# کوردبوون



## بەشێک لە بیرەوەرییەکانی کاپیتان حەمەدی مەولوودی

(١٩٠٧ - ١٩٧٩)



ساخکردنەوە و بەڵگەمەندکردنی
وریا مامڵێ

# کوردبوون

بەشێک لە بیرەوەرییەکانی

کاپیتان حەمەدی مەولوودی

(١٩٠٧ - ١٩٧٩)

کۆکردنەوە، ساخکردنەوە و بەڵگەمەندکردنی:

**وریا ماملێ**

# پێرست و ناوەرۆک

## پێشەکی وریا ماملێ

خوێنەری بەڕێز، ئەو کتێبەی لەبەردەستتانە، بەشێکە لە ژیاننامە و بیرەوەرییەکانی خوالێخۆشبوو (محەممەد مەولودیان - حەمەدی مەولودی - محەممەدی ڕاتب - محەممەدی ڕاتبی - محەممەدی سۆفی مەولودی یان حەمەدی مەولودە چرچی)ـییە. بابی ناوی «مەولوود و دایکی ناوی «زڵەخا» بووە لە ڕێکەوتی ٢٥ی خاکەلێوەی ساڵی ١٢٨٦ هەتاوی(١٥-٠٤-١٩٠٧ز) لە شاری سابڵاخ - مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان چاوی بە دنیا هەڵدێ.[1] دەگەڵ کۆمەڵێک لە لاوانی سەردەمی خۆی، یەکەمین حیزبی مۆدێرنیان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بونیات نا بەناوی (حیزبی ئازادیی کوردستان ١٩٣٨ز) کە ئەندامی ژمارە نۆهەمیان بووە و لە داهاتوودا بە هەندێک گۆڕانکاری بچووک لە ئەساسنامەی حیزبەکە، ناوەکەی دەگۆڕن و دەیکەن بە (کۆمەڵەی ژ.ک) و لە کۆتاییدا بوو بە (حیزبی دیموکراتی کوردستان). ژمارەی ئەندامێتی ٤٥ و ناوی نهێنیی لە کۆمەڵەی ژ.ک ـدا (چکاوەند)[2] بووە. کاک حەمەد یەک لە پێشمەرگە قارەمانەکانی سەردەمی کۆماری کوردستان بوو. بۆ ماوەی کەمتر لە ساڵێک بە ئەمری پێشەوا قازی محەممەد دەبێتە ڕەئیسی شارەبانی (پۆلیس)ـی مەهاباد و ئاسایش و ئەمنییەتی سابڵاغی لە ئەستۆ دەبێ. پاشان لە کۆماردا پلەی کاپیتانییان پێدا. لە زۆربەی هەرەزۆری مەیدانەکانی شەڕ، بە خۆی و بە پێشمەرگە گیانلەسەردەستەکانی بەشداری کردووە. ڕاستەوخۆ لە ژێر ئەمری نەمر پێشەوا قازی محەممەد هەڵسووڕاوە و خۆنەویستانە و ڕووسوورانە کارەکانی ڕاپەڕاندووە. پاش تێکچوونی کۆمار، دەگەڵ پێشمەرگەکانی خۆ بەدەستەوە نادەن و تا دوادەرفەت و دوافیشەک دەگەڵ ئەرتەشی شاهەنشاهی شەڕ دەکات. لەپاشان دەگەڵ ئەفسەرە قارەمان و نەمرەکانی کۆمار کە خەڵکی باشوور بوون، ڕوو دەکەنە عێراق و لەوێ بۆ ماوەی دوو ساڵ زیندانی دەکرێ. دەوڵەتی ئێران لەوێش دەستی لە بەرۆکی بەرنادات و لە زینداندا دەیدۆزنەوە و سەرهەنگێکی خۆی وەک ڕاسپاردە دەوڵەتی شاهەنشاهی دەنێرێتە زیندانەکانی عێراق تا بیگەڕێنێتەوە بۆ ئێران تا لەوێ لە سێدارەی بدەن، بەڵام لە سایەی کوردی مەرد و نیشتمانپەروەرەوە، کە دەزانن کاک حەمەد یەک لە پێشمەرگە لەزەبرەکانی کۆمار بووە، پێناسەی عێراقی بۆ دەردەکرێ و هاوکاری هەمەلایەنەی دەکەن و پێش

---

[1] ئەو ڕێکەوتە لە ئیدارەی ئامار و سەرژمێری لە مەهاباد دەرهاتووە کە دەکاتە ١٩٠٧/٠٤/١٥ی زایینی و (٢ ربیع‌الاول ١٣٢٥ی مانگی). بەڵام وەک لە داهاتوودا لە زمان کاک حەمەدەوە دەیخوێنینەوە، بەڕێزیان دەڵێ کە لە دایکبووی ساڵی ١٩٠٨ی زایینیم. ڕەنگە جیاوزی مانگ و ڕۆژەکانی نێوان ساڵی زایینی و هەتاوی باش پێک نەگرتبێ بۆیە ئەو ڕێکەوتەی نووسیوە.

[2] بڕوانە کتێبی "سێبەری ئازادی و هەوراز و نشێوێکانی" نووسینی: کەماڵ عەبدوڵاهی لاپەڕەی ٢٣٧

بە ڕادەستکردنەوەی بۆ ئێران دەگرن. کە ئازاد دەکرێ، لە سێبەری خوالێخۆشبوو «شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی»ـدا، لە گوندی خەلان و زینوێ شێخی،[1] نیشتەجێ دەبێ. لەو ئازادییە بەرتەسکەیدا، دیسان بۆ کوردایەتی تێهەڵدەبێتەوە و چەند جارێک بە نهێنی دێتەوە ناوچەی مەهاباد و موکریان و هەوڵ دەدات تا شۆڕش هەڵگیرسێنێتەوە، مخابن گوشارەکانی دەوڵەتی ئێران لەسەری چڕتر دەبنەوە و لەو دۆخەدا ناتوانێ زۆر بەرگە بگرێت، بۆیە بڕیار دەدات بە هەمان شوێندا کە بارزانییەکان پەڕیوەی سۆڤیەت بوون، ئەویش بەو ڕێیەدا بچێت بۆ ئەوێ. لە چۆمی ئاراس کە ئاودیوی سۆڤیەت دەبێ، دەیگرن و تاوانی سیخووڕی پێوە دەلکێنن و بۆ ماوەی دوو ساڵان لە زیندانەکانی «سیبیریا Siberia » و زۆر شاری تری ئەو وڵاتە دەیگرن و پاشان کە «ئیستالین» دەمرێ، بۆیان دەردەکەوێ سیخووڕ نییە و ئازادی دەکەن و بە یەکجاری لە ئازەربایەجان مافی پەنابەرێتی پێدەدرێت و نیشتەجێ دەبێت.

لەوێ خوالێخۆشبوو یای (Balabaci باڵاباجی) دەخوازێ وماوەیەکی کورت بەیەکەوە دەژین. بەرهەمی ئەو ژیانە کچێک بووە کە ناوی دەنێ (ڕووناک - Рунак) و ئێستاش نیشتەجێی شاری باکۆیە. کاپیتان ئەو کچەی لە سەرەتای لەدایکبوونی ڕا بە تەنیا گەورەی دەکات. یای ڕووناک لە بابی تەنیا سنوقێک وەک میرات و یادگاری بۆ بەجێ دەمێنی کە یەک دووربینی ڕاو، دەمانچەیەکی کۆن، مۆدنەیەک، چەند وێنە، چوار دەفتەر و هەندێک کوتەکاخەزی تێدا دەبێت.

یای ڕووناک کچی کاپیتان حەمەد ئەو یادگارییانەی باوکی زۆر خۆشویستوون و هیچکات دڵی نایەت هیچ لەو سنوقەی بابی دەرهێنێت یان بیانفەوتێنێ، بۆیە لای کەس باسی ناکات. نەیویستووە کەس پێیبزانێ (بەتایبەت خوشک و براکانی لە مەهاباد)، تا نەکا لێیوەرگرن و ئەو یادگارییانەی باوکی لای ئەو نەمێنن.

یای ڕووناک چەند جارێک پاش ڕوخانی شۆڕەوی (١٩٩١ز) سەفەری سابڵاخ دەکات و برا و خوشکەکانی دەدۆزێتەوە بەڵام، قەت باسی ئەو دەستنووسانەیان لەکن ناکات. تا لە ساڵی ٢٠١٧ کوڕی یای ڕووناک دەستی دەگاتە سنوقەکە و بە موبایلەکەی وێنەیەک لە لاپەڕەی یەکەمی یەک لەو دەفتەرانە هەڵدەگرێت و بۆ یەک لە خزمەکانی خۆی لە مەهابادی دەنێرێت، ئەویش کە دەیخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێت کە ئەو نووسراوانە دەستنووسی (کاپیتان حەمەدی مەولوودی)ـیە و بیرەوەرییەکانی ئەوە لە سەردەمی کۆماری کوردستان. بەبێ بەتڵاندنی کات، لەو دەفتەرانەی ئاگادار کردم و ئەو لاپەڕەیە لە دەستنووسەکەی بۆ ناردم کە لاپەڕەی یەکەمی دەفتەری ژمارە چوارە کە لە داهاتوودا لە بڕگەیەک بەناوی (سایینقەڵا) دەیبینن. ئەو ئازیزە داوای کرد کە وەشوێنی ئەو دەستنووسانە کەوم و پەیدایان کەم. کە جێی خۆیەتی زۆریان سپاس بکەم چون گەر

---

[1] زینوێ گوندێکە لە ناحیەی حاجی ئۆمەران، سەربە قەزای چۆمان لە پارێزگای هەولێر

ئەو نەبایە لەوانەبوو ئەوەندە بیرەوەرییانەشمان نەدیتبان. لە ڕاستیدا لە یەکەم چرکەکاندا وەمدەزانی ئەو بەڕێزە تووشی هەڵە بووە، لەبەر ئەوەی کە بە ئێمە نەوەکانی کاپیتان گوترابوو کە کاک حەمەد نەخوێندەوار بووە، بۆیە من زۆر هەواڵەکەم بە هێند وەرنەگرت. خۆم قاییل کرد ئەو باسە ساخ کەمەوە، بۆیە دەرفەتم بە فیڕۆ نەدا و تەلەفۆنم دەست دایە و بەو کەچە تورکی ئیستانبوڵییەی دەمزانی، سەری قسانم دەگەڵ پوورە ڕووناکم کردەوە. ئەویش بە ئازەرییەکی خەست و جارجاریش بە چەند وشەیەکی کوردی وەڵامی دەدامەوە. دەنا کچەکەی دیلمانجی بۆ دەکردین.

منداڵەکانی پوورە ڕووناک لە ئەلف و بێی کوردی تەنانەت یەک پیتیش تێناگەن و نازانن بیخوێننەوە، بەسەرهاتی ئەو دەستنووسانەی هەموو بۆ گێڕامەوە و دڵنیای کردم کە هەموو کاپیتان بە دەستی خۆی نووسیویەتەوە. کە وامزانی، بۆم شی کردەوە کە ئەم دەفتەرانە چین و چ نرخێکیان هەیە! تێمگەیاند کە ئەم دەستنووسانە بەشێکن لە مێژووی سەربەمۆر و هاوچەرخی گەلی کورد و هەروەها بەشێکن لە بیرەوەییەکانی باوکیی، کە ئەویش دەلاقەیەکە بەڕووی مێژووی ون و شێوێندراوی خۆی و گەلی کورد. بە خۆشییەوە دڵی نەرم بوو و دای بە کچەکەی تا لە ڕێگای پۆستەوە بۆم بەڕێ بکات. بە پێویستی دەزانم دونیایەک سپاسی ئەویش بکەم چون زۆرم ماندوو کرد.

پێش ئەوەی بێمە سەر باسی دەفتەرەکان، دەبێ ئەوە باس بکەم کە وەک کاپیتان حەمەد دەیانگێڕێتەوە، تا لە مەهاباد بووە، نەخوێندەوار بووە، پاش تێکچوونی کۆمار کە پەڕیوەی عێراق دەبێ و لەوێ زیندانی دەکرێت، لەلایەن ئەو کوردە نیشتمانپەروەرانەی کە دەگەڵی لە زیندان بوون، وەک «ئەنوەر دڵسۆز» و «فایەقی برای محەممەد قودسی» تا ڕادەیەک فێری کوردی نووسین و خوێندنەوە کراوە، بۆیە لە نووسینەکانیدا کەڵکێکی زۆری لە شێوەئاخەفتن و نووسینی باشوور وەردەگرێ کە ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاڵە کە لە باشوور فێری خوێندن کراوە. بە هۆی ئەوە کە کەم فێری نووسین و خوێندنەوە بووە، کوردی نووسینەکەی تا بڵێی شپرزە، بەبێ هیچ خاڵبەندییەک، بەدوور لە زاکوونی نووسین و لێوڕێژ لە هەڵەی ڕێزمانین. من خۆم سێ جاران وشەبەوشە خوێندوومەتەوە جا بە یارمەتی ئەو زانیارییانەی پێشووتر هەمبووە و ئەو موتاڵایەی پێشتر کردبووم، بە شیمانە دەمزانی باسی چی دەکات جا گرێپووچکەی قسەکانیم دەکردەوە و لێی حاڵی دەبووم. جاری چوارەم کە خوێندمەوە و دەستم بە تایپکردنی کرد، ئینجا باشتر لەسەری ڕاهاتم و لە شێوەنووسین و بیرکردنەوەی تێگەیشتم. بە دڵنیاییەوە ئەو دەستنووسەی کاپیتان حەمەد بۆ چاپکردن نەدەبوون، چون سەرەگێژەی بۆ خوێنەر دروست دەکرد و زوو لێی ماندوو دەبوو و پەیامی خۆی نەدەگەیاند، بۆیە بڕیارم دا کە بە نووسینێکی - تا ڕادەیەک - ستاندارد کە هەموو کەس بتوانێ بە سانایی بیخوێنێتەوە و لێی حاڵی بێت، تایپی بکەمەوە. دیارە هەوڵی تەواوم

داوە تا بە ئەمانەتەوە بیانووسمەوە بە چەشنێک کە ناوئاخنی باسەکان بە هیچ شێوەیەک نەگۆڕدرێت و لە مەبەست و مانای کاک حەمەد دوور نەکەوێتەوە. نکۆڵی لەوەش ناکرێ کە بۆ داڕشتنەوەی بەشێک لە ڕەستەکان ناچار ماوم سەر لە نوێ دایانڕێژمەوە بەبێ ئەوەی وشە، مانا و مەبەستی کاپیتان بگۆڕم.

**خوێنەری هێژا؛**

ئەو ڕۆژگارەی کە وەچەی پێشوومان تێیدا ژیاون، پڕ بوون لە قۆرت و کەند و کۆسپ. بە دڵنیاییەوە هەزاران کەس هەبوون کە دەیان ڕازی سەربەمۆر لە دڵیاندا بووەتە گرێی گۆڵە کراو کە لەبەر نەخوێندەوارییان یان کەم خوێندەوارییان یان نەبوونی دەرفەت و کەرەسە، نەیانتوانیوە دەریببڕن، ئەگینا ڕەنگبێ زۆر لایەنی شاراوەتر لە ڕووداوە گرینگەکان ڕووناکاییان بەرکەوتبایە. کورد پێویستە شوکرانەبژێر بێت کە کەسانێک لە وەچەی پێشوومان هەڵکەوتوون کە لانیکەم مێژوویەکی زارەکی، بەسەرهات و ڕووداوەکانی گەلەکەمانیان بۆ تۆمار کردووین.

نابێ ئەو خاڵەش نەدیو بگرین کە؛ ئەو کتێبەی بەردەستتان (تا ڕادەیەک) وەک مێژووی زارەکی (History Oral) پۆلێن دەکرێ و تایبەتمەندییەکانی ئەو چەشنە لە مێژوو بە خۆوە دەگرێ، کەواتە نووسەری مێژووەکە لەوانەیە شتی لەبیر چووبێتەوە یان دەستەوەستان بێ لە نووسینەوە و باس کردنیان، بۆیە نابێ چاوەڕوانیمان هەبێت کە هەموو ئەو دێڕانەی کاپیتان نووسیونی، بێ کەموکوڕی بن. ڕەنگە پاش و پێشی هەبێ، بەتایبەت کە زیاتر لە بیست و پێنج ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوانەدا تێپەڕیبێ و لە زێدی خۆی هەڵکەندرابێ جا تاوی دابێتە خامە، ئەویش بەو کەمچەخوێندەوارییەی کە هەیبووە! لە هەمووشی گرینگتر؛ لە هونەری نووسینیشدا دەستەوەستان بێ. بەڵام شتێک کە دوودڵی لێناکرێ ئەوەیە کە؛ کاپیتان حەمەد چەشنی ژیانی ئاسایی خۆی، بێباکانە، نەترسانە و ڕاستگۆیانە، ئەوەی دیتبێتی نووسیویەتەوە، ئەو خاڵە خۆی خاڵی هەرە بەهێزی نووسینەکانی کاک حەمەدە. ئەو بە پێچەوانەی زۆربەی (نەک هەمووی) ئەو کەسانەی بیرەوەرییەکانیان نووسیوەتەوە، دەپێشدا باسی خاڵە لاوازەکان و کەمایەسییەکانی خۆی کردووە جا پاشان بە دڵێکی بێفێڵوگزی ڕووداوەکانی گێڕاوەتەوە. گەر لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا شانازییەکی پێبڕابێ، هێند خاکەڕایانە باسی کردووە کە ڕەنگ بوو کەسانێک لەجیاتی ئەو بان، ئەوەندە ئەوەندە خۆیان پێ بەرز کردبایەوە. خاڵێکی بەهێزی تر کە لە بیرەوەرییەکانی کاپیتاندا دەیبینین، باس کردن یا پەردەلادانە لەسەر کۆمەڵێک ڕووداوی مێژوویی کوردستان کە کاک حەمەد بۆخۆی بەشداری ڕووداوەکان بووە و قامکیان لەسەر دادەنێ. ئەو ڕووداوانە تا ئێستا لە هیچ دەق و نووسراوەیەکی مێژووییدا باسیان لێوە نەکراوە یان بە پارێزەوە لێی دواون. لەو باوەڕە دام کە شارەزایانی کوردستان و کۆمارناسی، بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە، خوێندنەوەیەکی تازەیان دەبێ بۆ شرۆڤەکردن و

هەڵسەنگاندنی مێژووی هاوچەرخی کوردستان و کۆمارە خۆشەویستەکەمان. بە کورتی و بە کوردی؛ کاپیتان لە دەستنووسەکانی خۆیدا کۆمەڵگای سەردەمی خۆی ڕووت دەکاتەوە، هەڵیدەتەکێنێ و نهێنییەکانی لەقاو دەدات. دەچێتە ناو ناخی ڕووداوەکان، کەمایەسییەکان، گومانەکان و ئازارەکانەوە. کەس هەڵنابوێرێ و ڕاستگۆیانە ئەسکوێ لە بنی مەنجەڵ دەدا و بەرە لەسەر هەتیو هەڵدەداتەوە.

پێش ئەوەی لاپەڕەی بیرەوەرییەکانی کاپیتان حەمەدی مەولوودیان هەڵدەنەوە، بە پێویستی دەزانم سەرنجتان بۆ ئەو زانیارییانە ڕاکێشم:

١) ناوەرۆکی نووسینەکانی کاپیتان بە زمانێکی ساکار و بێپەرژین نووسراوە. چاوەڕوانیتان نەبێ کە نووسینی ئەدیبێک، نووسەرێکی دەرهاتوو یا مامۆستایەکی زانکۆ بخوێننەوە. هەرچەند ئەو ئەزموونانەی کاپیتان کۆی کردوونەوە، مرۆڤ دەکاتە مامۆستای گەورەترین زانکۆ لە ژیانی تاکەکەسیدا.

٢) هەوڵم داوە تا لەبەر ڕێز و حوورمەتی ئێوە خوێنەرانی بەڕێز، ئەو وشانەی ڕووی مەجلیسانییان نییە دەریانهاوێم و شوێنەکانیان بە سێ خاڵان (...) پڕ بکەمەوە. بەڵام لە زۆر شوێنان گەر وشەکان لە هێڵەگ درابان، لە ڕێچکەی نووسینەکانی کاپیتان حەمەد دەردەچوون بۆیە، زۆربەی وشەکان و ڕووداوە دڵتەزێنەکان وەک خۆی نووسراونەتەوە. داوا لەو خوێنەرە بەڕێزانە دەکەم گەر باری دەروونیان بەرگەی خوێندنەوەی ڕووداوی دڵتەزێن ناگرێت، یان توانای خوێندنەوە و بیستنی قسەی بێپەرژین و بێتوێکڵیان نییە، ئەو کتێبە نەخوێننەوە.

٣) کاک حەمەد سەر بە نەوەی کۆنە و لە ڕووداوەکانی پێش شەڕی یەکەمی جیهانی ڕا، بۆمان دەگێڕێتەوە تا ساڵی ١٩٧٢ کە دەستدەکات بە نووسینەوەیان. بێگومان ئەو سەردەم جیهان چەشنێکی تر بووە. کاتێک ئەو سەردەم دەگەڵ ئێستا پێک دەگرین، دەبینین کە کۆمەڵێک گۆڕانکاری بەرچاو ڕوویان داوە. بۆ وێنە کاتێک باسی کەسەکان دەکات، بەپێی ناودێربوونی خەڵکەکە لەوسەردەمدا ناوەکان دێنێ. وەک دەبینین کە باسی «سید محەممەدی سەیدی» دەکات، دەڵێ: «سەید محەممەدی سەید ڕەحمانی». واتە خەڵکەکە بە ناوبانگی کۆن دەناسێنێ نە بە ناسناوی ئێستاکەیان، کە ناسناوی (سەیدی)یان هەیە. لەبەر هەندێ، زۆر لە کەسەکان بۆ ساخکەرەوەش نەناسیاون. ڕەنگە لەپاش چاپ و بڵاو بوونەوەی ئەم کتێبە، هەندێک لە ناوەکان تیشکیان بەربکەوێ و بناسرێنەوە کە هەوڵ دەدەم لە چاپی دووهەمدا ناوئاخنی کتێبەکەیان بکەم.

٤) کاپیتان لە نووسینەکانیدا چەشنی ژیانی ئاسایی خۆی، بێباکانە ڕووداوەکانی گێڕاوەتەوە و تێیدا بە چاک و خەراپ، ئەوەی دیویەتی نووسیوێتی. تا ئەو جێگایەی بۆم لواوە هەوڵم داوە هێرش نەکرێتە سەر خەڵک، چون نە ئەو کەسانە ماون کە دەرفەتی داکۆکیکردن لە خۆیان هەبێ، نە ساخکەرەوە و گشت ئەو کەسانەی لە ئامادەکردن و چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبەدا دەستیان هەبووە، ئامادەن گلەیی کەس‌وکاری ئەو خەڵکە بێننەوە سەر خۆیان، مخابن نە کۆمەڵگەی کوردەواریش (جگە لە بەشێک) ئەوەندە پێشکەوتوویە کە بگاتە ئەو ئاستە لە گەشەی هزری و بە خۆی بڵێ «ئەو ڕووداوانە ئی سەدەیەک پێش ئێستایە و بە چاک و خەراپەوە بۆ ئەو سەردەم دەمێنێتەوە». کەواتە، تکایە تانەی خۆسانسۆڕی و شتی سەیروسمەرە لە ساخکەرەوە مەدەن.

هەندێک ڕووداو لەبەر گرینگی باسەکان بەبێ هیچ گۆڕانکارییەک نووسراوەتەوە، بەڵام ناوی کەسەکان بە سێ خاڵان (...) شاردراوەتەوە. لەوانەیە خوێنەر هەبن و بڵێن کە: (کاک حەمەد هەرچی لەسەر خۆی هەبووە و نەبووە، بە چاک و بە خەراپ گوتویەتی، ئەدی بۆ چاک و خەراپی خەڵک نەڵێت؟). بەڵێ، ئەم قسەیە ڕاستە، بەڵام بەرپرسیارەتییەکەی ڕاستەوخۆ لەسەر ئەستۆی کاک حەمەدە. ساخکەرەوەی ئەم کتێبە نە دەتوانێ ئەو قسانە پشتڕاست کاتەوە نە نکۆڵی. گەر کاک حەمەد بۆخۆی مابا، سەربەست بوو لە بڵاو کردنەوەیان. ئەو ڕووداوانە کۆن بوون و ئیتر دەبێ بۆ ڕابردوو بمێننەوە و لە هەڵە و سەرکەوتنەکانی ئەزموون وەرگرین و بیانکەین بە سەردێڕی لاپەڕەکانی داهاتوومان.

٥) ڕوانگەکانی کاپیتان سەبارەت بە عەشیرەتەکان، ئاغاوەتەکان، شێخەکان، سەیدەکان، دەوڵەمەندەکان، مەلاکان تەنانەت فەقیرەکانیش هەمووی هەر خۆی لێی بەرپرسیارە و دوور یا نیزیک پێوەندی دەگەڵ ڕوانگەکانی ساخکەرەوەی کتێبەکە نییە و بگرە لە زۆر شوێن دەگەڵیان ناکۆکە. وەک چۆن لە درێژەی بیرەوەرییەکاندا دەیخوێننەوە، کاک حەمەد باس لە عەشیرەتی قارەمان، ئاغای مەرد، دەوڵەمەندی ڕەند، شێخی گیانفیدا و نەداری دڵدەوڵەمەند دەکات. کەواتە دروست نییە وا گشتگیر بیر بکەینەوە. چاک و خەراپ لە هەموو چین و توێژێکدا هەیە.

٦) وەک باس کرا، بیرەوەرییەکانی کاک حەمەد شپرزە و ئاڵۆز نووسراوە. هیچ ڕەچاوی ڕێچکەی زەمان و کاتی ڕووداوەکانی نەکردووە (جیا لەوەی زۆر لە قۆناغەکانی ژیانی کاک حەمەدی هەر تێدا نییە). هەوڵم داوە بۆ جیاکردنەوە، کاتبەندی و ناودانان بۆ ڕووداوەکان و هەروەها بەشبەش کردنیان، تا دۆزینەوە، خوێندنەوە و تێگەیشتنی بۆ ئێوە خوێنەرانی هێژا، بەردەستتر بێت.

٧) کاپیتان باسی زۆر ڕووداوی مێژوویی دەکات کە بۆ ئەوەی ئێوە خوێنەرانی بەڕێز باشتر بزانن مەبەستی کاپیتان کام ڕووداوە، هەوڵم داوە تا لەناو کتێب و بەڵگە مێژووییەکاندا بگەڕێم بەشکوو سەرچاوەی زیاتر بدۆزمەوە و بۆ بەرچاوڕوونی زیاتری ئێوە خوێنەرانی هێژا، لە پەراوێز دایانبنێم. بەداخەوە لە دەروەی وڵات سەرچاوەکان کەم دەست دەکەون، بۆیە تێکۆشاوم هەرچەشنە کتێب و سەرچاوەیەکی کە گەیوەتە دەستم، کەڵکی لێوەرگرم. ڕەنگە هەندێک سەرچاوەم بەکار هێنابێ کە هەم کوردییەکەی، هەم فارسی و ئینگلیسییەکەی هەبن بەڵام، کەڵکم لە فارسییەکەی وەرگرتووە. هۆیەکەی ئەوەیە کە تەنیا دەستم بە کتێبە فارسییەکە ڕاگەیوە.

٨) بە هۆی ئەوە کە کاک حەمەد لە باشووریی کوردستان فێرە خوێندن و نووسین بووە و چەندساڵێکیش لەوێ ژیاوە و لە هەرەتی لاوێتیشیدا بەردەوام لە هاتوچۆی ئەوێدا بووە، بۆیە هەم بە زاراوەی ئەوێ و هەم بە زاراوەی موکریان بیرەوەرییەکانی نووسیوەتەوە. بۆ وێنە ئەو هەم دەڵێ: «تەماشا ئەکەن» هەم دەڵێ: «تەماشا دەکەن» لێرەدا هەوڵم داوە لە نێوان « ئەکەن و دەکەن»، (دەکەن) هەڵبژێرم تا نووسینەکە یەکدەست بێ. هەر وەک زۆربەی زمانەوانانی کوردیش هەر لەسەر ئەو بڕوایەن کە (دەکەن) دروستترە.

٩) ناشارەزابوونی کاک حەمەد لە هونەریی نووسیندا وای کردووە کە لە گێڕانەوەی و نووسینەوەی ڕووداوەکان و بیرەوەرییەکاندا شپرزەییەکی سەرسووڕهێنەری ساز بکات. لە هەندێک لاپەڕەدا کە سەرقاڵی گێڕانەوەی باسێکە، دەبینی پەڕیوەتە سەر دوو یا سێ باسی تر کە تەنیا لە درێژەی نووسینەوە و تایپی دەستنووسەکاندا کۆدەکانم بۆ دەشکان و دەمناسینەوە و ناچار دەبووم یا

دەگەڵ لاپەڕەکانی پێشووتر لێکیان بدەمەوە یان دەگەڵ لاپەڕەکانی داهاتوو. ئەو کارە بەڕاستی زۆری هێز و وزە دەویست و بە دەیانجار دەبوایە وشەبەوشەی ئەو دەفتەرانە پێک بگرم تا بزانم ئەو ڕستەیە ئی کامە ڕووداوە؟! بۆ وێنە لە دەفتەرێکدا باسی پێشهاتێکی کردووە، لە چەند دێڕێکی دی کە پەیوەست بووە بەو پێشهاتە، لە دەفتەرێکیتردا و لە گەرمەی گێڕانەوەی ڕووداوێکیتردا وەبیری هاتۆتەوە و نووسیوێتی. منیش هەمان دێڕم ناوئاخنی ڕووداوی پێوەندیدار کردۆتەوە.

بەباشی دەزانم ئەو ڕاستییە دەگەڵ ئێوە خوێنەرانی هێژا باس بکەم کە بڕیاردانی کارکردن لەسەر ئەو کتێبە، بڕیارێکی قورس و گران بوو. یەکەمجار بوو کە قامکم دەبردە سەر تەختەکلیل بۆ نووسینی کتێبێک، ئەویش لەو چەشنە کە لێوڕێژ بێ لە بەرپرسیارێتی. لەدرێژەدا دەیخوێننەوە کە کاپیتان حەمەد سێ جاران ئەو بیرەوەرییانەی نووسیوەتەوە، جارێکیان پرۆفێسۆر «عیززەدین مستەفا ڕەسوڵ» بەڵێنی بە کاپیتان داوە تا ئەو بیرەوەرییانەی بۆ چاپ بکات کە نەیکرد، تەنانەت دەستنووسەکانیش بەشێکی زۆریان فەوتان، ڕنگبێ ئەویش لەبەر ئاستی بەرزی بەرپرسیارێتی و ڕادەی زۆریی هەڵە و کەمایەسی لە بواری ڕێزمانی، نووسین و شپرزەیی بە نووسینەکانی کاک حەمەد بووبێ کە خۆی لێنەداوە و کاتی بۆ تەرخان نەکردووە. منیش زۆر دەگەڵ خۆم دەکەوتمە مشتومڕ و لێکدانەوە. تا بەوە قاییل بووم کە ئەو کتێبە بگەیێنمە کۆتایی و لە ئاکامدا گەر شانازییەکی پێوە بێ یان شوورەیی، ئەوەی هی کاک حەمەدە و هی من نییە. من تەنیا لەبەر ئەو خاڵە گرینگ و نەبیستراوانە کە لە سەردەمی کۆمار و کۆنی گەلەکەمان ڕوویانداوە شانم وەبەر ئەو کتێبە داوە؛ لەبەر ئەوەی گرینگییەکی تایبەتییان هەیە بۆ مێژووی کۆن و هاوچەرخی گەلمان کە کاپیتان بۆخۆی بە چاو دیتوونی و تێیاندا بەشدار بووە و باسی کردوون. بۆیە، پێموابوو کە دەبێ بڵاو بکرێتەوە تا پەیجۆرانی ئەو بوارە بیخوێننەوە، لێکیکەنەوە، لێکیدەنەوە و تێکیگرنەوە بەشکوو، دەلاقەیەک بکاتەوە بۆ مێژووی بێکەس و چەواشەکراومان، تا لە دەستکەوتەکان و هەڵەکانی، ئەزموون وەرگرین و بیانکەینە پەیژەیەک بۆ سەرکەوتنەکان.

لە یەکەم ڕۆژەوە کە بڕیاری کارکردن لەسەر ئەو کتێبەم دا، ناونانی کتێبەکە زۆری قورسایی دەکردە لەسەر شانم. دەگەڵ نووسەرێکی خامە بەبڕشتی کورد (کە ناتوانم ناوی بێنم)، ڕاوێژم کرد و زیاتر لە ٤٠ ناومان بۆ ئەو کتێبە دۆزییەوە، هەمووی ناوی جوان و شیاو، بەڵام لەسەری ساخ نەدەبوومەوە کە کامیان هەڵبژێرم. تا کاتێک چاوم بە کتێبەکەی مامۆستا «ڕەحیم سابیر» کەوت کە لەبەرئەوەی کاپیتان حەمەد، پاڵەوانانە تا دواساتەکان و دوافیشەک بەرگری لە کۆمار و دەستکەوتەکانی کردووە، کتێبەکەی پێشکەش کاپیتان حەمەدی مەولوودی دەکات. منیش ساخ بوومەوە کە ناوی بنێم (دوافیشەکی کۆمار). ئەو ناوەمان بە هاوکاری هاوژینم هەڵبژارد کە ئەویش دەبێتە نەوەی کاپیتان حەمەد. پاش ماوەیەک ڕەهەندەکانی ئەو ناوەم لێکدەدایەوە و گەیمە ئەو باوەڕە کە بەداخەوە، ڕاستە کۆمارەکەمان تێکچوو، ڕاستە کاپیتان و پێشمەرگە گیانلەسەردەستەکانی

تا دوافیشەک بەرگرییان لە خاک و کۆمار کرد، بەڵام ئەوە دوافیشەک نەبوو بۆ بەرگریکردن لە خاک و نیشتمان و بۆ پاراستن و بەرگریکردن لە دەستکەوتەکانی کۆمار و هەوڵدان بۆ دروستکردنەوەی کۆمارێکی تر. ئێستاش و لە دادێشدا، کورد بۆ وەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی خۆی و نرخەکانی کۆمار، فیشەکی بەرگریکردن لە خاک و نیشتمان دەهاوێژێت.

شەوێکیان دیسان دەگەڵ «شەرارە»ـی هاوژینم، پێداچوونەوەیەکمان بەسەر ئەو نەهامەتییانەی بەسەر کاک حەمەدی باپیرمان و منداڵەکانیدا هاتبوو، کردەوە. چارەنووس و سەربوردە پڕ لە ئازارەکانیانمان لێکدەدایەوە، بە هەردووکمان گەییشتینە ئەو باوەڕە کە کاپیتان بۆ کورد و کوردایەتی ئامادەبوو تەنانەت منداڵەکانیشی فیدای خاک و نیشتمان بکات و لەسەر کوردایەتی چەرمەسەری نەما نەیبینێ. ئیتر نموونەی وەک کاپیتان لە کوردیدا کەم نین و کەمتاکورتێک ژیانی هەموو کوردە و چارەنووسی هەموویان وێکدەچێ. ژیانی کاپیتان حەمەدی مەولوودی نموونەیەکە لە ئازارەکان و ژیانی کورد، هەستێکی هاوبەشی هەموو کوردانە و کەمووزۆر، کورد خۆی تێدا دەبینێتەوە؛ بۆیە ناوی (کوردبوون)ـمان بۆ هەڵبژارد.

کوردبوون هەستێکە هێژای پێوەنازین و پێخوڕین. نەک لەبەر ڕەگەز و ڕەچەڵەکەوە، بەڵکوو لەبەر ئەو ئازارانەی کە کوردێکی مافخوراو، بە ڕەگ و پێست و خوێنەوە، بۆ وەدەستهێنانی ئازادی و مافە ڕەواکانی دەیانچێژێت. بێنەوایی، برسێتی، بێبەرگی، بێدەرەتانی، زیندان، جەزرەبە، قەنارە، ماڵوێرانی، ئاوارەیی، تێکۆشان بۆ ئازادی و ... لە ئاکامدا، گۆڕغەریبی، هەمووی لە ژیانی ئاسایی کورددا بوونیان هەیە، کەچی بە خۆشییەوە سەرەڕای هەموو ئەو کارەساتانەی کە بەسەری دێنن، کورد هەر زیندووە، هەناسە دەدات و لە هەوڵ دایە پانتە بە نەیاران بکات. کورد گەر لانیکەمی قەڵتوپەی دوژمنانی دیتبێت، هەست بە شەڕەف و سەربەرزیی دەکات، چون لەسەر «کوردبوون» ئازار و نەهامەتی چێشتووە، خوێنی جیگەری خواردووەتەوە، ئارەقەی لەسەر ڕشتووە و فرمێسکانی بۆ هەڵوەراندووە. «بیرەوەری و کوێرەوەرییەکانی کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی» جیا لەوەی لە مێژوویەکی گرینگ لە سەردەمانێکی هەستیاری کوردستان دەدوێ و قارەمانێتی کۆمەڵێک کوردی گیانلەسەردەست باس دەکات، هاوکات ئاوێنەیەکی تەواونوێنی کوردێکی ڕاستگۆ و ئازارچێشووە کە دەتواندرێت وێنای کوردبوونـێکی ڕەسەن بکات.

با لەو ڕوانگەیەش ڕا (کوردبوون) ببینین؛ ڕاستە زیاتر لە ٤٣ ساڵە کاپیتان کۆچیدوایی کردووە. ڕاستە ئەو ڕووداوانەی لە (کوردبوون)ـدا دەیانخوێنینەوە بە دەیان ساڵیان بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام نووسینەوەیان لەلایەن کاپیتانەوە، ئەو پەیامەمان پێدەدات کە، کاپیتان لەدوای مەرگیشی بۆ کورد تێهەڵبووەتەوە و بەو کەچەخوێندەوارییەی کە هەیبووە، کۆڵی نەداوە و سێ جاران سەرلەنوێ بیرەوەرییەکانی نووسیوەتەوە و کردوویەتی بە دیاری بۆ ئێمە تا سەرەڕای هەموو ئازار و ئاستەنگییەکان، بۆ کوردستان و بۆ کوردبوون تێهەڵبینەوە.

لە درێژەی کارکردنم لەسەر ئەو کتێبەدا، کۆمەڵێک خزم، دۆست، هاوڕێ و هاوزمانی خۆمم زەحمەت داوە. لە ڕاستیدا هەموویان حەقیان بەسەر ئەو کتێبەوە هەیە. ناتوانم سپاسی تایبەتی مامۆستا ساڵح بێچار و هەروەها نووسەرە خامە بەبڕشتەکە نەکەم کە لە هەڵەبڕکردن و ڕێنوێنییەکانیاندا زۆریان یارمەتی دام. بەتایبەت کە مامۆستا ساڵح بێچار ئامادەکردنی فەرهەنگۆکی وشەکانی گرتە ئەستۆ. سپاسی شەرارەی هاوژینم دەکەم کە چەند جاران پێداچوونەوەی بە کتێبەکەیدا کرد و هەڵەبڕی بۆ کردم و مووی لە ماستی دەردەکێشا. هەروەها بە پێویستی دەزانم لە ناخی دڵەوە سپاسی گشت هەموو ئەو کەسانەش بکەم کە تەنانەت بە یەک وشەش بێ، یارمەتی «کوردبوون»ـیان دا. بەداخەوە لێرە بۆم نالوێ ناوی دانەبەدانەیان بێنم، بەڵام لە کۆتایی کتێبەکەدا سپاسی تایبەتیم ئاڕاستەی زۆرکەسان کردووە کە هیوادارم کەسم لەبیر نەکردبێ. ڕازاوەترین، جوانترین و چاکترینەکانیان بۆ بە ئاوات دەخوازم.

**کۆتایی**

با ئەو ڕاستییە بدرکێنم کە کاتێک بۆ یەکەمجار سەرقاڵی ئێدیت و ڕێکخستنی بڕگەکانی "کوردبوون" بووم تا بینێرم بۆ چاپ، لەجیاتی فایلە ئێدیت کراوەکە، بەداخەوە و بە هەڵە، فایلە ئێدت نەکراوەکەم ناردووە بۆ چاپ. لەو بابەتەوە زۆر داوای لێبوردن لەو خوێنەرانە دەکەم کە ئەو بەرگانەی پێشوویان کەوتۆتەوە دەست. هەرچەند ئەو کارەش خێری خۆی پێوە بوو و وەک چاوەڕوان دەکرا کۆمەڵێک زانیاری تازە لەلایەن خوێنەرانەوە هاتە دەستی ساخکەرەوە، هەروەها کۆمەڵێک هەڵەش تێیدا بەدی کرا، بە خۆشییەوە بۆ جاری دووهەم کە ناردمەوە بۆ چاپ، بەسەریاندا هاتمەوە و چاکم کردن و زانیارییەکانیشم پێوەلکاندن. جێی خۆیەتی زۆر سپاسی کاک مەنسور سیدقی، کاک حەسەن قازی، کاک بێهروز کوردئەحمەدی و کاک عەتا محەممەد بکەم کە کوردبوونیان دەوڵەمەندتر کرد. ئێستا ئەوە کتێبەکە لە کوردستان دەچێتەوە ژێر چاپ و ئەویش لە سلێمانی. بە پێویستی دەزانم زۆر سپاسی دۆستی کۆن و برای لە گیان نیزیکم کاک قادر شێخە دێگەیی بکەم کە پاڵپشتم بوو و ئەرکی دارایی چاپەکەی لە کوردستان گرتە ئەستۆ.

سەرکەوتن بۆ کورد و سپاس کە هەن.

بەوپەڕی ڕێزەوە.

وریا ماملێ

١٥-٠٦ - ٢٠٢٢

## پێشەکی مامۆستا شێرکۆ هەژار موکریانی

## بیرەوەرییەکانی کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی کارێکی مێژوویی بی وێنەیە.

بیرەوەرییەکانی کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی کتێبێکە لە سنفی خۆیدا بێ وێنەیە و، سامانێکی ئێجگار زۆر هێژایە، تۆمارێکی گرنگی مێژووی کۆمەڵگەی کوردە کە دەکرێت رۆژێک ببێتە سەرچاوەی زۆر بەرهەمی ئەدەبی و هونەریی کورد و میللەتانێکی تریش.
ئێمە تابلۆی دواکەوتوویی و چەوسانەوە لە هەموو روویەکی ژیانی مرۆڤی کورددا دە ئەم کتێبەدا دەبینین: باوک لە هەر دوژمنێک بێبەزەییتر، زڕدایک دەیەوێت منداڵی فڕێبداتە تەندوورەوە، هەر منداڵێکی چینی هەژار دەبێت رۆژانە تێهەڵدان و جنێو بچێژێت و، تەنیا بە ڕادەی جەربەزەیی و بێحەیایی و زبریی خۆی دەتوانێت جێگەی خۆی لە ژیاندا بکاتەوە، وێرانە و زبڵدان و توونی حەمامەکان پتر وەخۆی دەگرن تاوەکو ماڵ و حاڵ و کەسوکارێکی خۆی.
چینایەتیی دزێو و، تەعەسوب و بێعەقڵیی لە ئاست تابیعانی ئاینی تردا، خورافات و قۆڵبڕی و نیفاق ... هەمووی لە وێنەی نووسینەکانی کیپلینگ لەبارەی هیندستان لێرەدا دەبینین. کاپیتان حەمەد خۆی بە منداڵی لە مەیدانی گشتیدا ڕەگەڵ جەماوەر کەوتووە و لە مەیدانی مەنگوڕان، شەق شەقانێی بە کەلـلەسەری مرۆڤێک کردووە (هەمان شتی کە لە رۆمان و فیلمی «زەلامێ ویستی ببێت بە پادشا»دا دەیبینین) . کوشتاری گشتی لەدووی کوشتاری گشتی، هەتکی کچ و ژن لەدووی هەتک... بێبڕانەوە.
باوکی کاک حەمەدیش لە خەزای فەلەی ئاسووریدا بارگینێک و بارێک و «کچێک»ـی هێناوەتەوە تا بیکات بە مسوڵمان بۆ حەمەدی کوڕی، وێڕای ئەو هەمووە تاڵانەی خشڵ و بەرگی ژنانی مەسیحی تا سەری بەرز بێت و دەر و دراوسێ پێیبڵێن « خەزا پیرۆز، خەزا پیرۆز» و بەڵکو ئەوانیش شتێکیان لەو دزی و جەردەییەی ئەو وەحشیگەرییە پێببڕێت.
ئەو کچە ئاسوورییە هەژارەی کە دەیکەن بە مسوڵمان و ناوی دەکەن بە حەبیب، ئەگەر وەکو کاک حەمەد بیرەوەریی ژیانی خۆی بنووسیبایە، ئەویش چ رۆمانێکی لێ دەردەچوو . بەڵام لە ئەو هەمووە کارەساتەشدا دەبینین دڵی چاکی دوو چەوساوان کاک حەمەد و حەبیب چۆن ڕێز لە یەکتر دەگرن و وەک برا و خوشکی نموونەیی دەبن بە دڵدانەوەیەک لەو چەوسانەوانە بۆ یەکتر.
خەمی گەورەی سابڵاغ لەوەدا بووە چۆن لە تاڵان و بڕۆی عەشیرەتی کوردی بپارێزن. پادشای فارس کەسێکی ناردووە کە خەڵک کڕنووشیان بۆ بردووە و، کە فارسەکە تەماحی کردبێتە ژنێکی کورد و، ژن و مێردەکەی رووبەڕووی بووبنەوە، ئاغای کورد دە هانای فارسەکەوە چوون و ماڵی ژن و مێردیان بەسەر تەپڵی سەریاندا وێران کردوون و لەناویان بردوون.
کاتێک کوردێکی شار ویستبێتی «ئەمیر تومان»ـی حاکمی ئێران دەربکات، ئاغای کورد ئەو کوردەیان گرتووە و قاچیان لەبەر زگی وڵاخەکەی بەستووە و، بە کووچە و کۆڵانی سابڵاغیاندا گێڕاوە تا خەڵکی پێ بترسێنن.
دەکرا ئالیکساندر دوما یا ستاندال یا هوگۆ، بە خەیاڵ، دیمەنی سەگێکیان بکێشایە کە

توتکەکانی خۆی و منداڵێکی ساواش بلێسێتەوە و، خەڵکێک تێدا بهاتنایە منداڵیان هەڵبگرتایەتەوە و بۆ باب و زڕدایکیان ببردایەتەوە، دەکرا، بەڵام کە بەڕاستی ئەوە رووی‌دابێت و، ئەو منداڵە ساوایە گەورە بووبێت و بۆیان گێڕابێتەوە و خۆی رووداوەکەی نووسیبێتەوە ... ئەوە شتێکە من قەت لە هیچ سەرچاوەیەکی ئەدەبیاتی دنیادا نەمدیتووە.

یا دیمەنی کەسانێکی هەژاری چینی چەوساوە، کە هەمیشە ئامادەی قوربانی بۆ ئیدیئالی نەتەوە و نیشتمان، لە مەیداندا بن، ئازا و قارەمان بن و، چارەنووسیان بەدەست چینی تری سەرووی خۆیانەوە بێت و، نەزانن بە چ قەڵبەیەکیاندا دەدەن، بەڵێ ئەوە لە ئەدەبیاتی فەرەنسیدا لەبارەی رووداوانی ۱۷۹۳ و ۱۸۷۰ کەم نین، بەڵام هەمووی لەلایەن نووسەرانی ئەو چینانەی تری سەرووەوە نووسراون. ئەوە کە یەکێک لە ئەو چەوساوانە خۆیان، لە ئەو شەقام و کۆڵانانەوە، چەقۆکەی دەستی یا دەمانچە یا تفەنگەکەی بخاتە لاوە و قەڵەمێک بگرێتە دەست و ئەو خۆی چیرۆکەکە بە کتێب بگێڕێتەوە؟ نا، من نموونەیم نەدیتووە. رەنگە ماکسیم گۆرکی لێرەدا بە بیردا بێت، بەڵام نا، ئەویش نە ئەوەی بەسەر هاتووە کە بەسەر کاپیتانی ئێمە هاتووە و، نە نووسینەکەی بە ئەو کراوەیی و راستگۆیی و جورئەت و ڕاستەوخۆییەی بە زمانی ئەو چینە چەوساوە خۆی نووسیوە.

ئەوجا چەوسانەوەکە بە گوێرەی تەمەن دەگۆڕێت و تا چەوساوە بە تەمەن گەورەتر دەبێت، چەوسێنەرانی گەورەتری جەغزی گەورەتر بۆ بەرژەوەندی خۆیانی بەکاردەهێنن: فڵانە بکوژە، فڵانە شت بشێوێنە، بە خەڵک بڵێ لە هەڵبژاردندا بۆ مەجلیس دەنگم پێ بدەن ( ئەوە چەند رۆژێک دوای ئەوە کە گرتوویەتی و ئەو هەمووە جنێو و تێهەڵدانەی پێ چێشتووە، تا رووس فریای کەوتوون و رزگاریان کردووە). کاک حەمەد دەبێتە ئەندامی ژێکاف، بەڵام دەبینێت ژێکاف « سەتی نەوەدوپێنجی ئاغاوەت و توجار و سەید بوون، ئەوانەش بێزیان لە خەڵکی کاسب و زەحمەتکێش دەبۆوە». ژێکاف ئاغاوەتی عەشیرەتانی بە ئەندام وەرگرتوون بەڵام چەند نەفەر لە هەڤاڵەکانی کاک حەمەد ( دەڵێت: «کە لە خۆم دڵسۆزتر بوون»)ی بە ئەندام قەبووڵ نەکردوون. ئیدی کاک حەمەد و هەڤاڵانیشی گوێ بە مەرکەز نادەن و، لە خۆیانەوە باڵێکی چینی هەژار رێکدەخەن و، دوای مانگێک داوایان لێ‌دەکەن تێکەڵ ببنەوە و، دەبن. ئەو باڵە جیاوازانەی ژێکاف لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا بەوجۆرە باس نەکراوە.

کاتێک دەچێتە خزمەت قازی محەمەد لە مەحکەمە، قازی محەمەد پێی‌دەڵێت کە شەو لە پاراستنی شاردا بەشدار بێت نەوەکا مەنگوڕ بێن و شار تاڵان بکەن. کاک حەمەد یەک دنیا قێزی لەو دەوڵەمەندانە دەبێتەوە کە وا لە ترسی تاڵانی مەنگوڕان هەڵدەلەرزن، بەڵام ئیدی فەرمانی قازی محەمەدە و ناکرێت بەجێی‌نەهێنێت. چەند جوان باسی ئەو دەوڵەمەندانە دەکات کە ئەوەندە بە بێڕێزی باسی کەسانی وەک کاک حەمەدیان کردووە، پێیان گوتوون : عەمباڵی کوڕی عەمباڵ، بڕۆ لاچۆ هەی رەجاڵەی سەگباب، «وەک ئەوان لە زێڕ دروست‌کرابن و ئێمە لە قوڕ»،

ئێستا کە کاریان پێیان هەیە تا لە تاڵانی مەنگوڕانیان بپارێزن، « دەهاتنە لام و پێیان‌دەگوتم کە ئەوشۆ بانکراوی بۆ ماڵی کێ و کێ، منیش گونم نیشان دەدان و نەدەچووم»! یاخوا هەر شاد بیت کاک حەمەد گیان، کە من ئەوە دەخوێنمەوە وەک شەراب پێی مەست دەبم، ئەسڵەن ئەوە بۆ من قسە نیە، ئەوە «مووسیقایە، بەستەیە، گۆرانییە»، ئەرێوەڵڵا هەموویان بە قوربانی گونت بن! چ ڕێیان دەکەوێت بە گونت بن.

چەوساوە بە عاتیفەیەکی کە هەیەتی و چاوی لە دەستی قسەبەدەستانی قەومەکەیەتی فەتوای بۆ بدەن، لە هیچ درێغی ناکات و ژیانی خۆی لەسەر دەستی خۆی پێشکەش دەکات.

باسی شەڕەکانی نێوان پێشمەرگە و دوژمن لە بەڵەجەڕ، لە مەکڵاوی، کەسایەتیی مستەفا خۆشناو بەرانبەر وەهابی بلووری ( گوایە وەزیری کۆمار)، ئەو هەمووە قارەمانییانە لە شەڕدا و، ئەو هەمووە هەستە پیرۆزەی دێهاتییان کە چۆن هاتوون و ئاڵای کوردستانیان ماچ کردووە... هێندە- هێندە لاپەڕەی گرنگی مێژووی کورد دە ئەو بیرەوەرییانەدا دەخوێنینەوە.

بۆ باسی غەفوری مەحموودیان، ئەم کتێبە بۆ من تاقە سەرچاوەیەکی گرنگە، کە چۆن سەرەتا مەحموودیان، بە دروشمی چەپی، کاک حەمەد و هەڤاڵە ڕەشوڕووتەکانی خستوونەتە ژێر باڵی خۆیەوە و، بەرنامەکەی هەمان بەرنامەی « ژێکاف» بووە بەڵام چەند شتێکی تری وێخراوە، وەک: ئێمە خیانەت بە مەعمورەکانی سیاسیی شوورەوی ناکەین. مەحموودیان زۆر چالاک بووە، پێیەکی لە سابڵاغ و پێیەکی لە تاران بووە، ڕەقیبی قازی محەمەد بووە و، ویستوویە کۆبوونەوەی گشتی لە پێشەوا تێکبدات. بەڵام کاک حەمەد دوایی قەناعەتی هێناوە کە مەحموودیان پیاوی ئینگلیس بووە و خۆی و هەڤاڵانی دیارە لێی دوورکەوتوونەتەوە و، تەنانەت کاک حەمەد بە فەرمانی پێشەوا مەحموودیانی خستووەتە زیندانەوە و، ئەوجا لە وڵاتیان دەرکردووە و چووەتە ورمێ. بەڵام مەحموودیان وازی نەهێناوە، لە ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵای کوردستاندا هاتووەتەوە مهاباد و، چەند ناوێک لەو بۆنەیەدا خوێندراونەتەوە کە بە دوژمن ناسێندراون، مەحموودیان یەکێکیان بووە و ئەوەبووە کوژراوە.

زۆر حەیف کە هێندێک بەشی ئەو بیرەوەرییانە لەناوچوون. ئەوەی بەسەر ئەم بیرەوەرییانە هاتووە، چۆن چەند کەس ویستوویانە ڕێگە لە دەرچوونی بگرن و لەناوی بەرن، فەسڵێکی نوێ دەخاتە سەر فەسڵەکانی ئەم ڕۆمانە واقیعییەی ژیانی چەوساوەیەکی قارەمانی کورد، کە هەمان دەردەکانی کارەساتی چینایەتیی ئەم قەومە چۆن دوای ئەوەندە ساڵەش هەر درێژەی هەبووە.

کاک وریا ماملێ، بە ساغکردنەوە و ئامادەکردنی ئەم بیرەوەرییانە بۆ چاپ کارێکی ئێجگار زۆر پیرۆزی مێژوویی کردووە. ئەگەر من دەسەڵاتی دەستگاکانی نەتەوایەتیی کوردم هەبوایە، نەک هەر خەڵاتی کتێبێکی ساڵێک، بگرە خەڵاتی گرنگترین بەرهەمی سەد ساڵی ڕابردووی کتێبی کوردم بۆ ئەم کارەی پێشکەش دەکرد.

ئەو کتێبە پێشکەش دەکەم بە گشت پێشمەرگە و تێکۆشەرانی رێگای ئازادی کورد و کوردستان، بەتایبەت ئەو ناوە ونانەی خۆنەویستانە هاتنە مەیدانی خەبات و ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان کردە بەردەباز و بەلاگەردانی بستە خاکێکی نیشتمان کە بەداخەوە لە هیچ شوێنێك ناویان نییە و پێشمەرگەی ونن.

## دەفتەری ژمارە (١) و (٢)

کاپیتان حەمەدی مەولوودی سێ جاران بەسەرهاتەکانی خۆی نووسیوەتەوە. بە پێی وتەکانی یای «ڕووناک» کچی کاپیتان کە لە باکۆ دەژی و ئەو دەفتەرانە لەلای ئەو پارێزراو بوون:

(جارێکیان لە باکۆ کاک ڕەحیم قازی دێت بۆ لای کاپیتان و لێێ میوان دەبێ و دەفتەری بیرەوەرییەکانی لێدەستێنێت و ئیتر نایداتەوە. کاپیتان کە ئەوە دەبینێ و دەزانێ کە نووسینەکانی ناکەوێتەوە دەستی، بە ڕق دادەکەوێ و سەرلەنوێ و بۆ جاری دووهەم دەیاننووسێتەوە.

ئەوجارەیان بە کوردێکی عێراقیدا [مەبەستیان «پرۆفیسۆر عیززەدین مستەفا ڕەسوڵ»ـە][1] دیانێرێتەوە بۆ عێراق تا لەوێ بۆی چاپ کەن. لەوێش هیچ کە چاپ ناکرێ، سەری دەستنووس و دەفتەرەکانی تێدا دەچێ، جگە لە یەک یا دوو دەفتەر، باقی تر هەمووی دەفەوتێ.[2])

یای ڕووناک لە درێژەدا دەڵێ: (کاپیتان دیسان کۆڵ نادات و جارێکی تر و بۆ سێهەمین جار سەرلەنوێ دەست دەکات بە نووسینەوەیان. هەمووی خەڵاس دەکات و لە سنووقەکەیدا دینابوو تا لە هەلێکدا بیدات بە کەسێک بەشکوو بۆی چاپ بکات. لەپڕ شەوێکی کاک ڕەحیم قازی دەگەڵ پیاوێکی دی کە هیچکات نەمدیبوو و نەمدەناسی، لە باوکم وەژوور کەوتن و بوون بە میوانی. پاش سرتەسرتێکی زۆر و نامۆ، ماڵئاواییان کرد و لە ماڵ چوونە دەر. من کە لە ژوورێکی تر بووم لەناکاو بۆنی سووتمانم بۆ هات. بەپرتاو ڕامکرد تا بزانم چ سووتاوە؟ بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە دیتم کە باوکم ئاوری کردۆتەوە و ئەو دەفتەرانەی کە خوێنی جیگەری لەسەر خواردبوونەوە و سێ جاران نووسیبووییەوە، دەسووتێنێ. کردمە هەرا کە ئەی هاوار بۆ دەیانسووتێنی! حەیفە! زۆرت ڕەنج لەسەر کێشاون! مەکە ئەو کارەی! بەداخەوە بەگوێی نەکردم. دەستی دەلەرزا و بە ترسێکی زۆرەوە دەیگوت:

– پێیانگوتووم گەر بێتوو ئەو نووسینانە چاپ بکرێ و وەدەست دەوڵەتی شای بکەوێ، منداڵەکانت لە ئێران دەکوژن! بۆیە دەبێ بیانفەوتێنم و نەیانهێڵم![3]

هەرچی هاوارم کرد، گریام و پاڕامەوە، چی لێ شین نەبوو. هەر دەیگوت گیانی منداڵەکانم لە مەترسی دایە. پەشۆکابوو، قەتم بابم ئاوا نەدیبوو، وا دیار بوو کە چاکیان ترساندبوو و بەداخەوە هەوڵەکانم سەری نەگرت. کە زانیم قسەم بڕ ناکا، لێی لە فێڵان کەوتم و لەناو گشت ئەو دەفتەر

---

[1] بڕوانە لاپەڕەی ٤٠٠

[2] لە ناوناخنی بیرەوەرییەکانی کاپیتاندا و لە لاپەڕەکانی داهاتوودا، کاپیتان بۆخۆیان باسی ئەو ڕووداوە دەکات.

[3] دیار نییە کە مەبەستی دوکتور ڕەحیمی قازی لەو کارە چ بووە کە چەند جاران ویستوویەتی دەست بە نووسینەکانی کاپیتاندا بگرێ. (**ڕەنگە**) لەبەر دڵسۆزی بووبێ کە ئەو کارەی کردووە تا نەکا کاپیتان لە ڕووی ئەو دڵپاکییە زاتییەی کە هەیبووە و ئەو زانیارییە گرینگانەی کە لای بووە، شتێک بنووسێ کە دوژمنیی کورد نانی پێوە بخوات. یا ڕەنەگە هۆکاری تر بێ کە ئێمە لێی بێخەبەرین، (**بەهەرحاڵ ئێمە لە تاریکایی داین**).

و کاخەزە زۆرەدا، ئەو چوار دەفتەرەم لای خۆم گل دایەوە و وەک یادگار لە باوکم ڕامگرتن. تەنانت تا مردیش، نەمهێشت بزانێ کە ئەو دەفتەرانەم لێ شاردۆتەوە)

مخابن کە زۆر وێستگە لە ژیانی کاپیتان دەگەڵ ئەو دەفتەرانەدا کە سووتاندوونی فەوتاون و کۆمەڵێک ڕووداو و نهێنیان دەگەڵ خۆیان ون کردووە. لەو چوار دەفتەرە دوو دانەیان ڕێک وەک یەک نووسراون کە بەسەرهاتی هەرەتی منداڵیی کاپیتانیان تێدایە. بە ڕوونی دیارە کە یەکیان لەو دەفتەرانە بووە کە دوکتۆر «کەماڵ مەزهەر» بۆی بردۆتەوە. لە دەفتەرێکیاندا تەنیا دوو ڕووداوی جیاواز دەگەڵ دەفتەرکەی تری تێدا بوو کە ئەو دوو ڕووداوەشم تێکەڵ کردۆتەوە و لە کۆی یەک دەفتەر و وەک سەرەتای بیرەوەرییەکانی کاپیتان، پێشکەشتان دەکرێ.

## ڕواڵەت و تایبەتمەندییەکانی دەفتەری ژمارە (١)

دەفتەری یەکەم ١٧ سانتیمیتر پانایی و درێژایشی ٢٠،٢ سانتیمیترە. ڕووبەرگێکی کاغەزی ئەستووری هەیە. بۆ پاراستنی زیاتری ڕووبەرگەکە، بەرگێکی کەسکی پلاستیکی توندوتۆڵیان بە چرێش (سرێش) یا شتێکی هاوشێوە لێداوە. هەرچەند بەرگە نایلۆنەکە گشت ڕووبەرگە کاخەزییەکەی دانەپۆشیوە و لە سێ لاوە ڕووبەرگە کاغەزییەکەی پێنج میلیمیترێک بە دەرەوەیە. کە ڕووبەرگەکە هەڵدەدەیەوە ڕێک لە ناوەڕاست، هەندێک زانیاری بە زمانی ڕووسی لەسەر پشتی ڕووبەرگەکە وەدیار دەکەوێ کە وا وێدەچی زانیاری ئەو کارگەیە بووبێت کە لێی سازکراوە. کاتێک بە کەرەسەی وەرگێڕانی دیجیتاڵ تاقیم کردەوە پێیگوتم کە ئەوە زمانی بولگارییە. نرخی دەفتەرەکە، ڕێژەی چۆنییەتی دەفتەرەکە، ڕادەی لاپەڕەکانی و ناوی شاری لێنینگراد نووسرابوون. لە سەرەوەش دوو واژۆی کاپیتانی لەسەرە. کە یەکیان بچووک و ئەوەیتریان کەمێک گەورەتر دەنوێنێ. دەفتەرەکە وا وێدەچێ کە دەوری ١٨٠ لاپەڕە بووبێ چوون لە کۆتایی دەفتەرەکە بە ڕوونی دیارە کە لاپەڕەیەکی زۆری لێ دڕاوە. لاپەڕەکان کاغەزی ناسکی بۆرن کە کاغەزی «کاهی» پێدەڵێن و خەتەکانی درێژاودرێژ و پانەوپانن بەسەر یەکتردا هاتوونەوە کە چوارگۆشەی ورد دروست دەکەن. لەو ١٨٠ لاپەڕەیە تەنیا ١٦٠ لاپەڕەی کاپیتان ڕەشی کردوونەوە. دوو لاپەڕەش بە سپی ماونەتەوە. لە ڕووبەرگی کۆتاییشدا واژۆیەکی کاپیتان وەدیار دەکەوێ.

## ڕووالەت و تایبەتمەندییەکانی دەفتەری ژمارە (٢)

دەفتەری دووهەم ٢٠ سانتیمێتر پانایییەتی و ٢٩ سانتیمێتر درێژایی. ڕووبەرگێکی کەسکی تێکەڵاو لە نایلۆن و کاغەزی هەیە. کە ڕووبەرگەکە هەڵدەدەیەوە هیچ لەسەر ڕووبەرگەکەی نەنووسراوە. دەفتەرەکە دەوری ٦٣ بەرگە و لاپەڕەکان کاغەزی ناسکی بۆرن کە کاغەزی «کاهی» پێدەڵێن و خەتەکانی درێژاودرێژ و پانەوپانن بەسەر یەکتردا هاتوونەوە کە چوارگۆشەی ورد دروست دەکەن. کاپیتان لەو دەفتەرەدا سەرەتا و کۆتاییەکەی لێ تێکچووە و لە لاپەڕەکانی کۆتایی دەفتەرەکە ڕا دەستی کردووە بە نووسین و هەموو ئەو ٦٣ لاپەڕەیە لەلایەن کاپیتانەوە ڕەش کراونەوە. لە ڕووبەرگی کۆتاییشدا ڕێک لە ناوەڕاست، هەندێک زانیاری بە زمانی ڕووسی لەسەر پشتی ڕووبەرگەکە وەدیار دەکەوێ کە وا وێدەچی زانیاری ئەو کارگەیە بووبێت کە لێێ سازکراوە. کاتێک بە کەرەسەی وەرگێڕانی دیجیتاڵ تاقیم کردەوە پێیگوتم کە ئەوە زمانی بولگارییە و کە وەری گێڕا نرخی دەفتەرەکەی بوو دەگەڵ ڕێژەی چۆنییەتی دەفتەرەکە و ڕادەی لاپەڕەکانی.



دەستنووسی کاپیتان حەمەدی مەولودی

## ژیانی منداڵیم

ئەوە برێک لە بەسەرهاتی خۆم، چیم دیوە، چیم بیستووە، دەینووسم. لە ساڵی هەزار و نۆسەد و هەشت (١٩٠٨زایینی) لە شاری سابڵاغ لە دایک بووم. بابم دوو ژنی بووە. کۆرپەیەکی چوار ڕۆژە بووم کە دایکم مردووە. کە فامم کردەوە، جیران و خزم دەیانگێڕایەوە کە گۆیا زڕدایکم، دایکمی



ساوجبڵاغ موکری (سابڵاغ - مەهاباد): دانیشتووی سەر ئەسکەملە مۆزەفەرۆالدەولە - لەڕاستەوە ڕا کەسی حەوتەم - کاکائاغا یا کاکاغا (داروغەی سابڵاغ) سەرچاوە: ئەرشیڤی کاک جەمیل سام - فەرەیدون حەکیم زادە.

دەرمانداو کردووە. کاتێک دایکم دەمرێ، بابم و زڕدایکم وەخۆیانم ناگرن. دەمدەن بە ژنێک بە ناوی «ئایشێقەل». ئەو کوڕێکی لەبەرە چەند مانگ لە من گەورەترە. ئایشێقەل ئاوکێشی ماڵان بووە. مێردەکەی نێوی «حەمە گاوان»ـە و گاوانی گەڕەکی خۆیان بووە.

کەلاوەیەک بە پشتی ماڵی ئایشێ قەلەوەیە. ڕۆژێک لە ڕۆژان، ژنەجیرانێک بۆ کارێکی پێویست سەردانی ماڵی ئایشێقەل دەکات. لەپڕ چاوی بە دیمەنێک دەکەوێت کە زۆر سەرنجی ڕادەکێشێت. دەبینێت کە سەیەک تڕەکیوە و چەند بێچووی (توڵە) لەبەرە. لەو توڵانە یەکیان لە

هەموویان گەورەترە و وەک منداڵی ئینسان دەچێت. جیرانەکە کە نیزیک دەبێتەوە، دەبینێ کە سەیەکە وێڕای بێچووکانی خۆی، منداڵێکی ساوای دە ئامێز گرتووە و لە بێچووکانی خۆی هەڵیناوێرێ و پەیتاپەیتا چۆن بێچووکانی خۆی دەلێسێتەوە، ئاواش منداڵەکە دەلێسێتەوە.

کاتێک جیرانەکە ئەو دیمەنە دەبینێت دەیکات بە قاووقیژ و عالەم [خەڵک] وەسەر دەگەڕێن. من لە کۆشی سەیەکە دەردێنن. خەبەر دەدەن بە بابم و زڕدایکم. دێن و ئایشێقەل دەدۆزنەوە و بە لێدان و کوتان وەپێش خۆیانی دەدەن بۆماڵەوە. خەبەر دەدەن بە «کاکە ڕەشی داڕۆغە»[1]. خۆی و چەند نەفەر پیاوی حکوماتی [حکومەت] دێن و دەنێرن مێردەکەی (حەمە گاوان) لە گاڕان دەهێننەوە. هەر ئەوکاتەی شاربەدەریان دەکات. عالەم بە دوویانەوە ماستیان بەسەردا دەکەن. بە لێدان و بەردەباران، لە شار وەدەریان دەنێن.

بابم دەمباتەوە بۆ ماڵ و هەر ئەو ڕۆژە بە شانییم دادەدات و دەمباتە ماڵی باپیرم، ماڵی بابی دایکم. ئەوان ماڵیان لە «لاچین» دەبێت کە گوندێکە نیزیک شاری سابڵاغ. دەمدات بە نەنکم و باپیرم. ئەوانیش دەمدەن بە ژنێک بە ناوی «ئامین عاسیە». ئەویش چۆنی عاملاندوم؟ نازانم! تا پێم هەڵگرتووە ئەو ژنە بەخێوی کردووم. چۆنی بەخێو کردوم؟ نازانم! لەبیرم نییە!

دیسان هاتوومەتەوە ماڵی بابم، بەردەستی زڕدایکم، تا فامم کردۆتەوە. ئەو ماوەیەی لەبەردەستی زڕدایکمدا بووم، نازانم چی بەسەر هێناوم؟ ئەوەندەی دەزانم کە بابم زۆری خۆشدەویست و ئەویش ژنێکی بێ بەزە و دڕ و جانانە بوو. هەوڵ دەدەم ئەوەی وەبیرم بێتەوە بینووسم.

زڕدایکم، دەرد و ژانێک، بەڵا و نەهامەتییەک، ئێش و مۆتەکەیەک بوو بەناوی «شاشان» کە بەرۆکی گرتبووم و ببوو بە ماکی هەرچی ناخۆشییە لە ژیانمدا. چارەنووس و هەموو داهاتوومی فەوتاند. بەهۆی ناجسنی زڕدایکم، خۆشیم لە تەمەنی منداڵیم نەدیت. زۆری عازاب دەدام، برسی دەکردم، لێیدەدام، بە تووڕەیی و بە زمانی جنێو دەیدواندم، بە سووک لێیدەڕوانیم، بە مۆڕە خێسەی لێدەکردم و بەسەرمدا دەیقیژاند، چەپ و ڕاست تێیدەسرەواندم، سەرباقی دەردانیش، هەڕەشەی لێدەکردم کە نەکا لەلای بابم زار بکەمەوە و قسان بکەم. تەنانەت بۆ یەک جاریش نەمبینی بە بزە

---

[1] ناوی ڕاستەقینەی "مەولود کاکاغا"یە کە داڕۆغەی مەهاباد بووە. ڕێکەوتی لەدایکبوونی دیار نییە بەڵام، لە سەرەتای بەهاری ساڵی ١٣٣٥ق/١٢٩٥ش/١٩١٦ز لەبەرئەوەی شەڕی بۆ دەوڵەتی عوسمانی نەکرد، بە فەرمانی سەردارێکی سوپای عوسمانی بە ناوی "عمر ناجی بەگ" لە مەهاباد بەردەباران دەکرێت و بە شێوەیەکی دڕندانە دەکوژرێت. بڕوانە :

١- نگاهی بە تاریخ مەهاباد نووسینی: سید محمد صمدی لاپەڕەی ١٤٦

٢- مەهاباد در آینەی اسناد تاریخی نووسینی: فەرەیدوون حەکیم زادە لاپەڕەی ٣٥١، ٤٥١

٣- خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو، نووسینی: دکتر قادر محمودزادە (آسو) ل: ٢١

و بەزەییەوە بمدوێنێت. دەیگوت واو و وات لێدەکەم، چاوت دەردێنم، داغت دەکەم و زمانت دەبڕم. منیش نەمدەوێرا لای بابم بڵێم لەل. منداڵێکی چووک بووم و زۆریی لێدەترسام. بابم هەر منی هەبوو و تاقانەی بووم. زۆری خۆشدەویستم، بەڵام زڕدایکمی لە من خۆشتردەویست و لە قسەی دەرنەدەچوو.

دەڵێن بیری منداڵی تیژە. زۆر منداڵ بووم. وەبیرم دێت، زڕدایکم شامیکەبابی لێدەنا. بابم لەسەر بەڕماڵ نوێژی دەکرد و پشتی لە زڕدایکم بوو. منیش لە دەوری زڕدایکم دەهاتم و دەچووم. نازم لەسەر دەکرد. چونکە دایکی خۆم نەدیوە، وام دەزانی کە زڕدایکم دایکی خۆمە. برسی بووم. بۆن و بەرامی ڕۆن و کەباب ژوورەکەی داگرتبوو. منیش دەورەم دەدا بەشکوو تۆزێکم لەو کەبابە بداتێ. زڕدایکم لە ناکاو تاوەی داگرت و بەسەر لاقمدا ڕشتی و لاقم داپلۆخا و لە زڕێکم دا و یەکڕاست بە عەرزدا کەوتم. بابم بە پەشۆکاوی هات و کە زانی لاق و لەتەرم زۆر عەدم بووە، پرسیاری کرد: ئەوە چی بوو؟

زوو درۆیەکی لە مست بابم نا و وەڵامی دایەوە:

- لە دەوری ئاورگی حەقرەبەقۆی[1] دەکرد. هەڵنەنگووت و بە لاقیدا ڕژا.

بابم بە پەلە چوو بۆ مزگەوت. لە فەقێیان (مرەکەب)ی[2] وەرگرت و هێنای دە قاچ و قولی هەڵسووم. ئەوکاتی هەر داو و دەرمانی پیرە ژنان هەبوو.

لەو شارەدا تەنیا حەکیمێک هەبوو کە ناوی «وێنەتان»[3] بوو. ئێستاش نازانم بۆ نەیانبردمە لای ئەو حەکیمە؟ بە ناچار پاشی سێ - چوار مانگان کە لەسەر جێ کەوتم و بە داو و دەرمانی پیرەژنان بەرەو چاکبوونەوە بووم، دەهاتم کە لەو بەڵایە گەورەیە قوتار ببم، بەڵام ئەوەی لێی قوتار نەدەبووم، «شاشان»ـی زڕدایکم بوو. بەردەوام دە فکری ئەوەدا بوو چۆنم لەناو بەرێ.

---

[1] لە ئەدەبی زارەکی ناوچەی موکریاندا بە چەند جۆر ئەم وشەیە دێتە گۆ. حەقریبەقۆ،حەقلەبەقۆ، حەقلیمەقۆ، کە مامۆستا هەژار لە هەنبانە بۆرینەدا بە حەقلیمەقۆ نووسیویتی.

[2] وێدەچێ کە لە چاوگی "مرک" یا "مرکاندن" وەرگیرابێت و بە هۆی ئەوە کە سەرچاوەی زانست لەو سەردەمدا زانستی ئایینی بووە و لە حوجرە و مزگەوتەکاندا لەلایەن مامۆستایانی ئایینییەوە وانەی خوێندن و نووسین گوتراوەتەوە کە زیاتر بە عەرەبی بووە بۆیە، پێدەچێت کە هەمان وشەی "مرک یا مرکاندن"ی کوردییە کە عەرەبیش هەیانە و پێیدەڵێن "مرەکەب". بە واتەی مەرهەم و هێوەرکەرەوە. لە ئەگەرێکی دیکەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە لەوانەیە مەبەستی ئەو مرەکەبە بێت کە خامە و پێنووسی قامیشیان تێدەنا و لەسەر کاخەز پێیان دەنووسی. ئاخر قەدیم باو بوو کەڵکیان لە شتی سەیر و سەمەرە بۆ چارەسەری نەخۆشی وەردەگرت.

[3] ئەم حەکیمە ئاسۆری بوو و لەڕاستیدا ناوی George Jonatan بووە کە لە سابڵاغ پێیاندەگوت (یۆناتان یا وێنەتان). بە ناسنامەی ئێرانیش ناوی "یوناتان حاتمی"ـیە. غەنی بلوریان دە (ئاڵەکۆک) ـدا و لە لاپەڕەی ٣٤ ـدا، هەروەها سەید محەممەد سەمەدی لە کتێبی (نگاهی بە تاریخ مەهاباد) ل: ٣٩٧ ـدا باسی ئەم دوکتورە مرۆڤدۆست و خۆشەویستە دەکەن کە خزمەتێکی زۆری بە شارۆمەندانی سابڵاغ کرد.

ئەوەشم بیر هاتەوە کە بۆیان گێڕاومەتەوە. ماوەیەک پاشماڵەی ماڵی «قاسمە لاڵ» بووین. دە مدبەقەکەیاندا بووین. بۆ ئەوەی کرێ نەدەین، زڕدایکم مەنجەڵ و قاپی ئەوانی دەشووشت کاری ماڵێی بۆ دەکردن. باوکیشم زستانان بان و حەساری بۆ دەماڵین. ئەوە منیش بەردەوام وەدوای زڕدایکم دەکەوم و لەبەر پێی دێم و دەچم. ئاخر چی بکەم؟ قەتم دایکی خۆم نەدیووە و وەمدەزانی کە زڕدایکم، دایکی خۆمە! وەک سرووشتی هەر منداڵێک کە لەسەر دایکی ناز دەکات و خۆی شیرن و تاڵ دەکات، منیش نازی لەسەر دەکەم و گڕووی لەسەر دەگرم.

ڕۆژێک قاپوقاچاغ بۆ خاوەنماڵ دەشوات. مەنجەڵەکان هەڵدەگرێت تا بۆیانی بەرێتەوە. ماڵەکەیان لە نوهۆمی دووهەم بووە و پلیکانی زۆر هەبوو. منیش بە دوایدا دەڕۆم و دەگریم و دەکرووزێمەوە. وەسەر پلیکانان دەکەوێ و منیش بە دووی دا. بۆ چما هەردوو مەنجەڵان لەو حەوایەی ڕا بەسەرمدا نادا! لەو سەرەی ڕا خوللۆر دەبمەوە خوارێ و دەمرم و گیانم دەبەردا نامێنێ. هاوسێ و جیران وەسەردەگەڕێن و بە مردوویی دەمبەنەوە ژوورەکەی خۆمان. لێم بێهیوا دەبن و دەستم لێدەشۆنەوە. بانگی بابم دەکەنەوە و ئەویش دێتە سەر مەیتم. ئاوم بۆ گەرم دەکەن تا بمشۆن و پاشانیش بمنێژن کە لەپڕ وەهۆش هاتوومەوە. ئەوە ئەمجارەش لەم قۆرتە قوتار بووم و زڕدایکم نەیتوانی لەناوم بەرێ.

پەلە مەکەن و پشووتان لەسەر خۆ بیت، پاشان پێتان دەڵێم کە چی بەسەر زڕدایکم دێنم. ئەوە جارێ منداڵم و فام ناکەم. هەر وا دەزانم دایکی خۆمە و منی خۆشدەوێ. وا دەزانم کە خۆشەویستی بەو شێوەیەیە. وا دەزانم کە دایک دەبێ ئاوا بێت. بەردەوام برسیم دەکات و عازابم دەدات. تا خاوەنماڵەکەمان پێدەزانێت و بابم لەو جەزرەبە و ئازارەی کە شاشان دەیدا بە من، ئاگادار دەکەنەوە. بەڵام بابم ئەوەندە زڕدایکمی خۆشدەوێ گوێ بە قسەی خاوەنماڵەکەمان نادات و پێیان دەڵێ کە «شاشان» کوڕەکەمی لە چاوی خۆی خۆشتر دەوێت. هەر بۆیە جیرانەکانمان بە بابمیان دەگوت (...خۆر) ناویان نابوو «(ئاڵیە...ە) . دە کوردەواریدا کەسێک کە لە ژن بترسێ پێی دەڵێن «ئاڵیە...ە»

بابم بێستانچییە. دەگەڵ «سۆفی برایم» ناوێک لە بێستانێکدا شەریکە. هەروەک باسم کرد دە مدبەقی ماڵی «قاسمە لاڵ»یدا بووین. هەر یەک ژوور بوو. لە لایەکی ژوورەکە جێگای ئاوردوو بوو و دەوە و تەپاڵە هەڵچندرابوو. جێگای نووستنم لە تەنیشت ئاوردووەکە بوو. لەولای ژوورەکەش بابم دەگەڵ خێزانی دەخەوتن. بەیانیان زوو، بابم لەخەو هەڵدەستا و دەڕۆییشت بۆ مزگەوت. دایکیشم کاتی تاوهەڵاتان دەڕۆییشت بۆ سەرچۆم بۆ ئاوکێشانی ماڵان. ئەو ڕۆژە دایکم کە دەبینێ من لە غوڕڕابی خەو دام و باوکیشم لە ماڵ نییە، گرم ئاوردوو و تەپاڵەی هەڵچندراو تا میچ، بەسەر مندا دەڕووخێنێ و تێدەقوولێنێ بۆ چۆمی.

لە بەختی من، بابم هەندێک کەرەسەی بێستانی کە لەبەر دەرکی تاقە ژوورەکەمان دانابوون

تا دەگەڵ خۆی بیانبات بۆ بێستانی، لەبیری دەچێت. هێندەی پێناچێ کە «سۆفی برایم»ـی شەریکی بابم دێت تا کەرەسەکان بباتەوە بۆ بێستان. لەپڕ هەست دەکات کە نووزەی منداڵ دێت. گورج و بەپەلە دەژێر ئاوردوو و دەوە و تەپاڵەدا دەرم دەهێنێت و دەیکاتە هات و هاوار. جیران و هاوسێکان وەسەردەگەڕێن. تەپوتۆزیان لەسەر تەکاندم، دم و لووتیان بۆ پاک کردمەوە و ئیستیکانێک قەنداغیان بە گەرووددا کردم. نان و چایان دامێ و منیش هەرچەندی تێرم خوارد، بەڵام لە ڕووی دڵسۆزییەوە بە زۆر بابۆڵەیان دەزار دەگوشیم و دەیانگوت دەبێ بیخۆی. زڕدایکم خەبەر دەزانێت و بە هەڵەداوان هاتەوە ماڵ و کردی بە ڕۆژی قەرەوەیسی. لە خۆی دەدا و بە درۆ خۆی وێکنابوو و دەیگوت:

- ئەوە چی بووە؟ وەی کوێر بم و لەو قسانە.

ژنی ساحێب ماڵیش کە پێشووتر بابمی چەند جاران لەو ئەشکەنجە و جەربەزانەی کە زڕدایکم بەسەر منی دێنا ئاگادار کردبۆوە، بەڵام چ سوودی نەببو و لە «ئاڵیە (ئاڵە)...ە» بێهیوا دەبێت. ئەمجار بیانووی کەوتە دەست و لە زڕدایکم وەخۆ کەوت. بەربوو جنێودان و قسەی سووک پێی. چاوی قووچاند و ئەوەی بە زاریدا هات پێیگوت:

- دایکەکەیت دەرمانداو کرد و کوشتت ئێستا نۆرەی منداڵەکەیەتی؟ جا ئەو منداڵە چ گوناحێکی هەیە؟ تۆ خودا دەناسی؟ تۆ بەزەییت دە لەشدا هەیە؟ تۆ مرۆڤی؟ چەند جارم پێگوتی وا لەو کوڕەی مەکە؟

زڕدایکم چاک لە قۆڵێ کەوتبوو. ژنی ساحێب ماڵ تێیهەڵپێچا و ڕووی لە «ڕەحمان»ـی کوڕی خۆی کرد و پێیگوت:

— بڕۆ ئەو سڕ و سیپاڵەی وەدەرنێ بۆ دەرکی حەسارێ.

دەو بەینەشدا ناردیان بابمیان لە بێستان هێنایەوە. دیار بوو «سۆفی برایم» پێشتر خەبەری دابوویە. هاتە ژوور. دیتمی کە من دەباوەشی ژنەکانی جیران دام و نان و چا دەخۆم، ئاهێکی هاتەوە بەر. کە ژنەکانیش بابمیان دی، منیان لەبیر چۆوە. بە هەموویان بە جنێو و قسەی سووک کەوتنە سەری. دەردێکیان دایە نەبێتەوە. لە شەرمان خۆی ڕانەگرت و زوو دەرپەڕی و هەرچی کەلوپەلی ناو ژوورەکە بوو، بردییە داڵانی دەرکی حەسارێ. سەرتان نەهێشێنم هەر ئەو ڕۆژە دەرکراین. بابم چوو لە گەڕەکی باغی[1] سیسەی، بوو بە پاشماڵەی «توفیقی تارزەن» (تارژەن) و ئەوانیش ژوورێکیان داینێ. بابم چوو عارەبەی کەڵ و گامێشی هێنا و ئاوردوو و کەلوپەل و شڕەوبڕەمان دەناو نا و گواستمانەوە. ئێستا لەو ماڵە تازەیەمان بارم سووکە و عازابم نادات. بەڵام

---

[1] کاپیتان حەمەد لە نووسینەکانیدا ئەم وشەیەی بە (باغ) نووسیوە. لە ئەسڵدا پیتی (غ) لە کۆپیتی کوردیدا بوونی نییە و ئەو وشەیە بە (باخ) دەبێ بنووسرێت، بەڵام لەبەر دەستپاکی بە نووسراوەکانی کاپیتان، ئەو وشەیە و گشت ئەو وشانەی هاوشێوە وەک خۆی دەنووسمەوە.

چارەڕەشییەکەم لەوە دایە کە هەموو شەوێ کوندێک میز دەبنە خۆم دەکەم. هەموو بەیانییان لەسەر میزکردن چینێکم وێدەکەوێ. منداڵی خەڵک بە «قوربان و سەدەقە» لە خەو هەڵیاندەستێنن، منی داماو و بێدایک و خۆشی نەدیو، بە شەق و پێلاقە لە خەو ڕاستم دەکەنەوە. ئێستا زڕدایکم زگی هەڵمساوە و دووگیانە. ئاوکێشی ماڵان ناکات. زۆرتری کاتەکان لە ماڵێیە. شەوێک کردی بە فەرتەنە و قیژ و هەرا. مامانیان بۆ هێنا و زا. کوڕێکی بوو. کوڕە حەوتووی چوو و ئێویان نا «ڕەحمان». تا زەیستان بوو، لەماڵ بوو، بەڵام کە چلەی تەواو بوو، دەچۆوە بۆ کاری ماڵان. منیش ئاگام لە ڕەحمان دەبوو. فێری کردبووم کە لەتەنیشت لانکی ڕەحمان دابنیشم و خۆشخۆش ڕایژێنم. لە سێبەری ڕەحمان نانم لە ڕۆنی دایە و برسیم ناکات. لەو شیوەی کە لە ماڵان دەیهێنێتەوە بەشی منیش دەدات. ڕۆژێک گوتی: ئەوە دەچم بۆ چۆمی. دەچم بەڕە و مافووری ماڵە فلانە کەسی دەبەم بۆ شووشتن. گەر هاتوو ڕەحمان گریا و ژێر نەبۆوە، وەرە گازمکە. لەتە نانێکی دامێ و ڕۆیی. پاش تۆزێکی چوومە بەردەرکی ماڵەکەمان. دیتم منداڵ گاڵتە و کایە دەکەن. هەتا زیاترم چاو لێدەکردن، زیاتر سوێم دەچوو بۆ کایە کردن. کە گوتیان وەرە ئەتۆش کایە بکە دەتگوت ئەو دونیایەیان دا بە من. یەکەمجارە گەمەی «قەرەقەرێن» ببینم. یەک لە منداڵەکان چاوی خۆی نووساندووە و پشتی لە منداڵەکانی تر دەکات. تا ساڵی سێ دەژمێرێ. ساڵی یەک، ساڵی دوو، سەری ساڵێ سێ، وەدوای منداڵان دەکەوێ. هەر منداڵێکی کە بیگرێ، ئەو تێدەکەوێ و دەبێ ئەوجار ئەو چاوی خۆی بگرێ و ڕا بکات بە شوێن منداڵان و پیسیان[1] بکات. وەها چووبوومە دونیای قەرەقەرێنەوە و دونیای منداڵیمەوە کە نەمدەزانی دەوری چ پاشایەکە. ڕحمانم بەیەکجاری لەبیر چووبۆوە. تۆ مەڵێ زڕدایکم لەکار بۆتەوە و هاتۆتەوە ماڵ. تەماشا دەکا کوڕەکەی هێندەی بگری، ڕەش و شین بۆتەوە. کە ئەوە دەبینێ چوماغی هەڵدەگرێ و دەکەوێتە شوێنم تا بمدۆزێتەوە. دەوکاتەدا من چاوم گرتووە و دەبێ من شوێنی منداڵان بکەوم و پیسیان بکەم. ئەوەندەم زانی زەبرێکی قورسم وە لاقی کەوت. لەجێوە کەوتم. هەرچی کردم و کراندم نەمتوانی ڕاست ببمەوە. ئەوە ئەویش هەر لێمدەدات. لاقی ڕاستم شکا. (تەفیل)[2] بووم. زانی لە کەلک

[1] لە زۆر گەمەی منداڵانی ناوچەی موکریان باوە کە کەسێک لە گەمە و قوماردا دەدۆڕێت، دەڵێن ئەتۆ پیس بووی یا ئەتۆ سووتای. وشەی "پیس" بەتایبەت دە دوو گەمەدا زۆر بەکاری دێنن. ١- قەرەقەرێن ٢- شۆبەشۆبە.

[2] کاپیتان حەمەد بە هۆی ئەوە کە خوێندەواری باشی نەبووە لەوانەیە زۆر وشەی بێگانە بە هەڵە فێر بووبێت و بە هەڵەش دووپاتیان بکاتەوە یا بە هەڵە بیانووسێت. ئەو حاڵەتە زۆر ڕووی داوە و دەدات. بۆ وێنە لە ناوچەی شاروێران و چۆمی مەجید خان زۆر بیزاوە کە بەساڵاچووەکان وشەی "فقط"ی عەرەبی کە هاتۆتە ناو زمانی کوردی و فارسی، بە "فەتەق" دەیڵێنەوە. لەوانەیە کاپیتانیش لێرەدا مەبەستی وشەی "تلف" بووە کە بە ڕەچەڵەک عەرەبییە و هاتووەتە ناو زمانی فارسی بە مانای "بێکەلک، وێران و کوشتن" دێت و بە هەڵە "تەفیل"ی نووسیوە. هەرچەند تەفیل ناویشە لە زمانی عەرەبیدا. من بە ئانقەست دیسان لێرەدا نووسیومەتەوە تا نەکا ئەم وشەیە کوردی بێت و من نەمزانیبێت یان لەوانەیە کەسانێک لە من باشتر زانیارییان هەبێت و گەر کوردی بێت با نەمرێت.



کەوتووم و هۆشی خۆم نییە. بەناچار خۆی و چەند منداڵ، هەڵیانگرتم و بردیانمەوە ماڵێ. لەولاشەوە بابمیان ئاگادار کردبۆوە کە بگەوە ماڵێ، ژنەکەت قولی کوڕەکەتی شکاندووە. بابم هاتەوە. قەڵس و تووڕە. بە دەنگی بەرز قیژاندی و گوتی:

- ئەوە چییە دیسان؟ ئەو کوڕە بۆ ئاوای لێهاتووە؟

زڕدایکم یەک ئۆیینی[1] دەرهێنا نەبێتەوە. دەستی کرد بە لیچکردن و نوکەنوکێک، کافر ئاوری بۆ تێبەردەبوو. وا خۆی فەقیر کردبوو کە بەزەییت پێیدا دەهاتەوە. لە وەڵامی بابمدا بە کوڵی گریان و فرمێسکەوە گوتی:

- لە چۆمی بووم، ڕەحمانم بۆ بەجێهێشتبوو، وەک لە غەیبەوە پێمبڵێن کە بڕۆوە ماڵێ کوڕەکەت حاڵی مەخشووشە. منیش بە هەڵەداوان هاتمەوە. کە وەژوور کەوتم، دەبینم محەممەد هەردوو قامکی لە لووتی ڕەحمانی نابوو. گەر بڕێکی دی پێچووبا و درەنگم کردبا، قاڕەبڕی دەکرد.

بەو درۆیانەی کە کردی و بەو ئۆیینەی کە گێڕای هێندەی تر ئەژنۆم شکا. لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئێستا بابم باوەڕی پێدەکات و ئەوەندەم لێدەدات لەسەر قوون دانەنیشم و لەوانەیە لاقەکەی دیکەشم بشکێنێ، کەچی ڕووی تێکردم و کاتێک سەروسەکت و لاقە شکاوەکەی دیتم، لێینەدام، بەڵام بە هێز و قووەتی خۆی تفێکی لە ڕوو کردم و دەستی کرد بە پرتە و بۆڵە بەسەرمدا کە:ئاخر هەتیوە، ئەوە برای خۆتە و چۆن دەبێ ئاوای لێبکەی و دەبێ خۆشت بوێ ڕەببی خەجاڵەت بی و لەو قسانە...

منیش هەوەڵجار لە ژیانمدا وەدەنگ هاتم و زڕدایکم وەدرۆ خستەوە و گوتم:

- درۆ دەکا. من لە دەرێ لەنێو منداڵان گاڵتەم دەکرد و هات و بە چۆماغ لە لاقی دام.

---

[1] ئەو وشەیە لە ئەسڵدا تورکییە (Oyun) و بە مانای گەمە دێت و (Oyuncu) ـش بە مانای ڕۆڵگێران لە شانۆ و سینەما دێت. (Oyunbaz) ـش بە کەسێکی درۆزن و فێڵبازیش دەگوترێ. لە کوردیشدا بەو کەسانە کە بە درۆ و بۆ فێڵکردن یان بۆ فریودانی خەڵک لە ئاکاریی ئاسایی خۆیان لادەدەن دەگوترێ کە کابرا عۆین/ئۆیینی گێڕا، و نمایشی گێڕا، یانی بە درۆ و فێڵ هەڵسوکەوتی دەکرد.

که وام گوت، نازانم بەزەیی پێم داهات یا چی؟ هات و چاوی لە لاقم کرد، کە دیتی لاقم هەڵماسیوە و ژانم هەیە و ناتوانم پێی بڕۆم، دەرپەڕی چوو «مارفە کەچەڵ»ـی هێنا بە تەختە و پەڕۆوپاڵ لاقمی هەڵبەست. بە لاقهەڵپێچراوی لایکەم دوو مانگان دە جێگادا کەوتم. بابیشم کەمێک دەگەڵ زڕدایکم دەمەتەقەیان کرد و یەک-دوو ڕۆژ دەنگیان لە یەکتر گۆڕی و بڕایەوە.

ئیتر لەو ڕۆژە ڕا زانیم ئەوە دایکی خۆم نییە و زڕدایکمە. ڕێک بە پێچەوانەی من دەگەڵ منداڵەکەی خۆی دەدوا و هەڵس‌وکەوتی دەکرد. برسیم دەکات و نانم ناداتێ. خواردنم لێ دەشارێتەوە. هەر لێم دەدات و قسەی سووکم پێدەڵێ، درۆ و بوختانم بۆ هەڵدەبەستێ کەچی، بە کوڕەکەی خۆی هەڵدەڵێت و بە ماچان ملچەملچی لێدێنێت. منیش ڕۆژلەدوای‌ڕۆژ زیاترم قین لێیدەبێتەوە. قین‌بەقینەی دەکەم و ڕقەی لێدەگێرم. پێشتر ڕەحمانم زۆر خۆش دەویست، ئێستا دەیبوغزێنم. بڕێک گەورە بووم. دەفامم. لەسەر زۆر شتان بلەوەزی دەکەم و دمبەدمەی دەگەڵ دەکەم، بەڵام بەیانییان کە لە خەوم هەڵدەستێنێ، دەزانێ کە میزم دەبنەخۆم کردووە، جا بە پێلاقان دامدەگرێ و ڕاستم دەکاتەوە، دەنا وەکی دی قسەیەکم پێبڵێت، من دووی پێدەڵێمەوە.

نازانم هەر من وا بووم یا هەموو منداڵێک وەک من نەوسن بوو؟ نازانم لە هەموو ماڵێک نان لە منداڵان دەشاردرێتەوە یا هەر لە ماڵی ئێمە وا بوو؟ ئەوەندە برسی دەکردم کە دەو ماڵەدا کون‌بەکون دەگەڕام تا شتێکی خواردنێ بدۆزمەوە و دە زارمی هاوێم. دەیزانی کە هەمیشە برسیمە و بەردەوام لە شتی خواردن دەگەڕێم، بۆیە هەموو خواردنێکی لە من دەشاردەوە. منیش کۆڵ نادەم. گوێ نادەم بە لێدان و کوتان، هێندەی لێداوم خاراوم. ئەوە بڕێک گەورە بووم منداڵی لە خۆم گەورەتر دەرۆستم نایەن. دەچم تەواوی ماڵەکەی دەگەڕێم و خۆراکەکە دەدۆزمەوە و تێربەزگ دەیخۆم. باش لەبیرمە. ڕۆژێک لە مەیدانی مەنگوڕان دەگەڵ کوڕێک بوو بە شەڕمان. یەکجار لەخۆم بەتەمەنتر و بەخۆوەتر بوو. ڕۆی بوومێ و دەبنەخۆم نا. بە کۆڵەمستان لە سەر و گوێلاکیم دەدا. نەمدەهێشت پەل ببزێوێ. خەڵک تێمانهاڵان. دوو-سێ پیاوی پاک و خاوێن و کۆک و پۆشتە کە وێدەچوو ئاغا بن، پیلیان گرتم و گوتیان:

- بەسیەتی، هەستە لەسەری، کوشتت.

لەسەر ئەو کوڕە زەلامەی هەڵیانستاندم و یەکیان لێیپرسیم:

- ئەتۆ کوڕی کێی دەبەر ...ت مرم؟ دایک و بابت هەیە؟

دەنێو ئەو خەڵکەیدا کە لە تەماشایە ڕاوەستابوون، کەسێک وەڵامی دایەوە گوتی:

- ئاغا، ئەوە ناوی محەممەدە، پێیدەڵێن حەمەد، کوڕی (سۆفی مەولوودە چرچی یە)
- هەی لە منی کەوێ. وەڵڵاهی هەتیو بایە دەمبرد، دەمکرد بە کوڕی خۆم و دەگەڵ کوڕەکانم دەمکرد بە شەریک.

ئەوجار لە سەر تا پێم ڕا تەماشایەکی کردم. دیتی کە پێڵاوێکی شڕم دەبەر دایە، بردمی جووتێک

کاڵەی شەمامەبەندی بۆ کڕیم و چەند شایی[1] دامێ و دەستێکی بە سەرم داهێنا و ڕۆیشتن. قەت دە ژیانمدا شتی ئاوام بە خۆمەوە نەدیتبوو، کە من کاڵەی شەمامەبەندم هەبێت. لە خۆشییان لە مەیدانی مەنگوڕان ڕا بە هەڵاتن چوومەوە ماڵێ. کە چوومەوە وەک هەمیشە بابم و زڕدایکم دووبەدوو نانیان دەخوارد. مەگین چۆنەکایی بایە کە بانگم کاتەوە بۆ نان خواردن یا من لە ماڵ بام و نانی بخۆن و منیش دەگەڵیان دابنیشم دەنا، زڕدایکم تا بۆی بکرێت بەبێ من نان دادەنێت تا من نان نەخۆم و برسی بم. بەهەر حاڵ، وەژوور کەوتم. کاڵە تازەکەم لەچاو جلە چڵکن و شڕەکانەم زیاتر خۆی دەنواند و دەدرەوشایەوە و کەچەکەوشەکانیشم بەدەستەوە بوو. هەر کە منیان دیت، لەجیاتی ئەوەی کە بڵێن وەرە نانی بخۆ، چاویان زەق و، زاری پڕ لە نانیان وەک زاری حوشتری کردەوە و ماوەیەک تێم ڕامان و لێم خێس بوونەوە. بابم کە نانەکەی دە لاگووپێکیدا بوو، وەدەنگ هات و بە پڵتەپڵت گوتی: ئەو کاڵەیە چییە؟ لە کوێت بوو؟

منیش باش بۆم گێڕایەوە کە لە کوڕێکی لەخۆم گەورەترم دا، دە ڕۆستم نەهات، دوو-سێ ئاغا ڕاستیان کردمەوە، یەکیان بردمی کاڵەی بۆ کڕیم و چەند شایی دامێ و گوتیشی گەر هەتیو بای، دەمکردی بە کوڕی خۆم. زڕدایکم وەجواب هات و گوتی:

- درۆ دەکات. داخوا لە کوێی دزیوە.

متەقیان نەهاتەوە تا نانیان خوارد. ئینجا بابم وەپێشخۆی دام بۆ دوکانی کاڵەفرۆشی تا بزانێ ڕاست دەکەم یا کاڵەکەم دزیوە؟ هەموو شتێکی لە کاڵەفرۆش پرسی و ئەویش چۆنیەتی ڕووداوەکەی بە تێر و تەسەلی بۆ بابم گێڕایەوە. تەنانەت دەگەڵ قسەکانی من مووی لانەدەدا. ئەوجار زانی کە درۆم پێی‌نەگوتووە ناردمێوە بۆ ماڵ. کە چوومەوە نەقڵەکەم بۆ زڕدایکم گێڕایەوە، وا دەکات:

- دەک تێر عەمر نەبی ئەرێوەڵڵا. جا ئەوە لە ئێستاوە ئاوا بی، گەورە بی دەبێ چۆن بی؟!

ئێستا زەمانی جاران نەماوە. لەخۆم ڕا دەبینم چەنەوەڕی دەگەڵ بکەمەوە. نەمکردە نامەردی و پێمگوت:

- کوڕت تێر عەمر نەبێ.

ڕاست بۆوە تا تێمهەڵدات، بەڵام گورج لە چنگی دەرپەڕیم و هەڵاتم بۆ دەرەوە. تا شەو ڕانەکشا، نەهاتمەوە ماڵ. کە وەژوور کەوتم دیار بوو بابمی باش دنە داوە. ئەویش بڕێکی گوێچکە کێشام و دوو شەپەڵاغەی عەنتیکەی تێسرەواندم و هەڕەشەی لێکردم کە:

— جارێکی دی چەنەوەری دەگەڵ دایکت بکەی، هەردووک چاوت هەڵدەکۆڵم.

---

[1] لەو سەردەمدا پارەی فەرمیی ئێران (دینار) بوو کە هەر پەنجا دینار، دە (شایی) دەهاتە ئەژماردن. هەر بیست (شایی)ـش یەک (قڕان) بوو. بە فارسی پێیدەگووترێ (شاهی)

## هاتنی لەشکری عوسمانی و دواکەوتوویی خەڵکەکەمان



وێنەی سەیفەدین خانی سەردار کە عەلی خان والی گرتوویەتی.

ئەوە شەڕی عڕووس و عوسمانیانە[1]. هێشتا ڕووس نەهاتوون بۆ کوردوستان. لەشکری تورکان سی-چل کەس لە سابڵاغ بوون[2]. نێوی گەورەکەیان «سمایل ئەفەندی» بوو. هەموویان مسیی سووری گوڵینگەداریان لەسەر بوو.

ڕۆژی جومعان بۆ نوێژی جومعە بە مەشقی سەربازی دەهاتنە مزگەوتی سوور. عالەمی ئەو شارە وەک پەنجەی دەستان دەهاتن بۆ زیارەتی ئەو تورکانە. زۆر کەسی وا بوو زیارەتی دەستگیر نەدەبوو، بە هەناسەساردی دەڕۆیشتەوە ماڵ وەک بڵێی دونیا کۆتایی پێهاتبێت. من لە بابم بیستووە کە دەیگوت:

— «سوڵتان ڕەشاد»،[3] شای تورکان لەسەر بەرماڵی پێغەمبەر دانیشتووە.

ماڵتە، وای باس دەکرد دەتگوت بۆخۆی دەگەڵ سوڵتان ڕەشادی بووە. دوای دوو-سێ مانگان لەشکری ڕووسانیش هاتنە سابڵاغ، بەڵام خۆیان دە یەکتر

---

[1] لە نێوان دوو زلهێزی زەمەنی خۆی، واتە قەیسەری ڕووس و سوڵتانی عوسمانی، لە سەدەی پانزدەهەمەوە ناوبەناو شەڕ ڕوویداوە و لێکیان مڕاندووە و گەلانی بندەستیان بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان چەوساندۆتەوە و بەکوشتیان داون. ئەو ڕووداوانەی کە کاپیتان باسیان دەکات پەیوەستن بە مانگ و ڕۆژەکانی هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی کە سەرەتای ساڵی ١٩١٤ دەستی پێکرد، بەڵام عوسمانییەکان تا پاییزی ئەو ساڵە نەهاتنە ناو شەڕەکەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: زبدە تاریخ کرد و کردستان - نووسینی محەممەد ئەمین زەکی بەگ - وەرگێڕان بۆ فارسی: یدلله روشن اردلان - ل: ١٨٨، ١٨٩ هەروەها کتێبی کارەساتی مێژوویی (کوشتاری خەڵکی کورد بە دەستی سپای ڕووسی تزاری) نووسینی: عەزیز وەلیانی.

[2] ئەو دەستەیە لە لەشکری عوسمانیان لە نوامبری ساڵی ١٩١٤ هاتنە سابڵاغ. بەو پێیە تەمەنی کاپیتان لە ٦ ساڵە.

[3] "محمدعلی" کوڕی خەڵیفە عەبدولمەجیدی یەکەم، ناسراو بە "محەممەدی پێنجەم" یان "محەممەد رشاد"، لە ساڵانی ١٨٤٤ تا ١٩١٨ ژیاوە، یەکێکە لە خەلیفەکانی عوسمانی، دوای لابردنی براکەی "عەبدولحەمید"ی دووهەم کار و باری دەوڵەتی عوسمانی بەدەستەوە گرت و دە تەمەنی ٧٤ ساڵیدا کۆچیدوایی کردووە. سەرچاوە: مێژووی دەوڵەتی عوسمانی - محەممەد فەرید بەگ.

نەدەگەیاند. پاشی یەک-دوو مانگی تر هەر دوو لەشکر ون بوون.[1] بەینێکی تێوەرسووڕا تا لەشکرێکی تورکان سەرلەنوێ هاتەوە سابڵاغ. ئەوجار گەورەکەیان ناوی «عومەر ناجی بەگ»[2] بوو.



کۆنسوولی ڕووسیەی تێزاری لە ساباڵغ
(ئالێکساندێر ئیڤانۆڤیچ ئیاس)
(*Alexander Ivanovitch Iyas*)

ئێستا لە ساباڵغ جێ قوونی خۆش نەکردبوو کە، ژنێکی ساباڵغی هێنا. «دولبەری ... »یان پێدەگوت، دایکی «... خان»ی. «عومەر ناجی بەگ» چەند ڕۆژێکی خۆش دەگەڵ بووک ڕایبوارد و ئامادە نەبوو چاوی بە کەس بکەوێ تا تێر بوو. ئەوسا لەشکرێکی لە خەڵکی ساباڵغ کۆ کردەوە کە بەشی هەرە زۆری خۆبەخش بوون. خۆشییان دە دڵیدا دەگەڕا کە دەچن بۆ خەزایە. پێیان وابوو بێتوو بکوژرێن ئەوە شەهیدن و نەشکوژرێن، ئەوە بەشداری خەزایان کردووە و فەرزی ئیسلامیان بەجێ گەیاندووە. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو کە ئەو شێخ و مێخەی ئێران و عێراق هەمووی دەشار خزاون و خۆیان مەڵاس داوە و هەرچی ئەو تورکانە بیڵێن ئەوانیش وەباڵیان بۆ دەکێشن و خەڵکیان بۆ هاندەدەن بۆ خەزایە. دەبوایە هەموویان هاتبانە مزگەوت و گوێیان بۆ قسەکانی تورکەکان هەڵخستبایە. ئەوەی نەهاتبا و گوێی بۆ قسەکانیان هەڵنەخستبا، لە داریان دەدا. شێخ بابا[3] نەهات، داری

---

[1] بڕوانە: زبدە تاریخ کرد و کردستان - نووسینی محەممەد ئەمین زەکی بەگ - وەرگێران بۆ فارسی: یدلله روشن اردلان - ل: ١٨٨

[2] لەسەر ئەو کوردکوژە بڕوانە بەشی پەڕاوێزەکانی ئەو کتێبە لە لاپەڕەی ٤١٢

[3] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر شێخ بابای نەمر بڕوانە وەرزی پەڕاوێزەکانی ئەم کتێبە لە لاپەڕەی ٤١٧ دا.

قەنارەیان بۆ هەڵبەست و کوشتیان. سەیفەدین خان، سەرداری بۆکان[1] نەهات و گوێی بۆ شل نەکردن و لە داریان دا.

شەو کە دەنووستین و بەیانی ڕۆژ دەبۆوە، دەتدیت چەند کەس بە تاوانی ئەوەی کە نەیویستووە بچێتە مزگەوت و گوێیان بۆ شڵ بکات یان نەیویستووە بچێتە خەزایە، لە مەیدان سەریان بە دارەوە هەڵاوەسراوە.

دوو خزمی ئێمە کە هەردووک برا بوون و زۆر دەهاتنە ماڵمان، ئەوانیش لەدار دران[2]. زۆر کەس هەبوون کە ڕایان دەکرد و خۆیان دەشاردەوە تا وەدەست تورکان نەکەون.

وا بوو کە ئەو لەشکرە سابڵاغی چۆل کرد و نەما. ئەوجار لەشکرێک هاتن کە گەورەکەیان ناوی «سیدقی ئەفەندی» بوو. ئەویش بە هەمان شێوە کەسێکی بێبەزە و دڕ بوو. سەیر دەوەدا بوو کە «سیدقی ئەفەندی» و لەشکرەکەی زۆر خێراتر بوون بۆ ڕەشبگیری و تێکوەرپێچانی ئەو خەڵکە بۆ خەزایە. کاریان بە گەورە و بچووک و پیر و پەککەوتە نەبوو، هەرکەسێک گیری کەوتبا تفەنگیان دەدایە و بەڕێ دەکرا بۆ خەزایە. ئەوەی گوتبای لەل، لە جێوە لە سێدارە دەدرا.

---

١ سیف‌الدین خان حاکمی سەقز بوو و هەروەها "محەممەد حوسین خانی سەردار" حاکمی سابڵاخ کوڕی سەیفەددین خانی سەردار و نەوەی عەزیزخانی سەرداری گشتیی کە ئەوکات حاکمی سابڵاغ و بۆکان و سەردەشت بووە. هاوکات دەگەڵ محەممەد خان حاکمی بانە و شێخ بابای غەوسابات لەلایەن لەشکری تورکان لەسێدارە دران چونکە ئامادە نەبوون ملکەچی فتوای جیهادی خەلیفەی عوسمانییەکان بن. بڕوانە:

١) زبده تاریخ کرد و کردستان – نووسینی محەممەد ئەمین زەکی بەگ – وەرگێڕان بۆ فارسی: یدلله روشن اردلان – ل:١٩٠

٢) نگاهی به تاریخ مهاباد، نووسینی سید محمد صمدی، ل: ، ٨٠،، ٨١، ١٤٣

٣) ساوجبلاغ مکری (مهاباد در آینیه اسناد تاریخی) نووسینی: فریدون حکیمزاده، ل: ٣٦

٢ بەڵگە و سەرچاوەکان لە مێژووی ئەو سەردەمەدا کەم دەست دەکەون کە بە وردەکارییەوە باس لەو ڕووداوانە بکەن. بۆ زانیاری زیاتر دەتوانن سەردانی ئەو سەرچاوانە بکەن:

١) کتێبی (ایرانی که من میشناختم - ئێرانێکی کە من دەیناسم) نووسینی (بازیل نیکیتین یان باسیلی نیکیتین)

٢) (نگاهی به تاریخ مەهاباد) نووسینی (سەید محمد صمدی) لە لاپەڕەی ٧٨ ڕا.

٣) کارەساتی مێژوویی (کوشتاری خەڵکی کورد بە دەستی سپای ڕووسی تزاری) نووسینی: عەزیز وەلیانی

٤) کۆمەڵناسی کوردەواری، دوکتور حوسێن خەلیقی - بەرگی یەکەم - چاپخانەی الحوادیث - بەغدا - ساڵی ١٩٩٢ - لاپەڕەی ١٨٦

٥) کێشەی کورد ١٨٩٦-١٩١٧ نووسینی م.س لازاریف. لە وەرگێڕانی دوکتور کاوس قەفتان


قازی فەتاح و کوڕەکەی میرزا عەبدولڕەحمان ناسراو بە سالار موکری،

خۆش ئەو شێخانە بوون کە دە سابڵاغێ خزابوون. لە سێبەری خزمەت بە ئەفەندییەکانی تورک و لەسەر حیسابی خوێنی خەڵک، هەرکەسە و لە ماڵ و خانەقای خۆی بە ئیشتیا پاڵیان دابۆوە و پلاو و خۆراکی چەور و بەلەزەتیان ڕۆژانە لە ماڵە موریدان ڕا بە پیاڵە و قاپ و مجۆعمە بۆ دەهات. بابم «سۆفی» شێخی تەوێڵە بوو. ڕۆژ و شەو وەماڵێ نەدەکەوتەوە. بە قسەی خۆی خزمەتی خانەقایەی دەکرد. لە پێشخانەی خانەقایە کەوشی جووت دەکرد، ئاگای لە کەوشان بوو. بە چاوی بەستراو پێڵاوی گشت ئەو کەسانەی دەناسی کە هاتوچۆی ئەو خانەقایەیان دەکرد.

جارجار کە دەهاتەوە ماڵ دە شووشەدا ئاوی دەستنوێژی شێخی دەهێنایەوە. بە کەوچک دەیدا بە ئێمە دەمانخواردەوە. جیرانەکان دەهاتن، دەپاڕانەوە و دەلاڵانەوە بۆ تۆزێک لەو ئاوە. مرۆڤ بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە. زڕدایکم ئەوەی خۆشی لێبهاتبایە کەمێکی دەدایە و ئەوەی چاری نەویستبایە، بێبەشی دەکرد و نەیدەدایە. جا لە شێخەکانی سابڵاغێ سەیرتر و عەجایبتر، سۆفی و موریدەکانیان بوون. منداڵ بووم، بابم جارجار منی دەگەڵ خۆی دەبرد بۆ خانەقا و مزگەوتان تا منیش دەستەمۆی شێخان بکات بەڵکوو گەورە بم و ڕێبازی ئەو بگرمە بەر. گوێم لە قسەوباس و درۆ و دەلەسەی ئەو سۆفییانە شل دەکرد کە هەرکەسە و تاریفی شێخی خۆی دەکرد. درۆی وایان دەکرد نەبێتەوە. یەک دەیگوت: شێخی من گوللە تۆپ بە دەست دەگرێتەوە. ئەویدی دەیگوت: جا شێخی منت نەدیوە، خودا نەکا خەنجەر هەڵکێشێ، هەر دەست بۆ خەنجەر بەرێ لەشکری کافران بە هاوار و ڕۆڕۆ مەیدان چۆڵ دەکەن. ئەویتر درۆیەکی دی دەکرد. وەک باسم کرد، بابم موریدی شێخی تەوێڵە بوو و ئەویش تاریفی شێخی خۆی ئاوا دەکرد:

- شێخی تەوێڵە لە کاتی شەردا، دەست و لاقی کافران ڕەق دەکات.

سەرتان نەهێشێنم یەک شەڕە درۆ بوو نەبێتەوە، درۆکانیان وەک کێچی بە دیوارەوە هەڵدەچوون.



وێنەیەکی دەگمەن لە شاری ساباڵغ کە کێوی داشاماجید و ئاڵای عوسمانییەکان لەسەر شابەندەرخانەی عوسمانی بە جوانی دیارە. ئەو وێنەیە لە ساڵی ١٩٠٦ گیراوە و لە لاپەڕەی بەڕێز ڕومیک سارکیسیان وەرگیراوە.

## کۆمەڵکوژکردنی خەڵکی سابڵاغ لەلایەن سوپای ڕووسیەی تیزارییەوە (١٩١٦)

هەر ئەو شێخانە کە لە سابڵاغ بوون بە فیتی تورکان چەند نەفەریان فێر کردبوون کە بچن سەری قونسووری[١] ڕووسان[٢] لە سابڵاغ ببڕن[٣] و ماڵ و منداڵی ئەتک بکەن. سەرە بڕاوەکەشیان هێنابوو بۆ مەیدانی مەنگوڕان و بە شەق تۆپتۆپێنیان پێ دەکرد. وەنەبێ هەر منداڵەورکە کایەی پێ بکەن، پیاوی گەورە، پیر و جحێڵ شەقشەقێنیان پێدەکرد. تەنانەت منیش دەو تۆپتۆپێنەدا بووم و وێڕای عالەمێ وەدوای ئەو کەللەسەرە دەکەوتم تا شەقێکی لێدەم. منداڵ بووم و هیچم نەدەزانی. خۆ عاقڵی ئێستام نەبوو. وامدەزانی چونکی ئەو پیاوە گەورانە ئەو کارە دەکەن، کەواتە دەبێ منیش لاسایان بکەمەوە. پیاوی ڕیش سپی کە ڕیشی گەزێک درێژ بوو لەو سەر بۆ ئەو سەری مەیدانێ غاری دەدا تا شەقێک لەو سەرەبڕاوە هەڵبدات چونکە شێخەکان فتوای خەزایان دابوو و دەیانویست لەو خەزایە بەو چەشنە خێرێکیان پێبگات. هێندەی پێنەچوو بوو بە زستان و جێژنی مەولوود. بەفر لە نێوقەدە و لە هەموو ماڵان پڵاو لەسەر ئاورگە، بۆن و بەرامەی لە شار گەڕاوە و خۆشیمان دە دڵی دایە کە پڵاو دەخۆین. بۆ چما لەشکری ڕووسان وەسەر نەگەڕان! پەلاماری شاریان دا و شار گیرا. «قازی فەتاح»[٤] ماڵی لە قەراخ شار بوو. خۆی و چەند کەس لە پیاوەکانی تەقەیان لە ڕووسان دەکرد، یانی خەزایان دەکرد. زوو کوژران. ڕووس هاتن دە شارەوە. بەفر زۆر بوو کەس نەیتوانی هەڵێت و دەرباز بێت. سێ شەو و ڕۆژ کوشتار کرا. بەزەییان بە سەگ و پشیلەش نەدەهات. کەس بە کەسی نەدەزانی کە بە شیر لەسەریان دەدان. ئی وا هەبوو سەری دەپەڕی، ئیواش هەبوو یەک ڕەگی دەما و نەدەپەڕی. ئێمە خەڵکی ئەو گەڕەکە جیرانێکی عەجەممان

---

[١] مەبەستی کاپیتان حەمەد کۆنسوول/Consul ـە. لە هەموو نووسینەکانیدا هەر وای نووسیوە. کە هەوڵ دەدەم ئەو وشەیە لە درێژەی نووسینەکاندا وەک وشەی ماکی خۆی و بە درووستی بنووسمەوە

[٢] ئەو کۆنسوولە کەسێک بوو بەناوی (Iyas, Alexander Ivanovitch ١٨٦٩-١٩١٤) ئالێکساندێر ئیڤانۆڤیچ ئیاس کە بە (کۆلۆنێل ئیاس) ناسراوە. بڕوانە لاپەڕەی ٤١٥ لە بەشی پەراوێزەکانی ئەم کتێبە.

[٣] لەپاش تێپەڕینی سەدەیەک بەسەر ئەو ڕووداوەدا سەرەداوەکان گومان دەخەنە سەر کورد کە کۆنسوولی ڕووسەکانیان کوشتبێ. کاپیتانیش لە ژێر کاریگەری دۆخی ئەوکاتدا وا تێگەیوە. بڕوانە ل: ٤١٦

[٤] قازی فەتاح برابچووکی باپیری پێشەوا "قازی محەممەد"ـە، لە شەڕێکی نابەرانبەردا دەگەڵ لەشکری ڕووسی تزاری لە ڕۆژی جێژنی مەولودی لە ١٢ی ربیعالاول ساڵی ١٣٣٤ی مانگیی و ١٢٩٤ی هەتاوی و (١٩١٦/١/١٨) زایینی گیانی دانا. بە پێ ئەو ڕێکەوتە کاپیتان تەمەنی ٧ ساڵانەیە کە ئەو کۆمەڵکوژییە کراوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕواننە کتێبی: ١)- کورتە مێژووی بنەماڵەی قازی لەویلایەتی موکری - نووسینی: خەلیلی فەتاحی قازی - وەرگێڕ و ئامادەکار: حەسەنی قازی ل: ٦٧. ٢)- ساوجبلاغ مکری (مهاباد در آینیه اسناد تاریخی) نووسینی: فریدون حکیمزادە، ل: ٧٣ ٣)- کێشەی کورد (١٨٩٦ - ١٩١٧) نووسینی: م. س. لازاریڤ وەرگێڕانی د. کاوس قەفتان- بەشی دووەم-لاپەڕە: ٥٦٢، ٥٦٩، ٥٨٠ ٤)- کارەساتی مێژوویی (کوشتاری خەڵکی کورد بە دەستی سپای ڕووسی تزاری) نووسینی: عەزیز وەلیانی - لاپەڕەی ١٩١



هەبوو. پەنامان بۆ ئەو ماڵە بردبوو. ئەو عەجەمە دۆستی بابم بوو. سەری چوار ڕۆژەی بەیانی زوو، دەستێک قازاخی[1] ڕیشدرێژ لێمان وەژوور کەوتن. ئەوەی مووی لێهاتبوو پیلیان دەگرت. بە دوو قازاخان یەک لە ڕاست و یەک لە چەپەوە هەریەکە شیرێکیان لەپشت ملی دەدا، ئیوا بوو سەری دەپەڕی، سەرەکە دەکەوتە عەرزێ و چەند دەقیقان زاری لێکدەنا و ئاواڵەی دەکردەوە، قالبەکەشی جینگڵی دەدا وەک مریشکی چۆن سەری دەبڕن، بەدەنی وا هەبوو بستێک وەحەوا دەکەوت. ئی وا هەبوو زرزڕ تری دەکەند. ئیواش بوو یەک-دوو ڕەگی دەمان و دەکەوتن و دە خوێنی خۆیان دەگەوزان. ئەو ماڵەی ئێمەی لێبووین، ئەو عالەمەیان لە حەسارەکەی دەکوشتن لەپێش چاوی ئێمە. ئەوەی ژن و کچی جوانی هەبوو پیلیان دەگرتن و دەیانبردنە ژوورێکەوە و ئەتکیان دەکردن. لانیکەم چوارسەت کەس لەو ماڵە کوژران. تەنیا بنەماڵەی سێ کەس قوتاریان بوو. یەکیان «محەممەد

---

[1] لە ئەسڵدا ئەو وشەیە "کازاک"ـە کە نابێ دەگەڵ "قەزاق" کە زیاتر بە خەڵکی لای قەزاقستان دەگوترێ، لێمان تێکچێ. لە موکریان بە قازاخ ناویان دەهێنان. کازاک ناوی تایفەیەکی گەورە و شەڕکەرە کە ژینگەیان لە لای چۆمی (دۆن) لە ئوکراین بووە. ئەوانە لەبەر ئازابوون و دڕبوونیان لە شەڕدا ناوباگیان هەبوو و لە داگیرکارییەکانی تێزاری ڕووسدا خزمەتێکی زۆریان پێکرد. کاتێک ناسرەددین شای قاجار لە سەفەرێکی خۆیدا بۆ ئورووپا کە بە خاکی ڕووسیەیدا دەچێ، دەبینێت کە لە ڕووسیە وەها سەربازێک هەن، داوا لە دەوڵەتی ڕووسیەی تێزاری دەکات کە تابوورێکی ئاوای بۆ پەروەردە بکات. ئەوانیش دەستەیەک ئەفسەری خۆیان دەنێرن تا ڕاهێنان بە پیاوەکانی ناسرەددین شا بکەن. ئیتر لەوکاتەوە بە سەربازەکانی زەمانی قاجاریشیان دەگوت (قەزاق یا کازاخ). هەڵبەت فەرماندەی کازاخەکانی قاجار هەمیشە ڕووس بووە و ڕاستەوخۆ لەلایەن تێزاری ڕووسەوە دەستنیشان کراوە. **بەدوور نییە** کە ئەو کازاخانەی ناسرەددین شاش، کە فەرماندەکانیان ڕووس بوون، لەو ڕەشەکوژییەدا دەستیان هەبووبێ.

سەقزی»، دووهەمیان «ئەسەدی قاسمە لاڵی»، سێهەمیان بابم. ئەو عەجەمەی خاوەن ماڵەکە بە قازاخەکانی گوتبوو کە ئەوانە عەجەمن و ئەوانیش عەجەمیان نەدەکوشتن تەنیا بۆ تۆڵەکردنەوە لە کوردان هاتبوون. ئاخر کورد سەری کۆنسوولی ڕووسیان گۆشاوگۆش بڕیبوو نەک عەجەمەکان. ئەو سێ ماڵەمان کە مابووینەوە نەماندەزانی گەر ئەو چەند ڕووسە بڕۆن و دەستەیەک ڕووسی دیکە بێنەوە چیمان بەسەر دێتەوە؟ ناچار بابم زۆر لەبەر ڕووسەکان پاڕایەوە کە بمانباتە ماڵی ئەمریکاییەکان.[1] ڕووسەکە بەزەیی پێمان داهات و دەگەڵ خۆی بردینی بۆ ماڵە ئەمریکاییەکان.

لە ڕێگایە بەسەر کەلاکاندا دەڕۆیشتین. لە هەموو گەڕەکێک وەک گیشەگیا، کەلاک لە گیشە دراوە. خوێن جۆگەی بەستبوو و ئێستا بە تەواوی وشک نەببو. کە گەیشتینە مزگەوتی شادەرۆیشی دیتمان کە کەلاکێکی زۆر لە گیشە دراون.

من نەمدەزانی بەڵام بابم دەیگوت کوردی عێراق و تورکییەن.[2] ڕووسەکە بردینی دە ماڵی ئەمریکاییەکانی هاویشتین و بۆخۆی گەڕایەوە. کە چووینە ژوورێ چ ببینین؟ هەر عالەمە و لەسەر

---

[1] لە ساڵی ١٩١٠ی زایینی لەلایەن دوکتور ( L.O Fossum)ـی ئەمریکایی کۆمەڵەیەک ساز دەکرێ بۆ یارمەتیدانی خەڵکی داماوی کوردستان و لە بواری پزیشکی و پێویستییە مرۆڤییەکان خۆبەخشانە خزمەت پێشکەشی گەلی کورد دەکەن. ئەو کۆمەڵەیە بەناوی (کۆمەڵەی لوتێری میسیۆنی ڕۆژهەڵات) دەناسرێت و ناوەندەکەی لە ئامریکا بوو. ئەو میسونێرانە لە ساڵی ١٩١٠ لە مەهاباد و شار و گوندەکانی دەوروپشتی ئەو شارە خزمەتیان دەکرد و نەخۆشخانە و خوێندنگەیان بونیات نا. ئەو ماڵەی کە کاپیتان باسی دەکات، دەکەوێتە پشتی مزگەوتی سەید نیزام کە پاشان بوو بە خوێندنگەی (پهلوی - ابن سینا) کە خەڵکی سابڵاغ پێیاندەگوت (شابەندەر). ئەو کۆمەڵەیە تا ساڵی ١٩٣٦ درێژەی بە کارەکانی خۆیان دا. میسونێرەکان بەردەوام دەگەڵ ناوەندەکەیان لە ئەمریکا لە پێوەندی دابوون و گشت کار و چالاکییەکانیان لە کۆی گۆڤارێک بەناوی *"The Kurdistan Missionary."*چاپ و بڵاو دەکرایەوە کە هەڵگری مێژوویەکی سەربەمۆری گەلەکەمانە. بڕوانە: ساوجبلاغ مکری (مهاباد در آینیه اسناد تاریخی) نووسینی: فریدون حکیمزادە، ل: ١١٠ هەروەها کتێبی: کارەساتی مێژوویی (کوشتاری خەڵکی کورد بە دەستی سپای رووسی تزاری) نووسینی: عەزیز وەلیانی - لاپەڕەی ٨٠ - کتێبی: خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو، نووسینی: دکتر قادر محمودزادە (آسو) ل: ١٦،١٧،١٨

[2] بەپێی بەڵگەکان، شێخولئیسلامی ئیستانبوڵ لە کاتی خەلافەتی سوڵتان محەممەد ڕەشادی تورک لە ڕێکەوتی ١٩١٤/١١/٢٣ فەرمانی جیهادی دەرکرد. [کتێبی "کورد و عەجەم" نووسینی نەوشیروان- ل:٢٤٤] هەروەها [کتێبی "کێشەی کورد"( ١٨٩٦-١٩١٧) نووسینی: م.س لازاریف. لە وەرگێڕانی دوکتور کاوس قەفتان ل: ٦٣٩] یان [نگاهی بە تاریخ مهاباد، نووسینی سید محمد صمدی، ل: ١٤٢] لەشکری عوسمانی لەژێر دروشمی جیهاد بۆ ئیسلام هەستی ئایینی گەلی کوردی بۆلای خۆی ڕادەکێشا و بەو هۆیەوە زۆربەی شەرکەرەکانی لە کورد بوون. تەنانەت لەو کوردانە لە شەڕی "قەفقاز"،"بەسرە"،"کوت"، "عەممارە" و "باڵکان"یشدا کەڵکیان لێوەرگیراوە. بۆ جەبهەی مێزۆپۆتامیا و ئێران زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی لەشکری تورکەکان کورد بوون کە بەشی گەورەیان لە کوردانی باکوری کوردستان و بەشێکی تریان لە کوردەکانی باشووری کوردستان بەتایبەتی لە عەشیرەتی "دزەیی" پێکهاتبوون. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش بە فیتی شێخ و مەلاکان خەڵکێکی زۆر دەگەڵیان کەوتن. بڕوانە بەشێک لە نووسراوەکای میسونێر {لودویگ (لویس) ئولسن فاسوم} کە لە ژمارەی ١١ی ساڵی ٦ی " کوردستان میشنێری" دا، لە ئووتی ١٩١٥ بڵاو کراوەتەوە.

یەکتر دانیشتوون. یەک بست جێ گیر ناکەوێ. وەتاغەکان هەموو پڕە لە حەشیمەت. بە هەزار حاڵ لە وەتاغێک جێ قوونی خۆمان کردەوە. یەکجار زۆر گەرم بوو. نازانم لە کوێڕا کتێب و کاخەزیان دەهێنا دە کورەیان دەهاویشت و دەیانسوتاند. شەوانە خەڵک لەسەر قوون دەنووستن. جێی ڕاکشان نەبوو. پاش چەند ڕۆژان جارچی جاری کێشا کە:

- بە ئەمری ژڕەناڵ[1] «زاخاڕۆف»ـی عەفوی عمومی دەرکراوە. هەرکەس خۆی شاردۆتەوە وەدەرکەوێ.

ئەو شوێنەی ئێمەی لێبووین، کەس وەدەر نەکەوت بەڵام لە شوێنەکانی تر ئەوەی خۆی وەدەستەوە دابوو هەمووی گیران و بردیانن لە مێشەی«کورتان»ـی وەبەر ڕەشاشیان دان و هەموویان کوشتن. لانیکەم ٣٠-٤٠ هەزار کەس لە کوردەکانی ناو شار و دەوروبەری شار کوژران.[2]

خەڵک بە فیت و فتوای شێخەکان سەری کۆنسوولی ڕووسیان گۆشاوگۆش بڕی[3] و لە مەیدانی مەنگوڕان تۆپەڕاکردنیان پێدەکرد، ئاخر بە فتوای ئەو شێخانە ئەوە خەزایە دەکەن، کەچی لەو خەزایەدا و لەو شەڕ و کوشتارەدا تەنانەت یەک شێخ کەپۆی لە خوێن نەهات و شەهید نەبوو، بگرە هەموو غەیب بوون. ئێستاش کەس نەیزانی ئەو شێخانە لە کوێ خۆیان شاردەوە.

کە تاق و لۆق ئەو کوردانەی خەزایان دەکرد و دەگەڵ ڕووسەکان شەڕیان دەکرد، هاتبا و ڕووسەکانیان کوشتبا، ک... کەلاکی ڕووسەکانیان دەبڕی و دە زاریان دەنان. شێخەکان فتوایان دابوو کە هیچتان بۆ نەکرا، تف بکەنە ناوچاوانی ڕووسەکان، ئەویش هەر خەزایە.

سەیر لەوە دایە، لە گەرمەی ئەو خەزایەدا کە شێخەکان ببونە داردەستی ئەفەندییە تورکەکانیان و خەڵکیان بۆ هاندەدان تا خەزایە بۆ تورکان بکەن، یەک دەنکیان دیار نەبوو کە گوللە تۆپێک بەدەستی بگرێتەوە یا لاق و دەستی ئەو ڕووسە کافرانە لە شەڕدا ڕەق بکات. کەس نەیدەزانی لە کام کوونەمشکێک دان. هەر بۆ دەرمان شێخێکت نەدەدیت کە بێت و دەست بۆ خەنجەر بەرێت تا ئەو ڕووسانە بە هاوار و ڕۆڕۆ هەڵێن و لەوە زیاتر خەڵک نەکوژن. ئەوهەموو عالەمەیان بە قڕکردن دا و بۆخۆیان کەپۆیان لە خوێن نەهات. خۆزگە ئەو ئاکارانەی من لە هەندێک لەو شێخانەم دیتووە، کەس نەیبینێت. دەردی سەردەردان ئەو خەڵکە ساکار و دڵپاکەی خۆمانە کە وا باوەڕیان پێدەکەن. بڵێی ڕۆژێک بێت کە ئەو خەڵکە چاویان بکرێتەوە و چیتر فریوی ئەوانە نەخۆن؟

---

[1] کاپیتان مەبەستی ژێنێراڵ/ General ـە کە بەو چەشنەی نووسیوە، هەوڵ دەدەم لەمەوڵا ئەو وشەیە بە دروستی بنووسمەوە.

[2] ئەو ڕێژەیە کە کاپیتان باسی دەکات دەگەڵ ئەو ڕێژەیەی لە بەڵگەکاندا هاتووە جیاوازی زۆرە. بەڵگەکان ئاماژە بە ٧ یا ٩ یا ١٠ هەزار کەس دەکەن.

[3] لەپاش تێپەڕینی سەدەیەک بەسەر ئەو ڕووداوەدا سەرەداوەکان گومان دەخەنە سەر کورد کە کۆنسوولی ڕووسەکانیان کوشتبێ. کاپیتانیش لە ژێر کاریگەری دۆخی ئەوکاتدا وا تێگەیوە. بڕوانە ل: ٤١٦

نامهەوێ لێرەدا لە باسی کوشتاری عەرووسان لابدەم بەڵام ڕەوشت و ئاکاری بەشێک لەو شێخانە شتێکی تری بیر هێنامەوە کە پێم حەیفە لێرەدا باسی نەکەم. ئەوە من قاچاغم، دەوڵەتی ئێرانێ کون‌بەکون بەشوێنمەوە، منیش ناوێکی دیکەم لەسەر خۆم ناوە و وەک باغەوان لە دێیەک کار دەکەم.[1] شێخێک لەو دێیە بوو. ئاوێک لە شاخی ڕا شۆڕدەبۆوە بۆ ناو دێ و وایان ڕێگا بۆ خۆش کردبوو کە دەهاتە ناو حەوزێکەوە. ئاوەکەی یەکجار سارد و خۆش بوو. خەڵکیش دەهاتن لە ئاوی ئەو حەوزەی دەستنوێژیان هەڵدەگرت. خۆم گوێم لێبوو کە شێخ وادەکات:

- شێخی گەورە فەرمووی ئەو ئاوە سەرچاوەی لە بەهەشتێیە.

با ئەوەشتان بۆ بگێڕمەوە. گەر لەبیرتان بێ باسی ئەوەم کرد کە لەشکرێکی تورکان هات کە گەورەکەیان ناوی «سیتقی ئەفەندی»[2] بوو. پاشی ئەو، لەشکرێکی دی هات کە گەورەکەیان ناوی «ئەرکان ئەفەندی» بوو کە خۆی لە تورکمانەکانی کەرکوکێ بوو. لەشکرەکەی هەموو کوردی تورکیە و کوردی عێراق بوون. لە سابڵاغ و دەوروبەریشی لەشکرێکی یەکجار زۆری کۆ کردەوە.[3] ئەوجار یەکسەر ڕێگای داگرت بۆ تەورێز تا ئەو شارە بگرێ. یەک دوو ڕۆژی پێدەچێ کە عەجەمان لێی وەخۆ دەکەون. ڕایان دەماڵن تا دەیانهێننە باتڵاقی بناوێ. دەو باتڵاقەدا تاقیان لێدەبڕن. لانیکەم ٤٠٠-٥٠٠ کەس سابڵاغی بە فیتی بەشێکی زۆر لەو شێخانە بەشداری ئەو شەڕە بوون کە هەمووی دەو باتڵاقەدا خنکان و تێداچوون. تاق‌ولۆق قوتاریان ببوو کە دەگەڵ ئەرکان گەڕانەوە بۆ سابڵاغ. خۆم چووم بۆ تەماشایان. هەر ١٠-١٢ کەس دەبوون. هەمووی بریندار و شەل و گێڕ. لە تەواوی ئەو لەشکرە گەورەیە تەنیا ئەو چەند کەسە ڕزگاریان ببوو، باقی تریان هەموو تێداچوون. بە قەولی ئەو شێخانە، هەمووی شەهید بوون و ڕۆحیان لە بەهەشتێیە.[4]، [5]،[6]

با زۆر لە باسەکە دوور نەکەوینەوە. یەک-دوو ڕۆژی تر تێپەڕی، بۆ جاری دووهەم جارکێش جاڕی

---

[1] کاپیتان پێش کۆماری کوردستان چەند جارێک قاچاغ بووە و دەوڵەتی ئێران بەدوایەوە بووە کە لە داهاتوودا باسیان دەکەین. بەتایبەت ئەوکاتەی کە لە ساڵی ١٣١٩ه بۆ شاری شیراز دوور دەخرێتەوە و لەوێڕا بە پێیان و لە ماوەی ٦ مانگاندا دەگەڕێتەوە سابڵاغ. تا ساڵی ١٣٢٠ه کە فڕۆکەکانی شۆرەوی سابڵاغیان بۆمباران کرد و کاربەدەستان و ئەڕتەشی ئێران خۆی بەدەستەوە دا و بناخەی حکومەت لەو شارە لاواز بوو، هەر بە قاچاغی ژیاوە. لە پاش تێکچوونی کۆماری کوردستانیش لە باشووری کوردستان بۆ ماوەی چەند ساڵان بە قاچاغی ژیا.

[2] بە ئەگەری زۆر دەبێ ناوی ئەو کەسە (سیدقی - صدقی یا Sidki ) بووبێ.

[3] زبده تاریخ کرد و کردستان – نووسینی: محەممەد ئەمین زەکی بەگ – وەرگێڕان بۆ فارسی: یدلله روشن اردلان – ل: ١٨٩ هەروەها کتێبی: "کێشەی کورد"( ١٨٩٦-١٩١٧) نووسینی: م.س لازاریف. لە وەرگێڕانی دوکتور کاوس قەفتان ل: ٥٧٩

[4] نگاهی به تاریخ مهاباد، نووسینی سید محمد صمدی، ل: ، ١٤٤،١٤٥

[5] https://ruwange.blogspot.com/

[6] کێشەی کورد ١٨٩٦-١٩١٧ نووسینی م.س لازاریف. لە وەرگێڕانی دوکتور کاوس قەفتان ل:٥٩٩



وێنەی ماڵی ئەمریکایەکان کە کاپیتان حەمەد باسی دەکات. وەک دەبینین کێوی "داشامەجید" لە پشتەوە دیارە. ئەو ماڵە بە وتەی کاک حەسەن قازی دەکەوێتە ڕاستەی شەقامی شێر و خورشیدی کۆن و پەنای ئیدارەی دارایی کە پاشان بوو بە خوێندنگای (محەممەد ڕەزا شا) کە خەڵکی سابڵاغ پێیاندەگوت (شابەندەرخانە) و بە گوێرەی کتێبی بیرەوەرییەکانی دوکتور ئاسۆ، دەکەوێتە پشتی مزگەوتی سەید نیزام کە پاشان بوو بە خوێندنگای (پهلوی - ابن سینا).

کێشا کە:

- بە ئەمری ژێنێراڵ «زاخاڕۆف»ـی عەفوی عمومی دەرکراوە. هەرکەس خۆی شاردۆتەوە وەدەرکەوێ.

ئەوسا تاقولۆق خەڵک وەدەر کەوتن. لە هەر گەڕەکەو چایخانەیەک و دوکانێک کرایەوە. وڵات هێوەر و ئارام بوویەوە. وردەوردە ئەوەی بۆی لوا بوو پەڕیوە ببێت یا خۆی حەشار بدات، پەیدا بوونەوە. دوکان و بازاڕ هێدی‌هێدی کرایەوە و خەڵک دەستی کرد بە کار و کاسبی. بابم لە گەڕەکی خۆمان دوکانێکی چووکەی کردەوە و ماست و پەنیری دەفرۆشت. وردەوردە شمەک و کەلوپەلی دیکەشی لێ زیاد کرد. دەگەڵ دوو ڕووسان کە عەمبارداری هۆردووی ڕووسان بوون، بوو بە دۆست. ئەوان شەوانە قەند، ماسی ویشک، دوو تەلیس ئارد چەلەنگێک ڕۆنی گوڵەبەڕۆژەیان بۆ دەهێنا و ئەویش پارەکەی دەدانێ و دەڕۆیشتن.

## ئەو سێ ساڵەی کە ڕووسەکان لە سابڵاغ بوون (١٩١٥-١٩١٧)

ئەوە منیش حاڵم هەر وەک جاران شڕە بەدەست زڕدایکمەوە، بگرە خراپتریشم. لێم دەدات، جنێوم پێدەدات، دەمبوغزێنێت، دەمشکێنێتەوە و لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەیە کە برسیم دەکات. هەزار چێشتی لێبنێ یا هەر خواردنێکی هەمانبێت، لێم دەشارێتەوە و نامداتێ. بەشی من هەر جەماوجەم بوو ئەویش نە تێر بە زگی خۆم. یانی قەت لە ژیانی خۆم نەمدی ئەو زڕدایکە نانم تێر بە زگی خۆم بداتێ. گەر گازندەم بردبا لای بابم، هیچ کە باوەڕی پێنەدەکردم، لەوانەش بوو یەک-دوو شەقیشم تێهەڵبدات و لەولاش زڕدایکم هێندەی دی لێم بەڕق دادەکەوت، بۆیە دەستم لە بابم شووشتبۆوە و قەت هیچم لای باس نەدەکرد.

ڕۆژێک تووشی «حەمەچەتر»ـی هاواڵم لە گەڕەکی «باغی سیسە»ـی هاتم. چاوم لێکرد توورەکەیەکی بە شانییەوە و سەتڵێکی بە دەستەوەیە. سەتڵەکە پڕە لە خواردن بەڵام سەری داپۆشیبوو. کە سەری سەتڵەکەم لادا، شتێک وەک هەرزنی وڵاتی خۆمان زەرد، پلەگۆشتی زلەزلەی دەنێودا بوون. حەمە یەک-دوو چنگی دامێ، خواردم. زۆر بەتام و خۆش بوو. لێمپرسی:

- ئەوەت لە کوێ گیر کەوتووە؟
- لە نێو هۆردووی ڕووسان. کەلوپەلی دەبەم بۆ فرۆشتن. ئەو سەتڵەش دەگەڵ خۆم دەبەم. کاتی فراوین و کاتی جەمی شەوێ کە چێشتیان لەبەر دەمێنێتەوە، سەتڵەکە دەبەمە ئاستی زنجەکان،[1] خۆیان دێن و بۆم دەو سەتڵە دەکەن. واتە ڕۆژێ دوو جار ئەو سەتڵە پڕ دەکەم لە نان و شیو و دەیبەمەوە ماڵێ. ئێدی لە ماڵەوە بابم پارە بە نان و پێخۆر نادات. بە حەمەم گوت:
- دەی کە وایە بڕێکی ترم لەو نان و شیوە بدەیە.

هەتا تێر بووم دایمێ. ڕازیشم کرد کە دەگەڵ خۆی ببات بۆ هۆردووی. گوتی:

- پاش بانگی نیوەڕۆیە وەرە کن ئەو (کانانە)[2] ڕاوەستە جا پێکەوە دەڕۆین.

لە خۆشیی ئەو شیوە بەلەزەتە کە پڕە لە پلەگۆشت، هەر زوو چوومە بەر خواجەلەی[3]

---

[1] چارداغ، کەپر یا حەوشەیەک کە لە قامیش درووست دەکرێ، دەگوترێ "زنج". چارداخێک لە قامیش، کەپرێک لە قامیش...

[2] لە دەستنوسەکانی کاپیتاندا ئەو وشەیە ئاوا نووسراوە کە بەڕای من هەڵەیە و هیچ مانایەک نادات. بە ئەگەری زۆر مەبەستی "ئەو دوکانانە"ـیە. تەنانەت لە دێڕی داهاتوودا ئاماژە بە دوکانەکان دەکات.

[3] لە هەنبانەبۆرینەی مامۆستا هەژاردا لە لاپەڕەی ٢٤٧ دا خواجانە بە مانای دوو سەکۆ لە هەر دوولای دەروازە هاتووە. لێرەدا پاشگری "لە"ـشی پێوە لکاندووە بە مانای سەکۆی بچووک. گەر مەبەستی کاپیتان ئەوە بێت کە لە هەنبانە بۆرینەدا نووسراوە کەواتە، مەبەستی دوو سەکۆی بچووکی بەردەم دووکانەکان بووە. دەنا گەر بڵێین مەبەستی خوانچەکانی بەر دووکانان بێت، کە دوکاندارەکان لەبەر دەگای دوکانەکەیان شمەکی لەسەر دادەنێین تا بیفرۆشن، دەگەینە ئەو ئامانجە کە بە هەڵە وشەی خوانچەی بە خواجە نووسیوە. لەباتی بنووسێ خوانچەڵە، نووسیویتی خواجەڵە.

دوکانەکان، بەرامبەر بە ماڵی حەمەچەتری تا لەماڵ دەرکەوت. لەدووی نەبوومەوە و دوای کەوتم بۆ نێو هۆردووی ڕووسان کە لە دەشتی «باغی قۆپی»[1] بوو. چوار دەوری زنجیان لێدابوو.

هەموو دەنێو زنجاندا بوون. حەمە دەستی کرد بە هەرا و هوریا:

- سپیچکا، بوماگا، مارس پاپیرۆز.[2]



وێنەی لەشکری ڕووسییەی تێزاری لە ورمێ، مانگی مەی ساڵی ١٩١٥

بەو شێوەیە هەرچی کەلوپەلی کە پێیبوو هەمووی فرۆشت. بە پارەشی دەدا، بە قەندیشی دەدا. پاش قوتاربوون گوتی: ئێستا با بڕۆینە لای زنجەکان دانیشین. ئێستا دەڕۆن نان دەخۆن، ئێمەش دەچین سەتڵەکان پڕ دەکەین و دەڕۆینەوە بۆ شار. دەو قسانەدا بوو کە چاوی بە دەستە بەتاڵەکەی من کەوت گوتی:

---

[1] پرسیاری ئەو باغەم لە دوو بەساڵاچووی سابڵاغی کرد. فەرموویان: ئەو باغە لە ڕووبەڕووی کێوی خەزایی‌یە کە کاتی خۆی قۆپێکی(مرداب بە فارسی) لێبووە و مڵکی بەڕێز (مەلیکی قازی)یە. دەتوانین بڵێین کە ئەو باغە لە دەوروبەری تێرمیناڵی ئێستای مەهاباد بووە.

[2] واتە: شەمچە، پەڕ(پەڕەسیغار)، سیغاری مارس، کە بە ڕووسی ئاوا دەنووسرێت Спичка. Бумага. Папирос Марс

- ئەوە بۆ حاجەتێکت نەهێناوە؟ ئەدی دەتهەوێ خواردنەکە لەچی بکەی؟
- خەمت نەبێ، شیوەکە توندە، دە پێچەکەمی دەکەم.

سالاَت[1] بەرەو چێشتخانەکەیان دەچوون. هەریەکەو قارەوانەی خۆی پێبوو. نانیان خوارد و لە ئاشپەزخانەکە وەدەرکەوتن. جگە لە ئێمە عالەمێکی یەکجار زۆری دیکەشی لێبوو. ئێمە لە زنجێک حاجەتی خۆمان پڕ کرد بەڵام من پێچەکەی خۆمم پڕ کرد لە پلاوی زەرد، پلەگۆشتی زەلامزەلام و نان. لەبەرئەوەی حاجەتم پێنەبوو، لەوێ تێرم خوارد و جا ڕێی شاریمان گرت و هاتینەوە ماڵ.

بابم لە دوکان بوو. کە سەری هەڵێنا! گوتی:

- ئەوە چییە؟ ئەو پێچەت چی تێدایە؟!
- پلاو و گۆشتە.

بە سەرسووڕمانەوە تیر چاوی لێکردم و نەیدەزانی باوەڕم پێبکات یا نا؟! ناچار پێچەکەی لێک کردەوە و دیتی. ئەوجار لێم کەوتە پرسیاران کە کێ داویەی؟! لە کوێت بوو؟! لەبات جارێکی چەند جارم بۆ گێڕایەوە کە لە هۆردووی ڕووسانم هێناوە و دەگەڵ حەمەچەتری چووم و لەو قسانە.

ئەوجار هەرای کردە زڕدایکم:

— شاشان، شاشان بگەیە!

ماڵەکەمان لە تەنیشت دوکانەکەمان بوو. کە بابم باسەکەی تێگەیاند، شاشان شاگەشکە بوو لە خۆشییان! هەر زوویەکی چوو قاپ و حاجەتی هێنا و بەتاڵی کرد. لەبەر چەند هۆ پێی خۆش بوو. دەیزانی گەر من بتوانم هەموو ڕۆژێ ئەوەندە خواردن بێنمەوە ماڵ، ئەو چێشتلێنانی لەکۆڵ دەبێتەوە. لەلایەکی تریش پارە بە خۆراک نادەین، ئەوەش بەقازانجێ ئەوە، بەو شێوەیە دەتوانێ پارە کۆ بکاتەوە بۆ دایک و براکانی بنێرێتەوە. لە لایەکی تریش ڕۆژانە هیچ کە ناوچاوانی منی لەکۆڵ دەبێتەوە بگرە، قازانجێکیشم بۆی دەبێت.

شەو هەر لەو خواردنەی من هێنابومەوە خواردیان بەڵام من نەمخوارد، ئاخر ئەوەندەم تێ ئاخنیبوو کە جێگام نەمابوو. پاش نانخواردن بابم گوتی:

- تۆش وەک حەمەچەتری کەمێک کەلوپەل لە دوکان دەگەڵ خۆت بەرە لەوێ بیفرۆشە. بەڵام لەدووی حەمەچەتری نەبێوە. دەگەڵ ئەو برۆ و دەگەڵ ئەو وەرەوە.

بابم پێشتر نوێژی فێر کردبووم بەڵام کەیفم پێی نەدەهات و پێم شتێکی هیچ بوو. خەوی ناو دۆشەگە میزاوییەکەم و گاڵتەی ناو منداڵانم پێ خۆشتر بوو. هەلوکهەلوکێن و زۆرەبانی و خۆڵەپەتانێم لە نوێژکردن پێخۆشتر بوو. چی بکەم کە منداڵم و هەترەم نییە بە بابم بڵێم نا، دەنا وێمدەکەوت و تێیدەسرەواندم. بابم دەیگوت مەلا دەڵێ:

---

[1] کاپیتان نووسیوێتی سالاَت کە هەڵەیە و ساڵدات / Солдат درووستە.

- منداڵ کاتێ حەوت ساڵەی هات، دەبێ لەسەر نوێژ لێیبدەی، بە زۆر نوێژی پێبکەی. تۆش کە عەمرت حەوت ساڵە، دەبێ سەرت بچێ، نوێژت نەچێ.

بەیانی زوو، پێش مەڵابانگدانێ لە غوڕڕابی خەوێی ڕاست کردمەوە و وەپێش خۆی دام یەکسەر بۆ مزگەوت. ئەوە یەکەم ڕۆژە دەگەڵ خۆی دەمبا بۆ نوێژکردن. لەسەرم ڕاوەستاوە قیت، لێمدەڕوانێ و هەڵمدەسەنگێنێ تا لە دەستنوێژگرتن و نوێژکردندا هەڵە نەکەم. چوومە سەر ئاودەست و دەستنوێژم هەڵگرت. لە تەنیشت خۆی دایانم و نوێژمان بە جەماعەت کرد. جارجار لێم تێکدەچوو، ئەویش بە دەست سەرم دەبا بۆ سوژدەی و ڕاستم دەکاتەوە. منیش تەماشای عالەمێ دەکەم کە چۆن چۆک دادەنوێنن و ڕاست دەبنەوە. ئەوان چ ئۆینێک دەردێنن، منیش لاسایان دەکەمەوە. هەر ئەو ڕۆژە فێری هەموو مەرجەکانی دەستنوێژهەڵگرتن و نوێژکردن بووم.

لە مزگەوت هاتینەوە ماڵ، نان و چامان خوارد و چووین بۆ دوکانی بابم. توورەکەیەکم پڕ کرد لە مێوژ و پەڕی سیغار و سیغاری مارسپەپیرۆز. زڕدایکیشم سەتڵێکی دە دەستی نام بۆ خواردن هێنانەوە. لەسەر حەمەچەتری ڕانەوەستام و چووم بۆ نێو ڕووسان. تا حەمەچەتر هات من نیوێکم فرۆشتبوو. کە حەمەش هات هەموو شتەکامان فرۆشت و ئەوجار کاتی نانخواردنی ساڵداتان هات. حەمەچەتر گوتی کە من شیوی بەیانیان نابەمەوە، هەمووی شۆرباوە، نانی نیوەڕۆیە دەبەم کە پڵاو و گۆشتە.

لەبەرئەوەی رووس لە شەڕدا بوون خواردنیان زۆر بە ساڵداتەکان دەدا. ساڵدات نانیان خوارد. چوومە پێش زنجێک. سەتڵەکەم لەبەر دەرکەی دانا. ئەوەی لەبەریان مابۆوە وەریاندەگێڕایە سەتڵەکەم تا پڕ بوو. منیش گۆشت و دانەوێڵەکەم هێشتەوە و ئاوەکەییم ڕشت و تێهەڵبووینەوە بەرەو ماڵ. لە ڕێگا حەمەچەتر پەژیوان ببۆوە و دەیگوت کە لە بەیانی ڕا منیش وەک تۆ دەکەم.

لەپێشدا چوومەوە دوکانی بابم. ئەو پارەیەی کە گیرم کەوتبوو دامێ. لە خۆشییان وەختەبوو باڵ بگرێ و بفڕێ. کە نان و شیوەکەشی دیت کە پلەگۆشتی زەلامزەلامی تیدایە، هێندەی تر خۆشحاڵ بوو. دیسان گازی شاشانی کرد و ئەویش بە قاپ و قاچاخەوە هات شیوەکەی بەتاڵ کرد.

با زۆرتان سەر نەهێنمە ئێش. ئەو هۆردوویە ماوەی سێ ساڵان لە سابڵاغ بوو. ئەو دەستەیە دەڕۆیی، دەستەیەکی دی دەهاتن. ئەو چەند ساڵەی ئەوە ئیشی من بوو. فێری زمانیان ببوم. وا چەختیم لێدەرهاتبوو کە شەڕەهەلووک و شەڕەجنێوم دەگەڵیان دەکرد. لەولاشەوە ئەو چەندساڵەی بابم پارەی چاکی کۆ کردەوە. پارەی بە نان نەدەدا و کەلوپەلی دوکانیشی زۆر بەباشی دەفرۆشت و بەردەوام دەگەڵ عەنبارداری ڕووسانیش ئارد و قەندی بە هەرزان لێدەکڕین و بە گران دەیفرۆشتەوە و پارەی چاکی قازانج دەکرد.

بابم وەها دەوڵەمەند ببو کە خانوبەرەیەکی لە پەنا «مزگەوتی سوور» دروست کرد کە دوو نهوومی هەبوو دەگەڵ شەش وەتاغان، بێجگە لە مدبەق و ژێرخان. ئەو خانوبەرەیەی تەنیشت

مزگەوتی سوور کە ئێستا وەستای ددانسازی تێدایە هەوە. بەوەش ڕازی نەبوو ژنێکی تریشی هێنا. ئێستا دوو ژنی هەیە دیسان. ئەو ژنە تازەیەی خوشکی دایکی حەقی خۆمە، واتە هەم پوورمە و هەم زڕدایکم. ناوی «زینەت»ـە کە دەبێتە دایکی (حەمەدەمین)ی برام. ژنەکانی بابم هەرکام ژووری خۆیان هەبوو. بە نۆرە هەر شەوەی لە یەکیان میوان دەبوو. زۆر دەخۆشیدا بوون. جاران زڕدایکم ئاوکێشی ماڵان بوو بەڵام ئێستا نانکەری هەیە، ئاوکێشی هەیە و ناوی «ئامینە سوور»ـە. بابیشم بووەتە توجار، تووتن دەکڕیت، فەعلەی هەیە و تووتن دادەبێژن و چاکی دەکەن. شەریکی هەیە و تووتن بەڕێ دەکا بۆ ورمێ.

براکەم «ڕەحمان» گەورە بووە و زۆرم خۆش دەوێ. جارجارە دەگەڵ خۆم دەیبەمە نێو هۆردوو. ڕۆژێک لە ناو ئاپۆرای هۆردوودا، قەشەیەکی ڕووس تووشمان هات. دەستی بەسەر ڕەحمانی برامدا هێنا و گوتی وەدووم کەون. بردینی بۆ چادرەکەی خۆی. سندووقێکی کردەوە. لە سندووقەکە شکلی[مەبەستی «وێنە»ـیە] خاووخێزانی خۆی دەرهێنا و پێشانی ئێمەی دا. کوڕێکی بەقەد ڕەحمانی دەنێودا بوو باقی تر ژن و کچەکانی بوون کە کچەکانی هەموو عەزەب بوون. دەستێک کۆت و شاڵواری منداڵانی لە سندووقەکە دەرهێنا دای بە ڕەحمانی برام. هەر لەوێ جلەکانی ڕەحمانی لەبەر داکەندْ و ئەو کۆت و شاڵوارەی دەبەر کرد. چەند کەللە قەندی دا بە ڕەحمانی و پاشان وەدەرکەوتین هاتینەوە بۆ ماڵ.

کە دایکی ڕەحمان، چاوی بە ڕەحمان کەوت، واق ما! پرسی ئەوە چییە؟! بۆم گێڕایەوە و لە خۆشییان شایی لە دڵدا دەگەڕا. ئاخر ڕەحمان ئەوەندەی ژیکەڵە بوو، ئەوەندەش بەو لیباسانەوە ژیکەڵەتر ببوو. هەرچەند پوورە زینەتم تازە بۆ بابم بەبووک هاتووە بەڵام شاشان زیزی کرد و چۆوە بۆ ماڵە بابی. بابم شاشانی زۆر خۆشدەوێ و بە فیتی ئەو دەگەڵ پوورم باش ناجوڵێتەوە. ڕۆحی دەقونگیی دایە و ئەوەندەی خۆش دەوێ کە دەگوتن نایە.

پیاو هەستی پێدەکرد کە دۆخی وڵات بەرەو گۆڕانێکی سەیر دەچێت. وڵات بۆنی گرانی و قاتوقڕی لێدەهات. ئەوەی فەقیر و هەژاری ناوچەکەیە، ڕوویان لە شار کردووە. گرانییەکی سەیرە. خواردن هەر دێت لە کەمێ و لە گرانێ دەدات.

ڕۆژێک، نێو «ئامین»ـێک، ئاڵایەکی کەسکی هەڵگرت بەرەو بازار شۆڕ بۆوە. ئەوەی ڕەجاڵە و لات و بەلەنگاز بوو وەدووی کەوتن. هەر دەهات و خەڵکی ڕووت و فەقیر و برسی زیاتر لێی وەخڕ دەبوون و بە دوایدا دەڕۆییشتن. چەند عەرووسێکیش وەپێشی کەوتبوون تا گەیشتنە ڕاستەی بازاڕێ. ئەوجار بەربوونە دوکانان. هەموویان تاڵان کرد. لە قەیسەری ڕا بگرە تا بازاڕی، تا دوکانی عەلافان. بە جارێک گەسکیان لە ماڵی خەڵکی دا.[1]

---

[1] بڕوانە کتێبی "نگاهی به تاریخ مهاباد" نووسینی: سید محمد صمدی، ل:١٤٧

منیش کە ماڵمان لە بازاڕ نیزیک بوو، دەگەڵ منداڵەکانی گەڕەکێ تێکەڵ بە حەشیمەت ببووین تا بزانین چ ڕووی دەدات! کە چاوم لێکرد منداڵەکانیش دەست دەدەنە شمەکی دوکانان. منیش وەتەماح کەوتم و لە دوکانێکی چەکمە و کەوشان، دوو جووت چەکمە و دوو شەقەچەرمم تاو دایە کە بیهێنمەوە بۆ ماڵێ، لەپڕ ڕووسێک هاتە پێشم و شەقەچەرمەکەی لێئەستاندم و وەپێش خۆی دام بۆ مزڵەکەی کە لەنێو شاری بوو. پێدەچوو کە کەوش و چەکمەدروو بێت، چونکە ماڵەکەی پڕ بوو لە کەرەسەی کەوش و چەکمە. لەو سەردەمدا ئەو کەسانەی سەنعەتکار بوون زۆربەیان مزڵیان لە نیو شار بوو. کە شەقەچەرمەکانی لێئەستاندم ئەوجار سەولەیەکی دامی و وەدەری نام، بەڵام چەکمەکانی لێنەستاندم.

هاتمەوە ماڵ، شاشانی زردایکم کە لە باسەکە حاڵی بوو نەیهێنا و نەیبرد گوتی:

- دەک بەخێر نەیەوە، زیاد لەو هەموو پارچە فاسوونیایە چووە چەکمەی بۆ من هێناوە دەگەڵ سەولەی!

لەو قسانەدا بووین کە بابم لە نوێژ هاتەوە. نەقڵ و باسم بۆ گێڕایەوە. لای خۆی تۆبەکار و ئیماندارە و بستێکی ڕیش بەرداوەتەوە، چەکمەکانی بردە دوکانی خۆی و فرۆشتنی.

تا ئەو سات و وەختەش هەموو ڕۆژێک دوو جار تا سێ جار دەچوومە چۆمی یەرغوو، کەلوپەلم بۆ دەفرۆشت و بە سەتڵان خواردن و شیوم بۆ دەهێنایەوە ماڵێ. ئەویش ئەوەی لە خۆمان زیاد دەبوو دەیبرد لە دوکان دەیفرۆشت.

## دیسان کەوتمەوە بن دەستی زڕدایکم

قاو بوو کە لە ڕووسییەی دۆخەکە ئاڵۆزە.[1] بەیانییەکی بابم ڕاستی کردمەوە کە بڕۆم بۆ نویژێ و پاشانیش بۆ هۆردووی. لەترسی نوێژ و لەبەر خەوی خۆشی بەیانیان، بە ئانقەست خۆم لە نەخۆشی دا و خۆم هێنایە حاڵی جاوی و نەچووم بۆ نوێژ.

پاشی نوێژکردن بابم هاتەوە ماڵ و گوتی یەک ڕووس نەماوە، هەمووی ڕۆیون. کە ئەوەم بیست، یەکپێ ڕاست بوومەوە و خۆم کۆکردەوە و دەرپەڕیم. کە چوومە ئاستی هۆردوو، چاولێدەکەم کە عالەم بە زنجانەوە وەربوون، دەیرووخێنن، دار و بارەکەی دەبەن. ڕووسەکان

---

[1] ئەو سەردەمە سەرەتای شۆڕشی بوڵشویکەکان بوو بە دژی (نیکۆلای دووهەم) کە دوایین ئیمپڕاتوری تزاری ڕووسییە بوو. ئەو شۆڕشە بە دوو قۆناغدا سەرکەوت. یەکیان لە فێورییەی ساڵی ١٩١٧ بوو. پاشان لە ئۆکتۆبری هەمان ساڵ (وێلادێمیر لێنین) بە هێرشێکی سەربازی تۆکمە، توانی دەسەڵات لە حکومەتی کاتی وەربگرێت و (حیزبی سوسیال دیموکراتی کرێکاری ڕووسیە) لە جیاتانی هاتە سەر حوکم. بەپێی ئەو ڕێکەوتانە، ئێستا تەمەنی کاپیتان ٩ ساڵە.

پردێکی باشیان لە ئاستی باغی «قۆپێ» دروست کردبوو، ئەویشیان تێکوپێک دا. هەرچی دار و ئاسن بوو ڕووخاندیان و بردیان.

بە هەناسەساردی گەڕامەوە ماڵ. زانیم تووشی جەمەنانی زڕدایکم دەبمەوە. ئاخر پووره زینەتم واتە، ژنەکەی تری بابم، هیچ دەستی ناڕوات و ئەویش بە دەست «شاشان»ـەوە حاڵی زۆر لە حاڵی من تەواوتر نییە. گەورەی ماڵ، زڕدایکمە و تەنانەت زۆر جاران قسەی بابیشم برەوی نییە.

چەند ڕۆژان وەک گوێلکی گێژ دەسووڕامەوە. بابم مردبا ئەوەندە نەدەڕووخام. لە داهاتووم دەترسام بەدەست زڕدایکمەوە. دەمزانی هەڵوەدام دەکات و وەک مار پێوەم دەدات. ئەو چەند ساڵەی کە کەمتر ئازاری دەدام ئی ئەوە بوو کە قازانجم بۆی هەبوو. دەوڵەمەندم کردبوون. هەم بۆخۆی و هەم دایک و براکەیم حەساندبۆوە. لە پوڵ و پارە ڕا بگرە تا نان و شیوی هۆردووی بۆی دەناردن. ئیتر ئەو دونیایەم لەبەر چاوی تاڵ ببوو. حەقم بوو لە داهاتووم بترسێم، چونکە بەردەوام گیرفانم پوڵ و پارەی تێدابوو، منەتم لەسەر زڕدایکم دەکرد. تێر بە زگی خۆم نانم دەخوارد. ئەو چەند ساڵەی مەگین بە ئیشتیا هەندێک شیوی وەک دۆڵمە، دۆکڵیو و هەڵوا ئاوری بۆ هەڵکرابا دەنا، کەس بۆ لای چێشت سازکردن نەچوو.

باسی گیرفانی بابیشم ناکەم کە ئەوەندە دەوڵەمەند ببوو سامانەکەی بۆ حیساب نەدەکرا. باسی خانووبەرە گەورەکەی لە کن مزگەوتی سوورم بۆ کردن. وەتاغەکان گەورە و عال، هەمووی پڕ لە مافور و فەرشی عەنتیکە. دوو گامیش و مانگایەک کە یەک‌لەیەکێ قەڵەوتر بوون بەڵام زڕدایکم لە گامێشەکان قەڵەوتر ببوو. ماڵ ئەوەندە سازە کە تۆپ نایبڕێ. ئەوە جگە لە پارەی زۆرە کە بابم هەم بۆخۆی دەیشارێتەوە و هەم دەیدات بە زڕدایکم کە بۆی هەڵگرێت. پووری چارەڕەشیشم وەک مێو و ڕۆنی لە بن دەستی زڕدایکمدا دێ و دەچێت و لەسەر حاڵی خۆم ڕا زگم بە ئەویش دەسووتا.

دەو بەینەشدا بابم لەلای «مەلا هادی» دەبەر خوێندنێی نام. لەو قوتابخانەیە (٢٠) منداڵی لێبوو. منداڵ هەموو نانی نیوەڕۆیان دەگەڵ خۆیان دەهێنا، بەڵام من بەیانی کە لە خەو هەڵدەستم، نانێکم جیرەیە و وەریدەگرم و هەر بەڕێوە دەیخۆم، ئیدی هەتا شەو زگم قووڕەی دێت لە برسان. شەوێش ئەگەر شۆرباوێک یان شیوێکی دیکەم بۆ لەسەر لەتەنانێکی ڕۆ دەکەن، خۆ بە هیچکوێم ڕانەدەگەییشت، بۆیە چاوبرسی بووم و بەوەندەی تێربوونم نەبوو. بەو حاڵەی چەند مانگم خوێند، هیچ فێرنەبووم، گوێم نەدەدا بە خوێندن. هەر خواخوادام بوو کە زوو کاتی نان خواردن بێت و زوو جیرەکەم دەستگیر بێت. ئاخری وای لێهات کە ڕام کرد لە خوێندن. چەندی بابم لێم دەدا و دەمباتەوە قوتابخانەی، دەگەڵکوو ئەو وەدەر دەکەوت منیش پاشی ئەو دەردەپەڕیم بۆ دەرەوە. لەدوای ماوەیەک ئەویش چاری نەکردم و وازی لێهێنام.

بەهەرحاڵ، ڕووس کشانەوە. سابڵاغیان چۆڵ کرد. دەگەڵ ڕۆیشتنی خۆیان برسێتی و قات‌وقڕی

گەشەی کرد. گرانییەک بوو نەبێتەوە. ڕۆژ نەبوو کە سەت کەس لە برسان نەمرن. هیچ کوچە و کۆڵانێکت نەدەدۆزییەوە کە بە دەیان کەلاک نەکەوتبن. پشیلە و سەگ نەما، هەمووی خورا. لە چۆم و ئاوان ڕقە، بۆق و قرژاڵ هەموو خورا. لە چەند شوێنان عیسان، عیسانی خواردبوو. بەلەدیە پێرانەدەگەیشت یەکیەک کەلاکان بنێژێ. چاڵی گەورەیان هەڵدەقەند و ۲۰-۳۰ کەلاکیان وێکڕا دەشاردەوە. کەسێکی نابەڵەد نانی کڕیبا، بەجارێک دەوریان دەدا و نانەکەیان لێدەستاند، وەها پەلاماریان دەدا کە هەر کوتەی بەدەست یەکێکەوە دەچوو و کابرا بەدەستبەتاڵی و مایەپووچی دەگەڕایەوە ماڵ.

بەو زستانە تووشەی، کە بە ڕێگایەدا دەڕۆییشتی، لە پەنا دیواران عالەمت دەدیت کە لەبرسان کەوتوون و لە گیانەڵڵایە دان یا گیانیان دەرچووە. ئەوسەردەم لە سابلاغ کەلاوە زۆر بوون. ڕووت لە هەر کەلاوەیەک دەکرد، دەتدیت چەند ڕووت گیانیان دەرچووە و لە سەرمان ڕەق هەڵاتوون. دڵی ڕەق و بەردینی دەویست ئەو دیمەنانە ببینێ.

جا لەو گرانی و قاتوقڕییەدا، بابم دیسان لات و فەقیر بۆوە. خانووبەرە و ناوماڵ هەر هەمووی فرۆشرا و هاتەوە سەر حوللەمەرەسێی جاران تا گەییشتینە سەر فەرعانە. خانوبەرەکەی بە «حاجی لەتیفی» فرۆشت. بڕەپارەیەکی بۆ مایەوە کە خانوویەکی بچووکی لە «حەسەنی کەبابچی» پێ کڕێوە کە تاقە وەتاغێک و ژێرخانێک بوو، ئەویتر هەمووی خورا. زڕدایکم زۆری لێدزی. دایک و برایەکی هەبوو. لە بابمی دەدزی و دەیدا بە ئەوان. ژنێک نێوی «ئامینە سوور» بوو، ئەو ئارد و نان و دانەوێڵەی کێشەوە دەکرد بۆ ماڵە براکەی. جارێک چل لیرەی عوسمانیی لە بابم دزی و دابووی بە براکەی خۆی. بابم پێی زانی. چەند ڕۆژان شەڕی بوو دەگەڵی و دەنگی لێگۆڕی کەچی زۆری خۆشدەویست و زوو دەگەڵی ئاشت بۆوە. ئەوە لە حاڵێکدایە کە ماڵی باپیرم، لە دایکمەوە، کە دەبێتە ماڵی باوک و دایکی پووریشم، هەموویان بە خاو و خێزانەوە لە برسان مردن، بەڵام ماڵە بابی زڕدایکم هەموو دەرچوون. برای زڕدایکم نێوی «ئەحمەدی مەلا شێخی» بوو. کە کەوتە فەرعانە، دوکانی خەڕازی دانا. بابم لە ورمێ شەریکێکی عەجەمی هەبوو، چوو قەرز و قۆڵەکانی کۆ کردەوە و هاتەوە بەڵام ئەویش لەنێو چوو. بەو زستانەی بابم بێکارە، دایکم و پوورم نانی دەکەن و بابیشم دەیباتە بازاڕ و دەیانفرۆشێت.

ئێستا منیش هاتومەتەوە سەر دۆخی جاران بەدەست زڕدایکمەوە. دیسان برسیم دەکات و خواردنم لێدەشارێتەوە و لێم لە قفڵ و هاچەران دەنێ. جەماوجەم نانم دەداتێ. بەیانیان لەتەنانێک، نیوەڕۆیان نانێک و شەوان نانێک. خۆ بە هیچکوێم ڕانەدەگەییشت. هیچ کەس وەک من حاڵی ئەو خەڵکەی کە لەبرسان دەمردن، نەدەزانی. هەر من دەزانم ئەوان چیان دەچێژت.

به ناشوکری نەبێت لە ڕۆژی لەدایکبوونمەوە بۆ من هەر قاتوقڕی بوو. هەر برسێتی بوو بەدەست زڕدایکمەوە. زڕدایکم دەیویست کە وەک ئەو خەڵکە بمرم و لەکۆڵی ببمەوە. بەردەوام چاوی لەدووم بوو کە نانی زۆر نەخۆم. ئەو ماوەیە گەر ڕەحمانی برام نەبا حاڵم شپرێو دەبوو. خۆشخۆش فێری ڕەحمانیم دەکرد کە بچێت لەتەنانێکی لە دایکی بستێنێت کە ئەویش بۆ منی دەهێنا و دەمخوارد. هێندی پێنەچوو کە ئەو چاوەشم کاڵ بۆوە و دایکی پێیزانی بەڵام زۆری ڕەحمان خۆشدەویست و دڵی نەدەشکاند، هەرکات نان و پێخۆری ویستبا دەیدایە. ئەوەندەی خۆشدەویست کە گوێچکەی کون کردبوو و ئاڵقەی زێڕی دەگوێی کردبوو. لە کوردوستان کەسێک تاقە کوڕێکی ببێت، ئاڵقەی زێڕی لە گوێ دەکەن. ئاخر بابم (ئاڵیە...)ـە هەترەی نەبوو بە زڕدایکم بڵێ «محەممەد»یشمان کوڕە!

زستانی شووم لە هێز کەوت. بەهار بۆنی هات و کەوتینە فەرعانە. خاکی پیرۆزی کوردوستان[1] ژیایەوە و گیا و گوڵی بەهاری سەریان وەدەر نا. خەڵکی برسی ڕوویان لە بەندەن و زەنوێر و کوێستانی بەپیتی وڵات کرد. لە کیفۆک ڕا گرتوویەتی تا پۆلکە، لە ئەسپینگ ڕا تا سەیدۆکە، کەنگر، مەندۆک، پنگ و گیابرژیوە و ... هەر هەمووی لە فریای ئەو خەڵکە هاتن و لە برسان ڕزگاریان بوو.

من و پوورم، ژنەکەی تری بابم، دەچووینە دەشت و کێوان، پۆلکەمان دەهێنا. پۆلکە شتێکە وەک باقلەی. لە ماڵ دە مەنجەڵیدا دەمانکوڵاند. من دەمبردە بازاڕ و دەمفرۆشت. باش بوو منیش تێرم لێ دەخوارد و یەک-دوو شاییشم لە بازاڕ لێ خەرج دەکرد و باقی پارەکەم دەهێنایەوە بۆ زڕدایکم.

---

[1] لە موکریان دەگوترێ "کوردوستان"، بەڵام درووستەکەی "کوردستان"ـە. بۆ ئەوەی لە کەسایەتی و دەوری کاپیتان حەمەد دوور نەکەوینەوە، هەوڵم داوە وەک ڕاوێژی کاک حەمەدی موکریانی وشەکە بنووسمەوە.

## لە کەیەوە کوردوستان داگیر کراوە؟

ئەو زەمان مەلا و فەقێ دەستیان یەکجار درێژ بوو، حکومەتی ئێران زەعیف بوو. حاکمێک لە سابڵاغ بوو، چەند نەفەر لە خەڵکی شاری کە هەمووی سەرسەری و شەلاتان[1] بوون، کردبوونی بە نەزمییە. ئەوکاتە «کەریمی سیسمێڵی» داروغەی شار بوو. هەر شکایەت و شکایەتکارییەک با، دەچوونە لای داروغە. بە فکری من زۆر لەمێژ نییە حکومەتی ئێران کوردوستانی داگیر کردووە، با پێتان بڵێم بۆ؟! پاش بەینێک دەستێک سەرباز هاتنە سابڵاغ. پاپاغ سوور تفەنگی وەرنەویان[2] دەشاندا بوو. «خەزاڵە شێت»ـێک ژن بوو بەڵام لیباسی پیاوانی دەبەردا بوو، ئەو قازاخانە ئەو ژنەیان دەدیت و ڕایاندەکرد. خەزاڵ شەپی وای لەو قازاخانە دەدا نەبێتەوە. لە شوێنێک خەزاڵە شێت لەوێ با، یەک قازاخ نەیدەوێرا تخوونی ئەو شوێنە بێت. ئەوە یەک.

دووهەم، ئەو زەمان لە کۆڵان و کوچان بەیتێکیان دەگوت کە بە «سامسام»ـیان هەڵدەگوت کە باسی ئەوکاتی دەکات کە سەربازانی حکومەتی دەگەڵ سامسامی هاتوونە ئیندرقاش.[3،4] چەند کەلیمەم لەبیر ماوە کە کاتی شەڕ لە سەنگەردا لە زمان کەسێک بەناوی «ئەحمەد»ـەوە دەڵێ:

مامە پاشا ئەو سێتیرە[5] بۆ من باشە
پێی قڕ دەکەم پاپاغ ڕەشە
دەنگی سامسام[6] لە کۆڵان دێ
سەدای سامسام لە بورجان دێ

دیسان ئەحمەد دەڵێ:

مامە مینە ئەو سێتیرەم لەبۆ بێنە
پێی قڕ دەکەم پاپاغ شینە
دەنگی سامسام لە باغان دێ.

ئەو بەیتە زۆرە، من هەر ئەوەندەم لەبیر ماوە.

سێهەم، باش دێتەوە زەینم کە دوو حاکم بۆ سەردەشت چوون، نەیانهێشتووە قوون دادەن،

---

[1] مەبەستیان وشەی "شارلاتان"ـە (Charlatan) بە فەڕانسەوی کە بە ڕەچەڵەک ئەوروپاییە و پەڕیوەتە ناو زمانی فارسی و کوردیش.

[2] لەوانەیە مەبەستی تفەنگی برنەو - برنو یا *"Berno"* بوبێت کە تفەنگی فەرمیی لەشکری ئێران بوو.

[3] ئیندرقاش کە بە فارسی "اگریقاش" دێتە گۆ، گوندیکە لە ۹ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد.

[4] بڕوانە کتێبی: "نگاهی به تاریخ مهاباد" نووسینی: سید محمد صمدی، ل: ١٤٥

[5] "سێتیر" تفەنگێک بووە کە سێ فیشەکی دەخوارد.

[6] وەک دەگوترێ یەک لە گەورەکانی تایفەی چارداوەڕوەکان بووە لە هەوشار. دەنگۆش هەیە کە دەستی لە کۆمەڵکوژکردنی خەڵکی سابڵاخ لەلایەن ڕووسەکانەوە لەساڵی ١٩١٦دا هەبووبێ. بڕوانە کتێبی کارەساتێکی مێژوویی ل ١٢٢

شاربەدەریان کردوون و وەدەریان ناون.[1، 2]

چوارەم، لە سابڵاغ «کەریم هەتیو»[3] تیۆیک عالەمی لەخۆی خڕ کردەوە تا «ئەمیر تۆمان»[4] کە حاکمی شار بوو، لە شار وەدەری نێن، چەند ئاغاوەتی خۆفرۆش پێشیان گرتن، حەمە هەتیویان گرت و قاچیان لەبەر زگی وڵاغەکەی بەست و بە کوچە و کۆڵاناندا دەیانگێڕا و خەڵکیان پێ چاوترسێن دەکرد.

پێنجەم، خۆم بە چاوی خۆم نەمدیوە دەیانگێڕاوە کە دوو نەفەر هاواڵی یەکتر دەبن. یەکیان نێوی «مەلا وسوو» بووە و ئەوەی تریان نێوی «حەمە گڕوێ» بووە. ئەو دوو نەفەرە زۆر ئازا و چالاک بوون. نێوبانگیان لە هەموو کوردوستان دەنگی داوەتەوە. مەلاوسوو ژنێکی یەکجار جوان و قۆزی دەبێت. حاکمەکە نێوبانگی ئەو ژنە جوانە دەبیسێت. پێرەژنێکی دەڵاڵی ناردۆتە کن ئەو ژنە و پێیدەڵێ کە حاکم دەیهەوێ شەو بێتە لات بە میوانی. ژنەکەش گوتویە کە مێردەکەم بەیانی دەچێتە سەفەر، ئەو کە ڕۆییشت با بێت بەخێر بێت سەر چاوان. ژنەدەڵاڵ کە دەڕوات، هێندەی پێناچێت کە مەلاوسوو دێتەوە ماڵ. ژنەکەی ئەو حیکایەتەی بۆ دەگێڕێتەوە. مەلاوسوو دەڵێ کە ژنە دەڵاڵەکە هاتەوە، قەولی بدەیە با شەو حاکم بێت. شەوێ حاکم خۆی و دوو نەفەر فەڕاش دێن بۆ ماڵ. ژنە دەڵێ با فەڕاشەکانیش بێنە ژوور و لەو وەتاغەی دیکە دانیشن تا کەس نەیانبینێت. ژنەش حاکمی دەباتە ژوورێکی دی و جێگای بۆ ڕادەخات و ئێستا قوون دانادەن، لێیان وەژوور دەکەون، جا چییان بەسەر هێناون؟ خۆیان دەزانن. پاشان دارێکی لە ک.. زەلامتر دە ...ی حاکم

---

[1] بڕوانە کتێبی: سردشت در آیینه اسناد تاریخی، نووسینی: فریدون حکیمزاده، چاپ اول، ل: ١٥٩ - ١٧٠

[2] بڕوانە کتێبی: یادداشتەکانم، بە پێنووسی: عەبدوڵڵا احمد ڕەسووڵ پشدەری، بەرگی یەکەم، ل: ٢٨ - ٣٠

[3] پاشی لێکۆڵینەوەیەکی زۆر سەبارەت بەو ناوە گەییمە ئەو قەناعەتە کە شۆڕشێک بەنێوی شۆڕشی"کەریم هەتیو" بوونی نییە یا من نەمدیوە. بە ئەگەری زۆر کاپیتان "حەمە هەتیو"ی دەگەڵ "کەریم هەتیو" لێ تێکەڵ بووە. دیارە ئەو دیاردەیە بۆ کەسێکی کە زیاتر لە نیوەی تەمەنی لە غەریبایەتی ژیا بێت ئاساییە کە ناوەکانی باش نەیەتەوە یاد. من هەوڵ دەدەم لە دێڕەکانی داهاتوودا بە حەمە هەتیوە بینووسم. سەبارەت بە شۆڕشەکەی حەمە هەتیو زانیاری زۆر کەم دەبەر دەست دان. تەنیا خوالێخۆشبوو "غەنی بلووریان" لە بیرەوەریەکانی خۆیدا باسی ئەو شۆڕشەی کردووە و بە جووڵانەوەیەکی بۆڵشویکی پێناسەی دەکات. دەتوانن بڕواننە کتێبی: سەدەی کارەسات، نووسینی: برایم فەرشی، چاپی بنکەی ژین لە سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٨، لاپەڕەی ١٠ هەروەها کتێبی: ئاڵەکۆک، نووسینی: حامید گەوهەری، لاپەڕەی: ١٤

[4] لە کاتی حکومەتی قاجارییەکان دا، بە سەرۆکی هێزێکی ١٠،٠٠٠ سەربازی دەگوترا (امیرتومان). "تومان" لە زمانی "مەغولان"دا بە مانای (دە هەزارە/١٠٠٠٠)ـە. (هەنووکەش ئەو ناوە لە تورکییە کەڵکی لێوەردەگیرێت و پلەیەکی سەربازییە بە یەک یا دوو ئەستێرەوە Üsteğmen/teğmen). لە ئێران لە ڕێکەوتی ١٣٠٠/١٠/١٤هەتاوی ناوەکە گۆڕا و بوو بە (امیر لشکر) و لە ساڵی ١٣١٣هەتاوی جارێکی تر ناوەکەیان گۆڕی و بوو بە (سەرلشکر). دیارە ئەو ناسناوە زۆربەی جاران بە هەڕەمەکی و لە ڕووی گەندەڵییەکی زۆرەوە کە لە دەرباری شایەکانی قاجار باو بووە، تەخشان پەخشانیانی پێدەکرا و لە گۆترە بە سەر خەڵکیان دەبەخشییەوە.

دەبڕن و دوو شەقی تەڕی لیدەدەن و وەدیوی دەرێی دەنێن و دوو فەڕاشەکەش بە پەت دەخنکێنن. بۆ بەیانی ئاغاوەتی دەور و پشتی شار و فەڕاشی حکومەت، لەشکری لێدەکەن و دەوری ماڵە مەلاوسووی دەدەن. پاش شەڕێکی زۆر خانوویەکە بە سەریاندا دەڕووخێنن و ئاوری تێبەردەدەن و هەردووکیان دەکوژرێن.[1] جا بۆیە دەڵێم کە حکومەت پێشتر لە کوردوستان نەبوو و عەجەم لەسەر کوردان نەببوون بە کەڵەگا. ئەوەتا گەر ویستوویانە بێن کوردوستان بکەنە ئی خۆیان، کوردی قارەمان لێیان دەرهەڵبوون و دەریان کردوون دەنا، کوردی خۆفرۆش ڕێگای بۆ ئەوانە کردەوە تا حکومەتمان بەسەردا بکەن.

## «حەبیب»ـی یەخسیر

دەو بەینەیدا «جیلوڕەشکە»،[2] لای ورمێ و ئەو ناوەیان داگیر کردبوو. گەورەکەیان ناوی «مارشیمۆن»[3] بوو. لەپێشدا دەگەڵ کوردان جووت بوون، دوژمنی عەجەمان بوون، بەڵام سمایل ئاغای سمکۆ ئەو برایەتییەی تێکدا.[4]

---

[1] بڕواننە کتێبی: "نگاهی به تاریخ مهاباد" نووسینی: سید محمد صمدی، ل: ٧٦

[2] جەلوودی، جەلوو یا جیلوو، ناوی یەک لە خێڵە خاچپەرستەکان یا ئاسۆڕییەکانی کوردستان بوون کە لە باشووری گۆلی (وان)ێ بەتایبەتی دەڤەری حەکاری و جولەمێرگ لە باکوری کوردستان دەژیان. هەروەها ناوی زنجیرە کوێستانێکی چڕ و پڕپیتە لە ناوچەی حەکاری. ئەو هۆزە لە شەڕەکانی ڕووسی تزاریدا کە دەگەڵ عوسمانییەکان کردیان، لایەنگرییان لە دەوڵەتی ڕووس کرد. بەهۆی شۆڕشی بۆڵشەویکەوە، هیزی ڕووسان لەو ناوچانەی کە داگیریان کردبوو، کشایەوە و جیلووکانیان بە تەنیا جێهێشت. ئاسووریەکان لەو شەڕانەدا خزمەتێکی زۆریان بە ڕووسان کردبوو. بە کشانەوەی هێزی عرووسان و هەڕەشەی تۆڵەئەستاندنەوەی تورکان، ئیتر جیلووکان نەیاندەتوانی لە ناوچەکانی خۆیان بژین. ناچار بوون کۆچی بەکۆمەڵ بکەن بۆ ناو خاکی ئێران تا لە هەڵمەتی کۆمەڵکوژ کردنیان ڕزگاریان ببێت. بێ لەو هۆکارەش، دەوڵەتی تورکان هەر بە تەما بوو ناوچەکە لە نەتەوەکانی غەیری تورک پاکتاو بکات. لە دەڤەری موکریان بە هێز و لەشکری مەسیحییەکانیان دەگوت (لەشکری جیلوویان) یا (جیلووڕەشکە). (مارشیمۆن) ڕێبەرێکی ناودار و خاوەن پێگە لە ناو مەسیحییەکاندا بوو و پشتیوانی زۆربەی زلهێزانی ڕۆژئاوایی دەگەڵ بوو و دەیویست دەوڵەتێکی هاوبەش دەگەڵ سمایل ئاغای سمکۆ دابمەزرێنی کە وەک دەگوترێ بە دەستی سمکۆ شکاک دەکوژرێت. "ڕەشکە" پاشگرێکە بە مانای "حەشیمەت" کە باری نێگاتیڤ دەبەخشێتە ناو، لە دەڤەری موکریان زۆری کەڵک لێوەردەگیرێت. بە مانای خەڵکانێک یا شتێک کە زۆر خۆشەویست نین. وەک (عەجەمەڕەشکە). بۆ زانیاری زیاتر بڕواننە: (سمکۆ و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد نووسینی: محەممەد ڕەسوڵ هاوار).

[3] "مار شەمعۆن بێنیامین" (١٨٨٧/١٩١٨-٠٣-١٧ز)کە لە ناو بەڵگەنامەکاندا بە "مارشیمۆن بێنیامین" دەناسرێت، ڕیبەر و گەورەی جیلووە فلەکان بوو.

[4] لە بۆچوونێکی جیاوازدا بەڕیز (هێما سۆفی) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (سمکۆ - بارودۆخی سیاسی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٥ تا ١٩١٨ی زایینی)، ئاماژە بەوە دەکات کە کوشتنی مارشیمۆن ڕێبەری جیلووەکان، بە دەهۆیەکی ئینگلیسەکان بووە.

سمایل ئاغا مارشیمۆنی بە میوانی بانگهێشت کرد بۆ «چاریە»[1] و ئەویش بە خۆی و چل سوارانەوە لێی میوان بوو. سمکۆ پیاوی لە دەوروبەری قەڵاکەی دانا و پێیگوتبوون کە کاتێک من تەقەم کرد ئێوەش دەسڕێژی بکەنە سەر سوارەکانی مارشیمۆن و نەهێڵن یەکیان دەرچن. پاش نان خواردن هەڵدەستن دەست لە دەستی یەک دەنێن کە بڵاوەی بکەن، سمکۆ مارشیمۆنی وەبەر دەمانچە دەدات. پیاوەکانیشی «فلەکان»[2] هەموو دەکوژن.من بیستوومە، خۆم لەوێ نەبووم کە یەک-دوو کەس قوتاریان ببو و باس و خەبەر دەبەنەوە بۆ فلەکان. ئەوانیش لە کوردان وەخۆ دەکەون و ڕەشەکوژییەکی زۆر لە کوردان دەکەن تا دەگەنە چارییەی و ئەوێش داگیر دەکەن. لە قسان روحمیان بە ژن، منداڵ، پیر و پەککەوتەش نەدەکرد. هەرچی وەبەر دەستیان هاتبا



قەڵای چارییە لە ئالبۆمی وێنەکانی عەلی خان والی

---

[1] چهریق، چاری، چەری، چارییە، یا چەهریق لەڕاستیدا وەک پێتەختی حکومەتی نەمر سمکۆ وا بوو و بارەگای سەرەکییان لەوێ بوو. چەهریق یا چارییە لە باشووری ڕۆژئاوای دیلمان هەڵکەوتوە و دەکەوێتە نێوان شارەکانی سەلماس و خۆی، بە بەری ڕۆژئاواشدا دەکەوێتە سەر سنووری دەستکردی تورکیە. بەپێی هەندێک سەرچاوە دەگوترێ کە نەمر سمکۆ، مارشیمۆنی لە "کۆنەشار" کوشتووە بڕوانە: کتێبی: سمکۆ و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد نووسینی: محمد رسوڵ هاوار. لاپەڕەی: ٣٩٥ - ٣٩٦ هەروەها کتێبی: ڕاپەڕینی کورد بە ڕابەرایەتی سمکۆ نووسینی: م.م فان بروونەسن. وەرگێڕانی: شێرکۆ هەژار ل: ٣٤

[2] خاچپەرست، نەستووری، مەسیحی. لە زۆر سەرچاوەدا بە (فەلە)ـش ناویان هاتووە.


مار شەمعون - مارشیمون
*Mar Benyamin Shimun XXIII*

دەیانکوشت. پاش بەینێک عوسمانی و ئێران و لەولاشەوە کورد، جیلووڕەشکەیان ڕاو نا. کوشتارێکی زۆریان لێکردن و ڕاویان نان. بەشێک روویان لە عێراق کرد.

لە سابڵاغێش، کوردی شار و دێهاتی بۆ تاڵان کەوتنە شوێنیان. جا بابم کە خۆی پێ موسوڵمان بوو سەری لە فەرزی ئیسلام و خوا هەڵنەدەهێنا، نازانم لەکوی تفەنگێکی گیر کەوتبوو؟! تفەنگەی هەڵگرت و ڕۆیی تا شەڕی کوفار بکات و فلان بکوژێت. پێی بە خەزا و جیهاد بوو. ئەدی نەیدەگوت دەچم فلان تاڵان دەکەم! ئەسپی نەبوو، بۆیە بە پیادە ڕۆیی و ماوەی پانزدە ڕۆژی پێچوو. لەوسەری کە هاتەوە بارگینێک و بارێک و کچێکی دەگەڵ خۆی هێنابۆوە. کچێکی ژیکەڵانە، جوان، پاک و بێگەرد. کچەکەی سواری بارگینەکە کردبوو بۆخۆی پیادە بوو. ئێمەش بەرەو پیریان چووین و بار و بارگینەکەمان بردە ژووری و تاقەتمان کردن. زڕدایکم کە چاوی بە کچەی کەوت وەختەبوو شێت بێ لە داخی بابم، وەیزانی داخوا چ خەبەرە! ڕووی لە بابم کرد و پرسی:

- ئەو کچە چییە؟ بۆ دەگەڵتە؟
- فلەیە. هەڵبڕابوو لە عێلێ. بەزەییم پێداهات و دەگەڵ خۆم هێنام تا لەڕێی خودای دا لە محەممەدی مارە بکەم. مەبەستی لە من بوو.

چەند ڕۆژ بەسەر چوو بابم چوو «مەلا کەریم»ی هێنا و کچەیان موسوڵمان کرد و ناویان نا «حەبیب». زۆر بە چەتوونی بوو بە موسوڵمان. شادەیمانی هێنانی نیوسەعاتی کێشا. مەلا دەیگوت بڵێ: ئەشهەدوو ئەللا ئیلا...، ئەو جورێکی تری دەگوت تا نەبێتە موسوڵمان. بۆیە وای وەڵام دەدایەوە کە لەکوڵی ببنەوە و زۆری لێ نەکەن کە دینەکەی بگۆڕێ. هەرچۆنێک بوو موسوڵمانیان کرد. بابم شایی دە دڵیدا دەگەڕا کە فلەیەکی کردووە بە موسوڵمان. کچ لە ماڵەوە وردەوردە زمان فێر بوو. دەماڵێدا دەهات و دەچوو، یەکجار خوێنشیرن و جوان بوو. لە زاری ڕەحمانی برابچووکەکەمەوە بە منی دەگوت کاکە تا مردیش هەر بە منی دەگوت کاکە، بە بابمی دەگوت بابە، بە زڕدایکمی دەگوت دایە، لە زمان منیشەوە بە پوورم، ژنەکەی تری بابمی دەگوت پووری.

لەولاشەوە زڕدایکم[1]پتەی لێدەی دەقەڵشێ. چەندەی ڕق و قین لە من بوو، ئەوەندەشی ڕق و قین لەو کچە فەقیرە بوو. لەوە دەترسا بابم لەخۆی مارە بکات، بۆیە دیسان مەلا کەریمیان بانگ کرد. بابم و مەلا کەریم کەمێکیان چەنە لێک دا و من و حەبیبیان لە یەکتر مارە کرد.

لەسەر حاڵی خۆم ڕا زگم بە حەبیبی دەسووتا کە زڕدایکم چەند بێبەزەییانە دەگەڵی هەڵدەستا و دادەنیشت. بەیانیان زوو لە خەوێی هەڵدەستاند و سەوەتەی بە شانیدا دەدا تا وەدوای گاڕانێ بکەوی بۆ کۆکردنەوەی ڕیخ و شیاکە. ڕۆژێ سێ جار هەرجارەش دەبوو ڕیخەکە بشێلێت و بیکاتە دەوە. ئاخرێکەشی هەر دەرمانداوی کرد و کوشتی و ئەویشی بەدەردی دایکم برد. بۆخۆشم نازانم بۆچی تا ئێستا منی دەرمانداو نەکردووە؟ پێشتر باسم کرد کە بابم بە قسەی خۆی لە شەڕی فلان هاتەوە کە لە ڕاستیدا ئەوە پێیدەڵێن تاڵانی فلان نەک شەڕی فلان. بارێکی دەگەڵ خۆی هێنابۆوە. دەو عانەشدا[1] دەر و جیران هاتبوون دەیانگوت:

— خەزا پیرۆز، خەزا پیرۆز.

بار و بارخانەی لە عەرزێ دا و کردێوە. کەلوپەلی ژنەفلانی تێدابوو وەک، چارشێوشان، پۆپەشمین، جلیتقە و سیخمە و چەند ئەنگوستیلە و گوارەی زێڕ. ئەوەی بۆ ژنەکان پێویست بوو دابەشی کرد بەسەریان دا. دوو زێڕی پانی تێدابوو کە پێیان دەگوت «جەعفەری».[2] ئەو دوو جەعفەرییە و ئەنگوستیلەیەک زڕدایکم گیرایەوە و نەیدایەوە بە بابم. هەرچی بابم حەولی دا بەڵام هیچی بۆ نەچوو سەر و زڕدایکم نەیدایە. کەمبەرێکی[3] تێدابوو دای بە براکەم و پێچێکی گوڵگوڵی باشی دا بە من و لەسەری خۆم هاڵاند. شەو زڕدایکم لە بابمی دەپرسی:

— ئەو کەلوپەلەی ژنان بۆخۆت لە ژنەکانت دەکردەوە؟

— نا نا، هەموو لێیان بەجێ دەما.

ئەوجار «سۆفی مەولوود» چوو دەڵاڵی هێنا سەر بارەکە و هەمووی فرۆشت و پارەکەی نەغد لە گیرفانی نا.

نازانم چۆن دڵی هات باری فلانی ئاوا بە سەر ژن و منداڵەکانیدا دابەش بکات. لای خۆی تۆبەکار بوو. ڕدێنێکی حیز و درێژی بەردابۆوە و بەردەوام لە زکر و تەلیلان بوو. شەوانە خەوی لە چاوی ئێمە حەرام کردبوو ئەوەندە گۆرانی بە سەر شێخەکەیدا هەڵبلێ. بەینێکی شەو دەما کە لەخەو ڕاست دەبۆوە. دەستی دەکرد بە نوێژکردن. ئەوجار لە نوێژان قوتار دەبوو بەردەبوو تەلیلە و زکران. لەویش قوتار دەبوو بەر دەبوو گۆرانی گوتن بە سەر شێخدا. حەیفێ کە گۆرانییەکانم

---

[1] "دەو عانەیدا" یانی "دەو ئانەیدا - لەو دەمەیدا". لە موکریان وا دەڵێن.

[2] بڕوانە کتێبی (فەرهەنگۆکی خشڵ و پۆشاکی ژنانەی موکریان)، نووسینی: مامۆستا عەبدوڵڵا سەمەدی. ل: ٨

[3] مەبەستیان کەمەر، یان پشتێندێکی خشڵە کە لە ناوقەد دەیانبەست.

هەموو لەبیر چۆتەوە. وەک چۆن جحێڵێک عاشقی کیژێک دەبێ و بە سینگ و مەمکیدا هەڵدەلێ، ئەویش ئاوا بە شێخەکەی هەڵدەگوت و بەدەم گریانەوە دەینالاند و تێیهەڵدەکرد:

- عەلییە و عەلی و عەلی گەردن کۆ، هەر بە منداڵی مەیلم دا بە تۆ.
- بەیانە و بەیانە، بۆنی چفە و شاڵەکەی شا حیسامە.
- خۆم بەقوربانی قەدت بم بۆچی وا ڕەعنا دەڕۆی
  تاوسی باغی بەهەشتێی یان بە عەمدەن وا دەڕۆی.[1]
- بۆچ بڕۆم لێ تێک دەنێی ڕوو وەردەگێڕی چاوەکەم.
- یان دەڵێی حەددت نییە ڕزینم بێ بە حزوور
- دەستم دامانت یا حیسامەددین مەدەد
- شاهی شاهان داوێنی تۆم گرتووە
- ڕۆژی عەشرێ تۆ دەناسم شاهی شاهان عەلی زوورە
- گەر دەرم کەی ڕوو دە کوێ کەم هیچ پەنای دیکەم نییە
  دەربەدەر پوستم دەرێنی دێمەوە چارم نییە.
- هەر بەپیری تا بەتفلێ قەت دڵم بێخەم نەبوو
  گەردووشی ئەو چەرخە کۆنە قەت لە من غافڵ نەبوو

کە ئەوانەی دەگوت پاشان دەیکرد بە گریان و ڕۆڕۆیەک وەک تازە بابی مردبێت. هێند شتی سەیرسەیری دەگوت خۆ هەمووم بۆ نانووسرێت. جا ئەو ئیشانەشی دەکرد. بەقەولی خۆی، ماڵی حەرامی نەدەخوارد بەڵام دەیهێنایەوە و بە سەر ماڵ و منداڵی خۆیدا دابەشی دەکرد.

وایلێهاتبوو کە بەیانیان تێیدەسرەواندم، ڕاستبەوە، بڕۆینە مزگەوتێ و نوێژ بکەین. منیش جوابم نەدەدایەوە. ئەوجار دەکەوتە سەرم بە پێلاقە و لێبادان، دیسان دەنگم لەبەر نەدەهات. بە هەزار هەڕەشە و تێهەڵدان، دەگەڵم خەریک بوو نوێژم پێبکات بەڵام هیچ چاری نەکردم. ئاخر، من لەوەتا وەبیرم دێت بە لێدان ڕاهاتووم. هیچ کارم تێناکات. گیانم خووی بە ژانی لێدانێ گرتووە. خودا بتانحەسێنێتەوە دەستم لە نوێژان هەڵگرت و ئێستاش‌ئێستایە بۆلای نەچوومەوە.

ئەوە بابم ئێستا بێستانچییە. یەکەو بژارچنێکی دابوو بە من و حەبیبی و بژارمان دەکرد. من زۆرم گوێ نەدەدایە و خۆم دەدزییەوە. شەوانەش من و حەبیب دەبوو لە بێستان بنووین. بەخێر، حەبیب لە من مارە کراوە بەڵام هەردووکمان هێند منداڵین هیچ‌لەهیچ نازانین. وەک خوشک و براین و ڕۆژانە کە کاتی ببێت، دەیکەینە گاڵتە و گەپی منداڵان. پوورەکەشم دەگەڵ زڕدایکم لێیان بوو بەشەر و دەمێکە کە تۆراوە و چۆتە ماڵە خزمێکی خۆی. بابم و زڕدایکیشم چوونەتە ماڵی برای

---

[1] ئەم بەیتە بەشێکی لە گۆرانی (کانێ ئاسکان)ـە کە هونەرمەند محەممەدی ماملێ زیندووی کردۆتەوە.

زڕدایکم کە ناوی «ئەحمەدی مەلا شێخ»ـە، ڕەحمانیشیان دەگەڵ خۆیان بردووە. من و حەبیبیش بەردەوام لە بێستانێین. بابم بە قسەی خۆی بێستانی بە من ئەسپاردبوو و هەر دەیگوت:

- بێستانی بەجێنەهێڵی، باشت ئاگا لێبیت. نەچی نێو منداڵان و ئاگات لە بیستان ببڕێ ها!

زڕدایکیشم نان و پێخۆری بەتەسەلی بۆ دانەنابووین. هەرچی بەپێخۆر دەمانخوارد بەڵام هەر کەمیمان دەهێنا. هەردووکمان بە برسێتی دەنووستین. لای نیوەشەو بەخۆمم گوت:

— ئەوە حەبیب نووستووە، بۆ ناچێوە بۆ ماڵێ بەشکوو شتێک بدۆزێوە بۆ خواردن، خۆ ئەوە حاڵ نییە ئێمەی تێداین.

تەماشام کرد حەبیب خرپەی دێت. شەیتانم بەنەحلەت کرد و بە ئەسپایی هەستام وەدەرکەوتم. چوومەوە بەر دەرکی ماڵێ. بەسەر دەرگایدا وەسەر کەوتم. خۆم دەحەسارێ هاویشت و شوێن هاچەرەکەم دەزانی، هاچەرەکە دار بوو، گوڵەکەش دار بوو. کردمەوە و چوومە ژوورێ. گەڕام، گەڕام چیم دەستگیر نەبوو. تەماشام کرد سندووقی لیباسی زڕدایکم ئاواڵەیە. کاتێک کە لیباسی گۆڕیبوو، لەخۆشی ماڵی براکەی لەبیری کردبوو دایخاتەوە. لە تاڵووکان هاچەرەکەی لە خوارەوەی سندووقەکەی بەجێهێشتبوو. تەماح هەڵیگرتم تا بزانم نێوی ئەو سندووقەی کە باوکیشم هەترەی نییە بۆلای بچیت، چی تێدایە؟

دەستم کرد بە پشکنینی. بۆ چما دوو لەو زێڕە پانە جەعفەرییانە و چەند ئەنگوستیلە و جووتێک گوارەم نەدۆزییەوە! تەمام بوو هەموویان هەڵگرم و بیبەم بەڵام نەموێرا.

یەک لە زێڕە پانەکانم لە گیرفانم نا و وەدەر کەوتم. لەبەر نەفامی خۆم و لەترسی زۆر، سندووقەکەم گاڵە دا و هاچەرەکەم لەسەر سندووقەکە دانا. ئەدی نەمکرد کە سندووق و هاچەرەکە وەک خۆی لێبکەمەوە. ئەوجار هاتمەوە بێستانێ و حەبیب هەروا لە شیرنخەو دایە و خرپەی ڕیی ڕۆژێکی دەڕوات و نازانێ دەوری چ پاشایەکە. بە ئەسپایی چووم زێڕەکەم لە قەراغ بێستانی شاردەوە.

تاو و بان گەرم بوون و بابم و زڕدایکیشم پەیدا بوونەوە. زڕدایکم گەڕایەوە بۆ ماڵێ تا نانمان بۆ بێنێ، ئاخر بۆخۆیان لە ماڵی براکەی نانیان خواردبوو. کە هاتەوە هیچ باس نەبوو. جلە جوان و خاوێنەکانی لە سندووقەکە نابووە و لیباسە کۆنەکانی دەبەر کردبۆوە. گوتم:

- نۆخەی، شوکور نەیزانیوە، تازە زێڕ خورا و چاوی پێیناکەوێتەوە.

بابم باری بازاڕێی لە بێستان هەڵگرت بەرەو بازاڕ ڕۆییشت تا بیانفرۆشێت. زڕدایکیشم دەگەڵ کوڕەکەی لەناو بێستان دەگەڕان. منیش چووم زێڕەکەم دەرهێنا و دەخۆم نووسام بۆ دوکانی زێڕینگەران. ئەو دوکان و ئەم دوکانم کرد، بەڵام نەمویرا دەنگ لەو زێڕە دەرهێنم، ناچار گەڕامەوە.

لە گەڕانەوەمدا بەرەو مەیدانی ئاردی دەهاتم. لە کوچەی «خاڵۆغڵی» تووشی «ڕەحمان جوجیلە»ـی بووم. ڕەحمان دەڵاڵە و کەلوپەلی بە شانێوەیە بۆ فرۆشتن. تووشی بووم و پێشم پێگرت.

پێمگوت کە زێڕێکم پێیە و لێم بکڕە. نیشانم دا و گوتی وەرە بەدوامدا. چووینە مزگەوتی عەجەمان. دیسان تەماشای کرد و لێی‌پرسیم:

- لە کوێت دزیوە؟ منیش ڕاستییەکەم هەموو پێگوت.
- گوتی: چەندت بدەمێ؟
- گوتم: کەیفی خۆتە.

دەریهێنا ۲۲ قرانی دامێ و هەڕەشەی لێکردم:

- نەکا پێتبزانن و لێتبدەن و جەزرەبەت بدەن، نەکەی ڕاستێ بڵێی و ناوم بێنی.
- خەمت نەبێ، کەوڵیشم کەن، هیچ ناڵێم.

گەڕامەوە چوومەوە مەیدانی ئاردی. سەروپێیان دە مەنجەڵاندا کوڵاندبوو و دەیانفرۆشت. هەمووی بایی چەند شاییان بوو منیش دوو قرانم دەرهێنا و دام بە کابرای. ئەویش پارەی خۆی گێڕایەوە و باقی دامەوە. ئەوجار حەبیبم هاتەوە یاد کە لەخۆم هەناسەساردترە. لەخۆم برسیتر و داماوترە. یەکسەر چووم بۆ «سولی کەباب»ـی[1] چەند شاییم دا بە کەباب و جەرگ و دڵ، دەنانیم نا و پێچامەوە. بڕێکیشم مێوژ و لەبلەبی و سوجوق کڕی و لە گیرفانم ئاخنی. زانیم کە ئێستا لە «گۆمی چارداوەڕووان» گاڕان مۆڵدراوە و حەبیبی چارەڕەش لەوێیە تا ڕیخی گاڕانێ کۆ بکاتەوە. بە هەڵەداوان چووم بۆ ئەوێ. کە گەیشتمێ، دیتم حەبیب دەگەڵ چەند دەستەخوشکی خۆی بە سەوەتەی پڕ لە ڕیخەوە دانیشتووە بۆ حەسانەوە. کە منی دیت، بە پیرمەوە هات.

---

[1] ئەو دوکانەی کە جەرگ و دڵی برژاو دەفرۆشێ.

پێمگوت کە سەوەتەکەی هەڵگرێت دەگەڵم بێت بچینە ئەوبەری. لەباتی وەڵام بداتەوە زوو هاتە دەنگ و پرسی:

- ئەوە چییە لەبن پیلت دایە؟!
- با بڕۆینە ئەو بەر پێت دەڵێم.

پەڕینەوە بۆ ئەوبەر و سەوەتەم پێدانا و بردمە قەراغ بێستانی خۆمان و دامنیشاند و نان و کەبابم لەپێش دانا. واق مابوو. کۆمەڵێکی پرسیار لا دروست بوو بێجگە لە کوڵێک ترس. بە پەشۆکاوی لێیپرسیم:

- ئەوەت لە کوێ گیر کەوتووە؟
- چەند نەفەر پیاوی «گومرگی» لە «باغی کوێر» عارەقیان دەخواردەوە من بەوێدا تێپەڕبووم، عارەقیان قوتار ببو، گازیان کردم و پارەیان دامی تا عارەق و خواردنیان بۆ بکڕم. چوومە بازاڕ، بۆمکڕین و پاشان چەند شاییەکیان دامێ. منیش چوومەوە شار و پارەکەم دا بەو شتانە و بۆتۆم هێنا. تێر بخۆ و خەمی هیچت نەبێ.

زۆر دڵپاک و بێگەرد بوو. زوو باوەڕی پێکردم.

- ئەدی ئەتۆ بۆ ناخۆی؟
- من لەوێ پاشماوەی ئەوانم خواردووە و تێرم. تۆ نانی خۆت بخۆ و خەمی منت نەبێ.

ئەوەندەی برسی بوو کە وەک هاران دەیخوارد. وەها بەربووە نان و پێخۆرەکە، مشەمشی ڕێی ڕۆژێک دەڕۆیی. لە کەبابەکە کە تەواو بوو، کەوتە سەر گێوژ و لەبلەبی بەڵام ئەوی زۆر پێنەخورا. بۆم لە پەڕۆیەک وەرپێچا و لە قەراغ پەرژینی بێستانەکە بۆم شاردەوە و پێمگوت: ئێوارە کە چووی بۆ ڕیخ کۆکردنەوەی لەوانەیە برسیت ببێتەوە، جێگاکەی نیشانە بکە و دەریهێنە و بیخۆ. حەبیبی چارەڕەشی لە من چارەڕەشتر، قەتی شتی ئاوا نەدیبوو. لە ماڵی خۆمان دەخۆی ناخۆی، بەیانیان لەتەنانێک، نیوەڕۆیان نانێک و شەوان نانێک. کامە مرۆڤ بەو خواردنە کە ئیمە دەمانخوارد لە ماڵەوە تێرزگ دەبێ تا ئێمە تێرزگ بین؟

من و حەبیب زۆرمان یەکتر خۆشدەویست. وەک خوشک و برا وابووین. هیچلەهیچ نازانین. لای خۆی لێک مارە کراوین، ژن و مێردین. بە من دەڵێ کاکە. قەت لە دڵم دەرناچێ. لەسەر حاڵی خۆم ڕا هەر خەمی ئەوم بوو. من کوڕ بووم و دەمتوانی بەرەی خۆم بە هەر جۆرێک بێت، لە ئاو دەربێنم. بەزیادم نەکرد بەخێر باوکی خۆشم هەبوو، بەڵام ئەو کەسی نەبوو. هەر خودا دەزانێ تا چارەنووس بە دەرگای «سۆفی مەولوودە چرچی» دانەدابوو و نەکەوتبوو بەردەستی «شاشان»ـە شەیتان، لە چ ناز و نیعمەتێکدا بووە. زڕدایکم حەمباڵی و پیسترین کاری پێدەکرد بەڵام نووزەی لەبەر نەدەهاتە دەر. بەشی ئەو هەر قسەی سووک و نانە زگەکە بوو. بە دەیان جار بەسەریدا هاتوومەوە کە دە تەنیاییدا بۆ سەربوردە و حاڵ و چارەنووسی خۆی دەگریا. منیش ئەوەندەی بۆم دەکرا، دڵداریم دەدایەوە و ژیانی خۆمم بۆ دەگێڕایەوە و بە گاڵتە و گەپ لەبیریم دەبردەوە و

بۆی دەبوومە برا و ئاگام لێی دەبوو. منداڵێکی وەک من هەر ئەوەندەی لە دەست دەهات، دەنا دەستم ڕۆیشتبا، دەمزانی چۆن قەدری ئەو خوشکە پاک و بەقیمەتەم بگرم.

با بێینەوە سەر نەقڵەکەی خۆمان. باقی ئەو پارەیەی کە لە فرۆشتنی زێڕەکە بۆم مابۆوە، بردمە «مێشەی حاجی مشیری»[1] دەنێو دەوەنێکدا تاقەتم کرد. ئەوجار چوومەوە بێستانی خۆمان. دڵم وەک گونی هەللاجی لێیدەدا. دەمزانی ئاخری تووشی چەرمەسەری دەبم. ئەوە پێنج-شەش ڕۆژ تێوەرسووڕاوە بەڵام هیچ خەبەر نییە و کەس هیچی نەزانیوە. ئەو ماوەیە هەموو ڕۆژێ ئەوە کار و پیشەمە و دەچم لەو سولی کەبابە تێر دەخۆم و بەشی حەبیبیش دەبەمە شوێنەکەی خۆی. جاری وا بوو سجووق یان «هەڵوای دۆیمە»ـشم بۆ دەکڕی. چەند ڕۆژان بە خۆشی ڕامانبوارد.

ڕۆژێک لە بیستان دەگەڵ بابم لە قۆناغ دانیشتبووین. زڕدایکم لەماڵەوە بوو. هێشتا نانی نیوەڕۆمان نەخواردووە. چاوەڕێین زڕدایکم بێت و نان و چامان بداتێ. تەماشام کرد زڕدایکم ئەوە یەکبەخۆی دەگووڕڕێنێ و بە هەڵەداوان بەرەوڕوومان دێت. بەخۆمم گوت:

— ئەوە ڕۆژەکەیە کە لێیدەترسام.

هەر گەییە ساباتێ، لەپێشدا تفێکی دەڕووی کوتام. بۆم هات لێم بدات، بابم دەستی گرت و گوتی:

- چی بووە؟ چ قەوماوە؟ بۆ وا دەکەی؟ بۆ شێت و هار بووی؟
- لە جەعفەرییەکان یەکیان نەماوە.
- جا محەممەد بڵێ چی؟
- ئەو بێشەڕەفە، ئەو هیچ و پووچە، ئەو ... دزیویێتی.
- باش ناو سندووقەکە گەڕاوی؟
- هەمووم سەر و ژوور کرد. دیار نییە و دیار نییە و دیار نییە.
- با بڕۆینەوە ماڵ تا باشتر بگەڕێین.

تەمام بوو ڕا کەم، بەڵام بەری دەرکەی گرتبوو بۆم نەدەکرا. بابم پیلی منی گرت و وەپێش خۆیان دام بۆ ماڵەوە. لەو ڕێگا و بانەش زڕدایکم چەند جاران هوروژمی بۆ هێنام، بەڵام بابم دەستی دەگرت. دەلوورێنێ وەک سەگ و بەکەس بێدەنگ نابێ. هەرچی بابم لەبەری دەپاڕێتەوە، بەڵام وەک شێتانی لێهاتووە و وسکت نابێ. «ئاڵای بێستانچی» و چەند نەفەری دیکە بە هاوار و ڕۆڕۆی من و زیق و هۆڕی زڕدایکم، وەسەر گەڕان. هەرچەند قۆڵی دەگرن و لێمی دوور دەکەنەوە، خەراپتر دەبێ. هەر دەڵێ دزی کردووە و ناشوێرێ نێوی زێڕەکە بێنێ.

هاتینەوە ماڵێ. سندووقیان سەر و بن کرد، هیچیان نەدۆزییەوە. گیرفانم گەڕان، هیچیان

---

[1] مێشە یا باغی "حاجی مشیری" دەکەوێتە بەری باکووری چۆمی سابڵاغ لە پەنای "بیمارستانی سیل"ی ئێستا.

دەستنەکەوت. ئەوسا بابم بە فیت و هاندانی شاشانێ بەربوو لە گیانم، لێمدەدا ئەمما لێدان. منیش حاشای لێدەکەم و ئەویش باوەڕ ناکات. تا شل و شەکەت بوو کوتامی، هەر نەچوومە ژێری. ئاخری دە ژێرخانی کردم و سوێندی خوارد بەسەری شیخ حیسامەددینی، ڕاستێ نەڵێی، تا گیانت دەردەچێ لەو ژوورەدا دەتهێڵمەوە. جارجار لێم وەژوور دەکەوێ و چینێکیترم دەکوتێ، دیسان ناچمە ژێری و حاشای لێدەکەم. بەڵێنم بە ڕەحمان جوجیلەی دابوو کە کەوڵم بکەن باسی هیچ ناکەم.

لەو بەینەیدا کە لێدان و کوتانی بابم هەبوو، هاوار و ناڵەی منیش ئەو گەڕەکەی هەڵگرتبوو. هەرمەنییەکی[1] پیاوچاکمان جیران بوو ناوی «مامی گون» بوو، کە گریان و هاواری من حەجمینیان پێهەڵدەگرێ. بە خۆی و ژن و منداڵێوە بە هاوارم هاتن. ئەوان پێشتریش دەیانزانی کە من چ حاڵێکی شڕم هەیە بەدەست زڕدایکمەوە. شاشان جامین[2]ی ئەو ماڵەی نەدەویست. چونکە زۆر جاران لۆمەی شاشانێیان دەکرد و بەتایبەت کە دەیانزانی حەبیب فلە بووە و بەزۆر کردوویانە بە موسوڵمان و ئێستاش وەک دیل و یەخسیر هەڵسوکەوتی دەگەڵ دەکەن، بۆیە شاشان و بابمیان زۆر ناخۆش دەویست. مامی گون هاتە زگ بابم، لێی‌پرسی:

- ها سۆفی؟ ئەوە چییە؟ ئەو کوڕەت بۆ لە نیوەڕۆیەوە دەگری؟ بۆ لێیدەدەی؟ چیت لە گیانی ئەو منداڵە دەوێ؟

---

[1] "هەرمەنی" یان "ئەرمەنی" بە کەسێک دەگوترێ کە بنەچەی "ئەرمەنی" و هاوکای مەسیحی بووبێ. لە موکریان و بەتایبەت لە مەهاباد بە "هەرمەنی" بانگ دەکرێن.لە مەهاباد گەڕەکێکی ئەوشارە بە ناوی (گەڕەکی هەرمەنییان) هەیە.

[2] "جامین گرتن" یانی خاتر گرتن، ڕێز دانان، قازانج کردنی کەسێک، لاگیری کردن. ئەو وشەیە لە موکریان زۆر باوە.

- قوربان دزی کردووه
- چی دزیوه؟

چونکە زێڕەکە ئی فلان بوو، نەیوێرا لەدووی باسەکە بدات. دەترسا کابرا لاپەڕەی کۆن هەڵبداتەوە کە چووبوو فلانی ڕووت کردبوو و حەبیب و بارە ئەسپێکی دەگەڵ خۆی هێنابۆوە. بڕێک لە بابم تووڕە بوو گوتی:

- کە من ئەو دزییەم کردبا، ئەوهەموو لێدانەشم لێدرابا، گەر زێڕەکەم لابایە، ڕاستیم هەر دەگوت.

هاچەری ژوورەکەی لێوەرگرت و لە ژوورەکەی دەرهێنام، لێیپرسیم:

- چیت دزیوە؟
- هیچ.
- ئاخر باوکت لەسەر چی لێت دەدات؟
- دەڵێ زێڕت دزیوە. دایکم خۆی دزیوێتی و بەسەر منی دادێنێت.

هەرمەنی کەوشدروو بوو، دەستی درێژ بوو، لە ئیدارە و میداران، خەڵکێکی زۆری دەناسی، بە بابمی گوت:

- گەر دزیبای، ڕاستی دەگوت. چی دی لێیمەدە. بەسییەتی.

پیلی گرتم بۆ ماڵە خۆیانم بەرێ، بابم نەیهێشت. زانی لەوێ قسەی لەسەر دەکەم و پەتەی خۆی و شاشانی وەسەر ئاو دەخەم. لە کۆتاییدا هەرمەنی هەڕەشەی لیکرد:

- من ئەوە دەڕۆم بەڵام چیتر لێینەدەی ها! گەر بیبیسمەوە لێتداوە، نیوانمان زۆر تێکدەچێ!

هەرمەنی ڕۆییشت و ئەوانیش وەپێشخۆیاندام بۆ بێستانی. لەوێ ئەوجار بەخۆشی و قسەی نەرم تێمهاڵان:

- ڕۆڵە گیان چیت لێکردووە؟ بەکێت فرۆشتووە؟ مەترسە، دەچین پارەکەی دەدەینەوە و زێڕەکە وەردەگرینەوە.

هەرچی حەولیان دا، هەر حاشام لێکرد و هیچیان گیر نەکەوت. لەو بەینەشدا کە من بەدەستیانەوە لە ژێر جەزرەبە دام و لە ژێرخانیان کردبووم، حەبیب هاتۆتەوە ماڵێ ڕیخ بشێلێت و دەوە بکات. کە گوێی لە هاوار و ڕۆڕۆی من دەبێت، لەترسان هەڵدێتەوە بۆ بێستانێ. کە ئێمەش گەڕاینەوە بۆ بێستان، تەماشام کرد لە ترسان وەک ژوشک کووڕمە بووە و هەڵتوتەکاوە. کافر ئاوری بۆی تێبەردەبوو. چوومە پەنای و کەمێکم دڵداری دایەوە و هێوەرم کردەوە و لە نیگەرانی دەرمهێنا و تێمگەیاند کە هیچ شتێک ڕووی نەداوە کە مەترسی بۆ ئەو هەبێت جا بەو جۆرە هاتەوە سەرخۆ.

دوای ڕۆژێکی ناخۆش و پڕ لە هەرا کە هەموومانی لە ڕادەبەدەر شەکەت کردبوو، هەروەها پاشی حەولێکی زۆری ماڵەوە دەگەڵ من، کە ڕاستییەکانیان بۆ بدرکێنم و هیچیان دەست نەکەوت، شەو ڕاکشا و لە حەیفان چوون نووستن. من و حەبیب لەخوار کەپرەکە جێگامان بۆ مابۆوە و بە

هەرجۆرێک بێت جێگای خۆمان کردەوە پێخەوێکمان دۆزییەوە و بەخۆمان دادا و نووستین. چەند ڕۆژ بوونەوە و چەند شەویشی بەدوادا هات. بەردەوام لێمدەکۆڵنەوە. هەمان پرسیارەکانی جاران دووپات دەکرانەوە:

- ڕۆڵە گیان چیت لێکردووە؟ بەکێت فرۆشتووە؟ مەترسە، دەچین پارەکەی دەدەینەوە و زێڕەکە وەردەگرینەوە.

هەرجارەی بەجۆرێک دمدوێنن. بەنەرمی قسەم دەگەڵ دەکەن، جاجار لێم هەڵدەقولینجێنن، جارجاریش بە قسەی خۆش و پێکەنینێکی درۆ دەمبزێونن. جوابی منیش هەمان وەڵامی پێشوو بوو، «نازانم و ڕاحەتە گیانم». بە هیچ نەچوومە ژێری. ئەو ماوەیە باش ئاگام لە زڕدایکم بوو کە دەیویست لە داخی ئەو جەعفەرییە شتێکم بەسەر بێنێت. لەخۆم دەترسام. ڕۆژ نەبوو بیانوویەکم پێنەگرێ. ئاگام لێبوو کە کارێکی وای دەکرد کە من و ئەو بەتەنیا بمێنینەوە تا بەڵایەکم بەسەر بێنێ یان وەک دایکم سەرم بخوا، بۆیە نەمتوانی لەوە زیاتر لە ماڵەوە بم و هەڵاتم و نەچوومەوە ماڵێ.

هەر شەوەی لە کەلاوەیەکی دەخەوتم بەڵام پێخەفم نەبوو. زۆرم سەرما دەبوو و شەوانە چەقوچۆم دەهاتێ، لێوە لەرزەم دەگرت. زۆربەی زۆری ئی برسێتیش بوو. چەند جارانم هەوڵ دا پێخەفێک بۆخۆم بدزم بەڵام چیم دەستگیر نەبوو. ناچار دەچووم دە حوجرەکانی مزگەوتی سووردا دەنووستم. بابم کە بۆ نوێژی بەیانیان دەهاتە وێ، مجێورەکە بە «مەلا سەلیم»ـی ئیمامی مزگەوت دەڵێ. ئەوجار مەلا سەلیم و خەڵکەکەش بابم لۆمە دەکەن و بەسەری دەڕۆن، دەڵێن ئەو کوڕە بەرەوە ماڵێ گوناحە.


خوالێخۆشبوو میرزا مەحموود عەزیمی.

شەو بۆ نوێژی خەوتنان دیتم بابم هاتە حوجرەی و یەک-دوو چەپۆکی بە سەرم دادا و یەک دوو تفی لێکردم و وەپێشخۆی دام بۆ ماڵێ. ئەو شەوە زڕدایکم هەر نەیدواندم و لێم مۆن دەبۆوە.

بەیانی پاشی نانخواردن وەپێشخۆی دام بۆ

بازاڕێ. بەهار و هاوینان بێستانچییە و زستانانیش دەگەڵ میرزا «مەحموودی عەزیمی»[1] شەریکە لە دوکانی عەلافیدا. منی بردە لای میرزا مەحموودی و بە ئەوی ئەسپاردم و بۆخۆی ڕۆیی، پاش ماوەیەک هاتەوە و بردمی بۆ دوکانی «حەمە گودێوی کەبابچی». بە سرتە چی پێگوت؟ نازانم؟ بەڵام لەو ڕۆژەوە بووم بە شاگردی ئەو. کەبابم بۆ باوەشێن دەکرد و لە کاراندا کۆمەگم دەکردن، پیش مشتەریم خاوێن دەکردەوە، باش هەڵدەسووڕام. نیوەڕۆیان دوو کەباب و نانێکم دەدرایە و مانگێ ٥ قڕانیشم مووچە هەبوو.

«متەلیب» کوڕە گەورەی حەمە گوودێوی لە من زۆر بە عومرتر بوو. دوکان هەڵگیراوە و بابی چۆتەوە بۆماڵێ، چەند باری ڕەژی کڕیبوو منیش دە قەڕتاڵانم دەکرد و دەمبردە ڕەژیدانەکە. لەسەر چی بوو؟ نازانم! هەستا بە زللان دایگرتم. نە یەک، نە دوو. لێمان بوو بە شەڕ و منیش ڕۆییبوومێ و ئەو زەلامەم دەبنەخۆم نا و دوو-سێ مستم لە لاچاوی دا. بۆ چما چاوی هەڵنەمسا! ڕەش و شین هەڵگەڕابوو! ئەدی ڕاوەنەستام و چوومەوە ماڵێ و ئەوم بەجێهێشت. بەیانی هەستام و چوومەوە کەبابخانەی. حەمە گوودێو کە منی دیت لە دوور ڕا ماشەکەی پێدادام و دەستی کرد بە جنێودانێ:

— بڕۆ هەی سەگی سەگباب.

کردی بە هەرایەک نەبێتەوە. بۆ دوکاندارەکانی دەگێڕایەوە کە لە کوڕەکەی داوم و لاچاوی ڕەش و شین کردۆتەوە. بەو جۆرە دەرکرام. نەموێرا بچمە دوکان لای بابم، چوومە ماڵێ و لەوێ پرسییان:

— بۆ نەچوویەوە بۆ کارێ؟

— دەری کردم!

— بۆچی؟

— نازانم!

نەمگوت لە کوڕەکەییم داوە. لەسەر ئەو حاڵەش ڕا لە کەسم قەبوڵ نەدەکرد. بەو منداڵییە خۆمەوە کێ با، جوابم دەدایەوە. تەنیا جوابی زڕدایکم پێنەدەدرایەوە جارێ، پاشان پێتان دەڵێم کە چۆنم جواب دایەوە کە تازە نەتوانێ بڵێ لەل. ئەوە هەشت-نۆ-دە ساڵ عازابی منی دا و هەموو داهاتوومی فەوتاند. چەند جاران ویستی لەنێوم بەرێ، بۆی نەکرا.

---

[1] لە بەشی پەڕاوێزەکان و لە لاپەڕەی ٤٢٣ کورتەیەک لەسەر میرزا مەحموودی عەزیزمی بخوێننەوە.

## پەنا بردن بۆ «کێچاوا»[1]

ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ لای چۆمی چووم. کوڕی «مەلا محەممەدی موعتەمەد» نێوی «ڕەزا» بوو، لە دەم گۆمی جولەکان قولاپی داویشت بۆ ماسی گرتنێ. لە خۆم زەلامتر و گەورەتر بوو. لەسەر چی لێمان بوو بە شەڕ؟ لەبیرم نەماوە! گرتم دەبنەخۆم نا و سەر و گوێلاکیم بە مست و پێلاقان داگرت. بەوەشی لێ ڕازی نەبووم و قولاپم لە دەستی هەستاند تا لێی بشکێنم. بۆ چما قولاپ دە زاری هەڵنەچەقی! بەربوو زیق و هۆڕ. خەریک بووم لە زاری دەربێنمەوە بەڵام قولاپەکە چەزووداره و دەر نایەت، دیتم هەتیو لە خۆی چووە. کە وام دیت، دەخۆم نووسام و وەک بای ڕامکرد. لە دوورەوە ئاوڕم دایەوە و دیتم کە گەورە و منداڵ لێی وەکۆ بوون. لەولاشەوە «مام ئەڵڵای بێستانچی» کەوتوتە دووم، بۆی نەگیرام و چوومە نێو قەبران.

پاش من ڕەزای بە دارەمەیت دەبەنە لای حەکیمی و زاری بۆ هەڵدەدڕن و چەزووی قولاپی لە زاری بۆ دەردێنن. پاشان دەڕۆنە ماڵێ بەشوێنمدا تا تۆڵەم لێبکەنەوە، من لەماڵ نابم بەڵام موعتەمەد خۆی و کوڕە گەورەکەی و چەند فەقێ، بەردەبنە گیانی بابم، ئەوەندەی دەکوتن تا لەخۆی دەچێ و بەجێیدێڵن. ئەوجار دەکەونە شوێن من بە کۆڵان و باغ و باغاتان دا، هەر نامدۆزنەوە. منداڵان خەبەریان دامێ کە چییان بەسەر بابم هێناوە، بۆیە ناوێرم بچمەوە ماڵێ چونکە دەزانم بابم کەوڵم لە حاجەت دەخا. لەولاشەوە دەمزانی کە وەگیر مەلا موعتەمەدی بکەوم هەر دەمکوژێت، بۆیە سەری خۆم هەڵگرت ڕووم دە شاروێرانێ کرد. ئەو ڕۆژە چوومە «کێچاوا»ـیە.

لای تاوپەڕانە و دەگەڕێم لەنێو دێی تا شوێنێک بدۆزمەوە لێی وەحەسێم. چوومە بەر دوکانێکی لەسەر سەکۆکەی دانیشتم. دوکاندارەکە کابرایەکی پیر بوو. لای ڕۆژئاوابوونێ کابرا دوکاندار لێم هاتە پێش و گوتی:

— کوڕم خەڵکی کوێی؟ بۆ لێرەی؟

— گوتم: خەڵکی شاریم و بابم دەری کردووم و منیش هاتوومە ئێرە.

بڕێکی دیکەی دواندم و ئینجا دەرکەی ماڵەکەی کردەوە و ژنەکەی بانگ کرد و بردیامە ژوورەوە. نان و خواردنیان بۆ هێنام و پاش نانخواردنێکی تێرەزگ، لە نێوی بابمی پرسی. کە ناوەکەم پێگوت نەیدەناسی.

— گوتی: کە وایلێهات، بۆ هیچ کوێ مەڕۆ، لێرە بە و ببە بە کوڕی من، ڕازی؟

— ڕازیم.

ژنەکەی زۆر منداڵ بوو، من وەمزانی کچێتی. کابرا «ڕەشید بەگ»ـیان پێدەگوت، منداڵی نەبوو،

---

[1] کێچئاوا گوندێکە لە دەشتی شاروێران کە لە ٤٠ کیلۆمیتری باکووری مەهاباد هەڵکەوتووە

کاتی خۆی عەسکەری تورکان بووە، لێرە ماوەتەوە و لەو دێیە دوکانی داناوە، ئەو ژنەشی هێناوە. ماڵ و حاڵێکی باش، دوو گامێش، چەند مانگا، چەند سەرێکیش مەڕ و بزن و نۆکەرێکی هەرزەکاری لە دەرکێ بوو. دوو مانگ زیاتر یا کەمتر لەو ماڵە بووم. ڕۆژانە لە دەوری دێ ئاگام لە بەرخ و گوێلک دەبوو تا نەچن دە مووچە و مەزرای خەڵکی. تێر و پڕ بووم و زۆرم پێرادەگەییشتن، زۆریان خۆشدەویستم، هەرچی پێیان دەگوتم زوو بەجێم دەگەیاند. تا ڕۆژێک لە قەراغ دێ منداڵان کۆ ببونەوە و گاڵتە و قوماریان دەکرد، منیش خۆم تێهەڵقولاندن و بەربوومە کایە کردن. لەسەر چی دەگەڵ کوڕی کوێخای دێ بوو بە شەڕمان؟ نازانم! ئانبازی بووم و دەرۆستم نەهات و چاکم لێدا. برا گەورەکەی هات و بەر زللانی دام و بڕیک جنێوی نالەباری دا. لەسەر ئەوە، هەر ئەودەم ڕێگای شارم گرت و هاتمەوە شار. ڕۆژ ئاوا بووە، ژنی ڕەشید بەگی هەموو ڕۆژێ نانی نیوەڕۆیەی بە تەسەلی بۆ دە تورەکە دەنام، پێخۆر با، پەنیر با یان شیرێژ با دەیدامێ، لەو نانەی دە توورەکەیدا هەر مابووم تێر لێم خواردبوو و برسیی نەبووم. شەو داهات و بۆ نووستن لە شوێنێک دەگەڕام لێی بخەوم. ساڵ گەرمە و خۆم دە کەلاوەیەکی لای ماڵە خۆمان کوتا و لە تاقێکی لێیکەوتم. سەگێک لەو کەلاوەیە ترەکیبوو و منی دیوە و هەر دەوەڕی ئەوەندەی قوروسکاندبوو لێی نەدەبڕیوە. ڕاست دەبوومەوە و بەردم بۆ داویشت، خەراتر دەبوو. بەو چەق و لوورەی، بابم دێ، تەماشا دەکات ئەوە منم دەگەڵ سەگەکە دامبەستووە. قۆڵی گرتم و گوتی:

— عەمر کورت ئەوە ئەتۆی؟ وەرە وەپێشم کەوە. ئەو وەختەی لە کوێ بووی ها؟

وەپێش خۆی دام بۆ ماڵێ بەڵام لێینەدام، هەر توک و نەفرینیم لێدەکا، جنێوم پێدەدا. زڕدایکیشم کە منی دیت تێوچاوانی لێ گرژ کردم و لێم مۆن دەبۆوە. پوورم لەماڵ نەبوو و وەک جاران، دیسان زیز ببوو. حەبیبیش لە سوچێک هەڵتووتەکاوە و چاوی بۆ من تەڕە و دەگری. بەدزییەوە زۆری من خۆشدەوێ، لەبەرئەوەی من لەسەر بەدبەختییەکانی خۆم ڕا، زۆری بۆ باش بووم و ئاگام لێیبوو. ئەو شەوە نووستین و بۆ بەیانی نان و چا خورا و بردینی دە حەسارێی کردین، بەردی دە حەسارێ دەگرت. یەکەو جەواڵێکی داینێ وەپێش خۆی داین بۆ چۆمی تا بەردی چۆمەکەی بۆ دە جەواڵان بکەین. من دەچووم دەنێو چۆمەکەوە و بەردم فڕێ دەدا بۆ ئەوبەر و حەبیبیش دە جەواڵانی دەکرد و کە پڕ دەبوون، بە شانی خۆماندا دەدا بۆ ماڵێ. چەند ڕۆژان ئەوە کار و پیشەمان بوو تا حەسارەکە سەنگبەرد کرا و قوتار بوو. پاشان بردینی بۆ بێستانێ و ئەوەی پێیدەسپاردین بەجێمان دەهێنا. عەزاب و برسیکردنەکەی ئەو زڕدایکەم لە جاران خەراپتر ببوو، زۆر دڵڕەقتر بوو. هەردووکمان زۆر برسی دەکات. منیش بۆ وەدەستهێنانی خواردن هەموو کەلێن و کولێنێکی ئەو ماڵە دەگەڕێم، هەرچی وەچنگم کەوێ دەیدزم و دەیخۆم. شاشانیش هەرچی خواردنە لێمان دە قفڵ و هاچەری دەنێ. لە لێدانیش ناترسم، لەبەرئەوەی کە چاوم کردۆتەوە دەگەڵ لێدان بووینە هاواڵ و بە جەزرەبە و عازاب گەورە بووم.

## شەڕەگەڕەکی سابڵاغێ

ڕۆژانە دەچوومە شەڕەگەڕەکێ، ئەوزەمان هەر گەڕەکەی گەورەی خۆی هەبوو. گەورەی گەڕەکی ئێمە نێوی «بوداغ خان» بوو کوڕی «دولبەری کاکاغای».[1] منداڵی ئەو گەڕەکانە وەک عەسکەری گەرەکێ، دەگەڵ گەڕەکێکی دیکە وەک دوژمن وابوون. منداڵی ئەو گەڕەکە بۆ گەڕەکێکی دی نەیدەوێرا بەتەنێ بڕوات، لێیدەدرا. هەموو ئێواران دەبوو بە شەڕەقۆچەقانی، هەر دوو گەڕەک یان سێ گەڕەک بەیەکەوە پەیمانیان دەبەست و وەک پەیمانی «وەرشەو» و «ناتۆ» دەبوونە یەک. ماڵمان لە گەڕەکی مزگەوتی سوور بوو. گەڕەکی ئێمە دەگەڵ گەڕەکی باغی سیسەی دەچووینە گەڕەکی حاجی حەسەنیان. ئەو دوو گەڕەکە یەک بوون و دەگەڵ گەڕەکی بازاڕی و گەڕەکی هەرمەنیان بەشەڕ دەهاتین. شەڕەقۆچەقانی لە شاخی داشامەجیدی دەکرا. شەوانەش شەڕە گۆپاڵ دەکرا. ئی وا هەبوو بزماری ناڵی ئەسپانی لە سەری گۆپاڵەکەی دەدا. جاری وا هەبوو پیاوی گەورە یان پیاوی جحێڵی سەر و ڕیشدار دەهاتنە نێو شەڕەکە.

هەوەڵ ڕۆژ کە چوومە داشامەجیدی بۆ شەڕەقۆچەقانی زۆر ئازا بووم و سەری «عەزیزی حاجی سەدیقی»ـم شکاند. ئەو ڕۆژە گەڕەکی ئێمە شەڕەکەی بردەوە و بازاڕ و هەرمەنیان دۆڕاندیان و شەیپوور لێدرا و لەشکر دەستیان هەڵگرت لە شەڕ. منیش قۆچەقانییەکم خەڵات کرا. لەخۆشیان کە بداغ خان تاریفی کردووم و قۆچەقانی بە خەڵات داومێ، هەر جیفڕکم لەخۆم دەدا، وامدەزانی ئەو دونیایەم پێبەخشراوە. هەرکەس بڵاوەی کرد و چونەوە ماڵە خۆیان، منیش قۆچەقانیم لە پشتی خۆم بەست و چوومەوە ماڵێ. ئیتر هەموو ڕۆژێ دەچوومە شەڕەگەڕەکێ. ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ ئازاتر دەبووم و زیاتریان خۆشدەویستم.

شەڕەکان قانونی خۆی هەبوو. کە شەیپوور لێدەدرا، شەڕ دەستپێدەکرد و گەر ماندوو دەبوون، بۆ پشوودان سێ شەیپوور لێدەدرا و گەر شەڕ کۆتایی پێهاتبا، هەر شەیپوورێک لێدەدرا. کاتێک شەیپووری حەسانەوە لێدەدرا، هەموو دادەنیشتن. کوڕە توجاڕ و دەوڵەمەندی زۆر دەنێو دابوون و هەموو شتی خواردنیان دەبەر پشتێندی نابوو و دایاندەنا بۆ خواردن، چونکە دەشەڕدا ئازابووم وەکوو ئەوان دەمخوارد و شەرمم نەدەکرد. وا خۆشەویست ببوم کە وای لێهاتبوو ئەوانەی لێم دوور بوون بۆخۆیان خواردنەکەیان بۆ دەهێنام و لەپێشیان دادەنام.

---

[1] دولبەر لە ڕاستیدا کچی کاکاغای دارۆخەی سابڵاخ بووە کە مێرد بە ڕەشید ئاغای ئیندرقاش دەکات و یەک کوڕیان دەبێ بە ناوی بوداغ. سپاس بۆ کاک ڕەحمەت تەوەکوڵ کە ئەو زانیارییانەی دامێ. (زانیارییەکانی چاپەکەی پێشوو هەڵەبوو)

## چارەنووسی من و زڕدایکم

ساڵێک بەسەر چوو. ئەو ساڵەشم بە بەدبەختی و چەرمەسەری بەدەست بابی ناباب و زڕدایکی نادایک و دڕ، تێپەڕ کرد. پووریشم زووزوو دەتۆرا. بابم چاری نەدەویست. شاشان دیسان زگی هەڵمساوە (دووگیانە). کاتی بێستانە. بەر و بووم گەیونێ. ڕۆژێکی نان و چای بەیانیمان خوارد و بابم بارێکی ترێزوو بۆ بازاڕ برد بیانفرۆشێت. زڕدایکم لە بێستان دەگەڵ کوڕەکەی خەریک بوو. زانیم لە ماڵێ چەوەندەری دە تەندووری ناوە. سووکێکی لە بێستان وەدەر کەوتم بە پشت ماڵە «حەوڵای[1] کورتاندروو»ــدا وەسەر بان کەوتم. خۆم گەیاندە سەربانی خۆمان. بە قولەلدا شۆڕبوومەوە حەساری خۆمان. چوومە مدبەقێ. تۆ مەڵێ، ئەوە زڕدایکم دوابەدوای من هاتۆتەوە ماڵ. جا نازانم کاری هەبووە، یا دەیزانی کە من خۆ دەگەیێنمە چەوەندەرەکان؟! یا بەراستی داوە بۆی داناوم تا دە تەندوورم هاوێت و بسووتێم و پاشانیش بڵێ ئەوە لەسەر چەوەندەران سووتا و مرد؟! نازانم!

دەرخۆنەم لادا چەوەندەر دەرهێنم. دەگەڵ دەستم ڕۆهێشت بۆ تەندوور، زەبرێکی قورس و گران وە تیغەرەی پشتم کەوت. هەناسەی لێبڕیم، بە جۆرێک کە نەمدەتوانی هاوار بکەم. کەمی مابوو سەر و بن لە تەندووری کەوم. زۆر بە چەتوونی خۆم گرتەوە. ئەو نابەشەرە هیچ کە خۆی نەبزاوت کە بمگرێتەوە، بگرە قیت ڕاوەستا بوو لەسەرم تا ببینێ چۆن لە پۆلووان دەکەوم و دەسووتێم و دەمرم. دەیزانی گەر تێکەوم هاتنەدەرەوەم ئاستەمە، ئاخر هیچ کە منداڵ بووم، باڵاشم کورت بوو و نەمدەتوانی خۆم قوتار بکەم لەو ئاورە. دەیویست کە منیش یان وەک دایکم و وەک حەبیب بمکوژێت یان بە پەندێکمدا بدات. دەوکاتەدا کە نەمدەتوانی هەناسە بدەم، بە هەر جۆرێک بێت ڕاست بوومەوە بەڵام چۆکم هەر لە قەڕاغ تەندوورەکە داهاتبۆوە. لێم هاتە دەنگ و گوتی:

- گۆڕبەگۆڕ دایک، زێرەکەشت ئاوا دزیوە؟

درێژەی بە جنێوان دا و نەیدەبڕیوە...

چۆماغەکەی وا لە پشتم دابوو کە لەبەر ژانی پشتم بەری چاوم تاریک ببوو، هەر بومەلێلێکم دەدیت. تەماشام کرد بستەی تەندوور لە تەنیشت تەندوورەکەیە. بستە، ئاسنێکی پانە و لەسەر تەندووری دادەنێن بۆ بن مەنجەڵ و قاپ و قاچاغ. ڕۆبوومە بستەی تەندووری و بە هێز و قەوەتی خۆم زەبرێکم وەشاند ڕاست وە خاڵیگەی کەوت. زیقەی لێوەهات و تەخت لە عەرزی کەوت و

---

[1] "حەوڵا" یان "عەوڵا" و زۆرجارانیش "عەبە" کورتکراوەی "عەبدوڵڵا"ـیە و لە موکریان بە هەرچوار شێوە بەکاری دێنن.

لەخۆی گەوزا. واشی لێنەبوومەوە. هەستامەوە و زەبرێکی دیشم لە پشتی دا. تەماشام کرد هەست و خوستی نییە. جووڵە ناکات. ترسم ڕێکەوت و هەر وا بە بێهۆشی بەجێمهێشت. بە سەرلێشێواوی ڕام دەکرد. نەمدەزانی چ بکەم؟! لەپڕا خۆم لە بێستانی خۆمان دیتەوە. تەماشا دەکەم ڕەحمانی برام منی دیوە و بەدوومدا ڕا دەکات و هەرام دەکاتێ:

- کاکە؟ کاکە؟ بۆ کوێ؟ منیش بەرە. کاکە گیان؟ کاکە؟

من کە خۆم لێبارە و لەوپەڕی سەرلێشێواوی دام، نەمدەتوانی بیر لە ڕەحمانی براشم بکەمەوە. ناچار بۆی گەڕامەوە و یەک-دوو بەردم ڕێهاڵاند و گێڕامەوە.لە چۆم پەڕیمەوە. حەجمینم نییە، لەو مێشەیە بۆ ئەو باغ، لەو بێستان بۆ ئەو مێرگ و لەو موچەیە بۆ ئەو مەزرایە. لە پڕ خۆم لە «مێشەی کوردان» دیتەوە.

تا لای نیوەڕۆ خۆم لە بن ئەو دەوەن و پنچکەدا حەشار دا. کونی مشکیم پێ تەنگە. لە هیچ کوێ حەجمینم نییە و ئۆقرە ناگرم. لای نیوەڕۆیە گوتم با سەرێک لە قەراغ شار بدەم بزانم چ باسە؟ نەموێرا بچمە ئاستی بێستانی خۆمان. چووم بۆ بەستێنی چۆمی. خەریک بوو بپەڕمەوە ئەوبەر. چاوم لێکرد «ئامینە سوور»ـی ئاوکێشمان هاتبوو بۆ چۆمی ئاوی بەرێ. هەرای لێکردم گوتی:

- سەربەقووڕ ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ زڕدایکت دەحاڵی خۆی دایە و منداڵەکەی لەبەر چووە و خۆشی ئەوە لە گیانەڵڵا دایە. بڕۆ لەو ئارانانە مەمێنەوە. باوکت کون بە کون لە تۆ دەگەڕێ. وەبەر چنگی بکەوی لێکتهەڵدەدڕێت و کەوڵت دەکات. بڕۆ و پشتسەری خۆشت چاو لێمەکەوە.

که وای گوت، هێندەی دی ترسم ڕێکەوت و نەپەڕیمەوە، گەڕامەوە دواوە. دەیان پرسیاری زیاترم لا دروست بوو! ئەوجار ڕوو لە کوێ بکەم؟ خۆ من لە شار و لە کۆڵانەکانی خۆمان بەولاوە ڕووم لە هیچ کوێ نەکردووە. شەو لە کوێ بخەوم؟ چ بخۆم؟ بڵێی بابم بمدۆزێتەوە چیم لێبکات؟...

بە دەم فکر و خەیاڵانەوە سەری خۆم هەڵگرت و ڕێگام داگرت. نەمدەزانی بۆ کوێ دەچم. که سەرم هەڵێنا دەبینم لە ناو دێهاتێکی دام بە نێوی «کەرێزەی شێخان»[1]. لە نیزیک شار، دەرکەیەکی زەلامم بینی. چووم لەسەر خواجانەی بەر دەرگاکە هەڵتوتەکام. هەر کەس دێت، لێمدەڕوانێت و بە سەروسەکوتم ڕا دەزانن منداڵی ئەو دێیە نیم! کابرایەکی دەنێوچوو هات لە دەرگاکە بڕواتە ژوور، تەماشایەکی کردم گوتی:

- خەڵکی کوێی؟!
- خەڵکی شاریم.
- لێرە چی دەکەی؟!
- زڕدایکم دەریکردووم و سەری خۆم هەڵگرتووە و خۆشم نازانم ڕوو دە کوێ کەم.
- بابت هەیە؟
- هەمە.

چۆ ژوورێ، بڕێک پێچوو، ژنێکی جحێڵ هات بردمی بۆ وەتاغێک، تەماشام کرد خانمێکی دەنێوچوو پاڵی داوەتەوە و کابرای پیریش بە حەواوە ڕاوەستاوە، سڵاوم کرد، گوتی:

- دانیشە، لە چی دەگەڕێی؟
- زڕدایکم دەری کردووم و ڕووم دێرە کردووە.

بە ژنە جحێڵەکەی گوت کە بەرە لە مدبەقێ نان و مانی دەنێ، منیش چووم. دیار بوو ئەوان نانی خۆیان خواردبوو کەچی، قاپێکی شۆرباوگۆشت و سفرەنانیان لەپێشی دانام، تێر و پڕم خوارد. لەو دەمەدا خانم هاتە مدبەقێ گوتی:

- لێرە بە و مەڕۆوە لای زڕدایکت

بە کابرای پیریشی گوت کە:

- بیبە باغی با ئاگای لە باغ بێت تا نەهێڵێ مەڕ و ماڵات بێنە ناو باغەکە و عەدمی کەن.

کابرای پیر وەپێش خۆی دام بۆ باغی قەیسی کە تازە ئاوی تێدەگەیی.

ڕۆژێکی لە باغ بووم کە کوڕەکەی خانمێ، «پاشاخان» لە شار هاتەوە. خەبەریان دابوویە کە خانم کوڕە سابڵاغییەکی ناردووە بۆ باغ تا ئاگای لە باغ بێت. پاشاخان بە خۆی و چەند منداڵ هاتن بۆ لام لە باغ. لەپێشدا دەستیان کرد بە «چەلیک منزڵ» و گاڵتەی تر، منیش دەگەڵیانا. پاشان

---

[1] ئەو گوندە لە لای ڕۆژئاوای سابڵاغ هەڵکەوتووە. ئەوکات دەوری ٦ کیلۆمیتر لە مەهاباد دوور بوو, ئێستا دەڵێن مووچەکانی دەگەڵ شار تێکەڵ بوون.

دەستیان کرد بە زۆرانی [زۆرەوانی] و منیشی دەگەڵ کوڕێکی هاوتەمەنی خۆمدا پێکهەڵپڕژاند. ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو، لە عەرزم دا. پاشاخان کە ئاوای بینی، کەیفی پێم هات و دەگەڵم بوو بەدۆست. چ بە منداڵی، چ بە گەورەیی پێم شک نایەت کەس پشتی لە عەرز دابم.

بۆ ڕۆژی داهاتوو تەماشامان کرد لەشکرێک کە یەکجار زۆر بوون بە بەر ڕێگاکەی دەم باغەکەدا تێپەڕین. هەمووی هەر کورد بوون. لە مەنگوڕ ڕا بگرە تا دێبۆکری، عەشایر دەڕۆیشتن بۆ سەر سمکۆ. چەند نەفەر ئەفسەری ئێرانییان دەگەڵ بوو. ئەو عەشایرانەیان دەبرد بۆ سەر سمکۆ. بۆ لای نیوەڕۆیە لە «مەحمەشە»ی[1] لادەدەن و بار دەخەن بۆ حەسانەوە. ئەوەندەمان زانی بووە بە تەق و هووڕ.


عەلی ئاغای حاجی ئیلخانی (عەلیار). مەشهور بە ئەمیر ئەسعەد

پاشان بیستمانەوە کە لەسەر لقەدارێک دوو نۆکەر لێیان دەبێتە شەڕ و یەکیان دەکوژرێت. ئەوجار ئەوانەی تر پێوەردەبن. لەو شەڕەدا چەند ئاغای مەنگور و دێبۆکری دەکوژرێن. نۆکەر هەر باسیان ناکرێ کە زۆریان لێ دەکوژرێ. چاوی «عەلی ئاغای حاجی ئیلخانی»[2] دەو شەڕەدا کوێر بوو.[3] ئیتر لەشکر بۆی نەکرا بچێتە شەڕی سمکۆی و

---

[1] ئەو گوندە ١٥ کیلۆمیتر لە کەرێزەی شێخان و لە مەهاباد دوورە و لە باکووری مەهاباد و باشووری شاری نەغەدە هەڵکەوتووە.

[2] عەلی ئاغا ناسراو بە (ئەمیر ئەسعەد) گەورەی عەشیرەتی دێبۆکری بوو. زیاتر لە ١٧ دێی هەبوو. دوکتور ئاسۆ لە کتێبی بیرەوەرییەکانی خۆیدا بەناوی (خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو، نووسینی: دکتر قادر محمودزاده (آسو) ل: ٧٥ ئاوا لەسەر عەلی ئاغا دەدوێ: (عەلی ئاغای ئیلخانیزادە پیاوێکی کەڵەگەت و بەخۆوە بوو. چاوێکی لە شەڕی مەحمەشەی دەگەڵ مەنگوڕان کوێر ببوو. عەلی ئاغا دەنێو کوردەکانی نیزیک لەخۆی و خزم و عەشیرەتی خۆی بە"ئینگلیس" ناودێر بوو بەو مانایە کە پیاویکی وشیار و فێڵەزان بوو. ئەو دەگەڵ شایەکانی سەردەمی خۆی نێوانی خۆش بوو تەنانەت ناسناوی لە شایەکانی قاجار وەرگرتبوو. شاری بۆکان بەخری ئی ئەوان بوو). بنەماڵەی ئیلخانی، پاشان بوون بە سێ بەرە: ئیلخانیزادە، عەلیار، موهتەدی. شوێنی دانیشتنی سەرەکیان "بۆکان" و "حەمامیان" بوو، عەلیئاغا خۆی لە گوندی "کانی‌ڕەش" دادەنیشت. لە مانگی گوڵانی ساڵی ١٣٢١هـ/١٩٤٢ز بوو بە فەرمانداری شاری سابڵاغ.

[3] لەسەر ئەو شەڕە کاک حەسەنی قازی نامەیەکی بۆ ناردم کە لەلایەن یای "ئاڵما فاسوم" یەک لە میسۆنێرەکانی ئەمریکایی کە بۆ ڕۆژنامەی کوردستان مینشنێری نووسیویەتی. بڕوانە لاپەڕەی ٤٨٦.

هەمووی بڵاوەی کرد. هەر ئەو ڕۆژە لەشکر گەڕایەوە شار و دیتمان چەند کەلاک لەسەر بارگین دابەستراون. چەکداری مەنگوڕ بەو لایدا ڕۆیون و دێبۆکرییەکانیش بەو شوێنەی پێشوویاندا گەڕانەوە.

مانگێک زیاتر یا کەمتر لەو دێیە بووم. تێر و پڕ بووم. دەرپێیەکی خام و جووتێک کەوشی یەمەنی سووریان بۆ کڕیبووم. خەبەرم زانیوە کە زڕدایکم خۆی و ئەو کوڕەی دە زگیدا بووە مردوون. ئەوەی لە زگیدا بوو هەر ڕۆژی یەکەم مردووە و خۆشی پاشی سێ ڕۆژان کە لەسەر جێگا دەبێت، دەمرێ. پوورم کە دیسان شاشان تێیهەڵکێڵابوو و ئەویش زیز ببوو، ڕۆیشتبوو بۆ ماڵی خزمێکیان، بابم کە دەبینێ کەسی لە دەورە نەماوە و شاشان و حەبیب مردوون و کەس نییە ئاگای لە ڕەحمان بێت، هەڵدەستێ دەچێت پوورم دەهێنێتەوە ماڵێ.

لەو بەینەشدا نازانم کێ خەبەری دابوو بە خانم کە ئەو هەتیوە دایکی خۆی کوشتووە. ڕۆژێک لە باغ دەگەڵ پاشا خانی لێمان بوو بە شەڕ. ئەو خۆشخۆش بە زللان و بە شەق لێم دەدات و منیش هەر پاشەکشەم دەکرد. بە هیچ دەستی هەڵنەدەگرت. گەرم داهاتووە و هەرچی هاتە بەردەستی پێمدادەدات. بەردێکی هاوێشت ڕێک وەسەرم کەوت و خوێن فیچقەی کرد و بە ڕوومەتمدا هاتە خوارێ. کە خوێنم دیت، بەری چاوم تاریک بوو. ئەوجار ڕۆیبوومێ. دە بنە خۆم نا و بە مست وەسەر و گوێلاکی کەوتم. دەرفەتم نەدەدایە دەست بکاتەوە. چەند منداڵێک کە لەوێ بوون بەپەلە خەبەریان بردەوە نێو دێ. تەماشام کرد ئەوە دوو نەفەر پیاوی زەلام بە ڕاکردن بەرەو ئێمە دێن. کە ئەوەم دیت، یەکپێ لەسەر پاشاخان ڕاست بوومەوە، جا وەرە ڕا کە.

هیچ کە بەو شەڕە ماندوو ببووم، هێندەی دیش بەو هەڵاتنە برکم کرد. ئێدی باسی ئەوەش ناکەم کە هەنگاوەکانی ئەو دوو کەسە بە دوو لۆقاوی من دەبوون، بۆیە لە کوچەی باغی «عەزیز ئاغا» گیرام. هەتا توانییان تێیان هەڵدام. بەیەکجاری لەکەلکیان خستم. ئەوەندەیان بە نووکە شەق لە کەلەکە و سینگیان دابووم کە پەراسوویەکم شکابوو. کاتێک لە لێدانم ماندوو بوون، ئەوجار ڕەکێشیان کردم تا بمگێڕنەوە بۆ ناو دێ. هەروا کە بە ڕەکێشڕەکێش دەیانبردمەوە بۆ لای دێ، یەکیان هاتە دەنگ و بە ئەوەی دی گوت:

- بە غەوس بیبەینەوە دێی، پاشاخان دەیکوژێت، خۆ ئێمە لەکەلکمان خست. با بەڕەڵڵای کەین و بڕوات بەسییەتی.

هەر لەوێ بەڕەڵڵایان کردم. هیلاک و شەکەتم. تەواوی قالبەندم بە خوێن و قووڕ سواغ بووە. زمانم وا ویشک بووە کە تفم بۆ قووت نادرێت. بەهەر حاڵێک بێت خۆم گەیاندە جۆگە ئاوێک. تاوێک بۆی درێژ بووم. ئێشی گیانم کەمێک سووک بوو. ئاوێکم بە سەر و گوێلاکمدا کرد و کەمێک هاتمەوە سەر خۆ. دیسان فکر و خەیاڵ هەڵیانگرتم. نەمدەزانی ڕوو لە کوێ کەم؟! بگەڕێمەوە دێ، دەکوژرێم. دەڕۆمەوە بۆ شار، ژنی بابم کوشتووە. بابم تووشم بێت، ڕۆحم لێدەستێنێت. وردەوردە

برسێتیش هێرشی بۆم هێناوە. چوومەوە شاری و لە بازاڕ دەخولێمەوە و لە مەیدانی ئاردی لە تەماشای سیحربازان ڕاوەستابووم. دیتم دەستێک لەسەر شانم دەدات، کە ئاوڕم دایەوە «سەید ڕەحیمی سەید جامی» بوو. بانگی کردم و لە خەڵکەکە دووری کردمەوە و گوتی:



ساڵی ۱۳۰۳هـ - ۱۹۲۴ز، سەید جامی جەعفەری دەگەڵ کوڕەکەی سەید قادر جەعفەری

— بۆ نایەیە کنم، ڕۆژانە گامێش و مانگاکانم بەریە ئەودیوی قۆڕغی بیانلەوەڕێنی و ئاگات لێیان بێت؟

وا دیار بوو کە گاوانەکەیان دەرکردبوو. دەگەڵ خۆی بردمی بۆ تەویلەکەی. ئەوە لای نیوەڕۆیە بەڵام ماڵات هەر دە تەویلەی دان. ناردی نان و پێخۆریان بۆ دە تورەکەی نام و ماڵاتەکەم وەپێش خۆم دا بۆ مەزرای «داشتەمر»ـی. مەزراکەش و دێیەکەش ئی خۆیان بوو. ماڵات دمیان لە لەوەڕین نا و بۆخۆشم لەسەر گردی گڕاوان دانیشتم تا تاوپەڕان و ماڵاتم وەپێش خۆم دایەوە بۆ ماڵێ و شەویش لە تەویلەکەدا نووستم. جێگام باش بوو، ئەوێم چاکتر بوو لە کەلاوان. شەوێ کڵفەتەکەیان خۆراکی بۆ هێنام و جێگای نەرمونۆڵم ڕاخست و بۆی نووستم. یەک-دوو مانگان ئەوە حاڵم بوو.

ئێوارەیەکی گاڕانم هێنایەوە ماڵێ و دیتم «سەید قادری سەید جامی» برای سەید ڕەحیمی، لێیدرابوو و تۆرابوو و تووڕە بوو، لەسەر پلیکانەکان دانیشتبوو، نازانم جنێوی بە کێ دەدا؟ ئەوەندە تووڕە بوو کە ئاگای لە دمی نەبوو کە دەڵێ چی! لەبیرم نەماوە بۆچی لە پلیکانەکان دەچوومە سەر، لەپڕ سەید قادر ڕقی ئەوانی بە من دەرکرد و بەربوو جنێودان و قسەی سووک پێم، خۆ لێبڕانەوەشی نەبوو. لێی چوومە پێشێ و گوێچکەییم برێک بادا و زللێکی باشم لە بنانگوێی دا، کردی بە قاژ و قیژێک نەبێتەوە. منیش گوتم وەک پاشا خانیم لێدەکەن با بۆی دەرچم. تا «بارامە کوێر»ـی نۆکەریان و سەید جامی نەیانزانیوە، با ڕاکەم.

ئێستا لە حەول دام شوێنێک بدۆزمەوە تا شەو لێی ستار بم. هەر لە گۆترە و لەڕووی ناعیلاجی،

ڕووم لە لای «پردی سوور» کرد و چوومەوە لای «عەلیئاباد»ـی،[1] لەوێشڕا خۆم گەیاندە «پشتەپ»ـی.[2] لامدایە ماڵێکی و داوای نانم لێکردن. ئەوانیش نانێکیان دامێ. نانەکەم کە خوارد ئەوجار بە زنوێری «چواربەردان»ـدا[3] شۆڕ بوومەوە. لای نوێژیشێوان گەیمە «گەنەدار»ـی.[4] لە ناو دێدا خولێکم لێدا. دیتم کەس ناناسم. لە پڕرا چاوم بە مزگەوت کەوت. وەژوور کەوتم. دیار بوو جەماعەت لە نوێژ قوتار ببوون. چەند کەسێک لەولاوە دانیشتبوون، کە منیان دی، دەستیان کرد بە سرت و خورت، جا پرسیار بە لێزمە بەسەرمدا بارین:

- کوێندەری؟
- سابڵاغیم.
- لێرە چ دەکەی؟
- دەگەڵ زڕدایکم شەڕم بووە و ڕاوی ناوم.

پاش تۆزێک مەلای مزگەوتەکە گوتی:

- کوڕی کێی لە سابڵاغێ؟
- کوڕی سۆفی مەولوودە چرچی.
- دەی باشە کە وایە کەس نییە بچی بۆ لای، ڕاست بەوە با بچینەوە ماڵی ئێمە.

وەپێش خۆی دام بۆ ماڵی خۆیان و لە ڕێگا پێیگوتم:

- باوکت باش دەناسم. تازە مەچۆوە بۆ لای زڕدایکت و لای ئێمە بمێنەوە.

بە دەم ڕێگاوە کە دەچووینەوە بۆ ماڵەکەیان بۆی باس کردم کە لە «مزگەوتی سوور» جیرانمان بوون و بابمی باش دەناسی. دیار بوو کەم و زۆر دەیزانی کە چەند داماو بووم بە دەست زڕدایکمەوە. ئەو لە مزگەوتی سوور فەقێ بووە. لەلای «مەلا ڕەحمانی گەورە» خوێندوویەتی. ساڵێک پێش ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و لەو دێیە بووەتە مەلا. هەر لەو دێیەش ژنی هێناوە. ئێستا ژنەکەی دووگیانە و زگی زەلامە و منداڵی بەڕێوەیە. شەو پاش نان خواردن، نووستین. بەیانی تەماشام کرد ژنەکەی مانگاکانی دەبرد ڕەگەڵ گاڕانێیان بخات. کاتێک کە هاتەوە خەریکی تەویلە بوو و دەیماڵی. من ڕاست بوومەوە و چووم یاریدەم دا. بە شەنە پەینەکەم لە سەوەتە دەکرد و ژنەش دەیبردە سەرانگوێلکی. بەم جۆرە تەویلەمان خاوێن کردەوە. مەلا کە لە مزگەوت هاتەوە، نان و چایەکی تێر و تەسەلمان خوارد. ئەمجار «مەلا عەلی» ڕێی شاری گرت و لای شەوێ هاتەوە.

---

[1] بەدواداچوونم بۆ ئەو گوندە کرد، بەداخەوە چیم دەستگیر نەبوو.
[2] "پشت تەپ" لە ٤،٥ کیلۆمیتری باشووری مەهاباد هەڵکەوتبوو. ئێستا دەگەڵ سابڵاغ تێکەڵ بووەتەوە.
[3] ئەو شوێنە لە نیزیک پشتەپی بووە. ئێستا بووەتە "دانشگاه پیراپزشکی". زەمانی کۆن قاوەخانەیەکی لێبوو کە بە قاوەخانەی چواربەردان مەنشوور بوو. لەوێ قاچاغچی لایاندەدا و بارەکانیان لەوێ ڕا دەبردە ناو شاری.
[4] گەنەدار لە ٣٨ کیلۆمیتری باشووری مەهاباد و لە سەر ڕێگای مەهاباد سەردەشت هەڵکەوتووە.

چاوم لێکرد کراس و دەرپێی خام و کەوایەکی بۆ کڕیبووم. هەر زوو دەبەرم کردن. منیش چاکەیانم لە چاودا بوو. لە ماڵدا وەک هەلووک هەڵدەسووڕام، مەلاژنم حەساندبۆوە، زۆرم لێ ڕازی بوو. جارجار ئاوی بۆ گەرم دەکردم و لەسەر شۆرکەی خۆم دەشوشت، زۆر دەخۆشیدا بووم. یەک-دوو مانگان لەو ماڵە بووم.

زۆر تاسەی ڕەحمانی برامم دەکرد کە پاشی مەرگی دایکی دەبێ کێ ئاگای لێی بێت. پێمخۆش بوو بزانم لە ماڵی بابم، پاش من چ ڕووی داوە! ڕۆژ نەبوو بیر لەو شتانە نەکەمەوە. بەیانییەکی کە نانی بەیانیم خوارد گوێلکەکانم بردە مەزرایە. فکر و خەیاڵ لێم نەگەڕان. دەخۆم نووسام و هاتمەوە شار. بە نێو مێشەیدا چوومە بێستانی خۆمان. ڕوانیم پوورم ئاوی گەرم کردووە و ڕەحمانی برام دەشوات. بابم لە بازاڕ نەهاتۆتەوە. چوومە لایان و خۆم لێ ئاشکرا کردن. کە چاویان بە من کەوت، شاگەشکە بوون! هەردووکیان دەستیان لە مل کردم. پوورەکەم دەگریا! ڕەحمانیش وێڕای ئەو! لای خۆی دایکی ئەوم کوشتووە و دەبوو ڕقی لێم بایە، لەخۆشی دیتنەوەی من فرمێسک لە چاوانی بەند نەدەبوو! پوورم بە ڕەحمانی گوت:

- لای باوکت مەڵێ کاکم هاتۆتەوە. ئەویش گوتی:
- باس ناکەم.

لە ترسی بابم کە نەکا بێتەوە ماڵ و من لەوێ ببینێت، منی بردە قەراغ بێستان و نان و خواردنی بۆ هێنام و چاشی دامێ و گوتی:

- جارێ خۆت پێشانی بابت مەدە با ماوەیەک تێپەڕ بێت و مەسەلەکەت با کۆن بێت تا بزانین چۆن دەبێ.

لای نیوەڕۆیە و بابم بۆ فراوین دێتەوە بێستان، دەبوایە ڕۆییشتبام. لای ئێوارێ سەردانم کردنەوە. هەستم کرد کە ناوێرن خۆم لێدەن. زوو زانیم شتێک قەوماوە. نازانم بابم بە کوێدا زانیوێتی کە من چوومەتەوە بێستان؟ تێر و پڕی لە پوورم داوە و هەڕەشەی لێکردووە کە من نەدوێنێ و ڕێگەم نەداتەوە بۆ ماڵ. ڕەحمانی زۆر خۆشدەوێ و لەوی نەدابوو بەڵام چاکی لە ڕەحمانیش هەڵپێچابوو و نەترەی نەبوو بۆ لام بێت. شەو بۆ نووستن هیچ جێگایەکم نەبوو، نەمدەزانی لە کوێ بخەوم. بەناچار چوومە قاوەخانەی «قادر سێڵەی»[1].

---

[1] قادر سێڵە باوکی ئاغای سولەیمان قزڵی بوو. ماڵیان لە گەڕەکی خرێ و قاوەخانەکەشی جیرانی شیرنیفرۆشی عەلی خومایزی بوو.

## ئازاد کردنی سابڵاغ لەلایەن سمایل ئاغای شکاک (سمکۆ)[1]

بەیانی زوو بە تەق و تۆقی سمایل ئاغای سمکۆ ڕاست بوومەوە. سمکۆ بەسەر سابڵاغێی دادا و بۆ تاوهەڵاتێ تەواوی شاری گرت. لەشکرێکی زۆری سەربازی ئێران لە شار بوون. ئەو زەمان سەربازخانە نەبوو، هەموو دە نێو شاریدا بوون. فەرماندەکەیان نێوی مەلیکزادە (ملکزاده)[2] بوو. مزڵی لە گەڕەکی جوولەکان بوو. سەربازاکانیش جێگایان بۆ لە مزگەوتان کردبوونەوە. بەشی هەرە زۆری لە مزگەوتی سوور بوون. جا شار بە فەرماندە و بە سەربازەوە هەمووی گیرا.[3] لە «مەحموودکان»ـی خۆم لە تەماشایە بووم کە هەموو سەربازەکانیان خڕ کردبۆوە و بە ڕەشاشان هەموویان کوشتن. نەفەرێک لە نێو کەلاکەکاندا ڕای کرد. سمایل ئاغا دەستوری دا کە تەقەی لێمەکەن. زۆری نەمابوو لە لێوی خەزایی[4] ئاوا بێ و قوتاری ببێت کە سمایل ئاغا تفەنگی لە پیاوێکی خۆی وەرگرت و لەو دوورەوە ڕا تەقەی لێکرد و گەوزاندی. لەو ئەفسەرانەی لەبەر پێی دانیشتبوون،[5] لە یەکیانی پرسی:

— هەراڵی سن؟ [خەڵکی کوێی؟]

---

[1] لە زۆر سەرچاواندا ئازاد کردنی شاری سابڵاغ لە ژێر دەستەڵاتی ڕەزاشای داگیرکەر لەلایەن گەورە سەرکردەی کورد سمکۆ شکاک بە "هێرش" نێو دەبردرێ. نووسەری ئەو دێڕانە ئەوە بە هەڵە دەزانێت بۆیە دەستەواژەی "ئازادکردنەوە" لە سەردێڕەکەدا بە گونجاو دەبینێ.

[2] ماژۆر (سرگرد) ملکزادەی هیربد فەرماندەی هەنگی چوارەمی ژاندەرمەری کە بە هەنگی پۆڵایین ناوی دەرکردبوو. لە ڕێکەوتی ڕێبەندانی ساڵی ١٢٩٩ لەلایەن ڕەزاشاوە فەرمانی پێ درا تا هێزەکەی لە مەهاباد جێگیر بکات.

[3] ئازادکردنەوەی سابڵاغ لەلایەن هێزەکانی سمایل ئاغای سمکۆ لە ڕێکەوتی (١٩٢١/١٠/٠٦ - ١٣٠٠/٠٧/١٨) ڕووی داوە. بە پێی ئەو ڕێکەوتە، تەمەنی کاپیتان حەمەد ١٣ ساڵ بووە. بڕوانە: کتێبی: (کورتە مێژووی بزووتنەوە نەتەوایەتییەکانی کورد) نووسینی: (دوکتور سادق شەڕەفکەندی)، وەرگێڕان لە فارسییەوە: (تەها عەتیقی)، ل:٨٩ - کتێبی: سمکۆ (سمایل ئاغای شوکاک) و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد - چاپی یەکەم ١٩٩٥- ستۆکهۆڵم - ل: ٥١٥ - کتێبی: (مێژووی کورد لە سەدەی ١٩ و ٢٠ دا) نووسینی: کریس کۆچێرا - وەرگێڕانی: محەممەد ڕیانی - چاپی یەکەم - تاران - ل: ٨٩ - پەرتووکی: (نگاهی به تاریخ مهاباد) نووسینی: سید محمد صمدی - ل: ٨٦ - کتێبی بیرەوەرییەکانی ماژۆر مەلیکزادە هیربد. هەروەها لە کتێبی کورتە مێژووی بنەماڵەی قازیـدا لە لاپەڕەی ٤٦ نووسراوە کە لە مانگی ئۆکتۆبری ١٩٢١ سمایل ئاغا هێرشی کردۆتە سەر سابڵاغ.

[4] "خەزایی" کێوێکە کە لە باکووری شاری سابڵاغ و لە سەرەتای ڕێگای ورمێ هەڵکەوتووە. گەڕەکی مەحموودکان دەکەوێتە قەدپاڵ و گەڕەکەکانی فەرهەنگیان و موکریان دەکەونە پشت و گەڕەکەکانی باغی سماییل ئاغاش دەکەونە پێدەشتی ئەو کێوە.

[5] بە پێی ئەو سەرچاوانەی لە پەڕاوێزی سەرەوە نووسراون لەو شەڕەدا تەنیا چوار کەسی پلەدار زیندوو مانەوە، ماژۆڕ مەلیکزادە هیربد، نایب هاشمی ئەمین، سلطان محەممەد تەقی ئاڵپ (ئەو کەسە لە داهاتوودا کرا بە شارەداری شاری مەهاباد لە نێوان ساڵەکانی ١٣٣٤ - ١٣٣٦) و کەسێک بە ناوی ئازەرتاش.

— مرندی. [مرند]

— کوێرەیید، کوێرە. سەنیندی[1] [بڕوانن، ئێستا دەیبینی، کەوت]

ئێمە منداڵەکان ڕۆیشتین و نەمانزانی «کوێرە سەنیندی»[بڕوانن، ئێستا دەیبینی] چی بەسەر هات؟

مەلیکزادە و چەند نەفەر لە ئەفسەرەکانی لای سمکۆ دانیشتبوون. خۆی لە بەردێک و ئەفسەرەکانیش لە خوار بەردەکە و لەبەر پێی سمکۆ دانیشتبوون. هاوکات شکاک بە شارێوە وەربوون و شاریان گەسک لێدا و تاڵانیان کرد. هەرکەسێکیان لە ناو شار گیر کەوتبا کوڵە وێنجەیان لە کۆڵ قایم دەکردن یەکسەر بۆ مەحموودکانی بۆ وڵاغەکانیان. بە چاوی خۆم دیم کە سەرداری بۆکان دەگەڵ چەند حاجی (عمیان شا)[2] کۆڵەوینجە و گیایان لێ بار کردبوون. ئارەقەیان لە ڕووخساری دەهاتە خوار. ماندوو و هیلاک ببوون. جا حاجییەکان چەند جوان بوون کەشیدەیان بە سەرەوە، کۆڵەوێنجەیان بە کۆڵەوە. گوێلاکیان پیس و قووڕاوی، ئارەقەیان تک‌تک بە تەوێڵیاندا دەهاتە خوارێ، وەختەبوو سۆیان بچێت بۆ چۆڕەئاوێک، کەس نەبوو بیانداتێ.

بۆخۆم لە مەحموودکانێ بووم کە «برایمە گۆج» هاتە لای سمکۆی و شکایەتی کرد و گوتی تاڵان کراوم. جا برایمە گۆج زۆر «شارێکی»[3] چاک بوو، هاتە پێش سمکۆ و پێیهەڵگوت، سمکۆ ئەمری کرد چی چووە بیدەنەوە. بە برایمە گۆجی گوت کە:

— ئێوە لەشکرتان کردبوو کە بێنە سەر کوردان و تفەنگان بە شکاکانەوە بنێن، ئێوە کورد نینە.

جا دەو شەڕەشدا کوڕێکی ڕەفێقم هەبوو کە تفەنگدز و فیشەکدز بوو، ناوی «سەلیم جەوهەری» بوو، کاتێک لە گەرمەی تەقەکەدا سەربازێک دەکوژرێ، دەیهەوێ بچێت تفەنگەکەی هەڵگرێتەوە، نازانم لەکوێ ڕا فیشەکێکی پێوە دەنێن و ئەویش دەکوژرێت.

ئاخری نەمزانی کە سمکۆ چی لە مەلیکزادە و ئەفسەرەکان کرد ،بەڵام پاش ئەوەی بۆخۆی شاری بەجێهێشت کەسێکی بە نیوی «شێخ عەبدوڵڵا» کرد بە حاکمی سابڵاغ. لەشکرەکەی هەڵگرت و ڕۆیی بۆ لای سەقز و هەوشار و تیلەکۆیە.

منیش لەو بەینەدا دەستم کرد بە فرۆشتنی «هەڵوای دۆیمە». شەوانەش بۆ نووستن دەچوومە بۆ قاوەخانەی «قادر سێڵە». پاش ماوەیەک «شێخ عەبدوڵڵا» ڕۆیی و لەجیاتانی کەسێک بە ناوی «حاجی سەمەد خان» بوو بە حاکمی سابڵاغ. حاجی «سەمەد خان» کابرایەکی ڕدێن سپی، ڕیش پان و دینداڕێکی ویشک بوو. لە مانگی ڕەمەزاندا هەر کەسێک ڕۆژووی خواردبایە باسی سەر بوو و خەڵکی بە توندی جەزا دەدا.

---

[1] ئەو دێڕانە زۆر بە ناڕوونی نووسراون. بۆ تێگەییشتن لە مانای دێڕەکان دەگەڵ چەند شارەزای زمانی ئازەری هاوفکریم کرد کە ئەوان ئاوا وەریانگێڕا کە نووسراوە.

[2] ئەم وشەیە ناڕوونە و دیار نییە کە چ نووسراوە؟! هەوڵم داوە وەک خۆی بینووسمەوە.

[3] مەبەستی کاپیتان "شایەرە یا شاعیر"ـە و وشەکەی بە هەڵە نووسیوە.

پێش ئەوەی سمکۆ سابڵاغ بگرێتەوە و حاکمی کوردی بۆ دابنێ، دەگەڵ هەتیوێکی «دەروێش عەجەم»ـی لێم بوو بەشەڕ، تێمسرەواند و ئەویش بە عەجەمانی بەگرتن دام. شەوێک گیرام و تا بەیانی تێیانهەڵدام. ئێستا سەمەدخان حاکمە و کورد شاری بەڕێوە دەبەن. ڕۆژێکی کە کەشەفە هەڵواکەم لەسەر سەرم دانابوو و سەرقاڵی فرۆشتنی هەڵوا بووم، لەپڕرا ئەو هەتیوە بەبەر چاومدا هات. دەیویست هەڵێ، نەمکردە نامەردی، مجۆعمە هەڵواکەم بە ئەسپایی دانا عەرزی و ئانبازی بووم. لەبنە خۆم نا، تا توانیم لێمدا. ئەوجار بەوەشی لێ نەبوومەوە. پڕمدا چەکوچی هەڵوای و چەکوچێکم لە لاچاوی دا. خوێن فیچقەی کرد و بە سەر و گوێلاکیدا هاتە خوار. عالەممان وەسەر گەڕا و پیاوی حاجی سەمەد خانی وەپێش خۆیان دام بۆ حکوماتی. هەتیویش بە سەر و گوێلاکی خوێناوی. لە ناکاو حاجی دەگەڵ چەند پیاوی خۆی هاتە حەسارێ و دەهات و دەچوو. کە ئێمەی دی هاتە پێش و گوتی:

- ئەوە چییە؟

نەفەرێک جوابی دایەوە:

- قوربان ئەو هەتیوە لەوەی داوە.

هاتە پێشم گوتی:

- بۆ لێت داوە؟ بۆ وات لەو کوڕەی کردووە سەباب؟
- گوتم: مام حاجی، کاتی خۆی کە دەوری عەجەمان بوو، دەگەڵ ئەو هەتیوە بوو بە شەڕمان. من لێمدا. ئەوجار دوو پیاوی حکوماتی بە لێدان و تێهەڵدان بردیانمە بنکەی حکوماتی. شەو و دانێک لە ژوورێکیان کردم و تا توانیان تێیانهەڵدام و شپرزەیان کردم، پاشان بەرەڵڵایان کردم. ئێستا کە تووشیی بووم منیش تۆڵەی خۆمم لێکردەوە گوتم با لەسەر دڵم نەبێتە گرێ.

بە زەردەیەکەوە چاوی بزاندە چاوم. ماوەیەکی کورت بێدەنگ بوو. پاشان شەپەڵاغەیەکی لە


ڕابەری نەتەوەی گەلی کورد نەمر سمایل ئاغای شکاک (سمکۆ)

پشت ملم دا و هەڕەشەی لێکردم کە جارێکی دی شەڕ بکەی چاوەکانت دەردێنم، بەو جۆرە وەدەریان نام. منیش کەشەفەهەڵوام لەسەر سەرم دانا و وەدەر کەوتم. هەتیویش بابی نان فرۆش بوو، هاتن بردیانەوە.

تا وڵات گەرم بوو، تیشکی خۆر پێخەوم بوو، کە شەویش دادەهات، قوژبنێکم دەدۆزییەوە خۆی لێ گلۆلە بکەم. ڕۆژانە کە لە بازاڕ شت دەفرۆشم، تووشی بابم دەبم بەڵام ڕووم لێ وەردەگێڕێت و خۆم تێناگەیێنێت. ئەوە لە حاڵێک دایە کە هەموو بازاڕ دەزانن کە زڕدایکی خۆمم کوشتووە. ڕۆژێک مجۆعمە لەسەر سەر دەمنەڕاند:

— هەڵوا، هەڵوای دۆیمە.

لە ناکاو ڕەحمانی برام کە لەنێو قەبران دەگەڵ منداڵان گاڵتەی دەکرد، چاوی بە من کەوت و بۆم هات. باوەشی دەبەرنام، تێر ڕاممۆسی و ماچم کرد، گوتی:

— کاکە وریای خۆت بە، خاڵم دەڵێ تووشی بم وا و وای لێدەکەم.

— پێمگوت: مەترسە و ئاگام لە خۆمە.

کەمێکم دڵخۆشی دایەوە و دوو شاییم لە مستی ناو و ڕۆییشتم.

خاڵیی ڕەحمانی برام، «ئەحمەدی مەلا شێخی»-یان پێ‌دەگوت. کە ڕەحمانم جێ‌هێشت دەگەڵ خۆم کەوتمە قسان.

— جا ئەحمەدی مەلا شێخی کێیە؟ چواری وەک ئەو دەپێچمەوە. ئێستا گەورە بووم و زمانم لە سمێڵانم دەخشێنم. گونم ئاوی تێگەڕاوە و هێلکەی دە بن هەنگڵمدا دەکوڵێنم. شەرت بێ کارێکی پێ‌بکەم کارستان.

## هەرزەکاریم و خۆژیاندنم

ماڵە «مەلا غەفوری کولیجی» ئاوەدان بێت کە ڕۆژانە هەڵوای دۆیمەم دەداتێ و منیش دەیفرۆشم و ئێوارانیش پووڵەکەی بۆ دەبەم و قازانجەکەش بۆخۆم هەڵدەگرم. دەو بەینەشدا، بۆ چارەڕەشیم فێرە قومار ببووم. ڕۆژانە لە نێو قەبران، گەورە و بچووک، شێروخەت دەکەن. منیش ئەوەی لە پارەی وەستام زیاد بووبا بە شێروخەت دەمدۆڕاند. تا ڕۆژێکی هەرچی پارەی وەستا و پارەی خۆم هیچ؛ تەرازوو و چەکوچ و یاڵتەبەقیشم فرۆشت و هەمووم دۆڕاند. هاتمەوە سەر حوللەمەرەسێی جاران و هەناسەسارد مامەوە. بۆ نانی ڕۆژ موحتاج بوومەوە، بەڵام بۆ خەوی شەوان دەچوومەوە قاوەخانەی «سمایلە لەگەی».[1] کە ڕۆژ دەبۆوە نەمدەزانی ڕوو دە کوێ بکەم؟ تاقە یەک شاییم شک نەدەبرد کە تاقە نانێکی پێبکڕم. لە برسان هەڵدەلەرزیم. وەک حۆلان دەسووڕامەوە. دیسان کە وەخۆ هاتمەوە دەبینم لە قەراخ چۆمیم.

زۆرجاران کە وا برسی بووم تەنیا ڕەحمانی برام لە فریام دەهات و بەشەنانی خۆی بۆ دێنام. ئەوجارەش بۆیە هاتبوومەوە قەراخ چۆمی تا بەشکوو ڕەحمانی برام ببینێت و بچێت لە لای پوورم نانم بۆ بێنێت و دیسان لە برسان ڕزگارم بکات. خۆ لە ترسی باوکیشم ناوێرم خۆم وەدەرخەم. لە کونجێکی، کز و مات، ئەژنۆم لە ئامێز گرت و تاوێکی باش بۆی هەڵترووشکام و خۆم مات کرد. بەڵام ڕەحمان سۆراخی نەبوو، برسێتیش تاوی دابووم. هیچ دەرەتانم نەبوو، ناچار مام بۆ دزینی چەند هێشوو ترێیەک ڕوو لە باغان بکەم. چوومە «باغی گوێزێ». «حامیدە کوێری» باغەوان دیتمی. لەوێ دزی ترێم بۆ نەکرا. چوومە «باغی هەباس ئاغای»، لەوێش بۆم نەلوا. ئەوجار چوومە «باغی مەولەوی»، ئێستا باغی خۆمە، بە نێو جۆگەیدا چوومە قۆناغێ. بەختی من کەسی لێنەبوو. تەماشام کرد، ژنەکەی مام شەریفی باغەوان دەناو باغدا دەسووڕێتەوە. لەچی؟ نازانم! چوومە ژووری قۆناغێ. بە دیتنی سفرەنانی سەر تاقە و دیزەگۆشتی سەر ئاورگ، ئاهێکم هاتەوە بەر. زوو چەند نانێکم پێچایەوە و لە باخەڵم نا. پەڕۆیەک لەوێ بوو قوڵفەم لە دیزەگۆشت دا و سووکێکی بە نێو جۆگەیدا نەدیو، چوومە ناو مێشەی باغی سیسەی. لە چۆم پەڕیمەوە و لەبن دارێک دیزەم دانا و نانم لە باخەڵم دەرهێنا دوودانەم لە دیزەکەی کووشی و ملم لە شۆرباو خواردنێ نا. پاشان کەوتمە گیانی پلەگۆشتان و تێرتێر خواردم. گۆشتەکە زۆر بوو هەمووم بۆ نەخورا. ئەوەی مایەوە دە نێو نانیکم نا و پێچامەوە و لە پێچەکەم نا و لوور بوومەوە بۆ ناو شاری. یەکڕاست چووم بۆ نێو قەبران. تەماشام کرد، خەڵک ئەوە کۆمەڵکۆمەڵ ملیان لە شێروخەتی ناوە. منیش ئەوە لە

---

[1] ئەو قاوەخانەیە لە مەیدانی مەنگوڕان بووە. سمایلە لەگە و برایمە لەگە هەردوو کوڕی عەبدولخالەق بوون. کە پاشان ناسناویان بوو بە جافری.

تەماشایان ڕاوەستاوم و جەرگم جەرگیی دەخواتەوە. جا وەرە پارەت پێنەبێ تا منیش شێروخەتیان دەگەڵ بکەم! بە ناچاری بۆی دانیشتم تا قوتار بوون و بڵاوەیان کرد، منیش تێهەڵبوومەوە بۆ چایخانەی.

ئەوە بێماڵ و حاڵم، شەو درەنگایەک دەچمەوە بۆ چایخانە بۆ خەوتن. بێ پووڵ و پارەم، تەنانەت پارەی تاقە چایەکیشم نییە. لە برسان ژانەزگ بەرمنادات و تا درەنگایەکی شەو هەڵدەلەرزێم. سەرباقی دەردانیش فێرە سیغارکێشان بووم. بەیانیانیش دەبوایە دەگەڵ گرفەی سەماوەر و پێش هاتنی خەڵک بۆ چایخانە لەخەو هەستابام و وەدەر کەوتبام. هەر خۆم دەزانم چیم چێشت، هیوادارم کەس وەک منی لێنەقەومێ.

بەیانیان کە لە چایخانە وەدەر دەکەوتم، گەلێک دەسووڕامەوە. لەو گەڕەک بۆ ئەو گەڕەک، لەو کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان. لە برسان چاوم ڕەشکە و پێشکەی دەکرد. ڕۆژێک بە بەر مزگەوتی شادەروێش و مەحکەمەی «قازی عەلی»[1] ـدا تێپەڕیم. بیرم کردەوە تا لە مەحکەمە وەژوور کەوم بەشکوو لە حەسار و دەرکو بانەکەی شتێکم دەست بکەوێ تا زگی برسیمی پێ تێر بکەم. شەیتانم بە لەحنەت کرد و یەکڕاست بۆ وەتاغی مەحکەمەی. لە پێشخانەکەی کەوشێکی زۆر ڕێز کرابوون. کەسیش بە دیارەوە نەبوو. زوو جووتێک کەوشی تازەم لە پێچەکەم وەرپێچا و بێئەوەی کەس ببینێت دەرپەڕیم بۆ دەرێ. تا ماڵی «ڕەحمان جوجیلەی» بەند نەبووم. کە وەژووری حەسارەکەیان کەوتم دیتم کە ڕەحمان نانی نیوەڕۆیە دەخوات، ئەویش لە پەنجەرەی ڕا چاوی وە من کەوت و سفرەی بەجێهێشت و هاتە لام، پرسی:

— ئەوە چییە لەبن هەنگڵت دایە؟

منیش پێچەکەم دە مستی ناو ئەویش لێکی کردەوە. کەوشەکەی زۆر بەکەیفێ بوو، دیسان پرسیی:

— لە کوێت دزیوە؟

— لە مەحکەمەی قازی عەلی.

— چەندت دەمێ؟

— سەرپشک بە.

دەریهێنا دوازدە قڕانی دامێ، وەرم گرت و بە هەڵەداوان چووم جەرگ و دڵم خوارد و چایەکی تاڵیشم بەسەردا کرد. لەشم گەرمای تێگەڕا، وزەم هاتەوە بەر، چاوم دەیدیت و مێشکم کاری دەکرد. ئای کە برسێتی و نەداری و بێکەسی چیت لێدەکات! یاخوا کافر بە حاڵم نەبێ. ئێستا پارەم پییە و دڵم ڕوونە و ئاهێکم هاتۆتەوە بەر. گوتم با بڕۆم پارەی هەڵوای وەستاکەم بدەمەوە و سەر لەنوی

---

[1] قازی عەلی باوکی پیشەوا قازی محەممەدە.

دەست بکەم بە هەڵوا فرۆشتن پاشان پاشگەز و پەژیوان بوومەوە. دەمم شیرن ببوو. بەخۆم دەگوت جا کاتێک دەتوانم لە کۆڵان بخولێمەوە و بە سووک و.هاسانی شتێکم گیر بکەوێ، ئیدی بۆ بچم هەڵوا بفرۆشم؟ کەوایە ناچم بۆ هەڵوا فرۆشتن. دەو سەر و بەندەیدا ئێران و عوسمانی سمکۆیان ڕاو ناوە. لەشکری شکاک و هەرکی چوونەوە بۆ وڵاتی خۆیان. «خاڵۆ قوربان»[1] بە خۆی و لەشکرەکەیەوە هاتن بۆ سابڵاغ. حکومەتی ئێران خاڵۆ قوربانی ناردبوو وڵاتی بۆ ئەمین بکاتەوە و لەولاشەوە عەشیرەتەکانی هان دابوو تا خاڵۆ قوربان و لەشکرەکەی لەناو بەرن. ئەو ڕۆژەی لەشکرەکەی خاڵۆ قوربان هاتە ناو شار، ئەویان دەگەڵ نەبوو. خاڵۆ قوربان بە خۆی و چەند کەسێکی لە ئیندرقاش بوون. بۆ بەیانی زوو لەشکری مەنگوڕ، مامەش و دێبۆکرییان بەسەریان دادان. لەو لەشکرە زۆرە تەنیا چەند کەسێک بۆی دەرچوو. خاڵۆ قوربان و دوو برازاکەی لەبەر ماڵی ئیدرقاشی کەلاکیان کەوتبوو و دوو ڕەشاشی گەورەیان لە تەنیشت کەلاکەکان کەوتبوون. من کە بۆ ئەوەی بژیم، دەگەڵ عالەمێ بۆ تاڵانی ئەو لەشکرە تا ئیندرقاشی دویان کەوتم. ئەو شتانەم بە چاوی خۆم دیت، بەڵام چیم دەست نەکەوت.

پاشی خاڵۆ قوربان، لەشکری ئێرانێ هاتنە سابڵاغ. ئەوزەمان سەربازخانە نەبوو. ئەو لەشکرە هەمووی لە ناو شار بوون. کاروانسەرای «سیمونی» تۆپخانە بوو. گەورەی ئەو لەشکرە کەسێک بوو بە ناو «مەمەد خان». ماڵی دەماڵە «مستەفای حاجی قادر»ـدا بوو. باقی لەشکر لە کاروانسەرایاندا بوون.

ئێستا دێمەوە سەر ئاکاری خۆم. ئەو ئاکارانەی کە بۆ ئەوەی بژیم و هەناسە بدەم ناچار بووم بیانکەم. وەک باسم کرد، دەستم لە هەڵوا فرۆشتن هەڵگرت. دەستم کرد بە دزی کردن. ڕۆژ کە دەبۆوە بە کۆڵاناندا دەسووڕێمەوە و جل و بەرگ یا کەلوپەلی شووشتن کە خەڵک بە تەنافانەوە هەڵیانداوەسن، دەدزم و بۆ ڕەحمان جوجیلەی دەبەم. ئەویش خۆی و ئینسافی خۆی هەرچی دایمێ، وەری دەگرم. هیچکات قڕەی دەگەڵ ناکەم، لەبەرئەوەی گەر ئەو لێمنەکریت بەیەکجاری لە برسان قرم دێت. ڕەحمانیش ئەو ڕاستییە باش دەزانێت. بۆیە هەوڵ دەدات بێقڕە پارەم بداتێ چونکە ئەو کارە هەم بە سوودی ئەوە و هەم بە سوودی منە. کە پارەکەشم وەرگرت یەکسەر ڕوو

---

[1] مەبەست "خالو قوربان هەرسینی" ـیە کە ئەویش کورد بوو و بۆ ماوەیەک بە دژی دەوڵەتی ئێران دەگەڵ "قیام جنگل" لە "گیلان"ـی ئێران بە دژی دەوڵەت شەڕی کرد و پاشان دەگەڵ دەوڵەت ڕێک کەوت. ڕەزاشا کە ئەوکات (امیرتومان یا سەرلەشکر)ی قەزاقی ئێران بوو، لێی لە فێڵ کەوت و ویستی کورد بە دەست کورد بەکوشت بدات، بۆیە ناردی بۆ سابڵاغ و شەڕی سمایل ئاغای شکاکی پێکرد و لەو شەڕەشدا سەری تێداچوو. بڕواننە: کتێبی: ساوجبلاغ مکری (مهاباد در آینیه اسناد تاریخی) نووسینی: فریدون حکیمزادە، ل: ٤٩ کتێبی: (مێژووی کورد لە سەدەی ١٩ و ٢٠ دا) نووسینی: کریس کۆچێرا - وەرگێڕانی: محەممەد ڕیانی - چاپی یەکەم - تاران - ل: ٩٩ کتێبی: خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو، نووسینی: دکتر قادر محمودزادە (آسو) ل: ٢٥،٢٦

دەکەمە قەبران و لەوێ دەیکەم بە شێر و خەت. جارجار دەیدۆڕێنم و جاروباریش دەیبەمەوە.

ڕۆژێکی لای نوێژی شێوان بوو. چوومە ماڵی «حاجی ساڵح»ـی، دەرکە ئاوەڵە بوو، سەر داڵانەکە وەتاخی میوانان بوو. وەسەر کەوتم، کەس لەوێ نەبوو. دیتم کە پڕە لە بەڕە، مافوور، فەرش و کەلوپەلی گرانگران. پڕمدایە دوو بەڕەیەکی بچووک و لوولم کردن. پەردەیەک بە پەنجەرەکەیانەوە بوو. لەتێکم دڕی و دە بەڕەکانم وەرپێچا و بە شانم دادا و بە قەراغ چۆمیدا بردم تا ماڵە ڕەحمانی. تەماشام کرد لە کوچەی جولەکان عالەمێکی زۆری لێیە. نەموێرا بەو بەڕانەوە، بەو بەرانەدا بڕۆم و بە ناو ئەو خەڵکەدا تێپەڕم، ناچار لە کەلاوەیەک لام دا و بەڕەکانم لە پەنایەک شاردەوە. ئەوجار چوومە ماڵی ڕەحمانی. تاریک داهاتبوو. ڕەحمان لەسەر نان خواردن بوو کە منی دی، هاتە حەسارێ. تێمگەیاند کە دوو بەڕەم هێناوە و لە ترسی عالەمێ لە کەلاوەی پشت ماڵیان حەشارم داون. دەگەڵم هات تا بەڕەکان بەرێ، بەڵام هەرچی گەڕام بەڕەکانم نەدۆزییەوە، تەواوی کەلێن و قووژبنی ئەو کەلاوەیەم سنگ و شووژن دا نەمدۆزینەوە. دیاربوو شیرناپاکێک ئاگای لە من بووە کە شاردوومنەتەوە و پاشی من چووە و هەڵیگرتوون. ئەو ڕۆژە لێم حاڵی بوو کە لە من پیاوچاکتریش هەن بەڵام خۆیان وەدەر ناخەن. ڕەحمان لە حەیفان یەک چەپۆکی بەسەرم دادا و کەمێکی بۆڵاند و هەردووکمان بە دەستی بەتاڵ لێکهەڵبڕاین، ئەو بۆ ماڵ و منیش بۆ چایخانە. شەو لە داخان خەوم لێنەدەکەوت و هەر جنگڵم دەدا. بەیانی زوو کە لە خەو هەستام چوومە گەڕەکی باغی سیسە. تەماشام کرد دەرکی ماڵە «حاجی مشیری» ئاواڵەیە. لووربوومە ژوورێ. ئەوان دوو حەساریان هەبوو. یەکیان بۆخۆیان لێی دادەنیشت و ئەوەی تریان کە لە پێشەوە بوو، بەکرێی دەدا. تا لە ماڵەکە وەژوور نەکەوتم نەمزانی کە حاجی موشیر ئەو لایەی بە ئەفسەرێکی قازاخی عەجەم بەکرێ داوە. ئەوکات ئێستا ڕەزاشا ناوی نەبوو، هەر ئەحمەد شا ناوی هەبوو.[1] وێدەچوو یەکەم ڕۆژ بێت کە ئەو ماڵە عەجەمە هاتوونەتە ناو ماڵە حاجی مشیری، چونکە هێشتا بارگە و بنەیان لێک نەکردبۆوە. لە حەساری پێشەوە وەسەر کەوتم، دیتم ژنەعەجەمێک لە وەتاخی پێشەوە دەم و چاوی دەشوات و کەفی سابوونەکەی دەم و چاوی داپۆشیوە. لە ناو بارگە و بنەیاندا تەنیا سندووقێکی زەلام سەری کراوەتەوە باقی تر هیچیان نەکراونەتەوە. لە ناو ئەو سندووقە زەلامەی کە کراوەتەوە پڕە لە سندووقی بچووک و بووخچە. منیش بە ئەسپایی ڕۆبوومە بوخچەیەک و لەسەرەخۆ لە هەردوو وەتاخان وەدەرکەوتم. بە قەراخ چۆمدا شۆڕبوومەوە بۆ مێشەی مشیری. بوخچەم بە شانییەوە و بەتاڵووکە دەڕۆییشتم لەپڕ لەبەر دەرگای ماڵە «حاجی نازمی» تووشی «موتەلیبی عابید»ـی بووم، گوتی:

---

[1] ڕەزا شا لە ڕێکەوتی سێهەمی ڕەشەمەی ساڵی ١٢٩٩ی هەتاوی (١٩٢١/٢/٢ز) لە دژی ئەحمەدشای قاجار کودەتای کرد و هاتە سەر حوکم. بەو پێیە تەمەنی کاپیتان دەبێ دەوری ١٠ بۆ ١٢ ساڵان بووبێ.

— هەتیوە ئەوە چییە بە کۆڵتەوە؟
لەخۆوە بەزارم داهات کە:

— نازانم ئەوانە چین. کوڕی «ڕوفیا» خانمی جوولەکە چەند شایی دامێ گوتی بیبەوە بۆ ماڵمان. ئەرێ زەحمەت نەبێ لەو کازانە[1] کامیان ماڵی وانە؟

قامکی هێمای بەرەو ماڵێکی ڕاداشت و گوتی ئەوەیان هەوە و تێپەڕی. ماڵە ڕەحمان جوجیلە لەو ئاستە نیزیک بوو، چوومە لای. ڕەحمان بڕێک ناساز بوو و ئەو ڕۆژە وەدەر نەکەوتبوو. کە لێی وەژوور کەوتم، بوخچەکەم لەپێش دانا و بۆم باس کرد کە لە کوێم هێناوە. کە لێکی کردەوە تەماشامان کرد هەمووی لیباسی ئەفسەری بوو و شنیلێکی تێدابوو هەر بریقەی دەهات، وا هەبوو کە پاگونەکەی بەسەر شانەوە بوو. کە ئەوانەی بینی، زەندەقی چوو و وەک شێتانی لێهات. پێشتر کە لەبەر نەخۆشییەکەی بە نقەنق قسەی دەکرد، ئێستا بە سەرمدا دەنەڕڕێنی و جنێوم پێدەدات. خۆزگە هەر بۆخۆی بایە، خۆ ژنەکەی لەخۆی خەراپتر بوو، هەر هەدای نەدەدا! ژنەکەی چوو لە حەسارێ بەرچیغێکی هێنا و بەربوو گیانم.

— توتکە سەگ، ئەوە سەرم بە فەتەڕات دەدەی؟ تەماتە ماڵم بە قووڕ بگری؟ هەستە هەڵگرە لایبە لێرە تا هەموو قالبەندم نەشکاندووی هەی سەگی سەگباب.

وایان پەلامار بۆهێنام کە نەمتوانی شتەکان دەگەڵ خۆم بێنمە دەر و تەنیا توانیم سەری خۆم لە چنگیان قوتار بکەم. ئەوجارەش لە گۆنگەڵێ خەڵاسیم هات و شمەکەکانیش بەو دەردە چوون. چەند ڕۆژان نەمدەوێرا خۆی پێشان بدەم. پاشان کە بۆی باس کردم، بە قسەی خۆی بە چۆمێی دادابوون. پاش ئەو ڕووداوە چەند جارێک چارشێو، جل و بەرگ و شمەک کە ماڵان بە تەنافێوەیان دادەدا بە دزی لێم دەکردنەوە و بۆ ڕەحمانم دەبرد و پارەکانی دەدامێ. بەو چەشنە ماوەیەک لە برسان ڕزگارم ببوو و ژانەزگ و پەتای برسێتی منیان لەبیر چووبۆوە.

ئەوە نێوەڕاستی پاییزە، ساڵ ساردە و تەزووی لە ئێسکان دەمرێ. هەر وا لە چایخانە دەخەوم. دەرک و پەنجەرەی ئەوێ، ئەوەندەی کەلێن و نەفەس هەیە کە هەوای ژوورێ دەگەڵ دەرەوە چ فەرقێکی نەدەکرد. سەرباقی ئەوەش هیچ پێخەوێکم نەبوو تا بەسەر خۆمی دادەم و لە سەرمان هەڵنەلەرزم. حاڵم شڕە و ڕۆژگارم تووش. دەبوایە پێخەوێک بۆخۆم بدۆزمەوە، جا لە کوێ و چۆن؟ خۆ عیشایێ خودای شک نابەم.

ئەو ڕۆژە هەموو کۆڵانەکانم کرد تا بە تەناف و سەردیوارانەوە شتێک بدۆزمەوە کە بیکەمە پێخەو بەڵام چیم دەستگیر نەبوو. چووم بۆ مەیدانی ئاردی و بۆ کاروانسەرای «حاجی نازمی». یەکسەر ملم لێنا بۆ تەویلەکەیان. تەماشام کرد کاروانی گەورکان لەوێیە و هەمووی ئێستر و ئەسپن.

---

[1] "کاز" بە مانای کوخ یا ماڵێکی فەقیرانە و شڕ.

باری تووتنیان بردۆتە کاروانسەرای و وڵاخەکانیان لە تەویلە بەستۆتەوە. هەر زوو دوو جلە ئەسپم لە وڵاخەکان کردەوە. بڕێکیان لباد بوون کە لەسەر بەفری پێی نووستبام سەرمام نەدەبوو. دۆشەگەڵەیەکی بچووکیش بەسەر وڵاخێکەوە بوو، ئەویشم تاو دایە و دەگەڵ جلەکان پێچامەوە و بە کەژوو تووند بەستم. جا ئەوجار نەمدەزانی چۆن لە تەویلەکە و لە کاروانسەراکە وەدەریان خەم! هێنام جلەکانم لە هەیوانی ڕا فڕێ دان بۆ سەربانی حەمامێ و خۆم بە دەرکەیدا و بە سەڵتی وەدەر کەوتم.

چوومە سەربانی حەمام و شمەکم هەڵگرت و بە شانم دادا و لە کاروانسەرا دوور کەوتمەوە بەڵام بچمە کوێ؟ گەر بچمە چایخانە ناکرێ چونکە هەموو کەس دەزانن کە لەو دەستە جلەی چڵکنەی لە بەرم دایە چ سامانیکی دی شک نابەم. گەر ئەو شمەکەشم بردبا بۆ ئەوی هەم خاوەنی چایخانە ئیزنی نەدەدام و هەمیش لێم وەشک دەکەوتن. هەر وا کە دەڕۆییشتم ڕێم کەوتە توونخانەی. بیستبووم کە لە توونخانە منداڵی بێکەسوکار، منداڵی هەتیو و بێدەرەتان، بۆ خەوتن ڕێگە دەدەن. گوتم وا چاکە بڕۆمە توونخانە. تەماشام کرد «مام فەرەج» خەریکی ئاوری توونخانەیە و کەسی لە لا نییە. مام فەرەج بەتەمەن بوو. بەڵام دوو عەیبی هەبوو، زۆر تووڕە و قەڵس بوو و پارەشی زۆر خۆشدەویست. لە پلیکانان شۆڕ بوومەوە و چوومە لای، سڵاوم کرد. سەری هەڵێنا و منی دیت، ئەو دەیناسیم کە منداڵێکی بێکەسم و بۆ ئەوەی بژیم دزی دەکەم، گوتی:

- چییە؟
- مام فەرەج گەر ڕازی بی شەوانە منیش بێمە ئێرە بۆ نووستن؟
- ئەوە چییە بە کۆڵتەوە؟
- پێخەوەکەمە، شەوانە پێی دەنووم.
- باشە وەرە بەڵام هەر شەوەی چوار شایی لە هەر منداڵەی دەستێنم و تۆش دەبێ هەر شەوەی چوار شاییم بدەیەی.
- بەسەرچاو، منیش وەکوو ئەوان دەیدەم.
- دەی باشە بڕۆ دەرێ و بە ڕۆژ بەردەستم نابێ بگری و بە شەو بۆ خەوتن وەرەوە.
- ئەدی ئەو پێخەوەی لە کوێ دابنێم؟
- فڕێی دە سەر ئەو پەینەی.

پێخەوم فڕێ دا سەر پەینەکان و دەرکەوتم. دڵم ئەوەندە خۆشە نەبێتەوە. دەتگوت دونیا ئی منە. ئێستا بۆ نووستنی شەوانەم پێخەوم هەیە و جێگایەکی گەرمیشم گیر کەوتووە. لای ئێوارەدرەنگایەکی هاتمەوە توونخانە. تەماشام کرد پڕە لە منداڵی گەورە و چووک. لە پلیکانان شۆڕ بوومەوە بۆ خوارێ و بەرەو پێخەوەکانم کە لەسەر پەینەکەم دانابوو ڕۆییشتم تا دەستیان دەمێ، بەڵام لەوێ نەمابوون. دیتم مام فەرەج خەریکی ئاورگی توونخانەیە. زۆر بە نەرم و نیانی پرسیاری

پێخەوەکانم لێ کرد. سەرێکی هەڵێنا و تەماشایەکی پڕ لە جنێوی لێکردم و کەمچەی ئاورینی دەرهێنا و چاوی قووچاند و زاری کردەوە:

— سەگباب، من نۆبەچیتم؟ شەرت بێ وات لێبکەم تا وا بچێ ...

هەر ئەوەندەم زانی بە خۆی و بە کەمچەی داغەوە ڕامالّی کردم. زوو دەرپەڕیم بۆ سەر پلیکانەکان. گەر ڕام نەکردبایە دەیکوشتم. ئاگام لێبوو بە منداڵەکانی دەگوت:

— وەدەرینێن ئەو توتکەسەگەی. لایەن لەپێش چاوم دەنا دەیکوژم.

منداڵەکانیش ڕاماڵیان دامێ و دەریان کردم لە توونخانەی و دەرکەیان لەسەرم داخست. بەو شەوەی و بەو سەرمایەی نەمدەزانی ڕوو دە کوێ کەم. پێمخۆش نەبوو کەس چاوی بەفرمێسکم ببینێت، دەنا هێندەی نەمابوو لە گابۆڕێ بدەم. ئاخر کەس هەبوو لە من چارەڕەش تر؟ بەناچاری و لە سەرمان، ئەژنۆکانم لە باوەش گرت و هەر لەبەر دەرگای توونخانە هەڵتووتەکام. ئێستا شەو بە باشی ڕاکشاوە. چاو پێش خۆی بڕ ناکات، لە سەرمان ددانان لێکدەدەم. هەڵدەلەرزێم و خەونووچکە دەمباتەوە. لەپڕ دەرگای توونخانە کرایەوە، منداڵێک بوو، کە منی بەو حاڵە دیت، هاواری کرد:

— مام فەرەج، مام فەرەج، خۆ ئەو کوڕە نەڕۆیوە! هەر لە پشت دەرکەی دانیشتووە!

مام فەرەج لە پلیکانان وەسەر کەوت و بە تووڕەیی قیژاندی و گوتی:

— بۆ ناڕۆی هەتیوە؟ ها؟ لە ڕۆژی یەکەمەوە دەتهەوێ ئێرەم لێ بشێوێنی؟

چ دەرەتانم نەبوو. دەمزانی ئەو شەوە لە دەرێ مابامەوە، لەسەرمان ڕەق هەڵدەهاتم. زۆری لەبەر پاڕامەوە تا ڕێگام بدات بچمەوە ژوورێ. زانی کە داماوم کەس شک نابەم، بەزەیی پێمدا هات و ڕێگای دامەوە. کەمێکی پرتە و بۆڵە کرد و گوتی:

— وەرە خوار سەگی سەگباب، جارێکی دی گووی وا نەخۆی، بۆ چما من نۆبەچی پێخەوی تۆم؟ لێرە پڕە لە منداڵی دز و ناجسن. من چووزانم کامیان دزیویتی. ئاگات لە شتی خۆت بێ دەنا، خۆشت دەدزن. ئێستا بڕۆ ستار بە.

کە لە پلیکانەکان دەهاتمە خوارێ، چاوم لێدەکرد بزانم بچمە کام کونجی توونخانە کە لێی ڕاکشێم، یا ئاخۆ کەس لەو منداڵانە هەیە بەزەیی پێمدا بێتەوە و پێخەوێکم بداتێ یا شوێنێکم پێشان بدات؟ هیچ کە کەس نەبوو، دەورەیان دام و بە لای هەرکامێکیاندا کە تێدەپەڕیم یا مستێکیان لێدەدام، یا چەپپۆکێکیان پێدادەدام، یا شەقێکیان تێهەڵدەدام. بەناچاری چوومە سەر پەینەکان و لێی ڕاکشام. دیسانیش دەست هەڵناگرن و دێن بە چنگان پەینم بە سەر و گوێلاکی دادەکەن. تا ئاخری مام فەرەج لێیان تووڕە بوو و هێدی بوونەوە.

لە ناویاندا هەتیوێکی تێدا بوو نێوی «مامی خۆی» بوو. پێشەی گیرفانبڕی بوو. لە ناو بازاڕ و شوێنی پڕ لە عالەمدا گیرفانی خەڵکی دەبڕی. مامی خۆی ببوو بە گوونڕەشی ئەو منداڵانە. وەک

ئەفسەرێکی چابوک ئەمری بەسەر ئەو منداڵانەدا دەکرد. هەموو لێی دەترسان. ئەو شەوە منی زۆر ئازار دا. لەبەر ئەوەی لەناویاندا غەوارە بووم و بێدەرەتان، ئەوشەوەی ددانم بە جەرگی خۆم داگرت و هیچ دەنگم نەکرد. هەرچی کردی، سەرم داخست بەڵام چاکم لێکۆکردەوە و ڕقم لێ‌هەڵگرت. لە دڵی خۆمدا گوتم بزانە چۆنت عاقڵ دەکەم.

کە ڕۆژ بۆوە وەک منداڵی قوتابخانە، هەرکەسە و دەربازی ئیش و کاری خۆی بوو و بڵاوەیان کرد. منداڵە وردەکان بۆ سواڵکردن دەڕۆییشتن و دریشتەکانیش ئی وا بوو دز بوو، دەچوون لە مەیدانێ، ئارد، مێوژ، کشمیش و شتی خواردنیان لە لادێییان دەدزی. ئەوانە کەوا و شاقەلیان دە بەردا بوو. گیرفانی گەورەیان لێکردبوو تا جێگای زۆری هەبێت بۆ دزییەکانیان. دەچوون شاقەلەکانیان بە سەر تایەکاندا دەدا و دەستیان کە لە نێو گیرفانیان دایە و کەس نایبینێت. چەند چنگێک لە تایەکە دەدات و لە گیرفانە گەورەکەی دەکات و دەڕوات و شوێنەکە جێدێڵێت. ئەوانە توورەکەی بەتاڵیان هەمیشە پێبوو. دەچوون لە شوێنێکی نەدیو گیرفانیان بەتاڵ دەکرد و توورەکەیان لێ دەئاخنی. جا ئەوجار دەچوون بۆ سەر دوکانێکی دی و بۆ دزینێکی دی. تا توورەکەکانیان لیپاولیپ دەکرد و ئینجا دەیانبرد دەیانفرۆشت. تێشیاندا بوو وەک مامی خۆی ڕۆژانە بۆ گیرفانبڕی وەدەر دەکەوت. خۆی و چەند هاواڵی کە ئێوارە دادەهات، دەگەڕانەوە بۆ توونخانە و هەرکەس لە قەدەر خۆی پارەی مام فەرەجی دەدا و دەڕواتە شوێنی خۆی بۆ حەسانەوە. من کە یەکەم ڕۆژم بوو کەمێ زووتر هاتبوومەوە و ئاگام لە هەموو ئەو بەزمەی بوو بۆیە، منیش لاسای ئەوانم کردەوە و پارەی خۆم دا بە مام فەرەج و چوومە سەر پەینەکان و پاڵم لێدایەوە. دەگەڵکوو مام فەرەج پارەکانی کۆکردەوە بۆ نان خواردن ڕۆییشتەوە ماڵە خۆی، جا ئێستا منیش لە بیانوویەک دەگەڕێم تا خۆیەک بە مامی خۆی نیشان بدەم و قۆڵنجێکی بگرم. باش لە یادم نییە لەسەر چی بیانووم پێگرت! لێمان بوو بە شەڕ و لێک ڕاست بووینەوە. گرتم و لە نێو پەینەکەم خست. جا وەرە بە مستان لە سەر و گوێلاکی بدە. هێندەم لێدابوو کە تواناى نەبوو دەست بکاتەوە. دەستم دە گەرووی نا و گوتم بڵێ گووم خوارد، دەنا هەر دەتخنکێنم. ئەویش لەسەرەخۆ و بە قرخەقرخ گوتی گووم خوارد و منیش بەرم دا. هەتیوێک نێوی «ڕەحیمە لاڵ» بوو، لە دێهاتی دایک و بابی مردبوو، هاتبوو بۆ شاری و کەس نەیدەناسی و بە قەستی خۆی لاڵ کردبوو تا خەڵک بەزەییان پێیدا بێت. خەڵکیش باوەڕیان پێکردبوو. ئەو هەتیوەش لاگیری مامی خۆی بوو. ئەوە ئەمن سواری مامی بووم و نەفەسم لێبڕیوە، کەچی ڕەحیمە لاڵیش سواری من بووە و بە مستان سەر و گوێلاکمی داگرتووە. کە لە مامی تەواو بووم، لە ڕەحیمە لاڵی ڕاست بوومەوە و پڕ بە دڵم شەقێکم لە گوونی دا و لەسەر پەینەکان ڕا بۆ خوارێم فڕێدا. چما وەزمان نەهات؟! زمانی کرایەوە و یەکبەخۆی قیژاندی:

— ئەی بابە...

بۆ چەند چرکەیەک ئاگام لێبوو کە هەموو منداڵەکان بێدەنگ بوون و یەک چاوی لە یەکێ دەکرد. تەنانەت مامی خۆیش کە لە هەناسە کەوتبوو لەسەر لاتەنیشتێک بۆی درێژ ببوو و بە لاوازی سەرێکی هەڵێنا و چاوی لە ڕەحیمە لاڵی دەکرد کە چۆن وەک بولبووڵ دەخوێنێت و هاواری باوکی دەکات. ئینجا هەموو منداڵەکان دەورەیان دا و بە چاوی پرسیارەوە لێیان دەڕوانی. ئەویش کە کەمیک زانی گونی هێوەر ببۆوە وەقسە هات و گوتی:

— بەو شەقەی ئەو هەتیوەیە کە لە گونی دام، زمانم کرایەوە.

بەڵام درۆی دەکرد. ئەو ساختەچییە بە ئانقەست خۆی لاڵ کردبوو. هەتیوێک کە کەمچەی لەباتی مام فەرەجی لێدەدا، بە هەڵەداوان چووبوو مام فەرەجی ئاگادار کردبۆوە کە وەرە ڕەحیمە لاڵ زمانی کراوەتەوە. ئەویش کە هۆکارەکەی دەپرسێ، بۆی باس دەکەن کە حەمەد شەوێ لە گونی داوە و بۆیە زمانی کراوەتەوە. مام فەرەج پیاوێکی دونیادیدە و عەیار بوو، دەیزانی ئەو هەتیوە بە درۆ خۆی لاڵ کردووە. چەپۆکێکی بە سەری دادا و گوتی:

— هەتیوە ئێمە بە شێت دەزانی؟ ئێستا بۆ خۆت لاڵ کردووە؟ ها؟

لە سابڵاغ مەنشوورە کە زمانی ڕەحیمی، ئەمن کردوومەتەوە و خەڵک بە گاڵتە بە ڕەحیمیان دەگوت:

— بزانە حەمەد بە کام لاقی شەقی لێداوی، بڕۆ هەموو ڕۆژێ ماچێکی لێبکە.

با ئەوەندەشتان لەسەر ڕەحیمە لاڵی بۆ باس بکەم کە، گەر دەچوو بۆ سواڵکردن ئۆینی سەیر و سەمەرەی لەخۆی دەردەهێنا. لە ڕاستیدا شانۆکاری باش بوو. جارێ لەپێشدا کاتێک بە زمانی لاڵان قسەی دەکرد هەر خۆش بوو چاوی لێبکەی، پاشان ئەو دەستەی لە بنانگوێچکەی دەنا و گۆرانی بە زمانی لاڵان دەگوت. دەنگی دەکردە دووزەلە و خۆی دەگەڵ دەلەنگاند و سەری بۆ با دەدا. جا دەنگی سەیرسەیری لە خۆی دەردەهێنا و بە مرقەمرق و فلقەفلقان خۆی دەژیاند. پاش ماوەیەک دەگەڵ منداڵەکان دەچوو بۆ دزی ئارد و شتی تر. تا ئەوکاتی کە من لە سابڵاغ دەژیام هەر مابوو ئێستا نازانم ماوە یا نا؟

جا ئەوە زستانە و توونخانە جێگامە. دەگەڵ مامی خۆی موومان لەبەینەوە ناچێ. ئەو هەر وا سەرقاڵی گیرفانبڕییە و بژێوی ژیانی خۆی ئاوا دەست دەخات. ئەوزەمان هێشتا ڕەزاشا ئەسلەحەی لە کوردەواری کۆنەکردبۆوە. ڕۆژانە دەگەڵ مامی خۆی دەچووم بۆ مەیدان. ئەوزەمان سیحر و ئۆینی سەیرسەیریان دەردەهینا و خەڵک بۆ تەماشایە لێیان کۆ دەبوونەوە. ئێمەش لە هەرشوێنیکی ئەو مەیدانە زانیبامان کۆمەڵە و خەڵک خڕ بۆتەوە، خۆمان تێدەخزاند و دزی فیشەک و دەراغی دەمانچەمان دەکرد و دەمانبردە لای کابرایەکی دوکانداری چەکفرۆش کە ناوی «حەمەڕەسوڵە کەپۆ» بوو، پێماندەفرۆشت و قووتی خۆمان لێ گیردەخست. لەوەتا دەگەڵ مامی خۆی خەریکی ئەو بەزمەی بووم ئیتر بۆ لای تەناف و دیواری کوچە و کۆڵانان نەدەچووم. تا لای جێژنی نەورۆزێ

لەو توونخانەیە مامەوە.

با ئەوەندەشتان باسی مامی خۆی بۆ بکەم. ئەو هەتیوە کاتێک کە گەورە بوو، زەمانی ڕەزاشای کاری ڕێگری و پیاوکوشتن بوو. زۆر کەسی بە ناحەق کوشتبوو. عالەم زۆری لێدەترسان. ئاخر زۆر بە نامەردانە خەڵکی دەکوشت. جوانێکی کوشت کە ئاوی خواردباوە لە گەردنیدا دیار دەبوو، ئەوەندە لاوچاک بوو. لە بن بەردێکی خۆی مات کردبوو و کوڕەش بەبەر دمیدا هاتبوو، لە دەم ڕێگا کوشتی و تفەنگەکەی بردبوو. زەمانی شای خەڵک و حکومەتیشی هەراسان کردبوو. کاتێک ساڵی ١٩٤١ کە حکومەتی شۆڕەوی هاتە ئێران و کوردوستان، هەموو قاچاغ و قوچاغ ئازاد بوون و ئەویش گەڕایەوە سابڵاغ. بیستمەوە کە لەبەر ئەو کارە قۆڕانەی دەیکردن دەیانهەوێ بیکوژن. ڕۆژێکی لە قاوەخانەی دەم چۆمی دیتم و بە قسە کردن تا لای ماڵە خۆمان هاتین و پێمگوت کە دەست لەو کارانە هەڵگرێت دەنا، وریای خۆی نەبێ، تێدادەچێت. یەک-دوو ڕۆژێ پێچوو دیتم ون بوو. چووبوو بۆ «قەمتەرێ» دێی «میرزا عەبدوڵڵا حاجی ساڵحی». لە قەمتەرێ حەز لە کچێکی دەکا. برای کچەی لە دەشتی دەگرێت و دەڵێ دەبێ بچی خوشکتم بۆ بێنی دەنا دەتکوژم. کوڕەش لە ترسی گیانی دەڵێ باشە. دەچێتەوە ناو دێی خوشکەکەی بۆ دێنێ و لەولاشەوە چەند کەسان فێر دەکات کە بگەنە سەریان. مامی خۆی دەگەڵ کچەکەی لە قوژبنێکی دادەنیشن و بەردەبنە ڕاز و گلەیێ، لەو عانەیدا بە چەند نەفەران سواری ملی دەبن و هەر لەوێ دەیخنکێنن. پیاوی کەر و بێمێشک دەبێ بەو جۆرە بێت. ئاخر کێت دیوە خوشکی بەرێ بۆ کەسێک؟

ڕۆژێک تووشی ڕەحمان جوجیلەی بووم. کە دیتمی، زۆری بەزەیی بە سەر و سەکوتمدا هات. جلێکی ئەوەندە ڕەش و چڵکنم دەبەردا بوو کە شوێنی ساغی نەمابوو، هەمووی دڕا بوو و لە کەلک کەوتبوو. لە دوورەوە ڕشک و ئەسپێ و مۆرانەم لێدەباری. دەموچاوم ئەوەندە چڵکن بوو هەر بۆ باس نابێ. ڕەحمان بەزەیی پێمدا هات و منی بردەوە ماڵێ و جەمێکی تێر کردم. پاشان کراس و دەرپێیەکی خام و کەوا و پاتۆڵێکی نیمداشتی[1] دامێ و گوتی بیبە دەبەری بکە. منیش ئەوەندە دژوێنم کە شەوانە خەوم نییە لەبەر مۆرانە و ڕشک و ئەسپێیان. «میرزا مەحموودی حەمامچی» جیرانمان بوو. جارجار بەزەیی پێمدا دەهات و ئیزنی دەدام بچمە حەمامەکەی بە ئاوی گەرم دەموچاوم بشۆم. ئەوڕۆژە چوومە حەمام و خۆم پاک و خاوێن شوشت و جلەکانم دەبەر کرد و جلە کۆنەکانیشم بردە توونخانە و دە کورەی توونخانەم هاویشتن و سووتان.

خەڵک بامیان زۆر سەرکۆنە دەکرد. ئاگادار بووم کە زۆرجاران میرزا مەحموودی حەمامچی

---

[1] مەبەست کەوا و پانتۆڵێکە کە پێشتر لەبەر کراوە و لە تازە دەرچووە و بووەتە بەکارهاتوو. نە زۆر کۆنە و نە تازە. بە واتای ئەمرۆیی دەبێیە کەوا و پانتۆڵی دەستی دوو. ئەو وشەیە لە فارسیشدا بە هەمان مانا هەیە و وێدەچێت چاوگ و ماکی ئەو وشەیە فارسی بووبێت.

بابمی لۆمە کردبوو، بەڵام بابم گوێی نەدابوویە. ئەو شەوە تێمە منداڵەکان لە توونخانە خەریک بووین بنووین. ژوورەکەمان تاریک بوو هیچ کوێمان لێ دیار نەبوو. لەپڕ تەماشامان کرد لە سەرەوەی پلیکانەکان سێ کەس شۆڕبوونەوە و دێنە لامان. مام فەرەج کە فتیلەیەکی پێبوو دەگەڵیان قسەی دەکرد و ئاوری توونخانەش کەچەڕووناکاییەکی دەبەخشییە لای ئەوان. هەتا زیاتر لە پلیکانەکان دەهاتنە خوار، زیاتر ڕوون دەبۆوە کە کێن. تەماشام کرد بابم و «مەحموود سەقزی» و «بارامی دەلاڵ»ـن و هاوڕێ دەگەڵ مام فەرەج بەسەر بابمدا دەڕۆن. بابم دەڵێ:

— کوڕە کاکە، ئەو هەتیوە ژن و کوڕمی کوشتووە، عالەم لەیەخەم نابێتەوە دەنا، هەتاهەتایە بە لەحنەتم دەکرد.



ئێدی قەت نەیپرسی کە بۆ ئەو ڕووداوە ڕووی دا؟ کە بۆ کار گەییە ئەو ئاستە کە ئەو کوڕەم ژنەکەم بکوژێ؟ باشە ئەو ژنە دەبێ چی کردبێ کە ئەو کوڕە منداڵە کوشتویەتی؟ گەر تەنیا جارێک ئەو پرسیارانەی لە خۆی کردبا زۆر شت ڕوون دەبۆوە، بەڵام قەت نەیکرد. هەرچەند بەتەما نەبووم بیکوژم تەنیا ویستم لێیدەم تا خۆم ڕزگار بکەم و دە تەندوورم نەهاوێت و نەمکوژێت. لەو قسانەدا بوو کە مام فەرەج هەرای لێکردم. منیش بەپەلە لەسەر پەینەکان هاتمە خوار و وەپێشخۆیان دام بۆ ماڵەوە. پوورم کە منی دیت، بەربوو گریانێ و ڕەحمانی براشم وێڕای ئەو دەگریا. زوویەکی ئەو لیباسەی ڕەحمان جوجیلە دابوویمێ، لەبەری داکەندم و کراس و دەرپێی تازەم دەبەر کرد. گورجێکی جلەکانی برد لە تەندووری وەشاند و لەسەر شۆرکەی پاک و خاوێن شوشتمی و ئەوجا جێگای بۆ ڕاخستم و باش نووستم.

بەیانی زوو بابم لە خەو ڕاست بۆوە و ملی لە نوێژکردن و موناجاتی نا. پاشانی دەستی کرد بە زکر و تەلیلەی. نێوەنێوە وەک عاشقە و ماشقەی بە شێخی هەڵدەگوت. ئەوجا لێفەی لەسەر من لادا و هەڵیستاندم تا بڕۆین بۆ مزگەوتێ. هەرچی خۆم مینگاند لێم نەبۆوە. ئەوجا ڕاکێشی کردم. ئەی خودایە، تەماشا ئەمن تووشی چ بووم؟ سەت ئاواتم بە توونخانەی دەخواست. هەرچۆنێک بێ بردمی بۆ مزگەوت. دەگەڵ خۆی بردمی تا تارەت بگرم و دەستنوێژ هەڵگرم. پەیتاپەیتاش لێم دەڕوانێ بزانێ دەستنوێژ هەڵدەگرم یا بە فشە وا دەکەم. بەهەرحاڵ ئەو ڕۆژە نوێژمان بە جەماعەت کرد و قوتار بووم و هاتینەوە ماڵێ. نان و چای بەیانیمان خوارد جا گوتی:

— ڕاست بەوە بەرەو دوکان.

وەپێش خۆی دام بۆ دوکانێ. دەگەڵ «مەحموودی عەزیمی» لە دوکانی عەلافی، شەریک بوو. دوکانەکەی دانا و چوو لە دوکانی «عەلێ ڕەشەی» تایێک کشمیش و تایێک لەبلەبی کڕی. نازانم قەڕتاڵە و یاڵتەبەق و تەرازوو و بەردی لە کوێ هێنا؟! ئەوەندەی دەزانم هەمووی بۆ پێکەوەنام و لەبەر دەمم هەڵیچنین و پێشانی دام و گوتی بفرۆشە. بەرانبەر بە دوکانەکەی خۆی و لە نێوەڕاستی مەیدانی ئاردی، جێگایەکی بۆ کردمەوە و کەپرێکی بۆ دروست کردم و دەستم کرد بە فرۆشتنی کشمیش و لەبلەبی. تا تاو و بان گەرم بوو، ئەو هاوالانەی توونخانەم لێ کۆدەبوونەوە و بابیشم بە گوڕەگوڕ بۆیان دەهات و بڵاوەی پێدەکردن. پاشان دەکەوتە گیانی من و دەیکردە پرتە و بۆڵە کە:

— تۆ کەی چاک دەبی؟ بۆ ڕەفێقی چاک ناگری؟ لەمەودواوە مەهێڵە ئەوانە بێنە ئێرە و ...

منیش هەر دەمگووت باشە، ئیتر نەمدەگوت کە تۆ منت هێناوەتە سەر دونیا و لە بەدبەختیانت هاویشتووم و لەبن دەستی زڕدایکت نام و پشتت لێکردمەوە، بۆیە داوم لە داوی توونخانە و دزێتی و ئەو هاوالانە کەوتووە. هەرچەند هاواڵەکانم بۆ من، لە دایک و باب چاکتر بوون و پشت و پەنای ڕۆژی تەنگانەم بوون. درۆ ناکەم گەر بڵێم لە بابم خۆشترم دەویستن. لە ڕووی ناچاری، کە کوڕەکان لێم دوور و نیزیک دەبوونەوە، بە ئیشارە تێمدەگەیاندن و ئەوانیش سووکێکی دەگەڕانەوە. بەو جۆرە ژیانێکی تازەم دەست پێکردەوە، کاسبێکەم باش بوو، دوکانەکەم فراوان کردبۆوە. لە گوێز ڕا بگرە تا سنجوو و میوەی وشک و بادام و هەرچی گەیبامێ دامدەنا بۆ فرۆشتن. سەرم گەرمی کاسبێ کردبوو. بابم چی گوتبا، گوێم دەدایە و بە قسەم دەکرد. خودا هەڵناگرێ بەردەوام بە سیلەی چاوی لە منی دەڕوانی و چاوەدێری دەکردم. کاتی بانگی نیوەڕۆ و ئێواران کە دەهات، ئەمری پێدەکردم تا بچم بۆ نوێژێ. ئەو دوکانی خۆی دادەخست و دەهاتە سەر کەلوپەلەکانی من. منیش دەچووم کەمێک دەخولامەوە و لەسەر حەوزی مزگەوتێش ئاوێکم بە دەموچاوم دادەکرد و هەڵتەکهەڵتەک دەگەڕامەوە سەر کەلوپەلەکەم. جا لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو کە دەهاتمەوە، بە گومانەوە خێسەیەکی لێدەکردم و لێیدەپرسیم:

– نوێژت کرد؟

– بەڵێ.

– دەی ڕەببی خودا لێت قەبوڵ بکات و لە گوناحانت پاک کاتەوە.

دە خۆمدا دەکوڵام و دەمگوت ئەگەر دەزانێ نەچووم بۆ نوێژێ! شەرت بێ کەوڵم دەکات!

پاش ئەوەیکە من دەهاتمەوە، ئینجا ئەو دەچۆوە دوکانەکەی خۆی. بەو چەشنە سەرم لە ئیش و کار نا و بۆ ماوەی سێ-چوار مانگان هیچ بۆلای کاری خەراپ نەچووم. ئیستا لە ماڵی باوکی خۆمم. پووری خۆم، نازی دایکانەم دەکێشێت. تێرم و جێم گەرم و نەرمە.



وێنەی پۆلێک لە منداڵانی سابڵاغ لە ساڵی ١٩١٤ زایینی کە لەلایەن کۆنسوولی ڕووسییەی تێزاری ئێلێکساندر ئیڤانۆڤیچ ئیاسەوە گیراوە

## عاقڵ کردنی سەربازی ڕەزاشا

ئەوسەردەم دەستێک سەربازیان تازە هێنابوو بۆ شاری کە هێشتا جلی سەربازییان لەبەر نەکردبوون. هەر وا بە لیباسی شەخسی خۆیان مەشقیان پێدەکردن و هەر بەو لیباسانەشەوە لە ناو شاردا دەخولانەوە. ئەو زەمان سەربازی ئیجباری نەبوو، بە پارە سەربازییان دەکرد. جا لە وەرزی هاویندا ڕۆژانی جومعە دوکان و بازاڕ دادەخران و منیش بێکار دەبووم. ئێوارەیەکی جومعەی دەستی ڕەحمانی برام گرت و چووین بۆ قەبران. دیتم منداڵ «تۆپەڕاکردن» دەکەن و منیش دەگەڵیان چوومە کایەوە. دەستێک پیاوی لەتێوچووش بڕێک دوور لە ئێمە سەریان بەسەر یەکەوە نابوو قسەیان دەکرد. لەچی دەدوان؟ خۆیان دەزانن.

کەسێک لەو سەربازانە هاتە لای ئێمە و بۆ تەماشای تۆپێنێ ڕاوەستا. ئێمە مێرمنداڵ بووین و تازە سمێڵمان گووکرە ببوو، ئەو سەربازەش جحێڵ بوو، لانیکەم هەشت-نۆ-دەساڵێک لە ئێمە گەورەتر بوو. «برایم خانی ...» لەو تۆپێنەدا بوو و دەگەڵ ئێمە دەیکرد. ئەو منداڵێکی لوس و جوان بوو. هەر دەچوو دەستی لە ڕوومەتی دەدا و پیلی دەکێشا. هەتیویش خۆی ڕادەپسکاند و دەکڕوزاوە و بۆ شوێنێکی دی دەڕۆیی. کابراش وای ئاور گرتبوو کە قەتیساندبووی و وەدووی دەکەوت. کابرا بەربینگی کوڕەی بەرنەدا تا دە گریانی خست. جیا لەو هەموو پیاوەی کە لەو دەوروبەرەی بوون و جیا لەو هەموو منداڵەی، چوومە پێشێ و لێی وەجواب هاتم. کابرا شەقێکی داهێنامێ، بەڵام خۆم لادا نەیگرتم. ڕۆ بوومە بەردێک پڕ بە چنگم و پڕ بە هێزی خۆم لە کەللەی سەریم دا و بورایەوە و کەوت.

ئەو پیاوانەی کە لەوێ دانیشتبوون هەموو وەک با ڕایانکرد. هەر نەهاتنە پێش بزانن چ قەوماوە! تەنانەت منداڵەکانیش بڵاوەیان کرد. منیش پیلی ڕەحمانیم گرت و جا وەرە ڕا کە. لە کاتی ڕاکردندا چەند جارێک ئاوڕم دایەوە تا بزانم کابرا جووڵە دەکات! بەڵام جووڵەی چی، کەلاکی کەوتبوو و جووت لاقی لێ درێژ کردبوو. دوور و نیزیکی ماڵێ بووینەوە و ڕەحمانم تێگەیاند کە لای بابم باسی هیچ نەکات و ئەوم لە ماڵێ دانا. منیش لە ترسان نەمدەزانی ڕوو لە کوێ کەم. دەمزانی کە حکومەت لەو کابرایە دەپرسێتەوە و چ بمێنێ و چ بمرێ من جەزرەبە و ئازار دەدەن. ئەویش بەجێی خۆی، لە ترسی بابم نەمدەزانی چ بکەم؟ ئاخر ئەو پێی خۆش نەبوو گرفتم بۆ ساز بێتەوە دیسان، بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم تا خۆم لە شەڕی خەڵکی هەڵنەقوتێنم، منیش بەخۆم نەبوو، نەمدەتوانی ئەو شوورەییە قەبوڵ بکەم، نەمدەتوانی بە هانای لێقەوماوێک نەچم، نەمدەتوانی سەری خۆم شۆڕ کەم، نەمدەتوانی ببینم کە عەجەمێک بێت و دەست بەرێتە نامووس و شەرەفی کوردێک. سەرداخستن بە من نەدەکرا. ئامادەبووم مەرگیش بێ، بە دڵ و بە گیان بیکڕمەوە، بەڵام ئەو سەرشۆڕییە قەبوڵ نەکەم.

لە ترسی بابم نەمدەتوانی بچمەوە ماڵێ و نەشمدەزانی دیسان ڕوو لە کوێ کەم. سەرم هەڵگرت و چووم بۆ نێو باغان. لەو باغ بۆ ئەو باغ، لەو مێشە بۆ ئەو مێشە. مەڵاس ببووم و لە هیچ کوێ ئۆقرەم نەبوو، تا چوومە مێشەی «باغی حەسەن خانی». ئەوە نوێژی شێوانە و وڵات بەرەو تاریکبوون دەڕوات. برسێتی تاوی بۆ هێناوم و لەبرسان هەڵدەلەرزێم و خەوم لێناکەوێ. عیلاجم نەبوو، هەرچۆنێک بێ لەو باغە شەوم ڕۆژ کردەوە. بە خۆم گوت با بچمە قەراغ باغەکانی شار بەشکوو دەنگ و باسێک بزانم یان پێخۆرێک وەدەست خەم. هاتم گەیمە «باغی حاجی داوودی»[1]. «سوڵتان»ـی باغەوان باری بازاڕی دەبرد بۆ شار، کە منی دیت گوتی:

- هەتیوە ئەوە لەچی دەگەڕێی؟ ها؟ ئاخری بە خۆتەوە سەری بابیشت بە فەتەڕات دەدەی. دوێنێ ئێوارێ چەند نەفەر سەرباز هاتوونەتە ماڵتان و بە لێدان و کوتان بابتیان وەپێشخۆیان داوە بۆ تۆپخانەی. هێندەیان لێداوە شل و شەل و شەوێقیان کردووە. بڕۆ خۆت ون کە، بگیرێی کەوڵت دەکەن.
- کاک سوڵتان لەوە گەڕێ جارێ، فریام کەوە زۆرم برسییە.
- بڕۆ لە «هاجەر»ـی نان و خواردن وەرگرە.

---

[1] ئەو باغە مڵکی بنەماڵەی حاجی مستەفا داودی (حەجۆک) بوو. لەسەر ڕێگای مەهاباد ورمێ هەڵکەوتووە.لایەکی ئەو باغە، بە (کانونی کارآموزی) نووساوە و لایەکیشی بە باغی "گوڵان"ـەوە نووساوە. باغی گوڵان، باغێک بوو کە بە دەستی میرزا فەتاحی قازی ساز کرابوو کە لە ڕووی جوانی و ڕێسای و زاکوونی ئەندازیاییەوە لە زەمەنی خۆیدا بێوێنە بووە. بڕوانە کتێبی: تاریخ مهاباد - نووسینی: سید محمد صمدی - چاپ رهرو - ل ١٣٥




کەسی ژمارە ١ عەزیز زەندی (عەزیز ئاڵمانی)یە و کەسی ژمارە ٢ میرزا محەممەدی تابانی‌یە دەگەڵ پۆلێک لە مافپارێزانی مەراغەیی و تەورێزی. کاک محەممەد مافناس بوو، بەڵام مافناسیبوونی کاک عەزیز زەندی قسەی لەسەرە و هەندێک پێیان وایە مافناس بووە و هەندێکی بەپێچەوانە بیر دەکنەوە. سپاس لە کاک مەسعود تابانی کە ئەو وێنەیەی بۆ ناردم.

هەرای لە ژنەکەی کرد و پێیگوت نانم بداتێ. ژنەکەشی دوو-سێ نان و کەمێک پەنیری بۆ پێچامەوە و گوتی برۆ گیر مەبە. نانەکەم وەرگرت و بە باغ و مێشاندا تا باغەکانی «خانەگێ»[1] بەند نەبووم. ئەو شەوەش دە نێو مێشەی خانەگێ‌دا ڕۆژم کردەوە. تا سێ ڕۆژان بەو حاڵە ڕامبوارد. سەری چوار ڕۆژەی گوتم با بچمەوە لای شار، خۆ لێرە لە هیچ ئاگادار نابم، خۆ وەختە دڵم بتۆقی بۆ دەنگ و باسان. با بزانم چ قەوماوە؟

هاتم، چوومە لای یەرغووی.[2] لە کەلاوەکانی لای «ماڵە گولان» برێک نووستم. پاشان بیرم کردەوە کە بچمەوە بۆ لای ماڵێ تا بزانم چ باسە؟ بە «تەکیەی بابە خەلیفەی»دا هاتمە ئاستی ماڵە

---

[1] گوندێکە لە ٥ کیلۆمیتری باکووری مەهاباد هەڵکەوتووە. دەتوانین بڵێین کە ئەمڕۆ بووەتە بەشێک لەو شارە.
[2] "یەرغوو" چۆمێکی وەرزییە کە لە کێوەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی سابڵاغ سەرچاوە دەگرێت. زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵ ویشکە. لە تەڕەساڵاندا ئاو یا سێڵاوی تێدەگەڕێ و تێکەڵ بە چۆمی سابڵاغ دەبێتەوە و لە ئاکامدا تێکەڵ بە دەریاچەی ورمێ دەبێ. بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ مێژوو و ناوی ئەو چۆمە، بڕوانە کتێبی: شاری وێران- نووسینی عەلی حەسەنیانی (هاوار) - چاپی دووهەم - بڵاوکراوەی مانگ – ل: ١٦

«ڕەحمانی سەکری» لە قەراخ شار. هەر لە کووچەی وەرسووڕامەوە، بەرانبەرم «محمود خانی مەولوود خۆگێ» بە خۆی و دوو لەو سەربازانە کە لیباسی سەربازییان هێشتا لەبەر نەکردبوو، منیان دی، محمود خان هاواری کرد:

— ئەوەتا؟ بیگرن.

هەڵاتم تا خۆم قوتار کەم، سوکێکی خۆم لە ماڵە «مەلا هارەی» هاویشت. بەداخەوە هاتن لەوێ گرتیانم. هەر لەوێ ڕا بە لێدان و تێهەڵدان بردیانم بۆ تۆپخانەی لە «کاروانسەرای سیمۆنی». ئەوە عالەمێکی زۆریش بەدواماندا دێن بۆ تەماشایێ. کەس نەبوو لە چنگیان ڕزگارم بکات. کە گەیمە ئەوێ بە تەواوی لە کەلکیان خستبووم. لە دالانی کاروانسەرایە بڕستم لێبڕا و هێزم نەما کە بە پێوە خۆڕاگرم، کەوتم و هۆشم لە خۆم نەما. نازانم چەندە بێهۆش بووم بەڵام کە وەهۆش هاتمەوە، دەبینم کەسێک دەستی بەسەرمەوەیە و بە شەربە ئاوم بە گەروودا دەکات و دم و چاوم بۆ تەڕ دەکات و دەیسڕێتەوە. هەندیک زیاتر تاقەتم دا بەخۆم تا وەرسووڕێم و بزانم ئەو کەسە کێیە؟ دیتم «میرزا محەممەدی تابانی»ـیە کە بەچاوی بەفرمێسکەوە بۆم دەگری. تۆ مەڵێ ئەویش گیراوە و منیان لە ژوورەکەی ئەو کردووە. گۆیا ژنێکی هەرمەنی خواستووە و هێناوێتی و مێردەکەی ئەو ژنەی کوشتووە، ئێستا بەو تاوانە گرتوویانە. ماڵی ئاوەدان بێت نەیهێشتبوو خوینم زۆر لەبەر بڕوات و ئاگای لێم ببوو تا وەهۆشی هێنامەوە.

ژوورەکە نەختێک تاریک بوو. لەپڕ دەنگی ناڵە و ڕۆڕۆی کەسێکی دیم هاتە گوێ. کە ئاوڕم دایەوە، دەبینم ئەوە بابە بەکزی و لاوازیی لەسەر زگ درێژ بووە. هێندەیان لێدابوو کە هێزی نەبوو لەسەر قوون دانیشێت. سەر و گوێلاکیان هەموو بریندار کردووە و خوێنی بەند نابێت. هەردووک چاوی هەڵماسیوە و شین و ڕەش بۆتەوە. ڕەنگ و ڕووخساری بەتەواوی گۆڕاوە و شپرزەیان کردووە. تەنیا کەمێک زمانی کار دەکات، ئەویش هەر بەشی ئەوە دەکات جنێوم پێبدات و تووک و دۆعام لێبکات. ددان لە چیرەوە دەبا و تەکان بە خۆی دەدات کە ئانبازم بێت و لێم بدات، بەڵام ناتوانێ لە جێی خۆی ڕاست بێتەوە. لە دوورەوە جنێوان دەدات و تفم پێدادەکات و هەرچی لەبەر دەستی بێت تێمهەڵدەکات. بۆ یەک چرکەش ڕاوەستانی نییە.

— ڕەببی خودا لە منت بستێنی. ڕەببی لەسەر مەیتت دانیشم. ڕۆڵە دەست لە گووی خۆت نێی باشە؟ خودایە من چیم کردووە کە ئەو سەگەت دا بە من؟ ڕەببی هەلاهەلا بی. لە خودای دەکەم تەڵەب و تەمەنناپە خۆشی لە خۆت نەبینی و ...

خۆشخۆش میرزا محەممەد تابانی لێی وەدەنگ دەهات و پێیدەگوت:

— خودا نەکات. سۆفی چۆن دڵت دێ بە کوڕی خۆت ئاوا بڵێی؟ قسەی وا مەکە. تۆ دەبی شانازیی پێبکەی کە بەو تەمەنە کەمەیەوە لەسەر هاوڕێیەکەی وەجواب هاتووە و ئەو کێشە گەورەیەی بۆخۆی ساز کردووە. کێ ئەو پیاوەتییەی پێ دەکرێ؟

بەو قسانەی میرزا محەممەد بڕیک ئارام ببۆوە. لەوەی دڵنیام کە میرزا محەممەد تابانی لەوێ

ئەبا و بابم توانیبای قوون بجووڵێنێت، گەر عەجەمان نەیانکوشتبام، بابم هەر دەیکوشتم. ئەوە بەختەوەرییەکی گەورە بوو کە میرزا محەممەد دەگەڵمان لەو ژوورەدا بوو.

بابم خوشکێکی هەبوو کە نانی ماڵانی دەکرد. سەرهەنگ «یۆسف خان» دە ماڵە «مستەفای حاجی قادری» دایە. ئەو پوورەم نانی ماڵە مستەفای حاجی قادریش دەکات. دەچێت لەبەر ژنەکەی زۆر دەپاڕێتەوە و ئەویش بە مێردەکەی دەڵێت و ئەویش بە سەرهەنگ دەڵێ. پاشی سێ شەو و ڕۆژان بابم بەردرا. چەند نەفەر لە عەلافەکان فایتوونی بۆ دێنن و دەیبەنەوە ماڵێ. یەک-دوو ڕۆژان لە ماڵێ بۆی دەکەوێ تا کەمێک دێتەوە سەر خۆ، بایی ئەوەندەی بتوانێ لەسەر پێ بڕوات. ئینجا بۆ ئەوەی قامک لەسەر هەست و شعووری خەڵکەکە دابنێ، هەر بە سەر و سەکوتی بریندار و هەڵپێچراو، دەچێتە بازاڕێ. یەکەم کاری ئەوە دەبێت کە کاخەزێک بە میرزایەکی باش دەنووسێ و تێیدا حاشا لە من دەکات و دەڵێ ئەوە کوڕی من نییە، لە دایک و بابێکی دیکەیە، نووسیبووی کە:

— «ئەوە کوڕی «حەمە گاوان» ناوێکی بووە کە هەتیو کەوتووە، من زگم پێێ سووتاوە و دە ڕێی خودایدا بەخێوم کردووە. تا ئێستا گەورەم کردووە و نانم داوە. لەمەوبەولاوە بەڕەڵڵای دەکەم و هەر تاوانێک کە بیکات بە عۆدەی من نییە».

جا ئەوجار چووبوو مۆری «قازی عەلی»، مۆری «قازی موعێنی»[1]، مۆری «مەلاڕەحمانی گەورە» و هەروەها بە هەموو مزگەوتەکاندا سووڕابۆوە و لە مەلا ڕا گرتوویەتی تا فەقێ و قوتابی، پێی مۆر و ئیمزا کردبوون، تەنانەت بازاڕی و توجار و کەسەبەشی لەبیر نەچووبوو. کاتی خۆی کە بابم مرد، دەپاڵ کەلوپەلەکانیدا ئەو نامەیەم دۆزییەوە. کاخەزەکەی گەزێک درێژ دەبوو و لانیکەم ١٥٠ مۆر و ئیمزای لێدابوو. لەمەوبەولاوە کە کێشە بۆ من دروست دەبوو و کە لەلایەن دەوڵەتەوە دووم دەکەوتن و دەچوون یەخەی بابمیان دەگرت، باش بوو هەموو جارێ ئەو کاخەزە لە فریای بابم دەکەوت و پێی قوتار دەبوو.

بابم لەو زیندانە قوتاری بوو بەڵام من ئەوە هەر لەو ژوورە دام. باش بوو میرزا محەممەدی تابانیم لا مابوو دەنا، ئەو ڕۆژانە زۆر بەچەتوونی تێپەڕ دەبوون. بۆ منێکی مێرمنداڵ لە دۆخێکی ئاوا کەوتن، زۆر زەحمەت و دژوارە. هەموو ڕۆژێ یاوەرێک بە دوو-سێ سەربازان لێم وەژوور دەکەوتن. چیت خواردووە؟ ترش و چەوەندەر. ئانبازم دەبوون و لێیان دەدام و بە جنێوان کۆڵێکیان بێڕێزی پێدەکرم. دەیانگوت: حاڵیت دەکەین کە دەست لەسەر سەربازی حکومەتی شاهەنشاهی هەڵێنێوە یانی چی. وات لێدەکەین کە بڵێی غەڵەتم کرد، جەهەننەمت دێنینە بەر چاوەکانت.

تەنانەت جارێکیان ئەوەندەیان لێدابووم کە لە زمانیان خستبووم، میرزا محەممەد گوتی:

---

[1] قازی مونعیم درووستە.

— ڕۆڵە گیان تۆ منداڵی، کەس گلەییت لێناکات، هیچت لێ کەم نابێتەوە، بڵێ بمبوورن و ببەخشن بەشکوو بەزەییەکیان پێتدا بێتەوە و ڕەزایەتت بدەنێ و بەرت دەن.

— نەخێر میرزا محەممەد، بشمکوژن لە زار و زمانم نایەتە دەر. جا چۆن عەجەمێک لە وڵاتی خۆی ڕا بێتە ئێرە و تەماح لە نامووسمان بکات و منیش هیچ نەڵێم؟ هیچ کە پەژیوان نیم، بگرە گەر بەریشم دەن و بەیانی شتێکی ئاوایان لێببینمەوە، ئەوجار بە کوشتنیشیان لێخۆش نابم. لێگەڕێ با تا ماندوو دەبن لێمدەن، بەڵام نالێم بمبوورن و غەڵەتم (غلط) کرد. من بەو شتانە خاراوم. کە هاتوومەتە سەر ئەو دونیایە تێمهەڵدراوە، برسی کراوم، بە جنێوان ڕووخاندوویانم، تا سەرەمەرگێ بردوویانم، بەڵام سەرم بۆ کەس دانەنواندووە و دەستم بۆ کەس درێژ نەکردووە.

سەرتان نەهێشێنم، پاشی چوار شەو و ڕۆژان منیش بەردرام. پوورم باشم لە فریا هات و سەرهەنگ یۆسف خان ئەمری کرد و بەریاندام. تەمەنم بۆ کوشتن نەدەشیا. گاڵتەی پێناکرێ، ڕەزاشا گوونی گوونداری دەردێنی و منیش خوێنی سەربازی ئەوم ڕشتووە. ئەو کابرایەی من لێم دابوو، ئێستا بە کەتانی سپی سەر و سەکوتیان بۆ هەڵپیچاوە و تەقەڵی لەسەر خۆی نەماوە و هەتەران و پەتەران دەڵێ. سەربازەکان پێیان شەرم بوو کە منداڵێکی بگرن و پاشان لە شار بۆیان بڵاو بکرێتەوە کە سوپای شاهەنشاهی منداڵێک دەتوانێ لێیان بدات یا سەربازی شاهەنشاهی بە منداڵان دەوێرێ نەک بە گەوران. زۆر پێیان خۆش بوو خەڵک حیسابیان بۆ بکات. جا چ بە ترس یا هەڕەشە یا بە جەزرەبەدانی خەڵکەکە یا بە سەگێتی. پێموابی بەردرانی منیش هەم تکای پوورم بوو هەم سەگێتی سەرهەنگ یۆسف خان کە گەورەی سوپای شاهەنشاهی بوو لە سابڵاغ.

لای ئێوارە بوو کە لە تۆپخانەیان وەدەر نام. سەر و گوێلاکم خوێناوی و چڵکن، لا چاوەکانم ڕەش و شین هەڵگەڕاون، توانام نییە هەنگاوەکانم بەباشی هەڵێنمەوە و بە شەلەشەل دەڕۆم، هاوکات لە خەمی ئەوەدا بووم کە لە کوێ بخەوم؟! چۆن زگم تێر کەم؟! دەمزانی تازە دەبێ دەست لە بابم بشۆمەوە و ڕامناگرێتەوە. بە نائومێدی بەرەو مەیدان هاتم. لە مەیدان حەشیمەتێکی زۆری لێبوو. منیش نەمدزانی کە ئەوانە بۆ تەماشای من لەوێ ڕاوەستاون. پێیان سەیر بوو کە منداڵێک ١٢-١٣ ساڵانە لە سەربازی ڕەزاشای بدات! تا زیاتر لێیان نیزیک دەبوومەوە، زیاتر سەرم سوور دەما. تەواوی ئەو کەسانەی کە تا دۆێنێ ڕوویان نەدەدامێ و ئامادە نەبوون قوومێکم ئاو بەزاریدا کەن، هەموو ڕوویان لە منەوە و هەرکەسە و بە جۆرێک بە شان و باڵم هەڵدەڵێن.

— یەک دەیگوت: ئای بابم بە قوربانت بێ.

— ئەوی تر: وەی دەستیان شکێ، تەماشا چۆنیان لێداوە.

— یەکی تر: ژانت هەیە؟

— ئەوەیتریان: دا بۆمان بگێڕەوە، چییان لێکردی؟



وێنەیەک لە قەبرستانە کۆنەکەی سابڵاغ کە کاپیتان حەمەد بەردەوام باسی دەکات و شەوانە لەوێ خەوتووە.

— هتد

ئەوانەی کە منداڵی هاوتەمەنی خۆم بوون و دەمناسین، لە باوەشیان دەکردم و ماچیان دەکردم. دەچوومە هەر شوێنێک ئەو خەڵکە بەدوامەوە بوون و وەک قارەمانێک باسیان دەکردم و پیانهەڵدەگوتم. لە فکری ئەوەدا بووم کە بڕۆمە ناو قەبران و ئەوشۆ لەوێ بنووم. ڕێی قەبرانم گرت و ئەو خەڵکەشم بە دواوە بوو، دیتم لە مەیدانی حەمە خرچەم. لەناکاو کوڕیکی عەزەب هاتە پێشم و زۆر بە ڕێزەوە گوتی:

— بابم بانگت دەکات.

— بابت کێیە؟

— وەستا «سەعیدی دەلاک».

— لە کوێیە؟

— لە ماڵێیە، وەرە با بڕۆین، چاوەڕوانتە.

کۆمەڵێک منداڵی زۆر لە دەورەم بوون و بەریان نەدەدام، لە منداڵەکان تووڕە بوو و دەوریان چۆڵ کردم.

مەمنا ئەو ڕۆژەی کە لە قەبران لەو سەربازەم دا، وەستا سەعید دەگەڵ ئەو دەستە پیاوە لەنێوچووەکاندا بووە. هەم ئاگای لەو سەربازە بوو کە چۆن تەماحی لە «برایم خانی ...» کردبوو و لەیەخەی نەدەبۆوە و هەمیش ئاگای لە من ببو کە چۆن سەربازەکەم عاقڵ کرد و کەلاکیم خست و بە سەر و گوێلاک هەڵپێچراوی بۆ حکومەتی شاهەنشاهیم ناردەوە. لەولاشەوە ئاگای لەو باسەی

بابم ببوو کە قەباڵەی نووسیوە و تێیدا حاشای لە من کردووە و بێ ماڵ و حاڵم، بۆیە لەدووی ناردووم.

چوومە ماڵی وەستا سەعید، دیتم وەستا دانیشتووە و دوو کچی چووکەی بە دەورەوە بوو. سڵاوم کرد. زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم و فەرمووی کردم تا دانیشم. ژنێکی جحێڵیش دەهات و دەچوو. ئەویش بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێری هێنام و چای بۆ هەمووومان دانا. من لەپێشدا وای بۆ چووم کە ئەو ژنە یا بووکی وەستایە یا کچی وەستا، کەچی پاشان زانیم کە ئەوە ژنێتی! تۆ مەڵێ دایکی ئەو منداڵانەی وەستا مردووە و وەستاش تازە ئەو ژنە جحێڵەی هێناوە. ئەو ژنەش بە دەوری ئەو منداڵانەدا وەک گوڵی دەهات و دەچوو، وەک لە کۆشی خۆی بەربووبێتنەوە، وابوو.

شەو نان داندرا، پڵاو و ساواریان لێنابوو، بە زۆری دەرخواردی ئەو منداڵانەی دەدا. بە دەسرەی، لێو و دمی منداڵەکانی دەسڕێوە. منداڵ تێر بوون و نایانهەوێ نان بخۆن، کەچی پلەگۆشتی بۆ ڕادەداشتن. پاش نان خواردن برێک حەسانەوە و ئەوجار چای بۆ تێکردن، ساردی دەکردەوە و بەدمێوەی دەکردن. چوو لە ژوورێکی دیکە جێگای بۆ ڕاخستن و هەریەکەی لە جێی خۆی درێژ کردن. لە دایکی خۆیان جوانتر بە دەوریاندا دەهات و دەچوو. کە ئەو دیمەنەم دیت هێندەی دی زگم بەخۆم سووتا کە چۆن ئەو زڕدایکەی من هەموو ژیانمی فەوتاند. نایشارمەوە کە ئێرەییم دەبرد بەو منداڵانە و خۆزگەم دەخواست منیش دایکێکی ئاوام هەبا کە نازی کێشابام. بەداخەوە کە چاوم هەڵێناوە دەگەڵ ناخۆشیی، برسێتی، بێجێیی، جنێو، تێهەڵدان و نازنەدیتن لە دایک و باب، بووین بە هاوڕێ و تا ئێستاش کە ئەو بەسەرهاتانەم دەنووسم، بەرۆکیان گرتووم و لەکۆڵم نابنەوە.

شەو پاشی نانخواردن، تەمام بوو هەستم بڕۆم، کەچی وەستا وەدەنگ هات کە مەڕۆ و لێرە بە. بە کوڕەکەی گوت بیبە ئەو دیوی پیشان بدە با بنوێ. کراس و کەوایەکم دەبەر دابوو کە خوێن و چڵک و چەپەڵی پێوە بوو، دامکەند و ژنەکەی بردی بیشوات. کراسیکی درێژیان دامێ، دەبەرم کرد و بۆی نووستم. بەیانی داهات و بێدەنگیی شەو شکا. وەستا سەعید لە نوێژ هاتۆتەوە و بەتەمایە نان و چای بەیانی بخوات. منیش ئەوە هەر لە جێگا و لە خەو دام. کوڕەکەی هات و خەبەری کردمەوە. تەماشام کرد جلەکانم بە پاک و خاوێنی لە تەنیشتم داندراوە. زۆر سەرسام مام! ئەو جلانە بە کوێدا شۆران؟! بە کوێدا ویشک بوونەوە؟! نازانم! ئەوەندەی دەزانم کە زۆر خۆیان بە منەوە ماندوو کردبوو کە هیچکات فەرامۆشی ناکەم. کوردەواری دەڵێ:

— ژنیش هەیە و ژنۆکەش هەیە.

ئەوەش ژنە و زڕدایکی منیش ژن بوو. هیوادارم دە قەبرێشدا نەحەسێتەوە.

جلەکانم لەبەر کردەوە و چووم بۆ نان خواردن. پاشان وەستا ڕاست بۆوە و وەپێش خۆی دام و چووینە دوکانەکەی. لەوێ کەمێکی کەلوپەلەکەی کۆ کردەوە و هەندێک کاری ڕۆژانەی خۆی کرد و پێیگوتم کە لێرە بم و نەبزووم تا دێتەوە. تەنانەت هۆشداری دامێ کە لە دووکان نەچمە

دەرێ. ئەو ڕۆییشت، تۆزێکی پێچوو و هاتەوە، گوتی:

— وەدوام کەوە.

لە ڕێیە دەستی کرد بە قسان:

— لای «شۆخەی چایچی» بە شاگردی داممەزراندووی. شۆخە زاوای خۆمە و کچی من ژنێتی. لەوێ سەری خۆت بەردەوە و کاری خۆت بکە با موحتاجی ئەم و ئەو نەبی. نەکەی بزۆز بی و بڵەوەزی بکەی. شەوانەش وەرەوە ماڵێ و وێڕای منداڵەکانم ئەتۆش فەرقت نییە.

کە چووینە لای شۆخە، بە ڕوویەکی خۆشەوە قسەی دەگەڵ دەکردم و کاروباری چایخانەکەی فێر کردم. پاشان دەگەڵم هات و هەموو ئەو دوکاندارانەی موشتەری ئەو بوون پێشانی دام و ڕێوشوێنی دوکانەکانی تێگەیاندم و منی بە ئەوان ناساند. هەر ئەو ساتە دەستم کرد بە کار کردن.

## پاکم و بێباکم

سەیر لەوەدا بوو کە ئەو چایخانەیە جیرانی دوکانی بابم بوو. بابم ئێستاش لە ماڵێیە و هەر نەهاتۆتەوە سەر حاڵ. ڕۆژێ دوو - سێ جاران نیوئمەک دەکرێ. ئەوەندەیان بە قامچییان لە پشت و سمتانی داوە، لە کەلک کەوتووە. باش بوو شەریکەکەی «میرزا مەحموودی عەزیمی» لەسەر دوکانێیە. پاش چەند ڕۆژان بابم دەزانێ کە شۆخە ڕایگرتووم. بە شەلەشەل و قۆنەقۆن هاتە زگ شۆخە. وەستام لەسەر سەماوەر بوو و خەریکی کاری خۆی بوو. بابم لەسەر شۆخە کردی بە هەرایەک، نەبێتەوە. عالەمێکی زۆر بە هات‌وهاواری بابم لەپێش چایخانەکە کۆبوونەوە. یەک بە خۆی دەینەڕڕاند:

— ئەوە بۆ ئەو بەڵایەت هێناوەتە بن پیلم میرزا شۆخە؟ ها؟ ئەوە لە داخی من هێناوتە؟ قەڵسەم لێدەگێڕی؟ کەس نەمابوو ئەو بەڵایە ڕاگرێ بە شاگردی، ئەتۆ نەبی؟

لەو دەمەیدا وەستا سەعید پەیدا بوو. چوو پێش بابم و وەڵامی دایەوە:

— ئەوە سۆفی مەولوود بۆ وا شێت بووی؟ چی بووە؟ چ قەباعەتێک ڕووی داوە؟

— چۆن چ بووە؟ نابینی میرزا شۆخەی زاوات ئەو بەڵایەی هێناوەتە بن پیلم؟ ئەمن ئەوە هەر لە چنگانی هەڵدێم و میرزا شۆخەش دەیکاتەوە تووکی لووتی. دونیا و عالەم سەر لێک بدەن دەبێ هەر ئێستا ڕاوی بنێت و دەری بکات ئەو هیچ و پوچەی.

— وەستا سەعید: لای خۆت تۆبەکاری و خودا و پێغەمبەر دەناسی سۆفی گیان. ئاخر بۆچی دەری بکات؟ بڕوات دزیی بکات؟ کاری خەراپ بکات؟ تۆ دەبێ شانازیی بەو کوڕەتەوە بکەی. ئەوە ماوەی چەند ڕۆژە پیاوەتی ئەو کوڕەت وێردی سەر زمانانە. بەو تەمەنە کەمەیەوە، کاریکی کرد کە بە زۆر کەسمان ناکرێت. لەباتی قەدری بگری دەچی قەباڵەشی لەسەر ساز دەکەی و حاشای لێدەکەی؟

بابم بەو قسانەی وەستا سەعیدی زۆر بەخۆیدا شکایەوە. بۆ ئەوەی دیسان دەست بخاتە سەر هەست و سۆزی خەڵکەکە، سوکێکی سوخمە و کراسەکەی لەبەر خۆی داکەند و پشت و زگی بە خەڵکەکە نیشان دا کە چلۆن شین و ڕەش هەڵگەڕاوە و چلۆن بە قامچییان برینی قووڵی تێبووە! ئەوجار وەڵامی وەستای دایەوە:

— چاو لێکە و بزانە لەسەر ئەو هەتیوەی چییان بەسەر هێناوم؟ گەر پێم عەیب نەبا پاتۆڵ و دەرپێیەکەشم دادەکەند تا شاکارەکانی ئەو هەتیوەم باشتر ببینن و جا پشتی بگرن! ئەمن بەو تەمەنەوە بۆ ئەوە دەبم ئاوام بەسەر بێنێ؟

— سۆفی گیان تاوانی ئەو کوڕە چییە؟ خۆ ئەو نەیگوتووە بچن لە بابم بدەن و ئاوای شپرزە بکەن! تۆ پێت وایە حەمە پێیخۆشە ئاوایان بەسەر هێناوی؟ ئەوە خەتای ئەو حکومەت و سەربازە نامەردانەیە کە زوڵم و زۆریان گەیاندۆتە سەر ئێسقان. لێگەڕێ با ئەو کوڕەت سەر بە ژیانی خۆیەوە بنێت و لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت. سەر هەڵێنە و خودای ببینە.

پاشی ئەو قسانە کە لە نێوانیاندا تێپەڕی، وەستا سەعید قۆڵی بابمی گرت و بردی بۆ دوکانەکەی خۆی. جا لەوێ چییان لە نێواندا تێپەڕی؟ نازانم! ئیتر بابم زۆری سەر نەدەهاویشتە سەر سەرم و کاری پێم نەدابوو. هەرکەسیش باسی منی لە لا کردبا، دەیگوت نایناسم.

ئێستا ماوەی چوار-پێنج مانگە لەوچایخانەیە کار دەکەم. وەستام زۆرم لێ ڕازییە. مشتەرییەکانیش هەروەتر. وەک دوکانی خۆم و وەک هەلووکی هەڵدەسووڕێم. دڵم خۆش بوو کە لە کاری خراپ پرینگاومەوە. لە ماڵێشدا زۆریان خۆشدەوێم. شیو و کوڵم بۆ دەکەن و بەردەوام جلەکانم خاوێنە. زگم تێرە و گیرفانم پڕ لە پووڵە. تا بڵێی دە خۆشی دام. ئەو دۆخەم بە هیچ نرخێک ناگۆڕمەوە.

هەر وەک باسم کرد ڕۆژانی جومعان دوکان و بازاڕ دادەخران و خەڵک بۆ حەسانەوە و بۆ دەرباز بوون لە گەرمای هاوینێ ڕوویان دەکردە باغ و سەیرانگاکان و دەیانکردە هەڵپەرکێ و شایی، گۆرانی گوتن و دەهۆڵ کوتان. وەستاکەم وێڕای خەڵک خۆی ساز کردبوو بچێتە سەیران. بانگی هێشتم و گوتی:

— دەڕۆمە باغ، نەوەکوو درەنگ بێمەوە، ها، ئەوە هاچەری چایخانەی، بەیانی زوو بچۆ دەرگای بکەوە و هەموو کەلوپەلەکەی حازر بکە تا من دێمەوە.

هاچەرم لە قەدی گیرفانم نا و ڕۆییشتم. کەیفم بە خۆم دەهات و شام بە سەپان نەدەزانی. برێک لەناو شار سووڕامەوە. لای ئێوەڕۆیە چوومە لای چۆمی. لە «گۆمی جولەکان» منداڵ و گەورە مەلەیان دەکرد. لەوبەری چۆمیش دەنگی دەهۆڵ و زووڕنایە لە «باغی گەورە گوێز»ـی[1] دەهات.

---

[1] ئەو باخە دەکەوێتە خوارەوەی (تەپپەی تابانی) لە باکووری مەهاباد کە ئێستا هیچ ئاسەوارێکی لێ نەماوەتەوە. بە باخی گوێزێ یان باخی گەورەگوێز یان باخی گوێزی گەورە دەناسرا.

منیش ڕووت بوومەوە و خۆم دە چۆمی هاویشت. تا ماندوو بووم مەلەم کرد و خۆم فێنک کردەوە. پاشان جلەکانم دەبەر کرد و لە چۆمی پەڕیمەوە تا لە نیزیکەوە گوێ بدەمە دەنگی دەهۆڵ و زوورنا. کە چووم، دیتم ڕەشبەڵەکێکە، کەچکی تێناگەڕێ. ژن و پیاو، کچ و کوڕ تێکەڵ ببون دەستان دەگوشن و تۆزێ لە عەرزی هەڵدەستێنن. دڵیان ئەوەندە خۆشە نەبێتەوە. تاوێکی باش تێیان ڕامام. هەرچەندی زیاتر لێیانم دەڕوانی زیاتر لە قووڵایی نەهامەتییەکانی خۆم ڕۆدەچووم. زیاتر زگم بەخۆم دەسووتا و زیاتر بەخیلیم بەو خەڵکە دەبرد کە بۆچی من لەو خۆشییانە بێبەشم؟ ئێستا بەرەو عەزەببوون دەچم بەڵام لە ژیانمدا دەستی کەسم بۆ ڕەشبەڵەک نەگرتووە، گەڕێک هەڵنەپەڕیوم و کەسیشم نەبووە گەڕێکم سێپێیی، سێچکەیی، سۆسکەیی، سۆمایی، شێخانی، مەریوانی، عەبدۆیی، داغە، ڕۆینە، داڵانە، ڕاستە، چۆپی، گادەران، لەنجە، خوانچە یا گەڕانەوەم فێر بکات. ژانی زگەبرسی و خەمی جێخەو، دەرەتانیان نەدام تامێک لە هەستی شادی بچێژم. نە بە منداڵی وەک منداڵان ژیام، نە بە جحێڵی وەک جحێڵان. ئێستاش بە سەری پیری، لە وڵاتی غەریبایەتێ و لە ناو عەجەماندا، بە پشتی کووڕەوە و پەنجەی قەڵشیوەوە، باغەوانی دەکەم. باشتر بڵێم، قەت خۆشیم نەدیتووە تا شاد ببم و هەڵپەڕم. هەستێکی زۆر نامۆ بوو تەنانەت دیتنی ئەو دیمەنانەش نامۆ بوون. ئەوەندە نامۆ بوون کە بۆم باس ناکرێ.

ڕۆژ ڕۆژی هاوینە، خۆ نابڕێتەوە. تاوێکی خۆشە، لە سەیری سەیران و ڕەشبەڵەکی باغی گوێزی گەورە ڕاوەستام. دیتم کە ئێستاش ڕۆژ زۆری ماوە. هەڵکشام بەرەو «باغی مکایلی». لەوێش ئەو هەوایە بوو، شایی، ڕەشبەڵەک، زەماوەند، خۆاردن و خواردنەوە. وەستا شۆخەشم دیت، داوەتی دەگێڕا. دۆیەکی یەکجار تەڕوبڕی دە دەستیدا بوو. دیمەنی ئەو ڕەشبەڵەک و سەیرانە ئەوەندە جوان بوون کە هەرچی حەولم دەدا بە بزەیەک گووپەکانم قیت کەمەوە و فیزی دڵخۆشان لێبدەم بەڵام سەربوردەی تاڵم بزەی لێ بزر دەکردم و لێوەکانمی پێدادەژەنیم.

دەو کات و ساتەدا، کە لە قووڵایی خۆشیی خەڵکدا قوم ببووم. دیتم لە دوورەوە چەند کەسێک بە ڕاکردن لە خەڵکەکە نیزیک دەبنەوە و لە ئەم و لە ئەوی دەپرسن:

— ئەرێ حەمەدی مەولوودیتان نەدیتووە؟

خەڵکیش قامکیان بەرەو لای من درێژ کرد و منیان پێشانیان دا. کە لێم نیزیک بوونەوە دیتم، «کاکە مری چایچی» کە دۆستی نیزیکی وەستام بوو، هاوڕێ دەگەڵ دوو لە خوارزاکانی و کوڕی «فەقێ ئەحمەدی عەلاف»ـین. هەر واق مام. ئەمن چی و ئەوانە چی؟ دەبێ چ کارێکیان بە من بێت؟ لە مەودای ئەو یەک-دوو چرکەیەدا بە دەیان فکر مەخشووشیان کردم.

لێم هاتنە پێشەوە و بێ ئەوەی تێمگەیێنن کە چ بووە، کوت و پڕ ڕاماڵیان دامێ. چاویان قووچاند و زاریان کردەوە، ئینجا بە شەق و پێلاقە و چەپۆکان بەربوونە گیانم. داوەت و ڕەشبەڵەک کۆتایی پێهات و بڵاوەیان کرد. گشتی ئەو عالەمە هاتبوونە سەیری ئێمە.

وەستام عەجایب ما و هاتە پێشێ لێکی کردینەوە و پرسیاری کرد:

— چ بووە؟ چ باسە؟ ئاخر ئێوە بۆ لەو کوڕە بەستەزمانە دەدەن؟ چی کردووە؟
کاکە مر هەڵی دایە:

— لە چۆم مەلەم کرد و پاشان لیباسەکانم دەبەر کردەوە. ٤٥ تمەنم لە گیرفاندا بوو. کە دەستم لە گیرفانم ڕۆ کرد، ٤٥ تمەنە نەمابوو.

— هەر ئەوە بەتەنێ لەوێ بووە یان کەسی دیشی لێبوو؟

— ناوەڵڵا عالەمی زۆر لێبوو بەڵام کەسی وای لێ نەبوو کە شکم بۆی بچێ. لەوە زیاتر کەس ئەو پووڵەی لە گیرفانم دەرنەهێناوە. لەسەر قورئان هەڵدەپەڕم کە لەو هەتیوە لای نەداوە.
هەر وای گوت و زوویەکی وەک شێتان پەلاماری دام و بەرک و باخەڵەکانمی هەموو گەڕا. ئەوجار وەستام هاتە پێشەوە و هەموو لەشمی بە وردی پشکنی. کاکە مر دیسان هەڵی دایە:

— تاقەتی کردووە. ئەو هەتیوە بۆخۆی دەزانێ لە کوێی ناوە.
ئای خودایە ئەوە چ بەڵایەکە بۆت ناردووم؟ لەوەتا هاتوومەتە سەر دونیایە ئەتۆ سەرشاخم لێدەگری. ئاخر منداڵێکی وەک من لە ڕۆژی یەکەمیی تەمەنییەوە، دەبێ چ خەراپەیەکی دەرحەقی تۆ کردبێ کە ئاوا لێی داغداری؟

زمانم ویشک بووە. لەشم دەلەرزێ. لە شەرمی ئەو خەڵکە کە تێماندەڕوانن، بە حاڵەحاڵ لەسەر پێیان خۆ ڕادەگرم. قسەم بۆ ناکرێ. چاوەکانم پڕ لە ئاو و لەخۆم دەنووسم کە فرمێسکەکانم بەرنەدەمەوە. پێم خۆش نییە بپاڕێمەوە و بلاڵێمەوە ئاخر، بەڵێنم بەخۆم دابوو کە بەشوێن کاری خەراپدا نەڕۆم، بۆیە چیم لەخۆمدا شک نەدەبرد. پاکی پاک بووم. دیسانیش گەر باسی چارشێو و پەتووی سەر تەنافی ماڵانیان کردبا، دەمگوت لەوانەیە ڕاست بکەن و قەدیم دزیبێتم و ئێستا پێیان زانیوە بەڵام ٤٥ تمەن ئەوەندە زۆر بوو کە ئەو زەمان دوکانێکی باشت پێ دادەنا.

وەستام بە ڕووی پرسیارەوە خێسەیەکی لێکردم. سوێندم بۆ خوارد کە من ئەو پووڵەم نەدزیوە و نەمدیوە. دیسان وەک گورگی برسی پەلاماریان بۆ هێنام و بە جنێو و هەڕەشە وەدرۆیان دەخستمەوە. هەرچەند سوێندم بۆ دەخواردن، چاوم لێکرد شێلگیرتر دەبن. وەستام کە زانی ئەوانە دەست هەڵناگرن، ئەو جەماعەتەی ڕازی کرد کە لەماڵەوە و بە شێنەیی قسەم دەگەڵ بکات. وەپێش خۆی دام بۆ ناو شاری و بۆ ماڵەوە. هەر لە باغی میکایلی ڕا تا بەر دەرگای ماڵێ، حەشیمەتێکی زۆرمان بەدواوە بوون. لەو ڕێگا دوورەدا، هەر کەسمان دەدیت دەیانپرسی:

— ئەوە چی بووە؟ چ قەوماوە؟ خێرە؟

— ئەوە دزی کردووە و پارەی لە باخەڵی کاکە مری دزیوە. ئەویش ٤٥ تمەن.
هەر کە پێم دەحەساریٚ ماڵی وەستام نا، دیسان چینێکی خۆشیان لێدام. شەق و مست و پێلاقە و کەللە و شەپەڵاخە لا یەک، جنیو و قسەی سووکیش لایەک. ئەوجار دایک و خوشکی وەستام

هاتنە ناو کێشەکەوە و لە چۆنییەتی باسەکەیان دەپرسی. دیسان هەمانهەمان. دزی کردووە لە باخەڵی کاکە مری، ٤٥ تمەن بووە. خودا هەڵناگرێ هەردووکیان لاگیری من بوون و دەیانگوت کە کاری حەمەد نییە. ئێنجا وەستا سەعیدی دۆست و دڵسۆزم پەیدا بوو و بە هاوارمەوە هات. وەستا شۆخە کە زاواشی بوو ڕووی تێکرد و دەینەڕراند چۆن:

– ئەتۆ ئەو توتکەسەگەت لە ملی من هاڵاند. ئەتۆ ئابڕووی منت برد. ئەوەتا ئەوە کارە جوانەکانێتی. خودا دەزانێ سبەی چی دی لێ ڕوون دەبێتەوە و کێی دی دێت بەری دەرگام پێدەگرێت؟

چاوم لێکرد وردەوردە وەستا سەعیدیش لێم دوودڵ بووە و چۆتە سەر قسەی ئەوان و باوەڕم پێناکات. هەرچی سوێندی بۆ دەخۆم کە کاری من نییە و ڕۆحم ئاگادار نییە، چ فایدەی نییە، ئەویش چوو سەر دینی ئەوان و وەک ئەوان بیر دەکاتەوە.

لەولای ڕا دایکی شۆخە هەڵیدایە:

– هیچی تر جەزرەبە و ئازاری مەدەن، بیبەنە لای (...)[1] ی ئەو کەراماتی هەیە. هەر چاوی لێبکات یەکسەر دەزانێ کە دزیویتی یا نا. تەنانەت ئەگەر لای بێت جێگا و شوێنی پارەکەشتان پێدەڵێ.

دە دڵی خۆمدا ئەو قسەیەی دایکی شۆخەم زۆر بەدڵ بوو. دەمگوت جا «(...)» دزەکە بدۆزێتەوە من دەزانم چ بەسەر وەستام و کاکەمر دێنم؟ ئەوەی پارەکەشی دزیوە و ئێستا لە لایەتی وا بە هاسانی لە چنگانم قوتار نابێ!

ڕەپێچکیان دام بۆ لای «(...)ی». حەشیمەتێکی یەکجار زۆریش بەدوامەوە. چووینە .... گووتێرپاوەکەی. لەسەر هەیوانەکەی دانیشتین. خەبەریان دا بە «پیرە سەگە» و هات و هەموو حەوا کەوتین. کوتوپڕ بەرماڵیان بۆ ڕاخست. تاوێکی خۆش سەری دەبەر خۆی نا. ئەو عالەمەش مت بوون و نووزە ناکەن. ئینجا سەری هەڵێنا و بە وەستامی گوت:

– شۆخە چییە؟ چ باسە؟

– قوربان، کاکەمر لە چۆم خۆی شووشتووە، ئەو هەتیوە ئەوەندە پارەیەی لە گیرفان دەرهێناوە، دەگەڵی شلوکوت بووین ناچێتە ژێری.

تۆزێک چاوی لێکنا، پاشان سەری دەبەرخۆی نایەوە. ئەوجار سەری هەڵێنا و لە شۆخەی پرسی:

– کوڕی کێیە؟

– کوڕی مەولوودە چرچییە.

ئەوجار چاوی لە چاوم بڕی. ئەوە نەبوو چاوی بتروکێنێ یا چاوی لەسەرم لابەرێ. قەت شتی وام نەدیبوو. شەرمم دەکرد چاوبڕکێنەی دەگەڵ بکەم. سەری خۆم داخستبوو. نازانم لەترسان بوو

---

[1] لەو بەشەدا کاپیتان حەمەد زۆر بە توندی دەپرژێتە سەر کەسێک کە بۆ پاراستی کەسایەتی و کەرامەتی ئەو کەسە ناوەکەی لە کەوانەدا بە ٣ خاڵان دادەنێم.

یا لە خۆشیان، بەڵام بۆخۆم گوێم لە ترپەی دڵی خۆم دەبوو. ئاخر چارەنووسی من لە سەر لێواری لێوەکانی ئەودا بوو. جارجار چاوم تێدەبڕی تا بزانم چ لەو زمانەی دێتە دەر؟!

لەپڕ وەدەنگ هات و گوتی:

— هەتیوە، بڕۆ لەو شوێنەی پارەکەت ناشتووە، دەری بهێنە و بیدەوە.

ئەوجار ڕووی دە وەستام کرد و گوتی:

— ڕۆڵە، شۆخە، ئەگەر زانیت ڕاستێ ناڵێت کەسێکتان بێتەوە لام، من بۆی لەسەر نانی دەنووسم با ئەو هەتیوە بیخوات و بخنکێ!

بە ساجی ڕووڕەش، هەر ئەوەندە بوو ئەو سەگە ئەوەی گوت، کەوشیان بۆ دانا و تەشریفی چوو بۆ حەرەمسەرای خۆی. منیشیان بە لێدان و شەق بردەوە بۆ ماڵە وەستام و لە کۆڵەکەیان بەستم چ نەما بەسەرمی نەهێنن و پێم نەڵێن! ئەوجار بە قسەکانی (...) پشتئەستوور ببوون و شێلگیرانەتر لێیان دەدام . پێشتر دایک و خوشکەکانی وەستام لاگرم بوون بەڵام ئێستا ئەوانیش لێم پەژیوان بووونەوە و پێمدەڵێن کە:

— بە قسەی (...) بکە و لەکوێ شاردووتەوە بڕۆ بیهێنەوە و بیدەوە بە ساحێبەکەی.

هەرکەس دەهات تفی لە ڕووم دەکرد. جنێو نەما لە زاریان نەیەتە دەر و پێمی نەڵێن. ئەوانەی پێشتر بێدەنگ بوون ئێستا جنێو دەدەن و شەق و مستم لێدەدەن. ئیتر هەر لەوکاتەوە باوەڕم بەو شێخ و مەلا و پیاوە ئایینیانە نەما. جاران ئەو (...) یە ڕۆژی جومعان دەهات بۆ نوێژی جومعە. عالەم بۆ زیارەت کەڵەکە دەبوون. منیش کە ماڵمان جیرانی مزگەوتێ بوو ئەو دیمەنانەم دەبینی و وەمدەزانی گەر منیش وا نەکەم بەشم دەخورێت و وەپاش دەکەوم، بە هەر بەدبەختیەک بوایە خۆم دەگەیاندە پێشێ و دەستیم ماچ دەکرد.

با زۆری لەسەر نەڕۆم. بە جنێو، لێدان، تف لەڕوو کردن، توونی کردن، جەزرەبە و ئازارم، زۆریان حەول دا و چییان بۆ نەچوو سەر و منیش ئەوەی ڕاستی بوو پێمگوتبوون کە «پاکم و بێباکم». پێش قسەکانی (...). بە گریان و پاڕانەوە دەمگوت کاری من نییە بەڵام ئێستا هیچ کە ناگریم؛ تەنیا ئەوەم لە زار دێتە دەر:

— «پاکم و بێباکم».

ئاخر هیچ فایدەی نەبوو، ناچار خوارزای کاکەمریان نارد بۆلای (...)ی و لەسەر نان بۆی نووسی و هاتەوە. پەلکە نانێک کە نازانم چی لێنووسرابوو دایانە مستم. یەک دەیگوت:

— بیخۆ با گەرووت ڕەق بێ.

ئەوی تر دەیگوت:

— لێگەڕێن با بتۆپێ.

یەکی تر لەولاوە هەڵدیدەدایە:

— هەتیوە بڕۆ پارەکەی بدەوە و خۆت بە هیلاک مەدە.
لە پشتەوە ڕا یەکی تر دەینەڕاند:

— با جەهەننەمی لێ پڕ بێت، لێگەڕێن با نانەکە بخوات.

هەر چاوم لە نانەکە بوو و بیرم لێدەکردەوە کە بیخۆم یا نەیخۆم؟ بەخۆم گوت خۆ پارەکە لای من نییە و من نەمدزیوە ئیتر بۆ بترسێم لە خنکاندن؟ زوو پێچامەوە و قووتم دا. نە خنکام و نە هیچ ڕووی دا. گووی سەی بە گۆڕی (...) و بە قەبری ئەو شێخەی ئەو سەیەی کردۆتە ... .

پاشی ئەو هەموو سووکایەتی و بوختان و تێهەڵدان و تف لەڕووکردنەم، لەکۆڵەکەیان کردمەوە و بەڕەڵڵا کرام، منیش سووکێکی لەماڵ وەدەرکەوتم. سەری خۆم داگرت بۆ نێو بازاڕێ. نە پووڵم پێیە و نە جێگایەک شک دەبم شەوی لێ ڕۆژ کەمەوە. تەنانەت پارەی مانگانەکەشم خورا و گیرم نەکەوتەوە. لە ڕێگا دڵی خۆم دەدایەوە و بەخۆم دەگوت:

— ڕۆڵە، ئەتۆ ڕۆژی لەوانە سەختترت دیتووە، خەم مەخۆ لە هەموو هەوران نابارێت. منەت لە کەس هەڵمەگرە و ... .

زۆر سەیرە، دەڵێی خودا ئەمنی ساز کردووە کە بەڵاکانی لەسەر من تاقی کاتەوە. ئای لە خۆم چارەڕەشێ! ئاخ بۆ تۆزێک بەخت و شانس کە نەمبوو.

## ڕوویەکی دیی کۆمەڵ

بەدەم ڕێگاوە بیرم لەوە دەکردەوە کە چلۆن زگ تێرکەم و نان و چایەک بخۆم؟ ئاخر لە بەیانییەوە لەو لەتەنانە گڵاوەی (...) زیاتر، چیتر نەچووبوو سەر زارم. وردەوردە تاو بەتەما بوو بپەڕێ. بامدایەوە بۆ ماڵە پوورزاکەم کە مێردەکەی «نمەدماڵ»[1] بوو. شەوانە تا بەیانی دەچێ لە حەمام لباد دەگێڕێ. پوورزاکەشم قسر بوو، منداڵی نەدەبوو. بۆ منداڵێک دەچوو دە حەواوە. زۆر چاک و پیر گەڕا کە ئەو چاک و پیرانە منداڵی بدەنێ بەڵام کەس جوابی نەدایەوە.

شەوێ کاتێک کە مێردەکەی دەیویست بچێ بۆ کار، پرسیاری لێکردم کە بۆ دەگەڵم نایەی بۆ کار؟ منیش بێ ئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە دەگەڵی ڕۆییشتم. ئەو شەوە تا لای نیوەشەو یاریدەم دا، پاشان فۆتێکی[2] بۆ لولە کردم و گوتی:

— بڕۆ بنوو و ئەوەش لەبن سەرت بنێ.

ئەوەندە ڕۆژێکی ناخۆشم تێپەڕ کردبوو کە هەر سەرم لەسەر فۆتەکە دانا، خەوم لێکەوت.

---

[1] کەسێک کە پیشەی سازکردنی نمەد و لبادە.

[2] ئەو پەڕۆ یا دەسرە ناسکەی کە لە حەمام بە خۆیانەوەی دەگرن. بەرەڵبێنە - بەرهەڵبێنەی حەمام.

ئەو دەیزانی کە زۆر هیلاکم. بەیانی کە هێشتا عالەم نەهاتبوون بۆ حەمام، ئێمە چووینەوە ماڵ و پاش خواردنی نانی بەیانی من لە ماڵ وەدەرکەوتم و چوومە مەیدانی مەنگوڕان. ئەوە سەربازخانە دروست دەکەن. لە من چووکە تر بۆ کارکردن دەچن بۆ سەربازخانە. من زەلام بووم، مووی سمێڵ و ڕیشم سەریان وەدەر ناوە بەڵام هێشتا تیغم لێنەداوە.

لە مەیدانێ چوومە نێو فەعلان، «فەتحە بەگ» نێویک سەرکاری سەربازخانە بوو. ئەو ناوی فەعلەکانی دەنووسی بۆ کار. چوومە لای و گوتم: منیش بنووسە! برێک لێم ڕاما و پاشان نووسیمی. بە کوڕی «وەستا حەسەنی مێعماری»[1] گوت:

— ئەوەی دەگەڵ خۆت بەرە با لەژێر دەستی تۆدا کار بکات.

بابی ئەو کوڕە مێعمارێکی باش بوو، کوڕەکەی منداڵ بوو، تازە مووی لە ڕوو دەرکردبوو، باوکی فێری کاری مێعماری کردبوو و ئێستا وەستایەکی باشە. تاوم دایە خورجین و کەلوپەلی وەستام و بەشانم دادا و وەدووی کەوتم بۆ سەربازخانە.

دەستم بە کار کرد. بە ڕۆژ دەچووم بۆ فەعلەیی و بە شەویش دەچوومەوە ماڵە پوورزاکەم. ئەو پووڵ و پارەیەی وەرمدەگرت، دەمبردەوە ماڵێ و دەمدا بە پوورزاکەم. حاڵم زۆر باش بوو. بە خەونیش باوەڕم نەدەکرد کە ئاوا هەستمەوە سەرپێ و دەستم بگاتەوە دمی خۆم. لەولاشەوە پوورزاکەم «هەنێ هەڵگر» بوو. ڕۆژانە بانگیان دەکرد بۆ ماڵان و هەنتی


وێنەی سەربازخانەی کۆنی مەهاباد کە شوێنەکەی لە جێگای ئیدارەی دوخانیاتی ئێستایە. وێنەگر عەلی خان والی

[1] لەسەر وەستا حەسەنی مێعماری زیاتر بخوێنەوە لە لاپەڕەی ٤٢٢

ژنانی هەڵدەگرت. بە پیلان نان، پێخۆر، قەند و چای دەگەڵ خۆی دەهێنایەوە ماڵێ. یانی پارەی بە هیچ شتێک نەدەدا. دوو-سێ مانگ بەسەرچوو، لەو پارەیەی کە مانگانە دەمدا بە پوورزاکەم، هەمووی کۆ کردبۆوە و چوو لەسەر تا پێم لیباس و جلکی بۆ کڕیم.

وەستام و فەتحە بەگی سەرکاری سەربازخانە، زۆریان خۆشدەویستم. هەرچی گوتبایان بە گوێیانم دەکردن. وەک هەلووکی لەبەردەستیان دەهاتم و دەچووم. چونکە شاگرد بووم، سەرکارەکە ١٠ شایی لە فەعلان زیاتر دەدامێ. بەو شێوەیە کارم دەکرد و زۆریش لە ژیانم ڕازی بووم. بەیناوبەینیش کۆنە هاوڕێکانم کە لە جمخانە دەمناسین، دەمدیتن. زۆریان لە بن گوێمدا دەخوێند کە وەرەوە لای خۆمان و خۆت بۆ ماندوو دەکەی و ئێمە هیچ ماندوو نابین و پارەی چاکیش دەردێنین بەڵام من بەگوێم نەدەکردن و سەرم بەردابۆوە کاری خۆم دەکرد.



وێنەیەکی تر لە سەربازخانەکەی مەهاباد کە عەلی خان والی گرتوویەتی

## پەنابردن بۆ ماڵە «حاجی مستەفا داودی»!

بەوشێوەیە دەگەڵ وەستاکەم کارم کرد تا کاری سەربازخانە بەرەو تەواوبوون چوو و تەنانەت قولەکانی دەور و پشتی شاریشمان تەواو کرد. ئاخرین ڕۆژ وەستا گوتی کارێکی دیمان دەست کەوتووە لە ماڵی «میرزا ئەحمەدی گوڵندامی» ڕەئیسی بەلەدیێ.[1] دەچین حەسارەکەیان بۆ سنگەبەرد دەکەین، تۆ بەیانی خورجین و کەلوپەلەکەی بەرە بۆ ئەوێ و چاوەڕوان بە تا من دێم. بەیانی لە پێش وەستامدا لەوێ بووم. هێندەی پێنەچوو وەستاکەم هات و دەستمان بەکارکردن کرد. ئەو بەردی لە حەسارێ دەگرت و منیش بەردم بۆ دەهێنا. لای چێشتانێ ڕەئیس تەشریفی هاتەوە ماڵ. دەگەڵ باوکی وەستام کە لەسەر دیوار بوو و کاری



"میرزا ئەحمەدی گوڵندامی" میرزا ئەحمەدی ئەشعەری

دەکرد، دەستیان بە قسان کرد. پاشان لەسەر دیوار هاتە خوار و دەگەڵ وەستاکەی من بڕێک دوا. ئەوجا چوو بۆ نێو باخچەی و لەوێڕا منی گاز کرد و گوتی:

— هەتیو! هۆ هەتیو، بڕۆ ئەو پاچەی بێنە و ئەو ڕێنگایە خۆش کە.

وەستام لەسەرم وەدەنگ هات و گوتی:

— قوربان ئەوە شاگردمە و لەبن دەستم نەبێ ناتوانم کار بکەم.

هیچ گوێی نەدایە و گوتی:

— هیچ نیە ئەو تۆزە ڕێنگایە خۆش دەکات و زوو تەواو دەبێ و دێتەوە لات.

هیچ فایدەی نەبوو، لێم نەبۆوە، ناچار چووم. پاچم هەڵگرت و بەربوومە پاچ وەشاندن، بە هەموو هێزی خۆم پاچ لەو عەرزە دەدەم. عەرز چ عەرزا! ئەوەندە ڕەق و سەخت بوو کە هەر

---

[1] شارەداری شاری سابڵاغ (مهاباد) بۆ یەکەمجار و بە شێوەی ئەورۆیی لە ساڵی ١٣٠٦هـ دامەزرا، میرزا ئەحمەدی ئەشعەری (ناسروا بە میرزا ئەحمەدی بەلەدێ) یەکەم شارەداری ئەو شارە بووە کە تا ساڵی ١٣١٦ لە پۆستەکەی خۆیدا ماوەتەوە.

جارەی پاچی لێدەدەم، بەقەرا کەللەقەندێکی هەڵدەگرێ، ئەویش لەسەر سەرم ڕاوەستاوە و بە ناحەزیی خۆشخۆش پێمدەڵێ:

— هەی پشتت شکێ! تەماشا دەڵێی لەسەری من دەدات! هەی داوەشێی باشە! دەی دڵت تۆقێ، دەی کەمێ توندتری لێدە دەڵێی نانت نەخواردووە!

ئەوە وەستام و باوکی وەستام و هەموو فەعلەکانیش گوێیان هەڵخستووە و چاویان لێیە. ئەوانیش لەو بێڕێزییانەی کە ڕەئیسی بەلەدێ بە منی دەکرد سەریان سووڕ مابوو! ئاخر بەو دەنگە زەلامەی یەکبەخۆی جنێوی دەدا و بێڕێزی پێدەکردم، خۆ بڕانەوەی نەبوو. هەرچی من توندترم لە عەرزەکە دەدا، ئەو جنێوەکانی پیستر و دەنگی زیاتر دەکرد! ئەوە ئارەقەی ڕەش و شینم دەرکردووە، لە گیانی خۆم وەڕەز بووم، ئەوەش لەسەرسەرم ئاوا دەکات، جنێو و قسەی سووک نەبێ لە زاری نایەتە دەر. ئیتر هاتە سەرئێسکانم و گوتم:

— کوڕە بۆ چما هەزار ڕەئیسی بەلەدێ بی ...!

پاچم هەڵێنا و لەباتی لە عەرزی دەم بە هەموو هێز و قەوەتی خۆم لێم ڕاکێشا!

یەکسەر بەرەو دم کەوت. هەست و خوستی لێبڕا. کە ئەوەم دیت، وەک با ڕام کرد. فەعلەکان هاواریان لێ بەرز بۆوە:

— ها بیگرن بیگرن، نەهێڵن دەرچێ، ئەوە لە ڕەئیسی بەلەدێی داوە.

خۆ نەشیاندەویست بمگرن، دەنا زۆر بە هاسانی دەیانگرتم. ئەو هات و هاوارەیان بۆ ئەوەی بوو پاشان لێیان نەپرسنەوە کە بۆ نەتانگرتووە؟ بەهەر چۆنێک بێت بۆی دەرچووم و ئەوجارەش قوتار بووم.

بە ڕاکردن لە هەورازی سەری خرێ شۆڕ بوومەوە، گەییمە بەر دەرکی مزگەوتی هەباس ئاغای، ئاوڕم دایەوە تا بزانم لەپشت سەرم چ باسە؟ بڵێی کەسم بەدواوە بێ؟ دیتم هیچ باس نییە و کەسم لەدوو نییە. چاوم لێکرد دەرگای ماڵە «مستەفای داودی» ئاوەڵەیە[1]. مستەفا ئەوکاتە نەچووبوو بۆ حەج. خۆم دەماڵە ئەوان ڕاکرد. کەس لە دەرک و بان نەبوو. ملی ڕێگام گرت و تا تەویلەی بەند نەبووم. لەنێو ئاخوڕی وڵاخاندا تاوێک خۆم مات کرد، هیچ باس نەبوو، نە دەنگێک نە هەستێک نە خوستێک. دونیا زۆر لەوەی بیرم لێدەکردەوە ئارامتر بوو. ئەوە هیلاک و شەکەتم و خەویش هێرشی بۆ هێناوم. لەنێو ئاخوڕەکەدا لەسەر گازی[2] پشتێ بۆی نووستم. چووم دە خەوێکی قووڵ و بێبن. ئەوەندە خۆش بوو نەبێتەوە. لەو بەینەیدا «دەروێش حەسەن»ـی مێتەری (مەیتەر - مهتر بە فارسی) ماڵە مستەفا داودی دێتە تەویلە و تەماشا دەکات ئەوە هەتیوێک لە نێو ئاخوڕی تەویلەدا

---

[1] ئەو ماڵە جیرانی مزگەوتی "قوبڵە" بوو لە کوچەی خوسرەوی و بەرێکیشی دەکەوتە سەر "خرێ".
[2] کاپیتان لە دەستنووسەکانیدا بەو شێوەیە نووسیوێتی کە منیش وەک خۆی دامناوەتەوە. هەرچەند منیش بەو شێوەیە بیستومە، بەلام وێدەچێت کە " گازەی پشت" دروستتر بێ.

بۆی نووستووه. زوو دەچێت خەبەر دەداتە «خانمێ». «تەلی» کچی ماڵێ و کچەکەی «میرزالە»ـی خزمیان دێنە سەر کەلاکم و تەماشا دەکەن لەسەر پشت نووستووم و..... ئەوانیش دەچن لە باغچە، سەر و شوولێکی تەڕ لێدەکەنەوە و دێنە سەرم. لەو خەوە شیرن و خۆشە بە ژانی شوولان وەخەبەر هاتم. سەرم هەڵێنا «تەلی» کچی مستەفا داودی و کچەکەی تر شوولیان بەدەستەوەیە بە دەم قاقا و پێکەنینەوە لێم دەدەن. هەستاوەمە سەر قوون، کەچی دیسان دەستهەڵناگرن و هەر پێدەکەنن و لە ناوگەڵ و ڕان و قاچ و قووڵم ڕادەکێشن. قاقایان ئەو گەڕەکەی داگرتووە. بەهۆی پێکەنینەوە کەمێک وچان دەدەن و دەکێشنەوە پشتەوە بەڵام دیسان هورووژمم بۆ دیننەوە. منیش لە شەرمان و لە ترسان نەمدەزانی چ بکەم، تێمابووم! لە گەرمەی ئەو بەزمەدا بوو کە «سافی» کڵفەتیان کە ژنێکی پیر و وەنێوکەوتوو بوو هات. لە کچەکان تووڕە بوو و لێم کشانەوە. ئەوجار دەوریان دام بۆ پرسیاران:

— بۆ لێرەی؟ چ دەکەی لە نێو ئەو ئاخوڕەیدا؟ لەکەیەوە لێرەی؟ ...

منیش بۆم گێڕانەوە کە شەڕم کردووە و لە ڕەئیسی بەلەدیم داوە و خستوومە. ئێستاش لە ترسی گرتنم خۆم لێرە هاویشتووە. دیار بوو ئەوان هەر ئەوەندەیان بیستبوو کە فەعلەیک بە پاچ لە ڕەئیسی بەلەدێی داوە و بە دارمەیت بردوویانەتە سەر جێگا، ئێدی نەیاندەزانی کە من ئەو کارەم کردووە. ئێستا کە حاڵی بوون، نەیاندەزانی چیم دەگەڵ بکەن! خەبەریان دا بە خانمی کە ئەوە هەمان فەعلەیە کە لە ڕەئیسی بەلەدێی داوە. خانم گوتبوی بۆم بانگ کەن با بزانم ئەوە کێیە لە ڕەئیسی داوە؟

بردیانم بۆ لای خانمێ. سڵاوم کرد. گوتی:

— هەتیو، تۆ لە ڕەئیسیت داوە؟
— بەڵێ.
— هەتیو، دەزانی چ تاوانێکت کردووە؟
— بەڵێ.
— دەزانی بتگرن کەوڵت دەکەن؟
— بەڵێ.
— پەژیوان نی؟
— نەخێر.
— بۆ پەژیوان نی؟

هەموو نەقڵەکەم لە سەرڕا بۆی گێڕایەوە. کە تەواو بووم لە گێڕانەوەی، گوتی:

— دەستەکانت خۆش بێت و چاکچاکت کرد.

ئەمری کرد: بەرن نان و چای بدەنێ. بردیانم بۆ مدبەقێ هەر لە نان و ڕۆنی کەرە ڕا گرتوویەتی تا پەنیر و چای شیرن لەپێشیان دانام. منیش تا مەشکەم بردی خواردم. تێر تێر ببوم. هەر لە سووچی مدبەقەکەی لبادیان بۆ هینام و بۆی نووستم. ئەوجار نەموێرا لەسەر پشت بنووم، لەسەر زگ نووستم. ترسام، گوتم نەکا دیسان بە شوولان بێنەوە سەرم!

خەبەر دەهات کە ئەوە چوار- پێنج پیاوی بەلەدێ، هەریەکە و چۆماغێک بەدەستەوە، کونبەکون کەوتوونە سۆراغم و لە من دەگەڕێن. چەند جاران چوونەتە زگ بابم و لە منیان پرسیوە، بابیشم هەمان قەباڵەیان پێشان دەدات و قوتاری دێت. پێیان دەڵێ کە بچن بۆ ماڵی «قادر لەپە»، حەمەد لەوێ دەژی. دێن قادر ڕەکێش دەکەن و بەلێدان دەیبەن بۆ لای «میرزا ئەحمەدی ڕەئیسی بەلەدێ» .کە دەجێگا دایە و ناتوانێ ببزوێ. قادر لەوێ دەگری، دەپاڕێتەوە و سوێند دەخوات کە بابی حەمەدی (سۆفی مەولوود) درۆ دەکات و حەمەد لە لای من ناژی. میرزای ڕەئیس ئەمر دەکات کە بەڕەڵلای کەن. ئەویش بەم جۆرە قوتاری ببوو. لای نیوەڕۆیە میرزا مستەفا و «حەسەن»ـی کوڕی بۆ نەهارێ دێنەوە ماڵێ. خەبەری دەدەنێ کە ئەوە هەتیوێک شەڕی دەگەڵ ڕەئیسی بەلەدێ کردووە و خۆی دە تەویلەی ئێمە هاویشتووە. میرزا مستەفاش گوتبوی:



خوالێخۆشبوو میرزا مستەفا داودی (حاجی) کە پاشان بوو بە وەزیری بازرگانی کۆماری کوردستان

— چاکی کردووە و دەستەکانی خۆش بێت، جارێ ڕەئیس لە جێگا دایە، کە هاتەوە سەر حاڵ و کەوتەوە سەرپێ، خۆم پێیدەڵێم کە عەفوی بکات.

پاشی چەند ڕۆژێکی تر میرزای ڕەئیس وەدەر دەکەوێ. ڕۆژێک دەچێتە حوجرەی،[1] چەند نەفەر لە دەوڵەمەندەکانی شار لەوێ دەبن و دەیبینن کە ڕەئیس بەو حاڵە شڕەی بەوێدا تێدەپەڕێ. بانگی دەکەن، کەمێکی دەدوێنن و هەندێکیشی گاڵتە پێدەکەن، لە کۆتاییشدا ڕەجای لێدەکەن کە عەفوم بکات و ئەویش عەفوی کردبووم. نیوەڕۆیە لای چێشتانێ کە میرزا مستەفا و کوڕەکەی دیسان دێنەوە بۆ نەهارێ، خەبەری عەفوی من باس دەکەن. من کە لە مدبەقێ دەگەڵ نۆکەرەکان خەریکی نان خوارد بووم، دەروێش حەسەنی مەیتەر بە هەڵەداوان هات و خەبەرەکەی پێدام.

---

[1] شوێنێ بازرگانێکی گەورە لە بازاڕ. حوجرە لە دوکان گەورەتر و لەبرەوترە.

پاش ماوەیەک نان‌ومان خورا، میرزا حەسەنی کوڕی میرزا مستەفای کە دەهات بڕواتە حوجرەی، سەری دە مدبەقێ نا و بە منی گوت پێویست ناکا لەوە زیاتر خۆت بشارێوە. خۆت وەدەرخە و قوتار بووی. بابم خوابیشی لە ڕەئیس بەلەدێ کرد و ئەویش عەفوی کردووی.

ئەوان کە لە ماڵ وەدەر کەوتن، خانمیش کراس و دەرپێیەکی کۆن، جووتێک قۆندەرەی کۆن و کەوایەکی بۆ ناردم. کەوش و جلیقەکەم [جلیتقه - سوخمه] ئەوکاتی کە لە ڕەئیسم دا و ڕام کرد لە ماڵە «میرزا ئەحمەدی ڕەیسی بەلەدێ» لێم بەجێ مابوو. منیش چووم ماڵئاواییم لە خانم کرد و لە ماڵێ دەرکەوتم. زۆر نەڕۆییشتبووم کە «حەوڵا»ـی [عەوڵا - عەبدوڵڵا] نۆکەریان هەرای لێکردم و منیش گەڕامەوە لای. حەوڵا سێ قڕانی دە مستم نا و گوتی ئەوە خانم بۆی ناردووی. سپاسم لێکرد و چوومەوە بۆ ماڵە پوورزاکەم. کە وەژوور کەوتم شاڵاوی بۆ هێنام گوتی:

— سەربەقووڕ ئەوە لەچی دەگەڕێی؟ میرزا ئەحمەد هەستاوەتەوە سەر پێ و وەدەرکەوتۆتەوە، تووشت بن کەوڵت دەکەن، بڕۆ خۆت ون کە، گیر مەبە، نازانی پیاوانی بەلەدێ چییان بە سەر قادر لەپە هێناوە؟

منیش هەندێکم هێوەر کردەوە و بۆم باس کرد کە عەفوو کراوم و بەو جۆرە ئاهێکی هاتەوە بەرێ.

## ڕۆژانی شوانکارێتیم

ئەوە شەڕی پژدەر (پشدەر) و حکومەتی ڕەزاشایە.[1] پشدەری لەشکری ئێرانیان ڕاوناوە و سەردەشتیان بەخڕی تاڵان کردووە و پاشانیش سووتاندوویانە. لە دوکان ڕا بگرە تا خانووبەرەی خەڵک هەر هەمووی سووتاوە. پاشان حکومەت پشدەرییان لە سەردەشت وەدەر نا و لە حەولی ئەوەدا بوو کە بە سەردەشت ڕابگات.[2] لە سابڵاغ چەندەی وەستا و بەننای هەیە، هەمووی کۆکردۆتەوە و بۆ سەردەشتیان دەنێرێت تا ئاوەدانی بکەنەوە. وەستاکەم دەڕوا بۆ سەردەشت و داوای لێکردم کە دەگەڵی بچم، دەگەڵی نەچووم. هەرچەندی حەولی دا، گوتم نایەم. ئەوان ڕۆییشتن بۆ سەردەشت و منیش چەند ڕۆژێک بەبێ ئیش لە شاردا سوڕامەوە. ڕۆژێک «مام وسووی قەساب» تووشم بوو و گوتی:

— وەرە بتنێرم بۆ سەردەشتێ. مێگەلەمەڕێک دەبەی بۆ سەردەشت، مانگێ ئەوەندە پارەت دەدرێتێ، هەموو خواردنت لە سەربازخانە وەک سەربازان دەدرێتێ.

---

[1] ئەو شەڕە لە ڕەشەمەی ساڵی ١٣٠٧ی هەتاوی واتە ١٩٢٨ زایینی ڕووی داوە. بەو پێیە ئێستا تەمەنی کاپیتان ٢٠ ساڵە.

[2] بڕواننە کتێبی: ساوجبلاغ مکری (مهاباد در آینیه اسناد تاریخی) نووسینی: فریدون حکیمزاده، ل: ٥٢

بردمی بۆ لای قودراخچی[1] ئەو کابرایەکی عەجەمی خەڵکی تەورێزێ بوو. من و کابرا و مام وسوو هەموو قەرارومەرارمان براندەوە. بڕیارمان دا تا سەردەشت ئاوەدان دەکرێتەوە شوان بم. هەرکات لەشکر گەڕایەوە بۆ سابڵاغ منیش دەگەڵ لەشکر بگەڕێمەوە. پارەی دوو مانگانم لە قۆنتەراتچی وەرگرت و هەر ئەو ڕۆژە دەگەڵ سەربازێکی سوار، مێگەلمان وەپێش خۆمان دا بۆ سەردەشت. بە چەند ڕۆژان چووینە سەردەشت. وەستاکەم و باوکی، لەوێ کاریان دەکرد. خەبەریان پێدەگات کە ئەوە حەمەد هاتووتە سەردەشت. من لە قەراخ شار مەڕم دەلەوەڕاندن چاوم لێکرد، ڕەشاییەک لێم نیزیک دەبێتەوە، دیتم وەستام بوو. زۆری بە دیداری گەشامەوە. گوتی:

— کە لێرە قوتار بووی مەچۆوە بۆ سابڵاغ و وەرە لای خۆم بۆ کارکردن.

— پێمگوت کە قەرارم وا داوە کە تا سەردەشت ئاوەدان دەکرێتەوە شوانم.

ئەویش قەبووڵی کرد و شوێنەکەی خۆی پێگوتم و ڕۆیی. بۆ بەیانی قەساب هاتن و چەند سەر مەڕیان کوشتەوە، منیش چەند دەست جەرگ و دڵم گلدایەوە و بە قەرای سێ کیلۆ گۆشتیشم برد بۆ شوێنی وەستام. چەند مانگان کە لە سەردەشت بوون، نەمهێشت پارە بە نان و گۆشت بدەن. ئاخر قەسابەکان بێ من نەیاندەتوانی دەست لە مەڕان بدەن و گۆشت بەرن بۆ سەردەشت. وردەوردە سەردەشت هەستایەوە سەر پێ. لەشکر گەڕایەوە بۆ سابڵاغ، لەشکر قەسابیان نەبوو، من لە ڕێگادا هەم قەساب بووم و هەم شوان تا گەیێشتینەوە بۆ سابڵاغ. لەوێ کابرای قۆنتەراتچی زۆری حەول دا تا مەڕی بۆ بەرمەوە تەورێز و دەیگوت کە لەوێرا بە ماشێن دەتنێرمەوە سابڵاغێ بەڵام بەگوێیم نەکرد و حەق و حیسابی خۆم تەواو لێهەستاند و ماڵئاواییم لێکرد.

## لە ڕێگای (هامیلتۆن)کرێکارم و لە ڕواندز کووپەفرۆش

ئەوە کوڕی سابڵاغێ هەمووی دەڕۆن بۆ گەرمێنێ بۆ فەعلەیی. دەڵێن ڕێگا دەکێشن بۆ سەر حدوودی ئێرانێ.[2] کاتێک دەگەڕێنەوە، کۆک و پۆشتەن و باخەڵیان پڕە لە پووڵ. منیش بڕیارم دا کە

---

[1] مەبەستی کاپیتان قۆنتەراتچی - کۆنتراکتچی‌یە، ئەو کەسەی گرێبەستی دەگەڵ دەکەی.

[2] ئارچیباڵد میلن هامیلتۆن (١٨٩٨ – ١٩٧٢) (Archibald Milne Hamilton) لە نیوزیلاند لەدایک دەبێت. ساڵی ١٩٢٧ دێت بۆ شاری (دیوانییە)ی عێراق و لە ساڵی ١٩٢٨ ڕا دەست دەکات بە سازکردنی ڕێگای نێوان هەولێر - حاجی ئۆمەران کە چوار ساڵان دەخایێنێت تا تەواو دەبێت. ئەو ڕێگایە ئێستاش بە ناوی ئەو ئەندازیارە نیوزیلاندییە دەناسرێت و بە ڕێگای (هامیلتۆن) بەناوبانگە. هامیلتۆن لە کتێبەکەیدا لە ژێرناوی "Road Through Kurdistan, the Narratives of an Engineer in Iraq" کە لە ساڵی ١٩٣٧ لە لەندەن بڵاوکراوەتەوە، باس لەو ڕۆژانە دەکات کە سەرقاڵی دروستکردنی ئەو ڕێگایە بووە کە لە ڕاستیدا لاپەڕەیەکی گرینگ لە مێژووی کورد لەو سەردەم دایە.



وێنەیەک لە حەسانەوەی کرێکارانی ڕێگای هامیلتۆن کە لە کتێبەکەی ئارچیبالد میلن هامیلتۆن وەرگیراوە

بچم کرێکاری بکەم و پارەیەک وەکۆکەم. چەند ڕۆژێکی پێچوو تا خۆم کۆ کردەوە. بەبێ هاوڕێ و هاواڵ ڕێگام داگرت. بە چەند شەو و ڕۆژان گەییمە گەرمێنێ. جادە گەیبوو «حەریر»ێ. بێ ئەوەی دەرفەت لەدەست بدەم چوومە ناو عەمەلان. دیتم چەند کەسی سابڵاغی لەوێن. لە «لاولاوە کوێر» و «مەجید»ـی برای میوان بووم. ئەوانیش بردیانمە لای «ڕەمزی ئەفەندی»ـییەکی. کابرا خەڵکی سلێمانی بوو. نێونووس کرام و دەستم کرد بەکار تا ساڵ سارد بوو. ئەوجار کوڕە سابڵاغییەکان هەمووی چوونەوە بۆ سابڵاغێ بەڵام من نەچوومەوە. ئاخر چووبامەوە کوێ؟ نە ماڵێک، نە حاڵێک، سەرباقی ئەوەش بە بێکەسیان دەزانیم، بەردێک لە ئاسمانێ ڕا کەوتبا خوارێ، دەیانگوت کاری حەمەدییە. منیش لە بەرامبەر زوڵم و بێدادیدا ناتوانم بێدەنگ بم و دەترسم تووشی ڕووداوێکی ناخۆش بم. برینی بوختانەکەی کاکەمر و خزمەکانی و (...)، ئێستاش تازەیە و شەوانە لە داخان خەوم لێناکەوێ کە بۆ دەبێ ئەم تاوانە گەورەیە بەرامبەر مێرمنداڵێکی بێکەسدا بکەن؟ تەنیا تاوانی من ئەوەندە بوو کە بێکەس و بێپشتیوان بووم. دیوارم لە دیواری هەموو کەس کورتتر بوو. بۆیە بڕیارم دا لە گەرمێن بمێنمەوە و تا دەتوانم کار بکەم و پارە کۆکەمەوە و بە دەستی پڕ بچمەوە شاری خۆم.

هەستام، چووم بۆ ڕواندزێ. «سەعیدی کەوگیری» لەوێ دووکانی تەنەکەسازی دانابوو. چوومە لای و پێی سەیر بوو کە نەچوومەوە سابڵاغێ. بۆم باس کرد کە ناچمەوە و دەمهەوێ ئەو زستانەی کار بکەم تا دەبێتە بەهار. کە زانی ئاوا قاییم لەسەر کارکردن پێدادەگرم، وادەکا:

- ڕاوەستە، ئێستا لەلای کابرایەکی هیندی کارت بۆ دەدۆزمەوە. ئەو کابرایە ناوی «محەممەدعەلی»ـیە، کووپان ساز دەکات و دەیانفرۆشێت. لە شاگردێکی باش دەگەڕێت. وەرە لێرە دانیشە ئێستا پەیدا دەبێت، قسەی دەگەڵ دەکەم و دائتدەمەزرێنم. ئەو زستانەی ئەو کارەی بکە و تا بەهارێش خودا گەورەیە.

تاوێک لای سەعیدی دانیشتم و کابرای هیندی بەوێدا تێپەری. لە مەنجەڵێکدا کووپەی دەگێڕا. هەرای کردێ و هاتە لامان. بە محەممەدعەلی گوت کە بەردەستێکی باشم بۆ دیتوویەوە. لەوی پرسیار و لە من وەڵام، لە سەعیدیش مەدح و سەنام. بەو جۆرە کارم سەری گرت و قەرار بڕایەوە کە مانگانە دینار و نیوێکم بداتێ، خواردنم لەسەر ئەو بێت و لەلای ئەویش بمێنمەوە و بخەوم. وەپێشخۆی دام بۆ ماڵەوە. لە ماڵ دەگەڵ ژنەکەی بڕێک قسەیان بە زمانی خۆیان کرد کە من هیچیان لێ تێنەگەییشتم و نەمزانی باسی چ دەکەن! ژنەکەی جحێڵ بوو، دوو کوڕی یەک ساڵانە و سێ ساڵانەی هەبوو. ژنە لە ماڵێ کووپەی دروست دەکرد و محەممەدعەلیش دەیبردن بۆ فرۆشتنێ. پاش خواردنی نانی نیوەڕۆیە، مەنجەڵە کووپەی بۆ تێکنام و گوتی:

— بڕۆ لە ڕواندزی خواروو[1] بیانفرۆشە و منیش لێرە دەیانفرۆشم.

مەنجەڵە کووپەم بردە خوارێ و زوو هەمووم فرۆشت و گەڕامەوە. دیتم ئەوە محەممەدعەلی هەر وا بە مەنجەڵە کووپەوە لە ناو بازاڕدا دەخولێتەوە و ئێستا قوتار نەببوو. ئەو پارەیەی فرۆشتبووم دامە دەستی و چووینەوە ماڵێ و قازانی بۆ پڕکردم و چوومەوە بۆ ڕواندزی خواروو. ئەوڕۆژە سێ جاران چووم و هاتمەوە. دیاربوو لێم ڕازی بوو. وریا و توندوتۆڵم. باش هەڵدەسووڕێم. دەستپیس نەبووم. ئەو پارەیەی دەستم دەکەوێ بێ پێچوپەنا دەیهێنمەوە و لە مستی محەممەدعەلی دەکەم. هەرچی پێیاندەسپاردم بەوپەڕی باشی خۆیەوە بەجێمدەهێنا. محەممەدعەلی کابرایەکی نەوسن بوو، لە ماڵیاندا خواردن و خواردنەوە باش دەخورا. تێر و پڕ بوون. شەو لە پێشخانەی جێگایان بۆ من ڕاخست. ماڵەکەیان تاقە وەتاخێکی هەبوو کە بۆخۆیان لەوێ دەنووستن. بەوجۆرە کارم دەگەڵ محەممەدعەلی هیندی کرد تا بەهار داهات و وڵات گەرمای تێگەڕا. کوڕگەلی سابڵاغی هاتنەوە، منیش دامنابوو کە سەرلەنوێ بچمەوە سەر کاری ڕێگاسازکردنەوە. بە محەممەدعەلیم گوت کە دەڕۆم، زۆری حەول و تەقەللا کرد کە بەجێینەهێڵم و لەلای بمێنمەوە و نەڕۆم، بەڵام قاییل نەبووم. پارەی ئەو چەند مانگەم وەرگرت و چوومەوە نێو عەمەلەی و بەربوومە کارکردن. کارم کرد تا جادە گەییە «گەڵی عەلی بەگ» و سەر حەددی ئێرانێ. بەو جۆرە کاری ڕێگا سازکردن کۆتایی پێهات. کە حیسابی خۆم لێکدایەوە ئەو پووڵەی لای کابرای

---

[1] بە پێی ئەوە کە کاپیتان خەڵکی سابڵاغ بووە و لە ڕواندز غەوارە، ئاساییە کە باش نەتوانێ ناوەکان بەرێ یان پێناسەی ئەو شارە بکات. سەبارەت بە ڕواندزی خواروو دوو بۆچوون هەیە. یەکیان ڕەنگە مەبەستی گوندێکی بچووکە لە خوار پێچەکانی ڕواندزە و لە پێدەشتی ئەوشارە و لە سەر چۆمەکە هەڵکەوتووە کە پێیدەگوترێ "کاولۆکان" کە دەوری ٢ کیلۆمیتر لە شارەکە دوورە. ئەگەرێکی تر ئەوەیە کە سرووشتی ئەو شارە وا هەڵکەوتووە کە لێژە. قەدیم ئەو ماڵانەی لە سەرەوەی شارەکە بوون پێیان گوتووە "گەڕەکی سەروو" و ئەو ماڵانەی کە لە خواری شارەکە بوون واتە لەسەر هەڵدێرەکە بوون پێیان گوتون "گەڕەکی خواروو". وا وێدەچێ کاپیتانیش مەبەستی گەڕەکی سەروو و گەڕەکی خواروو بووبێ نەک ڕواندزی سەروو یا خواروو.

هیندی دەستم کەوتبوو ١١ دینار بوو و ئەو پارەیەی کە لە کاری جادەی گیرم کەوتبوو ٣٥ دینار بوو کە سەرجەم دەیکردە زۆر.

کاری ڕێگاکە کە کۆتایی پیهات، کوڕە سابڵاغییەکان دەگەڕانەوە بۆ سابڵاغ و پارەکانیان دەگۆڕییەوە بە پارەی ئێران. دیسانیش من دەگەڵیان نەچوومەوە. دەخۆم نووسام و سواری ماشین بووم یەکڕاست چووم بۆ هەولێر. هەر ئەو ڕۆژە تووشی «سەید عەلی» بووم. کاتی خۆی لە سابڵاغ گیرفانبڕ بوو. ئێستا لە هەولێر دوکاندارە و وازی لە گیرفانبڕی هێناوە. ڕیشێکی قۆڕی بەرداوەتەوە و تەسبێحێکی درێژی بەدەستەوەیە، لێیپرسیم:

— چۆنە لیرەی؟

منیش بەسەرهاتی خۆمم بۆ باس کرد کە کارم لە ڕێگا دروست کردن بۆ سەر حدوودی ئێران کردووە و بڕێکم پارە کۆ کردۆتەوە و دەمهەوێ بیدەم بە کەلوپەل و بڕۆمەوە بۆ سابڵاغ بەشکەم، ئاوا قازانجێکی بۆم تێدابێت. بردمی بۆ کاروانسەرای «کاکە حەمەی» ئەویش خەڵکی بۆکان بوو و ئێستا لە هەولێر کاروانچییە. بە کاکە حەمەی ئەسپاردم و قەرارمان دانا کە بەیانی بچمەوە لای لە دوکانێ و چیم لازم بێت بۆم بکڕێت. بۆ بەیانی کاکە حەمە بردمی بۆ مەیدانی وڵاغان و کەرێکی باشی بۆ کڕیم. کەژوو، گوریس و هەرچی حەوجەی دەکرد بۆی کڕیم. کەرم لە کاروانسەرای کاکە حەمە بەستەوە و بۆخۆم چوومە کن سەید عەلی و ئەویش دەگەڵم هات بۆ ناو بازاڕ. ئەوکات زەمانی ڕەزاشای بوو، ڕەزاشا لیباسی ژن و پیاوی قەدەغە کردبوو. سەید عەلی گوتی:

— با فەردێکت باڵتۆی ژنان بۆ بکڕم، لە ئێران خێری باش دەکات. بڕۆ عەمباڵی گازکە بۆت بار کەن، پاشان ئەوانە بەرەوە خانێ و وەرەوە باقی پارەکەت بۆ خەرج کەم.

گورجوگۆڵ باڵتۆکانم بردە خانێ و هاتمەوە لای. ئەوجار باقی پارەکەی بۆ دام بە گربشین[1] بڕێک دیاریم بۆ پوورزاکەم کڕی[2] و بار و بارخانەم پێچایەوە. سەید عەلی بە کاروانی شەقڵاوەی ئەسپاردم و هەر ئەو ڕۆژە دەگەڵ ئەوان کەوتمە ڕێگا. بە دوو قۆناغ هاتینە «شەقلاوە»[3]، لەوێشڕا دەگەڵ کاروانی ڕواندز هاتمە «دیانان»، هاتمە ناو «کێلەکان».[4] کاروانی «غەفوری فاتە گری»[5] باری «عەلی

[1] دەبێ مەبەستی کاپشێن بێت.

[2] دەبێ مەبەستی لە پووری هەمان پوورە زینەتی بووبێت کە ژنی باوکیشی بوو. کوڕەکەشی "محەممەد ئەمین ڕاتب" بوو کە هەم دەبێتە پوورزا و هەم دەبێتە باوکبرای کاپیتانی.

[3] شەقڵاوە لە ٤٣ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی هەولێر و ١٣٠ کلۆمیتری دەمێنێ بۆ حاجی ئۆمەران (سنووری تەمەرچیان).

[4] کێلەکان ٤٥ کیلۆمیتر لە باکووری شەقڵاوە هەڵکەوتووە و ٨٥ کیلۆمیتریش لە سەر سنووری خەیاڵی و دەستکردی ئێران و عێراق دوورە.

[5] لەوانەیە "فاتە گروێ" دروست بێت.

ڕیحان»ـیان دەبرد بۆ سابڵاغ. دەگەڵ کاروان تا سەر حەددی هاتم. «شێخەی چارویدار»[1] کۆنە خزمی بابمە، بە بابمی هەر دەگوت خاڵە. لای تاوپەڕان بوو، بە منی گوت تۆ بکەوە (هەوارقادر)ی،[2] ئێمە لە «شیناوێ»[3] دەبین، وەرە وێ. وە هەوارقادری کەوتم، شۆڕبوومەوە بە بەری خانێدا ڕۆییشتم، چوومە شیناوێ، ئەوانم نەدیتەوە. لەوێ بەند نەبووم و هەر ئەو شەوە هاتمە «لگبن»ێ[4]. بۆ بەیانی بە دۆڵی مەیدان بەڵەکیدا[5] وردەوردە هاتمە «داشتەمر»ـی.[6] لە مەزرای داشتەمری بارێکم لە نێو گیا و گۆڵدا تاقەت کرد و کەرەکەم لەبن دارێکی کە سێبەری هەبوو بەستەوە.

## کۆتایی بەشی (١) و(٢)

خوێنەری هێژا،

لێرەدا دەفتەرەکانی ژمارە یەک و دوو کە ناوەڕۆکەکەیان تا ڕادەیەکی زۆر وەک یەک دەچوون کۆتایی پێهات. گشت نووسین و ڕووداوەکانم پێک گرتن. گەر وردە زانیارییەکی زیاتر لە یەک لەو دوو دەفتەرەدا هەبووبێت ئەوە تێکەڵم کردۆتەوە. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا دەفتەری ژمارە ٣ هەڵدەدەینەوە. لەوێدا لەو قۆناغە ڕا دەستپێدەکات کە سەردەمی کۆماری کوردستانە. وەک دەبینن وێستگەیەکی زۆر هەستیار و گرینگ لە ژیان و بەسەرهاتەکانی کاپیتان حەمەد ونە و تێداچووە کە دەوری ١٠ تا ١٢ ساڵ لە تەمەنی لەخۆ دەگرێ. ڕێک لەو وێستگەیە دایە کە کاپیتان ژن دێنێ، منداڵی دەبێت، حیزب دادەنێت، دەگیرێت و شاربەدەر دەکرێ بۆ شیراز، لەوێڕا بە پێی پەتی و بە شاخ و کێواندا دەگەڕێتەوە زێدی خۆی، کۆمەڵێک هاوڕێ لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە کە هاوبیر و هاوفکر بوون ئەوجا لە دەوڵەت یاخی دەبێت و بە ئەمنیە و نەزمیەکان دادەدات و ڕووتیان دەکات و زۆر بەسەرهاتی سەرنجڕاکێش کە بەداخەوە لێیان بێبەری بووین. لەو سەردەمەدا

---

[1] باش ڕوون نیە چی نووسیوە ڕەنگە، مەبەستی کاپیتان چواردیوار، چواردەوار یا... بێت.

[2] "هەوارقادر" گوندێکی بچووکە لەسەر سنووری دەستکردی ئێران و عێراق لە ناوچەی حاجی ئۆمەران کە لە بەشی عێراق هەڵکەوتووە.

[3] گوندی شیناوێ دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری پیرانشار (خانێ). دوو کیلۆمیتر کەمتر مەودای هەیە دەگەڵ ناوەندی شارەکە و ماوەی ٢٥ کیلۆمیتر دەگەڵ سنووری دەستکرد مەودایان هەیە.

[4] لگبن لە نێوان دوو شاری مەهاباد و خانێ (پیرانشار) هەڵکەوتووە. ٥٥ کیلۆمیتر لە ڕۆژهەڵاتی خانێ و ٤٣ کیلۆمیتریش لە ڕۆژئاوای مەهابادەوە دوورە.

[5] مەیدانبەڵەک زنجیرە کوێستانێکی سەرکەش و سەرسەوزە کە لە نێوان خانێ و مەهاباد هەڵکەوتووە. لە لگبن ڕا تا گوندی خەلیفە پانتاییەتی.

[6] داشتەمر گوندێک بوو لە باشووری مەهاباد کە زۆر لەو شارە نیزیک بوو. کە بەنداوی مەهاباد لە ساڵی (١٣٤٩هـ/١٩٧٠ز) ساز کرا وەبن ئاو کەوت. پاشان ئەو گوندەیان گواستەوە بۆ شوێنێکی تر کە ئێستا ١٢ کیلۆمیتر لەو شارە دوورە و کەوتۆتە پاش بەنداوی مەهاباد.

بەسەرهاتێک هەیە کە خوالێخۆشبوو یای «خورشید ڕەهبەر»[1] هاوسەری کاپیتان بۆ نەوەکانی باس کردووە (بە نووسەری ئەو دێڕانەشەوە) کە هەوڵ دەدەم لێرە بینووسمەوە:

## سیاسەتی لادانی پەچە و چارشێوی ڕەزاشا

کاتێک ڕەزاشا قانوونی لادانی پەچە و چارشێوی (کشف حجاب) دەرکرد، لە کوردستان بەباشی بۆی بەڕێوە نەچوو. شۆڕشەکەی مەلا خەلیل گۆڕەمەڕ (١٣٠٧ه - ١٩٢٨ز) یەک لەو شۆڕشانە بوو کە لە دژی ئەو قانونەی ڕەزاشا بۆ ماوەیەک پەرەی ئەستاند. یای خورشید دەیگێڕایەوە:

[لە سابڵاغ ئەمنییە[2] چاکی هێرش هێنابوو سەر خەڵک. هەر ژنێک لە کوچە و کۆڵان چارشێوی لەسەر بووایە و ئاژان[3] یا ئەمنییەیەک دیتبای، چارشێوەکەیان بە زۆر لەسەری لادەدا و هیچ کە کۆمەڵێک جنێو و بێڕێزییان پێدەکردن، بە چۆماغان وەریاندەگەڕانێ. یەک لەو ئەمنییانەی سابڵاغ، ئاژانێکی عەجەم بوو کە ئامانی بە خەڵکەکە هەڵگرتبوو. منداڵی سەر پشتی لانکێ لێیدەترسا. (یای خورشید ناوی ئەمنییەکەشی دەهێنا، بەداخەوە ناوەکەی نایەتەوە زەینی نووسەر).

ماڵمان لە گەڕەکی ئەرمەنیان بوو. ڕۆژێک چارشێوبەسەر بە کۆڵاندا تێدەپەڕیم، کەچی لە بەختی ڕەشم تووشی ئەو ئاژانە ناجسنە بووم. ئاژان پەلاماری بۆ هێنام و بە زۆر و بە جنێودان چارشێوی لە سەرم فڕێ دا. کە دیتی من ژنی حەمەدی مەولوودیم، ئاژان خەوفی ڕێکەوت و چارشێوەکەی دامەوە و داوای لێکردم کە لای کاک حەمەد باس نەکەم. سوێندی بۆ خواردم کە گەر زانیبای هاوسەری کاک حەمەدم، چارشێوی لێ نەدەکردمەوە. منیش و ئاژانەکەش دەمانزانی گەر کاک حەمەد ئەوە بزانێ، ئاژانەکە لە کۆشی پێخەمبەریدا بێ و هەزار ڕۆحی هەبێ، یەکی پێناهێڵێ بۆیە، لای کاک حەمەد باسم نەکرد و گوتم با لەوە زیاتر کێشە بۆخۆی دروست نەکات چونکە ڕۆژ نەبوو لە قۆرتێک نەکەوێ.

نازانم کاک حەمەد [4] لە کوێ ئەو باسەی زانیبۆوە. بێ ئەوەی لای من باس بکات لە پەسیوێک لە ئاژان دەخەفتێ و لە بوومەڵێڵی تێوارە بەرانبەری ئاژان دێت. کە کاپیتانی دەبینێ، ئاژان ئەژنۆی دەشکێ و دەکەوێتە سەر چۆک و لەبەر کاک حەمەد دەپاڕێتەوە کە نەیکوژێت و دەڵێ نەمزانیوە کە هاوسەری تۆ بووە، دەنا ئەو کارەم نەدەکرد. کاک حەمەد هیچ قسان ناکات تەنیا بە یەک

---

[1] بڕوانە لاپەڕەی ٤١٠

[2] بەڕێوبەرایەتی پۆلیس یا بنکەی پۆلیس. لە سەردەمی قاجارەکانەوە بە بنکەی پۆلیسیان دەگوت (ئەمنییە یا نەزمییە).

[3] لە سەردەمی قاجارەکان بە پۆلیسیان دەگوت "ئاژان" کە لە Agentی فەڕانسەوی یا ئینگلیسییەوە وەرگیراوە.

[4] یای خورشید هەمیشە مێردەکەی بە " کاک حەمەد " بانگ دەکرد.

فیشەک دەیکوژێت. کە ئاژان کوژرا، شار شڵەژا. کەس نەیزانی ئەو ئاژانە کێ کوشتی؟! کە ماڵمان هات بۆ «خەلان»ـێ، لەوێ کاک حەمەد بۆی گێڕامەوە کە کوشتنی ئاژانەکە کاری ئەو بووە. گوتی: ئەو ئاژانە ئێستا لە دایکی خۆی نەبووە کە چارشێو لە سەری ژنی حەمەدی مەولوودی لێکاتەوە.]

## (تبعید) تاراندن یا دوورخستنەوەی زۆرە ملی بۆ شیراز

کاپیتان کە بۆ کارکردن لە ڕێگای هامیلتۆن چوو بۆ باشووری کوردستان، ئیتر لەوێ فێری کاسبی بوو و بە کڕین و فرۆشتنی کەلوپەل و ئەودیو و ئەمدیو کردنیان لە سنووری دەستکرد کە پێاندەگوت قاچاخچێتی، دەوڵەمەند بوو. لە ئەزموونەکانی خۆی لەو بوارەدا کەڵکی وەردەگرت و هەرجارەی کە هاتۆتەوە بۆ سابڵاغ هەوڵی داوە هەندێک لەو کوڕە سابڵاغییانە کە باری ئابوریيان باش نەبووە، دەگەڵ خۆی بیانباتە ئەودیو و شتیان بۆ بکڕێ تا ئەوانیش خێرێک بکەن و ژیانیان هاسانتر تێپەڕێ. لەو کەسانە دەتوانین ئاماژە بە حوسێنی زێڕینگەران، برایمە سوور، سەعیدی حەمەقالەی و برایمی حاجی ئەڵڵا (ئیلاهی) بکەین. لەو نێوانەدا دەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕووناکبیران و تێکۆشەرانی باشووری کوردستان ئاشنا دەبێ. ئەو ئاشنایەتییە دەبێتەوە هۆی ئەوە کە هەم پێناسەی عێراقی بۆ دەرهێنن و هەم کاریگەری لەسەر کاپیتان و حوسێنی زێڕینگەران دابنێن بۆ گەشەی بیری ناسیۆنالیستی کە ئەوکات لە جیهاندا جمەی دەهات. بەتایبەت کە گەلی کورد خۆی بە بەشخوراو دەبینی، ئەو هەستە خەوی لە لاو و ڕووناکبیرانی کورد هەراسان کردبوو.

کاپیتان، سەعیدی حەمەقالەی و حوسێن زێڕینگەران بە گواستنەوەی بیری نەتەوەیی و گۆڤار و بڵاوکراوەکانی تر بۆ مەهاباد کە لە باشوور دەردەچوون، کاریگەرییەکی باشیان دانابوو لەسەر جووڵاندنی ڕۆحی نەتەوەیی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا. هەروەها ئەوان بوون بە هۆی دامەزراندنی یەکەم حیزبی مۆدێرنی نەتەوەیی لە ئاستی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە ناوی (حیزبی ئازادیی کوردستان).

بە پێی پەیمانی سەعدئاباد دەبوایە دەوڵەتانی ئێران و عێراق یەکتریان لە هەر چەشنە جموجوڵێکی فەرهەنگی و سیاسی کە بەدوور لە بازنەی پلانی دەوڵەت بێ، ئاگادار بکرێنەوە. وا وێدەچێ کە دەوڵەتی عێراق دەوڵەتی ئێرانی لەوە ئاگادار کردبێتەوە کە قاچاخچییە ئێرانییەکان بەردەوام دەگەڵ ئەو کوردە نەتەوەییانە لە پێوەندی دان. لە مەهابادیش دەوڵەت هەستی بە جموجۆڵێکی سیاسی کردبوو و نووسراوەیەک بڵاو کرابۆوە کە داوای لە خەڵک دەکرد شۆڕش بکەن. ئەو خاڵانە وا لە دەوڵەت دەکات کە ئەو کەسانەی قاچاغچی بوون و هاموشۆی عێراقیان کردووە یان بە چەشنێک لە ناو خەڵکدا ناویان دیارە، بە محانج بیانگرێ و دووریانخاتەوە بۆ شیراز کە حوسێن زێڕینگەران و کاپیتان یەک لەو کەسانە بوون.

دوکتور ئاسۆ و مامۆستا هەژار موکریانی و کاپیتانیش لەو کتێبەی بەردەستتاندا هەندیک لەسەر ئەو ڕووداوە دواون کە لە داهاتوودا دەیخوێننەوە. هەروەها لە نامیلکەی (حیزبی ئازادیی کوردستان)ـدا[1] بە سەرچاوە و بەڵگەمەند، باسی وردەکارییەکان کراوە بۆیە بۆ ئەوەی درێژەدادڕی نەبێ لێرە باسەکە زۆر شی ناکەمەوە. تەنیا ئەوە نەبێ کە کاپیتان لە شیراز هەڵناکا و مەترسییەکانی بە دڵ و گیان وە ئەستۆ دەگرێت و لە شیراز بە پێی پەتی ڕا دەکات و ڕێی رۆژئاوا دەگرێت و شاخبەشاخ و گوندبەگوند و کەندبەکەند، دێتەوە ناوچەی سابڵاغ. تەنانەت دەیانگێڕایەوە کە لە ڕێگا شیر و نانی لە شوانان وەردەگرت. خۆی لە شێتێ دابوو تا کەس شکی بۆی نەچێ.

یای خورشید ڕەهبەر و ئامین کچی کاپیتان و کاک عەبدولڕەحمان (خانە) کوڕی کاپیتان، باسیان دەکرد کە کاتێک پاشی شەش مانگان ڕێگاکوتان لە شیرازەوە دێتەوە بۆ مەهاباد، یەکەمجار ڕوو لە گوندی «زگدڕاو» دەکات. ئەو گوندەش مڵکی بنەماڵەی بەڕێزی «شاتری» بووە. لەو پێوەندییەدا لە ڕێگای کاک کامبەخش شاتری وتووێژێکی کورتم دەگەڵ بەڕێز کاک حوسێن شاتری کرد کە ئێستا تەمەنی دەوری ٨٥ ساڵ دەبێ و ئەو ڕووداوانەی لە زمان دایک و بابی خۆیەوە ئاوا بیستووە:

(ئاغای حەمەدی مەولوودی کە کەسێکی زۆر ئازا و نەترس و ئەمین بووە، کە تەبعید کرابوو بۆ شێرازێ، لە شیرازێ ڕا پێش شەهریوەری ١٣٢٠ بە شاخان و بە نەبوونی و بە برسێتی و بێخەویدا ڕێگای گرتۆتە بەر و هاتۆتەوە بۆ لای سابڵاغێ تا دەگاتە زگدڕاوی. کە واریدی زگدڕاوی دەبێ دەچێتە حەوز و کانییەکەی تا دەست و چاوی بشوات. منداڵ وەدووی دەکەون هەرای دەکەنێ: هۆ شێتە شێتە. پیاوێک لە منداڵەکان تووڕە دەبێ و دەریان دەکات و پێیدەڵێ:

– مامە گیان کارت بە کێیە؟ چۆنە هاتووی؟
– ئاخر میرزا کەریمی شاتری مالیکی ئەو دێیەی نییە؟
– بەرێوەڵڵا
– کوا؟ لێرەیە؟
– بەڵێ بە ماڵ و منداڵەوە ئەوە لەناو باغین.
– دەکرێ ڕێگای باغیم پێشان دەی؟

کابرا دەگەڵی دێت هەتا ناو باغی. کە دوور و نیزیکی بنەماڵەی کاک کەریم دەبنەوە، دەبینن کابرایەکی سەر و ڕدێن هاتوو، چڵکن، لێباسی دڕاو، هەموو گیان بە دەرەوە دێتە لایان و سڵاوێ دەکات. لەپڕڕا حوسنی خانم کە چاوی لێدەکات، کاک حەمەدی دەناسێتەوە. دیار بوو لەپێشدا ناسیاوییان هەبوو. دەڵێ:

– حەمەد ئەوە ئەتۆی؟

---

[1] بڕوانە لاپەڕەی ٤٧٨

– بەڵێ خانم بۆخۆمم.

– ماڵت شێوێ ئەدی ئەوە چ وەزعێکە هەتە؟ کوڕە هەموو گیانت دیارە ماڵ خراپ، ها ئەو دەسرەیەی بە خۆت دادە جاریێ.

کاتەکەی جەنگەی نانی نیوەڕۆیە دەبێ، نانی بۆ تێدەکەن و تێرتێر نانی دەخوا و جا ئەوجار بۆیان باس دەکات کە چۆناوچۆن لە شیرازەوە بە پێیان هاتۆتەوە کە شەش مانگی خایاند. ئینجا حوسنی خانم دەستوور دەدات تا بچن لە ماڵێ لەسەر تەندووریێ ئاوی بۆ گەرم کەن تا کاک حەمەد لە شۆرکەی خۆی بشوات. پیاوێکیش بانگ دەکات تا ڕدێن و سەر و سەکوتی کاک حەمەد کورت کەنەوە. لەولاشەوە جلی تازە و خاوێنی بۆ دابین دەکات. لەپاشان حوسنی خانم پێیدەڵێ کە حەمەد زۆر پیست لێدەگەڕێن و بە شوێنتەوەن تا بتگرن، وشیاری خۆت بە و جاریێ لێرە مەبزوو تا بزانین چ ڕووی دەدات. کاک حەمەد پێنج ڕۆژ یا حەوتوویەک تاقەت دێنێ و بە حوسنی خانم دەڵێ کە پێیخۆشە بچێتەوە مەهابادێ و منداڵەکانی ببینێتەوە. هەرچی حوسنی خانم دەڵێ نابێ و ناکرێ و دەتگرن و دەتگوژن، کاک حەمەد بە گوێی ناکات و دەچێتەوە بۆ مەهاباد. بەڵام قەولی لێدەستێنێ کە لە مەهاباد گیر نەبێت و بچێ بۆ عێراقێ. چل تمەنی ئەوکاتیشی لە گیرفانی دەنێ و ماڵئاوایی لە یەکتر دەکەن. ئیتر کاک حەمەد تەنیا شەوێک لە لای منداڵەکانی دەمێنێتەوە و بار دەکات بۆ عێراقێ.[1] لە بەختی ئەو هێندەی تێوەرنەسووڕا کە شەهریوەری ١٣٢٠ ڕووی دا و حکومەت نەما و کاک حەمەد ئازاد بوویەوە. نێوانی بەینی مە و کاک حەمەدی فەوقولعادە خۆش بوو. ئەوکاتی ئاغایانی (یەک لە عەشیرەتەکان)[2] بە واسیتەی حیساب و کیتابێکی کە دەگەڵ باپیرم (حاجی مستەفا شاتری) هەیانبووە کە گۆیا پووڵی بە قەرز داوەتێ، دەنێرێ و دەڵێ بچن کەریمی شاتری تاڵان بکەن. لەولاشەوە کە دۆستان ئەو خەبەرە دەزاننەوە، جەماعەتێک زۆر بە هانامانەوە دێن. یەک لەوان کاک حەمەد بوو. لەو هەموو عالەمەی تەنیا بابم (کەریم شاتری) و کاک حەمەد شەری چاکیان کرد. پاشان کابرایەکی خەڵکی دێی دێ دەڵێ ئاغا، عەشیرەت هاتنە نێو دێی، بڕۆن، لاچن. بە ناچار دێیەکە بەجێ دێڵن و عەشیرەتیش تاڵانی دەکەن. کاک حەمەد و منداڵەکانی کاک حەمەدیش هیچکات ئەو چاکەیەی حوسنی خانم و بنەماڵەی شاتریان فەرامۆش نەدەکرد و بەردەوام باسیان دەکرد و ببوو بە خاڵێکی بەهێز لە نێوان ئەو دوو بنەماڵەیە دا. جا بۆیە کاپیتان لەو بیرەوەرییانەیدا کە لە داهاتوودا دەیبینن، دەفەرموێ کە دەمهەوێ چاکەیان بدەمەوە و لەسەر ئەو بنەماڵەیە تا لێواری مردن دەڕوات.

---

[1] کاپیتان سەردانێکی کورت بۆ عێراق دەکات و دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی موکریان و بە ناوێکی ساختە لە گوندەکاندا خۆ حەشار دەدات و لە گیشە دەوەن و تەپاڵاندا خۆی شاردۆتەوە.

[2] لە ناوهێنان خۆ دەپارێزم. تەنیا دەنووسم یەک لە عەشیرەتەکان. هۆکارەکەشم لە پێشەکییەکەدا باس کردووە.

# دەفتەری ژمارە (٣)

## ڕووالەت و تایبەتمەندییەکانی دەفتەری ژمارە (٣)

دەفتەری ژمارە سێ هاوشێوەی دەفتەری ژمارە یەک ١٧ سانتیمیتر پانایییەتی و ٢٠،٢ سانتیمیتر درێژایی. ڕووبەرگێکی کاخەزی ئەستووری هەیە بەڵام بۆ پاراستنی زیاتری ڕووبەرگەکە، بەرگێکی کەسکی پلاستیکیی توندوتۆڵیان بە چرێش (سرێش) یا شتێکی هاوشێوە لێداوە کە بەتەواوی ڕووبەرگە کاخەزییەکەی داپۆشیوە. کە ڕووبەرگەکە هەڵدەدەیەوە تەنیا دوو واژۆی کاپیتانی پێوەیە کە یەکیان گەورەیە و ئەوەیتریان بچووکتر. کاپیتان لەو دەفتەرەدا سەرەتا و کۆتاییەکەی لێ تێکچووە و لە لاپەڕەکانی کۆتایی دەفتەرەکە ڕا دەستی کردووە بە نووسین.

دەفتەرەکە دەوری ١٨٠ لاپەڕەیە کە هەمووی ڕەش کردۆتەوە. لاپەڕەکان کاخەزی ناسکی بۆرن کە بە «کاهی» ناودێرن و خەتەکانی درێژاودرێژ و پانەوپانن بەسەر یەکتردا هاتوونەوە کە چوارگۆشەی ورد دروست دەکەن. لە ڕووبەرگی کۆتاییشدا ڕێک لە ناوەڕاست، هەندێک زانیاری بە زمانی ڕووسی لەسەر پشتی ڕووبەرگەکە وەدیار دەکەوێ کە وا وێدەچی زانیاری ئەو کارگەیە بووبێت کە لێی سازکراوە. کاتێک بە کەرەسەی وەرگێڕانی دیجیتاڵ تاقیم کردەوە پێیگوتم کە ئەوە زمانی بولگارییە و کە وەری گێڕا نرخی دەفتەرەکەی بوو دەگەڵ ڕێژەی چۆنییەتی دەفتەرەکە و ڕادەی لاپەڕەکانی. زیاتر لە هەشت واژۆی کاپیتانی لەسەرە.

## لاوازبوونی حکومەت و هەڵاتنی عەجەمان لە ساباڵغ[1]

ئەو ڕۆژە لای نیوەڕۆیە ئینگلیسەکان فانی بوون. ئەوان ون بوون و عالەمی شار بە سەربازخانە وەربوون. داریان بەسەر بەردی نەهێشت. سەربازخانە تاڵان کرا.[2] عالەم وا داغدار بوون کە چەند هۆدەیان سووتاند. خەبەرم زانی کە دەستێک ئێستری تۆپخانە لە زینوی چاواربەردان[3] بەڕەڵایە.

بە هاواڵەکانم گوت با بچین ئەو ئێسترانە بگرین. من و «ڕەحیمی عەبدی ڕەزا»ـی[4] دەگەڵ دوو نەفەری تر بۆ لای ئێسترەکان چووین، تەماشامان کرد «بایزە خێلی ...» خۆی و سێ نەفەری نۆکەر، خەریکە ئێسترەکان دەگرێ، دوو ئێستری گرتووە و نۆکەرێک پەتی کردوون، ئێمەش چووین بۆ ئێسترەکانی دی. بایزە خێل بە سەرماندا گووڕاندی:

– بڕۆن لێرە!

کەمێک قسەی سووکی کرد و بۆمان هات کە شاڵاومان بۆ بێنێ. «دەمانچەی ڕووتم دەرهێنا و بۆی چووم و گوتم:

– گۆڕی باپیرە دەروێشەکەتان وا و وا لێدەکەم، ئەو ئێسترانە ماڵی باوکە کادز و شەنەدزەکەتانە؟ سەگباب ئێستا وەک سەگ پەتت دەکەم لێرە!

بە عومری خۆی شتی وای چاوپێنەکەوتبوو، زمانی گیرا و دەستی کرد بە پاڕانەوە و زمانلووسی و گوتی:

– بابم، ئێمە براین، شەڕ و قەڵسبوونی ناوێت، نەچۆبچێت، ئێسترەکان دووبەش دەکەین، بەشێک بۆ ئێوە و بەشێکیش بۆ ئێمە.

---

[1] دەوڵەتەکانی شۆڕەوی و ئینگلیس لە ١٠ی خەرمانانی ١٣٢٠ه/١٩٤١ز ئێرانیان داگیر کرد و حکومەتی ناوەندی چ دەستەڵاتێکی بەسەر ناوچە داگیرکراوەکاندا نەما. خەڵکی ساباڵغ بە هیممەتی پێشەوا قازی محەممەد پارێزگارییان لە ئاسایشی شارەکە دەکرد. بڕوانە کتێبی: جمهوری ١٩٤٦ کوردستان - نووسینی ویلیام ئیگلتۆن - وەرگێڕانی: سید محمد صمدی ل: ٢٩، ٣١

[2] لە سەرەتاکانی ئەو ساڵەدا هێزەکانی شۆڕەوی پاشی بۆمبارانکردنی شاری ساباڵغ، دەستیان بەسەر بنکەی پۆلیس و سەربازخانەی ئەو شارەدا گرت و هەموو سەربازەکانیان چەک کرد و ئەسلەحەخانەکانی ئەو بنکانەیان هەموو دەگەڵ خۆیان برد. ئەوەی مابۆوە هەمووی ئەسلەحەی کۆن و لەکەڵکەوتوو بوو. پاشان ئینگلیسەکان لە ڕێگای خانێوە هاتنە ناو ساباڵغ و دوو ڕۆژ لەوێ مانەوە و خەڵکیان هاندەدا تا بچن ئەو بەرماوە لە سیلاحە بێکەلکەکان بەرن بۆخۆیان. بڕوانە کتێبی (کورتە مێژووی بنەماڵەی قازی لەویلایەتی موکری - نووسینی:خەلیلی فەتاحی قازی - وەرگێڕ و ئامادەکار: حەسەنی قازی ل: ١٠٩،١٠٤)

[3] جوان دیار نییە کە چ نووسراوە!چواربەردان؟ چاواربەردان؟چاوەبەردان؟ چاطربەردان؟... بە ئەگەری زۆر مەبەستیان "چواربەردان"ـە.

[4] بنەماڵەکەیان ناسناویان ئێستا "مالکی"ـیەو بنەماڵەیەکی کۆن و ڕەسەنی ساباڵغن.

– دەی لە هەوەڵێوە وات گوتبا! ئەدی ئەو هەڕەشە و گوڕەشەت لەچی بوو؟ ئێستا لەو حەوت ئێسترە سێیان بۆ تۆ و چواریش بۆ ئێمە و دەنگت دەرنەیەت و پەتیان کە و بڕۆن و پشتی سەریشتان چاو لێمەکەن.

ئەوان بێئەوەی متەقیان بێت سێ ئێسترەکەی خۆیان برد و ڕۆییشتن، ماینەوە ئێمە کە نەماندەزانی ئەو چوار ئێسترە بۆ کوێ بەرین؟ لەوە دەترساین عەرووسان بمانگرن. پاش گفت و تەگبیرێکی زۆر، هاتینە سەر ئەوەی کە ئێسترەکان بەرینە زینوێ بیانفرۆشین. هەر لەوێ ڕەحیمی عەبدی ڕەزای دەگەڵ «وەستا برایم»ـی[1] ئێسترەکانیان برد و ڕۆییشتن.

ئەوان دەگەنە قازیاوایە و لەوێ تووشی کاروانێک قاچاغچی گەرمێن دەبن کە گەورەکەیان «سەید حەسەن» بوو و ماڵی لە زینوێ بوو، ناسیاوم بوو. هەر لەوێ ئێستر و ئەو تفەنگانەی دەستمان کەوتبوون بەوانیان دەفرۆشن و بە پووڵ و پارەوە گەرانەوە لامان. زوو گوتم بچن ئەو پووڵەی لە ناو هاواڵەکاندا دابەش کەن و بڕێکیش بدەن بەو چەند ماڵە نەدارەی کە دەمانزانی نانی شەویان نییە بیخۆن و منداڵی سەغیر و پیاوی نەخۆشیان هەبوو.

منیش ئەوەندەم لە پارەکە وەرگرت کە پارەی دەمانچەی «هاشمی فەرهادی»[2] بدەمەوە، دەنا من ئەوکات هیچ دە فکری پووڵ کۆکردنەوەدا نەبووم. لەسەر ئەو حاڵەی ڕا هاتوومەتە سەر ئەو حاڵەی، بۆ من هەموو شتێک بوو. ئەمنێک کە لەترسی ئەمنییەی شوێنێک نەبوو خۆی لێوەشارم، ئەمنێک کە لە تەویلە و پەسیواندا بە مانگ و ڕۆژ خۆم حەشارداوە تا گیانم لە چنگ پیاوی دەوڵەت و عەشایر ڕزگار بکەم، ئێستا ئازادم و تام لەو ئازادییە دەکەم و تۆڵەی خۆم لە عەجەم و ئەمنییە و دەوڵەمەندی خوێڕی دەکەمەوە.

من زۆر شەوان نانم نەخواردووە و بە ژانەزگی برسێتییەوە خەوم لێکەوتووە. زۆر شەوانیش لە سەرمان هەڵلەرزیوم و خەوم لێنەکەوتووە. زۆر شەوان بەفر و بارانم بەسەردا باریوە جا نووستووم، چونکە میچێکم دەست نەکەوتووە تا لە بنی درێژ بم و تەڕ نەبم. ئێستا ئەوەی گیرم دەکەوێت بەولا و بەولایدا دەدەم و گرێی دڵمی پێدەکەمەوە، دەستی خەڵکی داماوی پێدەگرم. پێمخۆشە لەپێشدا هاواڵەکانم کە ئەوانیش لەخۆم بێکەسترن، پاشان خەڵکی فەقیر و نەدارەکە ئاهێکی خۆش هەڵمژن و زگێکی تێر کەن. ئاخر ئەو زوڵم و زۆرەی پیاوی ڕەزاشای لەو خەڵکەی دەکرد، هیچ کافرێک نەیکردووە. ئەوانە زۆربەیان لە عەجەمستانێ ڕا هاتبوون، هەمووی خەڵکیان دەچەوساندەوە و دەوڵەمەند دەبوون و خەڵکەکەشیان دەقوڕێ دەنا.

---

[1] بڕواننە لاپەڕەی ٤٢٤ تا وەستا برایم بناسین.

[2] کورتەیەک لەسەر ژیانی خوالێخۆشبوو هاشمی فەرهادی لە لاپەڕەی ٤٥٣ی ئەو کتێبەدا بخوێننەوە.

من پێشتر بە کارکردن و قاچاغچێتی و فەعلەیی کردن لە جادەی ڕواندز،[1] توانیم کەمێک پووڵ و پارە کۆ بکەمەوە و ئەو باغانەی هەمن بیانکڕم. بەداخەوە ئێستاش کۆڵێکیان لەسەر قەرزدارم و لەبەر کوردوستان، ئەوە لێرە لە وڵاتی غەریبی کەوتوومەوە و ناتوانم باقی پووڵەکەیان بۆ بنێرم و مشکڵۆزمەیانم. هیوادارم گەردنم ئازا بکەن. وەک بیستووشمە دەوڵەتی ئێرانێ دەستی بەسەر باغەکانمدا گرتووە و هەمووی لێم داگیر کردووە.

خۆ چارەڕەشی من ناگاتە بن، با سەرتان نەهێشێنم و بچینەوە سەر باسەکەی خۆمان. خەڵک تفەنگێکی زۆریان کەوتبوو دەستی. ئەوە منیش بۆ تفەنگێکی بڕنوو دەچم دەحەواوە، دونیام جاڕ داوە بۆ بڕنوویەکی و کەس نییەتی و گیرم ناکەوێ. خەبەرم زانی کە «وەکیل باش»ـێک دە ماڵە «مارف حەتەمی»[2] دایە و تفەنگێکی بڕنووی هەیە و لە ماڵێدا تاقەتی کردووە. نەمهێشت ڕۆژی تێوەرسووڕێتەوە و هەر شەوێ دەگەڵ ڕەحمانی برام بۆی خووشیم و چوومە ماڵە وەکیل باشی بۆ زگ بڕنوویەکەی. خوای و ناخوای تفەنگم دەستگیر بوو و ٥٠ فیشەکیشی دەگەڵ بوو بەبێ قڕە

[1] مەبەستی جاددەی هامیلتۆن‌ـە.
[2] بنەماڵەیەکی بەڕێزی سابڵاغن و ئێستا ناسناویان "حاتەمزادە"یە.

دایمە دەستی. ئێستا ڕەحمانی برام دڵی پێوەیە و منیش وەختە بۆی شێت بم. بە ڕەحمانیم گوت با بڕنوویەکە لای تۆ بێت تا یەکی ترم گیر دەکەوێ. لە خۆشییان هەر مابوو هەڵفڕێ، تفەنگەی برد و چۆوە بۆ ماڵە خۆی.

بەیانی «سەید عەبدوڵلا سەید تەها»[1] لە دوکانەکەی ڕا دەستێکی لێهەڵوەشاندم و گوتی وەرە لام. چوومە لای و تاوێکی لەلای دانیشتم، جا وادەکات:

— دەزانی چی؟! قایم مەقامی ڕەئیسی گومرگی جیرانمە و خەڵکی تەورێزە. بار و بارخانەی تێکناوە و خەریکە بڕواتەوە بۆ تەورێز. سەگباب کاتێک هات بۆ شار خۆی و جووتێک گوونی، کەچی ئێستا دوو-سێ ماشێن جێگای سەر و سیپاڵی نابێتەوە. خۆتی بگەیێنە وەک پیاوان و نەهێڵی دەرچێ. تۆ قەت دەزانی ئەوانە چییان لە عالەمێ کرد؟ لەسەر خوێنی ئەو خەڵکە داماوە خۆیان تەیار کردووە و ئێستاش دەیانهەوێ وا بە سووک و هاسانی تێیقووڵێنن؟

جا «کوێر چیت دەوێ، دوو چاوی ساغ»، دەردی عەجەمان هەر لەکن منە. شەوێ هەشت لە هاواڵە بەکارەکانم هەڵگرت و چوومە ماڵەکەی قایم مەقامی. هەرچەند دەوروبەری ماڵەکەی خول دەدەین ڕێگای ژوورێمان نییە. ڕەحیم[2] چوو دیواربڕی هێنا، دیوارمان پێبڕی و چووینە ژوور. هەموو ژوورەکانمان سەر و سووژن دا بەڵام ئەو شتانەی کە سەید عەبدوڵلا باسی کردن هیچ دیار نەبوو. ماڵێکی ڕووت و قووت. ئەوە قایم مەقام دەگەڵ ژنەکەی لە حەسارێ نووستوون یا وەخەبەرن و ناوێرن جووڵە بکەن؟! نازانم! وەستا برایم چوو سەریان و تێیوەژاندن و ڕاستی کردنەوە. کابرایان هێنا بۆ دیوێکی و پێمانگوت:

— کوا ناوماڵەکەت؟ کوا پووڵ و پارەت؟ بۆ ماڵەکەی ئاوا چۆڵە؟

— بە حەزرەتی کێ و کێ ئەوڕۆ هەرچی پووڵ و ناوماڵی کە هەمبووە دەگەڵ منداڵەکانم بەڕێم کردوون.

هەمووومان دەستمان سارد بۆوە و نەماندەزانی باوەڕی پێبکەین یا نا؟ لەولای ڕا وەستا برایم کە ماڵی لەو گەڕەکەی بوو هەڵیدایە:

— ئەوڕۆ هیچ ماشێنێک بەو ئارامانەدا نەهاتووە.

ئەوجار کابرایان هەڵپێچا پیس! وا ترسا کە وەقسە هات و دەیگوت:

— هەر مەمکوژن جا من جێگاکەتان پێدەڵێم.

وەپێشمان کەوت و بۆ ژوورێکی بردین و نیشانی داین کە لە کوێ شاردوویەتەوە. ماڵتە وای دەرکەکەی سواغ دابوو کە کەس شکی نەدەکرد لێرە شمەک تاقەت کراون! زوو بە دیواربڕ کردیانەوە و تەماشام کرد تا میچی فەردە لەسەریەک هەڵچندراوە. کابرا و ژنەکەی لە دیوێک گیران و

[1] لە بنەماڵەی بەڕێزی ئەیوبیانی مەرکەزی.

[2] بە ئەگەری زۆر مەبەستی ڕەحیمی عەبدی ڕەزایە (مالکی).

نۆبەچیشمان بۆ دانان بەڵام پێشتر منداڵەکانی ڕەوانە کردبوو و ئێستا خۆی و ژنەکەی بە سەڵتی ماون. ئەو فەردانە ئەوەندە زۆر بوون کە نیوێک زیاتری کێشا تا کێشایانەوە ماڵە «مامە جەلیل»ـی. لە ماڵە مامەی تایەکانمان کردەوە و دیتمان کە زۆر شتی چاکی تێدایە. فەرشی چاک، پێخەفی چاک. دە نێو چەمەدانەکاندا کەلوپەلی نایابی تێدابوو. ئێمەش ئەوەی پێویستمان بوو هەڵمانگرت و باقییەکەمان دا بە سەید عەولای تا لە ماڵە فەقیرانی دابەش بکات. دواتر زانیمانەوە کە شەوێک پێش ئێمە «هاشمە کوێر» و براکانی بەسەریان داداوە و ئەوەی شتی باش بووە دەگەڵ خۆیان بردوویانە بۆیە، کابرا لەترسان منداڵەکانی دەرباز کردووە و باقی شتەکانیشی دەو ژوورەیدا سواغ داوە.

جا چەند شەو لەسەر یەک دەچووینە سەر ئەو ئەفسەرانەی کە مابوون لە سابڵاغێ، ئەوەی لازم بوو دەگەڵیانمان دەکرد. ئەوەی ئەو ماوەیەی لە سابڵاغێ بەسەر ئەو خەڵکەیان هێنابوو هەموومان تۆڵە لێکردنەوە و وەک سەگ بۆمان دادەهاتنەوە و دەپاڕانەوە. ترس و تەقوڕەوێکیان دەناو کەوت نەبێتەوە. هەر هەمووی ڕایان کرد و زۆربەیان کەلوپەلەکانیان تەسلیم بە دەوڵەمەندەکانی سابڵاغێ دەکرد و بۆخۆیان بۆی دەردەچوون. تەنانەت ئەو عەجەمە دەوڵەمەندانەی لە سابڵاغێ دەژیان، تەقوڕەویان تێکەوت و ڕایان کردەوە بۆ ئازەربایجانێ.[١]

---

[١] بڕوانە بەڵگەی ژمارە یەک کە لە لاپەڕەی ٤٧٤ دانراوە و پشتڕاستی قسەکانی کاپیتان دەکات.

## کۆکردنەوەی قاحبەخانەکانی «ئەکبەرئاباد»ـی[1]


خوالێخۆشبوو ئەحمەدی حەمە کەوڵە (ئەمەشیری)

وردەوردە شار ئارامتر ببۆوە. عەجەم شاریان بەجێدەهێشت. ئەو عەجەمانەی لە شار دۆست و ئاشنایان هەبوو، ماڵەکەیان دەدا بەو دۆستانەیان و ئەوانیش ماڵەکانیان لە مەیدان بۆ هەڕاج دەکردن و خۆیان و ماڵ و منداڵیان سووکبار دەکرد و دەڕۆیشتنەوە بۆ ئازەربایجان.

ئێستا شتێک ماوە کە ئەنجامی بدەین ئەویش، کۆکردنەوەی ئەو قاحبەخانانەی لای باغی سیسەی بوو. لای باغی سیسەی هەمووی قاحبەخانە بوون. ئەو گەڕەکە شەش-حەوت چایخانە و دوکانی لێبوو، لای کەم ١٠٠ ماڵ هەبوو هەموو قاحبەخانە بوون. بەو گەڕەکەیان دەگوت «اکبر آباد». «ئەحمەدی حەمە کەوڵەی»[2] گوتی:

— ئەوشۆ دەڕۆین ئەو قاحبەخانانە و ئەو گەڕەکەی داغان دەکەین. دەبێ ئەو شارە بە گەواد و قاحبان چۆڵ بکەین، با بڕۆن لەو شارە.

شەو چەند نەفەرمان بۆیان چووین، لامان دا بۆ چایخانەیەک، تەماشامان کرد بە تار و کەمانچە و دەفەی، بەزمێکە ئەوسەری دیار نەبێ. چووین دانیشتین و بڕێک سەیرمان کردن. دیاربوو لێمان دوودڵ بوون، بە دیتنمان بەزمەکەیان سارد بوو. ئەحمەد گوتی:

---

[1] بەڕێز ئەحمەدی ئەنجیری لە کتێبی (سڵاو لە سابڵاغ)ـدا، لە لاپەڕەی ١٧٥ دا لەسەر ئەو گەڕەکە دواوە و دەفەرموێ کە: (گەڕەکێک بوو لە باکووری سابڵاغ لە شوێن مەدرەسەی "جامی" ئێستاکە و نەگەیشتوو بە پردی یەرغوو کە ناوی بە خەراپ دەرکردبوو. ئەو سەردەم چواردەوری ئەو گەڕەکە چۆڵەوانی و دەشت بوو و هیچ خانوبەرەت لە دەورەی ئەو گەڕەکە نەدەدی. بە واتایەکی تر ئەو گەڕەکە لە قەراغ شاری سابڵاغ دروست کرابوو و لە شار دوور بوو و دانیشتووانی خەڵکی غەوارە و غەیری کورد بوون کە لە سایەی خودا و بە چالاکییەکی شۆڕشگێڕانە ئەو گەڕەکە توونا کرا و خانووی لێ نەما). هەروەها لە لاپەڕەی ٨٨ دا بە هۆنراوەیەک باسی ئەو گەڕەکە دەکات و دەڵێ:

لێی بوو دوو سێ ماڵی خەراپ خواری شار *** شوکری خودا بەردی بناغانی خوار
ئەکبەرئابادە نێوی بوو لەسەر *** خەڵکی ئەوێ جەمعی هەموو خەڵکی دەر
ئاخری شەماڵێکی توندی، قەوی *** ماڵی هەموو کردە خەراپ و نەوی

[2] خوالێخۆشبوو ئەحمەدی ئەمەشیری.

— ئەوە بۆچی سارد بوونەوە؟
داوای گۆرانییەکی کرد و بۆیان گوت. ئێستا کابرا گۆرانییەکەی تەواو نەکردبوو، ئەوەندەم زانی ئەحمەد هەستا تارەکەی لەدەستی کابرای هەستاند و منیش بەدوایدا چووم کەمانچەکەم هەستاند، ئەوجار ئێمە بووینە بەزمگێڕ. نە ئەو دەیزانێ تار لێبدات و نە من دەزانم کەمانچە لێدەم. لێمان شێواندن بە پیسی، هاواڵەکانیشمان بە شەق و پێلاقان کەوتنە گیانی جەماعەتەکە و بەزمگێڕ ڕاونران و من و ئەحمەدیش ئەوە بەربووینە تار و کەمانچە لێدان، شەق و هۆڕێکمانە نەبێتەوە. ساحێب چایخانەش لەترسان ڕای کردووە و لەولاشەوە هەر ڕەجاڵەیە دێن بۆ ئەو گەڕەکە. ئەوەندەم زانی زاق و زووق و سووتمانە. عالەم وەسەر گەڕاون و هەمووی سەعاتێک وەرنەسووڕا ئەو گەڕەکە تاڵان کرا، چەند ماڵ سوتێندرا، ئەو قاحبە و تەرەسانە هەموو شاربەدەر کران و من لەو هەموو تاڵان و ڕاو و ڕووتە تەنیا «سەرە چبوغێک»[1] زیاتر چیترم گیر نەکەوت.
جا دوکان و ماڵ هەمووی بەتاڵان چوو. بەیانی کە ڕۆژ بۆوە لەو گەڕەکەیدا زیاتر لە ١٠٠ ماڵ دەرکە و پەنجەرە و دار و بار هەموویان بردبوو. ئەو گەڕەکە ببوو بە کەلاوە. خەڵک لەو بەتاڵانبردنە هەموو دەوڵەمەند بوون بەڵام من خۆم نامهەوێ پارە کۆکەمەوە. دەڵێم لەوە زیاتر کە بە ئازادی دەسووڕێمەوە، ئیتر بەسمە وادەزانم دونیام هەیە.

## یەکەمین دیدار دەگەڵ قازی محەممەد و بەرگری کردن لە شار

بۆ بەیانی قازی[2] لەدووی ناردم و منیش چوومە مەحکەمەی. دیتم ئەوە چەند نەفەر لە دەوڵەمەندەکانی لەلایە. یەکڕاست وەژوور مەحکەمە کەوتم و سڵاوم کرد. دەوڵەمەندەکان بە چاوی نەگبەت تەماشایان دەکردم. ئەوان چووبوونە لای قازی گوتبوویان کە حەمەد ئەو گەڕەکەی تاڵان کردووە و ئەگەر پێشی نەگری ئێمەش تووشی ناڕەحەتی دەکات. قازی ڕووی تێکردم و گوتی:
— ئەوە ئەکبەرئابادت تاڵان کردووە؟ باشە کە تاڵانت دەکرد بۆچی ئەو گەڕەکەت دەسوتاند؟
منیش ڕووداوەکە چۆن بوو هەموویم بۆ گێڕایەوە. ئەوجا دەوڵەمەندەکان هەموو لێوی خۆیان دەکرۆشت بەڵام پێم ناوێرن، ئێمە زۆرین و ئەوان کەم. پاش ئەوەی بەرانبەری هەموویان قسەکانم کرد، ئینجا قازی وادەکا:

---

[1] "چەپۆغ - چپق بە فارسی" یا "سەبیلە" قامیش یا دارێکی درێژە، سەرێکی خڕی هەیە کە لە گڵ ساز دەکرێت. تووتنی لەو سەرە خڕە دەکەن و دووکەڵەکەی دەکێشن. ئەو سەبیلانە یان چەپۆغانە ئەوسەردەم زۆر باو بوون.
[2] مەبەستی کاک حەمەد نەمر (پێشەوا قازی محەممەد)ـە. لە یەک یا دوو شوێن نەبێ کە دەڵێ پێشەوا، دەنا هەر بە قازی ناوی دێنێت.

– بڕۆ بەڵام لای تاوپەڕان وەرەوە بۆ ئێرە کارم پێتە.

لە مەحکەمەی قازی وەدەر کەوتم و چوومەوە لای چەند نەفەر لە هاواڵەکانم کە لە خیابانی چاوەڕوانی من بوون تا بزانن چ باسە، منیش هەمووم بۆ گێڕانەوە. بەڵام ئێستا دڵم هەر لە خورتوپرت دایە! نەمدەزانی قازی ئەمنی بۆچییە؟ ئاخر من ئەوە یەکەمجارە دەگەڵ قازی قسەم کردبێ. هەرچۆنێک بێ، بوو بە تاوپەڕان و چوومەوە لای قازی لە مەحکەمەی. دیتم «مەلا محەممەدی دربکە»ی[1] لەلایە. سەلامم کرد و گوتی وەرە دانیشە. منیش بە شەرمەوە چۆکم دادا. ڕوانی لە پەنجەرەی ڕا دیتی کە چەند نەفەر لە توجاڕ و دەوڵەمەند دەهاتن بۆ لای قازی. قازی هەستا و مەلاش ڕاست بۆوە و وەدەر کەوت. کە مەلا وەدەرکەوت، قازی ڕووی دە من کرد و گوتی:

– تۆ چەک و مەکت هەیە؟

– بەڵێ.

– مەنگوڕان بەتەمان بێنە سەر شاری و تاڵانی کەن. من بە هەموو گەڕەکەکانم گوتووە کە هەر گەڕەکە و شەوانە چەند نەفەریان نۆبەچی بن. تۆش چەند نەفەر هاواڵت هەیە خەبەریان بدەیە با ئەوانیش بەرگری لەشار بکەن و نەهێڵن مەنگوڕ تاڵانی بکەن. ئەگەر هاواڵەکانیشت مومکین نەبوو، ئەوە دەسپێرم چەند نەفەرت دەنێ و دەگەڵ خۆت شەوانە بە شاریدا بگەڕێن و شار بپارێزن.

هەرچەند لە منداڵیمەوە چاوم بەرایی نادات تەماشای دەوڵەمەند و ئاغایان بکەم، هەر خۆم دەزانم چن! لەبەرانبەر عەجەماندا خۆپێکەم و لە بەرانبەر کوڕە فەقیر و نەدارانیشدا شێرن. چی بکەم، لەبەر خاتری قازی گوتم:

– باشە.

– دەی کە وایە شەو وەرەوە بەر مەحکەمەی بتبینم.

---

[1] مەلا محەممەدی دربکە یان مەلا محەممەدی لاهیجانی (لاجانی) یەک لە مامۆستایانی ئایینی بەناوبانگەکانی ناوچەی موکریان بوو. لە گوندی دربکەی ناوچەی پیرانشار لەدایک بووە. کەسێکی زانا بووە. قازی عەلی باوکی پێشەوا قازی محەممەد لە مەلا محەممەدی دربکە داوا دەکات کە بێت بۆ سابڵاغ و پێشنوێژی مزگەوتی قازی بکات. ئیتر لەوکاتەوە وەچەی مامۆستا مەلا محەممەد لە مەهاباد نیشتەجێ دەبن و بە یەک لە بنەماڵە بەرێزەکانی ئەو شارە دەناسرێن. بەڕێز قادر مەحموودزادە ناسراو بە دوکتور ئاسۆ لە کتێبی: خاطرات پرماجرای دکتر آسو - مقدمە و توضیح: محمود پدرام (زۆزان) - نشر رهرو - چاپ اول - سال ۱۳۷۳- لاپەڕەی ۹٦ دا ئاوا باسی مامۆستا مەلا محەممەد دەکات: (لە تەمەنی ۱۰ ساڵییەوە ڕەمەزانان بۆ نوێژ و تەراویحان باوکم منی دەگەڵ خۆی دەبردە مزگەوتی قازی کە پێشنوێژەکەی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محەممەدی دربکە (لاهیجانی) بوو. ئەو پیاوێکی زانا، تێگەیشتوو، هێمن و لەخۆبردوو بوو. ئەو فەرمانبەری ئیدارەی ئەوقاف بوو و لە خوێندنگاکانیش وانەی دەگوتەوە. دوو کچ و کوڕێکی هەبوو. ماڵەکەی بەرامبەر بە مزگەوتی ڕۆستەمبەگی بوو کە یەک لە مزگەوتە بەناوبانگەکانی مەهاباد بوو کە بایەخی مێژوویی هەیە). لە پاشکۆی ئەو کتێبەدا چەند وێنەیەک لە مامۆستا مەلا محەممەدی دربکە دەبینن کە لەلایەن نەوەی بەڕیزیان کاک ئەحمەد لاهیجانی گەیوەتە دەستم.

ماڵئاواییم لە قازی کرد و لە پلیکانەکانی مەحکەمەوە دەهاتمە خوارێ، تەماشام کرد دێلە ترکەنەکان وەسەر دەکەوتن تا بچنە لای قازی. ترسیان لێ نیشتووە کە مەنگوڕان تاڵانیان کەن. وەها ترساون کە خۆیان دەگەڵ ڕەجاڵی شاری نیزیک دەکردەوە و ببوونە دۆست. لەوە پێش بێزیان لێدەکردن و بە عیسانیان نەدەزانین و سووک و بێ قیمەت چاویان لێدەکردن. جاری وابوو کە ڕقیان هەڵدەستا پێیان دەگوتین (عەمباڵی کوڕی عەمباڵی)، یان جنێوی هەرە گەورەیان، (بڕۆ لاچوو هەی ڕەجاڵەی سەگباب) بوو. وەک ئەوان لە زێڕ دروستکرابن و ئێمە لە قوور. ئێستا لە ترسی مەنگوڕان و لە ترسی بەتاڵان چوونیان، دەستەدەستە ڕەجاڵە دەبەنە ماڵی خۆیان و سوێند بۆ یەکتر دەخۆن، دەگەڵ یەکتر بران و موویان لەبەینەوە ناچێ. زۆر جار کە دەلاڵەکانی دەوڵەمەندەکان دەهاتنە لام و پێیان دەگوتم کە ئەوشۆ بانکراوی بۆ ماڵە کێ و کێ، منیش گوونم نیشان دەدان و نەدەچووم. چیبکەم دەستی قازییم کوول بوو و لەبەر خاتری قازی شەوانە دەچووم بۆ کێشک.



لە چەپەوە: ئەمر ابولقاسم سەدری قازی (سەدرونیسلام)، مامۆستا مەلا محەممەدی دربکە (لاهیجانی) یا (لاجانی) و کەسی چوارەم مەلا سەدیق سدقی و کەسی پێنجەمیش ئەمر پێشەوا قازی محەممەد

## تاڵان کردنی «زگدڕاو»[1]

مامە غەنی[2] بوو بە ڕەئیسی چەند نەفەر قۆڵسوور، منیش بە ئەمری قازی بوومە قۆڵسوور. مامە غەنی هەر ئەمرێک یا کارێک بە منی دەگوت، دەمکرد. تا بەینێک بەو جۆرە دەگەڵ یەکتر بردمانە سەر بەڵام مامە غەنی خۆشی لە چڕ و چارم نەدەهات، دەیبوغزاندم، زۆر لای قازی بۆی تێدەچاندم، باش بوو قازی گوێی نەدەدایە. مامە غەنی لەپێشدا لە فەرمانداری کاری دەکرد. جیرەخۆری حکومەتی ئێران بوو. ئێستا بووەتە سەرۆکی شارەوانی.[3] لای هیچ بوو، خۆشی لێینەدەهات. منیش خۆشیم لە مامە غەنی نەدەهات، تا ڕۆژێک «کەریمی شاتری» هاتە ئیدارەی و بانگی کردم بۆ دەرێ و دەگەڵی چووم. گوتی:

— فڵانە عەشیرەت دەیانهەوێ تاڵانم بکەن. چووومەتە لای «کاک مامەندی کولیجی»[4] ئەویش چەند نەفەری داومێ، ئەوانم بەڕێ کرد بۆ «زگدڕاوی»، تۆش وەرە بە کۆمەگم.

— زۆر باشە، خەمت نەبێ، لە ئەسلەحە تەیار و سازم، دەمانچە و بڕنەویشم هەیە.

لە پێشدا نووسیومە کە کاتێک لە شیراز گەڕامەوە لامدا دێی کەریمی شاتری، (زگدڕاو). ئەویش زۆری کۆمەگ کردم.[5] لە عەوەزی ئەو چاکەی دەگەڵی کردووم، منیش سێ تفەنگم داوەتێ. تۆزێکم

---

[1] زگدراو گوندێکی گچکۆلەیە و لە ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد و لەسەر ڕێگای مەهاباد - بۆکان (قەمتەرێ) هەڵکەوتووە کە ٣٠ کیلۆمیتر لە ناوەندی مەهاباد دوورە.

[2] مەبەستی کاپیتان لە خوالێخۆشبوو (غەنی خوسرەوی)یە کە بە (مامە غەنی) ناودێر بوو. ماوەیەکیش سەرۆکی شارەوانی سابڵاغ بوو.

[3] لە زمانی فارسیدا بە بنکەی پۆلیس دەڵێن (شهربانی) کە لە ڕاوێژی خەڵکی سابڵاغدا دەگوترێ (شارەبانی). هەروەها لە زمانی فارسیدا ئەو شوێنەی کە لەوێ کاری خزمەتگوزاری دەکەن بۆ شارەکە، دەگوترێت (شهرداری) کە لە ڕاوێژی خەڵکی سابڵاغدا دەڵێن (شارەداری) و بە گفتی خەڵکی باشووری کوردستانیش پیی دەگوترێ (شارەوانی). ڕوون نییە کە ئەو سەردەم لە (شارەبانی یا بنکەی پۆلیس)، هاوکات کاری (شارەداری یا شارەوانی)، واتە خزمتگوزاری بۆ شارەکەش کراوە یا نا؟! ئەمڕۆ ئەو دوو ئیدارەیە جیاوزن و هەرکام کاری خۆیان دەکەن. لە زۆر بەڵگەی ئەو سەردەم شارەوانی نووسراوە و لە زۆر بەڵگانیش شارەبانی. بە ئەگەری زۆر، لەبەرئەوەی کاپیتان لە باشوور ژیاوە و لەوێ خوێندن و نووسین فێربووە، ڕەنگە بە ڕاوێژی ئەو دیو دوابێ.

[4] سەبارەت بەو ناوە هانام برد بۆ بەڕێز کاک کامبەخش شاتری و بابی خۆشەویستیان کاک کەریم شاتری کە ئەو ڕووداوانەی بەباشی لەیاد مابوو و جێی خۆیەتی دونیایەک سپاسیان بکەم. کاک کەریم فەرموویان کە حاجی مستەفای شاتری کچەکەی کە ناوی زیبا بوو دای بە کوڕەکەی کاک مامەندی کولیجی کە ناوی عەبدوڵڵا بوو. کاک مامەند مامەشە و دەگەڵ کاک هەمزەی جەڵدیانێ تایفەی قادرییان پێیدەڵێن. گوندی "کولیج" موڵکی کاک مامەندی بوو. لەبەر ئەوە هەم پێیان دەگوت کاک مامەندی کولیجی و هەم پێشیاندەگوت کاک مامەندی جەڵدیانێ دەنا، لە ئەسڵدا کاک مامەندی قادرییە لە تایفەی مامەشانە.

[5] زۆر بەداخەوە ئەو بەشە لە نووسراوەکانی کاپیتان فەوتاوە و لە بەر دەستدا نین. لەو بارەیەوە نووسەری ئەو دێڕانە کورتە نووسینێکی نووسیوە کە لە سەرەتای بەشی (دەفتەری ٣) خوێندووتانەتەوە.

چاکە داوەتەوە بەڵام ئەو لە ڕۆژی تەنگانەدا بە هاوارم هات و ئێستاش من دەبێ بە هاواری بچم. دەگەڵ میرزا کەریم چووم بۆ زگدڕاوی، دیتم چەند نەفەر پیاوی مامەندی کولیجیش لەوێن و بە هاواری میرزا کەریمی هاتوون. کاک مامەند و میرزا کەریم خزم بوون. خوشکی میرزا کەریم، ژنی کوڕی کاک مامەندی بوو. بەیانی بوو کە چووم بۆ زگدڕاوی بۆ لایان. پیاوەکانی کاک مامەندی چوونە شاخی و ئێمەش لە دەوروبەری دێ بووین. ئەوەندەمان زانی سواری عەشیرەت هوروژمیان کرد بۆ سەر دێی. لای خۆی پیاوەکانی کاک مامەند لەپێشیان بوون، بە درۆ چەند تفەنگێکیان بە سەر یەکتردا هەڵتۆقاند. من و پیاوێکی میرزا کەریم شوێنێکیان پێ سپاردبووین کەلاوە بوو. تەماشامان کرد میرزا کەریم و چەند تفەنگچی ڕایانکرد و بۆی دەرچوون. ئەوە پیاوەکانی کاک مامەندیش بە درۆ تەقە دەکەن. عەشیرەت هێرشیان هێنا بۆ سەر زگدڕاوی. چاوم لێکرد ئەو پیاوەی کە کاک کەریم ڕەگەڵی خستبووم خەریکە هەڵێت و ڕا بکات، منیش نایەڵم. سیلەم لە عەشیرەت داکوتا و تەقەم لێکردن. هەرچی هەوڵیان دا نەمهێشت بێنە پێشەوە و پاشەکشەم پێکردن. تەماشام کرد سوارێک بە خۆی و دوو نەفەری دی لاسارێ دەکەن و ناگەڕێنەوە دوایە و شاڵاو بۆ دێی دێنن. دوو تفەنگم بۆ سوارەکە تەقاند، هەوەڵ تفەنگم لە دەسکی خەنجەری دابوو و کە دوا تفەنگیشم هاویشت، سوار بەخۆی و بارگینی گەوزین. چاو لێدەکەم لە ناو دێ ڕا ئافەرینێکیان بۆ کردم. ئەوەندەم زانی سوارەکە ڕاست بۆوە بەڵام بارگینەکەی تۆپیبوو.

ئەوە ئاغای دێی بە خۆی و چەند نەفەر لە پیاوەکانی ڕایانکردووە، پیاوەکانی کاک مامەندیش لە شاخ خەریکن خۆ دەحەسێننەوە، منیش وەها بەقینەوە شەڕم دەکرد نەبێتەوە. خۆم شێت کردووە و بە تاقی تەنێ پێشم بەو هەموو سوارەی عەشیرەتی گرتووە. ئاخر کەس نییە بڵێ بابی بابم، ئاغای دێی ڕای کردووە و شەڕ ناکات ئەتۆ دەڵێی چی؟ ئەتۆ بۆ دەگەڵ ئەو هەموو تاڵانچییەت پێدەکرێ؟ لەپڕ هۆشم هاتەوە بەر و بەخۆم گوت:

(ماڵوێران ئەتۆ خوێن بەری چاوی گرتووی؟ بۆ دەستهەڵناگری؟)

چاوم لێکرد خۆ ئەو پیاوەی کاک کەریمی کە دەگەڵم بوو، لەمێژە پێمدەڵێ واز بێنە، بەڵام من ناچێتە گوێم! عەشیرەتەکان دەیانزانی کە تەنیا لەو کەلاوەیە ڕا تەقەیان لێدەکرێت. منیش بڕیارم دا کەلاوەکە بەجێ بهێڵم و شوێنەکەم بگۆڕم، لەبەر ئەوەی کەس نەبوو دەگەڵم تەقە لە عەشیرەت بکات. کەلاوەم بەجێهێشت و خۆم گەیاندە «چاک»ـێکی کە لە قەراغ دێی بوو. لەنێو بەردەکانی ئەو چاکەدا خۆم حەشار دا.

ئەوجار لەشکری عەشیرەت هاتن بۆ ناو دێ و تاڵانیان کرد. ئەوە من لەنێو ئەو چاکەم و تەماشایان دەکەم. هەموو سوارەکان دەزانن زۆر دوور نیم لە دێ بەڵام هیچ تەقەیان لێنەکردم و منیش کە ئەوەم دیت تەقەم لێنەکردن. دێیان پاکپاک تاڵان کرد و جا وەدەرکەوتن. ئەوان کە ئاوا بوون منیش لەنێو چاک هاتمە دەر. لەخۆم زیاتر کەس نەماوە. دنییێکی چۆل و هۆل. بەناچار

گەرامەوە بۆ شاری و لە ڕێگایە لام دا بۆ «دۆستاڵی» ماڵە «میرزا مەحموودی کوڕی تاجرباشی». ئەوەندەم زانی «کاک ڕەحیمی کوڕی شێخی بورهانی»[١]، خۆی و دەستێک سوار دێن بۆ زگدڕاوی تا نەهێڵن تاڵان کرێ. لایاندا دۆستاڵی و نانومان خورا و گەڕانەوە بۆ شاری و منیش پاشی ئەوان هاتمەوە سابڵاغ. لە شار تەماشا دەکەم «حاجی مستەفا باوکی میرزا کەریمی شاتری» چەند نەفەری کۆکردۆتەوە بە هاواری کوڕەکەی بڕۆن و قوتاری کەن، کە زانیان قوتاری بووە، ئەوانیش گەڕانەوە.



[١] لەسەر ژیانی خوالێخۆشبوو شێخی بورهان و کاک ڕەحیمی کوڕی لە بەشی پەراوێزەکان و لە لاپەڕەی ٤٢٠ دا بخوێننەوە.

## دەرکردنی فەرمانی کوشتنم لەلایەن عەشیرەتەوە

جا ئێستا «ئاغای عەشیرەت» ڕایسپاردووە بۆ کوشتنی من! خەبەرم وەرگرتووە و لە خۆم دڕدۆنگم، ئاخر ئەسپم لەژێر «سیقدی»[1] ئاغایدا کوشتووە! تفەنگم لە دەسکی خەنجەری ئاغای عەشیرەت داوە! تا ئێستا شتی وا ڕووی نەداوە. دەوری عەشایربازییە، عەشیرەت دەستێکی درێژیان هەیە، هەمووی ساحێب چەک و نۆکەرن، سابڵاغ ژێرچەپۆکی عەشێرەتە. شەوانە دەچنە سەر زۆر لە دەوڵەمەندی شار و بە زۆر پارەیان لێدەستێنن! وەعزی [وەزعی،دۆخی] شار باش نییە بەدەستیانەوە![2]

دەبوایە ئاگام لەخۆم بێت کە عەشیرەت نەمکوژن. کەمتر تخوونی ماڵێ دەکەوتم. ئەوکات ماڵمان دە ماڵە «حاجی لەتیف»ـدا بوو. حاجی مردووە، بەڵام ژنەکەی دەگەڵ چەند منداڵان بە بێوەژنی دانیشتووە و خاوەن ماڵمانە. دەشزانێ کە عەشیرەت لێم دەخەفتێن بۆ کوشتنم. چەند ڕۆژ بەسەر چوو، شەوێک هاتمەوە ماڵ تا بڕیک بحەسێمەوە، بە «خورشید»ـیم گوت:

— من کەمێک دەنووم، زۆر هیلاکم، بەڵام تۆ مەنوو و نۆبەچی بە.

دەرکەی حەسارێم گاڵ دا و بۆی نووستم. خورشیدیش بڕێک نۆبەچی دەبێت و پاش ماوەیەک خەوی لێدەکەوێت. ژنەکەی حاجی لەتیفی دەرکەی حەسارێ دەکاتەوە. لاشم وابوو کە فێریان کردبوو بیکاتەوە. ئەوەندەم زانی چوار نەفەر بە تفەنگەوە لەسەرم ڕاوەستاون و نووکی تفەنگیان لە تەپڵی سەرم گرتووە و پێمدەڵێن کە ڕاست ببمەوە. منیش هەستامە سەر قوون و تەماشام کرد «ڕەحیمی پیاوی ئاغا»ـیە. دەگەڵیان بەربوومە قسان و هەرچی کردم و کراندم، بێفایدە بوو، گوتیان هیچت بۆ نابێ، با بڕۆین بۆ لای «ئاغا». ناچار وەپێش خۆیان دام بۆ ماڵە ئاغای. تەفەنگەکەم لەبن

---

[1] ڕوون نییە چ نووسراوە، سێقەد، سیقد، ... بە ئەگەری زۆر (سێ قەد)ـە

[2] پاش لاوازبوون و نەمانی دەستەڵاتی حکومەتی ناوەندی لە مەهاباد، ئەمر قازی محەممەد هەموو عەشیرەتەکانی کۆکردەوە و بە زمانێکی خۆش هەموویانی قایل کرد کە بەرپرس بن سەبارەت بە ئاسایشی سابڵاغ. ناکۆکی و بەرچاوتەنگی و مرخی عەشیرەتەکان لەلایەک و گوێڕایەڵی سەرۆکانی زۆربەی ئەو عەشیرەتانە لە حکومەتی ناوەندی لەلایەکی تر، وای کرد کە لەلایەن دەوڵەتەوە قازی محەممەد وەلابنرێت و لە ڕێکەوتی ١٣٢٠/١٠/٢٠هەتاوی ١١-٠٣-١٩٤٢ زایینی (عەلی ئاغا ئیلخانیزادە) ناسراو بە (ئەمیر ئەسعەد) کە ڕوانگەکانی لە دەوڵەتی ناوەندی نیزیک بوو، وەک فەرمانداری ئەو شارە دابنرێت و هێزێکی عەشایریش ئاسایشی ئەو شارە بگرێتە ئەستۆ. ئەو دۆخە بە دڵی ڕووسەکان نەبوو. ئەوان بە هاندانی خەڵک و گوشاری لاوەکی، هەروەها ناکۆکی نێوان عەشیرەتەکان، عەلی ئاغای ئیلخانیزادەیان ناچار کرد لە ڕیکەوتی (١٣٢١/٠٦/٥ە ٢٧-٠٨-١٩٤٢ز) دەست لەکار بکێشێتەوە و لە گوندی "وشتەپەی" سەر بە بۆکان نیشتەجێ ببێت. بڕوانە: تاريخ مهاباد، سید محمد صمدی، سال ١٣٧٣، انتشارات رهرو مهاباد ل: ١٥٦ هەروەها کتێبی: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان - نووسینی: حامید گەوهەری - ل: ١١٣ هەروەها: جمهوری ١٩٤٦ کوردستان – نووسینی ویلیام ئیگڵتۆن – وەرگێڕانی: سید محمد صمدی ل:٣٢

سەرم بوو و تاوم دایە کە هەڵیگرم و دەگەڵ خۆمی بێنم نەیانهێشت، بەڵام خەنجەر لەبەر پشتێنم دایە. ئەوە شەو درەنگە، عالەم نووستوون، کە گەیێشتینە ماڵە ئاغای، دیتم ئاغا و چەند نەفەر ئاغای دی و «سەیدی قزڵقۆپی» و «حەسەنی برایمە گۆجی»ـش[1] لەوێن و بەو شەوە درەنگە خەریکی قومار کردنن. قومارەکەیان هێندە گەرم بوو کە کاتیان نەبوو بمدوێنن. لە ئاست خۆمەوە دانیشتم و پاشی سەعاتێک زیاتر کە قومار قوتار بوو، ئاغای عەشیرەت ڕاست بۆوە و هاتە سەرم. نۆکەرەکانی زوو خەنجەرەکەمیان لەبەر پشتێنم دەرهێنا. ئاغا بەسەرمدا گوڕاندی:

— هەی سەگباب، ئەوە وات لێهاتووە تفەنگ بە عەشیرەتی....وە دەنێی؟

ئەوەی لەو ژوورەیە تەماشای من و ئاغای دەکەن. «کوڕی حەسەنە سووری» خزمی منە و ئەویش نۆکەری ئاغایە، جارجار ئەو خەبەری دەدامێ. داخەکەم ئەو شەوە بە وییان نەگوتبوو کە دێن من بگرن. ئەوە ئەویش لەوێیە و ماتە، جوان دیارە پەرۆشی منێتی. ئاغا ئەمری کرد ڕەکێشی کەن بۆ حەسارێ. خۆی لە هەیوان ڕاوەستا. بە نۆکەرەکانی گوت لێیدەن. بە چوار نۆکەران کەوتنە سەرم، لێمدەدەن ئەما لێدان! خزمەکەی منیش لێمدەدات بەڵام من هاوار ناکەم! لەبنەوە پێمدەڵێ هاوار کە، جوابی نادەمەوە. تا تێر بوون لییاندام، پاشان گوڕراندی بەسەر نۆکەرەکاندا و گوتی:

— بۆ نێو قەبرانی بەرن و لەوێ بیتۆپێنن.

قۆڵیان گرتم، ڕاستیان کردمەوە و وەپێش خۆیان دام تا ئاستی ماڵە «مەلا مولودی». لەپڕ تەماشام کرد «حەسەنی برایمە گۆجی» یەکبەخۆی هەرای نۆکەرەکانی کرد:

— بیگەڕێننەوە! بیگەڕێننەوە!

ئەوانیش گێڕایاننمەوە. حەسەن هاتە پێش و گوتی:

— بڕۆ، ئەوجارەش ڕزگارت بوو، «سەیدی قزڵقۆپی» تکای لە ئاغای کرد و تۆی بەخشی.

خەنجەرەکەم بە نۆکەرەکان بوو، وەری گرتەوە و دایەوە بە خۆم و بە شەکەتی هاتمەوە بۆ ماڵ.

جا هەر بۆیە شۆڕشم خۆشدەوێ، پیاو بە مەرامی خۆی دەگات و زوڵملێکراوان تۆڵەی خۆیان دەستێننەوە. شۆڕش ناهێڵێ هیچ لەسەر دڵت بێتە گرێ، ئەوەی جارێکی زۆرداری کردبێت، لەسایەی شۆڕشەوە، دەستی تۆڵە دەیگاتێ. کاتی خۆی ئەو ئاغایە چی بەسەر من هێنا؟! من بیست ئەوەندەم تۆڵە کردەوە. پاشان گوێتان لەو باس و خواسەی من و ...ئاغا دەبێت کە چۆن وەک مەیمونی هەڵمدەپەراند! تەواوی ئاغای دێبۆکر و مەنگوڕ و مامەش لە شاری سابڵاغێ وەک سینەما لە تەماشای ئەو بەزمە خۆشە بوون و چاویان لەو ئاغایە دەکرد کە چۆن سەمای پێدەکەم، کەچی کەس نەبوو غیرەتی هەبێ بڵێ بۆ وا لەو ئاغایە دەکەی، نە نۆکەر فزەیان دەهات، نە ئاغاکان دەیانوێرا بڵێن لەل! کەس نەبوو بۆی بپارێتەوە!

---

[1] وەک دەگوترێ ماڵی لە چاکی قووڵەقەبری بووە و مەنشوور بووە بە "تاجی" و بەردەوام سەرخۆش بووە.

## شاربەدەرکردنم، تەورێز، حیزبی تودە و چەند ڕووداوێک

لەولاشەوە مامە غەنیش لای قازی بۆی تێچاندبووم کە ئەوە پرسی بەمن نەکردووە و چۆتە زگدڕاوی و دەگەڵ عەشیرەتان شەڕی کردووە. قازیشیان ترساندبوو یان بەقسەی مامە غەنی تۆزێک دەگەڵم سارد ببۆوە. لاشم وابوو لە ترسی ئەو عەشیرەتە وا سارد ببۆوە. ئاخر ئاغاوەتی ئەو عەشیرەتە دەگەڵم ببوونە دوژمن و تەنگیان پێهەڵچنیبووم. هەموو دەرگایەکیان لەسەر داخستبووم. پەڵپیان پێگرتبووم کە دەبێ ئەو شارە چۆڵ کەم و لەو ئارامانە نەمێنم. کورد و کرمانجی دەیانویست شاربەدەرم کەن. منیش کە وامزانی گوتم با ماوەیەک لەبەر چاویان نەمێنم و هەستام چووم بۆ تەورێزێ ماڵە «فاتمە خانم»ـێ و چەند شەوێک لەوێ بووم.

ئەوکات هەر کوردێک دەیتوانی بە ئەسلەحەوە لە تەورێز بسووڕێتەوە، عەرووسان بۆ کوردان دەنگیان نەدەکرد. منیش بە تفەنگ و فیشەکدانەوە چووبووم. ئەحمەدی حەمەکەوڵە و چەند نەفەر سابڵاغیش بەسەفەر هاتبوون بۆ تەورێز. هەموومان بە ئەسلەحەوە دەخولاینەوە کەس هیچی نەدەگوت. نە ئەمنییە و نە ئاژان قسەیان نەدەکرد، عەرووس ئیجازەیان دابوو.

شەوێک «خالەقی کەریمی ئەحمەد جانی» هاتنە مزڵەکەی ئێمە و گوتی: «سەروان قادر ...» شەوانە لە «مێهمانخانەی[1] ڕیحانی» دەنوێ. قادر ئەفسەرێکی ئەمنییەی ئێرانێ بوو. خەڵکی سابڵاغێ بوو و ئێستا لە ترسان ڕای کردووە و لە تەورێزە. میرزا قادر زۆر جوان و زەریف بوو، هەر ئەو جوانییەشی بوو کە بە سەروانی گەیاندبوو. ئەحمەد گوتی با سەرێکی لێبدەین. شەو ڕاکشا، من و ئەحمەد و کوڕی کەریمی ئەحمەد جانی هەرسێکمان چووینە لای جەنابی سەروان قادری. وەژوور کەوتین و دیتمان خۆی ڕووتکردۆتەوە و خەریکە بنوێ. لەپێشەوە شیرەکەی هەڵاوەسرابوو، دامگرت و لە قەدی خۆم بەست. هاواڵەکانم دانیشتن بەڵام من لە دەمانچەکەی دەگەڕام و نەمدەدۆزییەوە. هەڵمپێچا بۆ دەمانچەکەی، سوێندی خوارد کە لە ئیدارە ئیجازە نادەن دەمانچە هەڵگرین. ئەوجا بیانوومان پێگرت کە دەبێ بەو شەوە دەگەڵمان بێی بۆ گەڕان، ئەویش دەکرووزێتەوە و دەپاڕێتەوە کە دەستی لێهەڵگرین. لەو دەنگەدەنگەی ئێمە، «حوسێنی حاجییە کەڵەی» کە ئەویش لەو مێهمانخانەیە بوو، بەسەر ئەو بەزمەیدا هات. تکا و ڕەجای بۆ کرد و لە دەستمان قوتاری کرد. ئەو چۆوە ژوورەکەی خۆی و ئەوجار (...) گوتی شەو درەنگە و لێرە دەنووین تازە.

---

[1] میوانخانە، مسافیرخانە، مۆتێل Motel

ئەو دەگەڵ میرزا قادری لەسەر کراوتەکەی[1] نووستن و ئێمەش لەسەر فەڕشەکەی نووستین. (...) گوتی ئێوە بنوون من خەوم نایەت. کە وای گوت، زانیم دەڵێ چی! من نووستم و چووم دە خەوێکی قووڵەوە، کاتێک ڕاستی کردمەوە و گوتی بڕۆنە لای میرزا و لەو ئارامانە[2] مەمێنن. عیلاجمان نەما و شیرەکەم دایەوە و وەدەر کەوتین و چووینەوە بۆ مزڵەکەی خۆمان. بۆ بەیانی لە مزل وەدەر کەوتم بۆ گەڕان. لە ڕێگا تەماشام کرد کچێکی زۆر جوان و تەمیز سێسەرەم لەسەر هەڵناگرێ. چەند کەڕەت پێشەوبەرم لێدەدا و تەماشام دەکات. کچەکە کابرایەکی دەگەڵە، وادیارە نۆکەرێتی. کابراش دەگەڵ کچەی تەماشام دەکا. من سەری خۆم داخستووە و بە خیاباندا دەڕۆم، جارجار ئاوڕ دەدەمەوە ئەوانیش بەدوامدا دێن و خۆبەخۆ قسە دەکەن. کەمێک زەینم دانێ، تەماشام کرد کابرا تاوێکی خۆش پێشەوبەری دام و ئەوجار لێم هاتە پێش و گوتی:

– ئاغا، ئیجازە هەیە کەمێک بەیەکەوە قسە بکەین؟

– فەرموو!

– ئەو کچەی لەدوورەوە ڕاوەستاوە، کچە ئاغامە. دەڵێ زۆر مەمنونی دەبم گەر ڕازی بی، ئەو لیباسانەیم بۆ سەعاتێک بداتێ، دەمهەوێ وێنەی پێوە بکێشم.

– یانی من لیباسەکانم بدەم بەو و بەڕووتی بەڕێگادا بڕۆم؟ ئەوە چ داوایەکە بابم؟

– نا نا، وا نا! بەیەکەوە دەڕۆینە جێگای وێنەکێشان، تۆ لیباسەکانت داکەنە و ئەو وێنەی خۆی بکێشێت، کە قوتار بوو، لیباسەکانت دەبەرکەوە.

– دەی زۆر باشە و دەگەڵتان دێم.

من و کابرا و کچە هەرمەنی چووینە جێگای خۆی. لە دیوێک ڕووت بوومەوە، لیباسەکانم

---

[1] لە ڕاستیدا چاوگ و ماکی ئەو وشەیە لە وشەی (کر) ڕا دێت کە بە مانای کاری دەست، دروستکردن، چنین، تەنراو، دوورین، سەنعەت و پیشە ڕا دێ. قەدیم و ئێستاش بۆ دروستکردنی جلوبرگ یا پێخەف لە خوری و لۆکە کەڵکیان وەردەگرت و وەردەگرن. لە کوردستان کە ئاژەڵداری یەک لە پیشە نەتەوەییەکانی ئەو گەلەیە، زیاتر خوریان کردۆتە پێخەف. خوری و لۆکەش بۆ ئەوەی بۆ جلوبەرگ و پێخەف و بەڕە و مافوور دەکاری بێنن، دەبێ لە ڕووالەتە چیڕ و گلۆلە ئاساکەی بێننە دەر و ڕیشاڵڕیشاڵ و تەنک و ناسکی کەنەوە کە لە سازکردنی پێخەفدا زیاتر خوری و لۆکەکە هەللاجی دەکەن بۆ ئەوەی نەرم و نۆڵ بێتەوە. لێرەدا کاپیتان دەڵێ کە ئەو دووکەسە لە سەر (کراوتە)ـکە خەوتن و ئێمەش لەسەر (فەرش)ـەکە. مەبەستی ئەوەیە کە ئەو دووکەسە لەسەر پێخەفەکە (دۆشەگ) نوستن کە لە خوری یا لۆکەی (کراوە) ساز کراوە، یان لەسەر تەختێک نوستوون کە جێ نوسستنەکەی بە شێوەی ڕایەڵ و پۆ تەنراوە. تەنانەت ئەو وشەیە لە کاری جۆلایەتیشدا کەڵکی لێوەردەگرن. مامۆستا عەبدوڵڵا سەمەدی لە کتێبی: (گەشتێک بە کارگەی جۆلایی دا – فەرهەنگۆکی وشە و زاراوەکانی جۆلایی بە شێوەزاری مەهابادی) دا لە مانا کردنەوەی چاوگی (کر)دا دەڵێ کە کر یانی (تەنراو) و بە دەستکرد و دروستکراوەکانی جۆلاییش دەڵێ (کری جۆلایی) یا (کرانەی جۆلایی). هەروەها ژنانی کوردەواریش بۆ تەشی ڕێستن دەبوایە خوورییەکە بکەنەوە و بە شانە بیپشکنن پاشان بیڕێسن و ئینجا بیچنن. لەلایەکی تریشەوە (کراوات - кровать) لە زمانی ڕووسیدا بە مانای تەختی خەو یان قەرەوێڵە دێت. ئیتر دیار نییە کامەیان مەبەستی کاپیتان بووە؟

[2] (ئارا) یانی ناوچە، مەیدان.

داکەند و دام بە کابرای بردی. کچە هەرمەنی وێنەی کێشا و لیباسەکانی بۆ هێنامەوە و دەبەرم کردەوە. پیاو حەق بڵێ، لیباسێکی زۆر قۆزم دەبەردا بوو. ڕانک و چۆغەی گرژاڵ، ڕەنگی ئاسمانی، هەر تروسکەی دەهات. پشتێندی پەشمینە، پەستەکی سەبات، شەدەی ڕەش، کچە هەرمەنی ناحەقی نەبوو لیباسەکانمی لا جوان بێ و وێنەی پێوە بگرێ. پاش ئەوەی کە کاریان لەلام ڕاست هات، زۆریان سپاس کردم و وەدەرکەوتم. هاتمەوە ناوشاری بۆ گەڕانێ، لەپڕ تووشی «ڕەحمانە چەتە»ـی بووم. وردەوردە بۆخۆمان ملمان لە گەڕانێ نا. لە دوورەوە عالەمێکی زۆرمان دیت کە ڕیزیان گرتووە. پێمان سەیر بوو! هەنگاوەکانمان خێراتر هەڵێنایەوە تا بزانین چ باسە؟

— پرسیمان: ئەوە چ باسە؟ ئەو عالەمە بۆ ڕێچکەیان گرتووە؟

— گوتیان: ئێرە قوسوورخانەی[1] ڕووسانە، بە نۆرە دەڕۆنە ژوور و پاساپۆرتی[پاسپۆرت] شۆڕەوی وەردەگرن.

ڕووم دە ڕەحمانی کرد و گوتم:

— کوڕە کار لەوە باشتر نابێ، من دەچم پاسپۆرتی شۆڕەوی وەردەگرم. ڕەحمان گوتی: منیش دێم.

چووین دە ڕێچکەیەوە و نۆبەمان گرت. پاش ماوەیەک ڕاوەستان، دیتمان سێ نەفەر ڕووس، بە لیباسی شەخسی، لەبەر هەیوانەکە ڕاوەستاون و لە ئێمە دەڕوانن کە لەنێو عالەمەکەی داین. یەکیان هاتە لامان بە زەردەخەنەوە، مەلاییم گوتی: کارتان هەیە بە ئێمە؟ ڕەحمان ئازەربایجانی باش دەزانی و گوتی: بەڵێ، ئێمەش دەمانهەوێ پاسپۆرتی شۆڕەوی وەرگرین و لە ئێخەی حکومەتی ئێران ببینەوە. ئەو حکومەتە دەگەڵ ئێمە نێوانی باش نییە.

لە عالەمەکەیان هەڵبواردین و فەرموویان کردین و وەپێش خۆیان داین بۆ ژوورێ لای کۆنسوولی. ئەویش بە ڕوویەکی خۆشەوە زۆری دواندین و پاشان هەریەکەو کاخەزێکی پانیان داینێ و چوار تمەن و ٣٠ شایی پارەمان دا و دوو نەفەر تا بەردەرکەی بەڕێیان کردین، دەستیان دەدەستی ناین و وەدەر کەوتین. دڵم خۆشە کە بوومە تەبەعەی شۆڕەوی. لە خۆشییان وەختەبوو باڵ بگرم. جا ئاغا و ماغا چ دەکەن با بیکەن، چۆنم باس دەکەن با بیکەن، خۆ ئەوانە قەت بەزەییان بە کوڕی فەقیر و هەژاراندا نەهاتووە. تا بۆیان بکرێ پیاو دەکوژن، دەنا کابرای سووک و ڕیسوا دەکەن. هەر ئەو ڕۆژە ڕەحمان چەتە چۆوە بۆ سابڵاغ.

---

[1] مەبەستی کۆنسوولخانەیە - Consulate ـە. لە درێژەی کتێبەکەدا چەند جارێکی تریش هەر بەو شێوەیە نووسیێتی، بۆیە لەمەودوا وشە دروستەکەی دەنووسمەوە.

منیش ئەوە خەبەرم زانیوە کە لە تەورێز حیزبی تودە هەیە و«عەزیز زەندی»[1] دەو حیزبەی دایە. چووم بۆ کولوبی و لەوێ بردیانم بۆ لای کابرایەک نێوی «قولیۆف» بوو. کەمێکمان قسە کرد و پاشان گوتی کە عەزیز لەو ئیدارەیەیە و کوڕێکی دەگەڵ ناردم بۆ لای زەندی. کە چووم، دەبینم لە ژوورێک لەسەر میزێک دانیشتووە و یەک-دوو نەفەری لایە. کە منی دیت، زۆری پێخۆش بوو و ڕێزێکی باشی لێنام و دەفتەری حیزبی تودەی دامێ و منیش وەرمگرت.

ئیدارەکە زۆر ئاوەدان بوو و هاتوچۆم بۆ ئەوێ کرایەوە و زووزوو دەچووم. ڕۆژێکی عەزیز منی بردەوە لای قولیۆف و پاشان پێیانگوتم کە تازە مەچۆوە بۆ مێهمانخانە و لێرە بە. دیوێکی ژێکەڵە و پاک و خاوێنیان دامێ، پێخەفی نوێ و شاهانە. چەند شەو و ڕۆژێک لەو کولوبە نووستم. شەوێکی دیتم کە «عەزیز زەندی» کابرایەکی گرتووە، لەسەر چی؟ نازانم! عەزیز لای نیوەشەو هاتە لام و گوتی:

- ئەو کابرایە بەرەوە بۆ ماڵ، ٢٠٠ تمەنت دەداتێ، ئەگەر پارەکەی نەدایەی بیکوژە.
- من شتی وا ناکەم. بۆ ٢٠٠ تمەنی تۆ پیاو بکوژم؟ دەڕۆمە لای قولیۆفی بزانم ئەو دەڵێ چی!
- مەچۆ لای ئەو با ئەو نەزانێ.
- هەر دەچم.

وەدەر کەوتم بچم بۆ لای قولیۆفی، کەچی دووم کەوت و زۆر پاڕایەوە و گێڕایمەوە.

ئەدی کە ئەوەم لێدیتن، زۆرم بەزەیی بەخۆمدا هاتەوە. لە لایەک زۆرداری ئاغا و دەوڵەمەندان تەنگی پێهەڵچنیوم، لەلایەکیش پەنام بۆ حیزبێک هێناوە کە خۆی بە پەنای لێقەوماوان دەزانی،

---

[1] "عەزیز زەندی" (١٨٩٨-١٩٧٢ز) ناسراو بە "عەزیز ئاڵمانی"، یەک لە دامەزرێنەرانی (حیزبی ئازادیی کوردستان) بوو. پێشتر وەک بەردەستی میسیۆنێری ئاڵمانی دوکتور شاڵک کاری کردووە و زمانی کوردی فێری میسیۆنێرەکان کردووە. توانیوێتی کتێبی پیرۆزی ئینجیل بە کوردییەکی لاواز وەرگێڕێتە سەر زمانی کوردی کە ناوی کتاب ارشاد المذنین (ئامۆژگاریی گوناهباران) (ساڵی١٩٤٥، ٢٤٨ لاپەڕە)یە . ئەو کتێبە لە ( ٧ی شەوالی ١٣٤٤) بەرامبەر بە (١٩٢٦/٠٤/٢٠) بە دەستنووسی خۆی نووسیویەتەوە، بەڵام بیست ساڵ دوایە لە ئامریکا چاپ کراوە. لە ساڵی ١٩٣٩ دوکتور شاڵک عەزیز زەندی دەگەڵ خۆی دەبا بۆ وڵاتی ئاڵمان و ساڵێک دواتر، پاش داگیرکردنی ئێران لەلایەن سوپای هاوپەیمانان، دەگەڕێتەوە بۆ مەهاباد. لەناو بەڵگەکاندا قسە و باس لەسەر بەڕێز "عەزیز زەندی" زۆر نووسراوە، بۆ زانیاری زیاتر دەتوانن بڕواننە کتێبی: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، نووسینی: حامید گەوهەری، لاپەڕەی ٣٤. نامیلکەی (زبیحی کاریزمای ناتمام) نووسینی: مامۆستا "ناسر باباخانی". هەروەها، کاک "حەسەن قازی" لە وێبلاگی خۆیاندا بەناوی"ڕوانگە"، لێکۆڵینەوەیەکی دەوڵەمەندیان لەسەر بەڕێز "زەندی" کردووە کە دەتوانن لە ڕێگای ئەم بەستەرە کورت کراوەیەی ژێرەوە سەردانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بکەن: http://bit.ly/٢ZsdxUc ڕەنگە پێوەندی بە باسەکەوە نەبێ، بەڵام هەر بۆ زانیاری خوێنەران بەباشی دەزانم بڵێم کە سووری دەوران وای کردووە کە بەڕێز عەزیز زەندی ببێتە خەزووری مامۆستا حەسەن زیرەک و کاپیتانیش ببێتە خەزووری مامۆستا محەممەدی ماملێ.

ئەویش ئاوا دەرچوو تا من بکەنە قوربانی ۲۰۰ تمەنی خۆیان. [1]

## گەڕانەوە لە تەورێزەوە بۆ سابلاغ و پەلپی عەشیرەتی...

بۆ بەیانی سواری ماشێنی بووم و گەڕامەوە بۆ سابلاغێ. تا ئێستا سەرم بۆ کەس دانەنواندوە، تازەش بۆ ئاغایانی دانانوێنم. هەرچی دەبێ با ببێ. کە چوومەوە ماڵ، خورشید گوتی:

— چەند کەڕەت پیاوەکانی ... ئاغای هاتوون و لە تۆیان پرسیوە، گوتومە نازانم لە کوێیە.

تەواو قوونم گەرم دانەهاتبوو دەبینم سێ پیاوی ...ئاغای لێم وەژوور کەوتن. گوتیان:

— ئاغا دەڵێ دەبێ لەو شارە نەمێنێ.

— برۆمە کوێ؟ من لەو شارە لەدایک بووم، مردوو و زیندووم لەو شارەیە.

— زۆر قسە مەکە، بەیانی نابێ لێرە بتبینینەوە، دەبێ لێرە بڕۆی. قسەی ئاغایە و تەواو.

ئەوان وەدەرکەوتن و منیش شەو لەماڵ نووستم و بۆ بەیانی زوو ڕێگای ڕەزایەم گرت و چوومە ورمێ. «حەبیبە زەرد»یشم دەگەڵە و چوومە لای ڕووسان. کابرایەکی ئەفسەر نێوی «عەلی‌یۆف» بوو، تەتەر بوو، کاپیتانیش بوو. دەگەڵ حەبیبی چوومە لای کابرا. حاڵ و وەزعم بۆ باس کرد و پێمگوت کە ئێستاش ئاغاکانی فلانە عەشیرەت شاربەدەریان کردووم، چارم چییە؟ ڕێیەکم نیشان دە! برێک ڕاما، گوتی:

---

[1] (ئەردەشێری ئاوانێسیان - آرداشس آوانسیان) یەکێک لە کەسایەتییە کۆمۆنیستەکانی ئێران لە سەردەمی ڕەزاشا و یەک لە دامەزرێنەرانی " حیزبی تودەی ئێران " لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا لە باسی سەروبەندی بەر لە پێکهاتنی فیرقەی دێمۆکرات، باسی ڕێکخراوەیەک دەکا بە ناوی "سازمان زحمتکشان آذربایجان" - ڕێکخراوی زەحمەتکێشانی ئازەربایجان - و دەنووسێ: "ڕێبەرانی ئەوان خەڵکی بەدۆڵاب و فێڵباز و لە باری سیاسییەوە نەخوێندەوار بوون کە هیچ ئامانجێکیان نەبوو جگە لە پڕکردنی گیرفانیان نەبێ، کەسی هەرە سەرەوەیان بە دەرەجەی یەکەم کابرایەک بوو بە نێوی "قوڵی‌یۆف" کە مەعلووم نەبوو لە پێشوودا چکارە بووە. ئەو چەند ماشێنی باری هەبوو کە سوورسوور دیار بوو لە ڕێگەی دزی و پاشەکەوتەوە وەدەستی هێنابوو. سەرۆکەکەی دیکەیان کەسێک بوو بە نێوی زەند کە بە ڕەچەڵەک کورد بوو و پێشتر لای ئاڵمانییە فاشیستەکان کاری کردبوو. زەند تەنانەت جاسووسی ئاڵمانییەکانیش بووە. ئەوەی ئاشکرابوو هەر دووکیان شارلاتان و دز بوون " ..... " بە هەمە حاڵ وابزانم لە نێوەڕاست ساڵی ۱۹٤۲ دابوو کە ئەم ڕێکخراوەیە لە بەر یەک هەڵوەشا. [ خاطرات اردشیر آوانسیان ، ل ۲۱۰. ، ۲۱۱ .] (ئەو دێڕانە لە وێبلاگی (ڕوانگە) کە کاک حەسەنی سەیفی قازی بەڕێوەی دەبا، وەرگیراوە.)



برۆ بۆ نەغەدەی لای «شێخ محەممەدی عەڵیالی»[1] و بڵێ فلانکەس ناردوومی. هەر ئەو ڕۆژە چوومە نەغەدەی و گوتم هاتووم بۆ لای تۆ و حاڵ و نەقڵی خۆم بۆ گێڕایەوە. ئەویش بەخێرهێنانی کردم و بردمی بۆ ئیدارەکەی خۆی و بە قۆڵسوورەکانی ناساندم و گوتی لەمەولا حەمەدی مەولوودی سەرۆکی ئێوەیە و ئێوەش دەبێ ڕێزی لێبگرن. هەموو بە یەکدەنگ گوتیان ئێمە زۆر ڕازین. شێخ محەممەد هەموو ئیختیارێکی دابوو بە من، زۆر بە باشی کاروباری نەغەدەمان هەڵدەسووڕاند. خۆی و هەواڵە قۆڵسوورەکان زۆرم لێ ڕازی بوون.

## سوێندخواردنی یەکەمم دە کۆمەڵەدا (ژ.ک)

ڕۆژێک خورشید خەبەری ناردبوو کە زوو بگەڕێتەوە، ئامینی کچمان نەخۆشە. چوومە لای شێخ محەممەد و پێمگوت کە کچەکەم ناسازە و دەبێ بچمەوە سابلاغ، ئەویش بردمێوە ماڵێ و ۳۰۰ تمەنی دامێ و گوتی زۆر زوو بگەڕێوە بەڵام ئاگات لەخۆت بێت با دەگەڵ ئەو عەشیرەتە تووشی گۆنگەڵێ نەبی. سواری بارگینی شێخ حەمەدی بووم و گەڕامەوە بۆ سابلاغێ. خەبەریشم هەیە کە (کۆمەڵە) هەیە و خەریکی خۆڕێکخستنە، بەڵام بە من ناڵێن.

---

[1] خوالێخۆشبوو" شێخ محەممەدی عەڵیالی" لە بنەماڵەی عەڵیالییەکانی سابلاغێیە کە کاتی خۆی ژنێکی ئازەری دەهێنێت و لە نەغەدە نیشتەجێ دەبێ. زیندەیاد کەسێکی تاجر بووە. لە سەردەمی پێش کۆماری کوردستان و لە ساڵی ۱۳۲۰هەتاوی کە ڕووسەکان هاتن بۆ ناوچەکە، بەهۆی زانینی زمانی ئازەری و تا ڕادەیەکیش ڕووسی، بوو بە باوەڕپێکراوی ڕووسەکان و کرا بە سەرۆکی قۆڵسوورەکانی ئەو شارە و ئاسایشی ئەو شارەی بەدەستەوە گرت. بێ لەوەش کەسێکی خاوەن ڕێز بووە لەلایەن چینە جیاوازەکانی ئەو ناوچەیەدا. دیار نییە لە چ ڕێکەوتێک لە دایک بووە، بەڵام لە ساڵی ۱۳۲۳هـ/۱۹٤٤ز و لە گەرمەی ئەو ڕۆژە چارەنووسازانەدا لە نەغەدە کۆچیدوایی کردووە. ئەو ڕووداوانەی کاپیتان باسیان لێوە دەکات دەبێ لە سەروبەندی پێش کۆچیدوای کردنی شێخ محەممەد بووبێت.

پێش ڕاگواستنم بۆ شیراز حیزبێک هاتە کایەوە کە نۆهەمین نەفەر من بووم[1].

ئەو شەوە لە سابڵاغێ من و «شەریفی ڕەحیمە کەڕی» بانگ کراین و هەردووکمانیان سوێند دا. ئەو چەند کەسە لە ماڵە حوسێنی زێڕینگەران بوون:

- عەبدوڵڵا برایم شەمزینی
- حوسێن لبادی
- محەممەدیمەنگوڕی

چەند نەفەری تری لێبوو بەڵام لە (کۆمەڵە) بە ئێمەیان نەگوتبوو.

## تۆڵەکردنەوە لە ڕەئیسی ئەمنییە

کە هاتمەوە ماڵ دیتم ئامین زۆر نەخۆشە. حەکیم و دوختر [دوکتور] نییە لە شار، دەرمانخانە نەبێ. چوومە لای «محەممەدی دەرمانفرۆش» و داو و دەرمانم کڕی. ئەوە چەند ڕۆژێکە لە ماڵم، لە پیاوەکانی ئاغا و ماغایان کەس نەهاتە سۆراغم. مامە غەنیش لەسەر کار نییە. قازی، «مەنسووری کوڕی قازی فەتاحی» لە جێگای مامە غەنی داناوە. مەنسوور دەگەڵ من زۆر دۆستە. لای خۆی یەک-دوو ڕۆژ سووڕامەوە. ڕۆژێک خەبەریان دامێ کە ڕەئیسی ئەمنییە لە ماڵە «سەدرولئیسلامە».[2] کەلوپەلی لە ماڵە ئەوان بەجێماوە و هاتۆتەوە ئەوان دە ماشێن بهاوێت و بیانباتەوە بۆ ئازەربایجان.[3] هەر ئەو ڕەئیسە جارێک منی گرتووە و زۆری عازاب داوم. گوتم ڕۆژ ڕۆژی تۆڵەیە و نابێ بەسەرییەوە بچێت. چەند نەفەر هاواڵم هەڵگرت و چوومە سەر ڕێگای. هاواڵەکانم لە ئاستی «باغی حاجی داودی» لەوبەر و لەوبەر دامەزراند و خۆم گەڕامەوە بۆ شار بەشکوو خەبەرێک

---

[1] لە ساڵی (١٣١٧ھ/١٩٣٧ز) یەکەمین حیزبی مۆدێرنی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە ناوی (حیزبی ئازادیی کوردستان) ساز کرا. تەمەنی ئەو حیزبە کەمی خایاند و کاپیتان یەک لە دامەزرێنەرانی ئەو حیزبە بووە. بۆ خوێندنەوە لەسەر ئەو بابەتە دەتوانن سەردانەی لاپەڕە ٤٧٨ ئەو کتێبە بکەن.

[2] (صدرالاسلام) یان (سەدری قازی) ناوبانگی برا بچووکی پێشەوا قازی محەممەد بووە بەناوی (ئەبولقاسمی سەدری قازی). لە زەمانی دەستەڵاتی قاجارەکاندا و تا ڕادەیەکی لە زەمانی پەهلەوی باب دا، بەخشینەوەی ناسناو باو بووە. ناسناوی پێشەوا قازی محەممەدیش (محەممەد هومامی قازی) بووە.

[3] لەلایەن کاک حەسەنی قازییەوە بەڵگەیەکم وەرگرت کە ڕەنگە پێوەندی هەبێ بەو باسەوە. بەڵگەکە نامەی یەک لەو کاربەدەستە عەجەمانەی مەهابادە کە لە ترسان ڕایکردۆتە ورمێ و ماڵ و حاڵەکەی لە مەهاباد بەجێهێشتووە و غیرەتی نییە بێتەوە مەهاباد هەڵیگرێ، بۆیە نامەیەکی بۆ نەمر سەدری قازی نووسیوە تا ئەو یاریدەی بدات و کەلوپەلەکەی بۆ بە ماشێنی بارکات و بە پیاوەکانی خۆیدا بۆی بەرێکاتە ورمێ. دەقی نامەکە لە لاپەڕەی ٤٧٤ دانراوە و دەتوانن بیخوێننەوە و تێیدا زمانلووسی، هەلپەرستی و ماڵخۆشەویستی ئەو عەجەمانە زیاتر بەرچاو دەکەوێ و دۆخی ئەوکاتی سابڵاغتان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە.



لە ڕاستەوە: میرزا خەلیل فەتاحی قازی، ڕەحیم جەوانمەرد قازی(کوڕی عەبدولڕەحمانی قازی ناسراو بە ئاغای سالار)، مەنسووری قازی کوڕی قازی فەتاح، عەبدولڕەحمان قازی(ئاغای سالار کوڕی قازی فەتاح - دانیشتووە)، موحسین موجاهیدی (کوڕی قازی فەتاح لە دایکێکی تارانی)، قاسم قادر قازی و محەممەد فیرووز قازی. ئەو کەسەی لە پشتەوەیە نەناسراوەتەوە. سپاس بۆ دوکتور یوسف فەتاحی قازی کوڕی میرزا خەلیل کە ئەو زانیارییانەی دامێ.

بزانم کە کەی ماشێن وەڕێدەکەوێت. سوارم و لە ماڵە «حاجی مشیری» ڕا تەماشای ماڵە قازی دەکەم. دەبینم ئەوە خەریکی بارکردنن. من گەڕامەوە، کە گەیمە باغی، ماشێن هات تێپەڕێ. منیش ئەسپم تاو دا و وەدوای کەوتم. دیتم هاواڵەکانم لەوبەر و لەوبەر لێی درێژ بوون و ڕووی تفەنگیان دەماشێنی کردووە و ڕایانگرتووە. منیش بە سواری گەیمە سەریان. تەماشام کرد «کوڕی ... ئاغای کە نێوی هەمزە ئاغایە» و «حەسەن ئاغای ...» دەگەڵ پیاوێکی قازی کە نێوی «مەلا برایمە» و مەندیلێکی سپی بە سەرەوەیە دە ماشێنەکەی دان. هەمزە ئاغا و حەسەن ئاغا «دەمانچەی ڕووت» بە دەستەوە و بە سەرمدا دەگووڕێنن:

– مەیە پێش، مەیە پێش کوژراوی!

منیش دەمانچەی ڕووت بە دەستمەوە. جا بۆ درۆ و ڕاستی چەند نەفەر لەو شوێنە بوون، دەتوانن لێیان بپرسن. یەک لەوان مەلا برایمی پیاوی قازی کە پاش ئەو کەین‌وبەینە چەند کەڕەت دایکی بەقوربان کردووم کە چۆن جوابی ئاغاکانم داوەتەوە. کاتێک خۆیان ڕادەپسکاند و ڕووی دەمانچەیان تێکردبووم و دەیانگووڕاند بە سەرمدا، لێیان چوومە پێش و گوتم:

– ئای‌ئای! ئەوە دەمانچە لە ڕووی من دەگرن هەی ... بۆ نازانن دەمانچەی من لە ئی ئێوە بەکار ترە؟ هەی ...

یەک-دوو قسەی چاکی دیکەم پێگوتن و زیاتر لێیان چوومە پێش و بە سەریاندا دەمگووڕاند، چۆن! بەتەواوی تێکیان داویشت و شڵەژا بوون. ڕەئیسی ئەمنییەی خۆی دەپەنای ئاغاکان خزاندبوو و کونی مشکی پێ تەنگ بوو. لێی نیزیک بوومەوە و ڕووی دەمانچەم دە کەللەی ڕەئیسی دەگرت و ئەویش دەچوو دەپێی ئاغاکانەوە، ئەوانیش دەنێو خۆیان گرتبوو کە فیشەکی پێوە نەنێم. دەیانزانی بەڕاستیمە و خوێن و تۆڵە بەیەکەوە بەری چاویان گرتووم. جا هەر بەراستی بە قەستی کوشتنی چووبووم بەڵام هەر نەکرا بیکوژم. هات و هاوار و پاڕانەوەیەکیان بوو، نەبێتەوە. ئەوە منیش هەڵیاندەسووڕێنم، چۆن! سەریان وا لێشێواوە کە نازانن بە چ زمانێک قسەم دەگەڵ بکەن. ڕووم دە ئاغاکان کرد و پێمگوتن:

– ئاخر ئێوە چۆن لەسەر ئەو خوێڕییە دەکەنەوە؟ ئەو سەگە منی بە ناحەق گرتووە و تا سەرەمەرگێ لێیداوم، ئێستاش تا نەیتۆپێنم دەستهەڵناگرم.

ئاغاکان ئەوجا زانییان من لەوان شێتترم و بەراستیمە بۆیە، سارد بوونەوە و کەوتنە ڕەجا و پاڕانەوە کە بیبەخشم و ژن و منداڵی هەیە و چی و چی. مەلا برایم هاتە پێشم و زۆری ڕەجا لێکردم و خاوی کردمەوە. جا دیسان بە دەمانچەوە بۆیان چوومە پێش و گوتم:

– بڕۆن، خودا بە قوربانی ئەو مەلایەتان کات! ئەگەر ئەو نەبا ئێستا دەتانزانی چیم بەسەر دەهێنان.

ڕێگام بۆ چۆل کردن و ڕۆییشتن، ئێمەش ڕۆییشتینەوە بۆ شار. گیانی ڕەئیس ئەمنییەم بە تکای مەلای بەخشی، بەڵام وەها سووک و بێقیمەتم کردن کە تا دەمرن لەیادیان ناچێتەوە. تۆڵەی خۆم نەکردەوە و نەمکوشت، بەڵام بەو جۆرە کە سووک و ڕیسوام کردن، وەها هەستێکی خۆشم بوو کە دەتگوت دونیا ئی منە، کەسم بە پیاو نەدەزانی، غروورێک دایگرتبووم نەبێتەوە.

ئەوە من نازانم کە سەدری قازی ئەو باسەی بیستۆتەوە و خۆی و چەند پیاویی لە خیابان دەگەڕێن بۆ گرتنی من! منیش وەها غروور بووم کە ئەوەی فکرم لێنەدەکردەوە ئەوە بوو کە بیانهەوێ بمگرن. ئاخر من پیاوەتیم کردووە و کابرام نەکووشتووە، جا ئەگەر زانیبام ئەوانە هەر دەمگرن کابرام دەکوشت جا گرتبایانم. هاتن و گوتیان:

– سەدری قازی و پیاوەکانی لە خیابان دەسووڕێنەوە، وا بزانین خەریکە تۆ بگرێ.

– بۆ چیم لە سەدری قازی کردووە؟ بۆچی دەمن ڕۆ دێ؟

گوێم نەدایە، چوومەوە ماڵێ، بارگینم داکێشا تەویلەی و تفەنگم دا بە خورشید و بردی بۆ ژوور. دەمانچەم بە قەدەوە چوومە خیابان وەک لە من بەدەر کەس سەری پێوە نییە، ئەوەندە غەڕە ببووم و شاییم بەخۆم دەهات نەبێتەوە، کە چیم بە ئاغاکان و ڕەئیسی ئەمنییەی هێناوە.

دەگەڵکوو چوومە ئاستی شارەوانی تەماشام کرد خۆ ڕاستە، ئەوە سەدری قازی خۆی و چەند

نەفەر ئاغا و نۆکەر لێکهاڵاون و سرت و خورتیانە. دیسان گوێم نەدانێ و چوومە دوکانی «باڕۆن»[1]ی تێرم عارەق خواردەوە. پاش عارەقخواردنەوەیەکی خۆش و تاوێکی زۆر، لەوێ وەدەرکەوتم. ئەوجا تەماشام کرد هاتوونەتە چوارچرایە دەگەڕێن. پیاوێکی سەدری نێوی «بایز» بوو، ئەمن بەرەو سەرەوە دەڕۆییشتم، ئەویش لەوبەری خیابانێ دەڕۆییشت. لەوبەری ڕا چاوێکی لێهەڵتەکاندم و بە ئیشارە دەیگوت بڕۆ. منیش ئەوەندە سەرخۆشم ئاگام لەخۆم نییە و وامزانی دەگەڵ کەسێکی ترێتی. ئەوەندە مەستم، بێپەروا دەسووڕێمەوە. قازی کوڕی قازی کێیە تا حیسابی بۆ بکەم. ئەوە بەتەنیاشم و هاواڵەکانیشم کەس بەدەورەوە نییە، تاق و تەنیام. ئەوەندەم زانی، مەنسوور کوڕی قازی فەتاحی کە لەجیاتی مامە غەنی کراوە بە ڕەئیسی شارەوانی و زۆریش دەگەڵم دۆستە، هات دەستی دە دەستی نام، بە قسەکردن دە قسانی گرتم و کاتێک بەخۆمم زانی ئەوە لە شارەوانیم، لە دیوی مەنسووری. ئاخر یەکجار زۆر دۆستین. ناردی لە چایخانەی «وەهاب»ـی، چایان هێنا، هێشتا چایەکە لە گۆڕێ بوو کە یازدە نەفەر وەژوور کەوتن. لە پێشەوە مەنسوور ڕۆبوویە پیلم و ئەوانی تریش سوارم بوون. دەمانچەیان لێکردمەوە و قۆڵیان بەستم. کوڕی قازی و بایز و هەمزە ئاغای کوڕی کەریم ئاغای هاتن و بەربوونە گیانم، لێم دەدەن و دەڵێن: سەگباب، وات لێهاتووە پێشی میوانی ئێمە دەگری و تەماح لە گیانی دەکەی؟ لە ناکاو سەدری قازی و ئاغاکانیش هاتن. پێشتر باسم کرد کە بایزی پیاوی سەدری قازی بە چاو ئیشارەی دام کە بڕۆم و خۆم قوتار کەم بەڵام من گوێم نەدایە! تۆ مەڵێ، سەدری قازی و ئاغاکان چاویان لێبووە کە ئیشارەی کردووم. دەگەڵ وەژوور کەوتن، سەدری قازی بەردێکی لەدەستیدا بوو، وای لە سەری بایزی ڕاکێشا، یەکتەختە کەوت، بەوحاڵەش لێی نەبۆوە و چەند پێلاقەشی بە ورگیدا دا و بە سەریدا قیژاندی: سەگباب، مەگەر ئێمە هەموو کوێر بووین، چاوت لێدەترووکاند کە بڕوات. بایز کەلاکی کەوت و بە دارەمەیت ڕەکێشیان کرد بۆ هەیوانەکەی ئیدارەی، جا ئەوانیش کەوتنە سەرم. پاش تێهەڵدانێکی باش دە ژوورێیان کردم و چوار تفەنگچییان لەسەر دانام. ئەوە خەریکیشن بەڕێم کەن بۆ ڕەزایەی. ئەو شەوە گیرام. بۆ بەیانی چەند نەفەر هاوالانم هاتنە لام، «سەعید بابی»ـشیان دەگەڵ بوو. سەعید بابی هەم ڕووسی دەزانێ و هەم دەلاڵی ڕووسانە، لە مەیدان وڵاغیان بۆ دەکڕێت. بە وەستا برایمم گوت کە بچێتە ماڵە من و لەناو کیفی پارەیدا، کاخەزێکی چووکی تێدایە[2]، بیدات بە سەعید بابی

---

[1] (باڕۆن) ناوی پیاوێکی ئەرمەنی بوو کە لە نیزیک چوارچرای مەهاباد مەیخانەی هەبوو.

[2] دیار نییە ئەو نامەیە ناوەرۆکەکەی چییە و کاپیتانیش لە هیچ شوێنێک ئاماژەی پێنەداوە. لەوانەیە ئەو نامەیە لەلایەن حیزبی تودە لە تەورێز یان نامەیەک بێت کە لە کۆنسوولی تەورێز وەریگرتبێت یان شتێکی لەو چەشنە کە بتوانێت لە سێبەری ئەو نامەیەدا خۆی لە داو و دەهۆی دوژمنەکانی بپارێزێ و دەستی نەیارەکانی نەیانگاتێ. پێشتریش خوێندمانەوە کە کاپیتان دەڵێ: (دڵم خۆشە بوومە تەبەعەی شۆرەوی). ڕەنگە ئەو نامەیە پەیوەست بێ بەو باسەوە و بووبێتە تەبەعەی ئەو وڵاتە.

تا بیدات بەو چەند عەرووسەی کە دێن بۆ مەیدانێ بۆ وڵاغان. سەعید بابیش وەک پیاوان گوتی بۆم بێنە تا بۆ مایوری بەرم و بۆخۆشم چاکی حاڵی دەکەم.



وەستا برایم و چەند لە هاوالانم کاخەزی لە ماڵێ دێنن دەیدەن بە سەعید بابی و ئەویش دەیبات بۆ لای ڕووسەکان. زۆری نەکێشا کابرای ڕووس هات بۆ ئیدارەی. مەنسوور لەوێ نەبوو، «مستەفای زینەتی» هەمەکارەی بوو، لەسەر داوای کابرای ڕووس، مستەفا ناردی مەنسوور هات. بە مەنسووری گوت:

— ئەوەتان بۆ گرتووە؟

— قوربان من نەمگرتووە، سەدری قازی و کوڕی ... ئاغا گرتوویانە.

— لەسەر چی؟ دزی کردووە؟ تاڵانی کردووە؟

— نەخێر قوربان! لە دەرەوەی شاری پێشی بە میوانی قازی گرتووە.

— جا ئەوە بۆ وەی دەبێ بیگری؟ زوو بەرەڵلای کە زوو.

دیاربوو سەعید بابی لە دەرەوە چاکی حاڵی کابرای ڕووس کردووە. کە دەستووری بەرەڵلاکردنی منی دا ئەوجار زۆر بە ناقابلی ئیدارەی بەجێهێشت و ڕۆیی. ئەوکەڕەت سەعید هات پیاوەکانی هەمزە ئاغای تێر جنێو کرد و دەرکەی کردەوە و لە گرتووخانە دەرکەوتم.

لای خۆی دەور دەوری کوردانە! حکومەت لە شار نییە کە زوڵم بکات! عەرووسەکە قوتاری نەکردبامایە بۆ ئێوارێ بەڕێ دەکرام بۆ ڕەزایەی چونکە هەمزە ئاغا خۆی و سوارەکانی لە جێگای ئەمنیە بوون. سوارەکانی هەموو مووچەیان لە حکومەتی وەردەگرت.[1] دەو ماوە کورتەیدا دووهەم

---

[1] پاش هاتنی ڕووسەکان بۆ کوردستان و هەڵاتنی پیاوەکانی حکومەتی ئێران لە ناوچەکە، وردەوردە لەسەر ئیزنی ڕووسەکان دوو ئیدارە شارەبانی و فەرمانداری ئاوەدان کرانەوە و عەشیرەتەکان بەڕێوەیان دەبرد، بەڵام تێچووەکانی دەبوایە حکومەتی ناوەندی دابای. ئەو ڕووداوە دەبێ لە نێوان ساڵەکانی ۱۳۲۲ تا ساڵی ۱۳۲۳ ڕوویاندابێ کە عەشیرەتەکان ئاسایشی مەهابادیان درابوو دەستی.

کەڕەتە لەسەر دەستی کورد، لەسەر لێوی قەبری گەڕاومەوە. جاری پێشوو «کوڕی فڵانە ئاغای» لە سەر شەڕی زگدڕاوێ، ئێستاش «سەدری قازی». (سەدرولئیسلام)[1] خۆی بۆ نومایەندەی مەجلیسێ ڕێگای ئاواڵە دەکرد. قازیش دوو شووتی بە دەستێک هەڵدەگرت. لەلایەک دەیهەویست کوردوستان ئازاد ببێت و لەلایەکیش لە دوارۆژ دەترسا، نەیدەویست دڵی حکومەتی ئێران برەنجێنێ. لە دواییدا گوتیان لە هەموو ئاکارێک دەبی. وەنەبێ قازی حکومەتی ئێرانی خۆشبوێ، ڕقی زۆر لە حکومەت بوو. زۆر جار لێم بیستووە دەیگوت:

— **من باش دەزانم ئێران من دەکوژێ.**

## کوژرانی ڕەحمانی برام

لیرەدا ئەوەشم وەبیر هاتەوە. لە ساڵی ١٩٤١ ڕەحمانی برام کوژرا. چەند چەتە لە دۆڵی «مەیدانبەڵەکی» تووشی ڕەحمانی برام دەبن. ئەو بەبارەوە لە گەرمێن دەگەڕێتەوە بۆ سابڵاغ. شەوی جێژنی ڕەمەزانێ چەتەکان دەڕۆن بەرەو لاجان[2] و لە مەیدانبەڵەک[3] تووشی دەبن. هەوڵ دەدەن ڕووتی کەن و تاڵانی کەن، دەست نادا و دەگەڵیان دەکاتە شەڕ. تا فیشەکی قوتار دەبێ شەڕیان دەگەڵ دەکات. ئەوجار بە ١٢ کەسان پشتی لێدەگرن و ئەویش بە تاقی‌تەنێ چی پێناکریت و زۆر بە ناپیاوانە دەیکوژن. پاشی چەند ڕۆژ خەبەری کوژرانی ڕەحمانم زانی. بەپەلە خۆم گەیاندە مەیدانبەڵەکی، تەماشام کرد مەیتی ڕەحمانی هەر لەوێیە. منیش لەوێ قەبرم بۆ هەڵقەند و ناشتم. بە کوژرانی ڕەحمانی پشتم بە یەکجاری شکا. لە ژیانمدا کەلێنی ڕەحمانی بە هیچ پڕ نەدەبۆوە. با ئەوە لێرە بوەستێ.

---

[1] شەهید (ئەبولقاسم سەدری قازی) برابچووکی پێشەوا قازی محەممەد بوو کە بە (سەدری قازی) و بە (سەدرولئیسلام)ـیش بانگ دەکرا و لە ڕێکەوتی ١٠ی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ هەتاوی هاوڕێ دەگەڵ شەهیدان پێشەوا قازی محەممەد و حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی لە چوارچرای مەهاباد لە سێدارە دران.

[2] "لاجان" یا "کۆنە لاجان" گوندێکە لە ١٠ کیلۆمیتری شاری خانێ (پیرانشار) هەڵکەوتووە و هەشت کیلۆمیتریش دەگەڵ سنووری دەستکرد و خەیاڵی نێوان ئێران و عێراق دوورە.

[3] "مەیدان بەڵەک" یان "سەری مەیدانێ" ناوچەیەکی سارد، سەرسەوز، جوان، زۆزان، لەیلاخ، شاخاوی و بەرزە کە لە ٣٥ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای مەهاباد هەڵکەوتووە. لە پێدەشتەکانی گوندی خەڵیفە ڕا دەست پێدەکات تا دەگاتە لکێن.

## سوێندخواردنی دووهەمم دە کۆمەڵەدا (ژ.ک)

ئەوە سەرە بەهارە، ڕۆژی جومعەیە، لە چایخانەی دانیشتووم، دەبینم حوسێنی زێڕینگەران بانگم دەکات و بردمی بۆ گەڕانێ. پاش کەمێک سووڕانەوە گوتی بۆ لای نیوەڕۆیە وەرە باغی حاجی داودی.

— خێرە؟

— خێرە خێر.

لای نیوەڕۆیە چووم، تەماشام کرد ئەوە بێچوو توجاڕ و دەوڵەمەند، بەشێکیان لەو باغەن. سڵاوم کرد و دانیشتم. لە هەڵسوکەوتیان ڕا زانیم کە بەشی هەرە زۆریان پێیان خۆش نییە هاتوومەتە باغی. کە منیان دی، بەربوونە سرتەسەت و فسە. چی بە یەکتر دەڵێن؟ نازانم! ئەوەندەم لێحاڵی بوو کە من بەلایانەوە میوانێکی ڕەزاگرانم و پێیان خۆش نییە لەلایان دانیشتووم. یەک-دوو جار تەمام بوو هەستم بڕۆم، پاشگەز بوومەوە، گوتم با بزانم ئەو کۆبوونەوەیە چی بەسەر دێت؟! لە ناویاندا زۆرم چاو گێڕا کەسم نەدی تای من بێت، لە حوسێنی زێڕینگەران بەولاوە، هەمووی کوڕە دەوڵەمەندن. ئەویش وەکوو دەوڵەمەندەکانی لێهاتووە و کە سوێند دەخوات دەڵێ (خودا شایەدە) چونکە ئەو ئەعیانانە ئاوا سوێندێ دەخۆن، ئەوەی نەشیناسن خودایە. دەنا، شتێکی تریش دەڵێن (بیلئەخەرە)، پەککوو کە لێیان ناحەزە. یەک-دوو سەعات لەوێ بووم. دیتم دوودوو و سێسێ دەڕۆنە نێو باغی. وا دیارە داخیلی (کۆمەڵە) دەبن بەڵام کەس بە من ناڵێ. حوسێن زێڕینگەران سەری لە هەموویان قاڵتر بوو، هەر دە هاتوچۆدا بوو. کاتێک کە حوسێن چەند نەفەرێکی هەڵگرت کە بیانباتە ناو باغی، هەستام بڕۆم. لێیان پرسیم بۆ کوێ دەچی؟ منیش سەرئاوم بە بیانوو هێنایەوە. ئیتر هەستان و ڕۆییشتنم یەک بوو و هاتمەوە شار. دە دڵی خۆمدا دڵم زۆر لە حوسێنی هێشابوو. ئاخر بۆچی بانگی کردم بۆ ئەو باغە؟ بۆچی هەموو لەو باغەی ڕوویان دەگەڵ من گرژ بوو؟ خۆ حوسێن باش دەزانێ کە دانم دەگەڵ دانی دەوڵەمەند و ئاغایان ناکوڵێ! حوسێن لە هەمووکەس باشتر خدەی من دەناسێ! تاوپەڕان چوومەوە ماڵێ، خورشید گوتی:

— میرزا حوسێن دوو کەڕەت هاتۆتە ماڵێ و تۆی دەویست.

شەو کاتی نان خواردن حوسێن و «محەممەدی یاهوو» وەژوور کەوتن. زۆر بە گەرمی و هێدی دەستی کرد بە قسان:

— ئەرێ ئەوە چیت لێهات؟ بە کوێدا ون بووی؟ بۆچی گەڕایەوە؟

— حوسێن گیان، وابزانم ئەو جەماعەتەی لەوێ بوون خۆشییان لەمن نەدەهات و دڵخورد بوون بۆیە گەڕامەوە. گوتم با لێیان تێک نەدەم. بۆخۆت دەزانی من و ئەو جەماعەتەیان نەگووتووە.

— لەو قسانە گەڕێ، ڕاست بەوە با بڕۆین، کارمان زۆر پێتە.

هەڵیانگرتم یەکسەر بۆ ماڵە حوسێنی. کە چووم، سێ نەفەری تریش لەوێ بوون. هەر سێکیشیان سەید بوون. تاوێک ڕامانبوارد، پاشان حوسێن ڕاست بۆوە چوو بۆ دەرەوەی ژوورەکە و بە کەشەفێکەوە کە سەری داپۆشرابوو هاتەوە ژوور. کەشەفەکەی دانا عەرزی و شیرێکیشی لەتەنیشتی دانا و پەڕۆکەی لەسەر لابرد. لەسەر کەشەفەکە قورئانێک و ئاڵایەکی کوردوستانی لەسەر بوو. گوتیان وەرە پێشەوە و سوێندیان دام بەو ئاڵا و شیر و قورئانە. من سوێندەکەم لە دڵەوە خوارد و بە ڕاستیشم بوو. سوێندم خوارد تا ڕوحم لەبەر دایە، بۆ کورد و کوردوستان بە گیان و ماڵ حەول بدەم.[1,2] بەڵام بەشی هەرە زۆری ئەو جەماعەتە بە زۆڵێتی سوێندیان خواردبوو.

ئەوە دوو چەلە من شەریک بووم دە کۆبوونەوەی کورداندا. یەکیان پێش ڕاگواستنم بۆ شیراز بوو هەر لەو ماڵە، ئەو شەوەش هەر لەو ژوورە و لە ماڵە حوسێن زێڕینگەران.[3] شەریک بووم بەدڵ و

[1] سەبارەت بەو سوێندخواردنە و ڕادەی وەفاداری کاک حەمەد بەو سوێندە دەتوانن وتووێژی بەڕێز عەلی کەریمی دەگەڵ زیندوویاد نەجمەددین تەوحیدی بخوێننەوە لە لاپەڕەی ٣٦٠

[2] لەپاش ئەو سوێندخواردنە ژمارەی ئەندامێتی ٤٥ و ناوی نهێنی لە کۆمەڵەی ژ.ک ـدا (چکاوەند)ـی بۆ کاپیتان هەڵدەبژێرن.

[3] مەبەستی کاپیتان کاتی دامەزراندنی (حیزبی ئازادیی کوردستان)ـە. بڕواننە بابەتێکی پێوەندیدار بەو حیزبە لە لاپەڕەی ٤٧٨

گیان و ڕوحێکی پاک. هەر دوو کەڕەت سوێندم بۆ کوردوستان خوارد. هەردوو کەڕەتیش تووشی قۆرتی یەکجار گەورە بووم بەڵام دیسان لوتم لێ هەڵنەئەنگاوت و پەژیوان نەبوومەوە بگرە، جار دەگەڵ جار خۆم توندوتۆڵتر دەکرد. ئێستاش ئەوە پاشی ٢٦ساڵان لە وڵات دوور کەوتوومەوە، ٢٦ ساڵە ماڵ و منداڵم نەدیوە و لەوانەیە ئێستا بیانبینم و بمبینن، یەکتر نەناسینەوە. خۆداش دەزانێ چەند بە هەناسەساردی گەورە بوون، سەرباقی ئەوانەش خۆم لەپێش چاو نەکەوتووە و خۆم لۆمە ناکەم و شانازیی بە خۆم دەکەم و خۆم ڕووسوور دەبینم لە ئاست کوردوستان و ئەو سوێندەی خواردوومە. پێمخۆشە منداڵەکانیشم وەک من سەریان بەرز بێت و بشمبوورن کە نەمتوانی بابێک بم وەک هەموو بابان. هیوادارم ئەوانیش بۆ کورد سوێند بخۆن و بۆ کوردوستان گیانفیدا بن چونکە دەزانم ئەوانیش وەک من پەژیوان نابنەوە، هەرچی بۆ کوردوستان بیکەن، ئێستا کەمە. ئاخر هیچ لەوە ناخۆشتر نییە ئەمنییەیەک و عەجەمێک بێتە سەر ماڵت و سووکایەتیت پێبکات یا دەنا، بەناحەق تێتهەڵبدات. کورد دەبێ ئەوە قەبوڵ نەکات. مردن خۆشترە لەو حاڵە.

## یەکەم ڕاسپاردەی (کۆمەڵە)

جا گوتم داخیلی کۆمەڵە بووم. سوێندیش درابووم کە هەر ئەمرێکی پێم بسپێرن، ڕووی لێوەرنەگێڕم بەڵام هەر لە ڕۆژی هەوەڵەوە خۆشیم لە بەعزە کارێکیان نەدەهات. ئاخر ئەوەی دەو کۆمەڵەیەدا بوو، سەتی نەوەد و پێنجی ئاغاوەت و توجاڕ و سەید بوون، ئەوانەش بێزیان لە خەڵکی کاسب و زەحمەتکێش دەبۆوە هیچ، ئەوانە داخیلی هیچ شتێک نابن کە قازانجی خۆیانی تێدا نەبێ. ئەوانە کە زگیان بە خەڵکی زەحمەتێکش و داماو نەسووتێ، چۆن زگیان بە کوردوستان دەسووتێت؟ ئەوانە دەبوو داخیلی ئەو حیزبە نەکرابان. لە هەر عەشیرەتەی چەند ئاغا ... دەو حیزبە وەردەدا. من چەند نەفەر لە هاواڵەکانی خۆم نێو برد کە لەخۆم دڵسۆزتر بوو تا بیانهێنمە ناو (کۆمەڵە) کەچی، ڕازی نەبوون. شەوێک لە (کۆمەڵە) ڕا لەدوویان ناردم بچمە ماڵە «عەلی ڕیحان»ـی. کە چووم، چەند نەفەر کۆ ببوونەوە. «ڕەحمانی زەبیحی» و «مستەفا سوڵتانی» گوتیان:

– دەڕۆیە ماڵی «سەید عەلی چل سەیدان»[1]، وەزیرێک هاتووە (ئێوەکەم لەبیر نەماوە) ئەو کاخەزەی بدە بەدەستی خۆی. (وەبیرم هاتەوە نێوی «فەهمی»[2] بوو) هەرکەس گوتی بیدە بە من بۆی دەبەم، مەیدەیە، خۆت بە دەستی خۆت دە مستی بنێ.

ئاخر سوێندم بۆ خواردوون، مردن دە گۆڕێدا بێت، ئاور بێت، دەبێ خۆمی تێهاوێژم. کاخەزەم وەرگرت و ناشزانم چی دە نێو ئەو کاخەزە دایە یا چی تێدا نووسراوە! هەرچۆنێک بێت ڕۆییشتم بۆ لای مام وەزیر. دەرکەی ماڵە سەید عەلی ئاوەڵە بوو و چوومە حەسارێ. تەماشام کرد پڕە لە ئاغاوەت. کە چاویان بە من کەوت هەموو واق مان! گوتیان:

– بۆ کوێ؟

– کارم بە ئاغای وەزیرە.

هەموو عەجایب مان!

– چ کارێک؟

– کاخەزێکم پێیە و دەبێ بیدەم بە خۆی.

هەرچی کردیان کە نەچمە لای وەزیر بەڵام کەسم بە پیاو نەزانی و چوومە ژوور پێشخانەکەی. دیتم ئەوێش پڕە لە ئاغاوەت. دیسان کەسم بە پیاو نەزانی چووم بۆ ئەو وەتاغەی وەزیری لێبوو. دیتم وەزیر لەسەر کورسی دانیشتووە و دەوری وەتاغەکەش هەمووی ئاغاوەت بەپێوە

[1] سەید عەلی باوکی "باباغای حوسەینی" بوو. باباغا یەک لە مامۆستایانی مەدرەسەی "سەعادەت" بوو.

[2] ئەو وەزیرە کەسێک بووە بەناوی "دکتور خلیل فهیمی" کە لە زەمانی قاجارەکانەوە پلەی باڵای لە دەوڵەتە یەک لە دوای یەکەکانی ئێراندا هەبووە. لە پارێزگاری را تا باڵوێزی ئێران لە تورکیە و ئینگلیس؛ لە وەزیری دەرەوەی ئێران ڕا تا جێگری سەرۆک وەزیران؛ لە نوێنەرایەتی پارلەمان تا سەرۆک وەزیری ئێران بە وەکالەت پاشی تێرۆرکردنی ڕەزمئارا. لە ساڵی ١٣٣٢ھ لە تاران کۆچیدوایی کردووە. ئەو هاتنەی فەهیمی بۆ سابڵاغ لە ڕێکەوتی ١٩٤٤/٠١/١٤ واتە ڕۆژی هەینی ١٣٢٢/١٠/٢٣ هەتاوی ڕووی داوە. لە کتێبی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان - نووسینی: حامید گەوهەری - ل: ٤٧ باسی ئەو سەفەرەی فەهیمی دەکات، بەڵام دەڵێ کە کەسێک بەناوی ئیبراهیمی ئیبراهیمیان (نەوجەوان) ئەو نامەیەی داوە بە فەهیمی. وەک لێرەدا دەردەکەوێت، کاپیتان گەیاندنی ئەو نامەیە بە فەهیمی وەک یەکەمین ڕاسپاردە حیزبی خۆی پێناسە دەکات و بە وردی باسی ڕووداوەکە دەکات. بە ئەگەری زۆر هەڵەیەک لە سەرچاوەکەی کاک حامیددا ڕووی داوە یان باس لە سەفەرێکی دیکەی فەهیمی دەکات. هەروەها لە کتێبی "ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا بە پێی بەڵگەنامەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت لە نووسینی دوکتور ئەفراسیاو هەورامی و پێداچوونەوە و ئامادەکردنی سدیق سالح لاپەڕەی ١١٧ دا لە زمان ڕاپۆرتی "حەسەنۆڤ" سەرکۆنسولی یەکیەتی سۆڤیەت لە تەورێز باس لەو سەفەرەی فەهیمی دەکات، بەڵام ئەو دەڵێ کە فەهیمی سەردانی ماڵە قازی محەممەد و ماڵی کەریم ئاغا لە گوندی قومقەڵای کردووە. لەو بەڵگەنامەیەدا هیچ باسی لە ماڵی سەید عەلی چل سەیدان نەکردووە. یان سەردەانی ئەوێشی کردووە و حەسەنۆڤ نەیزانیوە یان کاپیتان لێی تێکچووە. ئەگەرێکی تریش ئەوەیە کە ڕەنگە لەجیات سەفەرێک چەند سەفەری کردبێ بۆ مەهاباد.

ڕاوەستاون. «قاسم ئاغای ئیلخانیزادە»ش[1] لای وەزیر بە پێوە ڕاوەستابوو، تەنانەت یەک کەسیشیان دانەنیشتبوون، هەموو وەک بەرچیغ چەقابوون.

دەست لەسەر سینگ چووم بۆ پێش جەنابی وەزیر. کاخەزم بۆ لەسەر میزەکەی پێشی دانا. ئەو عالەمەش وەک من سینەما بم، چاویان بڕیوەتە من. جەنابی وەزیر گوتی: این چیە؟

— من نازانم چییە!

سەری پاکەتەکەی لابرد، تەماشایەکی کاخەزەکەی کرد، دیار بوو بە کەیفێی نەبوو، هەمووی نەخوێندەوە. کاخەزەکەی دانا سەر میزەکەی و منیش سەرم بۆ دانواند و دەرکەوتم. چوومەوە لای هاوالانی کۆمەڵەم کە هێشتا بڵاوەیان نەکردبوو. هەموو نەقڵەکەم بۆ گێڕانەوە و تۆزێک ئافەرین و بژیم وەرگرت و چوومەوە ماڵێ. لام وایە وەزیرەکە نێوی «مهمی» بوو چونکە ئەو شتانە دەمێکە ڕوویانداوە و باش لەبیرم نەماوە. ئێستا کە ئەو شتانە دەنووسمەوە ساڵی ١٩٧٢یە. یانی ٣١ ساڵ لەمەوبەر بووە. زۆر شتم لەبیر نەماوە. ئەوەی دێتەوە بیرم، کەم‌وکوڕێک دەینووسم.

چەند ساڵ لەمەوبەر هەمووم بە ڕێکوپێکی نووسیبوو، کوڕێکی یەکجار باش بوو کە زۆرم جامین دەویست، ڕۆژێ جارێک نەمدیبا ئۆقرەم نەبوو، کوڕێکی دڵپاک و ڕەوشت و خووی تەمیز، ئەوەی نووسیبووم هەمووی بردە لای خۆی گوتی من هەمووت بۆ لەسەرڕا دەنووسمەوە و دەگەڵ خۆم دەیبەمەوە بۆ عێراق. کاتێک خەبەرم زانی کە ئەو کوڕە گەڕاوەتەوە عێراق و نووسراوەکانم سەری تێداچووە.[2] پاشی دوو ساڵان کوڕێکی تر نێوی «کەماڵ»[3] بوو و هاواڵی «عیزەددین» بوو، بڕێکی لە نووسراوەکانی بۆ هێنامەوە. دەشیگوت عیزەددین کاخەزی بۆ نووسیوم کە نووسراوەکانم لای کێ بووە و بۆم وەرگرتۆتەوە و دایمەوە بەڵام ئەوەی مابوو و دەستم کەوتەوە کەڵکی نەمابوو و سەرلەنوێ نووسیمنەوە.

---

[1] قاسم ئاغا ئیلخانیزادە ئەندامی کۆمەڵی ژ.ک بوو. بەپێی بەڵگەنامەکان وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت نوێنەرایەتی ژ.ک و کوردەکانی کردووە بۆ وەدەستهێنانی پشتیوانی لە کۆماری کوردستان. بڕوانە کتێبی "ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا بە پێی بەڵگەنامەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت لە نووسینی دوکتور ئەفراسیاو هەورامی و پێداچوونەوە و ئامادەکردنی سدیق سالح لاپەڕەی ١١٣

[2] مەبەستی دوکتور "عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ"ـە کە لە ڕێگای کاک ئازاد بایزەوە وتووێژێکی کورتم سەبارەت بە کاپیتان و چۆنیەتی ئاشنابوونیان و دیدارەکانیان دەگەڵ کردووە کە لە لاپەڕەی ٤٠٠ـی ئەم کتێبەی بەردەستتاندا دەتوانن بیخوێننەوە.

[3] مەبەستی دوکتور "کەماڵ مەزهەر"ـە. دوکتور کەماڵ لە کتێبی: کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا بەرگی یەکەم و چاپی دووهەم لە ساڵی ٢٠٠٩ و لاپەڕەی ٣٣٤ دا ئاوا باسی کاپیتان و دیدارەکان و ئاشنایەتییان دەکات کە دەتوانن لە لاپەڕەی ٢٨٦ ئەم کتێبەی بەردەستتاندا بیخوێننەوە.

## سەدری قازی و خۆهەڵبژاردنی وەک نومایەندە[1]


نەمر ئەبولقاسم سەدری قازی(۱۹۰۸ - ۱۹٤۷) ناسروا بە (صدرالاسلام)

جا ئەوە قازی و براکەی لەسەر جەنابی ڕەئیسی ئەمنییەی لێم تۆراون. ڕۆژێک سەدری قازی لە چوارچرایە تووشم بوو. بەتەنێ بوو و دەستێکی بۆ ڕاداشتم و بانگی کردم، منیش بە پیرییەوە چووم. سڵاوم کرد و زۆر بە گەرمی سڵاوی ساندمەوە. بە قسەکردن دەڕواتەوە بۆ لای ماڵێ و منیش بەدوویەوەم. زۆرم گلەیی لێدەکات کە بۆچی پێشم بە میوانی ئەو گرتووە؟ و جارجاریش ڕووی خۆشم دەداتێ. پاش زۆر قسە کردن و گلەییان وادەکا:

— خەریکم دەبمە نومایەندە. ئەو کەسەی ناسیاو و دۆستی تۆیە حاڵییان بکە ڕەی بۆ من دە سندوقێ باوێن.

منیش وەبازاڕ و کۆڵانان کەوتم و تووشی هەرکەسێک ببام دەمگوت بۆ سەدری قازی دەنگ دە سندوقێ باوێن، ئەو باشترە لە «ئیلخانیزادە»کان. ئاخریش بوو بە نومایەندە و چوو بۆ تاران. ئاخریش ئەو نومایەندە بوونە سەری خوارد. هەر ئەو میوانانەی خۆی بوون بە جەللادی یان هاواڵی ئەو میوانانەی بوون کە پەتیان دە ملی کرد و بە شەوی تاریک خنکاندیان.

ئاخر هەر ئەو سەدری قازییە بوو کە ئەوەندە دڵسۆزی دەنواند بۆ میوانە عەجەمەکەی، بۆ ڕەئیسی ئەمنییەکەی و خۆشیدەویست. ئەو ڕۆژە کە منیان گرت و دەمانچەکەیان لێکردمەوە، دایان بە دەستی سەدری قازی، ئەویش گەر نەیانگرتبا، بەتەما بوو لەسەر میوانە عەجەمەکەی، لەسەر ئەو ڕەئیسی ئەمنییە زاڵمەی، هەر بەو دەمانچەیەی خۆم، بمکوژێت. ئەوکاتەی کە پەتیان دەملی کرد میوانە خۆشەویستەکەی لە هیچ کوێ دیار نەبوو ڕەجای بۆ بکات تا نەیخنکێنن. بۆیە قەت نابێ پشت بە عەجەمان ببەستی.

[1] ئەبولقاسم سەدری قازی(۱۹۰۸ - ۱۹٤۷) ناسروا بە (صدرالاسلام)، کوڕی قازی عەلی و برابچووکی پێشەوا قازی محەممەد بوو. بەڕێزیان لە هەڵبژاردنەکانی خوولی چاردەهەمی مەجلیسی شووڕای میللی ئێران لە ساڵی (۱۹٤۳ز/۱۳۲۲ھ) بوو بە نوێنەری خەڵکی مەهاباد و دەوروبەری لە تاران.

## نیزیکبوونەوەی دووبارەم لە قازی محەممەد

چەند ڕۆژێک پێچوو. ڕۆژێکیان دەستێک ئەفسەری ئێران هاتن بۆ سابڵاغ و لە قازی میوان بوون. یەک لە ئەفسەرەکان سەرهەنگ بوو. قازی دەگەڵیان خەریک بوو و میوانداری لێدەکردن. بۆچی هاتوون؟ نازانین! شەو داهات و بۆ نانخواردن «سمایل» و «فەتاح»ـی هاواڵم لە ماڵە مە بوون، تەماشام کرد «حەمە شێت»ـی پیاوی قازی هاتە ماڵێ و گوتی قازی تۆی دەوێ. منیش سەرم سووڕما! ئاخر دەبێ قازی بۆچی منی بوێ؟! لە حەمە شێتم پرسی:

– منی بۆچییە قازی؟

– نازانم.

– دەی کەوایە بڕۆ بڵێ حەمەد نایەت.

هاواڵەکانم گوتیان خەمت نەبێ ئەو ئەفسەرانە هیچیان بۆ ناکرێ و ئێمە زۆرین. هەستە باچین بزانین قازی دەڵێ چی!؟ خورشیدی خێزانیشم کردبوویە بازاڕی خۆی و دەیگوت:

– دایکم مرێ و بابم مرێ ناهێڵم بچی، ئەو ئەفسەرانە هاتوون تا بتگرن. بۆخۆت نازانی کە حکومەت بە خوێنی سەرت تینووە؟ حەمە شێت هەڵیدایە:

– مەترسێ، هیچی بۆ نابێ، لام وایە ئەوشۆکە ئەو ئەفسەرانە لە شارن، حەمەد ئاگای لێیان دەبێ تا بەیانی دەڕۆن.

هەستاین چووین. لە ڕێگا تووشی «ڕەحیمی عەبدی ڕەزا» بووین. کە لە خەبەرەکەی زانی، ئەویش بە خۆی و دوو لە هاواڵەکانی دەگەڵمان هاتن. کە نیزیکەی ماڵە قازی هاتین، لام وابوو نانیان خواردبوو. دیتم ئەوە قازی و چەند نەفەر لە خزم و تایفەکەی ئەفسەرەکانیان لەژێڵڵا دەهێنا بۆ خەوتن و ئێمەش لە خیابان تووشیان بووین. سڵاوم لە قازی کرد و بە ڕوویەکی زۆر خۆشەوە وەڵامی دامەوە و گوتی:

– ئەوە هاتی؟ بەخێرێی. وەرە با بچینە ژوورێ. لەوێ پێیگوتم:

– لێرە بە با ئەو سەگانە دامەزرێنم جا دێمەوە لات. بڕێکی پێچوو و ئەوجار هاتەوە و گوتی:

– ئەوشۆ دەبێ باش ئاگاداری ئەو ئەفسەرانە بی، بەیانی فانی دەبن و دەڕۆن. ئەوە چەند نەفەری پیاوی خۆم و قۆڵسوورت دەگەڵ بێت بەڵام لەوان ئەمین نەبی بۆخۆت بەرپرسی و کەس نابێ لە قسەت دەرچێت.

ئەوە ماوەیەکە قازیش لەسەر کابرای ڕەئیسی ئەمنییەی دەگەڵم نالێکە و بێزم لێدەکات و لیم لالووتە، ئێستاش وای لێهاتووە سەر و ماڵی خۆی و میوانەکانی بە من دەسپێرێت. هەر زۆرم پێ سەیر بوو! قازی و خزمەکانی ڕۆییشتن و من و چەند نەفەر قۆڵسوور ئەو شەوە تا بەیانی نۆبەچی بووین. بەیانی کە تاو هەڵات، منیش ئامانەتەکانم [میوانەکان] بە ساغ و سڵامەتی تەسلیم بە قازی

کردەوە و هەرکەسە و چووینەوە ماڵی خۆمان. لای ئێوارێ بوو، قازی دیسان لەدوای ناردم و هەستام چووم بۆ مەحکەمەی. لەوێ چەند نەفەری لا بوو و زۆریش دەگەڵم ڕووخۆش و گەرموگوڕ بوو و گوتی:

– دەبێ بڕۆیەوە سەر کارەکەت و دەگەڵ هاواڵەکانت ئاگاتان لە گەڕەکی بازاڕ بێت.

منیش کە پەندەکەی سەدری قازیم لەبیر نەچووبۆوە کە لەسەر ڕەئیسی ئەمنییەیەکی عەجەم و زاڵم، چی بەسەرم هێنا و گەر عەرووس نەبان هەر خودا دەزانێ چییان بەسەر دێنام، بیانووم هێنایەوە و گوتم:

– هاواڵەکانم ڕازی نین و خۆشم بۆم ناکرێ.

هەرچەند فەرمووی من قەوڵم نەدایە. بیانووم هێنایەوە کە کەلوپەلمان کڕیوە و دەبێ ببەین بۆ ڕەزایەی بیانفرۆشین.


پێشەوای موعەززەمی کوردستان، نەمر محەممەد هومامی قازی (قازی محەممەد)

کاتێک هاتمەوە بەسەر چاو، هەر ئەمرێک بفەرمووی لەسەر چاومی دادەنێم. ڕاستییەکەی زۆریش لەبەر مەنسوور قازی پێم خۆش نەبوو هاوکاری بکەم چونکە، کاتێکی سەدری قازی خەریک بوو بمگرێ، مەنسوور بە دەهۆ منی بردە ئیدارەکەی و منیان گرت و لەسەر ئەو کارە کە مەنسوور دەگەڵ منی کرد نێوانم دەگەڵی زۆر ناخۆشە و دڵم زۆر لێیهێشاوە. ئاخر ئێمە زۆر دۆست بووین. ئەوە بوو کە من بیانووم بۆ قازی محەممەدیش هێنایەوە.

## پیلانگێڕیی حکومەت و ئاغاکان بۆ نانەوەی ئاژاوە لە نێوان من و «کەریم جانگیر»ـدا[1]

ئەوە ئاغاوەتی دەوروبەری شار خەریکی سەرتێداچوونمن، دەگەڕێن بە چ جۆرێک بێت، لەنێوم بەرن. نە ئەوان جامینی منیان دەوێ نە من چاکەی ئەوان. تا ئەو جێیەی بۆیان لوابێ، بۆ لەناوچوونم هەوڵیان داوە، بوغز و قینیشیان ئەوەندە زۆرە کە سێسەرەم لەسەر هەڵناگرن. ڕۆژێکییان بە سەرسووڕمانەوە چاوم لێکرد پیاوێکی «حەوڵائاغای مەنگوڕ» هاتە لام و گوتی: ئاغا دەڵێ لای نیوەڕۆیە بێت بۆ لام کارم پێیەتی. هەر زۆرم پێ سەیر بوو! دەمزانی کاری خێری پێم نییە، بەڵام نەمدەزانی چی دەبن سەری دایە؟! ناچار هەستام چووم. چوونم باشتر بوو تا نەچوونم. پاشی زۆر قسەکردن و بەسەردا هەڵگوتنم و شێر و ڕێوی هێنانەوە، گوتی: دەبێ «کەریم جانگیر» بکوژی! گوتم: بۆچی بە نۆکەرەکانی خۆت ناڵێی؟ گوتی: ئەو کارە بە تۆ دەسپێرم.

ئەو ڕۆژە زۆری شووتی وەبن هەنگڵی نام کە من شانم وایە، باڵم وا، شەوکەتم وا. «کەریم جانگیر» کوڕێکی زۆر ئازا و وریا بوو. ئەو لە دەرەوەی شاری میاندوواو و «کەلبی رەزاخان»،[2] لە کوشتنی ئەمنیبە و پیاوی حکومەت ڕانەدەوەستا. خۆیشی خەڵکی زۆری دەگەڵ نەبوو بەڵام ئەو نێوەی چاک شێواندبوو. حکومەتی ئێرانێ ئەمری بە ئاغاکانی سەردار عاشیرەت کردبوو کە من و کەریم بکوژن. «حەوڵائاغا» لەولاشەوە پیاوی ناردبوو بۆ لای کەریمی و ڕایسپاردبوو تا من بکوژێت. ئاوا بەتەمایە بە مەقسودی خۆی بگات و سووک و هاسان دە گیانی یەکترمان بەردات و من و کەریم جانگیر بە یەکتر بەکوشتن بدات. چۆن بە منی گوت کە کەریم بکوژم، ئاواش بە کەریمی گوتبوو. زۆری پێنەچوو بەهەڵکەوەت لە ناو شار دەگەڵ کەریمی یەکترمان چاو پێکەوت. ئەو هەڵی دایە و گوتی: ئاغا پیاوی بۆ لای من نارد بۆ تۆ، وشیاری خۆت بە، لەوانە ئەمین مەبە، نەکا پەندێکت بەسەر بێنن! منیش گوتم: دەنا بە منیشیان گوتووە بۆ تۆ!

جا هەردووکمان وشیار بووینەوە و لێک حاڵی بووین و زانیمان کە ئەوانە بە فیتی حکومەتی ئێرانێ بەتەمان هەردووکمان بکوژن و ئەو سەر ئێشەیە لەکۆڵ حکومەت و ئاغاکانی بکەنەوە. زۆر بە گەرمی لێک هەڵبڕاین و قەولمان دا ئەگەر خەبەرێک بوو یەکتر ئاگادار بکەینەوە.

---

[1] لە کتێبی (لە قەرەشڵاخەوە بۆ سوێد) نووسینی مامۆستا محەممەدی خزری - بەرگی یەکەم و لە لاپەڕەی ١٦٧ باس لە کەسێک دەکرێ بە ناوی (جانگیر). بەداخەوە پێشناوی (کەریم) دەگەڵ ناوەکە نەهاتووە تا مرۆڤ دڵنیا بێ کە ئەوە هەمان کەریم جانگیرە کە کاپیتان باسی دەکات یا نا!

[2] "کەلبە ڕەزاخان" گوندێکە لە سێسوچکەی مەهاباد، میاندواو و بۆکان هەڵکەوتووە. ئەو ناوە وێڕای ناوی زۆر لە گوندەکانی موکریان لە درێژەی شەرە درێژخایەنەکانی سەفەوییەکان و عوسمانییەکاندا تەتریک کراوە دەنا ناوە کوردی و ماکەکە خۆی (سەرچنار)ـە. خەڵکەکەی کورد و لە ٢٢ کیلۆمیتری باشووری شاری میاندواو هەڵکەوتووە.

## کۆمەڵەی دەوڵەمەندان و کۆمەڵەی کاسب و زەحمەتکێشان

(کۆمەڵە) منی کردۆتە داردەست. ئەوەی بۆخۆیان پێیان ناکرێ بە منی دەکەن. سوێندیشم بۆ خواردون و هەر ئەمرێکیم پێدەسپێرن بەدڵ و بەگیان بۆیان دەکەم. هەرچەندی ژن و منداڵم هەیە بەڵام نە لە مردن دەترسم و نە باکم ژن و منداڵمە، ئاخر من سوێندم بە کوردوستان و بە ئاڵای کوردوستان خواردووە، چۆن دەتوانم لە ئەمریان لا بدەم، کەچی تەماشای (کۆمەڵە) دەکەم لە سەید و ئاغا و توجارِ بەولاوە، کەس داخیلی ئەو حیزبە ناکەن. زۆر کەسم نێو گوتووە کە ئەوانە پیاوی چاکن و کوڕی ئازا و گیانلەسەردەستن بەڵام بە گوێم ناکەن و ڕازی نابن.

ڕۆژێک دەگەڵ چەند نەفەر لە هاواڵەکانم لە ماڵی «ڕەحیمی عەبدی ڕەزای» کۆبووینەوە و زۆر لەو حیزبە دواین. ئاخری هاتینە سەر ئەوەی کە لەو جەماعەتە بکێشینەوە و خۆمان هەر ئەو حیزبە ئیدارە بکەین، عالەم داخیل بکەین و گەورەی کەینەوە. هەر ئەو ڕۆژە لە هەموو گەڕەکان شوعبەمان دانا. هەر گەڕەکەی سەرۆک و نووسەری خۆی بۆ دیاری کرا.

- «سەید محەممەدی عیساقی»[ئیسحاقی] سەرۆکی گەڕەکی هەرمەنیان.
- «سەید محەممەدی حاجی سەید ڕەحمانی»[1] گەڕەکی حاجی حەسەنیان.
- «حاجی حەسەنە شەلە» گەڕەکی قولەقەبران.
- «مستەفای وسوو قەساب»[2] گەڕەکی ڕەزگەیان.
- «ڕەحیمی گەرمێنیان» گەڕەکی بازاڕی.[3]

---

[1] کورتە ژیاننامەی سەید محەممەدی سەید ڕەحمان یان سەید محەممەدی سەیدی لە لاپەڕەی ٤٣٩ ئەو کتێبەدا بخوێننەوە.

[2] ئێستا ناسناویان (داودی)یە

[3] لە پەرتووکی (سێبەری ئازادی)، نووسینی بەڕێز (کەماڵی عەبدوڵلاهی) چاپی بنکەی ژین، لە سلێمانی و ساڵی ٢٠٠٨، لاپەڕەی ٢٥٢ و ٢٥٣ لە زمانی ڕێزدار "عوبەیدیللا ئەیبوبیان"ـەوە دەڵێ: [لە سەردەمی ژ.ک لە مەهاباد، تەنانەت گەڕەکەکانیش ناوی ڕەمزییان هەبوو. بۆ نموونە "دەستەی هەڵۆ" ناوی نهێنی "گەڕەکی هەرمەنیان" و گەڕەکی "حاجی حەسەن" بوو. گەڕەکەکانی قووڵەقەبران" و "شوانان" و "ڕەزگەیان" و "مزگەوتی شادەروێشی" ناوی نهێنییان "دەستەی باز" بووە. سەرۆکی "دەستەی باز" (خاڵەمەلای داودی) و سەرۆکی "دەستەی هەڵۆ"ش، (سەید محەممەدی سەیدی) بوو. دواتر ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە پەرەیان ئەستاند و گەڕەکەکان بوونە حەوت دانە. دەستەکانی دیکەم لەبیر نەماوە، بەڵام لەبیرمە کە گەڕەکی"ڕەزگەیان" جودا بۆوە و کاک "مستەفا خاتەمی" کرا بە سەرۆکی گەڕەکەکە. گەڕەکی "هەرمەنیان"یش جۆ بۆوە و کاک (عەزیزی کوردپوور) کرا بە سەرۆکی. گەڕەکەکانی لای "مزگەوتی سەید نیزام" و "خانەقای شێخ عەلاودین"یش بوونە دەستەیەکی سەربەخۆ، بەڵام ناوی دەستەکەیانم لەبیر نەماوە]. کاک کەماڵ عەبدوڵلاهی ئاوا ڕای خۆی دەنووسێ:[ ڕێکەوتی دامەزراندنی ئەو ڕەمزانە دەگەڕێتەوە سەردەمی ڕووداوەکانی دوای خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی (مانگی ئووت و سێپتامبری ١٩٤١ی زایینی)]

لەو پێنج گەڕەکانە شۆعبەمان کردەوە و من و «میرزا برایمی گەورک» شەوانە بەو گەڕەکانەدا دەگەڕاین و بەسەرمان دەکردنەوە. کە خەلکەکە ئەوەیان دەزانێ، دەستەدەستە داخیل دەبوون و دەهاتنە ناو کۆمەڵە. هەر بەو مەرامنامەیەیَ (کۆمەڵە) سوێند دەخورا و کاریان پێدەسپێردرا و خەڵکەکەش بەدڵ و بەگیان ئامادەی گیانفیدایی بوون. ئەو خەڵکە هەمووی خەڵکی زەحمەتکێش و کاسب و فەقیرەکە بوون و هیچیان نەبوو کە دڵیانی پێ خۆش کەن، بەڵام کابرای دەوڵەمەند کەم وا هەیە دڵی بە کوردوستان بسووتێ، ئەوان هۆشێکیان هەر لەسەر سامانەکەیانە کە چۆن زیادی بکەن و لێی کەم نەبێتەوە، بۆیە کە دەوڵەمەندەکان ئەوەیان دیت کە پیر و جوان بە کۆمەڵ داخیلی (کۆمەڵە) دەبن، کێچیان دە کەوڵی کەوت. ئێمە بەبێ پرسی ئەوان ئەو گۆنگەڵەمان گێڕا و زۆریان پێناخۆش بوو، چەند کەڕەت پێیان گوتم کە ئەوە کارێکی باش نییە ئێوە کردووتانە، من جوابم ئەوە بوو و گوتم:

- بۆ خەم نابێ، هەر یەک کۆمەڵەیە و یەک مەرامە و یەک شتیَ تێدا هەیە، ئەوەی ئێوە دەوڵەمەند و ئاغای تێدایە و ئەوەی ئێمەش کاسب و زەحمەتکێشن، لای ئێوە ئەو نوقسانەی هەیە.

ئێستا (کۆمەڵە) بووەتە دوو دەستەی تێر و برسی. ئێمەی برسی و نەدار یەکجار لەوان زۆرترین، لەوان دڵسۆزترین، لەوان بێدەعێترین، لەوان زیاتر زگمان بە کوردوستان دەسووتێت، وەک ئەوان نین کە بۆ پاراستنی ماڵ و خۆڕانانێ، لە (کۆمەڵە) نیزیک ببینەوە و پاشان قسەی زەلامزەلام بکەن و خۆهەڵکێشن و لە ڕۆژی تەنگانەشدا پشتی (کۆمەڵە) بەردەین و کوردوستانمان لەبیر بچێتەوە و بە سمێڵی ئەو سوێندە پێبکەنین کە خواردومانە.

پێموایەساڵی ٤٢[١٩٤٢] یان ٤٣[١٩٤٣]یە کە ئەو شتانە ڕووی دا. ئێمە کۆمەڵەی برسییان هەمووی مانگێک نییە هەین، بەڵام ئەوان لای کەم دوو-سێ ساڵە هەن کەچی، ئێمە چەند بەرابەری ئەوانین. کە ئەوەیان دیت کێچیان دە کەوڵی کەوت و ئارام و قەراریان لێهەڵگیرا. خەبەریان نارد کە دەیانهەوێ قسەمان دەگەڵ بکەن و داوای کۆبوونەوەیان لێکردین. بۆ شەوێ دە-پازدە نەفەریان هاتن[١] وەکوو:

- عەلی ڕیحانی

---

[١] وا وێدەچێ کە ئەو کۆبوونەوەیە لە ماڵی کاپیتان گیرابێت. مامە غەنی لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسی ڕێکخراوی جەوانان دەکات و دەڵێ لە ماڵی حەمەدی مەولودی دەگەڵ کۆمەڵەی ژ.ک کۆبووینەوە و هێزەکانمان تێکەڵ کردەوە. کاپیتان حەمەد دەڵێ هەمان کۆمەڵە بوو بەڵام مامە غەنی دەڵێ ڕێکخراوی جەوانان بوو. گەر وتەکانی مامە غەنی و کاک حەمەد لە کن یەک دانێین ئەو گریمانەیە ساز دەبێ کە ڕەنگە مەبەستی کاپیتان هەمان ڕێکخراوی جەوانان بێ کە مامە غەنی لێی دواوە یا پێچەوانەکەی. لە لایەکیش کاپیتان هەم لە لاپەڕەکانی داهاتوودا و هەم لە دەق و سەرچاوەکاندا باسی لە دروستکردنی (حیزبی توده) کردووە. بڕوانە کتێبی ئاڵەکۆک - بیرەوەرییەکانی غەنی بلوریان - ل: ٣٣

- مستەفا سوڵتانی
- دوو سەیدی ماڵە چل سەیدان و ...

باقی ترم لەبیر نەماوە و کۆبوونەوەمان دەستپێکرد. پاشی زۆر هەڵسووڕاندن و بێنە و بەرە، هەردووک کومەڵەمان کردەوە بە یەک حیزب و دەستی بە کار کرد. لەلایەکی دیکەوە دەوڵەمەندەکان شەوانە عالەم بانگ دەکەن بۆ سوێند خواردن کە هەموو بەیەکەوە بۆ برایەتی تیبکۆشن و عاشیرەت زوڵم و زۆریان لێنەکات.



کەسی دووهەم لەچەپەوە: میرزا مەنافی کەریمی، میرزا مستەفا سوڵتانی یا سوڵتانیانە. کاک کاوە سوڵتانیان لە زمان کاک سولەیمان سوڵتانیان شیمانە دەکات کە کەسی سێهەم میرزا خەفووری مەحموودیان بێ و کاک حەسەنی قازیش هەر لەو بڕوایە دایە.

## کوشتنی ڕەئیسی ئاژان و ڕەئیسی سجیلی[1]

شەوێک «میرزا برایم» هاتە ماڵم و گوتی: لە ماڵە حوسێنی زێڕینگەران تۆیان دەوێ. کە چووم، حوسێن و «سەعیدی یۆسفی» و «حەمەدەمین خاتەمی» و چەند نەفەری دیکە لەوێ بوون. لام وایە زەبیحی بوو گوتی:

— بەیانی دەستێک مەعمووری ئێران دێنە شار، ڕەئیسی ئاژان و ڕەئیسی سجیلیان دەگەڵە. دەبێ هەردوو ڕەئیسی سجیل و ئاژانی لەنێو بچن، ئەوانە بۆیە دێن تا بنەی حکومەتی داکوتنەوە و جێ خۆشکەنەوە، ئێمە نابێ ئیزنی ئەو کارەیان پێبدەین.

ڕەئیسی سجیلی لە گەڕەکی «جولەکان» دەبێ و ڕەئیسی ئاژانیش لە گەڕەکی «حاجی حەسەنیان» دەبێ. هەردوو گەڕەکیش «سەید محەممەدی سەید ڕەحمان»ـی بەسەریان ڕادەگا کە دە کۆمەڵەیدا نەبوو. شەوانە خۆی و پیاوەکانی نۆبەچین. مامە غەنیش لەسەر کارە و ڕەئیسی شارەوانییە و چەند نەفەر قۆڵسووریش لە ئیدارەن و بە کاروباری شار ڕادەگەن و قازی هەر ئەمرێ بکات، ئەوان بەجێی دەگەیێنن. جا منیش نە نێوانم دەگەڵ مامە غەنی هەیە نە دەگەڵ سەید محەممەدی، ئەو ئەمرەشم پێسپێردراوە و هەر دەبێ بەجێی بگەیێنم، عیلاج نییە. هاواڵەکانم کۆکردەوە و لەناو خۆماندا ڕا و مەسڵەحەتمان کرد، چی بکەین؟ چۆن ئەو کارە قورسە ڕاپەڕێنین؟ هاتینە سەر ئەوەی دوو نەفەر بچنە سەربازخانە. لەوێ نەفەرێک لە پیاوەکانی مامە غەنی شەوانە نۆبەچی سەربازخانەیە، ئەو شەوە نۆبەی «هاشمی خەلیل تاڵانی»ـیە. لەوێ ژوورێکی لێیە دار و بارێکی زۆری تێدایە، ئەو دوو نەفەرە دەبێ بچن ئەو ژوورە ئاور تێبەردەن تا مامە غەنی بە هاواری سووتمانەوە بچێت و شار چۆل ببێت و ئێمەش بتوانین کاری خۆمان بکەین. بەڵام پێشتر دەبوایە بچم دەگەڵ سەید محەممەدی ئاشت ببمەوە و ڕازی بکەم کە هاوکارمان بێت دەو کارەدا تا بە ئاسوودەیی بچینە لای ڕەئیسەکان. جا ئەودەم «ـیان گاڵ دێ یان پەمۆغ»[2].

ئەو مانگەش مانگی ڕەمەزانە و دەبێ تا کاتی پارشێو لە هەموو کار ببینەوە. هەموو ڕێ و شوێنێکمان دانا و هەرکەسە و کاری خۆی دەزانی. شەوێ دوو نەفەر چوون بۆ سەربازخانە و من و «میرزا برایم» و «وەستا برایمی بەننا» چووینە ئیدارەکەی[3] سەید محەممەدی. چەند پیاو لەوێ بوون، بەڵام خۆی لەوێ نەبوو. چووبوو بۆ عارەق خواردنەوە. گوتیان خۆی و دوو کەسی دی لە

---

[1] ئەم ڕووداوە لە شەوی ٢٤ی ڕەزبەری ساڵی ١٩٤٣/١٣٢٢ز ڕووی داوە. بڕوانە بەڵگەی ژمارە ١١٢٠٠١ - ١١١ لە ئارشیوی سازمانی بەڵگەکانی نەتەوەیی ئێران کە بەڕێز محەممەد ڕەزا سەیفی قازی لە پەرتووکی (اسرار محاکمه قازی محەممەد و یارانش) دا چاپی کردووە. هەروەها بە پێی ئەو ڕێکەوتە کاپیتان تەمەنی ٣٥ ساڵە.

[2] لە موکریان ئەم مەتەڵەم بە "پەمۆ" بیستووە نەک بە "پەمۆغ"، ڕەنگە بەو چەشنەش هەبووبێ و من نەمبیستبێ.

[3] مەبەستی ئیدارەی "دوخانیات - دخانیات"ـە

ماڵە «ئاستێری جولەکە»ـن. منیش یەکسەر چووم. ئەوە دەمێکە یەکتر نادوێنین و شیر و تیر لێک دەسوێین و وەک کێرد و پەنیر واین، کەچی هەمووشی ئاغا و دەوڵەمەندەکان ئاژاوەیان لەنێوان ناوینەوە و ئێمەیان وا کردووە بە دوژمن کە سەری یەکتر بخۆین تا ئەوان ئاسوودە بن.

لە ماڵی «ئاستێر»ـی وەژوور کەوتین و دەگەڵ سڵاومان کرد، «سەید محەممەد» یەکپێ لەبەرمان ڕاست بۆوە و بە ڕووخساری ڕا دیار بوو کە زۆری پێخۆش بوو کە ئێمە چووینە لای. دانیشتین و تا درەنگێکی لە کاتی خواردنەوەدا گلەییەکانمان هەڵڕشت. ئەو گلەیی خۆی دەکات و منیش گازندەی خۆم، جا بۆمان دەرکەوت کە هەمووی بە قسەی دووژمنەکانمان کە دەوڵەمەند و ئاغاکان بوون لێمان بووەتە نەدواندن و دوژمنایەتی. پاشی ڕاز و گلەییان، پیلیم گرت و گوتم هەستە با بڕۆینە دەرێ. لەڕێگا تێمگەیاند کە کارم بە تۆیە و ئەو دوو کەسەی دەگەڵتن، بەڕێیان کە با برۆنەوە بۆ شوێنەکەی خۆیان. ئەوانی بەرێ کرد و سەری قسە و باسەکەی خۆمانم دەگەڵ کردەوە. پێمگوت کە دەبێ ئەو ڕەئیسانە بەو جۆرە بن. ڕازی نەدەبوو، بەڵام هەرچۆنێک بێت دڵیم نەرم کرد. ئەوە کات تا دێت نیزیک دەبێتەوە، بە دوو نەفەرەکەی کە ناردوومن بۆ سەربازخانە گوتومە کە سەعات ئەوەندە ئاورەکە بکەنەوە کەچی چاولێدەکەم دەو دەمودەستەیدا سەید محەممەد لێم پەژیوان بۆتەوە و دەڵێ:

- من بەیانی چ جوابی قازی و مامە غەنی بدەمەوە؟!
- گوتم تازە زۆر درەنگە بیر لەوە بکەیەوە. سەعات ئەوەندە ئاور دە سەربازخانە بەردەدەن و خۆت و پیاوەکانت بە هاواری سووتمانەکەوە بڕۆن، مامە غەنیش خۆی و قۆڵسوورەکانی هەموو لەوێ دەبن، ئەودەم تۆ تاوانبار نابی و کەس لێت بەشک نابێ.

بە هەزار قیر و ناری عەلی، هێنامەوە سەر ڕێگا و دڵی نەرم بۆوە. بڕێک سووڕاینەوە تا عالەم لە چایخانە و کۆڵانان بڵاوەیان کرد. ڕێک لەو کاتەی کە دامانابوو بۆ سووتاندنی سەربازخانە، گڕی ئاوری بڵیند بوو، ئەوەی نۆبەچی بوو بە هاواری سەربازخانەوە چوون. ئیتر ئێمەش وەخۆ کەوتین و چووینە ماڵە ڕەئیسی سجیلی کە نێوی «قازیزادە» بوو. زۆر سووڕاینەوە بە دەوری ماڵەکەیدا تا ڕێگایەک بدۆزینەوە و بچینە ناو ماڵەکەی، بەڵام زۆر چەتوون بوو. ناردم لە ماڵە جوولەکان نێردیوانیان دزی و هێنایان و بە پەنجەرەوەمان نا و خۆم وەسەر کەوتم. وڵات گەرمە و دیتم پەنجەرەیان ئاواڵەیە و چراکەیان خەفە کراوە. «قازیزادە» و خۆی و ژنە چوکەکەی بەیەکەوە لە خەوی شیرن دان و باقی منداڵەکانی دەگەڵ ژنە گەورەکەی لە مەرتەبەی خوارێن. چەند دەقیقەیەک خەریک بووم بۆم نەکرا بیکوژم، تەقەم لێکردبا ژنەکەشی دەگرتەوە. میرزا برایمی گەورک دەپێشدا ئاژان بوو، ئێستا ئاژانکوژە. وەسەر کەوت و لێمهاتە پێش و گوتی:

- ئەوە بۆ ڕاوەستاوی؟
- تەماشا کە، گەر تەقە بکەم ژنەکەشی وەبەر دێ.

— بەجەحەنەم، ڕێگام کە ئێستا خۆم ئەو سەگانە دەتۆپێنم.

ڕازی نەبووم و نەمهێشت. لە نەردیوان هاتمە خوار و گوتم نەردیوانەکەتان لەکوێ هێناوە، بەرنەوە جێگای خۆی و جا وەرن بە دوومدا. لەپشت ماڵە «قادر ئاغا»ـوە وەسەربانێ کەوتم و سێ نەفەریشم بەدواوە. بانە و بان چوومە ئاستی ماڵە ڕەئیسی. لەوێ نەوی بوو، چوومە خوار و هەردوو برایم گەورک و بەنناش لەدوومن. چوومە حەسار و لە داڵان دیوێکی چووکە هەبوو، دەرکەم کردەوە، تەماشام کرد ئاژانێک دە شیرینخەو دایە چۆن! ڕۆژەکەی بە ڕێگاوە بووە و ئەوەندە شەکەت و ماندوویە کە ئاگای لەو هەموو تەپەتەپ و چوونی ئێمە نەبوو و وشیار نەبۆوە. چوومە سەری ڕاستم کردەوە و دەمانچەکەم لەژێر سەری دەرهێنا و وەپێش خۆم دا تا دەرکەی دیوی ڕەئیسیم پێشان بدات. پرسیم:

— لەو دیوەی چرای خەفە کراوە، کێی لێیە؟

— منداڵەکانی دەگەڵ ژنە گەورەکەی لیرە خەوتوون و خۆشی لەسەرەوە دەگەڵ ژنە جحێڵەکەی نوستوون.

ژوورەکەی پێشان دام کە لەسەر پلیکانان بوو. لەو عانەشدا دەرکەی ماڵە ڕەئیسی کراوەتەوە و هەموو هاواڵەکانم هاتوونە ژوور و لە داڵانەکەی دان. لە پلیکانان وەسەر کەوتم و دەستم بە دەرکەی ژووری ڕەئیسەوە نا، بەڵام لەو دیو گاڵە درابوو. کەڕەتی دواوە دەرکەم تووند کێشا کراوە. ڕەئیس کە منی دیت، ڕاست بۆوە سەر قوون و دەستی بۆ ژێر سەری برد. دەست بردن بۆ دەمانچەکەی و تەقاندنی یەک بوو. زوو خۆم لانەدابا، کوشتبوومی. ئەوجار هەستاوەتە سەرپێ و تەقەمان لێدەکات و ژنەکەشی لێفەی دەخۆی وەرپێچاوە و دەزریکێنێ، چۆن! لەپەنا دەرکەی ڕا دەمانچەیەکم لە ڕەئیسی دا، دەمانچەکەی لەدەست بەربۆوە. دوو دەمانچەی تریشم تێهەڵکرد، بەڵام نەکەوت. لەولای ڕا «وەستا برایم» تفەنگێکی لێدا و لەسەر عەرزی درێژی کرد. ئیستا ژنەکەی دەپاڕێتەوە و دەڵێ:

— مرا دست نزن تو را به خدا. [بیکە بۆ خاتری خودای دەستم لێ مەدە]

— مەیکە هەرا، کەس کاری بە تۆ نییە.

ئەدی ژنەتیو نەیدەزانی بۆ ئەوەی ئەوی وەبەر نەدەین زۆر وەدرەنگی کەوتووین و دەبێ بەپەلە بڕۆینە گیانی ڕەئیسی ئاژان. ئەوە زۆری نەماوە بۆ پارشێو، بەپەلەین، دەبێ بڕۆین، تەماشام کرد «سەید محەممەد» خۆی و دوو نەفەر لە حەسار بوون دەگەڵ هاواڵەکانی من. کە تەقە کرا، وەسەر کەوتن و هاتنە ژوورەکەی ڕەئیسی لای ئێمە. لەو نێوەدا دەمانچەی ڕەئیسی ون بوو. لام وایە «سەید محەممەد» هەڵیگرتبوو، چونکە هاواڵەکانم هیچکات دەگەڵ من درۆیان نەدەکرد و لێیان ئەرخەیان بووم. ئێستاشی دەگەڵ بێت «سەید محەممەد» نەچوو ژێری. زۆر بە تاڵووکە گوتی: ئەمن دەبێ بڕۆمەوە بۆ سەربازخانە. ئێمەش بۆ لای ماڵە ڕەئیسی ئاژانێ چووین تا کاری ئەویش تەواو کەین.

ئەوە هات و ڕابرد، بەڵام هەر نەمزانی کە ڕەئیسی ئاژان چۆنی زانیبوو و کێ ئاگاداری کردبۆوە و بە لیباسی شەخسی ڕای کردبوو و چووبوو نێو باغان؟! دوایە بیستمانەوە کە «عەلی ڕەحمەتی» ماشێنی بۆ بردبوو و هەر ئەو شەوە تا میاندواوێی بەند نەکردبوو. ئەو دوو ڕەئیسە دەگەڵ سێ نەفەر ئاژان هاتبوونە شارەکەمان تا جێگای خۆیان خۆش کەن و ئەو قۆڵسوورانەی مامە غەنیش تا کاتی خۆی لەجێی ئاژان بن دەنا، لەسەر (کۆمەڵە) و خەڵکەکە ببنە سیخوڕ و ئەوەندە ئازادییەمان لێتێکدەنەوە و دیسان ئاژان و ئەمنییەی زاڵم لەسەرمان ببێتەوە کەڵەگا. مامە غەنی لەپێشدا لە فەرمانداری کاری دەکرد و داژدار و لاگیری ئێرانییەکان بوو. بوو بە پارشێو، عالەم لەماڵ هاتنە دەر بۆ مزگەوت و حەمام دەڕۆن و ئێمەش ڕەئیسی ئاژانمان دەستگیر نەبوو. هاواڵەکانم ناعیلاج هەرکەسە چوویەوە ماڵە خۆی. منیش چوومەوە ماڵ و زۆر شەکەت بووم و یەکسەر بۆی نووستم.



ئەمر حوسێنی زێڕینگەران (فروهەر) ئەو وێنەیە لەساڵی ۱۳۲۰ لە شاری شیراز گیراوە کاتێک دەگەڵ کاپیتان حەمەدی بۆ ئەو شارە تارێندراون. ئەم وێنەیە لە وێبلاگی وێنەکانی کۆماری کوردستان وەرگیراوە.

تاوێکی پێچوو تەماشا دەکەم «خورشید» هاتووە و خەبەرم دەکاتەوە بە پەشۆکاوی دەڵێ:

- هەستە، ئەوشۆ ڕەئیس کوژراوە. عالەمێکی زۆر لە خیابان کۆبۆتەوە، قازیش لەنێویانە. ڕاستیم پێبڵێ، ئەوە کاری تۆیە یا نا؟

زوو لێی تووڕە بووم و نەمهێشت جارێکی دی باسی بکاتەوە. نان و چای بەیانیم خوارد و چوومە خیابانێ. تەماشام کرد بەردەرکی ماڵی «قازیزادەی» عالەمێکی زۆری لێکۆبۆتەوە و «قازی»ش کورسییان بۆ داناوە و وەسەری کەوتووە و نوتقێ[1] بۆ عالەمێ دەکات. چوومە نێو

[1] قسە کردن بۆ ئاپۆڕای خەڵک بە دەنگی بەرز. ڕێشەی ئەو وشەیە عارەبی‌یە و پەڕیوەتە زمانی کوردییەوە.

خەڵکەکە تا گوێ بۆ «قازی» هەڵخەم، کەچی دەبینم هەموو خێسەم لێدەکەن، سوور دەزانن کاری منە. ئاغاوەتی مەنگور و مامەش و هەموو عاشیرەتەکان هاتوونە تەماشایە و لە خەمی «قازیزادە» دان و خێسەش لەمن دەکەن. منیش گوێم داوە بە قازی و کەسیش بە پیاو نازانم. قازی دەڵێ:

— ئەو «قازیزادە»ـیە لەوەپێش لە شاری ئێمە بووە، ڕەئیسی ئەو شارە بووە، داخوا زوڵمی لە کێ کردووە کە ئێستا بەو دەردە چووە.

زۆری تری لەسەر ڕۆیی و لە عەینی قسانیشدا جارجار چاوێک لە من دەکات. منیش لە خۆڕا دڵم بەو چاوانەی قازی خۆش بوو. ئەو زەمانیش دەور دەوری عەشایرە، هەرکەسھەرکەسە. سابڵاغ لەنێو ئاغاکانەوە بەش کراوە، بەنۆبە هەر ڕۆژەو ئاغایەک حکوماتی شارە. هەموو ئاغاوەتی عەشایر دە شاری خزاون. لەلایەک ئێران کۆپین دەدات بە ئاغاوەتەکان و قەند و شەکری پێوەردەگرن و سەری عەشایر بەو قەند و شەکرە گەرم دەکەن تا بەقسەی ئەوان بکەن و پیاوی ئەوان بێننەوە، لەولاشەوە حوسێنی زێڕینگەران کە لە گومرگ کار دەکات و خۆیشی هەمەکارەی کۆمەڵەیە، بە کۆپین زۆر ئاغای داخیلی کۆمەڵەی کردوون.[1]

## داو و دەهۆی ئاغاوەتان بۆ لەناوبردنم

ئەو ڕۆژە مەیتی «قازیزادە»ـیان بردە نێو قەبران و شاردیانەوە. ئەو سەردار عاشیرەتانە هەر دەتگوت بابیان کوژراوە، ئەوەندە خەمبار بوون. ئیتر هێندەی دی لەمن بە ڕقدا چوون و ناشوێرن بە ئاشکرا لەنێوم بەرن. لەمن ناترسێن، لەو کاخەزەی دەباخەڵم دایە دەترسێن. ئەوجا خەریکن بە جورێکی دیکە دەگەڵم ببزوونەوە. منیش بەرم داوەتە بێعارێ و ئەوانیش وەختە شەق بەرن. دەوڵەمەندەکانی شار لە ئاغاکان زیاتر ددانیان لێ دەچیرەوە دەبردم. ڕۆژ نەبوو نەچنە لای قازی و درۆ هەڵنەبەستن و بۆم تێنەچێنن. قازیش زۆریان گوێ بۆ شل ناکا.

لەوەتا حکومەت دەستەڵاتی کەم بۆتەوە، کار و کاسبی منیش خۆش بووە و لە عێراقێ ڕا باری قاچاغ هاسانتر و زۆرتر دەگاتێ و لێرەش ڕا بۆ ئەوێ هەر وایە. خەڵکێکی زۆری برسی و بێکارم دەکارێ وەرداوە و کارم بۆدەکەن و بارم لە عێراقێ ڕا بۆ دێنن و منیش یا بۆخۆم دەیبەم یا بە خەڵکیدا دەینێرم بە عەجەمانی دەفرۆشمەوە. جیا لەوەی شەوانە لە قومار دەیدۆڕێنم، دوو باغم کڕیوە و مێشەیەکیشم لە کوری «حاجی کەریم شیری» کڕیوە. کەیفم باشە و نە باغەڵم جێگای ئەو هەموو پووڵەی دەبێتەوە، نە لەماڵێ بۆم هەڵدەگیرێت.

زیاتر لە مانگێک بە سەر کوژرانی «قازیزادە»ـیدا بەسەر چووبوو. لەترسی تاڵانی عەشایران هەر گەڕەکە و کێشکچی خۆی هەبوو. ڕۆژێکی «قازی» ناردی لەدووم و هەستام چووم. گوتی:

---

[1] بڕواننە کتێبی: ئاڵەکۆک، نووسینی: غەنی بلوریان، کۆکردنەوەی: حامید گەوهەری، لاپەڕەی ٢٩

— ئێستا «سەید محەممەدی سەیدی» گەڕەکی حاجی حەسەنیانی بەدەستە، «سەید پیرە»ـش هەم بە گەڕەکی هەرمەنیان ڕادەگا و هەم بە گەڕەکی بازاڕی، ئاوا کورت دێنێ، با ئەو هەر بە گەڕەکی هەرمەنیان ڕابگات و تۆش دەبێ بەسەر گەڕەکی بازاڕێ ڕابگەی.

من لە داخی دەوڵەمەند و ئاغایان نەمویست خۆ دەو بەزمەی وەردەم، زۆرم بیانوو هێناوە، سوودی نەبوو. گوتم چەند نەفەر پیاوی باش ڕادەگرم و من مووچەیان دەدەمێ تا لەجیاتی من ئەو کارە ڕاپەڕێنن، دیسان لێی قەبوڵ نەکردم. ناچار وەدەر کەوتم. لەو هاوالانەی خۆم شەش نەفەرم هێنایە کایەوە. هەمووی تفەنگی خۆیان هەبوو و زۆر ئازا بوون. ئەو گەڕەکە زۆر موهلەکە بوو چونکە دوکان و بازاڕ و قەیسەری دەبا شەوانە لە دەوروبەری بگەرێی و بسووڕێیەوە. ئاغاوەت چاویان تێبڕیبوو تاڵانی کەن.

ڕۆژێک خەبەر هات کە لە گەڕەکی حاجی حەسەنیان دوکانی پارچە و کوتاڵی «دەروێشە جوولەکەیان» بڕیوە. ئەوە هەمان گەڕەکە کە «سەید محەممەد سەیدی» بەسەری ڕادەگات. لای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بوو، لە دوکانی «حاجی ڕەحمانی چەڵەبی» بووم، ئەویش حاجی ڕەحمان بۆخۆی بانگی کردم. دیار بوو فێر کرابوو. وای دە قسان گرتم کە سەری لێشێواندبووم. لەو قسەی کۆتایی دەهات، بۆ لایەکی دی دەڕۆیی، ئەوەندەم زانی «حەوڵای بایز ئاغای» و «بایزی عەزیز ئاغای» و سێ ئاغای دی هاتنە بەر دوکانی حاجی ڕەحمانی. لەوێ بەربوونە قسەکردن دەگەڵ حاجی. ئەوە چەند دەقیقەیە ئێمە لە دوکان دانیشتووین، بەڵام ئەوان دانانیشن و بە حەواوە قسە دەگەڵ حاجی دەکەن. ئەوە ناشزانم کە داویان بۆ داناومەوە و حاجی ئەوان فێریان کردووە کە من بانگ بکات و ئەوانیش من لەوێ ڕەپەچێک دەن. واشبوو، تفەنگم لە تەنیشت خۆم هەڵپەساردبوو، ئەوەندەم زانی ڕۆبوونە تفەنگم و ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو، دەمانچە و خەنجەریان لێکردمەوە و چەند نەفەر نۆکەر کە خۆیان لە قەیسەریدا مات کردبوو هاتن و قۆڵیان بەستم و بە نێو قەیسەریدا بۆ مزڵی «بایزی عەزیز ئاغای» وەپێش خۆیان دام.

لە ڕێگادا یەک بە خۆیان دەیانگوڕاند کە ئەوە دوکانی «دەروێشە جوی» بڕیوە. توجارەکانیش شاییان دە دڵیدا دەگەڕا. گوێم لێبوو «مەجیدی کەرباسی» گوتی:

— دە بیبەن و ئەو بەڵایەمان لەکۆڵ کەنەوە.

بەڵێ، بەو حاڵە و بەو دەردە بردیانم و بە دەستبەستراوی دە ژوورێکیان کردم و چوار نەفەر کێشکچیشیان بە تفەنگەوە بۆ دانام. هەر ئەو کاتەش ناردبوویان بۆ «ڕەزایە»ـی[1] تا ماشین و ئەمنییە بێن بۆ ئەوێم ڕاگوێزن. هێندەی پێنەچوو «هەباسە کورد»ـیشیان هێنا و دەپاڵ منیان کرد. «هەباس» هەر دۆعا لەو کەسە دەکا کە ئەو کارەی دەگەڵ کردووە و ئەوی تووشی ئەو بەڵایە

[1] مەبەست شاری "ورمێ یا ئورمییە"ـیە کە ١٢٠ کیلۆمیتر لە باکووری مەهاباد هەڵکەوتووە.

کردووە. جارجار وەختە بگری و منیش دڵی دەدەمەوە و هێوری دەکەمەوە. ئەوە ناشزانم کە ئاغاکان «هەباسە کورد» و «مستەفای زینەتی» دەگەڵ چەند نۆکەری خۆیان ناردووە دوکانی دەروێشە جووی ببڕن. ئەو داوەیان بۆ منە تا من دەگیر کەوم، بەڵام حەق ڕێگای خۆی ون ناکات.

«سەید محەممەدی حاجی سەید ڕەحمان» لەو گەڕەکە ئاشنای ژنێکە. لای نێوەڕۆ خۆی و «مەحموود» نێوێک کە پیاوێتی، دەچێت بۆ لای ئەو ژنە. تەماشا دەکات ژنێک لەوێیە و تەلیسێکی بە کۆڵەوەیە و بۆ کویی دەبا، کەس نازانی!

ژنەکەی ڕادەگرێ، کۆڵەکەی پێدادەنێ، زاری تەلیسەکەی دەکاتەوە دەبینێ هەمووی پارچە و کوتاڵی «دەروێشە جوو»ـیە کە لێیان دزیوە و ژنەکەش ژنی «هەباسە کوردی»ـیە! ئەوە هەباسە کوردیش دەگەڵ من گیراوە. ژنەی وەپێش خۆیان دەدەن و دەگەڵ هاواڵەکانی من دەڕۆنە لای «سەعید بابی» کە دەلاڵی ڕووسەکانە. باش حاڵی دەکەن و ئەویش دەگەڵ «سەید محەممەد» و هاواڵەکانم دەچێتە کن «عەبدوڵلایۆف»ـی کە کابرایەکی ڕووسە و وڵاغان دەکڕی بۆ ڕووسەکان و بۆی باس دەکەن کە ئەوە داوی ئاغاکانە بۆ منیان ناوەتەوە، ئەویش دەڵێ: چەند جارێک ئاغاکان هاتوونەتە لام و گوتویانە کە ئەو کابرایە دزە و پیاوکوژە با بیکوژین. بەڵام عەبدوڵلائۆف لییان تووڕە بووە.

ئێستا کوتاڵەکە دۆزراوەتەوە و «سەعید بابی»ش چۆتە لای «عەبدوڵلایۆف»ـی و تێیگەیاندووە کە دونیا چ باسە. ئەوەندەم زانی «سەید محەممەدی سەیدی»، خۆی و چەند نەفەر بە گوڕەگوڕ وەژوور مزڵی «بایزی عەزیز ئاغای» کەوتن و ژنەکەی هەباسە کوردیشیان دەگەڵە و کۆڵە کوتاڵەکەش بە کۆڵی پیاوێکی سەید محەممەدەوەیە. ئەوجار قۆڵیان کردمەوە. ئەگەر سەعاتێکی دی پێچووبا، ماشین و چەند نەفەر لە ڕەزایە ڕا هاتبوون بۆ من بمبەن بۆ ڕەزایە و لەناوم بەرن، بەڵام لە «باغی حەسەن خانی» پیاوەکانی ئاغاکان گیرابوویاننەوە. ئەوە پاشان بۆیان گێڕامەوە.

«سەعید بابی» کە هات ئاغاکان لەماڵ نەبوون. تفەنگ و دەمانچەکەیان بۆ وەرگرتمەوە و لەخۆم بەست و فیشەکم دەبەر نا بۆ «هەباسە کورد»ـی چووم تا بیکوژم، کەچی «سەید محەممەد» پیلی گرتم و نەیهێشت دەنا، وەسەر خوداکەیم دەکردەوە. ئاخر بۆخۆی دەنێو ئەو پیلانەدا بوو. لەولاش هەر دۆعای لەو کەسە دەکرد کە تووشی ئەو کارەی کردووە. وا دەکرووزایەوە کە لەسەر حاڵی خۆم ڕا بەزەییم بەو خوێڕییە دەهاتەوە. تۆ مەڵێ بە ساختە دە پاڵ منیان کردبوو و بەخۆشییەوە هەر لە خۆیشی ئاشکرا بوو.

ئەو ئاغا و دەوڵەمەندانە پیلانی وایان بۆ دەگێڕام کە هاواری سەر و ماڵ بوو، هیچیش سەری نەگرت بۆیان، هەموو پووچەڵ بوو. نە لە بوختانپێکردنم دەوەستان، نە بە ناوزڕاندنم بە دز و تاڵانچی. خەڵکیان دەترساند کە وێم نەکەون. داویان بۆ دادەنامەوە کە بکوژرێم و لەناوم بەرن. شاربەدەریان دەکردم. بۆیە منیش قەتم جامین نەدەویستن و ئەوەی بۆم کرابا دەگەڵیانم دەکرد.

ئەوانە نەیاندەزانی کە لە زیادیان دەژیم و چەند کەڕەت دەگەڵ مردن دەستەملان بووم سەرباقی ئەوەش، سەرم بۆ کەس دانەنواندووە. ئەگەر بۆشم نەلوابێ کە لەسەر ناحەقێ وەدەنگ بێم، ئەوە ڕۆژی خۆی تۆڵەی خۆمم ئەستاندۆتەوە و نەمهێشتووە لەسەر دڵم بمێنێتەوە. جا چ دەڵێن با بڵێن، چییان بۆ ناچێتە سەر. حەق ڕێگای خۆی ون ناکا.

## داوێکی دیکەی ئاغایان بۆ لەناوبردنم



هەر دەو ساڵەدا دەستێک ئاژان و ڕەئیس و دەستە و دایرەی ئێران لەنەکاو هاتنە شار و جێگای خۆیان خۆش کرد. هەر ئەو ڕۆژەش وەکوو پێشوو دەستیان بە کار کرد. نەمانهێشت جێ قوونیان خۆش کەن، کە شەو داهات چووینە سەریان و کردمان بە تەقە.[1] ئەوان لە ژوورێ و ئێمەش لە دەوروبەری ئیدارەی. نۆکەری ئاغاکانیش بە کۆمەگی وانەوە هاتوون، بەڵام شەوە و کەس کەس نابینێت. هەرچەند حەوڵمان دا بۆمان دەرنەکران. بە ئاغاوەت پشتەستوور بوون. تا لای نیوەشەوێ دەگەڵیان خەریک بووین، بۆمان دەرنەکران. ناچار هەرکەسە چۆوە ماڵی خۆی. بەیانی نان و چام خوارد و وەدەرکەوتم بۆ لای خیابانێ. ئەوەندەم زانی دەورە درام. شازدە نەفەر پیاوی مەنگوڕ و مامەش و گەورک، بردیانم بۆ شارەوانی. پڕ بوو لە ئاغاوەت. قۆڵپێچ دە ژوورێیان کردم. ئەوە قۆڵم بەستراوە،

---

[1] سەبارەت بەو گوشارەی کە کاپیتان و هاواڵەکانی لە مەهاباد هێنابوویانە سەر پیاوانی حکومەت تا لەو شارە جێ خۆش نەکەن، بەڵگەیەک لە لاپەڕەی ٤٧٦ دانراوە کە تێیدا دڵەڕاوکێی کاربەدەستانی دەوڵەت پێشان دەدا و داوا لە سەرۆک وەزیر دەکەن تا بە هانایانەوە بچن.

تەماشا دەکەم «پیرۆت ئاغای برازای قەرەنی ئاغای» لێم وەژووریَ کەوت و خەنجەری لێکێشام کە ورگم بدڕێ، دەستیان گرت. «سوارەی ئەحمەدی گوڵاوی ئاغای» گوتی: دەستی خۆت لەوە پیس مەکە! پێشیان گرت و بۆ دەرەوەیان برد، بەڵام چەند نەفەر ئاژان و پیاوی ئاغایان لەسەر دانام. دیسان ئەوە خەریکن بۆ «ڕەزایە»م بەڕی بکەن و لەوێ لەناوم بەرن. کەمێک پێچوو ئاغا بڵاوەیان کرد، ڕەئیسی ئاژانیش بە جوێ وەدەر کەوت. «مامە غەنی» ئەو ئیدارەیەی هەڵدەسووڕێنێ و ئەویش ئەوە لەوێیە.

زۆری نەکێشا، ئەوەندەم زانی چوار نەفەر مەلائیکە[1] لە ئاسمان هاتنە خوار و یەکسەر بۆ ئیدارەی وەسەر کەوتن و بە نێوچاوانی گرژەوە چوون دە دیوی ڕەئیسێوە. ڕەئیس بۆخۆی لەوێ نەبوو، بەڵام «مامە غەنی» لەوێیە. ئەوەندەم زانی «مامە غەنی» وەپێش ئەفسەرەکان کەوت و هاتن بۆ ئەو ژوورەی کە من لێی بەند بووم. بە پیاوی ئاغاکانیان گوت کە قۆڵم بکەنەوە و ئەوانیش کردیانەوە. ئەوجار چووینە ژووری «مامە غەنی». ئێستا لە «مامە غەنی» دەپرسن:

— ئەوەت بۆ گرتووە؟

ئەویش حاشای دەکرد و دەیگوت: ئەمن نەمگرتووە، ڕەئیس و ئاغاکان گرتوویانە.

— لەسەر چی گیراوە؟

— شەو ئیدارەی داوەتە بەر تفەنگ.

پاشی ئەوەی کە چەند پرسیارێکی دیکەی لێکرد، لێی پرسی:

— کەنگێ گرتووتانە؟

— شەو لە کاتی تەقە کردندا گرتوومانە.

کابرا بە دەنگێکی بڵیند هەڵیدایە:

— نەخێر درۆ دەکەی، بەیانی تاوبان هەڵاتووە و لە چەقی خیابانێ پیاوی ئاغاوەت گرتوویانە.

ئیتر زۆر بەسەر «مامە غەنی»ـدا ڕۆییشتن و قسەیان پێگوت. ئەوجار ئەفسەرەکان ڕوویان دەمن کرد:

— دەگەڵی ئاشت دەبێوە؟ دەیبەخشی؟

منیش کە چاوسووری خۆم دیوە و پشتم ئەستوورە، چاوم قوچاند و ...

کە وەخۆ هاتینەوە دیتمان لە ئێمە و «مامە غەنی» بەولاوە، کەس لەو ئیدارەیەیدا نەماوە، ئەوانەی نۆبەچیم بوون و پیاوی ئاغاکان بوون، ڕایانکردووە. پاشی قسەکردنێکی زۆر بە منیان گوت تۆش بچۆوە ماڵێ و بحەسێوە و جا لەوێ وەدەر کەوتین. ئەوان سواری ماشێن بوون و ڕۆییشتن. کە هاتمە خیابانێ تەماشا دەکەم پڕە لە خەڵک و هەموو هاتوون سەیری من دەکەن. با ئەوەش

---

[1] مەبەستی ئەفسەری ڕووسەکانە.

بڵێم کە ئەوکارە کە کردوومە و شەوێ چووم دەگەڵ هاواڵەکانم ئیدارەی ئاژانمان داوەتە بەر تفەنگان، (کۆمەڵە) هیچ خەبەری نییە، لەخۆمانەوە ئەو کارەمان کردبوو. نەماندەویست کە حکومەت جێ خۆش بکاتەوە و ئاغاوەت بەهێز ببنەوە و دیسان زوڵم و زۆرێ بکەن. گەلێک کار (کۆمەڵە) خەبەری نەبوو کە دەمانکرد چونکە سیخوڕی زۆر تێخزابوو.

## گرتنی ئیدارەی پۆلیس و کوشتنی ئاژانەکان

ئەوە «قازی» گەڕەکی بازاڕی بە من ئەسپاردووە و شەو تا بەیانی لەوێ کێشکێ دەکێشم و ئاگام لە بازاڕە. بە شەو لە بازاڕم و بە ڕۆژیش دەنووم. زۆری کێشا یان کەم، ڕۆژێک کە هاتبوومەوە ماڵ و لە خەوێکی قورسدا بووم، خورشید هات ڕاپەڕاندم و گوتی لەنێو شار تەقەیە. ڕاست بوومەوە و چوومە خیابانێ. لەوێ پرسیم و گوتیان کە «عەزیز خانی کوڕی گەنجاڵی بەگی» لە خیابان نوتقی کردووە و بە فەرمانداری گوتووە کە دەبێ لە شار بڕۆێ! عالەم چووبوون بۆ ئیدارەی شارەوانی و ئەو ئاژانی دەنێو ئیدارەی دابوون، هەموویان کوشتبوون. دەو نێوەدا «عەبدوڵڵای کوڕی مینە خاڵندی» کوژراوە و بە کوشتنی عەبدوڵڵا، خەڵکەکە هەموو ئاژانەکان دەکوژن و ڕەئیسی ئاژانیش ڕا دەکات.[1] بۆ لای ئیدارەی چووم تا بزانم چ بە چییە! تەماشام کرد ئیدارە داری لەسەر بەردی نەماوە. لە ژووری ئیدارەی هەشت-نۆ



ئیدارەی پۆلیسی سابڵاغ

[1] ئەو ڕووداوە بە بەربڵاوی و بە وردەڕێشاڵەوە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا باسی لێکراوە. ئێوە بۆ وەدەستهێنانی زانیاری زیاتر دەتوانن سەردانی ئەم سەرچاوانە بفەرمون: کتێبی (کورتە مێژووی بنەماڵەی قازی لەویلایەتی موکری - نووسینی:خەلیلی فەتاحی قازی - وەرگێڕ و ئامادەکار: حەسەنی قازی ل: ١١٣ کتێبی: جمهوری ١٩٤٦ کوردستان - نووسینی ویلیام ئیگڵتۆن - وەرگێڕانی: سید محمد صمدی ل: ٥٠ کتێبی: ئاڵەکۆک، نووسینی: غەنی بلووریان، کۆکردنەوەی و ئامادەکردنی: حامید گەوهەری ل: ٢٤ کتێبی: مێژووی کورد لە سەدەی ١٩ و ٢٠ دا، وەرگێڕانی: محەممەد ڕیانی، چاپی یەکەم، ل: ٣٦٤

کەلاکە ئاژان لە گۆڕێ کەوتووە. میز و سەندەڵی ئیدارەی تێکووپێک شکاوە و لە حەساری فڕێدراون. پاشان چووم بۆ لای ماڵە عەبدوڵلای. گوتیان مەیتەکەیان بردۆتەوە ماڵێ. دیتم کە عالەمێکی زۆر کۆبۆتەوە و هەمووشی کاسب و کوسووبە. بۆ لای تاوپەڕان مەیتی عەبدوڵلامان بە گڵ سپارد و گەڕاینەوە شار. تەماشام کرد ئەوە چەند ئەفسەری ڕووس لەبەر دەرکی ئیدارەی ڕاوەستاون و لە کوشتاری ئەو ئیدارەیە دەپرسن. بڕێک لە دەوروبەری ئیدارە سووڕانەوە و سواری ماشێن بوون و ڕۆییشتن. منیش بۆ لای ماڵێ گەڕامەوە. کە چوومەوە ماڵێ دەبینم ئاژانێک لە ژووری دانیشتووە. خورشید گوتی:

— نەکەی عاجزی کەی، زیاد لە هەموو ماڵەکانی ئەو شارەی، خۆی دەماڵە ئێمە هاویشتووە.

ئاژان نێوی «غوڵام حوسێن»ـە لەپێشدا زۆر دەترسا و منیش دڵخۆشیم داوە و ئەهوەن بۆوە. گوتم ترست نەبێ، بەڕێت دەکەم بۆ میاندواو. دوو ڕۆژ ڕامگرت پاشان ماشێنم بۆ گرت و تا چاپخانەی «گوێکتەپە»ـی[1] دەگەڵی چووم و لەوێش ڕا ڕەوانەم کرد.

## کۆبوونەوەی هەموو سەرداری عەشایری موکریان بۆ لەناوبردنم

چەند ڕۆژ پێچوو، ڕۆژێک تەواوی ئاغاوەت لە هەموو تایفەی عەشایر، دەستەدەستە دەڕۆن بۆ کۆنە فەرمانداری. کەس نازانێ چ باسە و ئەوەی خەبەریشی هەیە دەنگ ناکات و بە کەس ناڵێ! هەر ئاغایە و چەند نۆکەر و پیاوی بەچەکەوە دەگەڵە، هەمووشی سەردار عێلن کە لەو کۆبوونەوەیە دان لە فەرمانداری. ساباڵغ هەموو سەری سووڕ ماوە. منیش ئەوە لە دوکانی «وەستا محەممەدی تۆکمەچی»ـم،[2] تفەنگم چەخماخی کار ناکات، داومە چاکی کات، دوو ڕۆژە لەکنێتی. تفەنگی «ڕەحمانی کیانی»ـم بە ئەمانەت وەرگرتووە تا هینەکەی خۆم وەردەگرمەوە. ئەوە هەر ئاغاوەتە تێکداوێن و دەڕۆنە لای «قەرەنی ئاغای مامەش»[3] و سەردار عێلەکانی تر. ئەوەندەم زانی «سلێمانی ڕەسوڵ ئاغای مەنگوڕ» هاتە بەر دوکانی وەستا محەممەد و بەچاو ئیشارەی کردم گوتی:

---

[1] گوندێکە لە ١٤ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی مەهاباد و لەسەر ڕێگای میاندواو هەڵکەوتووە. لە ساڵی ٢٠١٧ بوو بە شار.

[2] کورتەیەک لەسەر ژیانی خوالێخۆشبوو وەستا محەممەدی تۆکمەچی لە لاپەڕەی ٤٢٥ دا بخوێننەوە.

[3] قەرەنی ئاغا کوڕی محەممەد ئاغای مامەش و گەورەی عەشیرەتی مامەش بوو. بە هۆی هێز و پێگەی کۆمەڵایەتییانەوە، نێوانی زۆر دەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی خۆش بوو. لە سەردەمی پێش دامەزراندنی کۆمار کە دەوڵەت بۆخۆی نەیدەوێرا و نەیدەتوانی لە ساباڵغ حکومەت بکات، داوای لە قەرەنی ئاغا کرد کە دەگەڵ چەند کەس لە سەرۆک عەشیرەتەکانی دیکە کە هەمووی چەکداریان هەبوون، ئاسایشی ساباڵغ بەدەستەوە بگرن و قەرەنی ئاغاش وەک فەرماندار خۆی بناسێنێ. فەرمانداریی قەرەنی ئاغا چەند مانگێک زیاتری نەخایەند و لەژێر گوشاری ڕووسەکان گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی لە نەڵۆسێ.

وەرە. ڕەنگی تێکچووبوو و پشووی سوار بوو، گوتی:

— بڕۆ خۆت قوتار کە ئێستا دەگیرێی.

ئەوەندەی گوت و بەپەلە گەڕایەوە لای ئاغاکان. منیش چوومەوە ماڵێ. خورشید گوتی:

— بۆ وا تێکچووی؟ دیسان چ باسە؟

— هیچ نییە و بێخەم بە.

تەواو قوونم دانەدا، ئەوەندەم زانی «حەمەدی وسوو کوتکەی» بە سواری لەبەر دەرکی حەساری هەرام دەکا:

— حەمەد، کوڕە حەمەد، زوو وەرە گیرای!

لە پەنجەرەوە تەماشام کرد ئەوە لەشکرێک بەرەو ماڵە من دێن کە لای کەم ٢٠٠ نەفەر پیاوی ئاغایان دەبوون. بێجگە لەو لەشکرە، چەند ئەوەندە منداڵەورکە بەدوویانەوە. بەپەلە هاتمە خوار و حەمەد گوتی: سواری پاشتەرکم بە. سوار بووم و ڕفاندمی بۆ ماڵە «محەممەدی غوڵامی قەساب»ـی. من با لەوێ بم!

لەشکری پیاوەکانی ئاغاوەت و عەشایری دەچنە بەر ماڵێ، لە دوورەوە هەرا دەکەن: حەمەدی مەولوودی وەدەر کەوە! خورشید دەڵێ: لەماڵ نییە. سوور دەزانن لەماڵ نیم، بەڵام ٢٠ نەفەر دەڕۆنە ژوور و تەماشا دەکەن من لەماڵ نیم و بە قوونی خۆیان دادەدەن و دەڕۆن. لەولاشەوە دەستێک لەشکر دەڕۆنە ماڵە «سەید محەممەدی سەیدی»، ئەویش ڕادەکات بۆ «حەمامیان» ماڵی «حاجی بایز ئاغای دێبۆکری» کە ئاشنای «حاجی سەید ڕەحمانی» باوکی بوون. ئەویش با لە حەمامیان بێ!

ئێستا کە ئێمە دەگیریان نەکەوتووین، «قەرەنی ئاغای مامەش» ئەمری کردووە کە «ئەوانە لەبن هەوران بن بیاندۆزنەوە و بە زیندوویی دەمهەوێنەوە». وەک داڵ لێمان دەگەڕێن. ئەوە بە تەنێم و هاوالەکانیشم بە دەورەوە نین. ئاخر نەمدەزانی ئەو هەموو عەشایرە تەنیا بۆ من و «سەید محەممەدی سەیدی» لەشکریان کێشاوە! لەولاشەوە خەمی ماڵ و منداڵەکانم بوو کە نەکا شتێکیان بەسەر بێنن. ئەو ڕۆژە تا شەوم لێداهات، شەقم برد. کە تاریکی داهات، «سەید محەممەدی ئیسحاقی» خۆی و چەند نەفەری دی هاتن و گوتیان:

— دەبێ بڕۆی خۆت دەرباز کەی دەنا لەناو شار بمێنێوە دەگیرێی!

— گەر ئێستا، لێرە بگیرێم لە شار وەدەر ناکەوم. ئاخر بڕۆمە کوێ؟

– «شێخ لەتیف» لە عێراق ڕای کردووە و هاتۆتە «سەردەشت».[1] بڕۆ بۆ لای ئەو و ماوەیەک لەوێ بە با بزانین ئاخری بەکوێ دەگات.

دوو ڕۆژان خۆم خافڵاند و لە جێگای خۆم نەبزووتم، لای نوێژیشێوان بوو کە حوسێنی زێڕینگەران خۆی و چەند هاواڵی هاتن و گوتیان:

– بۆ هیچ کوێ مەڕۆ، ئەوە چەند ئەفسەری عەرووسان هاتوون و دەیانهەوێ بڕۆنە لای «شێخ لەتیف» لە سەردەشتێ، باسی تۆمان بۆ کردوون و گوتویانە چەند ڕۆژان خۆی وەدەر نەخات و خۆی ڕاگرێ تا لەو سەفەرە دەگەڕێینەوە.

ئەوە بابیشم هاتۆتە لام و دەڵێ:

– دەبێ هەر ئێستا بڕۆی تا دەگیر ئاغاوەتان نەکەوتووی، تا ڕووس دەچنە سەردەشت و دەگەڕێنەوە، ئاغاوەت کاری خۆیان دەکەن و دەتگرن و سەرت تێدا دەچێ و پشتم دەشکێ با وەک «ڕەحمان»ی ئەتۆشم لەکیس نەچێت. ئێستا نارۆمەوە تا ئەتۆ بەڕێ نەکەم!

بەهەرحاڵێک بێ، بابمان لاواندەوە و هێورمان کردەوە جا ئەویان بەڕێکردەوە ماڵێ. بە قسەی



لە ڕاستەوە: کەسی دووهەم عەلی یاوەر یا عەلی ڕەهبەر کە دەبێتە ژنبرای کاپیتان - کەسی پێنجەم کە سمێڵێکی گەورەی هەیە کاک حەمەدی وسوو کوتکەیە و کەسی حەوتەم کاک متەلیب ماملێیە و کەسی ئاخر کاک سەدیق ڕەهبەر (مەلا ڕەهبەر).

---

[1] ئەمر(شێخ لەتیف بەرزنجی) کوڕی ئەمر(شێخ مەحموودی حەفید، پاشای کوردستان)، لە مانگی (ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٤٣) هاتۆتە سەردەشت و بۆ ماوەی حەوت مانگان لەو شارە ماوەتەوە. بەوپێیە ئەو ڕووداوانەی کاپیتان باسیان دەکات لە مانگی گەڵاڕێزانی ئەو ساڵە ڕوویان داوە.

حوسێنی زێڕینگەران و هاواڵانم کرد و هەرچۆنێک بێ شەش ڕۆژی دیکەش تاقەتم هێنا و نەبزووتم. سەری شەش ڕۆژەی تەماشام کرد «سەید پیرە» و «عەبدوڵڵای خاڵی» خەبەریان بۆ هێنام کە:

— دەرکەوە، ڕووسەکان لە سەردەشت گەڕاونەوە و یەکسەر چوونە مزڵی قەرەنی ئاغای مامەش، کە لەوێ وەدەرکەوتن، بە ئێمەیان ڕاسپارد کە بە تۆ بڵێین وەدەرکەوێ.

جا مزڵی قەرەنی ئاغای دە ماڵە «حوسێنی حەمەی ناڵبەند»ـیدا بوو. حوسێنی حەمەی ناڵبەندی بۆیگێڕامەوە گوتی:

— کاتێک زانیم سێ نەفەر ئەفسەری ڕووس هاتن و یەکسەر وەسەر کەوتن بۆ دیوی ئاغای. پێانگوت کە تۆ چیت داوە لە حەمەدی؟ بۆچی خەریکی بیگری؟ ... ئەوجا وەدەرکەوتن.

بەیانی زوو قەرەنی ئاغا لەشار وەدەر دەکەوێ و دەچێتەوە ماڵی خۆی. لەوێ نەخۆش دەکەوێت و هەر ئەو نەخۆشییە بوو کە پێیەوە نووسا و کوشتی[1]. ئەوە بوو کە ئاغاوەت زراویان چوو و شاریان چۆڵ کرد. ئیتر ئەو هەروگیفەیان نەما. جاروبار ئاغا دەهاتنە نێو شار و وەک تۆبەکاران سەریان دادەخست و نەزەریان نەدەکرد.

## ناکۆکی و ناتەبایی سیاسی دە (کۆمەڵە)ـدا

لەو بەینەشدا ئەوە (کۆمەڵە) شێواوە چۆن! ئەوەندەی سیخووڕی تێخزاوە نەبێتەوە. «قازی‌تەها» نێوێک دەگەڵ «عەزیز زەندی» و چەند نەفەرێکی دی بەربوونە گێرەشێواندن. لەلایەک «مەلا ڕەحمانی سەدرولعولەما» شەوانە لە ماڵان کۆبوونەوە دەکات و لەلایەکی دی «مەحموودیان»[2] خەریکی جوڵانەوەیەکی دیکەیە. ئێمەی تەبەقەی هەرە خوارەوە یا بە قەولی دەوڵەمەندی سابڵاغێ کە بە ئێمەیان دەگوت «ڕەجاڵە»، ئێمەی بێسەواد، دەو نێوەدا سەرەگێژەمان گرتبوو. کامیان زووڕنای باش لێدابا وەدووی دەکەوتین. «قازی محەممەد» تازە داخیلی (کۆمەڵە)

---

[1] لە ڕۆژنامەی "کوردستان" ژمارە ٣٢ لاپەڕەی ٤ لە قونیچکێکی بچووکدا هەواڵی مەرگی قەرەنی‌ئاغا بڵاو کراوەتەوە. کە ڕۆژی مردنەکەی نووسیوە ١٣٢٥/٠١/١٤ ساعەت ١٢ نیوەڕۆ. بەو پێیە ئەم ڕووداوەی کاپیتان دەیگێڕێتەوە (ڕەنگە) دوو- سێ ڕۆژ بەر لە مەرگی قەرەنی ئاغا بووبێت.

[2] مەبەستی بەڕێز "غەفور مەحموودیان"ـە کە ئەویش یەک لە دامەزرێنەرانی (حیزبی ئازادیی کوردستان) بوو کە پاشان دەگەڵ عەزیز زەندی (عەزیز ئاڵمانی) لەو حیزبە جیا بوونەوە. لە داهاتووشدا دەگەڵ (کۆمەڵەی ژ.ک) تێکەڵ نەبوو و کەوتنە ڕکەبەرییان. کۆمەڵێک دەنگۆ لەسەر هۆکاری کوشتنی بەڕێز مەحموودیان هەیە. ئەو قەتڵە یەک لە هەرە ڕووداووە قسە لەسەرەکانی سەردەمی کۆمارە کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا، کاپیتان پەردەی لەسەر لادەدات. هەروەها لە زۆر بەڵگە و دەقی مێژوویدا و لە زمان ئەو کەسانەی کە بەرپرسیارەتییان لە کۆماردا هەبوو لەسەر ئەو باسە دواون. بۆ نموومە بڕوانە: کتێبی ژیان و بەسەرهاتەکانی عەبدولڕەحمانی زەبیحی (مامۆستا عولەما) نووسینی عەلی کەریمی - نامەی کاک یۆسف ڕیزوانی لە لاپەڕەی ٣٩٥. هەروەها سەرچاوەی پەڕاوێزی ژمارە ٢ کە لە ژێرەوە داندراوە.

ببوو و هەرکەسە هەوڵ دەدات بۆ لای خۆی ڕایبکێشێ.

ئێمەی بێسەواد کە یەکجار زۆریش بووین، لەنێو خۆماندا کۆبوونەوەمان کرد و ڕامان هاتە سەر ئەوە کە چەند نەفەر لەلایەن ئێمەوە بچێتە ڕەزایەی لای کۆنسوولی ڕووسان و پێیان بڵێ کە ئێمە ئەو کۆمەڵەیەمان ناوێ کە ئەو خەڵکە خەراپەی تێخزاوە و سەریان لە خەڵکیش شێواندووە، خۆمان حیزبێکی دی تەشکیل دەدەین. ئەوە ناشوێرین لەبەر عالەمێ ناوی «حیزبی تودە» دەربڕین چونکە ئەوەی دە کۆمەڵەدا بوو بەشی هەرە زۆری زراویان لە «تودە» چووبوو. وایان بردبوونە مێشکێوە کە «تودە» دین و ئیمانی نییە و خوا ناناسێ و پڕوپاگەندەیەکی زۆر دەو حیزبە دا جێگیرە.[1]

«حەسەنە شەل» و «باقی»ـی برای و دوو نەفەری دی چوون بۆ ڕەزایەی بۆ لای کۆنسوولی و لەوێ قسەیان دەگەڵ کۆنسوولی کردبوو. کۆنسوول لێی پرسیبوون کە:

— مەحموودیانو دەگەڵە؟

ئەوانیش پێیان وابوو گەر بڵێن دەگەڵمانە کاری باش دەکەن و وەڵامیان دابۆوە:

— بەڵێ بەڵێ، دەگەڵمانە.

هەرچەند هێشتا «مەحموودیان» نەهاتۆتە کایەوە، بەڵام «حاجی» وایزانیبوو «مەحموودیان» لای ڕووسان زۆر بەڕێزە، بە باشیی زانیبوو کە بڵێ ئەویشمان دەگەڵە تا بەشکوو ڕووسەکان پشتیوانیمان لێ بکەن. ئەدی پاشی ئەو قسەیە، کۆنسوول زۆر مبالات بەو وەفدە [نوێنەرانە] نەدابوو و گەڕانەوە بۆ سابڵاغێ. خۆشی‌خۆشی کە کۆنسوول گوتویە مەحموودیانو دەگەڵە، جا هەر ئەو شەوە چەند نەفەر چوون بۆ لای «مەحموودیان» و هێنایان بۆ کۆبوونەوەی و هەر ئەو شەوەش «مەحموودیان» بوو بە سەرۆکی ئەو حیزبە و ئەویش «محەممەدی یاهوو» و «عەزیز زەندی» و «قازی سەید تەها» و هەموو ئەو ... لە دەوری خۆی کۆکردەوە. ئێمەش هەموو لە «قازی محەممەد»ـی هەڵگەڕاینەوە و زۆر باش پشتی «مەحموودیان»مان گرت.

چەند شەوی نەکێشا کە حیزب بوو بە دوو قۆڵ. لای «قازی محەممەد»ـی هەموو ئەوانە بوون کە کۆمەڵەیان پێکەوەنابوو و دەستەی «مەحموودیان»ـیش ئەو ... بوون و ئێمەی بێسەواد و نەزانیش چونکە کۆنسوول گوتویە «مەحموودیان»و دەگەڵە، لەپشتیان بووین. دەستەی «مەحموودیان» زۆر لە دەستەی «قازی محەممەد» بەهێزتر بوو، چونکە ڕەجاڵە هەموو دووی «مەحموودیان» بووین. زۆر شەوی وا بوو بەیەک هەڵدەپڕژاین.

شەوانە «مەحموودیان» بەسەر هەموو گەڕەکەکاندا دەسووڕاوە. «محەممەد یاهوو» خۆی

[1] مامۆستا محەممەدی سەمەدی لە کتێبی تاریخ مەهاباد لە زمان مامۆستا مەلا قادر مودەڕەسی لە نامیلکەی (ژ.ک چ بوو؟ چی دەویست؟ و چی لێ بەسەرهات؟)ـدا لە لاپەڕەی ١٠٧ باسی ئەو ڕووداوانە و ئەو حیزبە دەکات کە وەک بەڕێزیان باسی دەکات لە مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی ڕوویان داوە.

دەگەڵ دەستەی «قازی» بوو، بەڵام هەموو شەو دەگەڵ «مەحموودیان» دەگەڕا. زۆر بە پەرێز و زیرەک بوو، کەس نەیدەدیت و خۆی وەبەر چاوان نەدەدا، بەڵام لە ڕاستیدا لە هەموو شوێنێکیش بوو. لە کۆبوونەوەیەک پەردەت بۆ ڕائەنگاوتبا، خۆی دە نێو پەردەکەدا دەشاردەوە. لە هەوەڵەوە دەنێو کۆمەڵەدا بوو. دەگەڵ «میرزا ڕەحمەتی شافعی»ـش نێوانی زۆر خۆش بوو و پاڵی بە «مەحموودیان»ـێوە دەنێ بۆ گێرە شێواندن.

ئێستا «مەحموودیان» دەستێکی یەکجار درێژی هەیە کە «قازی محەممەدی» وەتەنگ هێناوە.

ئێمەش پشتمان لە «قازی کردووە و پاڵمان وە «مەحموودیان»ەوە ناوە. بەو جۆرە چەند ڕۆژێکی کێشا لەپڕ دیتم لای نیوەڕۆیە «سەید محەممەدی ئیسحاقی» هاتە ماڵێ و گوتی: «قازی» دەڵێ بێت بۆ لام. هەستام دەگەڵ «سەید محەممەد»ـی چووم بۆ مەحکەمەی. کە وەژوور کەوتم دیتم «قازی» خۆی و کچێکی چووکەی لە وەتاغی مەحکەمەی دانیشتبوون. سڵاوم کرد و گوتی دانیشە. پاشی گلەییەکی زۆر گوتی:

— ئێستا ئەوە وەدووی «مەحموودیان»ـی کەوتووی؟ حیزبی تودەتان پێکەوە ناوە؟ ئاخر چۆن ئەتۆ نازانی «مەحموودیان» بە قسەی ئینگلیسەکان ئەو ئاژاوەیەی ناوەتەوە؟

زۆری لەو قسانەی پێگوتم و یەکجار زۆر بەسەرم ڕۆیی، بەڵام هیچ دڵم بە قسەکانی نەرم نەبوو و هەستام و خواحافیزیم لێکرد و دەگەڵ «سەید محەممەد»ـی وەدەر کەوتین. لە ڕێگا هەردووکمان گوتمان قازی ڕاست ناکا، «مەحموودیان» خاوێنە. هەر ئەو شەوە لە گەڕەکی «مزگەوتی سوور» کۆبوونەوە بوو و عالەمێکی یەکجار زۆری لێبوو. «مەحموودیان» پێشنیاری کرد کە:

— کاتێک قازی بۆ نوتق کردن وەسەر کورسی کەوت، پیلی بگرن و دایبەزێنن.

ئەوەندەمان زانی، «عەلی»[1] پیاوی حەمەدەمینی موعەینی هات و بە سرتە بەگوێی «مەحموودیان»ـیدا شتێکی گوت و یەکپێ «مەحموودیان» ڕاستبۆوە و دەگەڵ «عەلی» ڕۆییشتن. ئێمەش سێ نەفەر وەدووی کەوتین و چەلێش نازانین ئەوە چ باسە! چووینە ماڵی «حەمەدەمینی موعەینی». دەگەڵکوو وەژوور کەوتین تەماشامان کرد چوار نەفەر ئەفسەری ڕووس لەوێن و دەستیان لە دەستی «مەحموودیان»ـی نا و چوون بۆ وەتاغێکی دی. ئێمەش ئەوە لە وەتاغێکی دیکە چاوەڕوانیانین بزانین کۆبوونەوەکەیان بەکوێ دەگا. پاشی زیاتر لە سەعاتێک، لە قسەکردن بوونەوە و «مەحموودیان» بە کەیفخۆشی و دمبەپێکەنینەوە لە دیوەکە هاتە دەر و گوتی با بڕۆین. لە ڕێگا کە دەڕۆییشتین هەر جیفڕکی لە خۆی دەدا و بە خۆشحاڵییەوە قسەی بۆ دەگێڕاینەوە کە چۆن ئەو ئەفسەرانە لێی ڕازین و زۆر شتیان قەول پێداوە. ئەوەندە بەدەق و بەدەماخ بوو نەبێتەوە. دەو عانەشدا کە قسەی بۆ دەکردین دیتمان ئەفسەرەکان بەسواری ماشێن بەلاماندا تێپەڕین و دەستێکیان بۆ «مەحموودیان»ـی هەڵێنا و چوونەوە بۆ «میاندواو»ـێ. شەو درەنگی کردبوو بۆیە «مەحموودیان»ـمان تا بەردەرکی ماڵێ بردەوە و ئێمەش هەر کەسە و بۆ ماڵی خۆی.

جا لە پاشی ئەو کۆبوونەوەیە ڕا «مەحموودیان» وەخۆ کەوت و هەڵدەسووڕا وەک بادەوە، هەدادانی نەبوو. چەند شەوێک دواتر لە فەرمانداری «قازی» نوتقی بۆ عالەمێ دەکرد،

---

[1] وەک ئامین خانم و پەری خانمی موعەینی وەڵامیان دامەوە ئەو کاک عەلی‌یە میرزا و قەڵەم بە دەستی باوکیان بووە.

«مەحموودیان» ئەمری کرد کە دەبێ بڕۆین بۆ ئەو کۆبوونەوەیە و گێرەشێوێنی بکەین. ڕەجاڵە کۆبۆوە و چووین. ئەو شەوە زۆری نەمابوو کە پێکوەربین. «قازی» هێدی و لەسەرەخۆ بوو، دەگەڵ ئەوانەی لەدەورەی بوون، لە شلێیان دا و بڵاوەیان کرد، دەنا زۆر پیس دەشێوا. [1] بۆ بەیانی لە چایخانە بووم و «حەبیبە زەرد» هات و گوتی:

— وەرە ئەوە «نەماز عەلییۆف»[2] تۆی دەوێ.

منیش «نەماز عەلیيۆف» ناناسم و زۆرم پێ سەیر بوو کە ئەفسەرێکی ڕووس ئەمنی بۆ چییە!؟ پرسیم:

— چ کاری بە منە؟

— نازانم، هەستە وەرە.

دەگەڵی چووم و دیتم «نەماز عەلیيۆف» لەبەر ماڵە «باڕۆن»ـی دەهات و دەچوو. سڵاوم کرد و دەستی دەناو دەستی نام و بە قسەکردن هەڵکشاین بۆ لای گاراج [گەراج - Garage -تێرمیناڵ]. داوای لێکردم کە مەڕامنامەی حیزبەکەی خۆمانی بۆ بەرم، بەڵام بۆی تەرجومە بکەم بە زمانی ئازەربایجانی. چووم لە گەڕەکی بازاڕ ئەو جێگایەی لێی کۆدەبوونەوە، «هاشمی گەرمێنی» کاتبی ئەو گەڕەکە بوو، پێمگوت و مەڕامنامەکەی بە زمانی ئازەربایجانی نووسی. مەڕامنامەکە هەر ئەو مەڕامنامەیەی «کۆمەڵەی ژێ - کاف» بوو، بەڵام «یاهوو» چەند شتی لێ زیاد کردبوو. لەو چەند شتانە یەکیان ئەوە بوو کە:

(ئێمە خیانەت بە مەعمورەکانی سیاسی شۆڕەوی ناکەین) و چەند شتی تر. مەڕامنامەم دا بە ئەفسەرەکە و دەباغەڵی نا و هات کە بڕوات، ڕووی تێکردم و ئەوەندەی پێگوتم:

— تۆ لەو حیزبە بکێشەوە!

ئەوەی گوت و سوار ماشێنی بوو و ڕۆییشت. منیش زوو چووم چەند هاواڵێکم خەبەردار کرد

---

[1] دەقی ئەو ڕووداوە بەڕێز قادر مەحموودزادە ناسراو بە (دوکتور ئاسۆ) لە بیرەوەرییەکانی خۆیان دا بە وردی باسی کردووە کە ڕێک بەو چەشنەی دەگێڕێتەوە کە کاپیتان باسی دەکات. بڕوانە خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو، نووسینی: دکتر قادر محمودزاده (آسو) ل: ١٤٠

[2] سەبارەت بەو ئەفسەرە تازەرییەی ئەرتەشی سووری شۆڕەوی زۆر گوتراوە و کەم ناسراوە. دوکتور ئاسۆ لە سەرچاوەی سەرەوەدا و لە لاپەڕەی ١٢٨ ئاوا باسی دەکات: (سەروانێکی دەزگای (چکا) بوو، هەرچی ویستبای دەیکرد، دەستی لە هیچ جینایەتێک نەدەپاراست! هەرکات ویستبای کەسێکی بسڕنەوە، دەتدیت کە جینایەتێک ڕووی دەدا. ترس لە نەماز عەلیيۆف دە لەشی هەموو کەسدا هەبوو. هەرکات سەروان تەواریش مۆڕەی لە کەسێک کردبا یا بە توندی دەگەڵ کەسێک دوابا، ڕۆژی گەشی لێ ڕەش دەکرد). ئەو ئەفسەرە ٣٥ساڵی تەمەن بووە. وەک لە بەڵگەکاندا باس دەکرێ پیاوێکی توندەخوو و کەمدوێ بووە. ئەو بەرپرسیارەتی ئارامی و ئاسایشی ناوچەی مەهاباد و میاندواوی بەدەستەوە بووە بەڵام، بنکەی سەرەکی و شوێنی ژیانی لە میاندواو بوو. بڕوانە کتێبی: جمهوری ١٩٤٦ کوردستان - نووسینی ویلیام ئیگڵتۆن - وەرگێڕانی: سید محمد صمدی ل: ١٢٠

کە ئیش بەو جۆرەیە. حەبیبە زەرد گوتی:

— ئەوشۆ قەرارە لە مزگەوتی هەباس‌ئاغای هەموو گەڕەکەکان کۆ ببنەوە. جا گەر بە باشی بزانن، کاتێک مەحموودیان یان هاوالّەکانی چوونە سەر کورسی بۆ نوتق کردن، پەلّپیان پێدەگرین و لێیان دەشێوێنین.

ئەو شەوە وەک شەوەکانی دی چووینە کۆبوونەوە. لەو کاتەدا کە «قازی تەها» لەسەر مینبەر گەرم داهاتبوو و ئەوەی دەیگوت نەیدەگوتەوە، چوومە پێشی و قۆلّیم گرت و هێنامە خوارەوە. «حەبیبە زەرد» چوو جێگای ئەو و عالەمی تێگەیاند. من و چەند هاوالّ لێیان وەخۆ کەوتین و ئەوەی زانیمان داژداری مەحموودیانە کۆمان کردنەوە، بەلّام مەحموودیان هێشتا نەهاتبوو. ئەو شەوە زۆر بە هاسانی لێمان شێواندن و چ گێرە و کێشە نەقەوما و ئێمەش بلّاوەمان کرد و هەرکەسە بۆ مالّە خۆی. بۆ بەیانێ لەسەر نان و چا خواردن بووم کە «عەلی چایچی» هات و گوتی «قازی محەممەد» تۆی دەوێ. زوو زانیم چ باسە! بەخۆمم گوت: ئەوە نەقلّەکانی شەوێی بیستووە و بانگم دەکات و دەستخۆشیم لێدەکات. هەستام چووم، دیار بوو قازی بەدەق و بەدەماخ بوو. دیسان پاشی هەندێک گلەیی کردن و قسە و باس گوتی:

— هەستە خۆت و شەش کەس لە هاوالّەکانت بڕۆنە شارەوانی [بنکەی پۆلیس] و بەسەر شار ڕابگە، بەلّام لەخۆتەوە هیچ کاران مەکە، ئەوەی من ئەمرم پێکردی ئەوەبێ.

— مووچەی ئەو شەش نەفەرە و خۆم لەکوێ دەگات؟

— خەمت نەبێ ئەویشت بۆ دیاری دەکەم.

هەستام چووم، دەگەلّ هاوالّەکانم شارەبانیمان ئاوەدان کردەوە و دەستمان کرد بە کار و کێشە و گرفتەکانی شارمان چارەسەر دەکرد. گەر کەسێک شکایەتی دەبوو، دەچوو بۆ لای قازی، قازیش بۆ منی دەنووسی کە ئەوانە بنێرە لای مەلا شەرعیان بکات یان ئەو ئیشەی ئاوا لێبکە. منیش بێ ئەمری قازی نەدەجولّامەوە و سەربەخۆ کارم نەدەکرد. زۆر باش بە کاروباری شار ڕادەگەییشتم و خەلّکیش و قازیش زۆر ڕازی بوون. ئێستا من بوومە داروغەی شار و ڕەئیسی ئەو ئیدارەیەم کە لە گرتووخانەکەی گیرابووم و ئەشکەنجەیان دابووم و تا سەرەمەرگێ تێیانهەلّدابووم. ئێستا من لەوێ ڕەئیسم، خەتاکاران دەگرم، لەو ژوورەیان دەکەم و بێتاوانان بەردەدەم.

زۆری نەکێشا «قازی» ئەمری کرد کە «مەحموودیان» بگرە و دە گرتووخانەی کە. منیش هەر بلّیی یەک و دوو گرتم و دەژوورێم کرد. چەند گیراوی دیکەش گیرابوون. «سەعیدی کاکەلاچینی» پیاوی کوشتبوو، دەگەلّ «مەحموودیان» دەژوورێکیدا بوون. پاشان «قازی»، «مەحموودیان»ـی شاربەدەر کرد و بۆ لای ورمێ چوو. بەداخەوە لەوێش ئەتوار و ئاکاری باش نەبوو و هەر بەقسەی ئینگلیسەکان دەبزووتەوە.

## هاتنی لەشکری سوور بۆ سابڵاغ و گاوگەردوونی من لەپێش لەشکری سوور[1]

لیرەدا چەند شتم وەبیر هاتەوە. لەمەوبەر لەشکری ڕووسان هاتن بۆ سابڵاغ. چەند نەفەری (کۆمەڵە) گوتیان بەیانی هوردوی شۆڕەوی دێتە ناو شار، ئێمە گایەک دەکڕین، کاتێک لەشکر گەییە قەراغ شار، تۆ گایەکە لەپێش لەشکر سەر ببڕە و گاوگەردوونیان بۆ بکە و منیش قەبوڵم کرد. دیار بوو ئەوان لە پاشەڕۆژێ دەترسان و نەیاندەویست بە ئاشکرا گاوگەردوون بۆ لەشکری سوور بکەن، دواڕۆژیان لەپێش چاو بوو. بۆیە خۆیان نەیاندەوێرا ئەو کارە بکەن و هاتنە لای من تا بۆیان بکەم، منیش دواڕۆژ و مواڕۆژم تێدا نەهێشتبۆوە.

بەیانی زۆر زوو دەگەڵ «عەلی ڕیحانی» و «ڕەحمانی زەبیحی» بۆ مەیدانی وڵاغان چووین و گاجووتێکمان کڕی و ئەوانیش پارەکەیان دا. دەگەڵ چەند نەفەر لە هاواڵەکانم چووینە قەراغ شار و چاوەڕێی لەشکری سوورمان دەکرد تا بگاتێ و لەولاشەوە «حەبیبە کەچەڵی قەساب»م هێناوە تا گایەکە سەرببڕی. لەو شارە گەورەیە کە زۆربەی دە کۆمەڵەدا ئەندام بوون و خۆیان بە دە مانگای زاو نەدەگۆڕایەوە، کەس نەهاتبوو بۆ پێشوازی لە لەشکری سوور، هەمووی ٤٠ یان ٥٠ کەس لە ڕەجاڵەی بێسەواد نەبێ، کەسی وای دەنێودا نەبوو کە دمولەوسێکی پێوەبێت کە کاتێک سەری گایەکەمان سەر بڕی، نوتقێک یان چەند قسەی بەکەڵک بکات. بە حەبیبە زەردم گوت:

- کاتێک لەشکر هات و گایەکەت سەربڕی، دمولەوسی وەت هەیە قسە بکەی؟
- با لەشکر بێت بزانە چ بەزمێکی دەگێرم. هەر ئەتۆ و قسەکردن؟
- ئەو لەشکرە نازانن ئێمە بێسەواد و نەزانین، زمانی ئێمەش نازانن، تۆ ئەوەندەی کە گایەکەت سەر بڕی دەست بە هەرا و بگرە بکە و بەس.
- بێخەم بە.

لای چێشتانی بوو کە لەشکر لە «کەڵکی بەگزادان»[2] شۆڕبۆوە و هات گەییە ئاستی ئێمە. قەساب و هاواڵەکان گایان لە عەرزێ دا. گەورەی لەشکرەکە لەپێش لەشکر بوو، ئەسپی تاو دا و وەک گوڵمیخ لە ئاستی قەساب ڕاوەستا. «حەبیب» زوو سەری گایەکەی بەدەستێکی لە حەوایە ڕاگرت و کردی بە گوڕڕە و هەرا و دەیگوت:

---

[1] ئەرتەشی سووری یەکیەتی سۆڤیەت (شۆڕەوی) لە ڕۆژی پێنشەممۆ ڕێکەوتی ٦ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢٠ هەتاوی (١٩٤١/٨/٢٨ز) مەهابادیان داگیر کرد.

[2] (کەڵکی بەگزادان) ناوی تەپۆڵکە یا گردێکە لە ١٠ کیلۆمیتری باکووری مەهاباد و لەسەر ڕێگای مەهاباد میاندواو هەڵکەوتووە و هەرکات لە میاندواوێ ڕا دەگەیە سەر دووندی ئەو کەڵکە، مەهاباد وەدیار دەکەوێ. ئەو گردە نرخێکی مێژوویی هەیە.

– سەری هیتلێل [مەبەستی ئادۆڵف هیتلێرە] وەک ئەو گایە بە نووکی ئێزەی سالاتی شۆڕەووی. بژی دەوڵەتی شۆڕەووی.

قسەی وا جوان و باشی دەکرد نەبێتەوە، بەداخەوە هەمووم بۆ نانووسرێت. ئەوە ژێنێراڵەکەش وەک ڕێز لەو خەڵکە و لە قسەکانی «حەبیب»ـی دەستی لە حەوایە. خۆ «حەبیب» بڕانەوەی نەبوو، وردەوردە گەرم داهات و ئەوجار بۆمان وەک خۆی لێنەدەهاتەوە. ئەوەی لە دەوری بووین، تینمان بۆهات کە بەجورێک بێدەنگی کەین. چەند دەقەیەک لەسەری ڕۆیی و پاشان هەرچۆنێک بێت بێدەنگ بوو جا «ژێنێراڵ»ـەکە دەستی دادایەوە و ئەوجار ئەو نوتقی کرد. ئێمەش هاڕەی لە بڕەی ناکەینەوە کە دەڵێ چی و باسی چ دەکات؟! ئەوەندە نەبی کە لە قسەکردن قوتار بوو گوتی: موسیقی کوردی لێدەن. ئەوە لەشکریش بە سوار و ماشێنسوارەوە هەمووی ڕاوەستاوە تا «حەبیب» و «ژێنێراڵ» لێبوونەوە. ئەوجار دەستیان کرد بە شەیپوور و باڵەبان لیدان تا چوونە سەربازخانەی.

لە شار زۆرکەس خۆشییان لەو گاوگەردوونە هات کە من لەپێش لەشکری سوور کردم، دەنگی باشیَ دایەوە. زۆر کەسیش کوێر بوون و چاویان بڕوای نەدا بۆ تەماشاکردن. ئەو لەشکرە چەند ڕۆژ لە سەربازخانە بوو و تەنانەت یەک نەفەریان نەهاتە ناو شار. پاشی چەند ڕۆژان بۆ لای ورمێ چوون. دیسان چەند ڕۆژێکی تێوەرسوورِایەوە کە دەستەیەکی دیکە ڕووس هاتن و لە جێگای ڕووسەکانی پێشوو دابەزین و تا ماوەیەک مانەوە.

ڕۆژێک چەند نەفەر لەو هاواڵە کۆمەڵانەم لەدوویان ناردم بۆ دوکانی «سەید عەبدوڵڵای سەید تەها»ـی. گوتیان:

– ئەو ڕووسانە خەریکن بەیانی بار دەکەن، بڕۆ بۆ لایان و میوانداریيان بکە با بێنە ماڵە «باڕۆنی هەرمەنی».

– چۆنیان حاڵی کەم خۆ زمانیان نازانم؟!

– چەند نەفەر کوردی شۆڕەوی ساڵداتن، ئەوان کوردی دەزانن.

منیش چوومە شوێنەکەیان دوو نەفەر ساڵدات هاتن کورد بوون. دەگەڵیان بەربوومە قسان، نە ئەوان لە من حاڵی بوون نە من. هەڵتەکهەڵتەک لەوێرا گەڕامەوە. گەڕام گەڕام تا «سەعید بابی»ـم دیتەوە. ئەو زمانی ڕووسانی باش دەزانی و لای «عەبدوڵڵایۆف»ـی دیلمانج [وەرگێر] بوو. سەعیدم بردە شوێنی ڕووسەکان و حاڵی کردن. ئەوان گوتیان ئێمە بۆ میوانداری نایەین. لە خۆمەوە گوتم: ڕازی دەبن چەند سەر مەڕ بکڕم و بۆیان بێنم؟ قەبوڵیان کرد. منیش چووم بە «مستەفای سوڵتانی» و بە «عەلی ڕیحانی»م گوت:

– بابم، ئەوانە دەڵێن ئێمە میوان نابین، ئەگەر دڵی نەهێشێت یەک دوو سەر گیسک و بەرخ بکڕن و بۆمان بێننە مزڵەکەی خۆمان.

گوتیان بەیانی یان خۆت، یان دوو نەفەر لە هاواڵەکانت وەرنە مەیدان، بۆیان دەکڕین و ئێوەش بۆیان بەرن.

ئەوە دارۆغەی شارم و قازی کردوومی بە ڕەئیسی شارەبانی و حاواندنەوەی ئەو شارە لە ئەستۆی منە. سەرم ئەوەندە قاڵە نەبێتەوە. لە قسەی قازی دەرناچم و ئەوەی ئەو بڵێ وا دەکەم. ڕووسەکانیش دەزانن کە من دارۆغەی شارم و دەمناسن بۆیە، هاواڵەکانم هاتنە لام و ویستیان من میوانداری ڕووسەکان بکەم. ڕووسەکان کە قایل نەبوون میوانداریان بم، بۆ بەیانی چەند سەر بزن و مەڕ کڕان و دایان بە من و بۆم بردن بۆ شوێنەکەی خۆیان کە لە تەنیشت ئیدارەکەی ئێمە بوو. کابرای قەڕەوڵ پێشی پێگرتم و نەیدەهێشت بچمە ژوورەوە. پێشم دەگرێ و حەیوانەکان دەگێڕێتەوە. نە من لە ئەو حاڵی دەبووم نە ئەو لە من. هاواڵەکانم نارد تا «سەعید بابی»م بۆ بدۆزنەوە. ناردیان سەعید هات و دەگەڵ کابرای قەڕەوڵ کەوتنە قسان و کابرا گوتی:

— دەبێ بڕوا کاخەزێک بنووسێ کە من بە مەیلی خۆم ئەو حەیوانانەم هێناوە بۆ ئێوە.

چوومەوە ئیدارەی و کاخەزێکم بە «کازم»ـی نووسی و دام بە نۆبەچییەکە و ئەویش هەرای کرد کابرایەکی دەرەجەدار هات و کاخەزەکەی دایە، بڕیک قسەیان کرد ئەوجار، حەیوانەکانیان داکردە ژووری گاراجێ و ئێمەش گەڕاینەوە. هەر ئەو ڕۆژەش ئەوان باریان کرد و چۆنەوە بۆ ئازەربایجان.

## کاتێک کە زانیم ئاڵای کوردوستان لە چوارچرا هەڵدەکرێت!

لەو سەروبەندەدا بووین کە ڕووسەکان ئاڵمانیان ڕاو نا و بێرلین گیرا.[1] «حوسێن زێڕینگەران» و چەند نەفەر لە (کۆمەڵە) هاتنە لام و گوتیان ئێستا کە بێرلین گیراوە، ئێمەش دەبێ جێژن بگرین. ڕوویان دەمن کرد و گوتیان تۆ دەبێ سەرپەرستی ئەو جێژنە بکەی. پارەیان بۆ هێنام و هەموو ڕێ و شوێنێکیان نیشان دام، ئەوە بکرە، ئەوە وا لێبکە، فڵانە شتت لەبیر نەچێ و چی و چی. ئەوان لە دواڕۆژی خۆیان دەترسان و نەدەهاتنە کایەوە و خۆیان وەبەر چاو نەدەدا. منیش خۆم و ئەو چەند نەفەرەی دەگەڵمە دەستمان بە کارەکانی جێژنی گیرانەوەی بێرلین کرد.

چووم چەند تۆپ خامی سوورم کڕی و وەستایەکی نەججارم هێنا، جا لە چوارچرایە تاقێکم لە نێوەڕاستی خیابان دروست کرد کە بڵێندایەکەی دەگەیشتە چراکانی خیابانێ، ڕێک لەسەر بڵێندایی چراکان ئاڵایەکی سوورم چەقاند. چەند نەفەر سابڵاغی لە زەمانی ڕەزاشایەوە مۆزیقە[2] و باڵەبان لێدەر بوون، ئێستا سەرباز نین و لەناو شار کار و کاسبی دەکەن. ناردم خۆیان و موزیقاکەیان هێنان. پێنج شەو و ڕۆژ لەسەر ئەو تاقە مۆزیقە و باڵەبان، لە خوارووی تاقەکەش دەهۆڵ و زووڕنا لێدەدرا و شەو و ڕۆژ شایی و زەماوەند بوو.

ئەوانەی دە کۆمەڵەیدا بوون و جارجار دێنە لام و شتم فێر دەکەن کە چ بکەم و چ نەکەم و هەر زووش خۆیان ون دەکرد، بەڵام من سەرم لەو شتانە دەرنەدەچوو، ئەوەی بۆخۆم بە سەڵاحم زانیبا و ئەوەی ئاغاوەت و دەوڵەمەند پێیان ناخۆش با، ئەوەم دەکرد. دەو ماوەیەدا کە من داروغەی شاریم، هیچکات لە قسەی «قازی» دەرنەچووم ئەوجارە نەبێ کە ئیجازەم لێنەخواست. «قازی»ش هیچ ناڵێ، نە دەڵێ باشت کردووە نە دەڵێ خەراپت کردووە. ماڵتە[3]، لەو پێنج شەو و ڕۆژەیدا ئەوانەی دە (کۆمەڵەی ژێ.کاف)ـدا بوون و بە منیان دەگوت وابکەم و وانەکەم تا جەژن بۆ کەوتنی ئاڵمان بگرین، لەترسان یەکیان بۆ لای ئەو شایی و زەماوەندەیدا نەدەهاتن، هەر لە دوورەوە سیلەی چاویان دەدایە و تێپەڕ دەبوون، تۆ مەڵێ ئەوانیش بەبێ ئیزنی کۆمەڵەی هاتبوون منیان فێر دەکرد کە جێژن بگرم، خۆ (کۆمەڵە) هەر خەبەری نەبوو. ئەوانیش بە غیرەتی منەوە

---

[1] شاری بێرلین - Berlinپێتەختی ئاڵمان لە ڕۆژی ١٩٤٥/٠٤/٣٠ (٢٢ی خاکەلێوەی ١٣٢٥ هەتاوی) لەلایەن هێزی هاوپەیمانەکانەوە گیرایەوە، تەنیا لە باڵاخانەی فەرماندەیی هیتلێر بەرگری بەردەوام بوو تا ڕۆژی ١٩٤٥/٠٥/٨.

[2] "مۆزیقە" هەمان موزیک Music ـە. خەڵکی کۆنی موکریان بە ژەنیاری ئامرازی موزیکیان دەگوت: "مۆزیقەچی". یەک لە کۆنترین هونەرمەندە مۆزیقەچییەکانی (ژەنیارەکانی) ئەو سەردەم خوالێخۆشبووان هاشمی مۆزیقەچی (فەرەجی) و مستەفای مۆزیقەچی (جەننەتی) بوون.

[3] "ماڵتە یا ماڵتانە" لە موکریان بەتایبەت لە مەهاباد زۆری بەکار دەهێنن. بە مانای (تۆمەز، تۆ مەڵێ) کە بە دەم گلەییەوە بەکاری دێنن وەک: "ماڵتە" - "ماڵتانە"، ئەو ئاوێنەیەت بۆ نەدامێ.



ئەو وێنەیە لە فیلمێک هەڵگیراوە کە لە سەردەمی کۆماری کوردستانە. ئەو کەسەی دەهۆڵەکە لێدەدات کاک هاشم فەرەجی‌یە کە بە هاشمی موزیقەچی ناودێر بوو. وێنەیەکی تریش لە کاک هاشم لە کۆتایی کتێبەکەدا داندراوە.

ئەوکارانەیان دەکرد و دەیانزانی من گوێ نادەمە (کۆمەڵە) و ئەوی دەوڵەمەند و ئاغاوەت پێیان ناخۆش با دەمکرد. شتی زۆر سەیر و سەمەرەم دەکرد، بەڵام هەمووم بۆ نانووسرێ، دەست و پلێکی وام نییە تا بە تەواوی و بە ڕێکووپێکی بیاننووسم.

لێرەدا ئەوەشم بیر هاتەوە، کاتێک کە ئەو تاقەمان لە چوارچرا ڕازاندبۆوە و ئاڵا سوورەکە دەشەکایەوە و شایی و هەڵپەڕکی دەگەڕا و مۆزیقا و دەهۆڵلێدان بوو، چوار ئەفسەری ڕووس هاتن و ئێمەیان دیت کە خەریکی چین و زانییان بۆچی ئەو بەزمەمان سازکردووە و ئاڵای سوورمان هەڵکردووە! زۆریان پێخۆشبوو و من و هەموو هاواڵەکانمیان لەبەر ئاڵا سوورەکە ڕیز کرد و دەگەڵ ئاڵاکە وێنەیان کێشاین. جا هەموومان بە لیباسی ڕەسمی و بە چەکەوە ڕاوەستابووین کە وێنەکەیان گرتین، داوامان لێکردنەوە کە یەکدانە لەو وێنەیەمان بدەنەوە و بەڵێنیشیان دا، بەڵام درۆیان کرد و نەیانناردەوە. پاشی پێنج شەو و ڕۆژان شایی و لۆغان و جێژن کۆتایی پێهات. ئەو خامە سوورەی تاقەکەم هەموو دابەش کرد بەسەر ئەو کەسانەی واجب بوون، بەڵام ئەو ئاڵا سوورەی کە بۆخۆم چەقاندبووم نەمهێنا خوارێ. هەرچەند گوتیان دایگرە و لایبە، گوێم نەدانێ و گوتم دەبێ ئەو ئاڵایە هەر لەوێ بێت با ئەوانەی دەبێ چاویان پێی کوێر بێت و دڵیان پێی بتۆقێ، ببینن. بۆیە ۱۰ ڕۆژ دواتریش ئەو ئاڵا زەلامە لەو شوێنە لارەلاری بوو. فکری ئەوەم کرد کە نەکا دەوڵەمەند و پیاوی ئاغاوەتان بچن دایگرن، بۆیە بەدزییەوە کێشکچیم بۆ دانابوو تا کەس تخوونی نەبێ، باش بوو کەس نەترەی نەبوو بەلایدا بڕوات.

سەری ۱۰ ڕۆژەی لە ماڵێ لەسەر نانخواردن بووم دیتم «وەستا برایم» کە یەکەمین هاواڵی

دڵسۆزم بوو، هات و گوتی ئەوە پیاوی «حەمەدەمین موعێنی» هاتۆتە ئیدارە و دەڵێ هەر ئێستا بێتە ماڵە «موعێنی». هەستام و چووم. وەژوور کەوتم و دیتم کە دوو نەفەر ئەفسەری ڕووس دانیشتوون. سڵاوم کرد و گوتیان دانیشە. یەکیانم دەناسی و نێوی «نەماز عەلی‌یۆف» بوو و ئەوەی تریش «مایۆر»[1]ـێکی ڕووس بوو کە قەتم نەدیبوو. لە قسەکانیان ڕا دیار بوو لەوەپێش چووبوونە لای «قازی» جا چیان گوتووە، من نازانم! کە لەلای قازی دەرچووبوون منیان گاز کردووە. بڕێک لەولا و لەولا قسەمان کرد و ئاخری «مایۆر»ـەکە بە ڕووسی دەستی کرد بەقسەکردن دەگەڵ «نەماز عەلی‌یۆف»ـی. پاشان نەمازیش ڕووی دە من کرد و گوتی:

— ئەو ئاڵایە داگرە!

— بۆچی؟ چ زەرەدی هەیە؟ با هەر لەو حەوایە بێ.

تاوێکی خۆش مشت و مڕمان بوو لەسەر ئەو ئاڵایە. ئەو دەیگوت بیهێنە خوار و منیش ڕازی نەدەبووم.[2] ئاخرێکەی بە زەردەخەنەوە گوتی:

— ئاڵاکە داگرە، زۆری ناکێشێ کە ئاڵای کوردوستان هەڵدەکەن!

کە ئەو قسەیان کرد لە خۆشیان وەختەبوو هەڵفڕم و دڵم نەرم بوو و هەر ئەو شەوە ئاڵای سوورم هێنایە خوار و ئەوانیش ڕۆیشتن بۆ ئازەربایجان.

---

[1] پلەیەکی سەربازییە کە لە فارسیدا "سرگرد" و لە ئینگلیسیشدا "Major"ـە

[2] مامە غەنی بلوریان لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا کە بەڕێز برایمی فەڕشی لە کۆی کتێبێکدا بەناوی سەدەی کارەسات بڵاوی کردۆتەوە، لە لاپەڕەی ١٦ی دا ئەو ڕووداوە لە دەلاقەی بیرەوەکانی خۆیدا باس دەکات کە لەگەڵ قسەکانی کاپیتان تا ڕادەیەکی زۆر یەک دەگرنەوە.

## سینەمای ئینگلیسەکان لە مەهاباد


لە ڕاستەوە: سەید ڕەحیم جەعفەری، ژۆرژ ئادیسۆن یوناتان (کوڕی حەکیم یۆناتان) و منداڵەکەش سەید قادر جەعفەرییە کە لە پۆلی یەکەم لە مەدرەسەی سەعادەت دەیخوێند. (ئەو وێنەیە لە لاپەڕەی فەیسبووکی "مهاباد در آینە اسناد تاریخی" وەرگیراوە).

یەک-دوو ڕۆژ بەسەر چوو. لای نیوەڕۆ بوو کە چەند نەفەر ئینگلیسی هاتنە شارەکەمان. هەوەڵ چوونە لای «قازی» و پاشان چوونە لای حەکیم «وێنەتان»ـی. لای تاوپەڕان بوو، هاتن گوتیان قازی تۆی دەوێ. هەستام چووم. دیتم قازی هاتۆتە سەر چۆمی تا لەوێ بەتایبەتی ببینێت. گوتی:

- دەزانی بۆ بانگم کردووی؟ ئەوە ئینگلیسەکان سینەمایان هێناوە تا پێشانی شارەکەی دەن، کارێکی وا بکە سینەماکە بشێوێنی، نەیهێڵی سینەما کار بکات تا بڕۆن و فانی بن. بۆ بەیانیش سەرێکی دوکانی کوڕی «حەکیم وێنەتان»ـی بدە.[1]

ئەوەی گوت و چۆوە بۆ مەحکەمەی. ئێوارێ لای تاوپەڕان دەگەڵ هاواڵان هەموو ڕێوشوێنێکمان جێگیر کرد و ئامادەبووین تا ئینگلیسی بێن و سینەما دابنێنن بۆ خەڵکی. شەو هاتن و سینەمایان وەکار خست. کوڕەکان بە گڵمە و بەردەورکە سینەمایان داگرت. دیار بوو دەستی لێهەڵناگرن و دیسان سینەما وەکار دەخەنەوە. نازانم «هاشمی گەرمێنی» لەکوێ مقەستی تەنەکەسازی گیر کەوتبوو، چوو سیمی سینەمای بڕی و لەکاری خست. ئینگلیسی هیچ خۆیان شلوێ نەکرد، بەبێدەنگی کەلوپەلیان کۆکردەوە و خۆیان و ماشێن و سینەما، بە قوونی

---

[1] وەک دەبینن پێشەوای مەزن بۆ بەرژەوەندی کوردستان ناچار بووە هەندێک بڕیار بدات کە ڕەنگە بە دڵی ئەو نەبووبێ، بەڵام بۆ ڕاگرتنی دڵی ڕووسەکان کە دەسەڵاتداری ناوچەکە بوون، ناچار بووە بیانکات. ئەو سەردەم سەرەتای شەڕی ساردی نێوان شۆڕەوی و وڵاتانی ڕۆژئاوایی بوو. ڕووسەکان بەو کەسانە تێکدەچوون کە لە ئینگلیسەکان نیزیک بوون. لێرەدا پێشەوا دوو ئەمر بە کاپیتان دەدات یەکیان تێکدانی سینەمای ئینگلیسەکانە تا نەیەنەوە سابلاغ و یەکیشیان گوشار هێنانە بۆ سەر بنەماڵەی (حەکیم یۆناتان) کە ئینگلیسەکان لێیان میوان دەبن و بە دۆستی خۆیانی دەزانن. ئەوە لە خۆیدا دەبێتە مەترسی بۆ ئەو بنەماڵەیە لەبەرئەوەی ڕووسەکان دەستەڵاتی تەواویان لەو ناوچانەدا هەیە و ئەو کەسانە کە لە ئینگلیسەکان نیزیکن دەکەونە بەر ڕق و قینی ڕووسەکان و لەناویان دەبەن. وەک لە داهاتووشدا دەیخوێننەوە لەناوبردنی بەڕێز خەفور مەحموودیان دەکەوێتە ئەو بازنەیەوە. وێدەچێ کە پێشەوا لەو ڕاستییەی ئاگادار بووبێ بۆیە بە کاپیتان دەڵێ بچنە سەر دوکانەکەی تا بەو شێوەیە شار بەجێبهێڵن و گیانیان ڕزگار بێت لە چنگی ڕووسەکان. وریا

خۆیاندا دا و ڕۆییشتن. بۆ بەیانیش لای نیوەڕۆیە چووینە موغازەی کوڕی «حەکیم وێنەتان»ـی کە موغازەکەی مەشڕووبات بوو. ئێمە چەند نەفەر بووین و چووین دانیشتین، دەستمان کرد بە خواردن و خواردنەوە تا تێر بووین. «حوسێنی خاڵیاغای» (حوسێنی خاڵ ئاغای) زۆر سەرخۆش بوو، دەمانچەی دەرهێنا و هەموو فیشەکەکانی لە شووشەکانی سەر تاقەکەی بەتاڵ کرد و بەو تەقەیە ئەوەی لەو دوکانەدا بوو و ئەوەی کاریشی لێدەکرد، ڕایان کرد بۆ دەرەوە. ئەوجا کە دوکان کەسی تێدا نەما، ڕەجاڵە وەسەرکەوتن و هوجومیان بۆ کرد، ئەوەندەی فوو لە قەننەی بکەی هەرچی مەشڕوب و کەلوپەل بوو بردیان و دوکانێکی چۆلوهۆل لەجێی خۆی ما. کوڕی حەکیمی یەکڕاست دەچێتە لای قازی و شکایەتی لە من دەکات. قازیش پیاوی بەدووودا ناردم و هەستام چووم. بڕێک خۆی لێم تووڕە کرد و گوتی: ئەوە بۆ واتان بەسەر حەکیمزادەی هێناوە؟

— جەنابی قازی من چی بکەم؟ بۆ یەخەی من دەگرن؟ ڕەجاڵە کردوویانە من بڵێم چی؟

بڕێک دڵخۆشی حەکیمزادەی دایەوە و ڕووی دەمن کرد و بە توڕەییەوە گوتی:

— بڕۆ لەپێش چاوم.

من وەدەر کەوتم، بەڵام حەکیمزادە لەلای قازی مایەوە. ئەدی نازانم پاش من قازی و حەکیمزادە چییان لە نێوان ڕابرد. پاشی چەند ڕۆژێک دیتمان حەکیمزادە کۆچ و باری تێکنا و بەرەو ئازەربایجان ڕۆیی.[1] ئەوە هەر لە ئیدارە شارەوانی لەسەرکارم و بە کاروباری شار ڕادەگەم، بەزیاد بێت هەم خەڵکەکە لێم ڕازین و هەم قازی. هەرچی ئەو بیڵێت من دەیکەم. لەو بەینە دا دیتمان کە کوردێکی زۆری عێراقیَ ڕاویان ناون و هاتوونەتە ناوچەی شنۆ و نەغەدەی، بڕێکیش هاتوونەتە سابڵاغ. ڕۆژانە زۆرترین کارم ئەوەبوو کە کۆمەگ و ناوماڵ و ئارد لە ماڵان کۆبکەمەوە و دایانمەزرێنم.

---

[1] کوڕەکەی حەکیم یۆناتان ناوی ( ژۆرژ ئادیسۆن) بوو کە تاقە کوڕی حەکیم یۆناتان بوو. لەپاش ئەو ڕووداوە کۆچ دەکەن بۆ تەورێز. ماڵەکەیان لەلایەن کۆمەڵەی ژێکافەوە بەکرێ وەردەگرن و دەیکەن بە چاپخانە. گۆڤاری نیشتمان و ڕۆژنامەی کوردستان و زۆربەی بڵاوکراوەکانی ئەوسەردەمیان لەو ماڵە چاپ دەکرد. هەڵبەت حەکیم یۆناتان دوو کچیشی هەبوو بە ناوەکانی (لەیلی) و (ڕەجینا). یای (لەیلی) شوو بە پەرویزخانی عەککاس (صیادیان) کە لە وێنەگرە مەسیحییەکانی ئەوسەردەمی مەهاباد بوو دەکات. بەرهەمی ژیانیان کچێک بوو بە ناوی (وێلما) کە مامۆستای خویندنگا بوو. ئەوسەردەم لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ٢٧ و لاپەڕەی ٢ کورتەیەک لە قسەکانی ئەو یایە بۆ پیرۆزباییکردنی دامەزراندنی کۆماری کوردستان وەک مودیری مەدرەسەی کچان، بە زمانی کوردی نووسیوە و بڵاوی کردۆتەوە. وەک دەردەکەوێت یای وێلما نەوەی حەکیم یۆناتان، دوای تێکچوونی کۆماریش لە مەهاباد ماوەتەوە. سپاس بۆ مامۆستا محەممەدی سەمەدی کە ئەو زانیارییانەی دامێ. بۆ زیاتر خوێندنەوە لەسەر ئەو بنەماڵەیە دەتوانن سەردانی کتێبی: (ضمیمه کتاب: نگاهی به تاریخ مهاباد - نووسینی: سەید محمد صمدی ٠ ساڵ ١٣٨٠ - لاپەڕەی ٣٣ تا ٤٣) بکەن. لێرەدا دەبێ ئاماژەی بەو دیدارە گرینەگی پێشەوا و حەکیمزادە (ئادیسۆن) بکرێ و ڕەنگە پێشەوا قاییلی کردبێ کە باشترە ئەو شارە جێبهێڵێ لەبەر ئاسایشی گیانی خۆی. دیارە ئەوانە شیمانە و گریمانەی نووسەری ئەو دێرانەیە.

## گرتنی پادگانیمیاندواو و یارمەتیدانی فیداییەکانی ئازەربایجان

لەلایەکی تریش دەمانبیستەوە کە لەلای ئازەربایجانێ وردەوردە شاڵاو دەبەنە سەر پۆستەکانییان. هاواڵەکانم گوتیان بڕۆ بۆ لای قازی و پێی بڵێ کە ئێمەش بە چەکی خۆمانەوە حازرین بڕۆین بە کۆمەگی ئازەربایجانەوە. منیش چوومە لای قازی و پێشنیاری خۆم و هاواڵەکانم دەگەڵ باس کرد. دەجوابدا قازی گوتی: جارێ دەست ڕاگرن، بۆخۆم پێتان دەڵێمەوە.

چاوەڕوانمان کرد تا قازی پێمان بڵێتەوە، بەڵام قازی چ دەنگی نەبوو. چەند جارێکی دیکەش چوومە لای، کەچی بێسوود بوو تا شەوێکی چەند ئەفسەری شۆڕەوی هاتن و چوون بۆ لای قازی لە مەحکەمەی. هاواڵەکانم گوتیان ئێستا کاتی چاکە بڕۆیە لای و لەکن ئەو ئەفسەرانە داواکارییەکەمانی پێبڵێی. من کە پێشتر چەند جارێک سەبارەت بەو باسەوە چووبوومە کنی شەرمم دەکرد زووزوو بڕۆمە لای و سەری بگرم. ناچار چووم قسەم دەگەڵ «کەریم خوسرەوی» کرد و ئەوم ناردە کن قازی و تێمگەیاند کە دەبێ بڵێ چی. ئەو کە قسەکەی دەگەڵ قازی باس دەکات، قازیش پرس بە ڕووسەکان دەکات و ئەوانیش دەڵێن زۆر باشە، هەرکەس مەیلی لێیە با بڕوات. کەریم هاتەوە و خەبەرەکەی داینێ و گوتی: قازی دەڵێ بڕۆن. منیش هەر ئەو شەوە چوومە گاراجی دوو ماشێنم هێنا و ٤٥ نەفەر کە زۆربەیان قاچاغ و قاچاغچی بوون و هەموویشی بە چەکی خۆیەوە سواری ماشێن بووین و بە نێو میاندواودا چووینە «تەغیابات»[1] کە فیدایی ئازەربایجان لەوێ بوون. «ئارامی هەرمەنی»[2] ساختەچی، ڕەئیسی ئەو فیداییانە بوو. بە واریدبوونی ئێمە زۆریان پێخۆش

---

[1] "تەغیابات" یا "تقی آباد" ئەوکات گوندێکی نیزیک "میاندواو"ێ بووە کە ٢ کیلۆمیتر لەو شارە دوور بوو و لە باشووری ڕۆژهەڵاتی میاندواو هەڵکەوتبوو. ئێستا دەگەڵ شاری میاندواو تێکەڵ بۆتەوە. "تەغیابات" ٧ کیلۆمیتر لە گوندی "کەلبەرەزاخان" یا (سەرچنار)ی کوردنشین دوورە.

[2] سەبارەت بەو کەسە زانیاری زۆر دەست ناکەوێ. وەک دەگوترێ هەرمەنییەکی ئازەریزوان بووە. کوردییەکی باشی زانیوە. دوکتور ئاسۆ (قادر مەحموودزادە) لە کتێبەکەیدا دەڵێ: (کەسێکی دەستڕۆیشتوو بووە لە ناو فیداییەکانی ئازەربایجان و لە "میاندواو" پیاوێکی ناسراو بووە. هەروەها لە ناو فیرقەی دیموکراتدا لە باکۆ بەرپرسیارەتی بەشی دارایی و ئەمانەتداری ئەو فیرقیەی لە تاراڤگە لەسەر شان بووە. برایەکی هەبووە بە ناوی "عیشق خان" کە دواتر لە باکۆ دەگیرسێتەوە و لە سێبەری فیرقە و حیزبی کومونیستەوە دەستی زۆر دەڕوات. خوشکێکیشی هەبووە بەناوی "وانیا" کە ئەویش لە ئازەربایجانی شۆڕەوی دەگیرسێتەوە و مێرد بە پیاوێکی عەڕەبی موسڵاوی دەکات بەناوی "الحیو"). هەروەها یەک لەو کەسانە بووە کە ڕاستەوخۆ لەبن دەستی ئەفسەری تایبەتی ئەرتەشی سوور بەناوی "ئەماز عەلی‌یۆف" کاری کردووە و لە شاری سابڵاغیش کەسێکی ناسراو بووە و تەنانەت لە گێرەشێوێنییەکانی سابڵاغ لە ڕووداوەکانی دوای خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی (مانگی ئووت و سێپتامبری ١٩٤١ی زایینی) دەستی هەبووە. مامۆستا محەممەدی سەمەدی لە کتێبی تاریخ مەهاباد لە زمان مامۆستا مەلا قادر مودەڕەسی لە نامیلکەی (ژ.ک چ بوو؟ چی دەویست؟ و چی لێ بەسەرهات؟ لە لاپەڕەی ١٠٧ باسی ئارامی هەرمەنی دەکات و بە کەسێکی ئاژاوەگێر دەیناسێنێ.

بوو. ئەو شەوە لە «تەغیابات» جێ و ڕێیان نیشان داین. بۆ بەیانی پاش نانخواردن «ئارام» گوتی بڕۆن بۆ میاندواو. «قارەمان» نێوێک کە ئەویش هەرمەنی بوو وەپێشمان کەوت بۆ میاندواو. لەوێ، لە چایخانەی مەلا نێوێک، کردمانە مزڵ کە لەتەنیشت پادگانی، بەرامبەر بە ئیدارەی دیژبان[1]، لای خوارەوەشمان ئیدارەی ئەمنیە بوو، بارگە و بنەمان بە عەرزێ دادا و بۆی دانیشتین. چەند ڕۆژان لەو چایخانەیە بووین، بەڵام سەرباز و ئەمنیە وەدەر ناکەون، شوێنەکانی خۆیان هەموو سەنگەربەند کردووە. جارجار و کەموکوڕ ئاژان دەردەکەون. شەوێک لەدوویان ناردم بۆ «تەغیابات»ێ، کە چووم، چەند نەفەر لای «ئارام» بوون. یەکیان پێیاندەگوت «عەزیمی». پاش چاک و خۆشی کردن دەگەڵ من، ڕووی دە «ئارام»ـی کرد و بە سرت و خورت کەمێک دوان. ئەوجار سێ کەسیان هەستان و دەستیان دە دەستی هەموویان نا و وەدەرکەوتن. ئەوان کە ڕۆییشتن، ئارام ڕووی تێکردم و گوتی:

— دەزانی بۆچی لەدووی تۆمان ناردووە؟ چوار نەفەر پیاوی گەورە هەن، دەبێ لەنێو بچن. ئەو چوار کەسە دەستڕۆیون و پشتیوانی لە دەوڵەت دەکەن و ناهێڵن پادگان و ئیدارەکانی دەوڵەت لە میاندواو، دەستی فیدائیەکان بکەون. ئێستاش لە تۆ بەولاوە لە کەسی تر ڕانابینین تا ئەو کارەمان بۆ بکات.

— ئەو کەسانە ناناسم یەک، دووهەم ئەوهەموو فیدایی ئازەربایجان هەیە بۆچ بەوان ناسپێری؟ ئەو فیداییانە ئەو کەسانە زۆر بەباشی دەناسن و ڕێو شوێنەکەش لە من باشتر شارەزان.

هەرچی گوتم و کراندم، بیانوویەکی هێنایەوە. ئەو هەرمەنییە ساختەچییە زۆر زمانلووس و تەڵەکەباز بوو و ئاخری پیشاندمی و بەڵێنم پێدا. گوتم من ئەو کەسانە ناناسم، دەبێ کەسێکم بە شارەزا دەگەڵ خەی. ئەویش هەمان کوڕە هەرمەنی کە دەگەڵمان هات بۆ میاندواوێ و ناوی قارەمان بوو، بە چاوساخ دایمێ و دەگەڵمان گەڕایەوە بۆ میاندواوێ. هەر ئەو ڕۆژە دەگەڵ هاواڵەکانم لە چایخانەکە دانیشتبووین. هەتیوی هەرمەنی وەژووری چایخانە کەوت و چاوێکی لێتروکاندم و بانگی کردمە دەرێ. «مستەفا زینەتی» ئەوەی دیت و وەدووم کەوتە دەرێ. هەرمەنی گوتی:

— «مەشەدی سەلیمخان» وا لەژێڵلا دێت.

چوومە نێو خیابان و «سەلیمخان»ـیش دەگەڵ چەند کەسان بە قسەکردن لێمان نیزیک دەبۆوە. ئەوانەی دەگەڵی بوون چوون بۆ گاراج و خۆیشی چوو بۆ دیژبان. تاوێکی خۆش لەوێ مایەوە، دیار بوو تەلەفۆنی دەکرد. پاشان لە دیژبان هاتە خوار و سواڵکەرێک لەبەر دەرکی دیژبان دەستی بۆ درێژ کرد و دەریهێنا پارەی دا بە سواڵکەرەکە. لەو دەمەشدا چەند نەفەر نۆکەری ئاغاکانی

---

[1] بەڕێوبەرایەتییەکی سەربازییە کە تایبەتە بە سەربازان. وەک پۆلیسێکن کە کاریان بە سەربازانە. Military police (MP)

دێبۆکری تووشم ببون و ده قسەیان گرتبووم. بایی توورێکیان لێ حاڵی نەدەبووم ئاخر، هۆشێکم هەر لەسەر «مەشەدی سەلیم‌خان» بوو خۆ نەمدەزانی باسی چی دەکەن، هیچ گوێم نەدەدا بە قسەکانیان! لەو عانەیدا خان یەکسەر بە نێوەڕاستی خیاباندا هات تا گەییە ئاستی ئێمە. چاوم لە مستەفای تروکاند و گوتم زووبە. مستەفاش دەریهێنا تفەنگێکی لێدا و کابرا کەوت و کەلاکی درێژ بوو.

ئەو پیاوانەی لەلام بوون، کە ئەوەیان چاوپێکەوت، دەخۆیان نووسان و ڕایانکرد. هەرچی بازار و دوکانی ئەو شارە بوو تێکیان هاویشت و دایانخست و یەکسەر بۆ ماڵەوە. کەس لەو نێوەدا نەما، کوچە و کۆڵان، بازاڕ و خیابانی ئەو شارە چۆلوهۆل بوو. ئێمەش بۆمان نەکرا بگەڕێینەوە بۆ لای هاواڵەکانمان، لەڕاستیدا ئەوان خەبەری ئەو کارەیان نەبوو کە ئێمە کردمان. کە وا دەزانن، دەچنە سەربانی چایخانە و دەوروبەری و ڕووبەڕووی پادگان و ئیدارەی ئەمنییە خۆیان قایم دەکەن و چاوەڕوانی پێشهاتەکان دەبن. من و مستەفاش ڕوومان لەو چایخانەیە کرد کە لەلای کارخانەی قەندی بوو. پاشان چەند ساڵداتێکی شۆڕەوی بە سواری دێنە نێو شار و کەمێک دەخولێنەوە و دەست بەسەر دۆخەکەدا دەگرن. کە وڵات ئەهوەن بوویەوە ئیمەش هاتینەوە لای هاواڵەکانمان لە چایخانەکە. دیار بوو هاواڵەکان لالووت بوون، دەیانگوت:

— بۆچی کە ئەو کارەتان دەکرد بە ئێمەشتان نەدەگوت! با هەموو بەیەکەوە کردبامان. ئەدی گەر کێشەیەک بۆ ئێوە ساز بووبا چیتان دەکرد؟

گوتم من دەمزانی کە «هەرمەنی» بۆ ئەوکارە چاوی لەمن ترووکاند و بانگی کردمە دەر و منیش دووی کەوتم تا ئێوە بەکارەکە نەزانن و کێشەتان بۆ ساز نەبێت و گەر بەڵایەک بەسەرم هاتبا با هەر من تێداچووبام نەک ئێوە. هەمووتان خەریکی قوماركردن بوون و تەنیا «مستەفا» ئاگای لێبوو کە هەرمەنی چاوی لە من هەڵترووکاند بۆیە دوم کەوت، دەنا ئەویشم نەدەبرد.

بەو قسانە ئەهوەنم کردنەوە و لە دڵیان هاتە دەر. ئەوە یەک لەو چوار کەسە لەناو چوو و مایەوە «سەرگوردی[1] ئەمنییە» و خانێکی دیکە بەناوی «سارم خان» و چوارەمین کەسیشم لەبیر نەماوە. هەر ئەو ڕۆژە زۆر چاوەڕێ بووین کە «ئارامە ترکەنی هەرمەنی» کەسێک بنێرێ تا دەگەڵمان بێتە بەڵەدێی و ئەو دووکەسەی دیکەمان نیشان بدات، بەڵام کەس نەهات و نەمانزانی لە ترسان لە چ کونێکدا خۆی شاردۆتەوە. ئێمەش سەرگوردی ئەمنییە باش دەناسین. خۆمان لە کۆڵان حەشار دا بەشکوو بەو شوێنەدا بێت و بڕوات. ئێمە شەش نەفەر، تا لای نیوەشەو چاوەڕوان بووین، کەس بەو ئارامانەدا نەهات و نەچوو، ناچار خەو هێرشی هێنا و چووینەوە بۆ چایخانە و لێینووستین. بەیانی خەبەریان پێداین کە پاشی کوژرانی ئەو خانە، ئیدارەی ئەمنییە بە شەو ڕایانکردووە.

---

[1] پلەیەکی باڵای سەربازی Major - بە فارسی دەبێتە (سرگرد) و بە عارەبیش دەبێتە (رائد)

دەستێک فیدایی ئازەربایجان بە سەرۆکایەتی «ئیلخانی هەرمەنی» لە کارخانەی قەندی بە ماشێنی ڕاوەستابوون، ئێمەشیان گازکرد و سواری ماشێن بووین و وەدووی ئەمنییەکان کەوتین بۆ هەوشار و چارداوەڕوو تا گەییشتینە دێی «ئیفتیخاری چارداوەڕوو». لە ڕێگا دوو ئەمنییە تووش بووین و چەکمان کردن و سواری ماشێنمان کردن. درکاندیان کە چەند نەفەر ئەمنییە لەو دێیە خۆیان حەشار داوە. چووینە نێو دیی. «ئیفتیخار» خۆی و چەند نەفەر لە دێ بوون، هەڵمپێچان بۆ ئەمنییەکان، حاشای دەکرد و دەیگوت شتی وا هەر نییە، ئەمنییەی چی و شتی چی؟! خەریکبووم بیکووژم، کەچی «ئیلخانی هەرمەنی»، سەرۆکی فیداییەکان پێشی گرتم. بە هاواڵەکانم گوت کە دێیەکە هەموو بگەڕێن. لە ماڵە ئاغای دوو بارگین کە وا دیار بوو بارگینی ئەمنییە بوون لە تەویلە دەریان کێشان. دیسان «ئیفتیخارم» هەڵپێچا، بەڵام هەرمەنی گاور ڕازی نەبوو. بەناچار دێمان بەجێهێشت و تا «مەحموودجغ»[1] شوێنیان کەوتین، بەڵام هیچمان دەستگیر نەبوو و گەڕاینەوە بۆ دواوە. لە کارخانەی قەندی دەگەڵ فیداییەکان لێکهەڵبڕاین و ئەوان چوونەوە بۆ «تەغیابات» و ئێمەش هاتینەوە بۆ میاندواو.

ئەوە ئیداراتی دەوڵەت لە تەورێز و مەراغە تەسلیم بە خەڵک و فیداییەکان بوون، لە هەموو شارەکانی ئازەربایجان هەر ئەمنییە و پیاوی دەوڵەتە چەک فڕێدەدەن و هەڵدێن، بەڵام ئەو میاندواوە تەسلیم نابێ. بە کوشتنی سەلیمخان هەوەڵ شەو ئیدارەی ئەمنییە و ئەو خان و مانانەی میاندواو کە لاگیری دەوڵەت بوون هەمووی ڕایان کرد، ماوەتەوە پادگانی میاندواو کە یەک-دوو هەزار سەربازی لێبوو. ئەویش وەک دەیانگوت ئەو «مەشەدی سەلیمخان»ـە پێشی پێگرتبوو کە خۆ تەسلیم نەکەن، گوتبووی تەسلیم مەبن، من ئازووقەی چەند ساڵتان دەدەمێ. ئێستا کە تەشریفی کۆچیدوایی کردوە ئیدی پشت و پەنای سەربازخانە نەماوە و ورەیان دابەزیوە. هەر ئەو شەوە لەلایەن «عەزیمی»ـیەوە ئەمرم بۆ هات کە دەبێ دەگەڵ هاواڵەکانم پادگان دەورە بدەین دەنا ڕادەکەن. شەو لە دەوری سەربازخانە خۆمان حەشار دا. سەربازەکان لە قولەکانەوە قسەمان دەگەڵ دەکەن. لای نیوەشەو بوو سەربازێک لە قولەیەکەوە گوتی ئەوە نەفەرێک دەنێرینە لاتان بۆ قسەکردن، تەقەی لێمەکەن. دیتمان نەفەرێک چرایەکی دەستی لەپێشەوە داییسێت هاتە لامان. گروبانێکی[2] جحێڵ بوو. دەورەمان دا و هێنامانە لای خۆمان. گوتی ئێمە تەسلیم دەبین. منیش چوار نەفەرم دەگەڵ خست و ناردم بۆ تەغیاباتێ. تا ئەوان چوون و هاتنەوە، ڕۆژ بۆوە. چەند نەفەر ئەفسەری ئازەربایجان دەگەڵ ژێنێراڵ عەزیمی هاتن و دەستیان دەناو دەستی نام و

---

[1] گوندی "مەحموود جغ" یا " محمود جق" لە ٥ کیلۆمیتری شاری "سایینقەڵا" یا "شاهین دژ" هەڵکەوتووە.
[2] "گروهبان یان Sergeant" پلەیەکی سەربازییە لە ئەرتەشی ئێراندا. لە ڕاوێژی خەڵکی بەتەمەن بە "گوربان" یا "گروبان" گۆ کراوە.

برێکیشیان شووتی وەبن هەنگڵی دام و لەسەر بارودۆخی سەربازخانە لێیپرسیم و منیش هەمووم بۆ باس کرد. دەو قسانەدا بووین، دیتمان ئەوە فیدایی ئازەربایجان ڕێچکەیان بەستووە و دێن لەژێللا. برێکیان دێن و خۆیان لە عەرزی دەدەن یانی ها، ئێمە سەربازخانەمان دەورە داوە. وردەوردە سەربازخانە خۆی وەدەستەوە دا، عەزیمی خۆی و چەند نەفەر ئەفسەرەکە چوونە ناو سەربازخانە تا کەلوپەل لە سەربازەکان وەرگرن و لە سەربازخانە وەدەریان نێن و ڕەوانەیان کەن بۆ ئازەربایجان، بەڵام ئێمە کە بووین بە باعیسی خۆبەدەستەوەدانی سەربازخانە، ڕێگایان نەدا تا بچینە ناو پادگانەکە تەنیا بۆ دەستخۆشانە دوو ڕەشاشی قوورس و چەند تفەنگی برنوو و هەر نەفەرەو قومقوومەیەکی ئاویان دا بە پێشمەرگەکان و گەڕاینەوە بۆ شار.[1]

لە شاری ئیدارەی نەزمییە دەستی لێنەدرابوو. «باقی حەسەنە شەل»ـی خۆی و چەند پێشمەرگە چوون ئاژانەکانیان چەک کرد. ئیدارەی ئەمنییەش کە پێشتر چۆلیان کردبوو، چووین تا لەوێ جێ بگرین ئەوەندەمان زانی دەستێک سواری فیدایی ئازەربایجان هاتن، برێک خۆیان تووڕە کرد و وەدەریان ناین. باقی حەسەنە شەلی خەریک بوو کێشە بکا، من نەمهێشت و ئەهوەنم کردەوە. بە فیداییەکانم گوت:

— ئێوە شەو لەکوێ بوون کە ئێمە سەربازخانەی دەوڵەتمان بۆ خستن؟ ئێستا شنگڵتان لەخۆتان داوە و هاتوونە سەر حازریوبزری و ئێمە دەردەکەن؟

من لەو کاتەوە ئەو ئازەربایجانانە باش دەناسم و دەزانم چ ماڵێکن! ئەوانە جامینی کوردیان ناوێ. ئێستا نێویان لە خۆیان ناوە (ئازەربایجانی)، لەوەپێش ئەوان بە ئێمەیان دەگوت کورد، ئێمەش بە وانمان دەگوت (عەجەم). ئەو میاندواوە سابڵاغی گرتی، ڕیشەی کارەسات سابڵاغی لەنێوی برد، دەنا ئەوە غیرەتی عەجەمان نەبوو تخوونی خان و مان و ئەمنییە و نەزمییە و سەربازخانەی حکومەت بکەون. زۆرمان کۆمەگ بەو عەجەمانە کرد، وەنەبێ بە خەیاڵ بێت یان درۆ، شایەدی موحتەبەر هەیە. هیچ ئەو پێشمەرگە و هاواڵانەی لە میاندواو دەگەڵم بوون، ئەفسەری شۆڕەوی کە لەو ناوچەیە بوون هەمووی ئاگادارن بەتایبەت، «نەماز عەلییۆف» لە هەموویان ئاگادارترە کە

---

[1] ئەو ڕووداوانەی کاپیتان لێرە دەیانگێڕێتەوە لە هیچ سەرچاوەیەکی کوردیدا نەکەوتە بەرچاوم، یا من نەمدیوە. تەنیا سەرچاوە کە باسی کردبێ ڕۆژنامەوانێکی ڕۆژنامەی دەوڵەتی "اطلاعات" بە ناوی "نجفقلی پسیان" لە ڕۆژنامەکەیاندا چاپی کردووە و هەموو ڕووداوەکانی کردۆتە کتێبێک بە ناوی (مرگ بود، بازگشت هم بود) بەڵام باس لە ڕۆڵی هێزی کوردەکان لە گرتنەوەی ئەو پادگانەدا ناکات. لە لاپەڕەی ١٠٤ دا زۆر بە وردی باسی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانەی میاندوای کردووە کە هەمووی دەگەڵ قسەکانی کاپیتان یەک دەگرنەوە، بگرە زۆر بە وردی ڕێکەوت و ناوەکانی نووسیوە. وەک لە کتێبەکەدا هاتووە، ئەو کەسە کە کاپیتان ناوی هێناوە، بە هەمان شێوە ناوی هاتووە و ئەوەش زیاد دەکات کە ڕووداوەکە لە ڕێکەوتی ١٩ی سەرماوەزی ١٣٢٤ی هەتاوی ڕووداوە و تەنانەت قسەکانی کاپیتانیش پشتڕاست دەکاتەوە کە ئەو کەسە سەر بە دەوڵەت بووە و نەیهێشتووە پادگانی میاندواو بکەوێ، بۆیە کوشتوویانە.

من چیم بۆ ئەو عەجەمانە کردووە و تەنانەت لە داهاتووشدا هەر بۆم کردن کە باسی دەکەم. ئەوەندەم کرد بۆیان کە لەلایەن ئەفسەرانی شۆڕەوییەوە خەڵات کرام. هەر خۆم دەزانم چ عازابێکم بۆ ئەو تورکانە کێشاوە.

بەڵێ، بەو شێوەیە شانبەشانی ئەو ئازەربایجانیانە، میاندواومان لە دەوڵەت پاک کردەوە هەتا دەگاتە «مەحموود جغ» و «هەمولەسوو»[1]. جا «ئارامی هەرمەنی» سپەی داکوتا لە «هەمولەسوو»ـیە. ئاغاکەی ئەو دێیە کە ناوەکەییم لەبیر چۆتەوە یەکجار دەوڵەمەند بوو. ئەو کە ساحێب دێ بوو ڕایکردبوو و ئارامی هەرمەنی بە میراتی ئاغای شاد ببوو و هەموو ئەو قەسر و قوسورەی کە ئاغای جێیهێشتبوو، کێشایەوە بۆ تەغیاباتێ. کاتێک ژنەکەی ئارامی هات بۆ خاکی شۆڕەوی، دوو ماشێنی کەلوپەلی بەقیمەتی دەگەڵ خۆی هێنابوو. ئارام لە زەمانی ڕەزاشای گاراجدار بوو. ئەوەی ڕۆژبەڕۆژ گیری نەکەوتبا نەیبوو بیخوات و هەمیشە مەحتەل بوو. ئیتر بەو سەنەعاتەی دەستی گیر بوو و خۆی دەوڵەمەند کرد و هەتا ملان تێیخزاند.

## قەرار بوو لە تاران بۆ کوردوستان بمرین و نەگەڕێینەوە

پاشان ئێمە هاتینەوە میاندواو. لەوێ گوتیان کە قازی محەممەد هاتۆتە میاندواو و دەیهەوێ بچێتە تەورێزێ. داوای کردووە کە پێش ئەوەی بڕواتە تەورێز، چاوی پێت بکەوێت. ئێستا لە ئیدارەی لای «نەماز عەلییۆف»ـە. کە چووم، سڵاوم کرد و ئەویش بەگەرمی سڵاوی هەستاندمەوە و فەرمووی کردم تا لای دانیشم. زۆر بە ڕووخۆشی حاڵ و ئەحواڵی پرسیم و تاوێکی باش دەگەڵم دوا. «نەماز عەلییۆف» لەلای قازی زۆر هەڵیدامەوە و تاریف و پەسنی منی کرد و هەروا بە دەم پێهەڵاگوتنمەوە لەسەر جێی خۆی ڕاست بۆوە و دوو قوتووی دەرهێنا و دای بە من و گوتی:

— ئەوە خەڵاتی حکومەتی شۆڕەوییە بۆ پیاوە ئازا و نەبەردەکان، دەیدەم بە تۆ، لەبەرئەوەی شایانتە.

منیش زۆرم پیخۆش بوو کە لەکن قازی ئەو خەڵاتەی دامێ، ئاخر هەستم دەکرد کە قازی خۆی بە من ڕووسوور دەزانێت و منیش هەروەها وامدەزانی کە هەم قازی و هەمیش کوردم سەربەرز کردووە. لە کۆتاییدا قازی گوتی:

— من دەڕۆمە تەورێز، تۆش بگەڕێوە بۆ سابڵاغ، لێرە کاروبارت نەماوە.

ئەو ڕۆژە هەموو هاواڵەکان گەڕاینەوە بۆ شاری، لەوێ دیتم «سەید پیرە» لە شوێنەکەی من لە

---

[1] ئەو گوندە "هولاسوو"ـشی پێدەڵێن و لە ٦ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری سایینقەڵا هەڵکەوتوە. سایینقەڵا و میاندوواو ٦٠ کیلۆمیتر لێک دوورن.

ئیدارەی شارەوانییە. دیار بوو کاروباری شاری باش هەڵدەسووڕاند. پاش چەند ڕۆژان قازی لە تەورێز هاتەوە. ئازەربایجان حکومەتی میللی خۆی دامەزراندووە، بەڵام قازی هەر لە هاتوچۆ دایە و جارێ حکومەتی دا نەمزراندووە.

یا ڕۆژێک یا دوو ڕۆژ دەبێ کە قازی لە تەورێزێ هاتۆتەوە. گوتیان قازی بەپەلە تۆی دەوێ. کاتم بە فیڕۆ نەدا و هەستام چووم بۆ فەرمانداری[1] کە ئێستا کراوە بە ئیدارەی حیزبی دیموکراتی کوردوستان. دیتم قازی بەتاقی تەنێ لە ژوورێک دانیشتووە. پاشی سڵاو و چاک و خۆشی گوتی:

— دەزانی بۆچی لەدووم ناردووی؟ کارێکی یەکجار گەورەم پێتە، ڕێگاکەش ڕێگای هات و نەهاتە، کردنی ئەو کارە بۆ داهاتووی کوردوستان زۆر گرینگە، دەڵێی چی؟ دەچی؟ دەیکەی؟

— هەر کارێک ئەمری ئێوەی لەسەر بێت من دەیکەم و بۆ مردنیش ئامادەم، چونکە دەزانم ئێوە خەمی کوردوستانتانە و مردنیش لە ڕێی کورددا بۆ من شانازییە، بەڵێ، حازرم و چ دەفەرمووی با وا بکەم.

— چەند نەفەر ڕووس لە ماڵە حەمەدەمینی موعێنین، دەڕۆیە لایان، ئەوان تۆ دەبەن بۆ تارانێ، لەوێ کەسێک بە تۆ نیشان دەدەن، تۆ دەیکوژی، ترسیشت نەبێ، خۆیان قوتارت دەکەن.

— عەرزم کردی قوربان من بۆ مردنیش بمنێری ئامادەم و سەریشم دەڕنیە دایە بۆ کوردوستان.

کە وامگوت قازی هەستا سەرپێ و توووند دەئامێزی گرتم و گوتی:

— بەڵام بەتەنێ نەچی، هاواڵێکیشت دەگەڵ خۆت بەرە. ئەرێ کام لە هاواڵەکانت دەگەڵ خۆت دەبەی؟

— منیش گوتم: «سمایل»ـی دەگەڵ خۆم دەبەم.

— «وەستا برایم» باشە، ئەوی دەگەڵ خۆت بەرە و بڕۆن و خوداتان دەگەڵ بێت.

قازی هەموو هاواڵەکانی باش دەناسی و دەیزانی کە هەموویان بۆ کوردوستان گیانلەسەردەستن و مەرگی بە دڵ و بەگیان دەکڕنەوە.

گەردن ئازاییم لە «قازی» خواست و خواحافیزیم لێکرد و وەدەرکەوتم. یەکسەر چووم بۆ ماڵە «وەستا برایمی». هەموو نەقڵەکەم حاڵی کرد. ئەویش زۆر کوردانە و مەردانە گوتی:

— زۆر باشە، منیش بۆ قازانجی کوردوستان لە گیانی خۆم درێغ ناکەم و حازرم لە پێناویدا بمرم.

— کە وایە، شەو وەرە ماڵی ئێمە، لەوێ نانومان دەخۆین، پاشان دەچین بۆ لای ئەفسەرە ڕووسەکان.

هەر واشمان کرد، شەو پاشی نان خواردن هەردووکمان چەکمان هەڵگرت و چووینە ماڵە «حەمەدەمین موعێنی». کە وەژوور کەوتین دیتم حەوت-هەشت ئەفسەری زەلام لە دەوری

---

[1] "قایم مەقامی". باڵاترین بەڕێوبەرایەتی دەوڵەتی لە شارەکان.

مێزێک دانیشتوون، کۆڵێکیان کاغەز و ماغەز لەپیشە، یەک دەینووسێ و یەکیتر لێی دەڕوانی. هەمووی هەر خەریکی نووسین و خوێندنەوە بوون. دەمانچە ڕەشاشێکی چووکم پێبوو، لای وەستا برایم بەجێمهێشت و ئەو لای موعێنی مایەوە و منیش چوومە لایان و سڵاوم کرد. یەکیان گوتی:

— کوانێ ئەسلەحەکەت؟

— ڕەشاشەکەم لەودیوە.

ئەوجار دەگەڵم کەوتنە پرسیار و جوابان. لە نێوی خۆم ڕا تا نێوی دایک و بابم هەمووی لێپپرسیم. لەو ئەفسەرانە یەکیان نێوی «بابایۆف» بوو هەر ئەوم وەبیر ماوە کە زۆری پرسیار لیدەکردم. پاشان دوو نەفەر لە ئەفسەرەکان ڕاست بوونەوە و گوتیان وەخۆکەوە با بڕۆین. لەبەر ماڵە موعێنی ماشێن حازر بوو، سواری ماشێن بووین و ڕفاندیانین. یەک لە ئەفسەرەکان فارسییەکی باشی دەزانی و بەفارسی قسەمان دەگەڵ دەکات. لە چایخانەی «بەردەڕەشان»[1] گوتی:

— ئەرێ ئەوە هیچتان نازانن گۆرانی بڵێن؟

— من دەنگم ناخۆشە، بەڵام ئەو هاواڵەم یەکجار دەنگی خۆشە.

هەر وامگوت، وەستا برایم تێیهەڵکرد:

● لێم یاغی، لێم یاغی، شیلانە و گەردن باغی

تا گەیێشتینە پردی «حاجی ڕەسووڵی» لێی نەبڕێوە. لەسەر پردێ ماشێن ڕاوەستا. ئەوەی ماشێنەکەی لێدەخوڕی دابەزی و ئەوەی فارسیشی دەگوت دەگەڵ ئێمە دە ماشێنەکەیدا ما و گوتی:

— ئێوە دەڕۆنە کوێ؟

کە وای گوت هەردووکمان واق ماین و دە یەکتر دەفکرین. گوتم:

— ئێوە دەبێ پێمان بڵێن کە ئێمە بۆ کوێ دەبەن؟

— بۆ «قازی» بە ئێوەی چ گوتووە؟

لە بنی بۆم گێڕایەوە کە قازی بە ئێمەی گوتووە کە ئەو ڕووسانە دەتانبەنە تاران، لەوێ کەسێکمان نیشان دەدەن و ئەوکات ئێمە خۆمان دەزانین چ دەکەین.

لە قاقای پێکەنینی دا و ئەفسەرەکەی تر لە میزکردن بۆوە و هاتەوە سوار بوو. بەیەکەوە دەستیان کرد بە قسان و ئێمەش هیچیان لێ تێنەدەگەییشتین. لە قەراغ میاندواوێ ماشێنەکەی ڕاگرت و گوتی:

ئێوە لێرە ناسیاوتان هەیە؟

بۆ ئەوشۆ لێرە دەبین؟

---

[1] گوندێکە لە سەر ڕێگای مەهاباد و میاندواو هەڵکەوتووە کە ٢٧ کیلۆمیتر لە مەهاباد دوورە و ٣٧ کیلۆمیتریشی دەمێنێ بۆ میاندواو.

کەیفی خۆتانە، حەزدەکەن لێرە بن دەنا بڕۆنەوە سابلاغ.

ئێستا بڕۆینەوە لای قازی چی جواب بدەینەوە؟ بڵێین چی؟ قازی شتێکی بە ئێمە گوتووە و ئێوەش شتێکی دیمان پێدەڵێن!

ئێوەم بۆیە هێناوە تا بڕۆنە سەقز و بزانن لەشکر لە چ شوێنێکە؟ قۆرخانە و کەلوپەلیان لە کوێیە؟

زۆر لەمێژ نییە کە چەند ئاژان لە سابلاغ کوژران، ڕەئیسی ئەو ئاژانانە ئێستا لە سەقزە و من باش دەناسێ و نامهەوێ بچمە وێ.[1]

دەی، با هاواڵەکەت بڕواتە ئەوێ و تۆش لە مياندواو چاوەڕێی بە.

ئێستا من دەستی لێ هەڵناگرم و دەڵێم ئەوەی قازی گوتویەتی دەبێ هەر وا بێت. ئاخری لە قەراغ شاری دایبەزاندین و گوتی:

- کاتێک هاواڵەکەت لە سەقز گەڕایەوە، هەر خەبەرێک بوو بڕۆنە لای «ئەماز عەلی‌یۆف»ـی و بە ئەوی بڵێن.

ئەوان ڕۆییشتن و ئێمەش لە مياندواو لە «خانم و سوڵتانی جوولەکە» میوان بووین.

ئێستا دەگەڵ «وەستا برایم»ـی مشتومڕمانە. من دەڵێم بڕۆ بۆ سەقز، بەڵام ئەو لە من عاقڵتر بوو گوتی:

دەزانی چی؟ ئەو ئەفسەرانە قازی تاقی دەکەنەوە، دەیانهەوێ بزانن کە قازی کەسی وای هەیە بەگوێی بکات و خۆی بۆ بەخت بکات؟!

من دەمگوت وا نییە دەبێ بڕۆیە سەقز و خەبەران بۆ «ئەماز عەلی‌یۆف»ـی بێنێوە پاشان بەیەکەوە دەچینەوە بۆ سابلاغێ.

گوتی باشە من دەچم بۆ سەقز، بەڵام ئەگەر ئەو ئەفسەرانە ڕاست دەکەن خۆیان لە سەقز ڕا هاتوونە سابلاغێ، ئێستا بۆ ئێمە بۆ ئەوێ دەنێرن؟!

هەرچۆنێک بوو ناردم بۆ سەقز و منیش لە مياندواو چاوەڕێی بووم. وەستا تا «زەمبیل»[2]ی دەڕوات و دوو شەو لەوێ ڕایدەبوێرێ و سەری سێ ڕۆژەی گەڕایەوە بۆ لای من. چەند خەبەرێکی بەدرۆی سەقزی بۆ هێنام و منیش وەپێش خۆم دا بۆ لای «ئەماز عەلی‌یۆف» و خەبەرەکانم پێگەیاند. ئەویش بە سەرسەرەکییەوە گوتی باشە بڕۆن. هیچ موبالاتی بە قسەکانمان نەدا. ئەودەم زانیم «وەستا برایم» ڕاست دەڵێ و ئەو ڕووسانە قازی تاقی دەکەنەوە. ئاخر «ئەماز عەلی‌یۆف» من باش دەناسێت، لەمێژ نییە لای قازی خەڵاتی کردووم و دوو قوتووی داومەتێ. کاتێک لە مەنزڵ

---

[1] ئاماژەی کاپیتان بە سەرۆکی شارەبانی ئەوکاتی مەهابادە کە کەسێک بوو بەناوی سەرگورد "قوربانی" کە کوردێکی خەڵکی کرماشان بوو و دوای ڕووداوی گیرانی شارەبانی مەهاباد و کوژرانی زیاتر لە ٥ ئاژان و هەروەها کوژرانی شارۆمەندێکی مەهابادی بە ناوی "عەبدوڵلای مینە خاڵندی" لە مەهاباد ڕای کردبوو و لە سەقز گیرسابۆوە.

[2] "زەمبیل یا زەنبیل" گوندێکە لە ٢٧ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژئاوای بۆکان ولە ٤٩ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژئاوای سەقز هەڵکەوتووە. بە مەڵبەند و ناوەندی ئەویندارانی تەریقەتی قادر/نەقشبەندی دەناسرێت و خانەقای ئەو گوندە مەکۆی مریدانی ئەو ڕێبازەیە.

قوتووەکانم کردەوە، یەکیان دەمانچێکی کۆڵت و قوتووەکەی دیش هەمووی فیشەکی دەمانچە بوو. کە ئەو خەبەرەمان بۆ برد هیچ گوێی نەدایە! پرسیاری نەکرد کە چەند ڕۆژ لە سەقز بووی؟! یان بۆ وا زوو چووی و گەڕایەوە؟!

سەری خۆمان هەڵگرت و گەڕاینەوە بۆ سابڵاغێ. هەر ئەو ڕۆژە من لە بەری چایخانەی «ئەحمەدی» بووم کە دیتمان قازی خۆی و چەند نەفەر لە دوخانیات[1] دەهاتنە خوارەوە. چووینە پێشەوە، کە چاوی بە من کەوت عەجایب ما! سڵاوم کرد و ئەوانەی دەگەڵی بوون لایان دا و منیشی دەگەڵ خۆی برد. چووینە شوێنەکەی خۆی لە حیزب و لە ژوورێک دانیشتین و گوتی:

— جا قسەم بۆ بکە، بۆ وا زوو گەڕایەوە؟ چۆن بوو؟ چیتان بەسەر هات؟ هەموویم بۆ بگێڕەوە.

منیش لە هەوەڵەوە هەموویم چەند کەڕەت بۆ گێڕایەوە. هەر من قسەم بۆ دەکرد و ئەویش لەخۆ دەبۆوە. هەتا دووپاتم دەکردەوە زیاتر پێدەکەنی. لە سەعاتێک بەولاوە، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، بەڵام هێندەی پێخۆش بوو لێی تێر نەدەبوو. ئاخری من بە قازیم گوت کە پێموابێ دەیانهەوێ تۆ تاقی بکەنەوە. کەچی هەمووی حەوتوویەک تێوەرنەسووڕا کە ئاڵای کوردوستان لە سابڵاغ چەقێندرا و حکومەتی میللی دامەزرا.

---

[1] ئەو بەڕێوبەرایەتییەی بە کاری تووتن و سیغار ڕادەگات.



کاپتان حەمەدی مەولودە چرچی

## «غەفووری مەحموودیان» چۆن کوژرا!

جا فتوای چەند نەفەر درا کە دەبێ لەنێو بچن. ئەو کەسانە ئەو چەند ساڵەی خەریکی ئاژاوەنانەوە بوون. پێیێکیان لە تاران بوو پێیێکیان لە کوردوستان. ئۆقرەیان نەبوو تا کورد سەرنەکەوێ. ئەوانە یەکیان «مەحموودیان»، «میرزا ڕەحمەت شافعی» و چەند نەفەر ئاغای مەنگوڕ و گەورک بوون. مەحموودیان لەنێو شکاک و هەرکییان دەسووڕایەوە، دیار نەبوو کە ئینگلیسەکان چییان پێئەسپاردبوو؟ دوو نەفەریان نارد تا لە هەر شوێنێک بێت بیکوژن. یەکیان «سەعیدی حەمە قالەی» و ئەوەی دیش «هاشمی کورد»[1] بوو. ئەوانە زۆر دەسووڕێنەوە بە شوێنیدا، بۆیان نەکرا و گەڕانەوە شار.

ئەو ڕۆژە لە شار بۆ سەربەخۆیی کوردوستان شایی و لۆغان بوو. هەموو ئاغا و چەند شێخ لە شاری بوون. قازی بوو بە پێشەوا. «حەمە حوسێن خان»یش بوو بە فەرماندەی هێز و ئەسلەحە بەسەر پێشمەرگەدا دابەش کرا. ئاڵای کوردوستان هەڵکرا. نێوی ئەو چەند سیخوڕانە گوترا و ئاشکرا بوو. هەر ئەو ڕۆژەش «مەحموودیان» هاتبۆوە سابڵاغ و لە حاجی باوە شێخی میوان بوو.

ئەویش پیاوی ئینگلیسەکانە و هاواڵە دەگەڵ «مەحموودیان».[2] ئەو ناردوویە و مەحموودیانی هێناوەتەوە سابڵاغ. ئەو ڕۆژە هەر ئەو دوو نەفەرە دیاری کران تا «مەحموودیان» لە هەرکوێ بێت سەکەتی کەن، بۆیان نەلوا. فەرمانم بۆ هات تا من یاریدەیان بدەم، منیش گوتم باشە.

دیار بوو، حاجی باوە شێخ بەری دەگرتن و نەیدەهێشت دەریکێشنە دەرێ. پێمگوت کە بۆ ئازەربایجان شاربەدەر دەکرێ تا دەست هەڵگرێ. ئەو گوتی خۆم دەچمە لای قازی و تکای بۆ دەکەم، گوتم من دەیبەمە گاراج تا ڕەوانەی ئازەربایجانی کەم و تۆش بڕۆ لای قازی. مەحموودیانم

---

[1] لەسەر نەمر هاشمی کورد کورتە باسێک لە لاپەڕەی ٤٥٢ بخوێننەوە.

[2] خوالێخۆشبوو حاجی باوە شێخ (حاجی بابە شێخ) سەرۆکوەزیرانی دەوڵەتی موستەقیلی کوردستان بوو کە لە سەردەمی کۆمار زۆر دەنگۆی خیانەت و پیاوی دەوڵەت و ئینگلیسەکانیان پێوە دەلکاند. لە کتێبی: جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد نووسینی پرۆفیسۆر د. وەدیع جوەیدە و وەرگێڕانی لە ئینگلیسییەوە پرۆفیسۆر ی.د یاسین سەردەشتیی لە لاپەڕەی ٥٤٣ دا ئەو شتە باس کراوە. مامۆستا هێمن موکریانیش لەسەر ئەو باسە لە کتێبی "تاریک و ڕوون" و لە بەشی "لە کوێوە بۆ کوێ" سەبارەت بە حاجی باوە شێخ ئاوا دەفەرموێ: [لێرەدا کە باسی حاجی بابەشێخ هاتە گۆڕێ دەمەوێ شتێکی مێژوویی ڕوون بکەمەوە .لە نووسراوی چەند پیاوی بێخەبەردا دیومە و لە خەڵکی ساکاریشم بیستووە تاوانی خەیانەت وەباڵ حاجی بابەشێخ دەدەن. من حاجی بابەشێخم خۆش نەدەویست .چونکە لەگەڵ ئەوەشدا دەیانگوت لە علوومی دینیدا زۆر شارەزایە و ڕیازیاتی کۆن زۆر دەزانێ، پیاوێکی زۆر کۆنەپەرست و کەللەڕەق و خۆپەرست و ناشارەزا بوو. بەڵام زۆر ڕاست و پاک و ئازا و بە بیر و باوەڕ بوو. بە هیچ بارێک تاوانی خەیانەتی پێوە نانووسێ. لەکاتی وتووێژ لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی مەرکەزیدا دوور نییە فریوی خواردبێ و بە هەڵە چووبێ. بەڵام لە ڕێگای ڕاست لاینەداوە.]

دەرکێشا و دام بە «سەعیدی حەمە قالەی» و «هاشمی کورد». گوتم بۆ گاراجی بەرن، بەڵام تا حاجی باوەشێخ دەڕواتە لای قازی ڕەوانەی مەکەن. سەیدێک کەلوپەلی مەحموودیانی بە شانەوە بوو، ئەویشم گێڕاوە و کەلوپەلەکەم دا بە هاشمی. ئەوانیش تا کووچەی جوولەکانی دەبەن. کە گوێم لە دوو تفەنگان بوو، زانیم مەحموودیان کوژرا.

چوومە حیزبی، پڕ بوو لە عەشامات [حەشامات-ئاپۆڕا] و قازی قسەی بۆ دەکردن. تەشریفی حاجی باوە شێخیش لەتەنیشت قازی دانیشتووە. لەپێشدا چییان گوتووە بەیەکەوە، نازانم! چوومە ژوور بە «حەمە حوسێن خان»ـم گوت کە مەحموودیان کوژرا. قازی دەستی بەسەری خۆیەوە گرت و سەری لەسەر میزەکەی دانا، یانی خەمی مەحموودیانی بوو. لەولاشەوە دیار بوو دەنگی مامە شێخ دەهات.



(میرزا خەفور مەحموودیان)
سپاس بۆ کاک فاروق فەرهاد کە ئەم وێنەیەی دامێ

## تۆڵەکردنەوە لە «... ئاغا»

ئێدی من وەدەر کەوتم و چوومە ناو شار. لەو جادە و خیابانانە یەک شایی و هەڵپەڕین بوو نەبێتەوە. تەماشام کرد «... ئاغا» لە مزڵی سمایل ئاغای وەدەر دەکەوێ و بۆ لای حیزب دەچێت. پێشتر دۆست بووین و پاشان لەسەر شەڕەکەی زگدڕاوێ لێم بوو بە دوژمن و پیاوەکانی بە نیوەشەو منیان لەماڵێ دەرهێنا و لەپێش چاوی کۆمەڵێک ئاغا و گزیر جنێو و بێڕێزی پێدەکردم و بە نۆکەرەکانی بەتێهەڵدان دام و فەرمانی دا بمبەنە نێو قەبران بمکوژن تا «سەیدی قزڵقۆپی» تکای بۆ کردبووم و نەیانکوشتم، ئاخرێکەشی شاربەدەری کردم.

بەڵێ، شۆڕشم بۆیە خۆشدەوێ کە ناهێڵێ هیچت لەسەر دڵی بمێنێتەوە. لە بەختی جەنابی ئاغا من لە حیزب وەدەرکەوتم و ئەویش لە مزڵی سمایل ئاغای هاتە دەر تا بچێتە حیزبێ. لە چەقی خیابانێ تووشی بووم کە دەگەڵ چەند نەفەری دیکە بوو. کە چاوم پێی کەوت، وەکوو گوڵ گەشامەوە. چوومە پێشێ و سەرم نیو گەز بۆ دانواند. ئەوجا سەرم هەڵێنا و دەستم لەسەر سینگم دانا و سڵاوێکی شەقم کرد و گوتم:

— یاخوا بەخێرێی ... ئاغا!

ئەوە نیو سەعاتیش دەبێ کە مەحمووديان کوژراوە و ئاغاوەت بە بیستنی ئەو خەبەرە کێچیان دەکەوڵی کەوتووە، هەر تێکداوێن و سەریان لێشێواوە. ئەو چەند کەسەی دەگەڵیشی بوون وەک لاڵ و کەڕ، دمیان هەڵناپچڕێ. قۆڵی ... ئاغام گرت و گوتم:

— فەرموو ئاغا گیان.

ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و پشووی سوار بوو. ئەوەندە زمانی گەڕا و گوتی:

— کاک حەمەد بۆ کوێ؟

ئەی ئەی! خۆ پێشتر ناوم لەلای ئەو (هەتیو) بوو، ئێستا بۆ بووم بە (کاک حەمەد)! هەر پێم سەیر بوو! گوتم:

— مەترسێ، من وەکوو تۆ ناکەم. ناتکوژم، بەڵام هەڵتدەپەڕێنم و سەمات پێدەکەم، هیچی تر ناکەم.

— بەڵێ!

جا ئەوەی بۆتان دەگێڕمەوە بۆ درۆ و ڕاستیان بڕۆن لە سابڵاغیانی بپرسن. لانیکەم ۲۰۰۰ نەفەر ئاگایان لەو ڕووداوە هەیە. وەک باسم کرد لە هەموو شاری هەڵپەڕین و شاییگێڕان بوو. خیابان پڕە لە ئاغاوەت، کەس نییە زار هەڵپچڕێت و تکایەکی بەخێری بۆ بکات و قوتاری بکەن. دەستی کە هەر وا بە دەستمەوە بوو، ڕامکێشا و هێنامە نێو هەڵپەڕینێ و دە دەستی «ڕەمەزان» نێوێکم هاویشت کە لە منداڵییەوە جێگای توونخانە بووە. لات و شەڕلاتانی وەک خۆی کەم بوو. ئەو

لیباسانەی دەبەری دایە، ئاوری تێبەردەی بۆسۆی نایە، ئەوەندە چڵکن و دژوێنە. ئەوەی لە دوورەوە وەستابوون، پێیاننا‌خۆشە کە وا لە ... ئاغا دەکەم و ئەوەی لە پێشێش وەستاوە پێیانخۆشە و بە چەپڵەلێدان و «مەملیمەمۆ» گوتنەوە چاو لە ئاغای دەکەن کە چۆن هەڵیدەپەڕێنم. خۆشم لەنێو داوەتەکە چەپڵە لێدەدەم و دەگەڵی دەسوورێمەوە ناهێڵم شلی کاتەوە. تا شەکەت بوو هەڵمپەڕاند. ئەوجا گوتم:

— ... ئاغا ئەو دەهۆڵ و زوورناڵێدەرانە شاباشیان دەوێ.

بە نۆکەرەکەی گوت و ۲۰۰ تمەن درا بە شاباش. جا گوتم:

— لەوە زیاتر کارم پێت نەما، فەرموو برۆ، من وەک تۆ ناکەم دەنا دەمتوانی زۆر شتت بەسەر بێنم.

سەری خۆی داخست و لە شەرمی عالەمێ ڕۆیی و هەر ئەو ڕۆیینە بوو ئەدی چاوم پێینەکەوتەوە. جا شۆڕش شتێکی زۆر باشە. ئاخ و داخ ناباتە ژێر گڵی و پیاو بە ئاواتی خۆی دەگا. با ئەوەش لێرە ڕاوەستێ.



## بڕیاڕی لەناوبردنی میرزا رەحمەتی شافعی!

میرزا ڕەحمەتی شافعی بە من ئەسپێردرابوو تا گەر لە نێو هەواشدا بێت، بیدۆزمەوە و شورت و گومی کەم. لە ڕاستیدا دەبوو لە پێش مەحموودیانیش بکەوێ، بەڵام خۆی حەشار داوە و کەس نازانێ لە کوێیە! چەند کەڕەت لە دەوروبەریماڵیان سووڕم داوە، کەچی وەبەر چاوم ناکەوێ. کاتێک لە داوەت و هەڵپەڕاندنی ... ئاغای قوتار بووم، گەڕامەوە تا بڕۆمەوە بۆ ماڵێ و بە بەر داڵانی حیزبێدا هاتم، تەماشام کرد میرزا ڕەحمەت هەڵتەکهەڵتەک وەسەر پلیکانەکانی حیزبی دەکەوێت و دەیهەوێ بچێتە لای قازی. مستەفای زینەتیشی بەدووایەوە. لە داڵانی حیزب پێشەوبەرم لێدا، وا شێوا بوو نەبێتەوە، کە چاوی بەمن کەوت گوتی:

— قازی لەماڵە؟



لە ڕاستەوە: کەسی دووەهەم میرزا ئەحمەدی ئەشعەری (شارەداری مەهاباد)، میرزا ڕەحمەتی شافعی و پێشەوا قازی محەممەد.

وا زمانی شکابوو کە دەیویست بڵێ: قازی لە حیزبە؟ دەرکەی کردەوە و یەکسەر چوو بۆ لای قازی. (...) قازی بەپێوە ڕاوەستا، چاو لە میرزا ڕەحمەتی دەکا و هیچ قسان ناکات. منیش لە تەماشای ئەو دیمەنەم. قازی ڕووی دەمن کرد و بە ئاشکرا بەمنی گوت: حەمەد، کارتان پێی نەبێ. ئەوجار ڕووی دە میرزا ڕەحمەتی کرد و گوتی: **بڕۆ ئازادی. حەمەد، بەڕێی کە!**

وەپێش خۆم دا، هەر ئاوڕ دەداتەوە دوواوە، منیش تا دەرکی دەرێ بەڕێم کرد، ئەو ڕۆیی و گەڕامەوە لای قازی. لە ژوورەکەیدا بەتەنێ بوو، خەریک بوو بڕواتەوە بۆ ماڵ، گوتی:

— خەبەرم زانیوە ... ئاغات هەڵپەڕاندووە، جارێ وەختی ئەو کارانە نییە.

تا بەر دەرکی ماڵی دەگەڵی چوومەوە و لەوە زیاتر چی تری لە بابەت ... ئاغاوە نەگوت! منیش ئەوەندە هەڵسووڕابووم، ماندوو ببووم و چوومەوە ماڵێ.

## به پلەی کاپیتان بووم بە فەرماندەی پۆلی هەوشار و چارداوەڕوو

ئەوە پێشمەرگە و ئەفسەر هەموو لیباسی ڕەسمی لەبەر دایە، بەڵام کەس لەمن ناپرسێ! «محەممەدی نانەوا»ـی ئەمر فەرماندەی هێزە. لەمێژیشە نێوانمان نییە. هەرچەند خۆشی لەمن نەدەهات، بەڵام لەنێو ئەو هێزەی کوردوستاندا، دوو یان سێ ئەفسەری وەکوو نانەوا هەبوویا، کوردوستان دەستی زۆر درێژ دەبوو، بەڕاستی لەو ئەفسەر و ئەوانەی لە حیزبدا بوون لە هەموویان دڵسۆزتر بوو. حکومەتی ئێران زوو فەوتاندی، قازی بە نومایەندە ناردبووی بۆ سەقز و بانە. سواری فڕۆکەی بوو لە سەقز دەچوو بۆ بانە، فڕۆکە سووتا و فڕۆکەوانەکە بە چەتر قوتار بوو. «ڕەزمئارا» بەو جۆرەی کوشت. ئەگەر ئەو مابا کوردوستان وای بەسەر نەدەهات. هەرچی باسی محەممەدی نانەوا بکەم کەمم گوتووە، ئەوندەی دەڵێم کە کەس لە محەممەد دڵسۆزتر نەبوو بۆ کوردوستان. با بێمەوە سەر باسەکی خۆم.


کۆلۆنێلی شەهید محەممەدی نانەوازادە

جا زۆر لەسەر دڵم گران بوو کە کوڕی «تابانی» لیباسی ئەفسەری دەبەر بکات و چەند ئەستێرەی لەسەر شانی بێت، کەسیش لەمنی نەدەپرسی و قازیش نەیدەویست من دەستدرێژ بم. شەو دەگەڵ چند لە هاواڵەکانم لە مێهمانخانە بووین. ئەوەندەمان زانی سێ نەفەر لە ئەفسەرەکانی کوردوستان وەژوور کەوتن و بە ساحێب مێهمانخانەکەیان گوت:

– ئەمشەو جێژنەمانە، هەموو ئەفسەرەکان لێرە دەخۆن و دەخۆنەوە.

بە ڕەحمەت بێ «محەممەد نازمی» هاتە پێش میزەکەی ئێمە و گوتی:

– ڕەجا دەکەم ئێوەش زوو قوتار بن، ئێستا ئەفسەرەکان دێن، جێگایان بۆ چۆڵ کەن.

بەسەر چاوم!

لە لامان دانیشت و بڕیک لاتاوی هاویشت گۆیا من لە کاروبار دەستگیر نیم، بەڵام هیچم

نەگوت، نە کەم، نە زۆر! هەستاین وەدەر کەوتین. ئەفسەرەکان ئەوشەوە جێژنەیان کرد، ئێمەش بە دڵساردی بۆمان چۆڵ کردن. هاواڵەکانم برێک قسەیان کرد و لۆمەیان دەکردم گۆیا ئەوهەموو شەڕەشەقەی بەسەرمان هاتووە بەخۆڕایی چوو. لەبەر لۆمەی خەڵکی چەند ڕۆژان وەدەر نەکەوتم. دەچوومە باغی و کاروباری باغەکەمم دەکرد و شەو دەچوومەوە بۆ ماڵ. لام وا بوو کە قازی چاری نەدەویستم و نەشیدەویست بێمە کایەوە، سەرزارەکی زۆرم دەگەڵ ڕووخۆش بوو. ئەوانەی لە دەوروبەری قازی بوون هەموو ئاغا، شێخ و مەلا بوون کە هیچی خۆشییان لە من نەدەهات. هەر ئەوانەش بوون چووبوون دەبن پیلی قازییەوە و دڵی قازییان لە من ڕەش کردبوو. لەپێشدا قازی زۆری حورمەت دەگرتم ئێستا، بەو جۆرەیە. هیچ شتێک ئەمنی نەکوشتووە ئەوە نەبێ کە چوومەوە بۆ ماڵ، خورشیدی ژنم گاڵتەی پێدەکردم. زۆرجار شەڕم دەگەڵ دەکرد. لە شەرمی هاواڵەکانیش سەرم هەڵنەدەهات. ئەو چەند نەفەرەی هاواڵم ئەوانیش وەکوو من هەموو تفەنگیان دراوەتێ، بەڵام وەکوو من بێکارن و زۆرم تانە لێدەدەن. منیش جوابێکم نییە بیاندەمەوە، سەرم بەردەدایەوە و بێدەنگ دەبووم. تا بڵێی ناخۆش بوو، هەستم دەکرد بە گەمژەیان زانیوم و وەک ماشە پۆلوویان پێگرتووم. هەستێکی یەکجار ناخۆش بوو.

ئەوڕۆژە لە باغ بووم خۆم بە کارانەوە گەرم کردبوو، داخ و قینی خۆم بە باغی دەردەکرد. تەماشام کرد دوو سوار تەقڵەکوت دێن. یەکیان «حەبیب»ـە و ئەوەی تریان «وەستا برایم». بە هەناسەبڕکە هاتنە پێش و گوتیان:

— قازی تۆی دەوێ!

— قازی منی بۆ چییە؟

— نازانم!

بەتەما بووم نەچم، بەڵام فکرم کردەوە، ئێستا قازی ڕەئیسی جمهورە، قسە لە قسەی بکەم خەراپ دەبێ. وەپێش خۆیان دام بۆ لای قازی. کە چووم، دیتم قازی لەبەر هەیوانی حیزبێ بوو و دەگەڵ چەند نەفەران قسەی دەکرد. لە قسان کە قوتار بوو سڵاوم کرد و پاشی سڵاو ئەستاندنەوە منی بردە ژوورەکەی خۆی و دایینیشاندم و برێک حاڵ و ئەحواڵی پرسیم پاشان گوتی:

— چەند ڕۆژ بوو دیار نەبووی؟ خەریکی چی بووی؟

هەرچی گوتی جوابم داوە، ئاخری گوتی:

— تۆم کردووە بە فەرماندەی پۆلی هەوشار و چارداوەڕوو، دەرەجەشت کاپیتانە، بڕۆ لای حەمە حوسێن خان.

هەستام چووم بۆ شوێنەکەی حەمە حوسێن خانی، چەند ئەفسەر لەلای دانیشبوون، سڵاوم کرد و دەستمان کرد بە قسان. لەپێشەوە تاوانباری کردم کە من چەند ڕۆژە دیار نیم و لە خزمەت دوور کەوتوومەتەوە و لەو شتانە. بەڵام هەردوو قازی بەقەستی خۆیان لە من قەڵس دەکرد. خەڵک

چووبوونە لای قازی و گلەییان لێکردبوو کە بۆچی حەمەد دە کایەدا نییە؟ لە کوێیە؟ کێچییان دەکەوڵی کەوتبوو. بە هەرەداوە[1] لەدووی منیان نارد و کردیانم بە فەرماندەی پۆلی هەوشار و چارداوەڕوو. حەمە حوسێن خان گوتی:

— بەیانی وەرە بەر مزگەوتی شادەروێشی، «مەلا مستەفا بارزانی» خۆی و دارودەستەکەی دێن بۆ لای ئەفسەرەکان.

بۆ بەیانی هەموو ئەفسەرەکان لەڕیز دران. مەلا مستەفا چەند نەفەری دەگەڵ بوو. قازی خۆی لەوێ بوو و لەپێشدا دەگەڵ مەلا مستەفا دەستیان لە دەستی یەکتر نا، پاشان هات بۆ لای ئەفسەرەکان. محەممەد نانەوا فەرماندەی هێز بوو و یەکبەیەک ئەفسەرەکانی بە مەلا مستەفا ناساند. ئەوە فڵانە کەسە و فەرماندەی فڵانە جەبهەیە تا گەیشتنە ئاستی من و محەممەد گوتی: ئەوە حەمەدی مەولوودی، فەرماندەی پۆلی هەوشار و چارداوەڕوو. ئەوجار قازی نوتقی کرد و مەلا مستەفاش دوای ئەو. پاشان قازی و مەلا ڕۆییشتن و ئێمەش هەر کەسە چۆوە سەر ئیشی خۆی. بەیانی قازی لەدووی ناردم و چووم، گوتی:

— دەڕۆیە بۆکان و ناچی بۆ هەوشار.

یەکجار زۆرم پێخۆش بوو، بە خۆشیخۆشی چوومەوە ماڵێ، بەڵام ئەوانەی دەگەڵ من زۆریان زەحمەت دیوە، کەسیان ڕێگا نەداوە، هەموو سەراسیمە دەسووڕێنەوە. منیش یەکجار دوودڵم کە ئەو کارە بکەم یا نا! ئاخر چۆن دەبێ ئەو کەسانە لە ڕۆژە سەختەکاندا دەگەڵم بوون تا کوردوستانمان گەیاندە ئەو ڕۆژە و ئێستا وەلاوەیان بنێن!؟ هەرچی فکرم لێدەکردەوە نەمدەتوانی ئەوە قەبوڵ بکەم. هەر ئەو ڕۆژە هەستام چوومەوە لای قازی و ئەوەی زانیم و دە دڵمدا بوو بە قازیم گوت. فەرمووی:

— نێوی هەموویان دەزانی؟

— بەڵێ.

— هەموویان کۆ کەوە و ئێوارێ بیانبە ئیدارەی.

ئێستا چاوەڕێم تا کەی قازی ئەمر بکات، بڕۆمە بۆکانێ. بۆ ڕۆژێک دواتر قازی گوتی ساز بە بڕۆ بۆ «سایینقەڵا»ـیە. بۆ بۆکان پەشیمان ببۆوە. ئەو سەید و شێخ و مەلا و ئاغاوەتانەی لە دەور و پشتی قازی بوون، قازییان لە خشتە برد و لەجیاتی من «محەممەدی نازمی» ڕەوانەی بۆکان کرا.

---

[1] ئەم وشەیە کەمێک نامۆ دەنوێنێ. پێموابوو کە مەبەستی (هەڵەداوان) بووە، بەڵام نەمتوانی خۆم قاییل کەم، لەبەرئەوەی زۆر بە ڕوونی وشەکە بەم شێوەیە نووسراوە، بۆیە منیش دەقاودەق لێرە نووسیومەتەوە.



مەهاباد - ساڵی ١٣٢٥ هەتاوی، سەردەمی کۆماری کوردستان. لە ڕاستەوە شەهید کۆلۆنێل محەممەد نانەوازادە، کاپیتان محەممەد خەلیل موەفەقی و میرزا ڕەحیم جەوانمەردی قازی.

# دەفتەری ژمارە (۴)

**ڕووالەت و تایبەتمەندییەکانی دەفتەری ژمارە (٤)**

دەفتەری ژمارە چوار هاوشێوەی دەفتەری ژمارە یەک و سێ، ١٧ سانتیمیتر پانایییەتی و ٢٠،٢ سانتیمیتر درێژایی. ڕووبەرگێکی پێوە نییە. زۆر ئالۆز و هەلوەشاوەیە و کاتێکی زۆری گرت تا ڕێکم کردوونەوە. دەفتەرەکە ١٧٦ لاپەڕەیە کە هەمووی ڕەش کردۆتەوە. لاپەڕەکان کاخەزی ناسکی بۆرن کە بە «کاهی» ناودێرن و خەتەکانی درێژاودرێژ و پانەوپانن بەسەر یەکتردا هاتوونەوە کە چوارگۆشەی ورد دروست دەکەن.

## سایینقەڵا[1]


مەلا مستەفا بارزانی و پێشەوا قازی محەممەد

پێشەوا گوتی دەبێ بچی بۆ سایینقەڵایە. «ئارامی هەرمەنی» فەرماندەی ئازەرییەکانە و تۆش بە بەشی کوردان ڕادەگەی. هەر زوو وەڕێکەوتین. «ئیفتیخار» و «عەلیڕەزاخانی چارداوەڕوو» بە درۆ هاتبوونە لای پێشەوا و وەفاداری خۆیان پێشان دابوو و هەریەکە نیشانێکی کوردوستانیان لەسەر سینگیان قاییم کرا، وەک ئەوەی چەند ساڵان دە ژێر هەردداا کاریان کردبێت و ئێمە نەمانزانیبێت. بە فیزێکی یەکجار سەیرەوە دەگەڵمان هاتن بۆ «هەوشاری».

ئەو ئاغایانە دەبوایە هاتبان بۆ ئیدارەکردنی من و ئەو چەند کەسەی دەگەڵم بوون. دەبوایە وەک ئەفسەرێکی کوردوستان دەستیان بۆ هەڵێنابان و ئەوانیش بە فیزێکی لە ڕادەبەدەر وەڵامیان دەدایەوە و وەژووری ئیدارەکەمان دەکەوتن و دەستیان دەکرد بە قسەی قۆڕقۆڕ و وایان پێشان دەدا کە سووتاون بۆ کوردوستان، منیش وامدەزانی بەڕاستییانە.

گوتیان ئێمە ١٠٠ پێشمەرگە بە خۆبەخش پێشکەش بە دەوڵەتی کوردوستان دەکەین. هەموو خەرجیان لەسەر ئێمە بێت. داوایان لێکردم کە من تەنیا داوای تفەنگ و سیلاح و فیشەکیان بۆ لە سابڵاغ بکەم. منیش نامەم نووسی بۆ سابڵاغ و قازیش دەستوبرد ماشێنێکی تفەنگ و فیشەک بۆ

---

[1] سایینقەڵا (شاهین دژ) لە ناوچەی هەوشارە. ئەو شارە ٨٥ کیلۆمیتر لە باکووری ڕۆژئاوای "تیکاب"، ٥٥ کیلۆمیتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی "میاندواو" و ٤٥ کیلۆمیتر لە ڕۆژهەڵاتی "بۆکان" هەڵکەوتووە.

ناردم و منیش تەسلیم بە ئاغاكانم كرد. ئەو پێشمەرگانەی دەگەڵ من بوون، زۆریان پێگوتم كە ئەو ئاغایانە مارن، ڕۆژێک دێت كە پێمانەوە بدەن بەڵام من لێیان تووڕە دەبووم دەمگوت ئێوە نازانن، ئەوانە لە دەستی قازی نیشانی كوردوستانیان وەرگرتوە و خیانەت ناكەن. هەروەک باسم كرد، پیاوەكانی «عەلیرەزاخانی چارداوەڕوو» ڕۆژانە دەهاتنە ناو ساینقەڵایە و چەند كاتژمێرێک بە شەقام و كۆڵانەكانی شاردا دەخوولانەوە و عەلیرەزاخانیش وەک ئەفسەرێكی دڵسۆز وەپێشیان دەكەوت. لەو سەر و بەینەدا چەند كەس لە فیداییەكانی ئازەربایجان هەڵاتن و هاتنە نێو ئێمە. جا ئەوە سەیر بوو كە لە نێو ئێمەدا جاسووس و پیاوخراپ زۆر بوون و لەناو ئازەرییەكانیشدا هەر مەپرسن، وەک خۆڵێ هەبوون. ئێمە تەلەفۆنمان نەبوو، دەبوایە چووباین بۆ ئیدارەی ئازەرییەكان تا تەلەفۆن بكەین بۆ سابڵاغ. ئەوەندە خەراپ بوون كە ئیزنیان نەدەداین. كە ئەو شتانەم دەدیت وردەوردە منیش دڵم لێیان ڕەش بوو. ئیتر وایلیهاتبوو كە ئەوەندەم ڕق لە ڕەزاشای نەبوو، ئەوەندەم ڕق لەوان بوو. ئەوە منیش بێخەبەرم كە هەموو دووژمنان كلكیان لە دژی ئێمە لێكهاڵاندووە، هەتا ڕۆژێكیان وەختابوو لێكراكێشین، تا ئەوان پاشەكشەیان كرد. دەنێو ئێمەدا ئاغاكانی چارداوەڕوو ئێمەیان هان دەدا تا دەگەڵ ئازەرییەكان بیكەین بە كێشە و لە ناو ئازەرییەكانیشدا دووژمنەكانی ئەوان. تا شەوێكی ژێنێراڵ «كەبیری»[1] و «شەبوستەری»[2] هاتن بۆ ساینقەلایە. شەو لەدوویان ناردم و منیش چووم. پاشی قسە و باسێكی زۆر گوتیان كە بۆمان سەلماوە ئەو ئاغایانە لە نیوان ئێمە و ئێوەدا ئاژاوە دەگێڕن و لە ڕاستیدا دووژمنی هەردووک لامانن. من كە ئەو قسانەم بیست زانیم كە هەڵە نەبووم و وا دیارە لایەنی ئازەربایجانیش ئەو هەستەی منیان هەیە. بۆم باس كردن كە هەركات دەچم بۆ تەلەفۆنكردن، بەربەستم بۆ ساز دەكەن. بۆ هەر ئیشێک و ئاتاجێک بچینە لایان، هاوكاریمان ناكەن و كۆسپ دەخەنە سەر ڕێمان و بە ئانقەست لە نێوانماندا نەمامێ دەكەن. پاش ڕاوێژێكی زۆر پێشنیاریان كرد كە بۆ ئەوەی كێشەكان چارەسەر بێن دەبێ لە چنگی ئەو ئاغایانە خەڵاسیمان بێت. وتم چۆن؟ گوتیان تۆ كارت نەبێ، تەنیا هەوڵ بدە ئەو دوو كەسەمان بۆ لە داو باوێ باقییەكەی ئێمە دەیكەین. من گوتم دەبی قازی لەو كارە ئاگادار بكەمەوە. ئەوان نەیانهێشت و گوتیان پێویست بە قازی ناكات، هەرچی ڕووی دا لەسەر ئێمە. بەیانی بەپێی بەرنامە ناردم لەدوای «ئیفتیخار» و «عەلیرەزاخان» تا بە بیانووی ئەوەكە ئەسلەحەی قورسمان بۆ هاتووە و دەبێ بێن وەریبگرن و ئیمزای بكەن بەشكوو بیانێرمە «هولەسوو».[3]

---

[1] دەبێ مەبەستی "ڕەبیع كەبیری" بێت كە لە دەوڵەتی ئازەربایجاندا وەزیری پۆست و تێلێگراف و تێلێفۆن بوو.

[2] ڕەنگە مەبەستی حاجی میرزا عەلی شەبوستەری سەرۆكی مەجلیسی نەتەوەیی ئازەربایجان (سەرۆكی مەجلیسی ئەیالەتی)، بێ.

[3] ئەو گوندە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری ساینقەڵا هەڵكەوتووە كە ١١ كیلۆمیتر لەو شارە دوورە. بە كوردی "هومەلەسوو یا هولەسوو"ی پێدەگوترێ و بە ئازەریش "هولاسوو".

ئازەرییەکان زۆر قەولی سەیر و سەمەرەیان پێدەدان، خولاسە کردیانن بە شا و لەسەر تەختیان دانان، تا بەشکوو ڕازی بن بچن بۆ «هولەسوو»، هەموو هاتن بەڵام «ئیفتیخار» نەهات، کوڕەکەی دەیگوت نەخۆشە و نەیتوانیوە بێت. گوتمان نابێ و دەبێ ئەویشتان دەگەڵ بێت. دڵیان خۆش بوو و هەر فیکەی سمێڵیان دەهات و وەیاندەزانی ڕاستە! هەموویان بە خۆشیخۆشی گەرانەوە بۆ سایینقەڵایە. لەو بەینەیدا من بە «یۆسف خان»ـی کوڕی ئیفتخارم گوت کە گەر بەیانی بابت چاک بۆوە وەرنەوە بۆ سایینقەڵایە و بەیەکەوە دەچین بۆ هولەسوو. ئەو ئەسلەحە و شتانەتان دەدەینێ و وەریگرن و بابیشت دەبێ بنەکەی ئیمزا بکات. گوتی باشە و بە سروودخوێندن و بە ئەی ڕەقیب گوتنەوە لە شاری وەدەر کەوتن. بۆ بەیانی ئیفتیخار و عەلیڕەزاخان دەگەڵ چەند نۆکەریان هاتنە ئیدارەکەمان. گوتیان با بڕۆین بۆ هولەسوو. من بە بیانووی هەندێک کاری پێویست مامەوە و بەڵێنم دانێ کە بۆ لای چێشتانێ دێمەوە لاتان. ئەوانم بەڕێ کرد. مەبەستیش ئەو دوو کەسە بوون. کە دەچنە ئەوێ، دوو کاتژمێری پێناچێت کە سەری هەردووکیان بە گۆمێدا دەکەن و بە نەمانی ئەو دوو کەسە، وڵات ئارام بۆوە.[1] دەگەڵ ئازەربایجانییان وەک برایانمان لێهات. ئەو قین و بوغزەی پێشتر هەبوو، هیچی نەما. بۆ هەرشتێک دەماننارده لایان، نەیاندەگوت نا. ئەو دوژمن و ناحەزانەی لەناو ئازەرییەکانیشدا بوون، دەستیان کێشایەوە و نەمامییان نەدەکرد. وەک ئاو بە ئاور داکەی وابوو و وڵات دامرکا.

بەڵێ، چەند ڕۆژێک پێچوو من چوومەوە بۆ سابڵاغێ. هەر ئەو ڕۆژە قازی ناردی لەدووم. گوتی هوردووی ئێران هاتوونە «تیکانتەپە»ـی هەوشاری و دەگەڵ هێزی ئازەربایجان شەڕیانە، دەبێ بگەڕێیەوە سایینقەڵایە. ئەوە «سەعیدزادە»[2] دەگەڵ دەستێک پێشمەرگە دەڕۆن بۆ یارمەتی ئازەرییەکان و تۆش دەبێ بگەڕییەوە و هاواڵەکانت هەڵگری و بە هانایانەوە بچی. گوتم بەسەر چاو. ئیتر بێئەوەی لە ماڵ و منداڵم ماڵئاوایی بکەم هەر لەکن قازی هاتمە دەر ماشێن ئامادە بوو، سوار بووم و یەکسەر بۆ سایینقەڵا. پێشمەرگەکانم ئامادە کرد و چووم بۆ هەوشار. «پیرزادە» ناوێک، ئەفسەری ئازەرییەکان بوو کە فەرماندەیی شەڕەکەی دەکرد. لەولاشەوە سەرهەنگ «موزەففەری» گەورەی هێزی ئێرانییەکان بوو کە خەریک بوو هەوشار بگرێت. پاش شەڕێکی کەم، هێزی ئێران تێکشکا و کشانەوە. ئێمە نەگەیشتینە ئەو شەڕە. خەتای سەعیدزادەی بوو. لە گوندێک

---

[1] سەفەرخان قەهرەمانیان لە کتێبی بیرەوەرییەکانیدا بەناوی (خاطرات صفرخان) کە بەڕێز عەلی ئەشرەف دەرویشیان بۆی نووسیوەتەوە، لە لاپەڕەی ٦٥دا بە وردی ئاماژە بەو ڕووداوە دەکات و دەڵێ لە گرتنی ئەو کەسانەدا بەشدار بووە، بەڵام ئەو بێ ئەوەی ئاماژە بە کاپیتان بکات، دەڵێ کە ئەو ئاغایانەمان بە خۆیان و بە ٧٠ کەسانەوە گرت و ڕەوانەی تەورێزمان کردن. لەوێ ئەو دوو سێ کەسە ئێعدام کران و ئەوانەی تریش زیندانی درێژخایەنیان بۆ بڕینەوە. بۆ ئەوەی صفرخان قهرمانیان زیاتر بناسن بڕوانە لاپەڕەی ٤٣٠ی ئەم کتێبە.

[2] بە ئەگەری زۆر مەبەستی لە بەڕێز "محەممەدی سەعیدزادە"یە.

کە ناوی (قزڵ قەبر)[1] بوو، زۆری خۆ خافڵاند و چەند جارێکیش دمەقاڵەمان لێ پەیدا بوو تا وای لێهات کە ئەو چوویەوە بۆ میاندواوێ و منیش گەڕامەوە بۆ سایینقەڵایە. «سەعیدزادە» کات بە فیڕۆ نادات و هەر لە ڕێگاوە نامەیەک دەنووسێت لە دژی من و بە هەموو پێشمەرگەکانی ئیمزا دەکات و لە میاندواو دەیدات بە «حەمە حوسێن خان»ـی کە حەمەدی مەولوودەچرچی دەستی لێداومەتە دەمانچەی و گەر پێشمەرگەکان نەیانگرتبا، سەعیدزادە کوژرابوو.

بۆ بەیانی بۆ کاری پێویست دەبوایە چووبامەوە بۆ سابڵاغێ. لە میاندواو لامدا بۆ ئیدارەی کوردان. تەماشام کرد حەمە حوسێن خان لە ستاد بوو، دەستم بۆ لە حەوادا بەڵام زۆر بە لالووتی وەڵامی دامەوە و بە ساردی ڕووی تێکردم و گوتی: من چاوەڕوانی ئەوەم لە تۆ نەبوو وا بەسەر سەعیدزادە بێنی!؟ منیش لە وەڵامدا تفەنگەکەم لەخۆم کردەوە و دەگەڵ ئەو حوکمەی دابوویمێ بۆم فرێدایەوە بەر لاقی و بێئەوەی یەک وشەش لەزارم بێتە دەر لە ژوورەکەی وەدەر کەوتم. چەندی هەرای کردم هەر وەڵامم نەدایەوە. ئەوجار پێشمەرگەکانی بانگیان دەکردم، دیسان وەڵامم نەدانەوە و لێیان دوورکەوتمەوە. ملم لێنا بۆ سابڵاغێ. لە ڕێگایە چاوم لێکرد «سەید محمد ئیسحاقی» بە ماشێنی وەدوام کەوتووە و هەرچی کردی و کراندی نەگەڕامەوە. ئەوە چەند ڕۆژە لە سابڵاغم بەڵام خۆم پێشانی کەس نەداوە، تا شەوێکی لەسەر نانخواردن «وەستا برایم» دەگەڵ «سمایلی» وەژوور کەوتن. گوتیان:

— قازی لە حیزبێیە و داوای کردووی و تۆی دەوێ، دەبێ هەستی و دەگەڵمان بێی و لە چاوەڕوانیت دایە.

منیش گوتم کارم بە کەس نییە و نایەم.

دەستبەردار نەبوون. زۆریان هەوڵ دا و قسەکانمان زۆری کێشا. بەهەرچۆنێک بێ هەستام دەگەڵیان چووم. کە چووینە حیزبێ، قازی لەوێ نەمابوو، گوتیان تازە چۆوە بۆماڵێ. دیسان نایەم لە من و دەبێ بێی لە وان. عیلاجم نەبوو، ڕێی ماڵی قازیمان گرت. کە چووین دیتم قازی محەممەد لە ژوورەکەی خۆی دایە و حەمە حوسێن خانیش دەگەڵ ئەفسەرێک بەناوی «کاکاغا»[2] لە ژووری میوانان تەختەنەردیان [یاری تاوڵە] دەکرد. سڵاوم کرد. حەمە حوسێن خان گوتی:

---

[1] ئەو گوندە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری سایینقەڵا هەڵکەوتووە کە ٢٠ کیلۆمیتر لەو شارە دوورە.

[2] پۆدپۆڵکۆڤنیک "(سرهنگ دو، Podpolkovnik، Подполковник، Lieutenant colonel) "سەلاحەدین کازمۆڤ" یان "سەلاحەدین عیسازادە کازمۆف" کوردێکی کوردستانی سوور و ئەفسەرێکی ئەرتەشی سوور بوو. بە هەردوو زمانی کوردی کرمانجی و تازەری دەگەڵ خەڵکی سابڵاغێ قسەی دەکرد و زۆر زوو لەناو دڵی خەڵکی ئەو شارەدا جێی خۆی کردەوە و بە (کاکاغا) بانگیان دەکرد. وەک لە بەڵگەکاندا باس دەکرێ کەسێکی لێهاتوو بووە و بە قارەمانی نەتەوەیی سۆڤییێت پێناسە دەکرا. ویلیام ئیگڵتن لە کتێبەکەیدا بەناوی (جمهوری ١٩٤٦ کردستان)، لە لاپەڕەی ١١٩، هەروەها عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری لە کتێبی: یادداشتەکانم، ل: ٥٧ باسی ئەو ئەفسەرە کوردە دەکەن.

– کەچەڵ! ئەوە چەند ڕۆژە لەکوێی؟ ها؟ بۆ دیار نی و لێمان ون بووی؟

– دیار بم چ بکەم؟

لەوەڕا سەری قسان کرایەوە و تا درەنگایەکی بەدەم قسانەوە دانیشتین. پاشان پێیگوتم کە:

– قازی زۆری پێخۆش بوو قسەت دەگەڵ بکات. ئێستا ماندوویە و لە ژوورەکەی خۆی دایە. بەیانی بڕۆ لای بزانە چیت پێدەڵێ.

بەیانی هەستام چووم بۆ لای قازی. دیتم چەند ئاغایەکی لەلا بوو و وەزیرەکانیش دەور و پشتیان گرتبوو و هەر ئەوانیش بوون بە کوشتیان دا. بانگی کردم و گوتی:

– ئەوە چەند ڕۆژە لەکوێی؟ چەند کەڕەتم ناردوّت بە شوێنتدا بەڵام دیار نی؟


ئەمر حەمە حوسێن خان سەیفی قازی و پۆدپۆلکۆڤنیک "سەلاحەدین کازمۆڤ" یان "سەلاحەدین عیسازادە کازمۆڤ" (کاکاغا)

پاشی زۆر قسەکردن و گوێگرتن بۆ قسەکانی منیش، فەرمووی دەبێ بچییەوە بۆ ساینقەڵایە سەر ئیش و کاری خۆت.

قازی باش منی دەناسی و دەیزانی کە من هەر کارێک بۆ کوردوستان نەبێت نایکەم. گەر من قسەم لە سەعیدزادەی هەڵبەزیوەتەوە لەسەر چوونەپێشی کارەکان بووە نەک ئیشی خۆم. بۆیە بە قسەی قازیم کرد و چوومەوە سەر پۆستەکەی خۆم لە ساینقەڵایە. کە چوومەوە بۆ ساینقەڵایە دیتم «ئارام» لەوێ نەمابوو، لەجێگای «پیرزادە» دانرابوو. پیرزادە سەرهەنگێکی زۆر لەسەرەخۆ و تێگەیشتوو بوو، بە ڕەچەڵەکیش فارس بوو. دەگەڵ ئەو زۆر باشم لێدەگوزەرا و زۆر شتی لێ‌فێر بووم کە هیچکات لەیادی ناکەم.

## تەمۆغە[1] و حەمەڕەشید خانی بانە[2]

پاش ماوەیەک خەبەرم بۆ هات کە «وەستا برایم» لە جەبهەی سەردەشتێ شەهید بووە. زۆری پێ تێکچووم. خۆمەوەخۆ نەگرت. پۆستەکەم دا بە «یۆسف خان»ـی و لە جێگای خۆمم دانا و چەند ڕێنوێنییەکم کرد کە پەیوەست بوو بە کارەکەوە، پاشان چوومەوە بۆ سابڵاغێ. یەکسەر چوومەوە کن قازی. داوام لێکرد کە بمنێرێتە جەبهەی. بۆم ڕازی نەدەبوو. ئەو پێیوابوو کە لە سایینقەڵایە دەتوانم زیاتر خزمەت بە کوردوستان بکەم، بەڵام من دەمزانی کە لە جەبهە باشتر خزمەتم پێدەکرێت و لەلایەکی تریشەوە ڕوخساری وەستا برایم بەردەوام لەبەر چاوم بوو و خەمم لێدەخوارد کە بە دەستی دوژمن شەهید بووە. هەرچۆنێک بێت قازیم ڕازی کرد و ئەمرم وەرگرت و هاتمەوە بۆ سایینقەڵایە. ئەو هاواڵانەی کە لەمێژبوو دەگەڵم بوون، هەڵمگرتن و ئیدارەکەشم بە گشتی تەسلیمی یۆسف خان کرد. ئەوجار دەگەڵ هاواڵەکانم ڕێی سابڵاغێمان گرت. لەوێش دەستەیەک پێشمەرگەم وەرگرت و چووم بۆ «سەرایە». خێری تێدا بێت، «حەمەڕەشید خان» فەرماندەی جەبهەی سەقز بوو. یەکسەر چووم بۆ لای حەمەڕەشید خان و ئەمرەکەم دایە دەستی. گوتی:

— برۆ بۆ «تەمووغە»ـی و لەوێ بە خۆت و هێزەکەت پۆست بە و هەر ئەمرێکم بۆ ناردی، بیکە. هەر ماشێنێک هات بیگەڕێ. گەر ئەسلەحەی تێدا بوو دەستی بە سەردا بگرە و گەر شمەکی خواردنیش بوو، لێگەڕێ با بڕوات بۆ سەقز و بانە بۆ ئێرانییەکان.

چوومە تەمۆغە و هەر ئەو ڕۆژە دەستێک ماشێن هاتن، سەرهەنگ «غەفاری» و چەند سەرباز و ئەفسەری دەگەڵ بوو. سێ پێشمەرگەی ئێمەش وەک چاوەدێر دەگەڵیان بوون. منیش ماشێنەکانم ڕاگرت و هەموویانم بە باشی پشکنی. لە شتی خواردن بەدەر هیچمان نەدۆزییەوە. چەند قوتوو ناڵی وەڵاخانی تێدابوو، ئەوانم گێڕایەوە. هەرچەند سەرهەنگ غەفاری هات و هاواری کرد نەمدایەوە. گوتم:

— ئەمریان بە من کردووە کە لە خواردەمەنی زیاتر هیچ شتێک بۆی نییە لەو سنوورە دەرباز ببێت.

لەو قسانەدا بووین کە یەک لەو پێشمەرگانەی چاودێریان بوون، ناوی «محەممەد» کوڕی «وەستا قادری بەننا» بوو، هاتە لام و گوتی:

— سەرهەنگ لە ڕێگایە دەمانچەکەی خۆی داوەتە من تا بۆی هەڵگرم و پاش ئەوەی لە پۆستێ دەرباز بووین، بیدەمەوە!

---

[1] " تەمۆغە" گوندێکە کە لە ١٧ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای شاری "سەقز" هەڵکەوتووە کە دەکەوێتە نیوان دوو شاری "سەقز" و "بانە".

[2] کورتەیەک لەسەر حەمەڕەشیدخانی بانە لە بەشی پەڕاوێزەکان و لە لاپەڕەی ٤٢٩ دا بخوێننەوە.

گوتم کوا دەمانچەکە؟

دەستی بۆ بەر پشتێندی برد و دەریهێنا و منیش لێموەرگرت. سەرهەنگ غەفاری چاوی لێمان بوو و هاتە پێشێ و گوتی:

— ڕەجا دەکەم بمدەوە، ئاخر تۆ ئێرانی و منیش ئێرانیم و کوا وا دەبێ و...

زۆری نەزیرە بۆ هێنامەوە تا بیدەمەوە، ئیتر نەیدەزانی لەو ڕۆژە دەگەڕام تا پەڵپی پێبگرم و حاڵی بکەم کێ ئێرانییە و کێ کوردە. تا توانیم بە سەریدا گوڕاندم و بڕێکم هەڵسووڕاند و ئەزیەتم کرد، ئینجا لێیان گەڕام بڕۆن. سەرهەنگ لە سەرایە چوبوو بۆ لای حەمەڕەشید خان و شکایەتی منی کردبوو. زۆری پێنەچوو دوو پیاوی خانیی هاتن و گوتیان:

خان دەڵێ دەبێ دەمانچە و ناڵەکانمان بۆ بنێریتەوە.

منیش نەمدانەوە و پێمگوتن کە بۆخۆم دێم، دیار بوو پێیان لێ هەڵدێنا بەڵام هێدیم دەکردنەوە. بەوحاڵە ئەوانم بەڕێ کردەوە بۆ خانی. زۆری پێنەچوو خانمیرزاکە دەگەڵ پیاوێکی دی هاتنە لام و وادەکەن:

— خان دەڵێ من فەرماندەی ئەو جەبهەیەم یان تۆ!؟

منیش پێم گوتن: من تازە هاتوومە ئەو جەبهەیە، من ڕەشید خان باش ناناسم بەڵام ئەو کارە هیچ لە بەرژەوەندی کوردوستاندا نییە. بەو بڕیارانەی کە خان دەیدات پیاو نازانێ کە خان پیاوێکی باشە یا خەراپە؟ بە ناچار دەمانچەکەم دانێ و ڕۆییشتن.

چەندی پێنەچوو کە «مستەفا خۆشناو»[1] و «میرحاج»[2] هاتنە لام و منیش هەموو نەقڵەکەم بۆ باس کردن. ئەوانیش سەریان سووڕ مابوو و دیار بوو ئەوان پێشتر لە من خانیان بەو بڕیارە سەیر و سەمەرانەیەوە دەناسی بۆیە، پێیان گوتم کە لەوەودوا جوابی خانی مەدەوە و هەر ئەمرێکی بۆی ناردی، تووڕی دە.

ماڵیان ئاوەدان بێت، چابوو ئەوان زوو حالییان کردم. لەمەوپاش کەس نەبوو حیسێب بۆ قسەی خانی بکات. هەرچەند شێرەشێرەی دەکرد و خۆی دەبرد ئاسمان و دەهاتەوە عەرزی، کەس نەبوو گوێی بۆ ڕاگرێت. کە زۆری هات و هاور دەکرد، تەنیا ئەو جوابەم دەدایەوە کە:

— مستەفا خۆشناو فەرماندەی ئێمەیە و تۆ ناناسم.

خان لەسەر ئەو کارانەی من ڕقی لە هەرچی سابڵاغی دەبۆوە. ئەوچەل وای لێهاتبوو «ئاغا» کە میوانی دەهات پێیدەگوت کە حکومەتی کوردوستان تەنیا لە مەهابادێ هەیە. جا سەیر لەوەدا بوو کە میوانەکان دەهاتن ئەو قسانەیان بۆ میرحاج و مستەفا خۆشناو دەگێڕایەوە. خودا

---

[1] لەسەر ئەمر مستەفا خۆشناو دەتوانن سەردانی لاپەڕەی ژمارە ٤٦٢ ئەم کتێبە بکەین.

[2] لەسەر ئەمر میرحاج ئاکرەیی دەتوانن سەردانی لاپەڕەی ژمارە ٤٦١ ئەم کتێبە بکەین.

بتانحەسێنێتەوە هێندەی پێنەچوو کە حەمە ڕەشید خان بۆی دەرچوو[1] و مستەفا خۆشناو بوو بە فەرماندەی جەبهەی سەقز و بانە، ئەوکەڕەتەی هەر ئەمرێکی ئەوم بۆ دەهات زوو بەجێمدەهێنا.

من کە لە تەمۆغەی پۆست بووم، ئاغای تەمۆغە نێوی «ئاغاخان» بوو. سێ برا و باوکێکی پیریان هەبوو. ئاغاخان دەگەڵ باوکە پیرەکەی، زۆر زۆرداریان دەکرد بەڵام دوو لە براکانی هەر لە تەمۆغە تێکەڵی دیموکڕاتی بوون. باوکیان دەستەڵاتی هەموو لەبەردەستی ئاغاخان نابوو. براکان هیچکارە بوون. من کە دەمدیت ئاغاخان و بابی زوڵم و زۆرداری دەکەن، چووم دەبن براکان و هانم دەدان، تا وایلێهات ئاغاخانیان وەدەر نا و خۆیان بوون بە ئاغای تەمۆغە. بەو جۆرە تا ئەو ڕۆژەی من لەو پۆستە بووم ئەوان ئاغای ئەو دێیە بوون.

## ڕووداوەکانی «بەڵەجەڕ»[2]

وەختێک، لەلای خۆشناوی[3] ڕا ئەمرم بۆ هات کە دەبێ بڕۆم بۆ «بەڵەجەڕ»ـی. منیش گورجوگۆڵ خۆم و هێزەکەم ساز کرد و ڕێی بەڵەجەڕیم گرتە بەر. لەجیاتی من «سەعیدی محەممەد عەلی غابی»بە خۆی و چەند بارزانییانەوە هاتنە تەمۆغە و پۆست بوون.

لە بەڵەجەڕی خەڵکی دێیەکە و ئاغاکان زۆر بە حوورمەتەوە بەپیرمانەوە هاتن. بە گەورە و بچووکەوە ئاڵای کوردوستانیان ماچ دەکرد و لەلایان زۆر پیرۆز بوو. دیوەخانیان بۆ پێشمەرگەکان چۆل کرد. زۆر دەگەڵمان بەڕێز و قەدرەوە دەجووڵانەوە. لە پیر و پەککەوتە ڕا تا ژن و منداڵی ئەو دێیە دەهاتن بە چاوی بەگریانەوە ئاڵای کوردوستانیان ماچ دەکرد و بۆی دادەهاتنەوە. ئەو پێشمەرگانەی دەگەڵم بوون، ئەوانیش بە دیتنی ئەو دیمەنانە کوڵی گریان دە ئەوکیاندا دەما و لە گابۆڕیان دەدا. پیرەژنی وا هەبوو دەهاتن و پێشمەرگەکانیان لە ئامێز دەگرت و ماچیان دەکردن. حەسانەوە و ڕەنجبەخەسارنەبوونم لە ڕووخساری هەموو پێشمەرگەکانمدا بەدی دەکرا. ئەو تێکەڵاوییەی فرمێسک و بزە، کە لە ڕوخساری پێشمەرگەدا دەتدیت، خۆی داستانێک بوو بە هەزاران لاپەڕەوە. بە داخەوە نازانم بینووسم. من تا مابم ئەو ڕۆژەم لەبیر ناچێتەوە و شانازیی بەخۆمەوە دەکەم کە توانیومە وەک پێشمەرگەیەک دە خزمەت گەلی لێقەوماوی خۆمدا بم و ئەو

---

[1] سەبارەت بە چوونی حەمە ڕەشیدخان بۆ عێراق و بەجێهێشتنی کۆماری کوردستان، بەڕێز عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری لە کتێبی: یادداشتەکانم، ل: ٧٧ کورتەباسێک دەورووژێنێت.

[2] "بەڵەجەڕ" گوندێکە کە لە ٢٧ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای شاری "سەقز" و ٣٥ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری "بانە" هەڵکەوتووە کە دەکەوێتە نیوان دوو شاری "سەقز" و "بانە".

[3] مەبەستی پۆدپۆلکۆڤنیک "مستەفا خۆشناو"ـە.

هەستە بە خەڵکی خۆم ببەخشم تا پێشمەرگەی کوردوستان بە پشت و پەنای خۆیان بزانن.[1]

چەند ڕۆژێک بوو کە لە بەڵەجەڕ دامەزرابووین. کار و بارەکانمان بەباشی بەڕێوە دەچوو و خەڵکیش وەک نیشتمانپەروەرێک ئەرکی پێشمەرگەکانیان لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیاندا هاسانتر دەکردەوە.

## سوپاس

ئەمن‌محمد مولودی بەخوم وپیشمەرگەکانمەوە کەماوەیەک‌بوو لەگوندی بەلەجەر کارمان پی‌تەسپیردرابوو آغایانی بەلەجەر بەتیوی ماندآغاو فارس‌آغاو برایانی‌ماند آغامەیشە بەبونی ئیمەدلو خوشحال بون وهەموو روژی‌دیدەنیان لی‌دەکردین ودمیانگوت ئیمەبەنوبەی خومان‌لەهیچ جورە خودەبیناوتانیک کوتایی ناکەین وآمادەین بەمال‌وبەگیان دەرەی آزادی و پاراستنی آلای مقدس‌وبەدوژمنایەتی ارتجاع گیانبازی بکەین دیسان روژی‌جیژنی رمضان تەواوی پیشمەرگەکانی‌بەلەجەریان دیمەن کردوجیژنەپیروزەیا لی‌کردین لەبەرواری ٩-٦-٢٥ لەلایەن جنابی پوت‌پولکونیک‌مصطفی خوشناو بەئیمەراگەیندرا کەپوستی بەلەجەر بگوبزینەوە بومیرەدی آغایانی بەلەجەر بەگوبزینەوەی ئیمە زورغمناک بون وتامیرەدی دەگەلمان هاتن‌وبەریان کردین .

کەچوینە پوستی میرەدی آغای‌رسول‌آغای جوانمردی هات‌بەپیرمانەوە ولەپوستی میرەدیش دیمنی‌لی‌کردین ولەماوەی چەندسەعاتان کەلەگەلمان دانیشتن رسول‌آغا بەقرآنی مجید سویندی خوارد کەئەمن بەنوبەی خوم‌آمادەم دەرەی‌آزادی وپاراستنی خاکی‌کوردستان وآرزی دستوری پیشەوای محبوب دالەهیچ جورەخودەبیناوتانیک رووەرنەگیرم بەلکان دەستی لەناودەستی هەموان ناوزورپەدلخوشی وشادمانی بەجی‌ی هیشتین .

ئیمە ئەوآغایانە : رسول‌آغا . ماندآغا فارس‌وسایری بەکوردیکی نیشتمان پەروەر دەزانین وزوریان سوپاس‌وقدر زانی لیدەکەین

کاپیتان محمدمولودی

سپاسنامەی کاپیتان حەمەد لە ئاغایانی گوندی بەڵەجەڕ و مێرەدێ کە لە ڕۆژنامەی "کوردستان"ی ژمارە ٨٥ لاپەڕەی ٢ ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان چاپ کراوە.

ڕۆژێکیان ٢٤ ماشێن هاتن. لە هەموو پۆستەکان ماشێنەکانیان پشکنیبوو بەڵام هیچیان نەدۆزیبۆوە. پۆستەکەی ئێمە دوایین پۆست بوو و پاشی ئێمە کەس نەبوو پێیان بڵێ پشتی چاوتان بڕۆیە. دەستمان کرد بە پشکنینی ماشێنەکان. نیزیک بە ٢٠ ماشێنمان گەڕابوو و چوار ماشێن مابوون کە بیانگەڕێین، لە ناکاو سەرهەنگ «فیروزی» و چەند ئەفسەرێکی دی هاتن و کردیان بە فەرتەنە کە ڕۆژ درەنگە و ناگەینە مەقسەد و چی و چی ... ئیزنمان بدە با بڕۆین. حەولەوەلایەکی سەیریان وێ کەوتبوو. چاک دە قسانیان گرتبووین. پێداگرییەکەیان ئەوەندە نامۆیان دەکرد کە لێیان وەشک کەوتم. سەربازێکیان دەگەڵ بوو کە ئۆینی دەردەهێنا. لۆکەی دە زاری دەنا و دەریدەهێنایەوە، وەک بە تەشی بیرێسی دەبوو بە دەزوو. کاخەزی دە زاری دەنا بە لوولە دەریدەهێناوە. زۆر عەجایب و سەیر و سەمەرە بوو. پێشمەرگەکان هێندەیان پێ سەیر بوو کە هەموو پێی خافڵابوون، بەڵام من لێیان زیاتر وەشک کەوتم، چونکە قەت باوەڕم بە عەجەمان نەبوو. چوار ماشێن مابوون کە بیانپشکنین. «غەفوری فەتاحی فەیزی» هاتە لام و گوتی:

— کاکە ئەو چوار ماشێنە چ لێبکەین؟

---

[1] کاپیتان لە گوندی "میرەدێ"ڕا، لە کۆی بابەتێکدا بە ناوی "سوپاس" لە ڕۆژنامەی "کوردستان"ی ژمارە ٨٥ لاپەڕەی ٢ ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان دا، دۆخی گوندەکانی میرەدێ و بەڵەجەڕ هەڵدەسەنگێنێت و سپاس و پێزانینی خۆی لە ئاغاکان و خەڵکی ئەو دیبانە دەردەبڕێت. بۆ دیتن و خوێندنەوەی دەقی ئەو پەیامە بڕوانە لاپەڕەی ٣٣٢

من و غەفور بۆ لای ماشێنەکان چووین کە بیانگەڕێین، دیتم سێ سەرهەنگ دەگەڵ ماشێنەکان بوون، هەر کە دەستمان کرد بە گەڕان، قۆڵیان گرتم و گوتیان:

— ڕۆژمان لێ درەنگ مەکە و لێمانگەڕێ با بڕۆین. ئەوەتا هەمو ماشێنەکانت گەڕاوە هیچی تێدا نەبووە ئەوانەش وەک ئەوانی ترن، تکایە ئیزنمان بدە بڕۆین.

وایان لێکردم کە سەریان لە منیش شێواند و منیش فەرمانم دا تا بەریان بەردەن تا بڕۆن. کە گوێیان لە فەرمانەکەی من بوو بەپەلە خۆیان ئامادە دەکرد کە بڕۆن، لەپڕ هاوار لە پێشمەرگەیەک بڵیند بوو و بانگی کردم:

— وەرە چاو لەو ماشێنە کە، پڕە لە تۆپ و تفەنگ.

کە چووم چ ببینم؟ دوو تۆپ، قۆمپارەیەک [خۆمپارە-هاوەن]، چوار بێسیم، ١٢ کۆتری کاغەزهەڵگر [کۆتری نامەبەر]ی ئەمریکایی، دوو ڕەشاشی گەورە، تفەنگ و قۆرخانەش کە لە حیساب نەدەهات. «ڕەحیم عەبدی ڕەزا»ش لەولای ڕا هات و گوتی:

— کوڕە حەمەد بەگەیە، لەو ماشێنەی دیشدا کللوورێک زینی وڵاخانی تێدایە.

فەرمانم دا کە ئەو ماشێنانە بەتاڵ کەن و ئەفسەر و سەربازەکان دەستبەسەر بکەن. جا ئەوجار کەوتمە گیانی سەرهەنگ و مەرهەنگان. دەردێکم دانێ بە سەگی نەدرابێ. ئەوەی بێڕێزی بوو پێمکردن. ئابڕووم بۆ نەهێشتن. تا ڕۆژ بوو، لەبەر سوورەتاوێ ڕامگرتن و کە شەویش داهات، لە ماشێنەکانی خۆیاندا حەپسم کردن و پێشمەرگەم لەسەر دانان. بە خەڵکی دێیەکەشم گوت کە هەرکەس چۆڕە ئاوێکیان بداتێ، لە بەرەی ئێمە نییە.

لای گەرمای نیوەڕۆیە سەرهەنگێک کە چووبوو دەنێو دەوەنێکەوە سەری هەڵێنا و بە پاڕانەوەیەکی زۆر حیزانە و سەرشۆڕانە وەپاڕانەوە کەوت بۆ قوومێک ئاو. منیش ئەوەم دەویست کە ئاوا سووک و ڕیسوایان بکەم. کە ئەوەم بینی بە پێشمەرگەکانم گوت بیانبەن بۆ نێو دێی و لە دیوەخانی کەمێکیان نان و ئاو بدەنێ تا نەتۆپن. جا چەند جوان بوون کە ئاوا بە دیلی و سەرشۆڕی دەهاتن و دەچوون دەتگوت تازە لە نێو قەبر هاتوونە دەر.

ئاغاکان هاتن و گوتیان گەر ڕازی بی لەو پڵاوەی بۆ پێشمەرگەمان لێناوە لەپێشیان دابنێین؟ منیش بیرێکم لێکردەوە و گوتم جا چۆن میوانی وا ئازیز دەبێ پڵاوی بێگۆشتیان بدەمێ!؟ قەت دڵم دێت ئەوانە وا بە هاسانی پڵاوەکەیان لە قوورگی بچێتە خوارێ!؟ ڕەحیمی عەبدی ڕەزام بانگ کرد و پێمگوت کە بچێت ئەو کۆترە نامەبەرانە سەر ببڕێت و ئاوڕووتیان بکات و لەجیات گۆشتی مریشکی بۆیان لە بن پڵاوەکەی بنێ با بیخۆن. ئاخر دەمزانی کە ئەو کۆترانە چەند بەنرخن و چەند بەکەڵکیان دێت و چەندیان خۆشدەویستن.

ئەوان کۆترەکانیان بۆ کاری جاسووسی و سیخووڕی کردن لە دژی ئێمە بەکار دەهێنا.[1] ڕەحیمیش نەیکردە نامردی هەر زوو بە چەقۆ تیژەکەی سەری هەڵپاچین و ناردی بۆ ئاوڕووتکردن. لەولاشەوە ناردم بە شوێن فەرماندەکەمان [مستەفا خۆشناو] لە «سەرا»[2]بە تا بێت و لە میوانداریيەکەدا بەشدار بێت و هەم خەنی بێت بە دیتنی ئەو دیمەنانە و هەمیش با بزانین چ تەگبیرێک لەو وەزعە دەکات داخەکەم، فەرماندە چووبوو بۆ سابڵاغ.

هەر ئەو ڕۆژە «وەهابی بلووری»[3] کە وەزیرە، هاتبوو بۆ سەرایە تا چاوێک لە جەبهە بخشێنێت. دیتم بۆ لای نیوەڕۆیە و کاتی نانخواردن مستەفا خۆشناو و ئاغای وەزیر پەیدا بوون. وردەوردە سفرە ڕاخرا و نان داندرا. ئەوانیش کە وەزیر و فەرماندەیان دیت، دەستیان کرد بە شکایەت کردن لە من. هەر ئەوان دەیانگوت کە حەمەد ئاوای لێکردووین و فیساری لێکردووین، ئاوی نەداوینێ و لەبەر گەرمایە ڕایگرتووین، حەپسی [بەندی - زیندانی] کردووین و بێڕێزی پێکردووین، مستەفاش زیاتر بزەی دەهاتێ و کەیفی سازتر دەبوو بەڵام ئاغای وەزیر نێوچاوانی غەزەبی لێدەباری، دیار بوو زۆری پێناڕەحەت بوو کە ئەو ئەفسەرانەم ئاوا سزا داوە. وەهاب لەکن ئەو عەجەمانە وەدەنگ هات و بە قەڵسی گوتی:

— ئەوە چ وەزعێکە پێکت هێناوە؟ ئەتۆ چۆن بۆخۆت قانون دادەتاشی؟ چۆن ئەو جەنابانەت ئەزیەت داوە؟ تۆ چۆن لەخۆتەوە کاران دەکەی؟

دیار بوو زۆری دەڕێست و پێی لێهەڵدێنا و بڕینەوەی نەبوو. منیش لەکن ئەوان بە توندی وەڵامم دایەوە و دمکوتم کرد و بێدەنگ بوو. ئەفسەرەکان هەلیان وەگیر کەوتبوو و زمانیان کرابۆوە و دەیانویست ئاژاوەمان لەناو بخەن، ئەوەی دەیانگوت نەیاندەگوتەوە، منیش ڕقی ئاغای وەزیرم بە ئەوان ڕشت و لە جوقەی شای ڕا تا مەلەکەی، لە وەزیری ڕا تا گزیری، لە ئێران ڕا تا تورانی، لە ئاڵایان ڕا تا ئایینیان و لە خاکیان ڕا تا خۆڵیان هەموویيم بۆ داگرتنەوە ئەوجار نۆرە گەیشتە خۆیان و کەس و کاریان، کەسم بۆ نەهێشتن تەنانەت مردوو و زیندووشیانم بەسەر کردەوە. ئەوە مستەفا

---

[1] لەسەر ئەو کۆترە نامەبەرانە و بەکارهێنانیان لەلایەن دەوڵەتی ئێران بۆ جاسووسیکردن لەسەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ٢١ - ساڵی یەکەم - شەممۆ ١١ ڕەشەمە ١٣٢٤ لە لاپەڕەی کۆتاییدا کورتە هەواڵێکی لەسەر نووسراوە.

[2] "سەرا" گوندێکە لە ١٩ کیلۆمیتری باکووریی شاری "سەقز" و ١٨ کیلۆمیتری باشووری شاری "بۆکان" هەڵکەوتووە کە دەکەوێتە نیوان ئەو دوو شارە. ئەو گوندە بە گوندی حەمەد ئاغای سەرایە (عەباسی) سەر بە عەشیرەتی دێبۆکری دەناسرێت و لەو سەردەمدا بنکەی فەرماندەیی هێزی پێشمەرگەی لێبوو.

[3] وێدەچێت کە کاپیتان ناوەکەی بەباشی نەزانیبێت یا لەبیری چووبێتەوە، بۆیە لەمەودوا لەبری بلووری، بلووریان دەنووسم. بە ئەگەری زۆر مەبەستیان بەڕێز "وەهابی بلووریان" بێت کە لە سەرەتاوە دەگەڵ کۆمەڵەی ژ.ک بوو و لەبەرئەوەی کەسێکی خوێندەوار بوو دواتر پلەی بەرز بوویەوە و بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان. ماوەیەکیش ئەندامی کۆمیتەی شاری سابڵاغ بووە.

خۆشناویش دەڵێی ڕۆنی سەی لە قاڵبی هەڵدەسووی، لەولای دانیشتبوو هەر بزەی دەهاتێ و زیاتر دەگەشایەوە. ئەو کە فەرماندەم بوو، بۆی هەبوو لێم قەڵس بێت و بێدەنگم بکات و سزام بدات بەڵام نەک ئەوکارەی نەکرد بگرە بە بزە و پێکەنینەکانی زیاتری هاندەدام. جەنابی وەزیریش پتەت لێدابا، دەقەڵشا. مستەفا چەندەی پێخۆش بوو، جەنابی وەزیر سەتهێندەی پێناخۆش بوو. هەر وا کە لە گەرمەی قسان بووین کەلوپەلی سفرەش دادەنران. مستەفا کە زانی ئیتر ئەوەی دەبوا بگوترێ گوتم، بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێت، وەدەنگ هات و گوتی:

— باشە پێم بڵێ بزانم ئەمرۆ چیت بۆ ساز کردوون؟

ئەوە دەشزانێ کە کۆترەکانم چ لێکردوون! وەڵامم دایەوە:

— پڵاو گۆشت.

— دەی باشە ڕۆژ درەنگە با نانمان بخۆین.

نان هات. کە تەماشایان کرد ئەو گۆشتە، فڕووج یا مریشک نییە! زوو زانییان کە ئەوە کۆترەکانی خۆیانن کە بۆمان لە بن پڵاوی هاویشتوون. ئیتر سەرهەنگ و مەرهەنگ وەک شێتانیان لێهات. دەستیان لە پڵاو و نانەکە کێشایەوە و گوتیان:

— جەنابی بللوری ئەوە چ کارێکە؟ ئەو کۆترانە لە ئەمریکایە ڕا دەنکی بە ٥٠٠ تمەن کڕاون. ئەو کۆترانە ئاسایی نین و نامەبەرن. عاملاندنی ئەو کۆترانە کارێکی هاسان نیە.

دیسان وەهاب دەستی کردەوە بە ڕێستن و لەلای ئەو عەجەمانە خۆی شیرن دەکرد. زانیم کە کۆترەکان کاری خۆی کردووە بۆیە، قسەم بە وەهابی پچڕاند و ڕووم لە مەجلیسەکە کرد و بە دەنگی بەرز گوتم:

— دەبێ جەنابی سەرهەنگەکان و ئەفسەرەکان ببەخشن کە ئێرە جەبهەیە و گۆشت کەم دەست دەکەوێت بۆیە کۆترەکانم بۆ ئامادە کردن تا خۆشتان لێ‌ڕابوێرێ. لەوە دەترسام پاشەملە قسەمان پێبلێن و بلێن کە قەدریان نەگرتین و ڕێزیان لێنەنان.

ئیتر بەو قسانەم هێندەی دی ئاورم تێبەردان. جا سەیر ئەوە بوو کە ئەوهەموو گۆشت و پڵاوەمان بۆ دانابوو بەڵام دمیان لە هیچ نەدا جگە نەختێ ماست و دۆ. هەم دڵیان نەدەهات ئەو کۆترانە بخۆن و هەمیش قسەکانی من زۆر لەسەر دڵیان کاری کردبوو. باوەڕتان بێت ئەوە ئێستاش ئەو پێشمەرگانەی لەوێ بوون و ئەو دیمەنانەیان دەدیت هەر ماون دەتوانن لێیان بپرسن، وەهابی بلووریان وەکوو ئەفسەرەکان، دمی لە نان نەدا، لە ئەفسەرە ئێرانییەکان زیاتر تەم دایگرتبوو، وەکوو ئەوان دەستەوئەژنۆ دامابوو. وەهاب دەگەڵ مستەفا خۆشناوی کە تازە گەیشتبوونە لامان، لەپێشدا هاواری کرد ئەری چمان هەیە؟ زۆرم برسییە! سەیر ئەوە بوو کە ئەفسەرەکان نان و ماستێکیان تام کرد، بەڵام وەهاب لە دوو کەچک دۆ بەدەر، هیچی دی نەخوارد. یەک لە کۆترەکان لە دەوریی [قاپ] مستەفا خۆشناویدا بوو، ئەویش زۆری برسی بوو، لەمنی‌کەوێ هەر مابوو

ئێسکەکانی بخوات تەنانەت قامکەکانیشی دەلێستەوە. داوای کۆترێکی دی کرد، چوون کە بۆی بێنن، بەڵام پێشمەرگەکان هەموویان خوارد بوو، ناچار بە ماست و دۆ خۆی تێر کرد. باوەڕ بکەن ئەوە قسەی مستەفا بوو کە گوتی: بەخوا بەلەززەت بوو. بە عومری خۆم نانی وا بەلەززەتم نەخواردووە. بەو قسانە وەهابی قەڵس دەکرد و پێی ڕادەبوارد.

نان و مان خورا و وردەوردە دەستیان کرد بە سفرە کۆکردنەوە. لە ناو دەورییەکدا ئێسکێکی چۆڵەمەی کۆترەکانم کەوتە بەرچاو. تاوم دایە و ڕەحیمی عەبدی ڕەزام بانگ کرد و لەپێش چاوی هەموو ئەفسەرە ئێرانییەکان و جەنابی وەزیر، لەسەر میوانداریيەکی کە چووینەوە بۆ سابڵاغێ، چۆڵەمەشکێنەمان کرد. هەر بۆیەش وام کرد تا زیاتر داخ لەسەر دڵیان دانێم و قەڵستریان بکەم و ڕقیان هەستێنم. مستەفا خۆشناویش لەوبەری ئەوە چاوی لە منە و ڕەش و شین هەڵگەڕاوە هێندەی پێبکەنێ. ئەو پەندەی من بەو ئێرانییانەم دا، دەبێ بە داستان باس بکرێت. جا من نازانم بەباشی بۆتان بگێڕمەوە، با ئاغاکانی بەڵەجەڕ و پێشمەرگەکان بۆتان بگێڕنەوە. ئینجا پاشی هەموو حەیسوبەیسێک عەجەم ڕوویان لە وەهاب و مستەفا خۆشناو کرد کە ڕۆژ درەنگە و ئیزنمان بدەن بڕۆین. میرزا وەهاب ئەمری دا کە ئازادیان بکەم تا بڕۆن.

— من گوتم: ناتوانم ئازادیان بکەم.

— وەهاب گوتی: من ئەمرت پێدەدەم کە ئازادیان بکە و تۆپ و ئەسلەحەکەشیان بدەوە،

ئیتر تووڕە بووم لەخۆم دەرچووم و بە سەریدا گوڕاندم و گوتم:

— گەر قازیش بڵێ تۆپ و تفەنگ و بیسێم و ئەسلەحەکانیان نادەمەوە. من تۆ ناناسم و بەرپرسی من نی. مستەفا خۆشناو فەرماندەی جەبهەیە گەر ئەو بڵێ باشە من هیچ ناڵێم.

مستەفاش وەک پیاوان دەستوری دا ماشێن و خۆراکەکانیان بدەنەوە بەڵام قۆرخانەکەیان بگێڕنەوە. منیش قۆرخانەم گێڕایەوە و ئەوانەی دیم دانەوە. قۆرخانەکەم لەوێ ڕانەگرت و زوو ناردمن بۆ سابڵاغێ. بە واریدبوونی ئەو شتانە بۆ ناو شاری، بە ڕادیۆ و بڵینگۆ،[1] دەست کرابوو بە تاریف و پەسنی من کە ئەوە فڵانە کەس بە بێتەقەوڕەقە، ئەوەندە ئەوەندەی سیلاح و کەلوپەلی لە دوژمن گرتووە و واو و وای کردووە. کە هاتیشمەوە سابڵاغێ دەچوومە هەر شوێنێک هەر تاریفی من بوو و خەڵک بە ڕێز و خۆشەویستییەوە دەستخۆشی و سپاسیان لێدەکردم. ئەوڕۆژە یەکسەر چووم بۆ لای قازی. وێڕای بەخێرهێنان و دەستخۆشییەکی گەرموگوڕ، فەرمووی کە:

— نەدەبوایە ماشێن و خۆراکەکەشت دابانەوە بە ئێرانێ.

— لە وەڵامدا گوتم: قوربان جەنابی وەزیرەکەت لەکن ئەو ئێرانیانە دەگەڵم بەشەڕ هات و چاوی لێسوور و شین دەکردمەوە، ئەو پێداگری کرد کە بیاندەمەوە دەنا، سوێند بە کوردوستان هەر بە پێیان

---

[1] لە بەشی پەراوێزەکاندا و لە لاپەڕەی ٤٧٢ وردە زانیارییەک لەسەر ئەم ڕادیۆیە بخوێننەوە.

بەڕێمدەکردنەوە و دەمکردنە پەندی عالەمێ، جا چۆن من شت دەدەمەوە بە ئێرانیان؟ چۆن دەهێڵم خێرم لەدەستی ببینن؟ ئەوە کاری جەنابی وەزیرەکەت بوو. باوەڕتان بێ، قازی هەر ئاخ و داخی بوو. ئەوجار فەرمووی کە:

— نەدەبوایە ئەو کۆترانەت سەربڕیبا، دەبوایە ناردباتنەوە بۆ سابڵاغێ.

— گوتم: قوربان دەمزانی کە میرزا وەهاب ئەوانیشی دەدانەوە، هەرچاک بوو کوشتمنەوە و لانیکەم پێشمەرگەکان خواردیان و عەجەمیش پێی دڕان لە داخان.

حەمە حوسێن خان کە فەرماندەی گشتی هیزی پێشمەرگە بوو بەتایبەتی بانگی هێشتم و خەڵاتی کردم. یەک میداڵی ئازەربەیجان و دەستێک جلی ئەفسەری و ٥٠٠ تمەنی کردە خەڵاتم و فەرمووی کە بۆ ساڵی تازەش دەرەجەیەکت بۆ زیاد دەکەم دەبی بە «مایۆر».

چەند ڕۆژێک لە ماڵێ وچانم دا و دەگەڵ ماڵ و منداڵم ڕامبوارد. پاشان چوومەوە جەبهەی. زۆری تێوەرنەسووڕا خەبەریان دامێ کە براکەی قازی کە لە تارانێ نوێنەرە، لە تارانێ ڕا بۆ ئەو تۆپ و قۆرخانەیە هاتۆتەوە سابڵاغێ لە قازی وەرگرتۆتەوە و داویەتەوە بە ئێرانێ. ئیتر خۆم بۆ ڕانەگیرا و بەپەلە و بەتاڵووکە خۆم گەیاندەوە بۆ سابڵاغێ. یەکسەر چووم بۆ لای قازی و لۆمەم کرد کە:

— تۆ بە منت دەگوت بۆچی ماشێنەکانیشت داونەوە کەچی بۆخۆت هەموو ئەو قۆرخانە باشەت داوەتەوە بە ئێرانی!؟ تۆ هەمان کاری وەزیرەکەت کردەوە، چۆن شتی وا دەبێت!؟ گوتی:

— ڕووسەکان گوشاریان هینابوو و دەیانگوت ئێوە بۆخۆتان تۆپ و قۆرخانەی باشتان هەیە، نەکا بەتەما بن دەگەڵ ئازەرییەکان شەڕ بکەن؟ منیش لە حەیفی ئەوان داومەتەوە.

پاشی زۆر قسە و باسی ڕەق و ناخۆش کە لە بەینماندا هات و چوو لە ژوورەکەی وەدەر کەوتم و چووم بۆ لای (ئەسەدۆف)ی کە موستەشاری شۆڕەوی بوو لە سابڵاغێ. پێمگوت کە:

— ئەوە چ کارێکە کردووتە؟ بۆچی واتان بە قازی گوتووە و ئەو تۆپانەتان لێهەستاندۆتەوە و داوتانەتەوە بە ئێران؟ گوتی:

— ئێمە کاری وامان نەکردۆت و ئاگاشمان لێنەبووە. برای قازی لە تارانێ ڕا هاتۆتەوە بۆ ئەو تۆپانە تا وەریانگرێتەوە بۆ ئیرانییان.

ئەسەدۆف کابرایەکی عەرووسی زەلامی لەلا بوو و دیار بوو لە ئەو پلەی بەرزتر بوو، هەرچی من دەمگوت بە عەرووسی بەو کابرا زەلامەی دەگوت و قسەکانی ئەویشی بۆ من تەرجومە دەکردەوە. زۆرمان کێشە بوو و چاوم لێکرد ناگەینە سەرئەنجام لەداخان وەدەر کەوتم. وەک مار جینگڵم دەدا، نەمدەزانی ڕوو لەکوێ بکەم، کە سەرم هەڵێنا، دیتم کە چەند کەس لە هاواڵەکانم چاوەڕوانی منن و (ئامینی کچیشم) دەگەڵیانە. کچەکەم دەباوەش کرد و ئەوجا چوومەوە ماڵێ. ئێستا نەحەسابوومەوە کە حەمە حوسێن خان ئەمری بۆ ناردم کە دەبێ هەر ئێستا بچێتەوە بۆ جەبهە. منیش یەکسەر ڕێگام بڕی و هاتمە سەرایە لای مستەفا خۆشناوی. هەموو شتێکم بۆ باس کرد. گوتی کە:

— هەموو شتێکم زانیوە و ئاگادارم، بەڕاستی کارێکی زۆر خەراپیان کردووە.

بە شەڕەف ئەوەی دەیڵێم قسەی ئەو بوو، گوتی:

— ئاخرمان خێر بێ. قسەیەکی تری گوت کە بۆ نووسین نابێ و من خۆی لێدەبوێرم.



شەهیدی قارەمان و هەرگیز نەمر، پۆتپۆلکۆڤنیک
مستەفا خۆشناو

## حاجی باوه شێخ (حاجی بابه شێخ)



حاجی بابه شێخ ١٨٨٤ - ١٩٥٩ز - ناوی عەبدولڕەحمان کوڕی سەید عەبدولکەریمی زەنبیله و ناسناویان (سیادەت)ـە.

پاشی ئەوەی کە هەموو قسەکانم لەلای مستەفا خۆشناو هەڵڕشت، چوومەوە بۆ جەبهە لای هاوالەکانم. چەند ڕۆژێک تێپەڕی هیچ باس نەبوو تا ڕۆژێکیان دەستێک ماشێن هاتن. هەر ماشێنەو ئەفسەرێکی ئێرانی تێدابوو. جەنابی «حاجی باوه شێخ»یش لە ماشێنێکدا دانیشتبوو و چەند پێشمەرگەشی دەگەڵ بوو. ماشێنەکان پڕ بوون لە شت. هەر خودا دەزانێ چی تێدابوو کە دەڕۆیی بۆ بانە و سەردەشتێ. خۆم گەوج کرد و وەسەر ماشێنێک کەوتم تا بیگەڕێم، لەپڕ گازیان کردم کە جەنابی حاجی باوه شێخ تۆی دەوێ. منیش چووم و گوتی: پێویست ناکات ماشێنەکان بپشکنی. لە ڕووی ناعیلاجی بەقسەم کرد، ئەو سەرۆکوەزیر بوو و نەمدەتوانی لە قسەی لادەم.

## جەبهەی سەردەشت

پاشی چەند ڕۆژێک مستەفا خۆشناو لە سەرایە ڕا ئەمرێکی بۆ ناردم کە لە سابلاغێ ڕا تۆیان دەوێ. کاتێک چووم بۆ سەرایە گوتی منیشیان داوا کردووە، بوەستە با بەیەکەوە بچینەوە بۆ سابلاغێ. لەوێ مستەفا بوو بە فەرماندە هێزی کوردوستان و بە ئەمری قازیش من چووم بۆ جەبهەی سەردەشتێ. قازی گوتی:

— پێشمەرگەکانت هەڵگرە و بچۆ بۆ جەبهەی سەردەشتێ. وەک دەڵێن «بەکر»[1]، فەرماندەی جەبهەی سەردەشتێ تفەنگ و فیشەک بەڕێ دەکاتە عێراقێ، بڕۆ بزانە ئەوە چ کارێکە؟

چوومەوە بۆ جەبهەی بانە و هاوالەکانم هەڵگرت و بەنێو گەورکاندا چوومە جەبهەی سەردەشتێ. بە نێو هەر دێیەکدا دەڕۆییشتین لادێیی بەپیرمانەوە دەهاتن و بەخێریان دەهێنایین. ئالای کوردوستانیان ماچ دەکرد و کڕنوشیان بۆ دەکرد. هەشبوو شکایەت و گازندەیان لە ئاغاکانیان دەکرد. بەداخەوە ئێمە نەماندەتوانی بەبێ ئەمری حیزبی دیموکرات هیچیان دەگەڵ بکەین.

---

[1] مەبەستیان (بەکر عەبدولکەریم حەوێزی) کە بە (ڕەئیس بەکر) ناودێرە. ئەوسەردەم کرا بە فەرماندەی جەبهەی سەردەشت.

ئاوریشمان بۆ ئەو هەژار و ڕووت و برسییانە تێبەردەبوو. داخەکەم، لە دڵخۆشی دانەوە و دانبەجەرگداگرتن، چیترمان لەدەست نەدەهات. پێماندەگوتن کە خەمتان نەبێ بە دڵی ئێوە دەبێ، تا گەیێشتینە لادێیەکی نێوانی بانە و سەردەشتی، - ناوی دێیەکەم لەیاد چۆتەوە - کابرایەک و پیرەژنێک و کچێکی گەنج، شکایەتیان لە ئاغای ئەو دێیە هەبوو. پیرەژنەکە تۆپێکی قووڕ لەسەر سەری دانابوو و بەدەم گریان و ناڵەوە دەیگوت کە ئاغا کوڕەکەی لێ بێسەر و شوێن کردووە. نازانین چی بەسەر هێناوە! وەختەبوو شێت بم. گوتم با ئەو شەوە لەو دێیە بمێنینەوە بەشکوو دەستم بگاتە ئاغاکان. بەداخەوە ئاغاکان چووبوونە بەرەی ئەو ئاغایانەی کە لەدژی کۆماری کوردوستان دەستیان دابوو تفەنگ و یارمەتی ئێرانییەکانیان دەکرد.

ئەو شەوە من لە ماڵی ئەو ئاغایانە بووم. لەترسان نە ئاغاکان و نە کوڕەکانی نەهاتنەوە. گەر ئەو شەوە هاتبانەوە، لەداریان دابام، تۆڵەی ئەو دایک و کوڕە داماوەم دەستاندەوە. ئێستاش لەسەر دڵمە کە نەمتوانی هیچیان بۆ بکەم. بەیانی تا لای نیوەڕۆیە بەئانقەست لەو دێیە ماینەوە بەشکوو سەر و گوێلاکی ئاغاکان وەدەر بکەوێتەوە بەڵام ئاغاکان لە کونی مشکێشدا دیار نەبوون.

دێیەکەمان بەجێهێشت و چووین بۆ «ڕەبەتێ»[١] لە نیزیک سەردەشتێ. فەرماندەی جەبهەکە

---

[١] "ڕەبەت" کە بە فارسی "ربط" دەنووسرێ گوندێک بووە لە سەر ڕێگای سەرەکی نێوان مەهاباد و سەردەشت. ١٥ کیلۆمیتر لە باکووریی ڕۆژئاوای سەردەشت و ١٠٨ کیلۆمیتریش لە باشووریی مەهاباد هەڵکەوتووە. ئێستا بووەتە شارۆچکەیەکی گەورە.

«بەکر» لەوێ پۆست بوو و لە ژوورەکەی خۆیدا بوو. ئێمە نەچووینە ژوورەکەی و هەر لەدەرێ ڕاوەستاین. چەند کاتژمێرێکی تێوەرسووڕا تا تەشریفی هاتە دەرێ و بزانێ ئەو هێزە بۆ هاتوون بۆ ڕەبەتێ؟ دیار بوو زۆری پێناخۆشە کە ئێمە هاتووین. پاش چاک و خۆشی، بەڕێیکردین بۆ «مەکلاوێ»[1] کە ئەویش هەر لە نیزیک سەردەشتێ بوو.

ئاغای دێیەکە کەپۆ و لووتی بڕابۆوە. کاتی خۆی «مەلا خەلیل»[2] لە شەڕێدا دەیگرێت و لووتی دەبڕێ. مەکلاوێ دێیەکی زۆر خۆش و دڵرفێن بوو. دوو-سێ ڕۆژان لەوێ بووین. ڕۆژێک ئەمری فەرماندەم بۆهات کە بەکر ئاغا بێت. نووسیبووی:

— کاتژمێر ئەوەندە، چەند ماشێنێک بەلای ئێوەدا دێن، بچن بۆ سەر جاددەی و پێشیان پێبگرن، گەر پێشمەرگەی ئێمەیان دەگەڵ نەبوو ڕایانگرن و نەهێڵن بڕۆن.

بەپەلە چووین بۆ سەر ڕێگایە و خەندەقمان لێدا و تێیاندا جێگیر بووین. زۆری نەکێشا دەنگی ماشێنان هات. نیزیکبوونەوە و ڕامانگرتن. سەربازەکان هەمووی ئەسلەحەیان پێبوو، نەمانهێشت لە ماشێن بێنە خوار. چوار ئەفسەریان دەگەڵ بوو، ئەوانم هێنا خوار و دام بە پێشمەرگەکان و گوتم بیانبەن بۆ دیی. ئەفسەرەکان کردیانە قاژ و قرووژ:

— بۆچی دەمانگری؟ ئەوە سەرهەنگ «ئایروم» دێت و بۆخۆت قسەی دەگەڵ بکە.

دەو قسانەدا بووین کە سەرهەنگ ئایروم لە ماشێنێک هاتە خوار. ئەو منی باش دەناسی. چەند جارێک ماشێنەکانیم پشکنیبوو. بە تووڕەییەوە گوتی:

— مەولوودیان، دیسان چ باسە؟ بۆ وا دەکەی؟ بۆ پێشت بەو ماشێنانە گرتووە؟

— گوتم: پێشمەرگەتان دەگەڵ نییە و ناهێڵم بڕۆن.

— گوتی: تا چەند دەقەی دی ڕێگات بەردا باشە دەنا، بەزۆر دەڕۆم.

من عەجایب مام!؟ تا ئێستا چەند کەڕەت پێشم بەو سەرهەنگ ئایرۆمە گرتووە هەر لەبەرم پاڕاوەتەوە و منەتبارم بووە کە ڕێگای بدەم! ئێستا بۆ وا لەسەرە؟ نازانم! منیش لێی تووڕە بووم و گوتم:

— گەر پیاوی و لە پیاوان بووی دەڕۆی. جا بزانە چیت بەسەر دێنم.

لەو قسانەدا بووین هاڕەی تانکی هات. پێشمەرگەکان هەرایان لێ بڵیند بوو کە کاکە تانک گەییە سەرمان. بەپەلە ویستمان خۆمان لە خەندەقان باوێژین بۆ چما نارنجۆکێکیان پێدانەدام!؟

---

[1] ئەو گوندە دەکەوێتە ١٨ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری سەردەشت کە لە نێوان ڕێگای سەردەشت بانە هەڵکەوتووە.

[2] مەبەستی کاپیتان، "مەلا خەلیل گۆڕەمەڕی"یە کە لە ساڵی ١٣٠٧هەتاوی تا ساڵی ١٣٠٨ هەتاوی (١٩٢٨-١٩٢٩زایینی) لە دژی قانونی جل و بەرگی زۆرەملی کە ڕەزا شا داوای دەکرد و بە قانونی (کشف حجاب) بەناوبانگ بوو، شۆڕشی کرد.

لەبەختی من نارنجۆک نەتۆقی و «حوسێنی عەبدوڵڵای بێستانچی» هەڵیگرتەوە و لە جانتاکەی هاویشت کە هەر بەقەرای سێوێکی گەورە دەبوو. بەو حاڵە خۆمان دەنێو دەوەن و خەندەقی هاویشت و بوو بە تەقە. سەرهەنگ ئایروم لە ناو قرمەی فیشەکاندا هاواری دەکرد»

— کوڕە مەولوودیان تەقە مەکە.

فەرمانم دا ڕۆحمیان پێ مەکەن. هەر ئەوەندەم زانی بەپەلە خۆی لەناو ماشێنێک هاویشت. جا گوتم دایگرن ئەو ماشێنەی. باوەڕتان بێت بارانی فیشەکانم بەسەردا باراند. بەداخەوە خۆی وەبەر نەهات و بۆی دەرچوو بەڵام دوو ئەفسەریی کە لەو ماشینەدا بوون، وەبەر هاتن و کوژران. تانکەکە شاڵاوی بردبوو بۆ سەر دەستەیەک پێشمەرگە. ئێستا مابیوو بگاتە ئێمە. تەماشام کرد دوو گروبان کە هەردووکیان ڕەشاشیان پێبوو، زۆر بێبەزەییانە دەیانڕەشاند. ئامانیان بە کەس نەدەدا. لەو خەندەقەدا من و دوو پێشمەرگەی دی بووین. یەکیان ناوی «محێدین بارزانی» بوو و ئەوەی دی «حوسێنی عەبدوڵڵای بێستانچی» بوو. گوتیان:

— کاکە چی بکەین؟ ئەو دوو گروبانە بە ڕەشاش وچان بە کەس نادەن! ئەوەتا لەپێش ئێمەن!

— گوتم: لێیان دەن.

محێدین و حوسێن وەک پیاوان لەسەر زگ لییان نیزیک بوونەوە و هەردوو گروبانەکانیان تۆپاندن و ڕەشاشەکانیان هەڵگرت و هاتنەوە. ئەوجار تانکەکە زۆری بۆ هێناین و ڕێگای پێ چۆل کردین. ئەوان دەرچوون بەڵام ١٢ کەسیان لێکوژرا. لەو بەینەشدا کوڕێکی بارزانیی کە عەمری ١٣-١٤ساڵان دەبوو، بە دەنگ تەقەیەوە هاتبوو. دە گەرمەی تەقەدا گروبانێکی دەکوژێت و دەچێت کە سیلاحەکەی هەڵگرێتەوە، وەبەر دێت. ئێمەش چووینەوە بۆ پۆستەکەی خۆمان.

لای نوێژی شێوان چاومان لێکرد کە ئەوە هەر ماشێنە و دێنە خوارێ. هاتوچۆیەکی سەیریان هەبوو. ئەوە ناشزانین کە بۆ سەر ئێمە دێن. هێندە جموجۆڵیان زۆر بوو کە ناچار بووم تەگبیرێکی بکەم و سەنگەران قاییم بکەین. لەسەر هەموو تەپەکانی دەوری دێ پێشمەرگەی نۆبەچیم دانان، بۆخۆشم دەگەڵ چەند نەفەران لەنێو دێی بووم. ئەوشەوە تا بەرەبەیانی لە جموجۆڵدا بوون. ئەوەندەم زانی بوو بە تەقە. کە وەسەر کەوتم دیتم «حوسێنی خاڵ ئاغای» شەهید ببو. حوسێن لەبن دارە گێوژێک هەڵدەستێتە سەر پێ تا گێوژان بخوات، تۆمەس تانکێک لەبن دەوەنان خۆی مات کردبوو. کە حوسێن ڕاست دەبێتەوە بۆ گێوژان، تانکەکە بە ڕەشاشی لێیدەدات و دەکوژرێ.

ئێمە لەو تەپۆڵکەیەی کە حوسێنی لێ کوژرا، جێگیر بووین. ئەوجار تانکەکان کە زانیبوویان ئاشکرا بوون، پێش ئەوەی ئێمە هێرشی بکەینە سەریان، ئەوان هێرشیان کرد. ئێمە بووین بە دوو بەش. بەشێکمان خۆمان لەناو دێ هاویشت و بەشەکەی دیکەش ڕێگای ڕەبەتی گرت. لەشکری ئێران وەیزانی هەمووومان هەڵاتووین و نەماوین. بە هەراکردن هجومیان کردە ناو دییەکە. وەنەبێ زۆر ئازا بن، پێیان وابوو کە دێیەکە چۆل بووە و کەسی تێدا نەماوە. لە هەرچوار لاوە بە هەراکردن

هێرشیان کرد. ڕووم لە پێشمەرگەکان کرد و گوتم: بەبابەوەو دەبەر مرم، کەس تەقە نەکات تا دەگەنە ناو دێی. لەپێش هەموو سەربازەکانەوە گروبانێک بە ڕەشاشەوە خۆی لەنێو دێی هاویشت. ڕووی لە دەرکەی ماڵە سەیدێکی کرد و بە ڕەشاشەکەی بێبەزەییانە ڕەشاندی و زیقەی لە ژن و منداڵی سەیدی هەستاند. لەتاو ماڵ و منداڵی سەیدی ئاورم گرت و فەرمانی تەقەم دەرکرد. لە یەکەم دەستڕێژ، کابرای گروبان کەلاکی کەوت و ٩ گوللەی بەرکەوتبوو. بەداخەوە بە ڕەشاشی کابرای دوو منداڵی سەیدی کوژرابوون و ژنەکەی و منداڵێکیشی بریندار بوون.

ئەوجار سەربازەکانیش لە هەوای گروبانەکە هێرشیان کرد و وەیاندەزانی کەسمان لە دێ نەماوین. لە هەموولایەکەوە فیشەکمان بەسەردا باراندن. چاکمان داگرتن. سەریان باش لێشێوابوو. نەیاندەزانی خۆیان لە چ کونێکی ڕاکەن. ئێمە لە قەڵاکەدا ١٢ کەس بووین، ئەوەندەمان زانی تانک بەری دەرکەی لێگرتین. بە پشتیوانی تانکەکە هەر چوار دەورمان گیرا. زوو سێ دانە نارنجۆکم لە شریتێک بەست و بە تانکەکەم دادا. بەهۆی ئەوە کە ئەو پەنجەرەیەی نارنجۆکەکانم پێدا هاویشت زۆر چکۆلە بوو، بەباشی تانکەکەی نەگرت، بەڵام ترسێکی سەیری خستە ناو دڵی دوژمن. لەولاشەوە، لەبەرئەوەی پێشمەرگە سەربەرزیی و سەرکەوتنی کوردوستانی لە دڵدا وەک چرا داییسا و ئامادەبوون هەموو گیانفیداییەک بکەن، لە تانک و فیشەک نەدەترسان، بۆیە لە شەڕێکی قارەمانانەدا بە خۆم و ١٢ پێشمەرگان، دەردێکمان دا بە لەشکری ئێرانی کە تا ماون شەڕی مەکڵاوێ لەیاد نەکەن. ئەو سەرکەوتنە لە زیرەکی ئێمە نەبوو بەڵکوو لە خۆشەویستی خاک و نیشتمانمان بوو، لە خۆشەویستی دەوڵەتی کوردوستان بوو.

لە گەرمەی هەڵاتهەڵاتی لەشکری ئێرانێ، تەماشام کرد کابرایەکی پەستەک سووری پشتێند سپی، لەناو لەشکردا خۆی هەڵدەسووڕاند و پاشەکشەی دەکرد و ڕای دەکرد. ڕووم لە هاواڵەکانم کرد و گوتم ڕەجاتان لێدەکەم تەقە مەکەن و دەست ڕاگرن. من ئەو فیشەکە داوێمە پەستەکسووری و ئێوەش تەماشای کەن. تەقەم لێکرد و وەرمگێڕا. هەموو پێشمەرگەکان بۆیان لە هورا دام. من بە ڕەشاش زۆر چاکم دەنگواوت. ئیتر پێشمەرگەکانیش وایان لێهاتبوو کە بە ئیشتیا سیلەیان لە عەشیرەتێک یا سەربازێک دەگرت و سللاریان دەکردەوە. ئەو لەشکرە وەها لێکهەڵوەشابوو کە ئەوەی هەڵات، هەڵات، دەنا زۆریان خۆیان دەناو دەوەن و کەند و دۆڵاندا حەشار دابوو تا نەکوژرێن. بەو جۆرە لەشکری ئێرانمان بە هوراکێشان شکاند و هەموو هەڵاتن و دێیان بەجێهێشت و کەلاکێکی زۆریان لەپاش بەجێما. لەپاشان زانیمانەوە کە ئەو هێرشە بە هاوکاری لەشکری بانە و سەردەشت کرابوو و زیاتر لە ٢٠٠٠ کەس دەبوون جیا لە عەشایر. هەموو چەشنە ئەسلەحەیەکیان پێبوو. تەنیا شتێکی کە نەیانبوو غیرەت و دەمار بوو کە عەجەم و ئێرانی لێی بێبەرین. بەداخەوە هەندێک عەشایری خۆفرۆش و خاکفرۆشیشان دەگەڵ بوو کە لە بنەرەتدا لە غیرەت بەتاڵ بوون، بۆیە خۆیانفرۆشتبوو، دەنا عەشایر هەبوو بە دڵ و بە گیان دەگەڵ کۆمار بوو. ئەو شەڕە ئەوەندەی

له ئێران و کۆماری کوردوستاندا ناوبانگی دەرکردبوو، دە ئەوەندەش لە کوردوستانی عێراقێ نێوی کردبوو. ئەو پێشمەرگانەی دەگەڵ من بوون، بڕوا ناکەم لە شۆڕەویش شەڕکەری وا هەبێ. بە ١٢ نەفەران دوو هەزار سەرباز و عەشایرت وەسەر گەڕێ و بەو هەموو سیلاحە قورس و قۆرخانەیەوە، ئەوان بدۆڕێن و هەڵێن ئێمەش بیبەینەوە و لە ناو دێدا بیکەین بە هەڵپەڕکێ و شایی. لە مێژوودا دبێ باس بکرێت.[1] ئەوجار هیچیان پێنەمابوو، لەسەردەشتێ ڕا بە تۆپان، تۆپبارانیان دەکردین. سەیر ئەوە بوو کە دەنکێکیش وە ئێمە نەدەکەوت. یا لە گیشانیان دەدا یا لە دەشت و دەوەنان. دەوری ئەو قەڵایەی کە ئێمەی لێبوون هەموویان داگرتبوو بە تۆپان بەڵام دەنکێک نەهاتە ناو قەڵاکەی. ئەو ڕۆژە هەر لە چێشتانەوە تا بەتڵێک لە شەو هەر تۆپیان تێهەڵکردین. بەکر ئاغا کە فەرماندەی جەبهە بوو، نەیدەتوانی یارمەتی و هێزی پشتیوانی بۆ ئێمە بنێرێت، لەبەرئەوەی ڕێگاکان هەمووی بە تانک و سەربازی ئێرانی و عەشایر گیرابوون. ئەوە خۆش بوو کە لەشکری ئێرانیش نەیدەوێرا تخووبمان بن، دەیانزانی کە ئێمەش «شووشە»[2]مان پێیە. جارجار لە دوورەوە ڕا تەقەیەکیان دەکرد و هیچی تر. درەنگایەکی شەو فەرماندە نامەیەکی بە چەند پێشمەرگەیەکدا بۆ ناردم. لە کاخەزەکەدا نووسیبووی پۆستەکەتان چۆل کەن و وەرنە ڕەبەتێ. فەرماندە خۆشی لە ڕەبەتێ دادەنیشت. بۆم نووسییەوە[3]:

— تاکوو سەرمان نەپەڕێنن ئەو دێیە چۆل ناکەم. جا چۆن دەهێڵم ئەو فەتحەی پێشمەرگەکان کردوویانە بیێتەوە هیچ.

کاخەزم لە مستی پێشمەرگەکان نا و بەرێمکردنەوە بۆ فەرماندە.

وردەوردە تەقە نەما و ئێمەش دانیشتین بۆ نان و چا خواردن و حەسانەوە. پێشمەرگە ئەوەندە ورەیان بەرز بوو کە بەو درەنگانەی شەوێ دەستیان کردبوو بە هەڵپەڕکێ و گۆرانی گوتن. بۆ لای

---

[1] ئەو ڕووداوانە بە وردە ڕیشاڵەوە "نجفقلی پسیان" کە ڕۆژنامەوانێکی سەر بە دەوڵەت بووە، لە کتێبێک بە ناوی (مرگ بود، بازگشت هم بود) چاپی دووهەم لە لاپەڕەی ١٦١ دا چاپی کردووە و ڕێژەیەکی باشی لە تواناکانی هێزی دەوڵەتی و بە ناوهێنانی فەرماندەکانیان و چۆنیەتی شەڕەکە و خەسار و لێکۆڕاوەکانی نووسیوە کە دەقاودەق دەگەڵ قسەکانی کاپیتان یەک دەگرنەوە. هەروەها (بەکر عەبدولکەریم حەویزی) کە زیاتر بە (ڕەئیس بەکر) ناودێرە و فەرماندەی جەبهەی سەردەشت بووە لە کتێبەکەی خۆیاندا بە ناوی (گەشتێک بە کۆماری مەهابادا) بە وردی باسی ئەو ڕووداوانە دەکات.

[2] "شووشە" ناوی چەشنە نارنجۆکێکی دژە تانک بووە کە ئاگری لە تانک بەردەدا. ئەرتەشی سوور دابووی بە کوردەکان. بەڕێز "عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری" لە کتێبی "یادداشتەکانم" دا، بەشی یەکەم، لە لاپەڕەی ٤٩ و٨٦ باسی ئەو شووشەیە دەکات و دەڵێ: [دەوڵەتی شۆڕەوی بە دیاری پێشکەشی هێزی پێشمەرگەی کوردستانی کردووە لە ناویاندا چەند هەزار دانە "شووشە" (تیزاب) کە بۆ سووتاندنی (دەبابە - تانک) بەکار دەهات. ئەویش دەبوایە پێشمەرگەی گیانفیدا لە نیزیکەوە بیخاتە سەر دەبابەکە].

[3] ئەوسەردەمە کاپیتان هیچ خوێندەواری نەوبووە. مامە غەنی لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێ لە مەکڵاوێ بەڕێز (سەدیق خاتەمی) میرزای دەستەی کاپیتانی بووە و نامەکانی بۆ نووسیوە، بڕوانە کتێبی ئاڵەکۆک لاپەڕەی ٨٠

بەیانێ «عەبدولڕەحمان بارزانی» بە خۆی و چەند بارزانی هاتن و نووسراوەیەکی دیکەیان لە فەرماندەوە بۆ هێنام. نووسیبووی:

— من فەرماندەم یا ئەتۆ؟ من ئەمرت پێدەکەم وەرنەوە بۆ ڕەبەتێ و ئەو پۆستەی چۆل کە. گەر بۆ ڕەبەتێش نایەی بچۆ بۆ دێیەکی نیزیک پۆستەکەت.

نێوی دێیەکەشی نووسیبوو بەداخەوە لەیادم نەماوە. عەبدولڕەحمان و هاوالانی ئەو شەوە لەلامان مانەوە. تاریک و ڕوونی بەیانی لە سەردەشتێ ڕا سەیدێک لەلایەن سەرهەنگ ئایرومەوە هاتە لام و گوتی: سەرهەنگ داوا دەکات کە ئیزن بدەی تا کەلاکەکانەیان کۆ بکەنەوە. منیش ئیزنم دا. ئەو سەیدە فەقیرە لە سپایی بەیانەوە تا بەتڵێکی باش لە شەو، هەر کەلاکی کۆکردنەوە و پێشمەرگەش لە دوورەوە چاوەدێری دەکردن نەکا ئێرانی پەل ببزێون. لە گەرمەی شەڕەکەدا چەند کەسێکمان پشدەری دەگەڵ بوون کە هاتبوون بۆ ناو ڕێزەکانی پێشمەرگەی کۆماری کوردوستان وەک «مستەفای خانمێ» و «عەبدولئاغا»[1] و چەند کەسێکی دی کە ناوەکانم لەیاد نەماون زۆر قارەمانانە دەستیان دەکردەوە، هەروەها چەند کەس لە خەڵکی دێ زۆر مەردانە دەگەڵمان لەسەنگەردا بوون و گیانفیدایانە بەرەنگاری دووژمن بوونەوە و شەڕێکی باشیان کرد بۆیە، کە تەقە نەما بە خەڵکی دێیەکەم گوت بچن تفەنگی ئەو کەلاکانە هەڵگرنەوە بۆخۆتانی بەرن. دوو ڕەشاشی ٢٠ تیرم گلداوە و باقیم دا بە ئەوان. کە تفەنگەکانم دانێ، ئەوەندە خۆشحاڵ ببون نەبێتەوە. لەمەودوا وایلێهاتبوو کە عەشیرەتەکان خۆیان بۆ لای من دەکوتا. دەیانزانی من تفەنگیان لێناستێنمەوە، ئیتر کێبڕکێیان بوو کە لێم نیزیک ببنەوە. تا ئەو ڕادەیەی کە عەشیرەتی دەوروبەری سەردەشتم هەموو تێهاڵابوو. عەشیرەت تفەنگی لێمەستێنەوە، ئامادەیە خۆت بۆ بەکوشت بدات. گەر بەکر ئاغا، کە فەرماندەی جەبهە بوو، لە عەشیرەتەکان تووڕە دەبوو، پێیدەگوتن بڕۆنە لایەکی تر، ئەوانیش دەیانگوت ئێمە بۆلای حەمەدی مەولوودی زیاتر ناچین بۆ لای کەس.[2]

---

[1] دەبێ مەبەستیان "عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری بێت کە خەڵکی پشدەر و لە ئاغاکانی میراودەلی بووە. بیرەوەرییەکانی خۆیشی لەمەڕ ئەو ڕۆژانە نووسیوەتەوە بە ناوی "یادداشتەکانم". عەوڵائاغا تا دواساتەکانی ڕووخانی کۆمار لەجەبهە دەگەڵ کاپیتان بووە.

[2] سەبارەت بە شەڕی مەکڵاوێ ڕەئیس بەکر لە کتێبەکەی خۆیاندا لە لاپەڕەی ٩٢دا بە وردی باسی هەموو شتێکی کردووە کە ئاڕاستەی ڕووداوەکان وەک ئەوە دەچێ کە کاپیتان باسی دەکات، بەڵام گێڕانەوەکەیان جیاوازە. ڕەئیس بەکر بۆ لای خۆی و هێزەکەی خۆی کە زۆرتر لە هێزی بارزانییەکان پێکهاتووە بایەدداتەوە و کاپیتانیش بۆ پێشمەرگەکانی خۆی، بەڵام نە کاک حەمەد دەتوانێ حاشا لە قارەمانەتی بارزانییەکان بکات و نە ڕەئیس بەکریش دەتوانێ ڕۆڵی سەرەکی کاک حەمەد و پێشمەرگەکانی بشارێتەوە. تەنیا شتێک کە لەو نێوانەدا ڕوونە ئەوەیە کە نە کاپیتان کەیفی بە ڕەئیس بەکر هاتووە و نە ڕەئیس بەکر بە کاک حەمەد.

## قارەمانی کۆماری کوردوستان

هەروەک پێشتریش باسم کرد ئەو شەڕەی مەکڵاوێ هەم لە کوردوستانی ئێرانێ و هەم لە کوردوستانی عێراقێ ناوبانگێکی زۆری دەرکرد. ئەو پێشمەرگانەی دەگەڵ من بوون، یەکەو حوکمی دەرەجەیەکیان بۆ هات و منیش حوکمی میداڵی قارەمانیم بۆ هات. لەلایەن ئازەربایجانیشەوە، تەقدیرنامە [نامەی ڕێزلێنان]ـێکی زەلامم بۆ هات.

لە سابڵاغێ بە ڕادیۆ و بە بڵینگۆی لە هەموو شاردا جاڕیان کێشان و دیسان تاریف و پەسنی منییان کردبوو کە ئەمجارەش کاپیتان حەمەدی مەولوودی لە جەبهەی ئاوا و ئاوای شەر کردووە و خاکی نیشتمانی پاراستووە و ئاوا و ئاوای دەستکەوت بووە. پاشی چەند ڕۆژان کە زانیم جەبهە ئەمن و ئەمانە، بۆ چەند کارێکی پێویست بۆ جەبهە، دەبوایە بچمەوە سابڵاغێ. کە چوومەوە هەر واق مابووم. دونیا لەپێش چاوم زۆر گۆڕابوو. من هیچ گۆڕانکارییەکم لە خۆمدا شک نەدەبرد و حەمەدەکەی جاران بووم. ئێستا لەلای ئەو خەڵکە من شتێکی ترم. هەرکەس دەمگاتێ دەستم دە دەستی دەنێت و «غەزا» پیرۆزیم لێدەکات. ئەوەی ناشمناسێت لێم دێتە پێش و دەستیم دە دەستی دەنێت و ئەحواڵم دەپرسێت.

بە واریدبوونم، قازی لەدووی ناردم. کە چوومە لای، دیتم خەڵکێکی زۆری لەلایە و مەلا مستەفای بارزانیشی دەگەڵە. لەپێش چاوی ئەوهەموو خەڵکە سەت هێندەی چەلان حوورمەتی گرتم و گوتی:

- من ئەوە دەچمە تەورێز و میداڵەکەت بۆ بەدروستکردن دەدەم. حوکمەکەم بۆ ناردی بۆ جەبهەی، وەرتگرتووە؟
- بەڵێ قوربان وەرم گرت.

بە مەلا مستەفا بارزانی و خەڵکەکەی گوت:

- میداڵی قارەمانیم بۆ ناردووە.

یەکەمین کەس بووم میداڵی قارەمانیم وەرگرت.

## شەڕەکەی (مەلاشێخ)ی[1]

دوو ڕۆژان لە ماڵ بووم بەڵام دڵم ئۆقرەی نەبوو. هەموو بیر و هۆشم هەر لە لای جەبهە و هاواڵەکانم بوو. ناچار خۆم تێکوەرپێچا و چوومەوە جەبهە. کە چوومەوە دەبینم ئەوە شەڕە. ئێرانییەکان هێرشیان هێنابوو سەر پێشمەرگەکان. کاتێک کە پێشمەرگەکان لە دێی (مەلاشێخی) دەبن ئێرانییەکان زۆر بە خەستی دەورەی هەموو شاخەکانیان لێدەگرن و هوروژمیان دەکەنێ. بەکر ئاغا لەدووی منی نارد. لەولاشەوە ناردبووی بەشوێن «ساڵحئاغای بارزانی»، برای «عیزەت»ـی کە چەند کەسیشی بارزانی دەگەڵ خۆی هێنا بوو. لە پەیامەکەیدا بەکر ئاغا بە من و بە ساڵحئاغا گوتبوو کە:

— گەر بەپەلە خۆتان نەگەیێننە ئێمە و بە فریامان نەیەن، عەجەمان ڕەبەتی دەگرن.

دەگەڵ ساڵحئاغا گەیشتینە یەکتر. پاش لێکدانەوەی بارودۆخەکە ساڵحئاغا بۆی دانام کە چۆناوچۆن بە یارمەتی ئەو پێشمەرگانەوە بچین و لە گەمارۆی عەجەمان ڕزگاریان بکەین و بەو کارەش مەترسی کەوتنی ڕەبەت کەم بکەینەوە. بە منی گوت کە حەمەد، تۆ دەستەی خۆت هەڵگرە و بەو باسکەیدا بڕۆ و لە فلانە و فلانە شوێن جێگیر بن و منیش دەستەی خۆم هەڵدەگرم و بەو دۆڵەیدا تێهەڵدەبم. ساڵحئاغا لەسەرەخۆ و ژیرانە بڕیاری دەدا. کەم کەسم ئاوا دیتووە. تا ئێمە وەسەر کەوتین ساڵحئاغا و بارزانییەکانی هاواڵی، عەجەمەکانیان لە سەنگەرەکانیان هەڵکەند و دە سەردەشتێی کردنەوە. ئەو ڕۆژە ساڵحئاغام وەک شێر هاتە بەرچاو. ئەو ئازایەتییەی بەو کابرایە و بە دەستتەکەیەوە دیتم، هیچکات نەمدیتبوو. ئەو شەڕەی ئەو قارەمانە بە خۆی و هاواڵانی کردیان، باوەڕ ناکەم شتی ئاوا لە هیچ حکومەتێکیدا هەبووبێت، گەر هەشیانبێت بە قامکێکی ساڵحئاغا نابن. دەڵێن لە «لێنینگراد»ـی قارەمانی وا هەبووە، من باوەڕناکەم، چونکە ئەوان حکومەتیان هەیە کە باسیان بکات و پێیان هەڵبڵێ، خۆ ئێمەی کورد حکومەتمان نییە هیچ، بگرە دەیان دوژمنیشمان هەیە و بێکەسیشین و هیچ دۆستمان نییە دەنا، دەبوایە ئەو قارەمانەتییەی ساڵحئاغا و بارزانییەکان لەخۆیان پێشانیان دا، تا دونیا ماوە وەک مێژوو لە کتێباندا بنووسرێتەوە. لە ناو کوردی چارەڕەشدا پیاوی قارەمانی وەک ساڵحئاغا شوێنی ون دەبێت و ناوی دەشۆرێتەوە. بەراستی من کە ساڵحئاغام ئاوا بە قارەمانانە دیت، خۆمم لەپێشچاو کەوت. سەبارەت بەو قارەمانە هەرچی بڵێم کەمم گوتووە. خۆزگە سەوادەکەم دەیبڕی، جا ئەوکات دەمزانی چۆنی باس بکەم. چیرۆکی غیرەت و گیانفیدایی ئەو قارەمانە، پیاوی بەدەست و قەڵەمی باشی دەوێ.

دیارە لەو شەڕەدا پشدەری بەشدارییەکی زۆر باشیان کرد کە ناکرێ باسیان نەکەم. بەراستی

---

[1] گوندێکە لە ١٥ کیلۆمیتری باکووری سەردەشت هەڵکەوتووە.

گیانفیدایانه به گژ دوژمندا هاتنەوە، بەڵام کەس تۆزی «ساڵحئاغا»ـی پێنەدەشکا. لەو شەڕەدا کوڕەئاغایەکی «سوێسنێ» کە ناوی «حەسەنئاغا»[1] بوو کوژرا. جوانێکی زۆر قۆز و شۆخ بوو.

دیسان سەرکەوتین و دیسان ناوی کوردوستان، کانگای هەموو گیانفیداییەک بوو. دیسان خۆشەویستیمان بۆ کوردوستان پشتیوانمان بوو. ئەمجارەش سەربەخۆیی کورد و پاککردنەوەی خاکی پیرۆزی کوردوستان لە بێگانان، هەوێنی هێز و سەرچاوەی وزە و بناخەی ئیمانی پتەومان بوو. ئیتر کە شەڕ کۆتایی پێهات، هەموومان بە فەتح و خۆشی، بە ئەی ڕەقیب و سروود گوتنەوە، گەڕاینەوە ڕەبەتێ.

## ڕووداوەکانی «میرشێخحەیدەر»[2]

پاشی حەسانەوەیەکی کورت، بەکر ئاغا گوتی دەبێ بە خۆت و هاواڵەکانت پۆستەکەت بەری بۆ «مەلاشێخ»ـی چەند ڕۆژێک لە مەلاشێخی بووین. هەموو ڕۆژێ وردە تەقە دەگەڵ ئێرانیان ڕووی دەدا، بەڵام پاشەکشمان پێدەکردنەوە. ڕۆژێکی ئەمرم بۆ هات لەلایەن فەرماندەی هێزی پێشمەرگە کە مستەفا خۆشناو بوو. دەبوایە بە زووترین کات بچمەوە بۆ سابڵاغێ. جەبهەم بە تۆکمەیی بەجێهێشت و چوومەوە بۆ لای فەرماندە هێز لە سابڵاغێ. بە هۆی ئەوە کە پێشتریش یەکترمان دەناسی و زۆرمان یەکتر خۆشدەویست و ئەو لە دڵ و دەروونی من دەگەیشت و منیش هەروەها، بۆیە من زۆر دڵم بە مستەفا دەکرایەوە کە دڵنیاشم ئەویش هەر وا بوو. پاشی قسە و باسێکی زۆر گوتی: دەبێ پۆستەکەت بەری بۆ «میرشێخحەیدەر»ـی.[3] هەروەها لە وەڵاغەکانی

---

[1] ڕەئیس بەکر لە کتێبەکەی خۆیدا لە لاپەڕەی ٨٦ بە وردی باسی ئەو شەڕە دەکات و بە شەڕی جێژنی قوربان ناوی دێنێت و ناوی ئەو شەهیدەش بە حەسەن خانی بریاجی دەناسێنێ. هەروەها خوالێخۆشبوو کەریم حیسامی لە کتێبی (کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران) ساڵی ١٩٧١ لاپەڕەی ١٦ سەبارەت بەو شەهیدە دەنووسێت کە حەسەن خان کوڕی برایم ئاغای بریاجی یەکێک لە ئەفسەرەکانی حکومەتی دیموکڕات بوو لە گوندی "نەنیە" نیزیک سەردەشت لە شەڕێکی دژی لەشکری حکومەتی تاران دا شەهید کرا.

[2] "میرشێخ حەیدەر" دەکەوێتە پێنج کیلۆمیتری ڕۆژئاوای شاری سەردەشت و لەسەر ڕێگای "سەردەشت" - "باساوێ"یە. واتە لای دەشتی کەپران.

[3] لە لاپەڕەی ٨٧ی کتێبی (یادداشتەکانم) بە پێنووسی (عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری) بەشی یەکەم - بەغدا ١٩٩٢ نووسەر سەبارەت بە شەڕ لە گوندی (میر شێخ حەیدەر) ئاوا دەنووسێ: [دوای چەند شەو و ڕۆژ شەڕ و لێکدان ئەوەبوو بەکر ئاغا خۆشی هات بۆ بەرەکەمان وەکوو سەردان و پشکنین (تفتیش) و زۆر ڕازی بوو نیشوو کاری (بەرە) و ڕێکخستنمان و لەسەر داوای ئێمە (حەمەی مەولود)ـیش لە ناوچەی (ڕەبەت)ـەوە گووازتەوە لای ئێمە بە خۆی و لقێکی سەربازییەوە چونکە بەرەی ئێمە کلیلی دەرگای سەرکەوتن بوو و هەموو گڕ و گەرمای ئاگری شەڕ کەوتبوو سەر ئەو بەرەیە].

«حیساموشکری»[ئەم وشەیە بەباشی ناخوێندرێتەوە، لەوانەیە حیسام و لەشکر بێت یا ...][1] ماینێکی بە جانووی خەڵات کردم و بەڵێنی دامێ کە بۆ ساڵی دادێ، دەرەجەیەکم بۆ زیاد بکاتِ و حوکمەکەشی بۆ نووسیم و دایە دەستم، هەروەها مانگێ ٢٠٠ تمەنی بۆ خەرجی سەفەرم بۆ بڕیمەوە و گوتی:

— لە جەبهەی میوانت دەبێ با پووڵت هەبێ کە بۆیان خەرج بکەی.

ئیتر منیش هەر بۆ بەیانی خۆم ئامادە کرد و هاتمەوە بۆ جەبهەی و هاواڵەکانم هەڵگرت و چوومە میرشێخحەیدەر. لەوێش بەهەمان شێوە، هەموو ڕۆژێک دەگەڵ عەجەمان قوونەشەڕە[2]. ڕۆژێک ئەوان دێنە سەرمان و دەیانشکێنین، ڕۆژێکیش ئێمە بەسەریان دادەدەین و دەریاندەپەڕێنین. «ساڵح جوجکە»[3] بە خۆی و پارتیزانێکی زۆری سەردەشتی، لە سەردەشتێ ڕایانکردبوو و هاتبوونە ناو دیموکڕاتی و لە میرشێخحەیدەر گیرسابوونەوە. ساڵح جوجکە پیاوێکی زۆر ئازا و بەکار بوو. ژن و منداڵەکەی لە سەردەشت مابوونەوە. سەردەشتی و خەڵکی دەوروبەری ئەوشارەی زۆر دەگەڵ بوو، هەمووشی زۆر ئازا و لەزەبر بوون.

ڕۆژێکی شەڕێکی قورس کرا و عەجەم شکان و پێشمەرگەکان دوو پیاوی «حەمەد ئاغای» میرشێخحەیدەری دەگەڵ مامی حەمەد ئاغایان، بە یەخسیر گرتن. ئەوانە لە ڕاستیدا پێشمەرگەی کوردوستان بوون و ناویان لەو لیستەدا بوو کە مووچەی پێشمەرگەیان بۆ دەهات. حەمەدئاغا بۆخۆشی لە حکومەتی کوردوستان «پۆلکلۆنیک»[4] بوو. هەرکات پارەی پێشمەرگە هاتبا، وەک پێشمەرگەی کۆماری کوردوستان پارەی خۆیان وەردەگرت. کە مامی و پیاوەکانی گیران، یەکسەر ڕەوانەم کردن، بەڵام زۆری پێنەچوو بەرەڵڵا کران. هەم خۆم و هەم پێشمەرگەکان لەو کارە واق مابووین کە چۆن دەبێ ئەوانە ناویان وەک پێشمەرگە هەبێت!؟ پووڵی پێشمەرگایەتی وەرگرن!؟ هاوکات بچن لە ڕیزی دوژمنەوە و دەگەڵ ئەوان گوللە بە ئێمەوە بنێن!؟ لە هەمووشی سەیرتر ئەوە بوو کە لە شەڕدا بە یەخسیرمان گرتبوو، کەچی بەرەڵڵابەرەڵڵا بە بەرچاوماندا دەهاتن و دەچوون!؟ کە پێشمەرگەکان لێیان دەپرسیم ئەوە چ باسە؟ من هیچ وەڵامێکم نەبوو بیاندەمەوە جگە لە خۆخواردنەوە.

بە هەڵکەوت تووشی حەمەد ئاغا بووم. بەخۆمم گوت هەلی چاکە بەشکەم بیانوویەکم بۆ هەڵکەوێت و بە دڵی خۆمیان دەگەڵ بکەم. ئەو پۆلکلۆنیک بوو و بەتەمەنیش لە من گەورەتر

---

[1] کاک حەسەنی قازی یارمەتی دام و فەرموویان ئەو کەسە (حیسام داشکستان)ـە.

[2] شەڕی کەم و کورت، بەڵام زووزوو.

[3] لە باشووری کوردستان بە ساڵحی مام ڕەحمانی نێودێرە. لە سەردەشت ناو و ناسناوی "ساڵح ڕەحمانی" ـیە. لەناو خەڵکدا بە "ساڵحە جوجکە" ناسراوە.

[4] پۆلکۆڤنیک یا Полковник یا Colonel واتە، سەرهەنگ بە فارسی.

بوو، که هاته ئاستی من دەبوایە دەستی بۆ هەڵێنم و ڕێزی سەربازی بۆ دابنێم. ئینجا لێمپرسی که:

— «سامە»ـی برات لەنێو عەجەمان دایە و تۆش پۆلکلۆنیکی کوردوستانی، چۆن شتی وا دەبێت؟ دەکرێ بۆم باس بکەی؟

ئەو لە من زیرەکتر بوو، هیچ بیانووی نەدامێ. زۆر بە خۆشی و لەسەرخۆ بەڵام زیاتر وەک پاڕانەوە و خۆ پەڕاندنەوە جوابی دەدامەوە و گوتی:

— چی بکەم؟ زۆرم دەگەڵ گوت بەڵام بەقسەی نەکردم، بۆم ڕازی نەدەبوو.

ئەو جوابە منداڵێکیش ڕازی ناکا چ بگا بە من، دەزانن بۆ؟ ئاخر ئەوە فێڵی ئاغا و سەرۆک عەشیرەتانە کە دڵی هەردووک لا ڕاگرن بۆ بەرژەوەندی خۆیان. بە داخەوە لەو بەینەدا کەم نەبوون ئەو ئاغا قاچاغانەی کە لەترسی دیموکراتی ڕایان کردبوو و چوبوونە پاڵ عەجەمان، شەڕیان دەگەڵ پێشمەرگە دەکرد و فیشەکیان پێوە دەناین. یەک لەوان «حەوڵای بایز ئاغا»ـی بوو کە تفەنگی بە ئێمەوە دەنا. «حەمەد ئاغای» برای حەوڵای، لە دیموکڕاتیدا مایۆر بوو. هەروەها «بایزی عەزیز ئاغای» هەمەکارەی قازی بوو بەڵام براکانی لە سەقز هەمووی لەناو عەجەماندا بوون. لەو نمونانە زۆر بوون و زۆرمان لەو ڕۆژانە بینی. مەنعم مەکەن کە وا دەڵێم، باوەڕتان بێت ئاغا و عەشیرەت گەورەترین غەدریان لە کوردوستان کرد.

## شکانی ئازەربایەجان و گەڕانەوە بەرەو سابڵاغ

ڕۆژێک لە ئاخری ڕۆژەکان، خەبەریان هێنا کە ئەوە دەستێک سەرباز بە ئێستری تۆپخانەی، خواردەمەنی و کەلوپەلیان بۆ قوللەکانی عەجەمان دەبەن. ساڵح جوجکە هات و گوتی کاکە ئیزنم بدە ئێستا ئەو ئێسترانە بە ئەرزاق و کەلوپەلەوە هەمووی دەست بەسەردا دەگرم و دیانهێنم. منیش ئیزنم دا. ساڵح بە خۆی و هاواڵەکانی ڕۆییشتن. هێندەی پێنەچوو پەیدابوونەوە. زۆر ئازایانە و نەترسانە چووبوون دەستیان بەسەر خواردەمەنی و کەلوپەلەکەدا گرت و یەکەم دەستڕێژ، چەند سەرباز دەستدەکەنەوە ، کە ئەوان دەکوژن ئیتر سەربازەکانی دیش هەمووی هەڵدێن و ون دەبن. منیش کە ئاوا ئازا و دەستکەرەوەم دیتن، ئێسترەکانم دا بەخۆیان و لێمنەستاندنەوە. هەر ئەوڕۆژە بۆ لای نوێژی شێوان سەرهەنگ «ئایرۆم» بە کوڕەکەی ساڵح جوجکەیدا کاخەزێکی دوور و درێژی بۆ ساڵح جوجکەی نارد و تێیدا نووسیبووی کە:

– ئەوە ئێوە خەریکی چین؟ ئازەربایجان ئەسلەحەی داناوە و «پیشەوەری»[1] هەڵاتووە و تەورێز گیراوە، ئێوەش تا زوویە چارەی خۆتان بکەن.



خوالێخۆشبوو ساڵح جوجکە

ئێمەش ئەوە خەبەری هیچمان نییە و ئاگاداری هیچ نین. ناشزانین کە فەرماندەکەی ئێمە کە بەکر ئاغایە، بێئەوەی ئێمە ئاگادر بکاتەوە لە ڕەبەتێ هەڵاتووە و چۆتەوە سابڵاغێ. هەرچی دەمکرد نەمدەتوانی باوەڕ بکەم کە فەرماندەکەمان جەبهەی جێهێشتووە و هەڵاتووە. ئاخر زۆری پێ تێکچووم. کەمێکم ورە دایەوە بە هاواڵەکانم و لەجیاتی بەکر ئاغای کاخەزێکی کەیلی جنێو و قسەی سووکم بۆ سەرهەنگ ئایرۆم نووسی و وە کورەکەی ساڵح جوجکەم دا، گوتم بۆی بەرەوە بۆ جەنابی سەرهەنگ. کوڕەکەی ساڵحی کە ڕۆیی ئیتر دانیشتین و فکرمان لێکردەوە. هەر دەهات زیاتر لە فکران ڕۆدەچووین. ئاخر ئەوە چ بوو کە سەرهەنگ نووسیویەتی؟ بڵێی ڕاست بکات؟ ئەدی بۆ ئێمە ئاگاداری هیچ نین؟ گەر شتی ئاوا ڕووی دابا حەمەن بەکر ئاغا خەبەری بە ئێمە دەدا! درۆیە. شتی وا نابێ. بەو قسانە دڵخۆشی خۆ مان دەدایەوە. لە گەرمەی ئەو قسانەدا بووین کە «برایمی هەباسی» دەگەڵ «مام حەسەنی کوری سەید کەریمی «بەتاڵووکە وەژوور کەوتن و گوتیان:

– ئێوە خەریکی چین لێرە؟ کوڕە ئازەربایجان گیرایەوە! هەستن خڕکەنەوە بڕۆن!

---

[1] سەید جەعفەر جەوادزادە ناسراو بە سەید جەعفەر پیشەوەری سەرۆکوەزیرانی دەوڵەتی ئازەربایەجان و دامەزرێنەری فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوو.

من باوەڕم پێنەکردن و وەمزانی گاڵتە دەکەن و پێیان پێکەنیم. کە زانییان ئێمە زۆر بێخەبەرین لێیپرسیم:

— باوەڕم پێناکەی؟

— نا!

— دە ها بگرە ئەوەش کاخەزی پێشەوا کە بۆ تۆی نووسیوە.

کاخەزم وەرگرت و دام بە میرزاکەم بۆی خوێندمەوە. قازی نووسیبووی: زۆر بەپەلە پۆستەکەت هەڵدەگری و دێیەوە بۆ سابڵاغێ.[1]

ئەوجار زانیمان خەبەرەکان ڕاستن و زۆر بەپەلە بارگە و بنەمان تێکنا. کە لێبووینەوە شەو درەنگاییەک بوو. کۆمەڵێک پشدەریمان دەگەڵ بوو. بەهۆی ئەوەی کە ئێمە ئاخرپۆست بووین و دەمانڕوانییە عێراق، پشدەرییەکان زۆریان تکا کرد کە تازە نەچینەوە بۆ سابڵاغێ و دەگەڵیان بچینەوە بۆ پشدەر. دەیانگوت تا ئێمە مابین کۆمەگ و یارمەتیت دەکەین و دەتپارێزین. زۆرم سپاس کردن و بەو شەوە سەری ڕێگایەم گرت بەرەو سابڵاغێ.[2] لەسەر ڕێگامان چەند پۆستێکی پێشمەرگەی لێبوو، هەر هەموویان چۆلیان کردبوو و چووبوونەوە بۆ سابڵاغێ و ئێمەیان ئاگادار نەکردبۆوە تا چووین بۆ «ڕەبەت»ێ کە ناوەندی فەرماندەکەمان بوو و دەبوایە فەرماندەکەمان بەکر ئاغا لەوێ بوایە کەچی، بنکەکەی چۆلوهۆل بوو. سۆراغی فەرماندەمان لە خەڵکی دێیەکە پرسی، گوتیان:

— هەی هووو، ئەوە دەڵێن چی؟ سێ ڕۆژە فەرماندە چووەتەوە بۆ سابڵاغێ و ئێستاش نەهاتۆتەوە.

چەند پێشمەرگەیەک مابوون کە نەیاندەزانی چ بکەن! لەخۆڕا دەخولانەوە! ئەوانیش چوونەوە ماڵەکانیان و ئێمەش درێژەمان بە سەفەرەکەماندا و بۆ لای بەیانی گەیشتینە لەشکری «زێڕۆبەگی»[3] و پێشمەرگەکان. تەماشام کرد «سەعیدزادە» هەموو پێشمەرگەکانی لەخۆی

---

[1] بەڕێز عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (یادداشتەکانم)، بەرگی یەکەم بەغدا ١٩٩٢ لاپەڕەی ٩٤ دەقی نامەکەی پێشەوای نووسیوەتەوە کە دەقاودەق و بێدەستکاری لە بەشی پەراوێزەکان و لاپەڕەی ٣٤٢ نووسراوەتەوە

[2] بەڕێز عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری کە خۆی خەڵکی پشدەرە لە عەشیرەتی میراودەلی، لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا بۆ پشتیوانی کردن لە کۆماری کوردستان تێکەڵ هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەبێت و لە ناوچەی سەردەشت خزمەت دەکات. لە نیزیکەوە دەگەڵ (کاپیتان حەمەدی مەولودی) لە سەنگەردا بووە. بەڕێزیان بیرەوەرییەکانی خۆیان لەکۆی پەرتووکێکدا کە نووسیوەتەوە بەناوی (یادداشتەکانم). لە بەرگی یەکەمی ئەو کتێبە و لە لاپەڕەی ٩٢ بەولاوە بە وردی باسی ئەو کات و ساتانە دەکات کە کاپیتان دیانگێڕێتەوە. لەبەر گرینگی باسەکە دەقی بیرەوەییەکانی بەڕێز عەبدوڵڵا ئەحمەد لە لاپەڕەی ٣٤٠ دادەنێمەوە.

[3] کورتەیەک لەسەر ژێنێراڵ زێڕۆ بەگی هەرکی لە لاپەڕەی ٤٤٥ دا بخوێننەوە.

خڕکردۆتەوە و قسەیان بۆ دەکات. کە ئێمە چووین زۆر خۆشحاڵ بوون. یەکەم قسەم دەگەڵ سەعیدزادە پرسیاری فەرماندەم لێکرد و گوتم:

- فەرماندە چی بەسەر هاتووە؟
- وەڵڵا خەبەری بە ئیمەش نەداوە و چۆتەوە بۆ سابڵاغێ.

زۆر ماندوو بووین. بەو شەوە یەکبین ڕێگامان کوتابوو. باش بوو پێشمەرگەکان کەمێک حەسانەوە و نان و مان خوران و سەرلەنوێ وەڕێ کەوتینەوە. بۆ لای تاوپەڕان گەیێشتینە «کاوڵان»ـێ[1] و لەوێ شەومان ڕۆژ کردەوە. چەند ئاغایەکی مەنگوڕان مایۆر و ئەفسەری جەبهەی کوردوستان بوون، لەوانە «حەمەدئاغای ...» و برای «قادری ...» و چەند کەسی دی کە هەریەکە و فەرماندەی جەبهەیەکی بوون. ئەوانە شەوێ لە کاوڵانێ خۆیان دزییەوە و چوونە پاڵ لەشکری مەنگوڕان و لە «گوێچکەدەرێ» ڕێگەیان لە ئێمە گرتبوو و نەیاندەهێشت دەربازی سابڵاغێ بین و دیانویست چەکمان کەن. ئەوانە هەر لە ڕۆژی هەوەڵەوە بە دەغەڵی خۆیان وا نیشان دەدا کە گۆیا دەیانهەوێ کوردوستان ئازاد بکەن و بۆ کورد شەڕ بکەن. بەیانی کە لە خەو ڕاستبووینەوە زانیمان کە ئەوانە هەڵاتوون و خۆیان دزیوەتەوە. خەبەریشیان دابووینێ کە ئەوە مەنگوڕ لەشکرێکی یەکجار زۆریان لەسەر ڕێمان ئامادە کردووە تا ڕێگەمان پێبگرن و چەکمان بکەن. ئێمەش هەموو شتێکمان بە دڵ و بە گیان قەبوڵ کرد و خۆمان ساز کرد و وەڕێ کەوتین. من لە ناوەندی لەشکرەکە بووم و زێڕۆبەگیش بە سواری ماشێن لە دواوەی لەشکر بوو، هێشتا زۆر نەڕۆییشتبووین کە لە دوور ڕا دیتم ئەوە پێشمەرگەکانی پێش ئێمە وا لێکهاڵابوون هەموو تێکیان داویشت، هەر دەتگوت شتێکی عەنتیکەیان دۆزیبێتەوە. زوو سوار بووم و تەقڵەکوت خۆم گەیاندنێ. کە پێشمەرگەکان منیان دی بانگیان کردم و گۆتیان وەرە بزانە ئەو سێ کەسە دەڵێن چی؟ ئەو سێ کەسە دیار بوو منیان دەناسی. گوتم:

- چییە؟ چ بووە؟
- ئێمە ڕاسپاردەین و چمان لەسەر نییە. قاسیدین و ناردوویانین بۆ لای ئێوە.
- دەی؟
- ئاغاکانی مەنگوڕان هەموو ڕێگاکانیان لە ئێوە گرتووە و دەیانهەوێ چەکتان کەن.
- دەی؟
- ئاغاکان دەڵێن «حەمەدی مەولوودی« دەگەڵ هەموو سابڵاغێکان ڕێگایان کراوەیە، دەتوانن بێن بڕۆن بەڵام زێڕۆبەگ و دەستەکەی دەبێ تفەنگان دابنێن جا بڕۆن.

---

[1] کاوڵان گوندێکە لەسەر قەدی ڕێگای نێوان سەردەشت و مەهاباد هەڵکەوتووە. ٥٧ کیلۆمیتر لە باکووری سەردەشت و ٦٢ کیلۆمیتریش لە باشووری مەهابادەوە دوورە.

من ئەو کەسە نەبووم پشتی پێشمەرگەی کوردوستان بەردەم. هەرچی ئاغای خائینە دەکەم بەقوربانی پێڵاوی پێشمەرگەیەک، بێ‌ئەوەی لەسەر زێڕۆبەگی ڕاوەستم تا دەگاتێ و تەگبیری دەگەڵ بکەم، وەڵامم ئاوا دانەوە:

— کێشە نییە تۆ بڕۆ پێیان بڵێ ئێستا ئێمە دێین بۆ «گوێچکەدەرێ»[1] و لەوێ قسەی خۆمان دەکەین. بەڵام ئەوەشم پێبڵێن بزانم حەمەدئاغا و ئەفسەرەکان لەوێن؟

— بەڵێ، نیوەشەوێ هاتوونەوە و کڵاوە ئەفسەرییەکانیان فڕێ دا و نیشانەکانیان لەخۆیان کردەوە و گەپیان پێدەدان و قسەیان پێدەگوتن.

— دەی باشە کە وایلێهات بڕۆن پێیان بڵێن ئێمە لە قەراخ گوێچکەدەرێ خۆمان مەڵاس دەدەین و لە حەمەدئاغا و ئەفسەرەکان زیاتر کەس نەیەت، لەبەرئەوەی ئێمە ئەسلەحەکامان تەنیا دەدەینەوە بە ئەوان کە ئەفسەری کوردوستان بوون.

ئەوان وەڕێگا کەوتن و گەڕانەوە، ئێمەش درێژەمان بە ڕێگا دا، لەو شاخ و کوێستانە سەختانە وەسەر کەوتین و گەیشتینە گوێچکەدەرێ. میر و لەشکری مەنگوڕان هەرچی شاخ و ڕێگا بوو گرتبوویان. وچانێکمان گرت و کەمێک حەساینەوە و لەسەر قەولی خۆشمان ڕاوەستاین تا بەشکوو بێن چەکمان لێبستێنن، کەچی نەهاتن. ئەوجار فەرمانی هورووژمم دا و پێشمەرگە خۆنەویستانە پەلاماری لەشکری مەنگوڕانیان دا. شەڕ دەستییپێکرد. هەر دەهاتوو گەرمتر دەبوو. بە باشی نازانم خۆم تاریفی خۆم بکەم، بەڵام من سوار بووم و لەمن بەدەر هەموو پیادە بوون. زێڕۆ بەگ نەبێ دە ماشێنەکەدا بوو کە لە دوای هێزەکەمان بوو. ئەو ڕۆژە پێشمەرگەی سابڵاغێ شەڕێکیان کرد تا ئەوڕۆ شتی وا نەبینراوە. هەر کادەرووێشی بوو هەڵدەهات. تەرتوتوونا بوون. کەس نەیزانی بۆ کوێ هەڵاتن و لە چ کونێکدا خۆیان شاردەوە. برایەکی «کاکە ڕەحمانی گەنەداری» کوژرا، کە ئەو کوژرا ئیتر خۆیان نەگرتەوە. بەوجۆرە گوێچکەدەرێمان گرت و خوا هەڵناگرێ پیاوەکانی زێڕۆبەگ شەڕێکی مەردانەیان کرد. ئێمەش تاوێک وچامان گرت و کەمێک حەساینەوە. «خانانی هەرمیلەی» کە ئەفسەرێکی کوردوستان بوو، گوتی باشتر وایە وەدوویان کەوین و ڕاویان بنێین نەکا خۆیان بگرنەوە، ئێمەش وەدوویان کەوتین. ئەوشەوە هاتینە «هەمزاوا»ـیە[2] ( .... ) شەو لەنێو دێ تێر حەساینەوە. بۆ بەیانی چووینەوە سابڵاغێ. کەسوکاری پێشمەرگەکان هەموو هاتبوونە سەر ڕێگایە، زانیبوویان مەنگوڕان هاتوونەتە سەر ڕێگامان. وایانزانیبوو کە تێداچووین ئیتر نەیانزانیبوو کە کوڕەکانیان شەڕێکیان کردووە بێوێنە. شین و واوەیلایەکیان بوو نەبێتەوە. هەر دایک و باوک بوو

---

[1] گوێچکەدەرێ گوندێکە لەسەر قەدی ڕێگای نێوان سەردەشت و مەهاباد هەڵکەوتووە. ٧٩ کیلۆمیتر لە باکووری سەردەشت و ٥٤ کیلۆمیتریش لە باشووری مەهابادەوە دوورە.

[2] هەمزاوا گوندێکە لەسەر ڕێگای نێوان سەردەشت و مەهاباد هەڵکەوتووە. ١١٠ کیلۆمیتر لە باکووری سەردەشت و ٢٠ کیلۆمیتریش لە باشووری مەهابادەوە دوورە.

دەستی لە ملی ڕۆڵەی خۆی گرتبوو و لە خۆشیان دەگریان. دەگەڵکوو هاتینە ناو شاری، سەرم سووڕ مابوو، ئەو ڕۆژە من سابڵاغم قەت وا نەدیبوو، لە چەند نەفەر خائین بەدەر هەموو مات و ملکەچ، هەموو وەک مردوویان لێمردبێت وابوو.

کەسانی وەک «میرزای بلووری»[1] و هاوتاکانی فیکەی سمێڵیان بوو، وەک باوکیان زیندوو بێتەوە وابوو. کەس هێز و وزەی ئەوەی نەبوو لە دەرێ بمێنێتەوە، هەر کەسە چوو دەماڵە خۆی، منیش چوومەوە ماڵێ. خەیاڵم بوو بڕۆم بۆ لای قازی، بەڵام گوتیان لێرە نییە و چۆتە مياندواوێ بەپیر «سەرلەشکر هومایونی»ـیەوە. بۆ بەیانی خەبەرم زانی کە قازی هاتۆتەوە. هەستام چووم. کە چوومە مەحکەمەی پڕ بوو لە ئاغا و توجار. وەک «میرزا ڕەحمەتی شافعی» وەک «بایزی عەزیز ئاغای»، ڕێی ڕێداری نەبوو، لە قووژبنێکی جێی خۆم کردەوە بەڵام وایان تەماشا دەکردم، ماندوونەبوونییان بە تەوسەوە لێدەکردم.

**زۆر بە داخەوە لاپەڕەی ٧١٤ تا لاپەڕەری ٧١٧ لە دەفتەرەکەدا نییە.**

[خوێنەری هێژا، ئەو قۆناغە لە ژیانی کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی گرێدراوە بە زۆر بڕیاڕ و ڕووداوی چارەنووسساز کە بەداخەوە فەوتاون. لەو وێستگەیە لە ژیانی کاپیتان، گەر نەفەوتابا و دەستمان کەوتبا، بە دڵنیاییەوە ئەو کات و ساتانەی باس دەکرد کە سەرۆکەکانی کۆمار و ژ.ک دەبوایە بڕیاڕی خۆیان بدەن. کاپیتان هەمووی لەوێ بووە، لەبەر ئەوەی فەرماندەیەکی لەزەبر و بە توانا بووە، بەردەوام تەگبیریان پێکردووە. ئاگاداری هەموو دۆخەکان بووە. ئێستا کە بەداخەوە ئەو بەشە فەوتاوە و لە نووسینەکانی کاپیتان بێهیواین، ناچارین لە لاپەڕەکانی بیرەوەرییەکاندا بگەڕێین بەشکوو شتێک بدۆزینەوە. دەقی هەندێک وردەباسم دۆزیوەتەوە و لێرە وەک خۆی

---

[1] میرزا مستەفا بلووری ناسراو بە "میرزای بلووری" (١٢٩٢ - ١٣٧٢هەتاوی). ناوی بابی "خەلیل"ـە و سێ برای هەبووە بە ناوەکانی قادر، ڕەسوڵ، ئەحمەد کە لە کۆنەوە مڵکدار و سەرقاڵی باغداری بوون. دەگەڵ دەوڵەتی شای نێوانی خۆش بووە و لەساڵی ١٣٤٦ خۆی کردە کاندیدی مەجلیسی شورای میللی و تەنیا ٩٠٠ دەنگی هێنابۆوە. بنەماڵەی بلووری بە گشتی بە بنەماڵەیەکی شەهیدپەروەر و نیشتمان خۆشەویست بەناوبانگن، بەڵام دیار نییە کە میرزای بلووری بۆ هەڵوێستەکانی دژ بە کۆماری کوردستان بووە؟ تەنانەت لە بەڵگەنامەکانیشدا بە ڕوونی هەڵوێستی میرزای بلووری بەڵگەمەند کراوە. بۆ وێنە دەتوانن بڕوانە کتێبی (اسرار محاکمه قاضی محمد و یارانش – نوشته دکتر رحیم سیف قاضی - تهیه و ترجمه محمد رضا سیف قازی - چاپ سوم – سال ١٣٨٥ – ل: ١٣٢ تا ١٣٦). سەرەڕای ئەوەی میرزای بلووری ئەوە هەڵوێستی بووە بەرانبەر بە کۆمار، بەڵام دوو کوڕی خوێندەوار و قارەمانیی بۆ کوردستان و نیشتمانەکەی بوون بە قوربانی بە ناوەکانی "خەلیل" و "عەلی". خەلیل لە ڕێکەوتی ١٣٦٠/٩/٢٥ و عەلی‌ش لە ڕێکەوتی ١٣٦٠/١٠/٩ بە مەودای ٢ حەوتوو لە یەکتر لەلایەن کۆماری ئیسلامی تیرانەوە لە ورمێ لە سێدارە دران. سپاس بۆ کاک مەنسور بلووری کە یارمەتی دام بۆ ئەو کورتە نووسینە.

دایاندەنێمەوە، گەر هەڵەیەکی تایپی یا ڕێزمانی هەبی هیچ پێوەندی بە کۆکەرەوە نییە و مافی ئەو نییە دەستیان تێوەربدات.

## بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوایەتیی گەلی کورد و قازی محەممەد ١٩٤١ - ١٩٤٧

نووسینی ڕەحیمی قازی - دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس - هەولێر لاپەڕەی ٢٩٣. دوکتور ڕەحیمی قازی دەنووسێت:

**(... هەر ئەو شەوە کە قازی و هاوڕێکانی گیران ١١٥٠ کەس لە تێکۆشەرانی حیزب و پێشمەرگەکانی کوردستان لە مەهاباد بوون بە سەرۆکایەتی ئەفسەری هێزی پێشمەرگە «محەممەدی مەولوودیان» بە چەکەوە لە شاری وەدەر دەکەون و تێکەڵاو دەبن بە هێزی پێشمەرگە بە سەرۆکایەتیی مەلا مستەفا بارزانی کە لە مەڵبەندی نێوانی نەغەدە و شنۆ جێگیر بووبوو. بە تێکەڵاوی ئەم هێزە ژمارەی هۆردووی ژێر فەرمانی بارزانی گەیشتە ٧ هەزار کەس و دەستیان کرد بە خۆئامادەکردن بۆ پەلاماربردن بۆ سەر گۆردووی ئێران لە مەهاباد. ژمارەیەکیش لە فیداییەکان و ئەفسەرەکانی ئازەربایجان تێکەڵاوی هێزی بارزانی بوون....)** هەروەها لە

## لە کتێبی: ژیان و بەسەرهاتەکانی عەبولڕەحمانی زەبیحی (مامۆستا عولەما)

نووسینی: عەلی کەریمی - نامەی کاک یۆسف ڕیزوانی لە لاپەڕەی ٣٩٧دا ئەو بیرەوەییە هەیە کە جێێ خۆیەتی لێرە جێ بگرێ. خوالێخۆشبوو کاک یوسف ڕیزوانی بۆ کاک عەلی دەنووسێ:

**(٣- بەچاوی خوم دیتم کە قازی محمد خەڵکی لە مزگەوتی مهاباد کۆ کردەوە و فەرمووی ئەوە حکومەتی ئازەربایجان تەسلیم بوو، من تا ئیستا کە سەرۆک کۆمار بووم وا ئێستا پێشمەرگەیەکی ساکارم و تفەنگ بەدەست، پشتیوانیم بکەن، واجبی نیشتمانیە دەبێ کومار بپارێزین. لەناو تەواوی خەڵکی شاری مهاباد «حاجی حسن زبیری» کە لە دەوڵەمەندەکانی مهاباد بوو دەنگی هەڵبڕی و وتی قازی دەتەوێ شارەکەمان وێران بکەی؟ ئێمە حازر نین لە بەرانبەر حکومەتی تاران بوەستین و خیانەت بە نیشتمان بکەین!! خەڵکی ترساند بەڵام قازی دەرگای سەربازخانەی کردەوە هەرچی چەک و ئالەتی دیفاع بوو تەسلیمی خەڵکی مهابادی کرد و وتی کێ پیاوە با دیفاع بکات. لەو کاتەدا (حەمەی مەولوود) بە خوی و پیشمەرگەکانی هاتە گۆڕەپانی کۆبوونەکەوە و بەو لەهجەیە وتی ژنو ... سابلاغی، ئەوە بۆ پیاوتان تێدا نەماوە؟ چون سەر شۆڕ دەکەن؟ هەرچی چەکی قورس بوو بردی و وتی ئەوە من دەچم بو میاندواو پردەکەی دەڕوخێنم، با شا پیاو بێ و بتوانێ پێ بنێتە مهابادەوە. تەواوی میشە و باغەکانی مهاباد و ئیندرقاشی داگیر کرد و مسەلسەلەکانی دامەزراند و چەند جنیوی توندی بە حاجی حسن دا و لە مەیدان دەرچوو**

**و دەگەڵ بارزانیەکان دەرچوون. ئەوەی زۆر بەرچاو بوو هەرچی پێچ و شەدە و بالتۆ و کەوشی تازە بوو، بە زۆری لەخەڵکیان هەستاند و لە شار دەرچوون. شەڕ لەلای نەغەدە دەستی پێکرد و بە عێراق و ئێران و تورکیا، بارزانیەکان و دەستەی حەمەی مەولوودیان بە [ناخوێندرێتەوە] چەکی قورس داگرت، تاکوو و جارێکی تر هێزی ئیرتیجاع کوردستانیان داگیر کرد و بە سەدان ئینسان شەهید کران.)**

## ڕایەکی دی

کۆکەرەوە و ساغکەرەوەی ئەم کتێبە، لە زمان بابی خۆیەوە "محەممەدی مامڵێ"، ئەو سات و ئانانەی بە دەیانجار بیستووە. هەرکات باسی کاپیتانیمان دەکرد وەک کەسێکی نەترس و بەغیرەت ناوی دەهێنا کە منەتی بە کەس نەبووە. نە لە مەرگ ترساوە و نە ژیانی خۆی بۆ گرینگ بووە. تا سەر ئیسقان کورد و نیشتمانپەروەر بووە. باوکم وەک نموونە ئەو ڕووداوەی دەگێڕایەوە و دەیگوت کە: (**بۆخۆم لە مزگەوتێ بووم کە پێشەوا خەڵکی کۆ کردەوە و تەگبیری دەگەڵ کردن. پێشەوا کە زانی خەڵکەکە مەیلیان نییە بۆ شەڕ، ئەویش ڕێزی بۆ ڕای خەڵک دانا و شەڕی نەکرد، بەڵام کاک حەمەد لە خەڵکەکە وەدەنگ هات و زۆری قسە بە خەڵکەکە گوت. تەنانەت یەک کەس دەنگی لەبەر نەهاتە دەر. جا ئەوجار کاپیتان گوتی کە بە خۆی و بە پێشمەرگەکانییەوە تا دوایین فیشەک شەڕ دەکەن و ناهێڵن جارێکی تر ئەمنییە و ئاژان پێ لە خاکی سابڵاغ بنێنەوە.)**

**لە لاپەڕەی ٧١٨ ڕا کاپیتان ئاوا دەستپێدەکاتەوە**

زۆر نارەحەت بوو. پیاوەکەی قازی (تەرو کرد) [دیار نییە چ نووسراوە]گوتی:

— بە قازی بڵێ شتی وام دە قازی ڕانەدەدی. تا دوێنێ ڕەهبەری کوردوستان بوو، ئێستا ڕێگا بۆ ئێرانیان ئاوەڵە دەکات! زۆر حەیف بۆ قازی.

ئەوجار لەبەر خۆیەوە چوو دە فکرەوە و کەوتە گلەیی کردن لە خۆی. هەروا بەدەم بۆڵەبۆڵ و پرتەپرتەوە لێم دوورکەوتەوە و ڕۆییشت. منیش بەدەم فکر و خەمانەوە هاوڕێ دەگەڵ پێشمەرگەکان وەڕێگا کەوتین.

## مامۆستا قانع[1]

لە ڕێگا شتێکی سەیرم چاو پێکەوت. پیاوێک دوو منداڵی دەگەڵ بوو، منداڵەکانی دەو بەفر و کڕیوە و سەرما سەختەدا یەکەو کاڵەشڕەیەکیان دە پێدا بوو. وەک ئەوە وابوو کە پێڵاویان لەبەر نەبێ. کە چاوم بەو دوو منداڵە کەوت، لەتاوانیان ئاورم گرت. پێشمەرگەکان هاتن و گوتیان ئەوە «قانع»ـە. من نێوی قانعم بیستبوو، بەڵام ئەوە یەکەمین جارە کە چاوم پێی دەکەوت. یەکڕاست چوومە لایان و سڵاوم کرد. لە وڵاغەکەم هاتمە خوارەوە و گوتم:

— کاکە قانع تکا دەکەم منداڵەکانت با سوار بن.

— گوتی نابێ سوار بن. با فێری کوێرەوەری بن.

چەندی من گوتم، فایدەی نەبوو و نەیهێشت ئەو منداڵانە سوار کەم. هەرچی کردم و کراندم هەرچی پاڕامەوە چی لێ شین نەبوو. پاشان منیش بەپێیان و بە قسەکردن دەگەڵی کەوتمە ڕێگا. زۆر قسەخۆش بوو و زۆرم خۆش ویست. دەمویست لێی جودا نەبمەوە ئەو ڕۆژە. تا گەیەشتینە نەغەدەی بەیەکەوە بووین، بەداخەوە لەوێ لێکهەڵبڕاین.



محەممەد کابوولی( ١٨٩٨-١٩٦٥) ناسراو بە مامۆستا قانع، شاعیری چەوساوەکان زانای گەورە و پایەبەرزی نەتەوەی کوردە.

## ١ نەغەدە و داواکردنەوەم لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە



ئەمر حەمەدئاغای مێرگەسووری

«حەمەدئاغای مێرگەسووری» فەرماندەی ئەو جەبهەیەی بوو. ئێمە سابڵاغییەکانی نارد بۆ «خنخنە»ی کە دێیەکە دوو سەعات لە نەغەدەی دوورە و بارزانییەکانیشی بڵاو کردەوە، هەر دەستەیەی ناردە پۆستێکی. پاشان «مامەندی شێروانی» بە خۆی و دەستەکەی هاتنە خنخنەی. زۆری نەکێشا «مەلا مستەفا» دەگەڵ ئەفسەرە عێراقییەکان چوونە تارانێ. لەپێش چوونی مەلا مستەفا بۆ تارانێ قەول وابوو خۆ دە سابڵاغێ هاوێین، بەڵام بە چوونی مەلا مستەفا قەرارەکەیان گۆڕا. مەلا مستەفا لە تاران ئێرانییەکانی فریو دابوو. گوتبووی ئەسلەحەکانو تەسلیم دەکەم، بەوجۆرە دەگەڵ «سەرهەنگ غەفاری» گەڕایەوە «شنۆ»یە. لەوێ مەلا مستەفا جوابی نەدایە و سەرهەنگ غەفاریش بە قوونی خۆی دادا و چۆوە بۆ سابڵاغێ. ئەوە دەوڵەت هەرجارە و بە بیانوویەک و پەیتاپەیتا داوای من و ئەفسەرەکان لە «شێخ ئەحمەد مەلا»[1]ی دەکرد تا بماندانەوە بە ئێران و ئەوانیش هەر جوابیشیان نەدانەوە. هەموو جارێک کە داوایان دەکردینەوە شێخ ئەحمەد دەیگوت کە ئەو نێوانە لە لای ئێمە نین. کاتێک ئێرانییەکان خواردەمەنییان دەدا بە بارزانییەکان دیسان داوای ئەو چەند کەسەیان لێکردن. ڕۆژێک «شێخ سولەیمان» گوتی:

— حەمەد مەیە بۆ نێو نەغەدەی. داوای تۆیان لێکردووین با بیانوویان نەدەینە دەست. ئەوانە دەزانن تۆ دەگەڵ ئێمەی بۆیە زووزوو داوات دەکەن، باشتر وایە خۆت وەبەرچاو نەدەی.

منیش هەرچۆنێک بێت ددانم بەجەرگم داگرت و چەند ڕۆژێک نەچووم بۆ نەغەدەی. خۆم وەک یەخسیر دەهاتە پێش چاوان. پاش ماوەیەک خۆمۆەخۆ نەگرت. لە ڕکێفێم دا و چوومە نێو شارێ. تەماشام کرد عالەمێکی زۆر خڕبوونەوە. کە من چووم و لێیان نیزیک بوومەوە، دیتم شێخ

---

[1] دەبێ مەبەستی کاپیتان خوالێخۆشبوو "شێخ ئەحمەدی بارزانی" براکەورەی مەلا مستەفا بارزانی. ئەوکات سەرۆکی عەشیرەتی بارزانی بوو و بە "خودانی بارزان" ناویان دەبرد. شێخ ئەحمەد لە نەغەدە و سندووسی دادەنیشت و مەلا مستەفاش لە مەهاباد.

ئەحمەد دەگەڵ ئاغا قەرەپەپاغەکان گەرمی قسانن. ئاغاکان کە منینان دیت دەنگیان سەبر کردەوە و بە سەبرا دەگەڵ شێخ ئەحمەدی دەدوان و دمیان لە گوێچکەی نیزیک دەکردەوە تا من لێیان تێنەگەم. پاش ماوەیەک سرت و خورت، شێخ ئەحمەد ڕووی دەمن کرد و گوتی:

— حەمەد، گەر خۆت پێتخۆش بێت دەتوانی برۆیەوە بۆ سابلاغێ، دەوڵەت عەفووت دەکات. دەڵێی چی؟

لەولاوە «عیزەت» وا بە چاوان ئیشارەم دەکا. ئیتر زانیم کە شێخ لەبەر ئاغا قەرەپەپاغەکان وا دەڵێ! منیش تێگەیشتم کە ئەوە قسەی ئاغاکانە و بە شێخیان گوتووە تا وا بڵێت، جا زارم کردەوە، لە شای ڕا پێداهاتم تا گەیمە تەبەقەی هەرە خوارێ. دیار بوو شێخ زۆری کەیف پێهات، هەر بزەی دەهاتێ. ڕووم تێکرد و گوتم:

— یا شێخ، ئەگەر ئێوە پێتان ناخۆشە لەلاتان بم ئەوە هەر ئێستا بە خۆم و هەواڵەکانمەوە دەڕۆین. کە وام گوت ئەفسەرەکان وەدەنگ هاتن.

— ئەوە شێخ لەبەر ئاغاکان وا دەڵێ، چونکە ئێرانییەکان زۆر حەول دەدەن تۆ وەرگرنەوە، بەڵام شەکریان خوارد. ڕۆژ نییە بە ماشێنان خۆراکمان بۆ نەهێنن و لەولاشەوە هەموو ڕۆژێ داوای ئەفسەرەکانی دیموکراتی وەکوو «تەفرێشیان»[1] و هەواڵەکانی دەکەن. تۆ هەوڵ بدە کەمێک ڕەچاوی دۆخەکە بکە و خۆت وەبەرچاو مەدە و مەیە ناو شاری نەغەدە با بزانین چ ڕوو دەدات؟!

---

[1] ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی هێندێک لە ئەفسەرانی ئەرتەشی ئێران کە ئەندام و لایەنگرانی حیزبی توودە بوون لە پارێزگای خۆراسان. لە دژی داگیرکردنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە، هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە دەبێ بۆ ڕووخاندنی حکومەتی شا لە خۆراسانەوە شەڕی چەکداری دەست پێبکەن. شەوی ٢٥ی گەلاوێژ شۆڕشەکە دەستی پێکرد، بەڵام بە هۆی کوژرانی چەند بەرپرسی خۆیان لە سەرەتای شۆڕشەکەدا و لە ٢٩ی گەلاوێژی هەمان ساڵدا، کۆتایی بە شۆڕشەکەیان هات. ئەوانەی مانەوە، هەڵاتن و لە سنووری خۆراسانەوە چوون بۆ شۆرەوی. پاشان کە فرقەی ئازەربایجان حکومەتی دانا، شۆرەوییەکان ئەو ئەفسەرانەیان بۆ یارمەتیدانی فیرقەی ناردەوە بۆ تەورێزێ. تاقمێک لەو ئەفسەرانە دە سەروبەندی ڕووخانی فیرقەی ئازەربایجان و پاش ئەوەی فیرقە زانی شەپکە توونده بە چەند چەکێکی قورسەوە نێردرانە بەرەی شەڕی سەقز، بەڵام تازە زۆر درنگ بوو، چونکە سەرانی فیرقە زۆربەیان هەڵاتن و فیرقەش تێکچوو دە ئاکامدا ئەو ئەفسەرانەی تازە هاتبوونە بەرەی سەقز وێڕای چەند هاواڵی دیکەی خۆیان دەگەڵ پێشمەرگەکانی کۆمار و بارزانییەکانی بەرەی شەڕی سەقز بەرەو مەهاباد پاشەکشەیان کرد. لە ڕێگای بۆکان - مەهاباد چەند ئاغاوەتێک پێشیان پێدەگرن و دەیانهەوێ چەکیان بکەن، بەڵام بە هەر چۆنێک بێ خۆیان دەرباز دەکەن و بە ڕێگای "بورهان"ـدا دەچنە مەهابادێ. کە کۆماری کوردستانیش تێکدەچێ، وێڕای پاشماوەی پێشمەرگەکانی کۆمار (کاپیتان و پێشمەرگەکانی) و بەتایبەتی پێشمەرگەکانی مەلامستەفا بارزانی هەتا توانیان بەرەنگاری هێرشەکانی ئەرتەشی حکومەتی شا بوونەوە. دە دواییدا کە بارزانییەکان بڕیاریان دا بەرەو سنوورەکانی شۆرەوی بڕۆن ئەو ئەفسەرە فارسانە و یێک لەوان تەفرەشیان وێڕای کاپیتان و چەند پێشمەرگەی ئەودیو خۆیان ڕادەستی حکومەتی عێراق کرد. پاش ماوەیێک عێراق ئەو ئەفسەرە ئێرانیانەی ڕادەستی ئێران کردەوە و لە ئێرانیش دوای زیاتر لە ١٦ ساڵ مانەوە لە زیندان ئازاد کران. (ابوالحسن تفرشیان) کە کاپیتان لێرە دا باسی دەکات کتێبێکی بە ناوی (قیام افسران خراسان) نووسیوە کە زۆر زانیاری وردی لەسەر ئەو ڕۆژانەی کاپیتان نووسیونی تێدا باس کراوە.

ئیتر زۆریان لەو قسانە دەگەڵ کردم. ماوەیەک دیسان هەر نەچوومەوە بۆ نەغەدە، بەڵام ڕۆژێک بێتاقەت بووم و چوومە نەغەدەی و لەپڕ «سێمانبەگ» تووشم بوو و گوتی:

— بۆ هاتوویە نەغەدەی؟

— بۆچی؟ بۆ دەنا من حەپسم؟ ئەگەر بزانم من لێرە حەپسم دەچمەوە سابڵاغێ و لە گرتووخانە دادەنیشم.

## چوونم بە هانای زێڕۆبەگی لە گوندی «کوگێ»[1] و «محاڵی مەرگەوەڕی»

ئیتر لەوکات ڕا جوابی کەسم نەدەدایەوە و هەموو ڕۆژێک دەچووم بۆ ناو شار تا ڕۆژێکی لەلایەن شێخ ئەحمەدەوە ئەمرێکم بۆ هات کە بە خۆم و هاواڵەکانمەوە بڕۆم بە هانای زێڕۆبەگی لە «کوکێ». بۆ لای شەو گەییشتین بۆ ئەوێ. هەرچۆنێک بێت شەومان بەڕێکرد. بۆ تاریک و ڕوونی بەیانی بۆ چما تەقە دەستی پێنەکردا! بە تانک و تۆپ دایانگرتین ئەمما داگرتن! ئێمە و چەند خزم و پیاوی زێڕۆبەگی لە قەراغ دێ دە سەنگەردا بووین. ئەوجار لەشکر هێرشی بۆ کردین و لەو هێرشەدا دوو کەس لە خزمەکانی زێڕۆبەگ کوژران. لەو بەینەدا تانک هاتۆتە سەر لەشکری ئێمە و شکاوین و نەمانزانیوە. پیاوەکانی زێڕۆبەگی دوو کوژراوەکانیان ڕفاند و سەنگەرەکان چۆل کران. ئەوە ئێمەش ئاگامان لەو پاشەکشەیە و لەو شکانە نییە و بەگەرمی شەری خۆمان دەکەین. ئەو ڕۆژە ڕشاشەکەم کارێکی باشی کرد و لە گەرمەی تەقەدا بووم کە «حەبیبە زەرد» هەرای کردم:

— کوڕە ئەوە چ دەکەی مردووت نەمرێ، خۆ کەس نەماوە لە سەنگەرەکاندا لە ئێمە زیاتر.

کە سەرم هەڵێنا و ئاوڕێکم لەولا و لەملای خۆم دایەوە، لە سابڵاغییەکان و چەند نەفەر لە بارزانییەکان زیاتر کەس نەمابوون. کابرایەکی هەرمەنیشمان دەگەڵ بوو ناوی «سندوق» بوو، ئەویش مابوو دەنا، هەرچی سەنگەر بوو چۆلوهۆل بوو. کە بە دووربینەکە چاوم لێکرد، کوڕە خۆ شاخەکان هەموو گیرابوون. تانک وەسەر «دمدمی»[2] کەوتبوو. لەشکر گەییشتبوو «بەروژ»[3] بەڕۆژە دێیەکی چووکەیە. هیچ چارمان نەبوو ئێمەش لەسەنگەر وەدەر کەوتین. بۆ هەر لایەک دەچووین ڕێگایان لێگرتبووین. تەماشام کرد دەستەیەک سەرباز کە هەشت کەس دەبوون پێشیان لێگرتبووین،

---

[1] "کوکێ - کوگێ" یان "کوکیا" گوندێکە کە لە دۆڵی قامسلوو و لە نێوانی دوو شاری شنۆ - ورمێ هەڵکەوتووە. دەکەوێتە ٤٦ کیلۆمیتری باکووری شنۆ و ٣٠ کیلۆمیتری باشووری ورمێ.

[2] مەبەستیان کێوی "دمدم"ـە کە "قەڵای دمدم"ـی لەسەرە. ئەو کێو و قەڵایە دەکەوێتە ١٨ کیلۆمیتری باشووری ورمێ و لە نێوان دەریای ورمێ و دۆڵی قاسملووو هەڵکەوتووە.

[3] "بەڕۆژ" گوندێکە کە لە دۆڵی قاسملووو و لە نێوانی دوو شاری شنۆ - ورمێ هەڵکەوتووە. دەکەوێتە ٤٥ کیلۆمیتری باکووری شنۆ و ٣١ کیلۆمیتری باشووری ورمێ.

ئێمە لەبەر پاڵین و ئەوانیش لە دەشتایە ڕاکشاون. ئاخر ئێمەیان شپرزە کرد، هەراسیان بە ڕۆحی هەڵگرتین. لەو عانەشدا ڕەشاشەکەم بە «حوسێن لاسوور»ی[1] بوو. هاوارم کرد تا ڕەشاشەکەم بۆ بهێنێت. ڕەشاشەم وەرگرتوو و سیلەم تێگرتن و یەکسەر دوو دەراغم لێ تەققاندن کە دەیکردە ٤٠ فیشەک. چونکە ئەوان لە گۆڕایێ بوون و زۆریش لێمان نیزیک بوون، حەوتیان لێکوژرا. ئەوجار ڕێگەمان بۆ کرایەوە و هاتینە سەر ڕێگایە، بەڵام دیسان لە کێوەکان ڕا دایانگرتین. ناچار خۆمان دە جۆگەی هاویشت و بە نێو جۆگەیدا ڕۆییشتین تا گەییشتینە گوندی «شیرە»ی[2]. با ئەوەندەش بڵێم کە ئەو ڕۆژە لە «بەرۆژ»ێ هەشت پێشمەرگە محاسەرە [دەوریێچ - ئابڵۆقە] کرابوون کە زۆر ئازایانە خۆیان دەرباز کردبوو. کە هاتینە ناو دێی «شیرە» دیتمان ئەوە لەشکری زێڕۆبەگی لەوێن، باش بوو ئاهێکمان هاتێ. چووم بۆ لای زێڕۆبەگ تا تەگبیرێک لە وەزعەکە بکەین دیتم نانی بە قاورمەی دەخوات. وەختا بوو سوێم بچێ بۆ تۆزێک قاورمە. ماڵتە بە کەسی نەگوت فەرموون. لە ناعیلاجیان لەناو دێ نان و دۆیەکمان وەرگرت و خواردمان و دیسان وەرێ کەوتینەوە و چووینە شاخەکانی بەرۆژێ و خۆمان قاییم کرد. زۆر جێگایەکی سەخت بوو، هەرچۆنێک بێ چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوە و شاخەکان هەموو بەدەست ئێمەوە بوون. ڕۆژ نەبوو هێزی عەجەمان هێرشمان نەکەنە سەر. ئێمەش لێیان دەهاتینە دەست و دەمانگێڕانەوە دوایە.

## چوونم بۆ یارمەتیدانی مەلا مستەفا بارزانی

ڕۆژێک لای شێخ ئەحمەدی ئەمرم بۆ هات کە دەبوو بڕۆمە «دۆڵی پێستان»[3]. ئەو محاڵەی کە ئەو دێیەی لێبوو «مەرگەوەڕ» بوو. ئاغای ئەو دێیە، حاجییەکی پیر بوو. زۆر پیاوی چاک بوو. زۆری ڕێز دەگرتین و نان و خواردنێکی باشی دەداینێ و تا لەوێ بووین هەموومان تێر بووین. چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوە و تا دیسان ئەمرم بۆ هات کە دەبێ دەگەڵ هەواڵەکانم بڕۆیینە دێیێک کە لەسەر چۆمی بوو، بەداخەوە ناوەکەییم لەبیر چۆتەوە. دوو-سێ ڕۆژانیش لەوێ ماینەوە تا خەبەر هات کە مەلا مستەفا دەگەڵ چەند نەفەر لە ئەفسەرە عێراقییەکان بەتەمان بڕۆنە ناو شکاکان تا قسە دەگەڵ ئاغاکانی شکاک بکات، بەشکوو ڕێگایان بۆ چۆل بکەن و بڕۆن بۆ خاکی شۆڕەوی.

---

[1] "حوسێن لاسوور" باوکی هونەرمەند "مستەفا دادار"ـە کە پێشمەرگەیەکی زۆر بەغیرەت و شەڕکەر بووە و یەک لە هاواڵە خۆشەویستەکانی کاپیتان بووە. ئەویش چەشنی هەموو هاواڵەکانی کاپیتان لە چینی نەدار و دەستکورتی سابڵاغ بوو. لە لاپەڕەی ٤٣١ ژیاننامەکەی بخوێننەوە.

[2] "شیرە " یان "شیرەکان" گوندێکە کە لە دۆڵی قاسملووو و لە نێوانی دوو شاری شنۆ - ورمێ هەڵکەوتووە. دەکەوێتە ٣٨ کیلۆمیتری باکووری شنۆ و ٣٤ کیلۆمیتری باشووری ورمێ.

[3] "دۆڵە پیسان" ناوە درووستەکەیەتی.

شەو لە دێیەکی چووکە دەبن. بۆ لای بەیانی بەگزادەکان دینە سەریان. مەلا مستەفا دوازدە نەفەری ئەفسەر و سەرۆکەکان دەگەڵ بوو وەک «ئەسعەد خۆشەوی»، «ئەنوەر دڵسۆز»، «بکر ئاغا» و چەند نەفەری دی. هەر چوار دەوریان گیرابوو. لە پشت دێیەکە شاخێک بوو لەوێ شەڕیان دەکرد.

ئەوەندەمان زانی بوو بە تەقە. ئەو چەند نەفەرەی ئێمەش کە هەمووماں سابڵاغی بووین، کە زانیمان، چووین بە کۆمەگیانەوە. با تاریفی سابڵاغییان نەکەم، لەبەرئەوەی خۆم سابڵاغیم، بەڵام ئەو ڕۆژە کە شەڕ خەڵاس بوو ئەسعەدی خۆشەوی چەند کەڕەتی گوت هەموو (....) بەقوربانی ژنەکەی ئێوە بێت. بەراستی سابڵاغییەکان لەو شەڕەدا هۆیان دایەوە و مەلا مستەفا و ئەفسەرەکانمان دەرباز کرد. بۆ لای شەوێ هێزی ئێرانی، هەرکی، شکاک و «نوری بەگ» بەجارێک هێرشیان هێنا. ئێمەیان گێراوە بۆ دوایە و پاش شەڕێکی قورس و گران توانیمان بە سەریاندا سەربکەوین و چەند کەسیان لێ بەدیل بگرین کە لە ناویاندا کوڕی «سەرلەشکر جەهانبان»ـی دەگەڵ چەند ئەفسەر و سەرباز هەبوون. لە مەیدانی [شەڕگە] لای شنۆیەش بارزانییەکان دەگەڵ ئەفسەرەکانی دیموکراتی وەکوو «تەفرێشیان» و هاواڵەکانی هوردووی ئێرانیان شکاند و چەندسەت کەس ئەفسەر و سەربازیان لێکوشتن و چەندە تۆپیان لێگرتن.


خوالێخۆشبوو ئەنوەر حەسەن عوسمان ئەبوبەکر ناسروا بە (ئەنوەر دڵسۆز)

بەداخەوە عەشایری کوردی ئێرانی خائین بوون و لەشکریان لێکردبووین و شەریان دەگەڵ ئێمە دەکرد. ڕۆژێک دەستەیەک مەنگوڕ لە «سۆفیان»[1] هێرش دەبەنە سەر چەند نەفەر بارزانی. ئەوانیش لێیان وەخۆ دەکەون و چەند ئاغای مەنگوڕیان لێدەکوژن و باقی تر خۆیان بە چۆمێ دادا و دەرچوون. ئەو بارزانیانە زۆر شەڕکەرن. لە مردن ناترسن. ئەگەر زگیان تێر بێت، کێویش بێت دەیرووخێنن. جا ئەو هەموو گێرە و کێشەیە بە من نانووسرێت. «ئەنوەر دڵسۆز»[2] لە هەموو شەڕەکان دەگەڵمان بووە، لە ئەو بپرسن. ئەوە هەڵی دەبوێرم لێرە.

---

[1] "صوفیان " یان "سۆفیان" گوندێکە کە لە نێوانی دوو شاری شنۆ - خانێ هەڵکەوتووە. دەکەوێتە ١٩ کیلۆمیتری باشووری شنۆ و ٢٨ کیلۆمیتری باکووری خانێ.

[2] لە لاپەڕەی ٤٦٥ دا خوالێخۆشبوو ئەنوەر دڵسۆز باشتر بناسە.

## بەرەو سنووری کوردوستانی عێراق (باشووری کوردستان)

ئێرانییەکان دەستبەردار نەبوون. لەولای دەمانشکاندن لە لایەکی دی بۆمان دەهاتنەوە. من و ئەو چەند پێشمەرگەیەی دەگەڵم بوون حاڵمان زۆر شڕ بوو. هەموو کاڵە دڕاو و پێخواس، بێبەرگ و لیباس، بەفر و سەرماش لەوێ ڕاوەستێ، لە دۆخێکی زۆر دژواردا بووین. بەو حاڵەشەوە بەڕەوڕووی دووژمن دەبووینەوە تا چاومان لێکرد لە «دۆڵی گادەر»ـیان پەستاوتووین. لەوێ ڕۆژێکی لەسەر نانخواردن بووین کە تەقەیەک کرا و کوڕێکی باشیان لێ بریندار کردین. کەس نەیزانی کێ تەقەی کرد و لە کوێ ڕا ئەو تەقەیە کرا؟! «بەکر ئاغا» پاشی ئەو تەقەیە خەوفی ڕێکەوت و دەترسا ئەویش بکووژن، بۆیە ئێمە ئەفسەرەکانی هەموو خڕ کردەوە.[1] پاشی قسە و باسێکی زۆر و لێکدانەوەی دۆخەکە، ئەفسەرەکان بڕیاڕیان دا و گوتیان:

— ئێمە دەڕۆینە لای شێخ لەتیف و تەسلیم نابین.

بەکر ئاغاش گوتی من کاکە زیاد خزممە و دەچمە لای ئەو و تەسلیم نابم.

منیش گوتم دەگەڵ سابڵاغییەکان و ئەفسەرە عێراقییەکان دەچمە لای شێخ لەتیفی، ئەو باشم دەناسێت.

لەولاش ئەفسەرەکانی دیموکڕاتی، فارسەکان گوتیان ئێمە تەسلیم بە عێراق دەبین و تۆش دەگەڵمان وەرە خۆت تەسلیم بکە، بەڵام قەبوڵم نەکرد.

ئەوان ناردیانە لای «ئەمیر قوا» کە «سەید عەلی حیجازی»[2] بوو. ئەویش وەڵامی ناردبۆوە کە وەرن خۆتان تەسلیم بکەن ناهێڵم کەس لە گوڵ کاڵترتان پێبڵێت و وەک گوڵ ڕاتاندەگرم.[3] لەو بەینەشدا شێخ ئەحمەدی بارزانی لەدووی منی نارد و لێی پرسیم:

— دەڵێی چی؟ تەسلیم بە عێراق دەبی یان دەگەڵ مەلا مستەفای وەشاخی دەکەوی؟

---

[1] بەکر ئاغا لە کتێبی خۆیدا بە ناوی گەشتێک بەناوی کۆماری کورستاندا – بیرەوەرییەکانی - ڕەئیس بەکر - (عەقید عەبدولکەریم حەوێزی) – (١٩٤٤ – ١٩٤٧) - بڵاوکراوەی: ئاراس - چاپی دووهەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە - هەولێر – ٢٠٠١ – لاپەڕەی ١٣٧ ئاماژەیەک بە ڕووداوە دەکات و دەڵێ[... کاک محەممەد ساڵح ژاژڵەیی و ژمارەیەکی دیکەش لەوێ بوون، لەناکاو گوللەی تفەنگێک لە دەستی یەکێک دەردەچێت و بەر باسکی محەممەد ساڵح دەکەوێ و برینداری دەکات...]

[2] بۆ زانیاری زیاتری لەسەر ئەو کوردکوژە "سەید عەلی حیجازی"، لاپەڕەی ٤٥٦ ئەم کتێبە هەڵدەنەوە.

[3] دەقی ئەو نامەیەم دەست خستووە کە لەلایەن مەلا مستەفا بارزانییەوە نووسراوە بۆ سەید عەلی حیجازی، گەر هەڵەم نەکردبێ یەکەمجارە لەو کتێبەی بەردەستاندا (کوردبوون) بڵاو دەکرێتەوە. یان بڵاو کراوەتەوە و من نەمدیوە. بڕواننە لاپەڕە ٤٥٩

گوتم ئەزبەنی، نە وەشاخ دەکەوم، نە تەسلیم بە عێراق دەبم، من و هاوڕێکانم دەگەڵ ئەفسەرە عێراقییەکان دەبین و بۆ هەر جێگایەک چوون، ئێمەش دەچین با شین و شادیمان بەیەکەوە بێت.


شێخ ئەحمەد بارزانی (خودانی بارزان)

دۆخەکە تا دەهات دژوارتر دەبوو. جموجۆڵ بە زەحمەت دەکرا. تا دەهات لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ[1]مان لێ تووند دەکرا. هەرکەس دەبوایە خۆی ساغ کاتەوە. یان دەگەڵ مەلا مستەفا ڕۆییشتبا، یان خۆی تەسلیم بە ئێران یا عێراق کردبایە، یان بە قاچاغ ژیابا و لەو گوند بۆ ئەو گوند و لەو شاخ بۆ ئەو شاخی کردبا. ئیتر دانیشتین دەگەڵ «محەممەد مەحموود»[2] و «جەلالی

[1] "گەمارۆ" وشەیەکی ڕەسەنی کوردییە کە تایبەتە بە دونیای ئاژەڵان بەگشتی و لە نەریتی ڕاوکردندا بەتایبەتی بەکاری دێنن. ئەم وشەیە ئەوکاتە بەکار دەبردرێت کە ئاژەڵی وەک سەگ و گورگ یان ئاژەڵانی دڕ، گوندێک، مەزرایەک، مێگەلێک یان ئێچیرێکی خۆیان دەورە دەدەن، یان ڕاوی ڕاوکەر لەلایەن سەگ و تاجییەکانەوە دەورە دەدرێت. لەوکاتەدا ئاڵێن: گوندەکە دەورە دراوە، ئاڵێن تاژییەکان کەروێشکەکەیان دەرویێچ کردووە، دەڵێن: گەمارۆ دراوە. وەک چۆن ناتوانین ئەم وشانە بۆ مرۆڤ بەکار بێنین (وەرکەوتن، کاوێژ، جووتە، حەپە، لوورە و ...، (گەمارۆ)ـش دەگەڵ ئەو چەشنە وشانە پۆلین دەکرێت. بە واتایەکی تر، ئەم وشەیە تەنیا دەبێ لە دونیای ئاژەڵاندا کەڵکی لێوەربگیرێت نەک بۆ مرۆڤەکان. بەڵام کاتێک دەمانهەوێ دوژمنەکامان وەک ئاژەڵ پێناسە بکەین، دەکرێ ئەو وشەیە لەکاری بگرین. گەر سەرنج بدەن کاپیتان باس لە دوژمنەکان دەکات و دەڵێ: "گەمارۆ"مان لێ توووند دەکرا. ناڵێ دەورەمان گیرا. لەبەرئەوەی ویستوویەتی بێڕێزی بە دوژمن بکات و وەک سەگ و ئاژەڵی دڕ بیانشوبهێنێ. بەداخەوە ئەمڕۆکە بە هەراو لەلایەن مێدیا و نووسەرە کوردەکانەوە تەنانەت بۆ پێشمەرگە و گەریلاش کەڵکی لێوەردەگرن و دەڵێن پێشمەرگە فلانە شوێنی گەمارۆ داوە. ئەوە هەڵەیە. لەبری ئەم وشەیە دەتوانین بڵێین (دەورپێچ یان دەورەدان). زۆر جاران بینراوە کە (ئابلۆقە)ش بەکار دێنن، بەڵام ئەم وشەیەش کوردی نییە و تورکییە (Abloke) هەروەها ئەوانیش لە وشەی (Blockade)ی ئینگلیسی وەریانگرتووە.

[2] مەبەستی دەبێ ئەفسەری شەهید "محەممەد مەحموود قودسی" بوو بێت. کە دەتوانن لە لاپەڕەی ٤٦٠ دا کورتەیەک لەسەر ئەم شەهیدە قارەمانە بخوێننەوە.

ئامین بەگ»[1]ی و چەند نەفەری دی تەگبیرێکمان لێکردەوە و بڕیارمان دا کە بچین بۆ لای «شێخ لەتیف».

بۆ بەیانی وەڕیگا کەوتین. بارزانییەکان تەسلیم بوون و مەلا مستەفا وەشاخی کەوت. ئێمە سابلاغییەکان و ئەفسەرە عێراقییەکان، بە شاخاندا ڕێگەی عێراقمان گرتە بەر بۆ لای شێخ لەتیف. تازە وەڕێکەوتبووین کە «میرحاج» جانتاکەی لەبیر چووبوو و گەڕایەوە تا بیهێنێت، ئیتر نەهاتەوە لامان. بەفر کرێوە دەکات چۆن! سەرمایەکە بێئامان، جەرگ دەسووتێنێ چ بگا بە ئێسقان! یەکنوا بەفر دەبارێت و لێناکاتەوە! نە کاڵەمان کاڵەیە و نە بەرگمان بەرگێکە کە بەرگەی ئەو سەرما و سۆڵە بگرێ. کەسمان نانی پێ نییە، ئێمە نەبێ برێکمان نۆک پێبوو. لە ڕێگا هەرکەسە و لەوچێکم دانێ تا لە برسان و لە سەرمان نەمرن. لەو کوێستانە سەختانە هەر دەڕۆین و ناگەینە هیچ شوێنێک. پێموابێت یان دوو شەو و ڕۆژ، یان زیاتر بە ڕێگاوە بووین.

لەو ماوەیەدا چاو چاوێ نەدەدیت. ئێمە و محەممەد محمود و ئەفسەرەکان زۆر شپرزە بووین. هەموومان لە ماندووبوونیان و لە برسان، برستمان لێبڕابوو، کەچی دیتم ئەوە «بەکر ئاغا» نانی پێیە و بەدزی ئێمە دەیخوات!! لە ئاخر ڕۆژدا «حەمەدەمین»ـی برام[2] لە برسان کەوت. بە هەر جۆرێک بێ ڕەکێشمان کرد بۆ سەر شاخی. ئەوە ناشزانین کە ڕێگامان لێگۆڕدراوە. وەختێک وەسەر کەوتین تەماشامان کرد لە خوارەوە هەموو چادری پۆلیس و عەسکەرییە. چەند وەختە ئێمە کەوتووینە ڕێگا، کەچی هاتووینە شاخەکانی «لولان»ـی دێی «شێخ ڕەشید»ـی. لەکنەخۆ کابرایەکی بەڵەدمان دەگەڵ بوو چونکە بەفر و کرێوە بوو، ڕێگای هەڵە کردبوو. ئیتر بەیەکجاری هەموومان سارد بووینەوە و ئەژنۆمان شکا. حەمەدەمینی برام ئەژنۆی هیچ، زمانیشی شکا بوو. هیچمان هێزی ئەوەمان نەبوو تەنانەت یەک ساعەتیش بڕۆین، لە بەکر ئاغای زیاتر کە نە سەرمای لێ دیار بوو، نە بێبەرگی و برسێتی. ڕووم لە محەممەد مەحموودی کرد و گوتم:

— برام، ئەوە حەمەدەمین کەلاکی کەوتووە و ناتوانم بەجێی بهێڵم. چارمان چییە؟

جەلال و محەممەد مەحموود گوتیان با شۆڕ بینەوە و تەسلیم بین.

لە بەکر ئاغای زیاتر هەموومان بڕیارمان دا تەسلیم بین. بەکر ئاغا تێر بوو. نانیشی شاردبۆوە. کوڕێکی کەڵەگەت و قەوی دەگەڵ بوو کە کۆڵێکی تفەنگ و فیشەک لە کۆڵی قایم کردبوو. ئەو دەگەڵ کوڕەکە لێمان جیا بوونەوە و درێژەیان بە ڕێگای خۆیان دا. وەک پاشان زانیمان، لە ڕێگا

---

[1] دەبێ مەبەستی کاپیتان "جەلالی ئەمین بەگ" بووبێت کە یەک لە ئەفسەرەکانی کوردی ئەرتەشی عێراق بوو و هاوڕێ و نیزیکی شەهید "محەممەد محمود قودسی" بوو.

[2] "حەمەدەمینی ڕاتب" یا حەمەدەمینی سۆفی مەولودە چرچی" دایکبرا و کوڕەپووری کاپیتانە. دایکی ناوی "زینەت" بوو. بڕوانە لاپەڕەی ٣٢٥. کاپیتان خوشکێکیشی لە دایە زینەت هەیە بەناوی "خەجیج" کە لە وێنەکانی کۆتایی کتێبەکەدا وێنەی ئەو شێرەژنە دلۆڤان و خۆشەویست و خۆشینەدیوە، دانراوە.

نانی نادات بەو کوڕە داماوە و لە برسان گیان دەدات. من وەختێک کە قاچاخ بووم و هاتمە «ماشکان»ێ،[1] ئەو کابرایەی کە بەکر ئاغا چووبوو ماڵی ئەو شتانەی بۆ باس کردم و دەیگوت:

— وەختێک بەکر ئاغا هات شەو بوو. کۆڵێکی پێبوو. لە سەرمان کەسیرە ببوو. بەکر گوتی پیاوێکم دەگەڵ بووە و لە ڕێگایە مرد. وەختێک پشتێندەکەی کردەوە لاوچێکی ورتکە نان لێ کەوتە خوارەوە.

بۆیە دەزانم ئەو کوڕە باش و بەخۆوەی کە دەگەڵ بەکر ئاغا بوو لە برسان مردووە. ئاخر ئەو بارەی ئەو لە کۆڵی ئەو کوڕە داماوە نابوو باری دوو کەسان بوو. نانیشی پێنەبوو. بۆخۆم لاوچێکم نۆک دایە تا گەرمی بێتەوە و نەمرێ لە سەرمان. دڵنیام گەر نانی دابایە ئەو کوڕە نەدەمرد. ئەدی بۆچی بۆخۆی نەمرد؟ خۆ کوڕەکە زۆر بەخۆوەتر و جحێڵتر بوو لە بەکر ئاغا. بە هەر پێودانێک لێکی بدەینەوە، گەر قەرار بوو لەو ڕێگایەدا کەسێک بمرێ، دەبوایە بەکر ئاغا بمرێ نەک ئەو کوڕە.[2]

بە هەر حاڵ. محەممەد مەحموود بڕیاری دا بچێتە خوارەوە و دەگەڵ سەید عەلی حیجازی قسە بکات بەشکوو وەخێر گەڕێ! ئێمەش لەو سەر کێوە و بەو سەرما و سۆڵە و بە برسێتی دانیشتبووین و چاوەڕێی بووین. هەر کە محەممەد چوو بۆ خوارەوە، بوو بە بەهارێک نەبێتەوە. تاو سەری وەدەر نا و گەرمای تێگەڕاندین. حەمەدەمینی برام کە گەرمای تاوەکەی وێکەوت ئیتر زمانی کرایەوە و وەقسە هات و گوتی:

---

[1] ماشکان گوندێکە لە ٢٣ کیلۆمیتری باکووری خانێ (پیرانشار) هەڵکەوتووە و ١١ کیلۆمیتر لە سنووری دەستکرد و بێ بنەمای ئێران و عێراق دوورە.

[2] بەکر ئاغا لە کتێبی خۆیدا بە ناوی گەشتێک بەناوی کۆماری کوردستاندا – بیرەوەرییەکانی - ڕەئیس بەکر - (عەقید عەبدولکەریم حەوێزی) – (١٩٤٤ – ١٩٤٧) - بڵاوکراوەی: ئاراس - چاپی دووهەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە - هەولێر – ٢٠٠١ – لاپەڕەی ١٣٧ بەولاوە ئاماژەیەک بە ڕووداوە دەکات و دەڵێ: [... پاش ڕۆییشتنێکی (٣) شەو و ڕۆژی بەنێو ئەو هەموو بەفرەی چیاکانی سنوردا بێ هیچ خۆراکێک کابرای ڕێ پیشاندەر و شارەزا، ڕێی لێ تێک چوو. هەر هێندە بە خۆمان زانی کە گەیشتووینەتە سەر شاخەکانی نێوچەی لۆلان کە سەربازخانەی عێراقی تێدا بوو. لە وەزعێکی گەلێک شپرزە و بێ هێز و برسیدا بووین. لەوێ کاک محەممەد قودسی و کاک جەلال ئەمین و چەند کەسێکی دیکە ووتیان کە: "ئیدی هێزی ڕۆییشتنمان نەماوە و هەر دەمرین، لەبەر ئەوە تەسلیمی لەشکری عێراقی دەبین". من و (٦) کەسی دیکە ماینەوە و بەسەر لوتکەی چیاکەوە بەرەوە ڕۆژهەڵات ڕۆییشتین. (٤) کەس (ئیبراهیم خۆشناو، سەیدە ڕەواندوزی، عومەر کاولۆکانی) کە ئێوارەی بەسەردا هات لە ئێمە داترازان، چونکە گەلێک لەپێش ئێمەوە دەڕۆییشتن. من و واحیدی مام ڕەزا کۆیی و عەزیزی قالەڕەشی کۆیی (بەناوبانگ بە عەزیز لەیلێ) شەو لەسەر چیاکان ماینەوە و تا بەیانی لە نێو ئەو بەفرەدا هاتوو چۆمان دەکرد و ناو بەناویش پشتمان بە یەکترەوە دەنا و مێزەرەکانی سەرمان بەخۆ دادەدا تا ڕۆژ دەبۆوە، ئەو ڕۆژەش بە نێو ئەو چیا و بەفرەدا ڕۆییشتین و کاتی نیوەڕۆ بوو واحیدی مام ڕەزا هێزی لەبەر براو لە برسان گیانی پاکی دەرچوو. بەناچاری خۆی و چەکەکەیمان بەجێهێشت. من و کاک عەزیز تا نیزیکی ئێوارە هەر ڕۆیشتین، ئەو دەمە گەیشتینە سەر ئاقاری دەشتی شنۆ.] لە درێژەدا دەڵێ: [ بەرەو گوندێک کە لە دەشتایە بوو کەوتینە ڕێ، لە دەرەوەی گوندەکە چەکدارێک بە پیرمانەوە هات و کەوتە پرسیار کردن لێمان کە ووتمان ئێمە گەلێک ماندووین و برسین، جارێ بمانگەیێنێتە نێو گوند تا کەمێک پشوو بدەین ئەو دەمە بەسەرهاتمان باس دەکەین. لەگەڵ چەکدارەکە بەرەو ماڵی کوێخای گوند (سۆفی شوکر) ڕۆییشتین.]

— کاکە بەجێم دەهێڵی؟

— نا، جا چۆن بەجێت دەهێڵم؟ ئەوە محەممەد چۆتە خوارەوە و ئێستا دەگەڕێتەوە و نانیشمان دەگەڵ خۆی بۆ دێنێت.

— کاکە تۆ بۆ ناڕۆی؟ خەمی من مەخۆ. من منداڵم، دەڕۆم خۆم تەسلیم دەکەم ئەوان خۆ دە من ناگەیەنین.

کە وای گوت ئاورم تێبەربوو.

— باشە، با محەممەد بێتەوە بزانین چۆن دەبێ.

سەعاتێکی زیاتر کێشا و محەممەد بە خۆی و دەستێک شووڕتە، هاتن بۆ لامان. گەورەکەیان نێوی «عەلی بەگە خڕە» بوو. خەڵکی سولێمانی بوو. محەممەد گوتی:

— سەید عەلی حیجازی قەولی شەڕەفی پێداوم کە زۆر باش پەنای ئێوە سابڵاغییەکان بدات و ئێمەش [ئەفسەرە کوردە عێراقییەکان] عەفوو کراوین.

خێرا پۆلیسەکان چەکیان کردین. من دووربینێکم پێبوو زۆرم خۆش دەوسیت و پۆلیشی دەکرد. بە گەورەی پۆلیسەکانم گوت:

— ئێمە هیچ پارەمان پێ نییە، ئەو دووربینەم لێ مەستێنن. با بیفرۆشم و بەشکوو کەلێنێکمان بۆ بگرێت.

گوتی حکومەت هەرچی بتانهەوێ بۆتان حازر دەکات. خەمی هیچ مەخۆن.

بەو حاڵەش هەر نەمدانێ. لە ڕێگا دام بە پۆلیسێکی بە ٦ دیناران.

بردیانین بۆ نێو چادرەکان. ئەوەندەمان دیت کە سەید عەلی حیجازی لە چادرەکەی هاتە دەرەوە و چەند نەفەر ئەفسەری عێراقیش لە پشتەوە دەڕۆییشتن. دەگەڵ محەممەد مەحموود و باقی ئەو ئەفسەرە عێراقییانەی دەگەڵمان بوون بە عەرەبی دەستیان کرد بە قسان. پاشان ڕووی دە ئێمە کرد و نێوی هەموانی پرسی دەگەڵ ئەوەی کە خەڵکی چ جێگایەکی ئێرانین. گەیشتە من گوتی:

— نێوت چییە؟

— حەمەدی مەولوودە چرچی.

کابرای معاوینی کە کوردیش بوو و ناوی «فازڵ» بوو، دەتگوت گەنجی دیوەتەوە، هاواری کرد:

— ئەوەتا، بۆخۆیەتی، ئەوە حەمەدی مەولوودە چرچییە.

جا بە عەرەبی دەستیان کرد بە قسان. خۆشخۆشیش چاویان لە من دەکرد. ئیتر ئەو عالەمەیان هەموو لەبیر چوویەوە و باس باسی من بوو. من لە عەرەبیم نەدەزانی، بەڵام بە دەیان جار ناوی خۆمم گوێ لێدەبووە کە ناویان دەهێنام. ئیتر وردەوردە خۆفم لێ نیشت. دەمزانی ئەو چرکەساتانە بۆ من گرینگن و چارەنووسم دەنووسنەوە. پاش تاوێکی معاوینەکە ڕووی تێکردم و دیسان لێی پرسیمەوە:



— یانی تۆ حەمەدی مەولوودە چرچی؟

من کە خەوفم لێنیشتبوو گوتم با حاشای لێبکەم زوو وەبیرم هاتەوە کە چەند ساڵ پێشتر کاتێک لە «سەنگەسەر» دەگەڵ چەند سابڵاغییەک قاچاچێتیم دەکرد و گیراین. یەک لەو سابڵاغییانە «مام برایمی حاجی ئەڵڵا»[1] بوو. ئەودەم بە قۆڵبەستراوی بردیانین بۆ «ڕانیە». قایم مەقامی ڕانیە ژنەکەی سابڵاغی بوو. پیاوێکی زۆر باش و نوێژکەر بوو. شەو هاتبۆوە ژوورەکەی خۆی لە قایم مەقامەتی. هاتن ئێمەیان بردە لای ئەو. کە زانی سابڵاغین، هەر ئەو شەوە بەڕەڵای کردین و گوتیشی کە بەیانی وەرنە ئیدارەی تا تەسکەرە و نفووستان بدەمێ. بەیانی کە چووینەوە هیچ تەسکەرەی بۆ دەرکردین و بووین بە ساحێب تەسکەرەی عێراقی، تەنانەت پاسی تفەنگەکانیشی بۆ دەرکردین و ئەوجار بە ئازادی تفەنگمان دەشانی کرد و چۆینە «کۆیە». ئیتر کە ئەو نەقڵەم هاتەوە بیر بێ ئەوەی خۆم بخەجڵێنم وەڵامی «فازڵ»ـیم ئاوا دایەوە:

— ئەو حەمەدەی تۆ باسی دەکەی من نیم. ئەو حەمەدەی تۆ دەیڵێێ لە مەرگەوەڕی کوژرا. من بابم ناوی مەولوود نییە. من عێراقیم و لە ساڵەکانی گرانییە چووم بۆ ئێرانێ و ئێستاش هاتوومەتەوە بۆ عێراق و دوو تفەنگیشم هێناوە بۆ فرۆشتن، بەڵام ئێوە لێتانهەستاندم، ئێستا نازانم چ بەرمەوە بۆ منداڵەکانم.

ئینجا فازڵ ڕووی دە ئەفسەرە عەرەبە عێراقییەکە کرد و گوتی:

— ئەوە دەڵێ حەمەدی مەولوودە چرچی کوژراوە.

ئەوجار فازڵ هاتە نێوانی من و ئەفسەرە عێراقییەکەوە.

— ئەفسەری عێراقی گوتی لێی بپرسە کە دڵنیایە حەمەدی مەولوودی کوژراوە؟

---

[1] "مام برایمی حاجی ئەڵڵا" ناسناوی (فەهمی)یە و برای مام "ئەحمەدی ئیلاهی"یە کە وەزیری ئابووری کۆماری کوردستان بوو. ئەو بنەماڵەیە بە ماڵە "حاجی ئەڵڵا" ناوبانگیان هەبوو.

— بەڵێ دڵنیام و هەموو کەسیش ئەوە دەزانن.
ئەفسەری عێراقی گوتی ڕۆژ نییە لەلایەن ئێرانەوە مخابەرە نەکرێت کە داوای «حەمەدی مەولوودە چرچی» دەکەن.

— قوربان من تەسکەرەم هەیە. بابم نێوی «چرچی» بە سەرەوە نییە. تەواوی ڕانیە و پشدەر ئەوەی دەزانن. ئێوە دەتوانن تەماشای تەسکەرەکەم بکەن جا بۆتان دەردەکەوێت.

— کوانێ تەسکەرەکەت؟

— ونم کردووە. نێوم لە دایرەی نفوس ماوە، بگەڕێن و بیدۆزنەوە ئەودەم دەزانن کە بابم نێوی «مەولوودە چرچ» نییە. من نێوم «حەمەد»ە و بابم نێوی «مەولوود»ە و ئەو «چرچ»ـەشم ئەوە لێرە بیست.

زۆری قسە دەگەڵ کردم و پاشان دەستووری دا بە سابڵاغییەکان و بە ئەفسەرە عێراقییەکانی کە دەگەڵمان بوون، لە چادرێکیان کردین و پۆلیسیان لەسەر داناین. ئەفسەرەکان گوتیان کە درۆیان دەگەڵ کردوین و فریویان داین، تەنانەت محەممەد مەحموود گوتی:

— تازە ئێمە دەرناچین.

## گرتووخانەکانی عێراق

بەیانی زوو ڕاستیان کردینەوە. بە چەند ڕۆژان چووینە «دیانان» لەوێ لە دەشتێ، سیمیان ڕائەنگاوتبوو. دەنێو سیمەکەیان کردین. هەوەڵ کەڕەت ئێمە و ئەفسەرەکان چووین دەنێو سیمەکەیەوە، پاشان بارزانییەکان دەستەدەستە بە ژن و پیاوەوە دەنێو سیمەکەیان کردن. ئەو شەوە دە نێو سیمەکاندا بووین و بۆ بەیانی بردیانین بۆ «هەولێر»ـێ. لە ڕێگایە محەممەد مەحموود گوتی:

— لە هەولێرێ لێکمان هەڵدەبڕن. هانێ، ئەو ١٠ دینارەی بگرە با پێتبێت.

— تۆ ئەو پارە زۆرەت لەکوێ بوو؟ من نامهەوێ. ئەدی بۆخۆت؟

— من لە ڕێگایە ئەفسەری دۆستم هەبوو و دەمانچەکەیان بۆ فرۆشتم و تۆ خەمی من مەخۆ. تۆ پارەت پێویست دەبێ.

کە گەیێشتینە هەولێرێ منیان هێنا خوارەوە ئیتر زانیمان کە لێکمان هەڵدەبڕن. دەگەڵ کوڕەکان دەستەملان بووین و بە ماچکردن ماڵئاواییەکی تاڵمان لەیەکتر کرد و ئەوانیان بردە «کەرکوک»ـێ و لەوێش محەممەد مەحموود و عێراقییەکانیان برد بۆ «بەغدا»ـیە. لە هەولێر منیان بردە گرتووخانە و لە ژوورێکیان کردم. تەماشام کرد یەکێک لە کوونی دەرکە ڕا هەرا دەکا:

— حەمەد ئاغا، حەمەد ئاغا!

منیش ئەوە نازانم کە هەرا لە من دەکات، خۆ من ئاغا نەبووم لەکوێ ڕا بزانم کە دەگەڵ منێتی؟

خۆ لێبڕینەوەشی نەبوو، هەر دەتگوت نێوم لێدەنی. تا کابرایەک گوتی:

— کاکە ئەوە دەگەڵ تۆیانە.


محەممەد تۆفیق وردی

کە لێی ورد بوومەوە چاو لێدەکەم ئەوە «فارس»ـە. ئەو فارسە خەڵکی لای هەولێرێ بوو. کاتی خۆی کە لە جەبهەی سەردەشتێ بووم، فارس دەگەڵ بارزانییەکان بوو. پاش ماوەیەک کۆڵێکی تفەنگ ڕفاندبوو و هەڵاتبوو و چووبۆوە بۆ عێراقێ. ئێستا ئەوە لە گرتووخانە یەکترمان ناسیوەتەوە. ئەوجار فارس چوو بۆ لای کابرای «چاووش» و ڕەجای لێکرد و منی بردە هۆدەکەی خۆی، جا دانیشتین کای کۆنمان بەبا کرد.

هێندە لە مانەوەم لەو گرتووخانەیە پێنەچوو کە دەستەدەستە بارزانییەکان و باقی عێراقییەکانیان هێنان بۆ گرتووخانە. تەنانەت «محەممەد وردی»[1]شیان هێنا. لەوێ چەند نەفەر «دزەیی» گیرابوون کە زۆریان حووڕمەت گرتم و زۆریان سپاس دەکەم و هیچکات لەیادم ناچێت. سەیرم دەهات کە خۆم نەمدەزانی ناوبانگم پەڕیوەی ئەودیو بووە و زۆرکەس دەیزانی کە پێشمەرگەی دیموکڕات بووم و تەنانەت باسی شەڕەکانی منیان هەموو بیستبوو هەر بۆیەش زۆریان ڕێز دەگرتم بەتایبەت ئەو دزەییانە ساعەت دەگەڵ ساعەتی، دەگەڵم باشتر بوون. تەنانەت ئەوڕۆژەی کە لەو گرتووخانەیە بەڕێیان کردم بۆ گرتووخانەی کۆیە، ئەو دزەییانە چەند دیناریان پارە دامێ کە هیوادارم لە ژیانیاندا کاریان ڕاست بێت و بەردی سارد و گەرم نەیەتە بەر پێیان.

بەیانییەکی من و محەممەد وردی‌یان قۆڵبەست کرد و بردیانین بۆ کۆیە. من لە قسەکانمدا گوتومە کە خەڵکی ڕانییەم و محەممەد وردیش گوتویە کە خەڵکی کۆیە. کە لە کۆیە نیزیک دەبووینەوە، لە قەراغ شاری، خەڵک هاتبوون بەپیر محەممەد وردییەوە و منیش قۆڵم دەگەڵ قۆڵی ئەو بە هاوبەشی بەسترابوو. گەر ئەو بۆ هەر لایەک سووڕا با، منیش بەناچار دەبوو بۆ لای ئەو سووڕابام یان پێچەوانەکەی. یانی دوو مرۆڤ بووین و بەیەکەوە نووسابووین. جا خزم و ئاشناکانی

---

[1] "کورتەیەک لەسەر ژیانی نەمر محەممەد تۆفیق وردی لە لاپەڕەی ٤٤٧ی ئەم کتێبەدا بخوێننەوە.

که محەممەدیان دیت، هەومەنیان[1] هێنا تا ماچی بکەن و بەخێرهاتنی بکەنەوە. لەو بەینەشدا چەند ماچیان لە محەممەد وردی کردبێت، ئەوەندەشیان ئەمن ماچ کرد! نازانم ئەو هەموو خەڵکە لە کوێ پەیدا بوون! ئاخر هەر خەڵک بوو لە ژێڵلا دەهاتن بۆ لای محەممەدی!

بەهەر جۆرێک بێت بردیانین بۆ گرتووخانەی کۆیە. لەوێ دوو کەس هاتن و گوتیان کە ئێمە محامین. گەر مەحکەمە کرای، تۆ ناوی ئێمە بڵێ و کارت بە هیچ نەبێ. وەردی ئێوەکانی بۆ نووسیم و دایە دەستم. چەند ڕۆژ لەوێ بووم چ باس نەبوو.

## بەرەو گرتووخانەی ڕانیە

ڕۆژێکیان سێ پۆلیس بە سواری ئێستر هاتن و زنجیرێکی درێژیان هێنا دەدەستیان کردم و سەری زنجیرەکەش بە دەست پۆلیسێکیان بوو و ڕایانکێشام بە دوای خۆیان دا. چۆن لۆتی مەیمونی ڕادەکێشت بە دووی خۆی دا، منیش خۆم ئاوا هاتە پێش چاو. بەراستی هەستێکی ناخۆشم هەبوو، پەککوو کە زگم بەخۆم دەسووتا، چ بکەم کە بەو کەچەسەوادەمەوە ناتوانم هەستی خۆم لەو ڕۆژە بنووسم. بەو حاڵەوە کە لە ڕێگایە دەیانبردم، چەند کەسێک کە نەمدەناسین و ئەوانیش منیان نەدەناسی، بەڵام دیار بوو زۆر ئینسانن و بەزەییان بە حاڵی مندا هاتبوو، هاتنە سەر ڕێگایە و خواییشیان لە پۆلیسەکان کرد کە زنجیرەکەم لەدەستی دەرهێنن. پۆلیسەکان گوتیان با لە شار وەدەرکەوین جا ئەوکات وا دەکەین. کە لە شار چووینە دەرێ، ئینجا زنجیرەکەیان لە قۆڵم دەرهێنا.

بۆ لای ئێوارێ گەیێشتینە «ڕانیە» و یەکسەر لە گرتووخانەی ئەو شارەیان کردم. لەوێ ناردیان لە چایخانەیەکی ئەو شارە ڕا بۆ گیراوەکان چا هات. پێم سەیر بوو کە چا بۆ منیش هاتبوو. پاشی خواردنەوەی چایەکە هەموو گیراوەکان دەریانهێنا و پارەی چایەکەیان دانا، منیش پارەی خۆم دانا، بەڵام کوڕیکی منداڵکار پارەکەی دامەوە و گوتی پارەی تۆ گەیوە. منیش نەمپرسی کێ داویە؟ شەو بردیانم بۆ پرسیارلێکردن. کابرای مەرکەز، مەعمورێکی تووڕە و تەوسنی تورکمان بوو. لێیپرسیم:

– کوێندەری؟
– عێراقیم.
– خەڵکی کام شاری؟
– ڕانیەییم.
– بۆ چووبووی بۆ ئێرانێ؟
– چەند لەوە پێش لێرە گرانی بوو، چووم بۆ ئێرانێ تا بەشکوو بژێوی ژیان پەیدا بکەم.

---

[1] ئەم وشەیە لە "هەو" ڕا دێت. "هەو" بە مانای شاڵاو، پەلامار، هێرش.

ئیتر زۆری لەو قسانەی لێپرسیم و منیش جوابم دەدایەوە و چ کێشەم نەبوو دەگەڵی. لەپڕ پرسی:

— لە «دیموکڕات» چکارە بووی؟

— چۆن! دە «حیزب»ـدا بووم!

کە وام گوت، دوو ئەفسەری گەنج کە لەوێ دانیشتبوون، هەردووکیان لیویان لێقرماندم و بە چاو تێانگەیاندم کە نەدەبوو ئەو قسەیەی بکەم. منیش زانیم کە دۆڕاندم. ئیتر نەمدەزانی چ بکەم؟! ئەوجار پرسی:

— پێم بڵێ بزانم، حیزب چییە؟

— بەگم، چۆن نازانی حیزب چییە؟ حیزب حەساسە.

— حەساس چییە؟

— قوربان، ئیوە کەسێک کە ئاگای لە دوکان و بازاڕ بێت و قەرەوڵ بێت چی پێدەڵێن؟

دوو ئەفسەرە گەنجەکە لە تریقەی پێکەنینیان دا و لە خۆ ببوونەوە بە پێکەنینێ. دیسان درێژەی بە پرسیاران دا و گوتی:

— حەرەس بووی؟

— بەڵێ بەڵێ، حەرەس بووم حەرەس. چونکە لەمێژە چووم‌ە ئێرانێ زۆر شتم لەبیر چۆتەوە.

ئەوجار مەعموورە تورکمانییەکە لە حەیفان دەستی کرد بە پێکەنین و لەبنەخۆیەوە بە تورکی گوتی: «محەممەد پێغەمبەر، قوربان ئۆلاییم، نە جوور ئوممەتی وار!» [ئەو ڕەستەیە یانی: قوربانی حەزرەتی محەممەدی پێغەمبەر بم کە چ جۆرە ئوممەتێکی هەیە!] ئینجا دەستی کردەوە بە پرسیاران:

— بۆ هاتوویەوە بۆ عێراقێ؟

— قوربان چەند تفەنگم هێنابوو بیانفرۆشم کە ئەوانیشتان لینەستاندم. هەرچی ئەو ماوەیە پەیدام کردبوو دابووم بەو تفەنگانە. سەت بریا تفەنگەکانم دە ئاوی هاویشتبان و نەهاتبامەوە بۆ عێراقێ، ئاخر مستەپووڵێکم پێدابوون و خێرم لێنەدیت.

ئیتر وام خۆ لێ نەفام کرد، لێم ماندوو بوو و فەرمانی دا بمبەنەوە بۆ گرتووخانەی. جێی خۆیەتی لێرە زۆر سپاسی ئەو دوو ئەفسەرە گەنجە بکەم، گەر ئەوان نەبوونایە هەتا بنپیلان پێوە ببووم و تێدادەچووم و دەیاندامەوە بە ئێرانێ. ئەوان لێویان قرماند و منیان حاڵی کرد.

هەروەک باسم کرد، کوڕیکی منداڵکارە هەموو ڕۆژێک لە دەرەوەی گرووخانەکەوە چای دێنێت بۆ گرتووەکان. هەموو جارێک پارەی بۆ دەردەهێنم، بەڵام وەری ناگرێ و دەڵێ پارەی تۆ گەیشتووە. ڕۆژێک کە لەسەر نانخواردن بووین چایان بۆ هێنایـن، بەڵام کوڕە منداڵکارەکە نەبوو، ئەوجارە کوڕێک بوو لە ئەو کەمێک بەتەمەنتر بوو. وا دیار بوو کە ئەو خاوەنی چایخانەکەیە. کاتێک کەشەفە چایەکەی دانا، پێمگوت:

— برام، من چەند ڕۆژێک دەبێ لەو گرتووخانەیەم و شاگردەکەی تۆ هەموو ڕۆژێک چا و سیغارم بۆ دێنێ و پارەی دەدەمێ و لێم وەرناگرێ و دەڵێ پارەی تۆ گەیوە. ئاخر ئەوە چۆن دەبێ و من ئاوا بۆم قەبوڵ ناکرێ.

— ئەوە برامە، بە بەردەست گرتوومە و یارمەتیم دەدات، تا تۆ لێرە بی، نەک سیغار و چا، بگرە هەرچییەک کە پێویستت بێت شەرم مەکە و بڵێ با بۆتانی ئامادە بکەم.

زۆر بەپەلە ئەو قسەیەی کرد و ڕۆیی. پاشان لە گرتووەکانی دیم پرسیار کرد کە ئەوە کێیە گوتیان کە ئەوە نێوی «محەممەدە» و کوڕە منداڵکارەکەش برایەتی. لەو گرتووخانەیەی ڕانیە، ڕۆژانە زۆر کەس دێنە لام و من نایانناسم. زۆریان حورمەتی من لەبەرە و هیچکات لە یادیان ناکەم. هەوڵ دەدەم لەو ماوە کەمەی‌دا، لانیکەم ناوەکانیان بپرسم و بیانزانم. ئەو ناوانەی لەیادم ماون ئەوانە بوون «تۆفیقی مەلا سەدیقی»،[1] «وەستا بێهجەت»، «وەستا نەسروڵڵا». بەداخەوە ئەو ئینسانە باشانە ئەوەندە زۆر بوون کە پێم خۆش بوو ناوەکانیانم لێرە نووسیبا، بەڵام ناوەکانم لەبیر چۆتەوە.

هەر زوو بە تۆفیقی مەلا سەدیقیم گوتبوو کە من فڵان ساڵی تەسکەرەی عێراقیم وەرگرتووە لە «ڕانیە»، کارێکی وا بکەن نێوم بیننەوە لە دایرەی نفوس دەنا تووشی گۆنگەڵی دەبم. ئەویش دەیگوت کە ئەوە کارێکی هاسانە و چ نییە، کارێکی وا دەکەین کە هەرچی زووە لێرە نەجاتت بێت. هەموو ڕۆژێک وەخت و بێوەخت دەمبەن بۆ پرسیارلێکردنم. منیش هەر دەڵێم خەڵکی ڕانیەم. بەداخەوە لە ئیدارەی نفووسیش نێوەکەم نادۆزنەوە، بۆیە شک و گومانیان لەسەرم لاناچێت. ئەوەی دڵخۆشکەر بوو بۆ من ئەوە بوو کە شایەدم زۆر بوون. ئەوەی قەتم نەدیوە و نەمناسیوە، ئەمرۆ وەک پیاوان وەباڵم بۆ لە ئەستۆ دەدەن و دەڵێن ئەوەی دەناسین و ڕانیەییە. منیش تەنیا دڵخۆشیم ئەو شایەدانە بوون و مەعمورەکانیش لەبەر ئەو شایەدانە نەیاندەتوانی بڕیارم لەسەر بدەن. ئیتر چۆن چاکەی ئەو مرۆڤانە دەتوانم لەیاد بکەم. ئەوەی ئەوانە دەگەڵ منیان کرد، نەبووە و نەبینراوە.

هەر لەو گرتووخانەیە کوڕەئاغایەکی گەنج، نازانم لەسەر چی گیرابوو، زۆری عەزیەت دەکردم. بەردەوام گاڵتەم پێدەکات. کە بانگم دەکات، بە گەپ یان دەڵێ «قازی محەممەد» یان دەڵێ «پێشەوا»! منیش زۆری پێ تێکدەچم. چەند نەفەر لەو گرتووخانەیە زۆری سەرزەنیشت دەکەن و خۆشم زۆری قسە دەگەڵ دەکەم و بە نەرمی تێیدەگەیێنم کە کاکی برا دەست هەڵگرە، بەڵام هیچ فایدەی نییە، ئەوەی دەیکا، هەر دەیکا.

شەوێکیان هەموومان نووستبووین. لەناکاو پۆلیسەکان لێمان وەژوور کەوتن و لە غورڕابی خەوێ ڕاستیان کردینەوە و بژاردیانین. پاش ئەوەیکە پۆلیسەکان لە ژوورەکەمان چوونە دەرێ، کوڕەئاغا

---

[1] لە لاپەڕەی ٤٥٥ دا زیاتر لەسەر خوالێخۆشبوو تۆفیقی مەلا سەدیقی بخوێنەوە.

بە گەپ و بە پێکەنینێکی سووک و بە دەنگێکی بەرز وادەکات:

— پێشەوا؟ ئەرێ قازی محەممەد؟ باش نووستبووی؟ هیچ خەونی خۆشت نەدی؟

ئینجا لە قاقای پێکەنینێی دا! ئەدی هاتە سەر ئێسکانم و گوتم تا کەنگێ لێی قەبوڵ بکەم؟ یانی وام لێهاتووە کە لەبەر ئەو هەتیوە دەنگم دەرنەیەت؟ گورجێکی لێی ڕاست بوومەوە و سواری بووم. جا وەرە لێیدە. خۆ دەرەقەتیشم نەدەهات و زۆری بە من نەدەشکا. تا دەستی هەڵدێنایەوە چوار مستم تێدەسرەواند. هاتوهاواری ئەو گرتووخانەیەی هەڵگرتبوو هێندەی بڵێ ئەی هاوار بگەنێ، ئەی هاوار کوشتمی. ئەو شەوە زۆر باشم لێدا و گیراوەکانیش دەستیان وەبەر نەدەهێنام و پێیانخۆش بوو کە لێیدەدەم، چونکە زۆری بێتام کردبوو. تا پۆلیسەکان بە فریای هاتن و دەستیان گرتم و لە چنگیان درهێنام. ئینجا هەردووکمانیان برد بۆ پرسیارلێکردن کە لەسەر چی شەڕمان بووە و ئەو شتانە. پاشان هێنایانینەوە بۆ ژوورەکەی خۆمان. ئەوجار زیندانییەکان بەسەری ڕۆییشتن و پێیان دەگوت کە حەمەد غەریبە و لێی قەوماوە و چ کارت پێی داوە و لەو قسانە. بۆ بەیانی چایچییەکە بەتاڵووکە هات و گوتی:

— ئەوە چی بووە؟ پۆلیسەکان هاتوونەتە چایخانە و باسیان کردووە کە شەڕتان کردووە. حاڵیم کەن بزانم چ ڕووی داوە؟

چایچییەکەشیان تێگەیاند و ئەویش زۆری ئامۆژگاری کوڕەئاغا کرد و ڕۆییشت. ئینجا کەسوکارەکەی هاتن، خوداهەڵناگرێ ئەوانیش زۆریان لۆمە کرد و لەولاشەوە تۆفیق و چەند کەسێکی تر هاتن و ئەوانیش باش بەسەری ڕۆییشتن. خودا بتانحەسێنێتەوە، کوڕەئاغا عاقڵ بوو و دەستی لێهەڵگرتم. چەند ڕۆژ بەسەر چوو. ڕۆژێک تەماشام کرد کوڕێکی گەنج بڕێکی خواردەمەنی پێبوو و هاتە بەر دەرکی حەپسخانەکەمان و دەگەڵ پۆلیسێکی قسەی دەکرد و لە منی دەپرسی. پۆلیسەکە هات و منی هێنا دەرێ. وادیار بوو پۆلیسەکە دۆستی ئەو کوڕە بوو. ئێمە لەسەر سەکۆیەکی دانیشتین و پۆلیسەکەش بەجێی هێشتین و ڕۆییشت. هەرچی لە سەر و سەکوتی ئەو کوڕە دەڕوانم ، نایناسم! وە قسە هات و گوتی:

— من ناوم «زاهیر»[1]ە و خەیاتم، دەزانی بۆ هاتوومە لات؟

— ناوەڵڵا.

— وەکی لێیحاڵیین تۆ لێرە بەرەڵڵا ناکرێیت چونکە، لە دایرەی نفوس زۆر گەڕاون تەسکەرەی تۆ نابیننەوە. ئێستا تۆ دەبێ بڵێی من خەڵکی «قەڵادزێ»م و خەڵکی ئەو دێیەم، (ئێوی دێیەکەی پێگوتم،

---

[1] "زاهیری ڕەسام" کورتە ژیاننامەیەک لەو مرۆڤە کوردپەروەرەم ئامادە کردووە تا هەم ئێوە خوێنەری هێژا زیاتر بەرچاوڕوونیتان هەبێت و هەمیش یادێک بێت لە کاک زاهیر و هەروەها یادێک بێت لە هەموو ئەو مرۆڤە کوردپەروەرانە. بڕواننە لاپەڕەی ٤٤٨.

بەڵام لەیادم نەماوە) تۆ کارت نەبێ و ئێمە خەڵاست دەکەین. گەر گوتیشیان لەوێ کێ دەناسی؟ ئەو ناوانە بڵێ.

ئێوەکانیشی پێگوتم بەداخەوە سەوادم نەبوو بیانووسم، بۆیە هەموویم لەبیرچوونەوە. پاشی قسە و باسێکی زۆر کە بەیەکەوە کردمان ئەو ڕۆییشت و پۆلیسەکەش هات و بردمیەوە بۆ ژوورەکە. بۆ لای ئێوارێ دیسان بردیانمەوە بۆ ژووری پرسیاران. تەماشام کرد کابرا تورکمانەکە نییە و کەسێکی کوردە کە پرسیارانم لێدەکا. زمانی زۆر وەک «کۆیی»یان دەچێت. پیاوێکی لەسەرخۆ و هێمنە. زۆر بە پشوودرێژی پرسیارانم لێدەکات. وەک کابرای تورکمان نەبوو کە بە سەرمدا بقیژێنێت. لەپێشدا گوتی:

— خەڵکی کوێی؟

منیش لەسەر حیسابی قسەی زاهیری گوتم:

— خەڵکی قەڵادزێم.

کە وامگوت کابرا واقێکی بردەوە و زۆر بە سەیری ڕووی تێکردم و گوتی:



— ئەی ئەی!؟ جا چۆن وا دەبێ؟ تۆ پێشتر گوتوتە خەڵکی ڕانیەم و ئێستاش دەڵێی خەڵکی قەڵادزێم؟

هەرکە وایگوت، زمانم تێکەڵ بوو. دەڵێن قسەی درۆ بۆخۆی هاوار دەکات، هەر ڕێک وابوو. هەرچی دەمگوت بۆم ڕاست نەدەبۆوە. هەتەران پەتەرانێکم دەگوت نەبێتەوە. بڕوا بکەن گەر کابرای تورکمان مابا و ئەو قسانەمی بیستبا، شەویلکەی دەشکاندم، بەڵام ئەوە هەرچی من دەمگوت دەینووسی و ئەوەی من نەمدەزانی بۆخۆی دەینووسی. بێنووسینیش زۆری پرسیار لێکردم و پاشان بردیانمەوە کونەڕەشێ. لەوێ بۆ هاواڵەکانم گێڕایەوە کە چۆن گوتومە خەڵکی قەڵادزێم. کوێخایەکی لێبوو ئەویش دەگەڵمان زیندانی بوو، فێری کردم کە، گەر چووم بۆ قەڵادزێ و شاهیدیان لێ تەڵەب کردم، بڵێم کە «سۆفی فەتاح»، «ڕەزای دەلاک» و مامەی ساتق»[مەبەستی سادقە - صادق.] دەناسم. ئەوانە هەمووی پیاوی چاکن.

## گرتووخانەی قەڵادزێ

بۆ بەیانێ سێ پۆلیس قۆڵیان بەستم و سەرێکی زەنجیرە درێژەکەیان دە دەستم کرد و سەرەکەی دی بە دەست پۆلیسێکەوە بوو. ئەوان سوار منیش پیادە، لە دووی خۆیان ڕاکێشام. بۆلای تێواریێ بردیانم بۆ قەڵادزێ. لەوێ لە بەردەرکی قشڵەی، چەند نەفەر ئاغای پشدەری دەگەڵ «مەرکەزمەعموری» ڕاوەستابوون و بە عەرەبی قسەیان دەکرد. پاشان بردیانم دە ژوورێیان کردم. دە ژوورەکەدا چەند کەسی بەندی لێبوو کە منیان دیت، هەموو لێم خڕبوونەوە و باس و خواسیان لێدەپرسیم و حەزیان دەکرد بمناسن.

قەول بوو زاهیر بێت لە قەڵادزێ بمبینێت، بەڵام بەختی من چووبۆوە بۆ کۆیە و لە ماڵ نەبوو. بێئەوەی زاهیر ببینم و دۆخەکە لێکبدەینەوە، شەو دووبارە بردیانم بۆ لای مەرکەزمەعموری بۆ پرسیاران. ئەویش تورکمان بوو، بەڵام پیاوێکی باش بوو. دەستی کرد بە پرسیاران و منیش وەک چۆن دەگەڵ زاهیری قسەمان بڕابۆوە گوتم قەڵادزەییم و لەو دێیە دادەنیشم و فڵانە کەس و فیسارە کەس و «سۆفی فەتاح» و ئاغای دێیەکە دەمناسن. هەرچەند قەت هیچیانم نەدیبوو و نەناسیبوو لە فەتاحی برای ڕەزا زیاتر. ڕۆژ بۆوە و پۆلیسێک دەرکەی کردەوە و هەرای کرد:

— «حەمە مەولوود مستەفا»!

لە تەسکەرەی عێراقییەکەمدا ناوی بابم «مستەفا» بوو[1] و منیش خۆم بەو ناوە ناساندبوو. هاتن و بردیانم بۆ لای کابرای گەورەی مەرکەز. لە ژوورەکەی کە وەژوور کەوتم، دیتم پڕ بوو لە ئاغا و پیاوی کۆک و پۆشتە. منیش ئەوە نازانم ئەو جەماعەتەیان لەبەر من هێناوە. حەیف کە نێوی ئاغاکە و دێیەکەم لەبیر چۆتەوە، بەڵام لە زاهیری بپرسن ئەو دەزانێت. کابرای گەورەی مەرکەز لەکن هەموو ئەو جەماعەتە ڕووی تێکردم و گوتی:

— کابرا، بۆ ڕاستێ ناڵێی؟ تۆ کێی؟ خەڵکی کوێی؟

— تاکەی بڵێم، من «حەمە مەولوود مستەفا»م و خەڵکی پشدەریم و ئی فڵانە دێم؟

— زۆر باشە، دەکرێ پێم بڵێی کێ تۆ دەناسێ؟

نێوی هەموو ئەو کەسانەم هەڵدا کە فێریان کردبووم. ئەوە ناشزانم کە ئەو جەماعەتەی لەوێن هەمووی ئەو کەسانەن کە من نێوم بردوون.

— گەر ئەو کەسانە ببینی دەیانناسییەوە؟

---

[1] کاپیتان لێرە دەڵێ ناوی باوکم مستەفا بوو، بەڵام دەبێ هەڵەیەک ڕوی دابێ. ئەو لە شوێنێک پێشتر دەڵێ کە ناوم حەمەیە و ناوی باوکم مەولودە و ئەو "چرچی"ـیەم بە دواوە نییە. کەواتە دەبێ ناوی بابی باوکی واتە باپیری لە تەسکەرەی عێراق، مستەفا بووبێ.

— چۆن نایانناسمەوە؟ چاوم ببەستن دەیانناسمەوە.

— لەوانە کە لێرە دانیشتوون کێهەیان «سۆفی فەتاح»ە؟

ئای هاوار چیم لێقەوماوە! جا ئێستا لەو جەماعەتە کامەیان بڵێم؟ جا ئەمن چووزانم ئەوانە لەبەر من هاتوون، دەنا قسەی ئاوا گەورەم نەدەکردن. لەو فکرانەدا بووم کە یەک لە ئاغاکان بە چاو ئیشارەی کردم و بە چاوترووکاندن حاڵی کردم کە ئەو کەسەی لەپەنای ئەو دانیشتووە، سۆفی فەتاحە. سەرباقی ئەوەش وەها پەشۆکابووم کە لێی حاڵی نەدەبووم و نەمدەزانی دەڵێ چی! لە وەڵامی مەرکەزمەعموریدا گوتم:

— قوربان ئەوانە هیچیان هەو نین.

تێکڕا دەستیان کرد بە پێکەنین. ژوورەکەیان گەرمەی پێکەنینێ کرد. هەمان ئاغا کە بە چاو ئیشارەتی دام، بە پێکەنینێکی زیرەکانەوە وەدەنگ هات و گوتی:

— ئەوەیە سۆفی فەتاح ماڵخراپ. خۆ ئەوندەشیان چەرمەسەری داوی خۆشت ناناسی.

دیسان جەماعەت لە قاقایان دا و هەوڵیان دەدا بەو شێوەیە هەڵەکەم بۆ ڕاست بکەنەوە. هەمان ئاغا نەیهێشت کابرای مەرکەزمەعمور وەدەنگ بێ و پرسیاری زیاترم لێبکات، هەر زوو جڵەوی قسانی گرتەوە دەست و گوتی:

— ماڵوێران، ئاغای دێیەکەتم.

ئەوجار یەکەیەکە خەڵکەکەی پێ نیشاندام و پێیناساندم. خۆشخۆش درێژەی بە قسان دەدایەوە و نۆرەی کەسی نەدەدا تا نەکا کەس قسەیەکی نەکات کە بۆمان ڕاست نەکرێتەوە. ئەوجار ڕووی دە کابرای گەورە کرد و گوتی:

— بەگم، بەو سوێند و بەو قورئانەی ئەو کابرا داماوە وەکی نۆکەری ئێمە وابوو. قەبری باب و باپیری ئێستاش لە دێیەکەی منە. بێنە قورئانی لەسەری هەڵدەپەڕم. ئەو ماڵوێرانەش ئەوکات کە من ئێستا ژنم نەهێنابوو، گرانی بوو و خەڵك لە برسان دەمردن، هەر وەمانزانیوە مردووە. ئێستا کە لێرە بە زیندوویی دەیبینم پێی گەشاومەتەوە.

بەو قسانەی کابرای ئاغا، سوکناییەکم بە دڵدا هات و دڵەکوتەم نەما و زەریف هاتمەوە سەرخۆ. جەماعەکەتە وەها دەستیان کرد بە قسەکردن و ورتەورت دەگەڵ کابرای گەورە، کە کەس ئاگای لە من نەما. پاشی کێشمەکێشێکی زۆر، کابرای گەورە لێی پرسیم:

— ئەوکاتەی کە گرانی بوو، بە چ خەتێکدا چووی بۆ ئێرانێ؟

قەدیمی دەڵێن: (گەر زمان لێگەڕی سەر سڵامەتە)! ڕێک وایە. نازانم بۆ هاتە سەر زارم و گوتم:

— قوربان بە خەتی ڕواندزێدا چووم بۆ ئێرانێ.

بڕێکی دیشی پرسیار لێکردم و پاشان دوو پۆلیسی بانگ کرد و دەستووری دا دەکونەکەیان کردمەوە. لەوێ هەموو باسەکەم بۆ بەندییەکان باس کرد و هەموویان بەدڵ بوو تا گەیمە ئەو

ئاستەی کە گوتومە بە ڕواندزێدا چووم بۆ ئێرانێ، ئیتر هەموویان بە سەرمدا هاتن:

— نەدەبوو باسی ڕواندزم کردبایە، ئێستا دەتنێرنەوە بۆ ڕواندز و لەوێ مەحکەمە دەکرێی. گەر گوتبات لە خەتی پەشدەرێ ئاودیو بوومە، ئەوکات هەر لێرە مەحکەمە دەکرای و کارت هاسان دەبوو.

ئەوە زاهیریش هاتۆتەوە و دوو ڕۆژێکە لە ماڵێ را خواردنم بۆ دەهێنێتە ناو گرتووخانەکە. ئەویش هەر ڕۆژی یەکەم کە بۆم باسی قسەکانم کرد، گوتی کە کارێکی خەراپت کردووە و نەدەبا باسی ڕواندزیت کردبایە. هەر وەک باسم کرد، قسەکە بە زارمدا هات و نەگەڕایەوە. گەر ئەو قسەشم گۆڕیبایە ئیتر بەیەکجاری لێم دەکەوتنە گومان و دڕدۆنگی.

## بەرەو گرتووخانەی ڕانیە و هەولێر

ئەو ڕۆژەم لێ ئاوا بوو و بەیانی هات. چاوم لێکرد سێ پۆلیس بە زنجیرە درێژەکەیانەوە لێم پەیدا بوون. بە سەرێکی زنجیرەکە قۆڵیان گۆڵە کردم و سەرەکەی تریشیان دا بە دەست یەک لە پۆلیسەکان. دیسان وەک مەیمونی لەدوای خۆیان ڕایانکێشام. بە ناو بازاڕی قەڵادزێدا کە دەیانبردم، چەند نەفەر قەڵادزەیی کە نەمدەناسین، بەڵام دیار بوو ئەوان منیان دەناسی، هاتنە پێشمان و داوایان لە پۆلیسەکان کرد کە زنجیرەکە لە قۆڵم بکەنەوە، لە وەڵامدا پۆلیسەکان گوتیان با لە شار وەدەر کەوین جا ئەوجار. «زاهیر»ـی دڵسۆز و خەمخۆر بیستبووی کە ڕامدەگوێزن بۆیە، دەگەڵ خۆی نان و سیغار و هەندێک کەلوپەلی پێویستی بۆ هێنابووم. تەنانەت کەمێکیشی پارە دا بە پۆلیسەکان تا دەگەڵم باش بن. لەولاشەوە «مامەی سادقی»ـش هاتبوو و بە پەرۆشەوە دڵخۆشی دەدامەوە و بەو حاڵە کەوتینە ڕێ. ماوەیەک کە بەڕێوە بووین گەیێشتینە چۆمی «ژاراوێ»[1]. لەوێ پۆلیسەکان گوتیان گەر پێتخۆش بێت، دەتوانی لەو چۆمەدا مەلە بکەی. کورد دەڵێ: کوێر چیت دەوێ، دوو چاوی ساغ!

قۆڵیان کردمەوە و خۆم دەچۆمێ هاویشت و وەک گوڵی خۆم شووت و هەرچی چڵکی کۆن بوو لەخۆمم کردەوە. ئەوانیش ئێسترەکانیان بەڕەڵا کرد تا تێریان خوارد. پاشی حەسانەوەیەکی باش ئەوان سوار بوون منیش بەبێ زنجیر وەپێشیان کەوتم هەتا ناو ڕانیە. لەوێ بردیانم دە ژوورێکیان کردم. هێندەی پێنەچوو، تەماشام کرد «تۆفیقی مەلا سەدیقی» دەگەڵ «وەستا بێهجەت»ـی هاتنە لام. منیش هەموو نەقڵ و باسی خۆمم بۆ گێڕانەوە. زۆریان دڵخۆشی دامەوە

---

[1] ژاراوێ، ژاراوا، ژاراوە ناوی گوندێکە کە لە ٨ کیلۆمێتری باشووری قەڵادزێ بەرەو ڕانیەیە هەڵکەوتووە. ئێستا شارەدێیە. مەبەستی کاپیتان چۆمەکەی ئەو گوندەیە.

و گوتیان کە ئێمە وچان نادەین تا لەو وەزعەت خەڵاسی دەکەین.

شەوێ لەوێ نووستم و بۆ بەیانی دوو پۆلیسم لێ وەژوور کەوتن و دیسان زنجیرە درێژەیان لە دەستم گۆڵە کرد و وەک مەیمونی وەپێش خۆیان دام. لە قەراغ شاری تۆفیقی مەلای بە خۆی و دوو نەفەری دی پەیدا بوون. ڕەجای لە پۆلیسەکان کرد تا چەند دەقەیەک ڕاوەستین. گوتی ناردوومە تا پیاوێک و ئێسترێک بێن بۆ حەمەدی با سواری بێت و بە پێیان ئەو ڕێگایە نەبڕێت. سووکێکی پێچوو کە کابرایەکی سەید بە خۆی و دوو ئێسترانەوە وەدیار کەوت. منی سواری یەکیان کرد و بۆخۆشی سواری ئەوەی دی بوو. خواحافیزیم لێکردن و کەوتینە ڕێگا. پێش ئەوەی وەڕێ بکەوین، مەلا سەدیق و وەستا بێهجەت داوایان لە پۆلیسەکان کرد تا لە ڕێگایە ئەو زنجیرانەم لە دەستی دەربهێنن، بەڵام لە بەختی ڕەشم مەرکەزمەعمورێک بە چەند پۆلیسەوە لێمان پەیدا بوون. بۆ کوێ دەچوون؟ نازانم! ئەوە نەبێ کە تا «سەرخمەی»[1] دەگەڵمان هاتن و لەوێ لایان دا. پاشی ئەوەی کە برێک ڕۆییشتین پۆلیسەکان ئەرخەیان بوون کە مەرکەزمەعمور نایانبینێت، هاتن و زنجیرەکەیان لە جومگەی کردمەوە. تا لای تاوپەڕانێ گەییشتینە کۆیە. لە قەراغ شاری زنجیرەکەیان لێ قاییم کردمەوە و سەرێکی بە پۆلیسێک و سەرەکەی تری لە دەستەکانی من دا، ئەوان سوار و منیش پیادە، بەو حاڵە بە ناو شاردا کە دەڕۆییشتین تا ببەن بۆ سەرایە، خەڵک هەمووی بەدەرەوە بوو. زۆریان پەرۆشم و زگیان پێم دەسووتێت. کە گەینە سەرایە لەوێ یەکڕاست دە ژوورێیان کردم تا بەیانی.

بەیانی لەخەویان ڕاست کردمەوە و دە ماشێنێکیان هاویشتم بەرەو هەولێر. لەوێش دەژوورێکیان کردم کە بەندییەکانی زۆر بەڕێز بوون و زۆریان حووڕمەت گرتم. شەو لە هەولێر نووستم و بیانی ئەوندەم زانی هاتن کەلەپچەیان بە هاوبەشی لەدەستی من و «ئەنوەر دڵسۆز» کرد تا ببانبەن بۆ گاراجێ. ئاواتەخوازم ئەوەی من ئەو ڕۆژێ دیتم، کەس نەیبینێت. مەرگی خۆم بە ئاوات خواست. دەزانن بۆ؟ ئاخر من کورتە باڵا و ئەنوەر دڵسۆزیش باڵابەرز. دەستیشمان بەیەکەوە کەلەپچە کراوە. ئەو خزم و کەسێکی زۆری هاتبوون بۆ گاراجێ تاماڵئاوایی لێبکەن و بەڕێی بکەن. بوو بە ماچوموچ کردن و دەست لە مل کردنێک نەبێتەوە! نە یەک و نە دوو و نە دە! ئەنوەریش کە ئەوەی دیت، گەرم داهات چۆن! هەرکەسێکی دیبا، دەستی دەملی دەکرد. ئاگای لە من هەر نەما! کاتێک دەستی دە ملی دەکردن، دەستی منیشی دەگەڵ دەستی خۆی هەڵدەهێنایەوە! ئیتر باسکم هێندەی نەمابوو لێبێتەوە. ئەو دەستەم هەر بە حەواوە بوو. هەرچەند جارێک دەستی

---

[1] "سەرخمە" ناوی گوندێکی گەورە بووە سەر بە ڕانیە کە بنکەیەکی گەورەی پۆلیسی لێبووە. کاتێک کە بەنداوی "دوکان" دروست دەکرێت، ئەو گوندە بە تەواوی دەکەوێتە ژێر ئاو، بە چەشنێک کە ئەم گوندە ئێستا هیچ ئاسەوارێکی لێ نەماوەتەوە.

هەڵدەهێنایەوە دەستی منیشی وا هەڵدەهێنایەوە کە دەیهێنامە سەر پەنجەی لاقانم! سەیر ئەوە بوو کەس ئاگای لە من نەبوو تا وشیاری بکاتەوە و بە ئەنوەری بڵێ کاکە پیلی ئەو داماوەت دەرهێنا، بۆ وا دەکەی؟ ئەو ڕۆژە سەگ بە حاڵم بێت. هەر خۆم دەزانم چی بەسەر هێنام. بەجارێک لایەکی شارەکە کەوتبوو سەرمان. خۆ ئەوە نەبوو یەک‌یەک و دانەبەدانە بێن و دەستی دە ملی کەن، پۆل‌پۆل دەهاتن! منی سەربەقوڕیش لە نێویاندا ئەو پیلەم هێندەی نەماوە لێبێتەوە. هەرچی هاوار دەکەم و دەگوڕێنم کە ئەی هاوار قۆڵم پچڕا، بۆ خاتری خوا ئەنوەر پیلم هاتە دەر، هیچ، هەر گوێشی لیم نەبوو! هەر وەکوو دەگەڵ ئەویشم نەبێ! وا گەرم داهاتبوو کە لەبیری چووبۆوە کەلەپچە لەدەستی من و ئەو دایە.

پاشی ماوەیەکی زۆر پۆلیس هاتن و دە ماشێنیان ناین. خۆ دەستیان لەیەخەمان نەدەکردەوە. جارێ ئەنوەر دایکێکی قەڵەوی هەبوو دەستی هەڵنەدەگرت. دە ماشێنیشدا هەدای نەدەدا. وەک سواڵکەران لەبەر پۆلیسەکان دەپاڕامەوە کە دەرگاکەی داخەن و نەجاتیم بێت لەو حاڵە. «بە هەزار (قیلی سەقیل)[1] ماشێن کەوتە ڕێ و خۆمان گەیاندە گاراجێ و نەجاتیم هات لەچنگ هەولێرییان. لە ماشێنیدا کە سارد ببومەوە، ئەوجار ژانی دەستم ئامانی پێهەڵگرتبووم. ئەوەندی تەکان دابووم، هەموو دەستم داڕووشابوو هیچ، ژانێکی بێئامانیشی تێکەڕابوو کە تەنگی پێهەڵچنیبووم. دیسانیش شووکرانە بژێرم کە زیندووم. تا ئەمن بم، ئەو ڕۆژەم لەبیر ناچێتەوە.

## گرتووخانەی ڕواندز

هەرچۆنیک بێت ئەوڕۆژە چووین بۆ ڕواندز و لەوێش ڕاست دە ژوورێکی گرتوخانەیان کردین کە پڕ بوو لە بارزانییەکانی کە لە سابلاغ بوون و دەگەڵ شێخ ئەحمەد هاتبوونەوە بۆ عێراق. زۆریانم دەناسی و یەک لەوان «فایق برای محەممەد مەحموود» بوو و «سعدی محەممەد علی ئاغا»ش[2] دەگەڵ ڕواندزییەکان لەوێ بوو، کە ئێمەیان دیت، هەموو هاتن و لێمان وەکۆبوون. هەموومان ئەوەندە بە دیداری یەکتر شاد بووینەوە کە ژانی شان و پیلم لە یاد چووبۆوە و دەستم دە ملی هەموویان دەکرد و یەکترمان ماچ دەکرد. لە ماڵە ئەنوەری، ژنێکیان لە ڕواندزی دەژیا و خواردەمەنییەکی زۆری بۆ ئەنوەری دەناردە گرتووخانەکە. هەروەها لە ماڵە ڕواندزییەکانیش ڕا خواردنێکی زۆر دەهات بۆ گیراوە ڕواندزییەکان و هەموو گیراوەکان بەیەکەوە دادەنیشتین و هەر

---

[1] لە موکریان ئەو دەستەواژەیە بەکار دێنن. پێدەچێ کە سەرچاوەکانی عارەبی بێ، بەڵام مانای هەزار بەدبەختی، هەزار ماندووبوون، هەزار فێڵ و گزی دەدات.

[2] دیار نییە چی نووسیوە. یا سعید محمد عەلی ئاغایە یا سەعیدی محمد حەسەن ئاغایە.

خواردنێکی هاتبا بەیەکەوە دەمانخوارد. ئەو چەند ڕۆژەی لە ڕواندز گیرام، هەموو خواردنم لەسەر ئەوان بوو و دەگەڵ ئەوان خواردنم دەخوارد.

کەشی گرتووخانەی ڕواندز زۆر باشتر بوو لەو گرتووخانانەی کە من پێشتر لەوێ بووم. گرتووەکان زۆر یەکگرتووتر بوون و دە خەمی یەکتردا بوون و پشتی یەکتریان دەگرت. گەر کێشەیەک هەبا، هەموو بەیەکەوە چاریان دەکرد. جارێ ڕۆژ و شەو فایەق گۆرانی دەگوت. ئەو زۆر کوڕێکی ڕووخۆش و دڵشاد بوو. زۆرم خۆش دەویست. بە فایەق و بە ئەنوەری تێیانهەڵپێچام کە دەبێ فێری نووسین و خوێندنەوە ببم. وردەوردە حەرفەکانیان بۆ نووسیم و پێیان دەگوتم کە چیبەچییە. ئەوەندەی نەکێشا کە ڕاهاتم و دەمزانی شت بخوێنمەوە. تەماشام کرد زۆر خۆشە و ئیتر سەرم لەسەر هەڵنەگرت. وەک چۆن سۆفی دەچن دە چلەیەوە، منیش ئاوا خەریک بووم و دەستم دایە فێربوون. لەخۆمەوە شتی قۆڕقۆڕم دەنووسی. زۆر باش «گەلاوێژ»م[1] دەخوێندەوە تا ڕۆژێک پۆلیسەکان هاتن و گوتیان لە ئێران ڕا «سەرهەنگ شوکری» دەگەڵ «قوڵی خانی نەغەدە»ی[2] دێنە ڕواندز.

---

١ مەبەستی "گۆڤاری گەلاوێژ"ە. ئەم گۆڤارە کوردی بوو کە لە ساڵانی ١٩٣٩ هەتاکوو ساڵی ١٩٤٩ی زایینی بڵاو دەکرایەوە. بەرپرسانی ئەم گۆڤارە خوالێخۆشبوان "ئیبراهیم ئەحمەد" و" عەلائەدین سەججادی" بوون.

٢ بۆ زانیاری زیاتری لەسەر "قوڵی خانی نەغەدەی"، لاپەڕەی ٤٢٨ی ئەم کتێبە هەڵدەنەوە.

که ئەوەم زانی، عەیبەت دایگرتم و ترسم لێ نیشت. بە کوڕەکانم گوت بێ و نەبێ ئەو سەرهەنگە بۆ من دێتە ڕواندز تا من وەرگرێتەوە و بمباتەوە بۆ ئێران. ئەنوەر و هاواڵەکان زانیان زۆر تێکچووم بۆیە دەستیان کرد بە دڵدانەوەم و جارێک دەیانگوت:

— ئەوە لەبەر تۆ نایەن و ئەوانە ئیشی حکومەتیان هەیە و چ ئیشیان بە تۆیە.

جارێکیش دەیانگوت:

— جا چکارێکیان بەتۆیە؟ ئەوە نییە پیاوی وەک زێرۆبەگ و کێ و کێ هەیە، بۆ دێن بۆ لای تۆ؟ و لەو شتانە!

بەڵام من دەمزانی و بە دڵمدا هاتبوو کە بۆ من دێن. دڵم وەک گونی هەلاجی لێیدەدا. وەک ئەوە وابوو کە پێم بڵێن گۆڕی خۆت هەڵقەنە، ئەوە سەرهەنگت دەگاتە سەر، هەستێکی ئاوام هەبوو کە دڵخۆشیدانەوەی کوڕەکانیش هێوەری نەدەکردمەوە. ئەو شەوە هەر فکرم لەخۆم دەکردەوە و نەمدەزانی چارەنووس بەرەو کوێم هەڵدەدێرێت. هەرچی دەمکرد خەو بەچاوانمدا نەدەهات. بۆ بەیانی کاتێک تاو هەڵات، بیستم کە جەنابی سەرهەنگ و قوڵی خان هاتوون بۆ ڕواندز. ئیتر دڵم وە کوتەکوت کەوت، وەها لێیدەدا وەختە بوو لە سینگم بێتە دەر. دەو عانەشدا، تەماشام کرد «مستەفای ژنبرام»[1] هاتۆتە بەر دەرکی گرتووخانەکەی و داوای من دەکات. کە چوومە لای، پاشی چاک و خۆشییەکی زۆر گوتی:


خوالێخۆشبوو مستەفا ڕەهبەر

— چووم بۆ ڕانییە و لەوێ بەمنیان گوت کە دراوی بە گرتووخانەی ڕواندز، بۆیە بەپەلە هاتوومە ئێرە تا بتبینم. ها ئەوە تەسکەرەکەت. ئەوە «تۆفیقی مەلا سەدیقی» لە ڕانییە دایمێ و گوتی زوو بۆی بەرە!

باوەڕم نەدەکرد! نەمدەزانی لە خۆشییان چ بکەم! ڕووحێکم هاتەوە بەر و بەخۆم گوت جا ئەوجار سەرهەنگ با هەر لە ئەژنۆی خۆی بدات. هەر باسی من بکات ڕێک تەسکەرەی بە دم دادەدەم. دەگەڵ مستەفا وەدەر کەوت پۆلیسەکان دەرکەی ژوورەکەیان کردەوە و گوتیان:

---

[1] مەبەستی خوالێخۆشبوو "مستەفای ڕەهبەر" بووە.

— فەرموو جەناب سەرهەنگ تۆیٚ گەرەکە!

ڕووم دە کورەکان کرد و گوتم:

— ها! نەمگوت سەرهەنگ لەبەر من دێت بۆ ئێرە تا بمگرێت و بمداتەوە بۆ ئێرانێ!

پۆلیس وەپێشخۆیان دام. لە دوورەوە چاوم لێکرد ئەوە سەرهەنگ و قوڵی خان لە ژووری قایم مەقام، لە تەنیشت یەکتر، لەسەر سەکۆیەک هەڵتوتەکاون و بە چاوی مشتەری لێمدەڕوانن و هەڵمدەسەنگێنن. تەنانەت چاو ناترووکێنن و لەبنەوە بە سەبرا دەگەڵ یەکتر دەدوێن. قایم مەقامیش بەرانبەریان لە شوێنی خۆی دانیشتووە. دیارە کە تەسکەرەم وەرگرتووە و تا ڕادەیەکی زۆر ترسم لێ ڕەویوەتەوە، بەڵام پیاو نازانێ لەپشتەوە ئەو حکومەتانە چۆناوچۆن پێکهاتوون، بۆیە مەترسی بردنەوەم بۆ ئێران هەر لەسەرم بوو و دەمزانی کە بمدەنەوە بە ئێرانێ گرتن و کوشتنم یەکە. ئیتر بەخۆم گوت لە مردن واوەترمان نییە و چاوی من کاڵتر نییە لەو هەموو شەهیدانەی لە ڕێی کوردوستان گیانیان دانا. با لێیان بێمنەت بم خۆم داماو نیشان نەدەم. باوەر بکەن وا لە ژوورەکە وەژوور کەوتم وەک سەریان پێوەنەبێ. ڕووم لە قایم مەقام و پشتم دە وان کرد و سەر بڵێند و دەنگ دلێر، قیت چەقیم. قایم مەقام کوردە و خزمی «مەمەدی شێروانی»ـیە و ژنەکەی بارزانییە. ڕووی تێکردم و گوتی:

— تۆ بۆچی ڕاستێ ناڵێی؟ خەڵکی کوێی؟

— بەگم، چەند کەڕەتم گوتووە، عێراقیم و خەڵکی ڕانییەم.

— کوانێ تەسکەرەت؟

— فەرموو.

دەرمهێنا و دامێ. تێر چاوی لێکرد و جوان سەر و ژووری دەکرد. وەرگەڕایەوە و گوتی:

— ئەو تەسکەرەیە ساختەیە.

— گەورەم، گەر ساختەیە بۆ داویانە بە من؟

ڕووی لە قوڵیخانی کرد و پرسی:

— کوێندەرییە؟ باوکی نێوی چییە؟

— سابڵاغییە و نێوی باوکی نازانم. ئەوەندە دەزانم پێیدەڵێن «حەمەدی مەولوودی»

— لە دیموکڕات چکارە بووە؟

لە وەڵامدا قووڵیخان وەکوو ماری ژەهراوی دەرشایەوە و بوختان و درۆی وای دەکرد بە دژی من کە بە خەونیش شتی وام نەدیبوو. وای بۆ سەری لێدەدام کە دەتگوت بە دژی ئەو چەکم هەڵگرتووە و دەیهەوی تۆڵەم لێبکاتەوە. شتی وای دەگوت کە دە قوتووی هیچ عەتتارێکیدا نەدیتراوە.

تا ئێرەتان لەبیر بێت پاشان دەگەڕێمەوە سەر ئەو باسە. لێرەدا دەبێ باسی ئەوە بکەم کە کاتی

خۆی کە لە زیندانی کۆیە بووم، بە «میرزا حەمەدەمینی کۆیە»[1]م گوتووە کە تەسکەرەی عێڕاقیم هەیە و باش لە دەردی من حاڵی ببوو و دڵخۆشی دەدامەوە و دەیگوت:

— ترست نەبێ هەموو هەوڵی خۆم دەدەم تا ڕزگارت بکەم و دەچمە لای «کاکە زیاد»ـی[2] و داوای لێدەکەم کە کارێک بکات تا تەسلیم بە ئێرانت نەکەنەوە.

تۆ مەڵێ کە حەمەدەمین دەگەڵ کاکە زیاد قسەی کردووە و کاکە زیادیش دەگەڵ «موتەسەڕیفی هەولێر» قسەی کردووە تا بە جۆرێک لە بەندم خەڵاس بکەن. ئەوە من تا ئەو ساتە کاکە زیاد ناناسم، هەر ناوم بیستبوو. میرزا حەمەدەمینیش خۆی لە ئەسڵدا سابڵاغییە. لەولاشەوە ڕۆژێک پێش هاتنی سەرهەنگ شوکری و قوڵیخان، دیتم «شێخ عەلاوەدین»[3] هاتۆتە بەر دەرکەی گرتووخانەکەی. هاتبوو تا «سەید موسلیح» بەڕەڵا بکات کە ئەویش لەو گرتووخانەیە گیرابوو. کەمێک هاتە ژوورێ و ئەحواڵی گیراوەکانی پرسی. ئەو کە پێشتریش منی باش دەناسی، دەستم لە کونی شیشە ئاسنەکاندا دەرهێنا و گوتم:

— قوربان دەستت بێنە پێش با زیارەتی کەم.

دەستی دەکونی ئاسنەکان نا و ماچم کرد. گیراوەکانیش یەکەیەکە دەستیان ماچ کرد و پاشان گوتی:

— حەمەد، مەراق مەخۆ بە سەید عەلی حیجازی دەڵێم بەڕەڵڵات بکات.

— قوربان تەسکەرەی عێڕاقیشم هەیە.

— چاتر. ئەوەش بە سەید عەلی دەڵێم.

ئەوەندە قسەیە لە ناوماندا تێپەڕی و ماڵی ئاوەدان بێ پاشان چووبو بە سەید عەلی گوتبوو. ئیتر من لەو کونەڕەشەیدا ئاگام لە هیچ نییە کە ئەو خەڵکە باشە بەشوێن کاری منەوە بوون تا ڕزگارم بکەن لەو دۆستاخە. خودا هەڵناگرێ کوردی عێڕاقێ وەک کوردی ئێرانێ نین. کوردی ئێرانێ دوو بەشن. بەشێکیان پیاوە گەورەکانیانن کە زۆر خۆبەکەمزان و ترسەنۆکن. هەزاری وەکوو من دەکەن بە قوربانی ئەوەی کە ئەفسەرێکی ئێرانی پێیان بڵێ مەرحەبا. جا لەمەر ئەوانە شتی عەجایبتان بۆ دەنووسم کە چەند ترسەنۆک و بێکیفایەتن، بۆ هیچ نابن و بۆ ئەوە نابن کە پشتیان پێ ببەستی. بەشەکەی دی، کاسب و هەژار و نەخوێندەوارن کە زۆر باش و بەڕێزن، بەڵام هیچیان لەدەست نایەت و بێدەستەڵاتن، بەردەوام غەدریان لێدەکرێت. کوردی عێڕاقێ وا نین. ئەوەی من

---

[1] بۆ زانیاری زیاتری لەسەر " میرزا حەمەدەمینی کۆیە "، لاپەڕەی ٤٥١ی ئەم کتێبە هەڵدەنەوە.

[2] بۆ زانیاری زیاتری لەسەر " کاکە زیاد "، لاپەڕەی ٤٢٦ی ئەم کتێبە هەڵدەنەوە.

[3] مەبەستیان "حەزرەتی شێخ عەلائەدینی حوسێنی نەقشبەندی"ـیە کە هەوڵدەدەم لەمەولا ناوەکەیان بە شێوەی دروستی خۆی بنووسمەوە. هەروەها دەتوانن بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو گەورەپیاوە کوردپەروەرە، لاپەڕەی ٤٦٦ی ئەم کتێبە هەڵدەنەوە.

دیتم و دەگەڵ منیان کرد، دەبێ دە مێژوودا بنووسرێتەوە. گەورە و بچووکی، کاسبکار و سەپانی، دارا و نەداری هەمووی پیاوم هاتنە بەرچاوی. تا توانیان هەوڵیان بۆ دام نەدرێمەوە بە تێران و نەکوژرێم. ئەوان دەیانزانی درانەوەم بە تێران و هەڵاوەسینم بە قەنارەوە یەکە.

جا با بێمەوە سەر باسەکەی سەرهەنگ و قوڵیخانی. وەک گوتم، قایم مەقام ئەو ڕۆژە زۆری خۆ لێ توورە کردم. دەیگوت کە تۆ ڕاستێ ناڵێی و درۆ دەکەی. منیش تەسکەرەکەم وەک کەر دەزەڕڕێنێ. نێوی باوکیشم مستەفایە نەک مەولوود. جا سەیر ئەوەبوو کە سەرهەنگ وەک زمانی بە دەرزی دوریابێ وا بوو، متەقی لێوە نەدەهات. پێموابێ زمانی نەدەزانی، بەڵام ئەو قوڵیخانە ئەوەی دەیگوت نەیدەگوتەوە. هەتا بۆی کرا بۆ سەرمی لێدەدا. شتی وای دەگوت کە بۆخۆم پێم سەیر بوو. ئەو شتانەی دەیگوت هیچی ئەسڵ و ئەساسی نەبوو، دەنا بۆخۆم دەزانم، ئەوەندە بەرانبەر دەوڵەتی ئێرانێ تەقەم کردووە و زەبرم لیداون، کە بە خوێنی سەرم تینوون. لەلای ئەوان گرتن و کوشتنم یەکە، ئیتر پێویستی نەدەکرد کە قوڵیخان ئاوا بێتامی بکات و ئەو هەموو درۆیانە وەسەر یەک بنێ. بۆیە وای دەکرد تا خۆی شیرین بکات لەلای ئەو سەرهەنگە. ئەو ڕۆژە سەعاتێک زیادتر مرخیشیان دەگەڵ کردم و پاشان دە ژوورێیان کردمەوە. ئەنوەر و هاواڵەکان کە منیان دیت هەموو هاتن و دەورەیان دام. دیار بوو لەخۆم زیاتر دە خەممدا بوون. منیش هەموو حەیسوبەیسەکەم بۆ گێڕانەوە. دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەوەی عەیبەت و دڵەڕاوکێ بوو لە بەدەنمدا، نەمابوو. ئەو شەوە زۆر بە خۆشی ڕامانبوارد و بۆ بەیانی پاش خواردنی نانی بەیانی لەپڕرا پۆلیسەکان تێکیان هاویشت و بوو بە ڕۆژی قەروەیسی کوژراو. هاواڵەکان لە کونی شیشەکانی حەپسخانە پرسیان:

— ئەوە چ قەوماوە؟

— گوتیان: ئێستا سەرهەنگ بۆ ئێرە دێت.

دیسان ترسەکەم لێنیشتەوە و دڵەکوتە دایگرتم. بە خۆم گوت کە تازە تەواو، ئەورۆ دەمدەنەوە بە ئێرانێ و هەزار فکر و خەیاڵم دەکردن. لە دوورەوە چاوم لێکرد ئەوە «سەرهەنگ شوکری» بەخۆی و «قوڵی خان»ـەوە دەگەڵ «فازڵ»ـی کە جێگری «سەید عەلی حیجازی» بوو و هەروەها دەگەڵ چەند ئەفسەر و پیاوی پۆشتە وەژووری سەرایە کەوتن چوون بۆ سەرێ. تەواو دانەنیشتبوون کە دوو پۆلیس هاتن و بردیانم بۆ سەرێ. لە مەودای ژوورەکەم ڕا تا گەیمە سەرێ بۆ ژووری ئەوان، ترسەکەم هەر دەهاتوو زیادی دەکرد، تفم لە زاریدا ویشک ببوو. کە سەرم دەژووری نا، فازڵی کە پێشتر هەر بەتوورەیی و بە ناخۆشی دەیدواندم و لێپرسینەوەی دەگەڵ دەکردم، زۆر بە ئارامی و بە ڕووخۆشی هەرای کردم و گوتی: حەمە، ڕۆڵە وەرە ژوورێ.

کە ئەوەم بیست ئاهێکم هاتەوە بەرێ و پشوویەکم خواردەوە و گوتم ئەوە لەبز و شێوە دواندنەی فازڵی بێموو نییە! چوومە ژوورێ و سڵاوم کرد و ڕووم دە وان و پشتم دە سەرهەنگ و

قوڵیخانی کرد. قایم مەقام ڕووی تێکردم و دیسان هەمان پرسیاری پێشووی لێکردمەوە، بەڵام نەختێک بە توندتر گوتی:

— کابرا بڵێ بزانم، ئەتۆ بۆ ڕاستێ ناڵێی؟ تۆ کێی؟ کوێندەری و چ کەسێکی؟

— بەگم، هەر ئەوەیە کە گوتومە، پشدەریم، عێراقیم، ناوم حەمەدە، بابم مستەفایە، لەوە زیاتر چیتر نازانم بڵێم.

هەر کە وامگوت، تووڕە بوو چاوی لێدەرپەڕاندم و دەنگی بەسەرمدا هەڵێنا و وەک مار دەڕشایەوە. زۆری وەڕەوەڕ کرد و پاشان فازڵ هەڵی دایە گوتی:

— بەگم ئەوە عێراقییە، بەڵام لەمێژە چۆتە ئێرانێ.

هەر ئەوەندەی گوت، لە برینی خۆم حاڵی بووم. زوو زانیم ئەوە کاری شێخ عەلائەدینییە، وەی دایکم بەقوربانت بێ. جا هەر واش بوو. شێخ لە گرتووخانە گوتی دەچمە لای سەید عەلی حیجازی خەڵاست دەکەم. فازڵیش کە معاوینی سەید عەلی حیجازی‌یە ئاوا لەسەرم وەجوابە، زوو زانیم کاری شێخی بووە. ئیتر ئەو ترس و سامەی ڕێم نیشتبوو، بەجارێک نەما. ئەوجار زمانم کرایەوە و هەژدەرهەژدەر دەستم کرد بە قسان و گوتم:

— قوربان، جەنابی قایم مەقام، ئەوە تەسکەرەکەم لە خزمەتت دایە، چەندەی شایدیش تۆ دەڵێ، من هەمە. لەوە زیاتر چی دیت دەوێ؟

— ئەوە دەڵێی چی؟ تۆ ئێرانی و ئەو تەسکەرەیەش ساختەیە.

— قوربان گەر من ئێرانی بام وەک ئەوانە دەبووم، (ڕووم دە سەرهەنگ و هاواڵەکەی کرد) ئێرانی ئەوانەن. تەماشای ڕەنگ و ڕووخساریان بکە و تەماشای ڕەنگ و ڕووخساری منیش بکە. ئەوانە چونکە تریاککێشن وەک دە مەنجەڵیدا پیشابن ئاوان، دیوتە چەند لاوازن.

ئەوجار ڕووم دە پۆلیسەکان کرد و گوتم:

— تۆ خوا کاکی پۆلیس ڕاستێ بڵێن، ئەوە من ماوەیەکە لێرە لەلاتان گیراوم، دیتووتانە من تریاک بکێشم یان تریاک بخۆم؟

پۆلیسەکان لە قەزمەی[1] پێکەنینێیان دا و نەیانتوانی وەڵامم بدەنەوە و بە دەم قاقاوە لە ژوورەکە چوونە پێشخانەی. قایم مەقام تۆزێک زەردەی هاتێ، بەڵام شەرمی دەکرد لەبەر سەرهەنگی دەری

---

[1] ئەم وشەیە بەوجۆرەی کە نووسراوە، نووسیومەتەوە. وێدەچێت کە ئەم وشەیە "قەزمە - قەشمە" بێت کە لە "قەشمەر"ـەوە دێت. قەشمەر بە دوو مانا دەدات. یەکیان بەچکە مەیمون، ئەوەی تریان بە مانای گاڵتەپێکردن و تیز هاویشتن. مەبەست ئەو پێکەنینەیە کە لە دوای گاڵتەپێکردنێک دەکردرێت. ئەودەم (تەنانەت ئێستاش) باوە بووە بۆ پارە پەیدا کردن بەچکە مەیمونیان دەهێنانە ناو بازاڕ و گاڵتەجاڕییان پێدەکردن و خەڵکیان پێ وەپێکەنین دەخست. لێردا مەبەستی کاپیتان ئەوەیە کە پۆلیسەکان چەشنی ئەو پێکەنینەی کە خەڵک بە قەشمەری دەکەنن، ئاواش پۆلیسەکان بەو ئێرانییانە پیکەنیون. مەبەستی کاپیتان لە بەکارهێنانی ئەو وشەیە سووکایەتی پێکردن بەو دوو ڕاسپاردەیەی دەوڵەتی ئێران بووە. وەک قەشمەر شوبهاندوونی و پێکەنینی پۆلیسەکانیشی بە پێکەنینی خەڵکانێک شوبهاندووە کە بە قەشمەر پێدەکەنن.

ببڕی. هەر لەبەر خۆیەوە زەردەی دەهاتێ. فازڵیش بێپەردە ئەوەندە پێکەنی ڕەش و شین ببۆوە. قایم مەقام یەک دوو جاران زمانی خۆی دەگەست و چاوی لێ زەق دەکردمەوە بەو مانایەیە کە بەسە لێی ببڕەوە و چیتر مەڵێ. قوڵیخان و سەرهەنگیش چاوەڕوانیان نەبوو کە ئاوا بیانشکێنمەوە. پتەت لێدابان دەقەڵشان، ئەوەندە قەڵس ببون نەبیتەوە. زۆر باشیش دەمزانی گەر بمبەنەوە بۆ ئێرانێ هەر لە ڕێوە کەوڵم لە حاجەت دەخەن. گوتم هەرچی دەبێ با ببێت بە ...ری قەلەندەر. من کەی ئەوانەم پێ پیاو بووە تا ئێستا بۆیان دابنوێنم. ئەوانە کە ناوی منیان دەبیست، دەچوون لە باوەشی ژنەکانیانەوە جا چۆن دەهێڵم لە سەرەمەرگیشمدا ئەوانە پێم خۆش بن. بەو جۆرە مەجلیسەکەم وا خۆش کردبوو نەبێتەوە. نیزیک بە پانزدە دەقان لەسەر ئەو ئێرانییە تریاککێشانە ڕۆییشتم. ئەگەر قایم مەقام وسکتی نەکردبام، وا زوو لێم نەدەبڕێوە، بەڵام لێم تووڕە بوو و گوتی:

— وست بە سەگباب، هەر کەسانی وەک ئێوە بوون کە هێندەی نەمابوو ئیمپراتورێکی وەک ئێران تێک بدەن و لێکی هەڵوەشێنن. دمت داخە بەسە ئێدی.

فازڵیش لەولا ڕا هەڵی دایە:

— هەر وەکی تێکیش درا.

دیسان قایم مەقام بە سەرمدا ڕشایەوە و دەستیکرد بە جنێودان، وەک بەڕووی خواردبێ و وسکتی کردم. ماوەیەک بێدەنگ بووم و قایم مەقامیش چاوی لە تەسکەرەکە دەکرد و لێکیدەدایەوە تا بزانێ چەندی بە چەندییە. کەوتە پرسیاران لە «قوڵی خان»، ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت کە:

— ئەوە من دەیناسم و سەتجارم دیوە و من سێ ساعات لە سابڵاغ دوورم، بەڵام هەمووکەس دەناسم و لەو شتانە. منیش هەڵمدایە و گوتم:

— قوربان، بەگم، بزانە ئەوەی ئەوە دەیڵێ هەمووی درۆیە. چۆن سێ سەعات لە سابڵاغ دوورە و هەموو ڕۆژێش لە سابڵاغە؟ ئاخر با منیش هیچ نەڵێم خۆتان بزانن ئەوە دەگەڵ عەقڵ دەگونجی؟ تەماشا چۆن ئەو هەموو درۆیانە پێکەوە دەنێت. ئێوی باوکیشم نازانێت و تەمایەتی لەجێی کەسێکی تر بمقەبڵێنێت. ئەدی نازانێ کە ئێرە عێراقە و لێرە هەموو شتێک بە تەسکەرەیە. قوربان من بێسەوادم، بەڵام ئێوە سەوادتان هەیە، ناکا ئێوەش فریوی ئەو درۆیانە بخۆن؟

کە ئەو قسانەم پێگوت، دوو پۆلیسەکەی بانگ کرد و گوتی ئەوەی لابەن، دەژوورێی کەنەوە. لە ڕێگایە کە دەگەڵ پۆلیسەکان دەچوومەوە بۆ ژوورەکەم، چەند کەڕەت پۆلیسەکان دایکی خۆیان بەقوربان کردم. کە وا لە دمی هەموویانم دایەوە. لەو ڕۆژەوە پۆلیسەکانیش خۆشیاندەویستم. کە چووینەوە لای هاواڵەکان، من هیچم نەگوت، پۆلیسەکان بە تام و چێژەوە ئەوەی من بە قایم مەقام و سەرهەنگ و قوڵی خانم گوتبوو، بۆ هاواڵەکانیان گێڕایەوە.

پاشی ئەو قسانە کە کردم لە ژووری قایم مەقامی، ئیتر هیچ ترس و دڵەکوتەم نەمابوو بگرە ورەیەکی سەیرم گرتبوو، بەڵام دوودڵیش بووم. لەلایەک فازڵم ئاوا بینی کە کارچاکیم دەکات و زانیم

که شێخ ڕایسپاردووە، لەلایەکیش ئەو میرغەزەبانە لە ئێرانەوە بۆ من هاتوون، نەکا گۆنگەڵێک بنێنەوە و دڵی عێراق ڕازی بکەن و بمدەنەوە بە ئێران؟ هەرچەند ئەو وەختەی برێک پاش من ئەوانیش لە ژووری قایم مەقام وەدەر کەوتن، بەڵام ئەوانە ئەوەندە فێڵەزان و دڵڕەقن، بۆیە کەمێکم دڵەڕاوکێ هەر هەبوو کە بەخۆشییەوە هیچ پێمەوە دیار نەبوو. ئەوان کە لە ژوورەکە وەدەر کەوتن، پۆلیسێک خەبەری هێنا کە ئەوە بەتەمان بچنەوە بۆ ئێرانێ. هاواڵەکانم کە زیاتر لەخۆم پەرۆشم بوون ئەوان لە پۆلیسەکەیان پرسی کە:

— کاری حەمەی چی لێهاتەوە؟

— بە سەرهەنگیان گوتووە کە ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان پێ نییە. بچنەوە ئێران سجیل و مەدرەکی بێنن تا بزانین ئێرانییە یا عێراقییە؟ ئەوانیش چوونەوە تا سجیلی بێنن.

که پۆلیسەکە ئەوەی گوت، لە ئەژنۆی خۆم دا. هاواڵەکانم گوتیان ئەوە چییە بۆ وا دەکەی؟ گوتم ئێوە نازانن. گەر بێتوو ئەوانە سجیل و بەڵگەی بێنن، سەت ڕۆحم پێبێت، ڕۆحێکم پێناهێڵن. هاواڵەکانیش بەتێکڕا دڵدارییان دەدامەوە کە کار نییە خودا چاکی نەکا و لەو قسانە.

بەڵێ، ئەوە سەرهەنگ ڕۆییشتەوە و بۆخۆم بە خۆمم گوت کە چەلێ لەو پلەیە نەجاتیم بوو. بە ئەستۆی شکاویان فانی بوون و هیوادارم نەیانبینمەوە، کەچی دوو ڕۆژ لە ڕۆییشتنەوە سەرهەنگی تێپەڕیبوو کە لەپڕا پۆلیسێک لە دەرگای دا و هەرای کرد:

— حەمە مەولوود مستەفا، وەرە دەرێ.

منیش وامزانی ئەوە هاتووە کە بەیکجاری بمدەنەوە بە ئێرانێ. هاتم کە دەست دەئەستۆی هاواڵەکانم بکەم تا گەردنی خۆمیان پێ ئازاد و ماڵئاواییان لێبکەم، کەچی پۆلیسەکە هەڵیدایە:

— ماڵخراپ ئەوە چ دەکەی؟ هەستە زووبە خۆت کۆکەوە بەرەڵڵا دەکرێی. دەبێ بچی کەفیلی بۆخۆت پەیدا کەی.

ئیتر هاواڵەکانم کردیانە هەرای خۆشیی و لەلایەک منیان دەباوەش دەگرت و لە لایەکیش پەلاماریان بۆ پۆلیسەکە دەبرد و زیاتریان زانیاری لێدەستاند. لەمێژبوو کە لە ڕانییە و لە کۆیە ڕایانئەسپاردبووم کە گەر داوای کەفیلیان کرد ناوی ئەو چوار کەسە بدە. یەکیان «حاجی تەهای بەزاز» ئەوەیتریان «مەلا قادری نانەوە» و ئەوانەیترم لەیاد نەماون.

بەڵێ، پۆلیسەکە بردمی بۆ لای مەرکەزمەعمەوری کە ناوی «یوحەننا» بوو. کابرایەکی چاو چەپوڕاست و گڕوێ و زۆریش ناشیرن بوو. کە چووم، لەپێشدا داوای پارەی لێکردم. منیش کە تازە ژنبراکەم پارەیەکی بۆ هێنابووم، پێنج دینارم دایە و جا ئەوجار هاتە قسە و داوای زامنی لێکردم. منیش ناوی قادری نانەوام دا و پۆلیسەکەش گورجێکی چوو قادری نانەوای هێنا. ئەوە من قەت قادری نانەوام نەدیوە. کابرای مەرکەزمەعموری لە قادری پرسی:

– دەبی بە کەفیلی ٢٠٠ دیناری؟

– دبمە کەفیلی ٢٠٠٠ دیناریش.

لە دڵی خۆمدا گوتم وەی بەبابەوە دەبەر گونانت مرم عێراق کە پیاوی وەک قادری نانەوات تێدایە. ئاخر نەدی و نەناسیو، کێ ئەو کارە دەگەڵ من دەکات، ئەمنێکی دەوڵەتی ئێرانێ بەدوایەوە و هەموو سەر و سەکوتی گۆنگەڵە. زۆر پی اوانە زەمانەتنامەی لەپێش دانا و ئەویش ئیمزای کرد. لە حەسارێ دینارێکم دا بە پۆلیسێک تا بۆم بچێت «مەلا قادر»م بۆ بهێنێت. تا مەلا قادر هات من چوومەوە لای هاواڵەکانم و خواحافیزیم لێکردن و گەردن ئازاییم لێنەستاندن. بڕوا بکەن کە ئەوان بە بەڕەڵلا کردنم، لەخۆم زیاتر شاد و شوکور بوون، شاییان بۆ دەگێرام.

## هەر کە ئازاد بووم...

مەلا قادر هات و بەیەکەوە لە گرتووخانە وەدەرکەوتین. یەکڕاست بردمێوە بۆ ماڵە خۆیان. ئەو ڕۆژە و بۆ شەوێش هەر لە ماڵە ئەوان بووم و زۆریان قەدر و حووڕمەت گرتم کە لەبیرم ناچێت. بەراستی ماڵئاوەدان و ماڵکراوە بوو. بۆ بەیانی خواحافیزیم لێکردن و دەستی یەکترمان ماچ کرد و چووم سواری ماشێن بووم بەرەو هەولێر.

لە هەولێر کە دابەزیم توشی «جەردیس»ـی بووم. ئەو کۆنە هاواڵێکم بوو کە زەمانێکی بەیەکەوە قاچاخچێتیمان دەکرد و ماڵمان لە عێراق دەکڕی و دەمانبردە تەورێز دەمانفرۆشت. لەپێشدا ئەو منی دیبوو، بەڵام من نەمدیتبوو. چاوم لێکرد کەسێک بانگم دەکات! کە ئاوڕم دایەوە جەردیسە! تێر یەکترمان ماچ کرد و پاش چاک و چۆنییەکی گەرم و گوڕ بردمێوە بۆ ماڵی خۆیان. شەو و ڕۆژێک لە ماڵی ئەوانیش بووم و پاشان دەگەڵم هات بۆ گاراجی و سواری ماشێنی کردم بۆ کۆیە. لە کۆیە شەرمم کرد بچمە ماڵی میرزا حەمەدەمینی، چوومە «خانیی مەلای گەورە». کە دوور و نیزیکی ئەوێ بووم، دیتم کاروانێکی سابڵاغییانی لێبوو. ئەو شەوە تا بەیانی لەلایان بووم و بۆ بەیانی هەر دەگەڵ ئەو کاروانە چووم بۆ قەڵادزێ بۆ ماڵە زاهیری خەیات. کە زاهیر منی دیت یەکجار زۆری پێخۆش بوو. ماوەی مانگێک لە ماڵی ئەوان بووم. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ چاتری ڕێز و حووڕمەت دەگرتم. هیچکات ناتوانم چاکەکانیان فەرامۆش بکەم. خۆم بە قەرزداریان دەزانم. شەوشەوەش کە زاهیر لەماڵ نەدەبوو، دەچووم بۆ ماڵی «حاجی عەبدوڵڵا»ـی کە خۆیشی سابڵاغی بوو. ڕۆژێک لە «چایخانەی کەریم»ـی[1] بووم، تەماشام کرد «باشچاووشێک»[2] و دوو پۆلیس گوتیان وەرە با بڕۆین. خەڵکەکە پرسیاریان کرد کە ئەوەی بۆ کوێی دەبەن؟ چی کردووە؟ و لەو شتانە. گوتی من هیچ نازانم، مەرکەزمەعمور دەیەوێ. خودا هەڵناگرێ خەڵکەکە چەند نەفەریان تا بەردەرکەی سەرایە دەگەڵم هاتن. تەنانەت زاهیر دەگەڵم هات بۆ لای کابرای گەورە. دڵیان نەدەهات بەتەنیا جێم بهێڵن. لەوە دەترسان کە بمگرن و یەکڕاست بمدەنەوە بە ئێران. بۆخۆشم هەر ئەو ترسەم هەبوو. زاهیر لە کابرای گەورەی پرسی:

— بۆچیتانە دیسان؟

— من نازانم بۆ چییانە، بەڵام لە ڕواندزەوە داوایان کردووە.

---

[1] ئەوسا دوو چاخانەی کریم هەبوو. ١- چاخانەی کەریم ئەسعەد ٢ - چاخانەی کەریم حەشاش. دەبی کریم حشاش بیت، چونکە جیرانی وەستا زاهر بوو. ئێستاش ماوە. (مامۆستا ستار حەمە تایەر)

[2] ئەم وشەیە "BaŞçavuŞ" ترکییە و پلەیەکی سەربازییە بەرامبەر بە" گروهبان یکم" دە فارسیدا و "رقیب اول" دە عارەبیدا و "Sergeant major" دە ئینگلیسیدا کە بەجێماوە لە حکومەتی عوسمانییەکان لە عێراق.

کە وای گوت، لە ئەژنۆ بە ژێرم مرد! زانیم چ باسە! گوتم بێ و نەبێ مام سەرهەنگ سجیل و کاخەزی هێناوە، جا هەر واش بوو. زاهیر بڕێک بە زمانی عەرەبی کابرای مەرکەزی دواند و پاشان کردیانەوە بە کوردی. زاهیر گوتی:

— چار چییە؟

— دەبێ پۆلیسی دەگەڵ بنێرم.

— ئاخر زامنی داوە و گەر ویستبای بۆی دەرباز بێت لەمێژ بوو ئەوکارەی دەکرد! چ پێویست بە پۆلیس دەکات. کاکە من زامنی دەبم با بۆخۆی بچێت بۆ ڕواندز و خۆی بناسێنێت.

— نابێ شتی وا.

ئاخر زاهیر زۆری خواییش لێکرد و هیچ فایدەی نەبوو. پێموابێ ئاخری زاهیر سەت دیناری دەزاری گووشی جا ڕازی بوو. گوتیشی با زامنێکیش بێنێت جا پاشان بڕوات. زاهیریش هەر لەوێ بوو بە زامن و لە سەرایە وەدەرکەوتین. چەند هەنگاوێک لە سەرایە دوور نەکەوتبووینەوە کە زاهیر گوتی:

— ڕامەوەستە و هەڵێ و خۆت خەڵاس کە!

— ئاخر تۆ بوویتە کەفیلم؟ چۆن شتی وا دەبێت؟ من کاری وا ناکەم و هەڵنایەم.

— تۆ کارت بە من نەبێ! خۆ من ناکوژن، زۆرزۆر سەت دینارێکی تر دەدەم. تۆ بڕۆ خۆت خەڵاس کە دەنا، ئەوجار بتگرنەوە دەدیوی ئێرانێت دەکەنەوە و ڕۆحت لێدەستێنن.

دەریهێنا هەشت دیناری دامێ و گوتیشی کە لە هەرجێگایەک بووی کاخەزم بۆ بنووسە پارەت بۆ دەنێرم تۆ خەمی پارە مەخۆ. کە ئەو قسانەی پێگوتم، دەسرەکەی دەرهێنا و بە چاویەوە گرت و فرمێسکی بەردانەوە. من کە ئەوەم دیت، کوڵی گریانم هەستا و دەستمان لە ئەستۆی یەکتر کرد و دە خۆماندا دەکوڵاین و بە چاوانیش فرمێسکمان دەباراند، بەڵام چونکە کوڵی گریان لە ئەوکماندا وەستاوە، قسەمان بۆ ناکرێ. ئەو ڕۆژە زۆر ماتەم گرتمی چونکە، زاهیر گریا و منیش گریام. چەند نەفەر قەڵادزەیی هاتن و گوتیان چبوو؟ چیتان کردەوە؟ زاهیریش بۆی باس کردن کە لە ڕواندزێ ویستوویانم.

## پەنابردن بۆ شێخ لەتیف

من بەتەما بووم بچمە «خەلان»ێ لای شێخ عەلائەدینی. گوتیان مەچۆ ئەو خەتی، بڕۆ بۆ لای «شێخ لەتیف». پاشان چووینە چایخانەی و چایەکمان خواردەوە و ئینجا چوون کەمێکیان نان و سیغار و شڕە و بڕەیان بۆ دە چارەکەیەکی نام. بڕێک دەگەڵم هاتن تا لە شار دوور کەوتمەوە و لەوێش یەکترمان ماچ کرد و چارەکەم بە کۆڵێ دادا و کەوتمە ڕێگا. بە نێو پشدەردا بە پێیان ڕێی سولێمانێم گرت و بە چەند ڕۆژان لای چێشتانێ بوو کە چوومە ماڵە شێخ لەتیفی. تەماشام کرد پڕ بوو لە قاچاغیی سابڵاغی و عێراقی. کە وەژوور کەوتم و سڵاوم کرد ئیتر هەموو ناسیانمەوە و هەموو بەجارێک دەورەیان دام. بەربووینە ئامێز و ماچوموچی یەکتر تا ماندوو بووین. ئەوانەی لەوێ بوون: حەسەنی قزڵجی، زەبیحی، ڕەحمان ئیمامی، سەیدە گوڵەی سەمەدی، محەممەد سمێڵ و چەند نەفەری دی. هەژاریش چووبوو بۆ بەغدایە. خەبەریان دا بە شێخ لەتیف و هات. زۆری بەخێر هێنام و دانیشتین حیکایەتی خۆم و ئەوەی بەسەرم هاتبوو، هەمووم بۆ گێڕانەوە. لە ماڵە شێخ لەتیفی سێ‌جەمە پڵاو گۆشت بوو کە کەڵی تێدا دەخنکا. نیوەڕۆیە نان هات ئەوە هەوەڵجارمە دەگەڵیان نان دەخۆم. بە کوڕەکانم گوت:

— تۆ خوا هەموو ڕۆژ ئەو پڵاوخۆریشتە هەیە؟

— گوتیان: نێوەڕۆ و شەو پڵاوگۆشتە و بەیانیش ڕۆن و ماست و شتی ترە.

— گوتم: دەی، کەوایە پاڵەوپەستۆم دەن، لێرە بۆ هیچکوێیەک ناڕۆم، ئەوە جێگامە تا دەمرم.

دوو مانگ زیاتر لەو ماڵە بووم، لەو ماوەیەدا شێخ لەتیف ڕۆژدەگەڵڕۆژ خولقی خۆشتر بوو، بەڵام پیاوەکانی دەیانبوغزاندین. هەرچەند لەبەر شێخی نەیاندەوێرا بە ئاشکرایی هیچ قسەیەک بکەن. ئیتر بۆ وایان دەکرد؟ نازانم! بەڵام وا دیار بوو لەمێژە ئەوان کوڕەکان دەبوغزێنن. وا هەڵکەوت کە شێخ لەتیف قاچاغ بوو. ئێمە قاچاغەکانیش هەموومان وەدووی کەوتین. چوو بۆ شاربازێڕی و لە دێیەک بە نێوی «سیتەک»[1] قوونمان داکوتا. ڕۆژێ دوو مەڕ دەکوژرایەوە و دەرخوارد ئەو جەماعەتەی دەدرا کە دەگەڵی بوون. نە پۆلیس دەهاتنە سەری و نە ئەویش بزێوی دەکرد.

ڕۆژێک شێخ میوانی هەبوو. هەمووی پیاوی گەورە بوون. سەری دەگەڵ میوانەکان قاڵ بوو هۆشی لە ئێمە نەما. نانی نیوەڕۆیە خوڕا، بەڵام ئێمە قاچاغەکان کە هەموومان لە دیوێکی بووین، نانیان بۆ نەهێنایین. پیاوەکانی شێخی زانییان کە شێخ سەری قاڵە بۆیە نانیان بۆ نەهێنایین. لەو عانەیدا من چووبووم بۆ سەر ئاوێ، کە هاتمەوە لەبەر دەرکی چێشتخانەکە دیتم کە میوانەکان هەموو نانیان خواردووە و نۆکەرەکانی شێخیش ئەوە خەریکن نان دەخۆن. هیچیان منیان نەدیبوو. یەکیان گوتی

[1] سیتەک گوندێکە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سلێمانی هەڵکەوتووە و ٢٣ کیلۆمیتر لەو شارە دوورە.

ئەرێ ئەوە نانی نابەن بۆ ئەو دیموکڕاتانە؟ یەکی تریان هەڵی دایە و چەند قسەیەکی خەراپی گوت. زۆر لەسەر دڵم گران هات، بەڵام هیچ وەسەر خۆم نەهێنا. کە ئەوەم بیست، لامدا کە بچمەوە دیوەکەی خۆمان، نۆکەرەکان هەستیان بە من کرد. چوومەوە نێو کوڕەکان و بە دوای مندا نۆکەرێک هات و بانگی کردین بۆ نان خواردن. زەبیحی هەڵیدایە و گوتی: ئەرێ ئەوە بۆ ئەوڕۆ نانمان بۆ ناهێنن؟ گوتیان: وەرن دەگەڵ ئێمە بخۆن. کە وای گوت، ئیتر کوڕەکان تووڕە بوون و داوایان کرد کە نانیان بۆ بێتە دیوەکە و ناچن بۆ ئەوێ نانی بخۆن. من زۆرم پێگوتن کە ئەوڕۆ شێخ میوانی هەیە و سەری قاڵە و پیاوەکانیش هەروەها، قەیدی چییە با ئێمە بچین بۆ ئەوێ نانی بخۆین، بەڵام پێیان داگرت کە ناچین بۆ ئەوێ نانی بخۆین. کە وام بینی، زانیم ئێسکمان لێرە گران بووە و وردەوردە لێمان ماندوو بوون با شێخیش هیچ نەڵێ و ئاگای لە هیچ نەبێ، بەڵام پیاو دەتوانێ لە ناوچاوان و ئاکاری پیاوەکانی شێخ ئەوە ببینێت. بۆیە بڕیارم دا فکرێک بە حاڵی خۆم بکەمەوە. هەستام چووم لە چێشتخانەی دەگەڵ پیاوەکان تێر و پڕم خوارد. پاشان داوام لە پیاوەکان کرد دوو-سێ نانم دەنێ پڵا و گۆشتی دەنێو دەکەم. گوتیان: بۆچیتە؟ وەڵڵا ئەوانە زیز بوون، زەبیحیش زۆرخۆرە، بۆی دەبەم بەشکوو بیخوا. نیگەران مەبن نایبەم بۆ دیوەکەیان و ناشڵێم کە ئێوە زانیوتانە. دەی باشە، هەرچەندی دەتهەوێ ببە. منیش چەند نانم پڕ کرد لە گۆشت و کراسێکی کۆنم هەبوو، دەنێو ویم نا و وەبن پیلی خۆم دا و وەدەرکەوتم. هەرایان کرد:

— ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ ئاخر نەتگوت بۆ زەبیحی دەبەم؟ ئەدی بۆ واوە دەڕۆی؟

— ئاخر زەبیحی شەرم دەکات، دەزانم لێرە نایخوات، دەیبەم بۆ سەر کانی و پاشان دێم زەبیحی دەبەم بۆ ئەوێ تا بیخوات.

— ڕاست دەکەی، برۆ ببە.

کانییەکە لە قەراغ دێی بوو، چوومە ئەوێ و تۆزێک دانیشتم دیتم کەس دیار نییە. بە هەڵم زانی و بەبێ هیچ قسە و باسێک شێخ لەتیف و سیتەکم بەجێهێشت و ڕۆییشتم. زۆر نەڕۆییشتبووم کە شەو داهات و لە بەختانم تووشی دێیەکی چووکە بووم. لام دا ماڵێک و شەوم لەوێ ڕۆژ کردەوە. بۆ بەیانی ملی ڕێگام گرت بەڵام نەمدەزانی بەرەو کوێ بچم؟! لەخۆڕا سەری خۆم هەڵگرت و بە چەند شەو و ڕۆژان هاتمە «ڕایەت»[1] شەو درەنگە و سەگان بە حەپەحەپی دەورەیان دام. ماڵێک لە پێشەوەی دێیەکە بوو، لە ترسی سەگان و بۆ ئەوەی خەڵکی دێ لە خەو خەبەر نەکەمەوە، خۆم دەماڵەکەی هاوێشت کە پاشان زانیم ماڵی «عەلی ئاغا»ـی بوو. کە چوومە ژوورێ، پڕ بوو لە ژن. هەر کە سەر و سەکوتی چڵکنی منیان دیت، دەورەیان دام و بە پرسیاران هورووژمیان بۆ هێنام.

— تۆ چ کەسی؟ کێی؟ بەو شەوە درەنگەی بۆ هاتوویە ئێرە؟ چیت دەوێ؟ تۆ نازانی ئێرە ماڵە کێیە؟

---

[1] "ڕایەت" گوندێکە لە باڵەکایەتی و ۲۱۷ کیلۆمیتر لە "سلێمانی" و ۷ کیلۆمیتری لە "حاجی عومەران" دوورە.

— کچێ دایکی دایکم بۆ وا دەکەن؟ من لە ترسی سەگان خۆم لێرە کوتاوە، وەڵڵا پیاوێکی خەراپ نیم و ڕێبوارم و ڕێگام ون کردووە و ... دەکرێ پێمبڵێن ئێرە ماڵی کێیە؟ ئێرە ماڵی «مینەی عەلی ئاغایە».

لە هەرکام لەو ژنانەم پرسی تۆ چی ئەو ماڵەی؟ گوتیان من ژنی مینەم. پێموابێ پێنج ژن گوتیان کە ژنی مینەم. دە دڵی خۆمدا گوتم دەبێ ئەو مینەیە چ لاوچاکێک بێت؟ زۆرم حەز دەکرد بیبینم بەڵام لە ماڵ نەبوو. چووبوو بۆ کوێ؟ نازانم! دەو قسانەدا بووین کابرایەک وەژوور کەوت و لێیپرسیم: ئەوە لێرە چ دەکەی؟ ژنەکان نەیانهێشت من جوابی بدەمەوە و گوتیان: ئەوە لە ترسی سەگان خۆی دێرە کوتاوە. کابرا دیسان ڕوی دەمن کرد و گوتی:

— ڕاست بەوە بزانم، هەستە وەپێشم کەوە دەی، با بڕۆینە دیوەخانی، ئێرە جێگای تۆ نییە.

دیسان ژنەکان وەجواب هاتن و گوتیان:

— لێگەڕێ با نانێکی بخوات، برسی دیارە پاشان بیبە دیوەخانی.

— نایهەوێ، ڕاست بەوە دەی.

وەپێش خۆی دام یەکڕاست بۆ دیوەخانی. کە وەژوور کەوتم پڕ بوو لە خەڵک. سڵاوم کرد و کەس نەبوو سڵاوم بستێنێتەوە و تەنانەت کەس نەیگوت دانیشە. منیش لەسەرەخۆ پێڵاوەکانم داکەند و لە جێوە دانیشتم. ئەوە ماوەیەک تێپەڕیوە بەڵام کەس لێمناپرسێ چ کەسی و چ دەکەی لێرە؟ هەر تەماشام دەکەن و هەڵمدەسەنگێنن. بەینێکی باش تێپەڕی، لەپڕ عەلیئاغا لێیپرسیم:

— تۆ چ کەسی؟ لە چی دەگەڕێی؟ بۆ چووی دە دیوی ژنانەوە؟

— قوربان لە ترسی سەگان. وایان هەڵپێچام نەبێتەوە. چاوم لێکرد دەرکە ئاوەڵە بوو و منیش خۆم دەوێ کوتا، ئیتر من چووزانم ئەوێ دیوی ژنانە؟!

— باشە بڵێ بزانم، بەو نیوەشەوەی و بەو سەر و گوێلاکەتەوە لە چی دەگەڕێی؟ ئەگەر پیاوێکی چاکی، بۆچی بەڕۆژ ناڕۆی؟

زۆری لەو پرسیارانە لێکردم و منیش لەبەر ئەوەی پڕ بوو لە عالەم نەمدەوێرا ناوی خۆم بڵێم و ئاشکرا بم، لە ناعیلاجییان هێندەم درۆ بۆ کرد و قسەی درۆش بۆخۆی هاوار دەکات هیچ، لەولاشەوە من لە درۆ کردن زۆر ئازا نیم، هەر زوو لە دم و چاوم ڕا دیار دەکات کە درۆ دەکەم. عەلیئاغا کە زانی درۆی دەگەڵ دەکەم گوتی: ڕاست بەوە. ڕاست بوومەوە. پێڵاوەکانت دەپێ کە بزانم. پێڵاوەکانم دەپێ کرد. ڕووی دە پیاوێکی خۆی کرد و ئەمری پێکرد تا لە دێم وەدەر بنێت. کابراش قۆڵی گرتم و وەپێشخۆی دام. کابرا پیاوێکی باش بوو. بەو درەنگانەی شەوێ، ئەو ڕێگایەی دەگەڵم هات و لەو ڕێگایەدا هەزار جار جنێوی بە ئاغایان دا. ئەوجار هەندێک چرا لە تاریکایی شەودا وەدیار کەوتن. جا کابرا گوتی: ئەو چرایانەت دیوە؟ ئەوە «خەلان»ە[1].

---

[1] نێوانی "خەلان" و "ڕایەت" ٤ کیلۆمیترە. ئەو گوندە شوێنی نیشتەجێبوونی حەزرەتی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندییە.

## گیرسانەوەم لە خەلانێ

بەو جۆرە کابرا تا خەلانێ دەگەڵم هات و بەوشەوە و بەتاقی‌تەنێ گەڕایەوە. منیش وردەوردە چوومە ناو خەلانی. ئەوە درەنگایی شەوە، هەموو عالەم نووستوون، لەپڕرا وەبیرم هاتەوە کە «مستەفای زینەتی» بەماڵەوە هەڵاتووە و هاتۆتە خەلانێ. هەرچەند ئەوجارەیان ترسم لێنیشتبوو کە بە نیوەشەو لە دەرکەی ماڵەکان بدەم، بەڵام خۆم بەپێوە ڕانەدەگرت، بۆیە ورەم دا بەخۆم و لە دەرگایەکم دا. ژنێک وەدەنگ هات و گوتی:ئەتۆ کێی؟ دەڵێی چی؟ خوشکێ ماڵە «مستەفای زینەتی» کێهەیە؟ بڕێک ڕاوەستام چ دەنگ نەبوو. ئەوەندەم زانی دەرکە کرایەوە، تۆ مەڵێ لە بەختی باشم من ڕێک لە دەرکەی ماڵی مستەفام داوە. مستەفا دەنگی ناسیبوومەوە و گوتبوی نامەردان! ئەوە دەنگی حەمەیە! ئیتر بە هەڵەداوان هاتوو دەرگای کردەوە. هەر لەبەر دەرکێ یەکترمان دەباوەشێ گرت و بە ماچان وەرگەڕاینە یەکتر. ئەوجار ژنەکەی و کچەکەی قۆڵیان ماچ کردم و دەستیان کرد بە گریان و شینێکی گەرم. شەو کە زۆری نەمابوو ئەوانیش نان و چایان حازر کرد و بەیەکەوە نانی بەیانیمان خوارد و ئەوجار مەلا بانگی دا. چەند سەعاتێک هەر من بەسەرهاتی خۆم بۆ ئەو دەگێڕایەوە و ئەویش بۆ من. من کە نەمتوانی درێژە بە بەسەرهاتەکان بدەم و خەو و شەکەتی هێرشی بۆ هێنام و نووستم. بۆ لای ئێوارێ دەگەڵ مستەفای چوومە خانەقایە، شێخ لە ماڵێ بوو. کوڕەکانی لەوێ بوون و زۆریان بەخێر هێنام. تەماشام کرد «حەمەدی کا خدری»ش[1] لەوێ بوو. ئەویش قاچاغ ببوو و لەوێ خۆی داڵدە دابوو. زۆری پێنەچوو شێخ وەدەر کەوت و هاتە خانەقایە. چوومە پێش و دەستیم ماچ کرد و لێیپرسیم: تۆ حەمەدی مەولوودی نی؟ بەڵێ بۆخۆمم. زۆری بەخێر هێنام و لە پەنا خۆی دانیام و لێم کەوتە پرسیاری بەسەرهاتم. منیش لەسەر ڕا هەمووم بۆ گێڕایەوە تا ئەو جێیەی کە هاتوومەتە ماڵی «عەلی‌ئاغای ڕایەتی» کە چۆنی بە نیوەشەو لە ماڵە خۆی وەدەری ناوم. کە ئەوانەم بۆ شێخی گێڕایەوە ، زۆر لە عەلی‌ئاغای قەڵس بوو و گوتی:

— لێرە دانیشە و مەترسێ، ئاسمان بڕووخێ نایەڵم چیت بەسەر بێت. تۆ ئاگات لێ نییە کە من چەندەم حەول بۆ داوی لای سەید عەلی حیجازی!

— قوربان چاک دەزانم.

لە سێبەری شێخی لە خەلانێ دانیشتم. من و «حەمەدی قادری»لە خانەقایە دەنووستین و ئەوەی لە ماڵە شێخی دەخورا، ئێمەش دەمانخوارد. من دەگەڵ کوڕەکانی شێخی نانم بۆ دەهات و دەگەڵ ئەوان دەمخوارد. لە خانەقایە هەموو ڕۆژێک پڕ دەبوو لە میوان. پڵاو و گۆشت وەک خۆڵێ بوو. زۆر باش بۆم لوا بوو. دەو پەڕی قەدر و ڕێزدا بووم. بۆچی ئێرانییەکان زانییان کە لە خەڵانێم!

---

[1] حەمەی کا خدری یا محەممەدی قادری. بۆ ناسینی ئەو تێکۆشەرە بڕوانە لاپەڕەی ٤٥٤ ئەم کتێبە.

دەسەر حکومەتی عێراقییان کرد بۆ گیانی من بەڵام پۆلیسەکان کە هەموو کورد بوون و دەیانزانی من کێم و بۆ لە خەلانیم، خۆیان تێنەدەگەیاندم. «مەلا حەسەن» باشچاووش بوو، لە حاجی ئۆمەران مەئمور بوو. ئەو منی نەدەناسی. ڕۆژێکی من لە خانەقایە لە خزمەت شێخیدا دانیشتبووم و هاتە لای شێخی و گوتی:

— یا شێخ ڕۆژ نییە لە ئێرانەوە مخابەرەمان بۆ نەیە، داوای حەمەدی مەولوودی دەکەن. دەڵێن لێرە لە خەلانێیە. پێی‌بلێ با ئاگای لە خۆی بێت و ئەگەر مەفرەزە هات، خۆی وەدیار نەخات.

— شێخ گوتی: ئەوەتا حەمەدی مەولوودی، نە قەت چاوم پێی کەوتووە و نە ئەویش منی دیوە.

کە شێخ منی پێ نیشان دا و منی پێناساند، لێم هاتە پێش و دەستی دەدەستی نام و زۆری بە ڕووخۆشی ئەحواڵی پرسیم و گوتی:

— خەمت نەبێ، شێخ سڵامەت بێ هیچ بۆتۆ نایەتە پێش و زۆری ئامانەتی شێخی دام.

ئیتر لەوەوە بووینە دۆست و تا خەبەر دەهات لە ئێرانەوە، دەهاتە خەڵانێ و شێخی ئاگادار دەکردەوە. ماوەیەک بەسەر چوو، ڕۆژێک من لە خانەقایە دەگەڵ کوڕەکانی شێخی و «حەمەدی کا خدری» گاڵتەمان دەکرد، لەناکاو خەبەریان هێنا کە ئەوە مەفرەزەیەک هاتنە ناو دێی. پۆلیسێکیان لەپێشەوە هاتە ناو دێی و وای کرد تا من خەبەرم بێ و لە خۆم حاڵی بم کە ئەو مەفرەزەیە بۆ من هاتوون تا من خۆم ون کەم. هەر لە دوورەوە بە تووندی گوتی:

— ئاخر من دەگەڵ حەمەدی مەولوودی نان و پیوازم خواردووە؟ لە کوێ من ئەو دەناسم؟ من چووزانم حەمەدی مەولوودی چکارەیە؟

زۆر زوو کوڕەکانی شێخی وەخۆ کەوتن و گوتیان بڕۆ نێو باغی و خۆت حەشار دە تا پۆلیسەکان دەڕۆن. دەخۆم نووسام چوومە باغی. لە باغیش تاقەتم نەهێنا ملی شاخیم گرت و وەشاخی کەوتم. پۆلیسەکان کە نۆ کەس دەبوون لە خانەقایە لە حەمەدی مەولوودیان پرسی بوو، کە هیچیان گیر نەکەوتبوو گەڕانەوە. منیش لە کێوەکە هاتمە خوارێ. بۆ لای ئێوارێ مەلا حوسێن باشچاووش هاتە لای شێخی و گوتی:

— بە گرمە[1] هەموو ڕۆژێ کاخەزێک دێ کە تێیدا داوای حەمەدی دەکەن. هەراسانیان کردووین. پێم باشە حەمەد بڕوات بۆ شوێنێکی دی. ئەوان ئەخباریان هەیە کە لێرەیە و دەترسم بۆی خەراپ بێت.

— شێخ: نا با نەڕواتە هیچ شوێنێک. با لێرە لەلای خۆمان بێت چاکترە.

ئیتر لەو ڕۆژەوە مەفرەزە بەو دێیەی فێر ببوون. بە شەو و ڕۆژ بەسەریان دادەداین و داوای منیان دەکرد. ڕۆژێ هەر پێمدەکرا لەوباغ و لەو کەند، لەو مدبەق و لەو مەزرا خۆم حەشار دەم. ببومە کێشە بۆ ماڵە شێخیش.

---

[1] پێدەچێ کە کاپیتان مەبەستی "بروسکە" واتە "پەیام" بوویێت کە بە نامە، تێلێگراف یا بێتەل لە نێوان دوو شوێن ڕەوانە دەکرێت.

## حەمەدی مەولوودە مەنگوڕی

ڕۆژێکی لە ڕواندز ڕا هاتن و بە شێخیان گوت کە دەزانین حەمەد لەلای تۆ دالّدە دراوە و لای تۆیە. دەبێ بماندەیەوە. شێخیش حاشای لێکرد و گوتی شتی وا نییە و نەبووە.

ئەوان بە وەڵامی شێخ باوەڕیان نەکرد و چوون بۆ «زینوێ». لەوێ شێخ عوبەیدوڵلایان بە تووندی هەڵپێچابوو کە دەزانین حەمەد لێرەیە و دەمانهەوێتەوە دەنا، وا دەکەین تا وا بچێ. شێخیش دەڵێ ڕاستە لێرەیە، پەلەم لێمەکەن تا چەند سەعاتی دی تەسلیمتان دەکەم. لە زینوێ «حەمەدە مەنگوڕێک»ـی لێبوو کە باوکی نێوی «مەولوود» بوو، شێخ گورجێکی کوڕەکەی دەنێرێتە لای حەمەدی مەولوودە مەنگوڕی و هەڕەشەی لێدەکات و پێیدەڵێ:

— ئێستا تەسلیم بە پۆلیسانت دەکەم، بەڵام بێتوو نێوی حەمەدی مەولوودی بێنی، زمانت دەبڕم. نەکا هیچ بڵێی! گەر لەداریشت بدەن نێوی حەمەدیت بەزاری دا نەیەت! هەر جێگایەک بتبەن هیچت بۆ نابێ و دەگەڕێیەوە چون، ئەوان دەزانن کە تۆ ئەو حەمەدە نی کە ئەوان داوای دەکەن.

سەرتان نەئێشێنم، حەمەدی مەولوودیان وەپێش خۆیان دا و بردیان بۆ ڕواندزی. لەوێ پۆلیسەکان هەموو دەیناسن و دەزانن کە ئەوە حەمەدە مەولوودەکە نییە کە لێیدەگەڕێن، بەڵام دیسان هیچیان دەنگێ ناکەن. کە ماڵی شێخیش زانییان حکومەت هێرشی هیناوە تا بمگرن، گوتیان وا باشتر تەگبیرێکیش لە تۆ بکەین. منیان دەماڵە پیرەژنێکی کرد. دیوێکی چووکە بوو دە ژێر عەرزی دا. جەم دەگەڵ جەمێ نان و خواردنم بۆ دەهات. بە ڕۆژ دەرنەدەکەوتم شەوانە نەبێ کە دێ چۆل دەبوو دەچوومە سەر ئاو. لێرەدا بەجێی دەزانم کە ئەوە بڵێم، ئاوەدان بێت کوردوستانی عێراقێ. گەر لە دونیادا پیاوەتی هەبێت لە کوردوستانی عێراقێ هەیە، لە هیچ جێگای تر نییە. ئەوەی من بە چاوی خۆم لە عێراقێم دیوە دە تاریف نایەت. وەختی زۆر دەوێت بۆ باسکردنی. کوڕە جا پیاوە گەورەکانیان چەند بە تەآسوفن[1].

بەڵێ، پیرە حەمەدە مەولوودیان دوو مانگان لەو گرتووخانە بۆ ئەو گرتووخانەیە هەڵدەداشت. پاشان هێنایان بۆ حدودی و تەسلیمی ئێرانیان کرد. جا سەیر ئەوە بوو کە سەرهەنگ شوکری دەگەڵ ئاغاوەتی پیران و مامەشی هاتبوو بۆ پۆستی «گەرووی شینکی» بۆ پێشوازی حەمەدی مەولوودە مەنگوڕی. سەرهەنگ من باش دەناسێت و دوو جاران لە گرتووخانەی ڕواندزی منی دیبوو، کە چاوی بە پیرە حەمەدی دەکەوێ، تووڕە دبێت و بە پۆلیسەکان دەڵێ:

---

[1] پێدەچێت مەبەستی کاپیتان "تەعەسوب" کە هەمان وشەی "تعصب"ە کە لە عەرەبییەوە پەڕیوەتە ناو زمانی فارسی. کوردی ڕۆژهەڵاتیش لە زمان فارسانەوە ئەو وشەیە بەکار دێنن. بۆ وێنە دەڵێن: کابرا لەسەر میللەتی خۆی چەند بە تەعەسوبە، واتە کابرا چەند هەستی نەتەوەیی توند و پتەوە.

— عجب حمدی مولودی برای من آوردی!؟ این چیه؟ این چه حقەبازیە؟ [یانی: ئەوە چ حەمەدی مەولوودێکە بۆتان هێناوم؟! ئەوە چییە؟ ئەوە چ ساختەکارییەکە؟]

— پۆلیسەکان دەڵێن: قوربان لە زینوێ و خەلانێ لەو حەمەدی مەولوودەی زیاتری لێ نییە.

سەرباقی ئەوەی باش دەزانن کە ئەو حەمەدە هەمان حەمەد نییە کە ئەوان بە شوێنیدا عەودالن، دیسان ئەو داماوەی بەرەڵلا ناکەن و لە خانێ و نەغەدە و ڕەزایە و چەند جێگای تر دەیگرن. جا وەرە حەمەدی مەولوودی وەبەر دەستی ئەمنییان بکەوی. جا بۆ کەوڵی ناکەن؟

وەک بۆخۆی دەیگێڕایەوە لە هەموو شارەکان لە گرتووخانەیان هاویشتووە و تا بۆیان دەرکەوتووە کە ئەوە هەمان حەمەد نییە کە لێی دەگەڕێن، کەوڵیان لە حاجەت خستووە هێندەی ئالووز و جەزرەبە و ئازاری بدەن. جا با بۆخۆی بۆتان بگێڕێتەوە. هەر باس ناکرێ کە چییان بەسەر ئەو داماوە هێناوە. پاشی ئەوەی کە یەک دوو مانگ دەیگرن، ئەوجار تەسلیم بە عێراقیی دەکەنەوە. من ئەوە هەر دەکوونەکەی ماڵە «پووره پەریزاد»ـی دام. شەو بوو لەپڕ خەبەریان دامی کە ئەوە حەمەد مەنگوڕ هاتەوە. منیش خۆم پێنەگیرا و بەو شەوە وەدەرکەوتم یەکسەر بۆ زینوێ. شەو درەنگ بوو کە گەییشتمە زینوێ. یەکڕاست چوومە ماڵە حەمەدی تا بزانم چ باسە! کە چووم دیتم چەند کەسێک لە خەڵکی دێی پێیەوە هاتوون و گەرمی قسانن. کە وەژوور کەوتم و چاوی بە من کەوت، دەهری بوو، ئەوەی دەیگوت نەیدەگوتەوە.

— ڕەببی ماڵت خەرا بێ وەکی خەرا بووە. ئەوە چ کارێک بوو دەگەڵ منت کرد هەی ...

منیش سەرم داخستووە و متەقم لێنایەت و ناوێرم بڵێم لەل، هەر کە دەمهەوێ زار هەڵپچڕم، برینی دەکولێنەوە و بە دەنگی بەرزەوە تووک و دۆعام لێدەکات و قسەم پێدەڵێ. ماڵی خەڵکەکە ئاوەدان بێت، کەمیکیان هێوەر کردەوە بەڵام ئەوە هەر بە پێوەم و نە کەس دەوێری خوڵقم بکات تا دانیشم و نە خۆم دەوێرم جووڵە بکەم. باش بوو خەڵکەکە کەمێکی تر دڵیان داوە و هاتەوە سەر خۆ جا ئەوکات دایانیشاندم. کە تەماشای حەمەدیشم دەکرد ئەوەندە لاواز بووە کە وەک داری ڕەقی لیهاتووە، بەزەییم بۆی پێدا دەهاتەوە. حەمەد وەردەوردە زاری قسانی کرانەوە و دەستی کرد بە ڕاز و گلەیی. بۆی گێڕاینەوە کە چی بەسەر هاتووە و چۆنیان بە دەست بەستراوی ئازار داوە. بڕوا بکەن ئەو دەیگێڕایەوە من دەترسام. قسەکانی تا درەنگایەکی شەوی خایاند و پاشان خەڵکەکە بڵاوەیان کرد و منیش چوومەوە بۆ خەلانێ بۆ ژوورەکەی خۆم.

بۆ بەیانی شێخ عەلائەدین ناردی لەدووی حەمەدە مەنگوڕ و هات. لەولاشەوە شێخ کوڕەکانی بە دوای مندا نارد و هاتن منیان دەگەڵ خۆیان برد بۆ لای شێخی. کە چووم، شێخ لە سابات بوو و چەند نەفەری سۆفی لەلا بوو کە دەستە و نەزەر ڕاوەستابوون. حەمەدە مەنگوڕیشی دانابوو قسەی بۆ دەگێڕایەوە کە چی بەسەر هاتووە و لە ئێران و عێراق چییان لێکردووە و چۆن بەدەست بەستراوی زەحمەت و ئازاریان داوە. منیش کە وەژوور کەوتم و سڵاوم کرد، گوتی:

— ئەوەتا کەڵەگاکەم، هەی ڕەببی بەخێر نەیەی.

شێخ زەردەیەکی هاتێ و منیش ناوێرم هیچ بڵێم. هەر ئەو بەسەرهاتی خۆی دەگێڕایەوە و شێخیش پێدەکەنی. حەمەد مەنگوڕ ئەوەندە داخ و ڕقی لە من بوو کە بەسەرهاتەکەی خۆی دەگێڕایەوە بۆ شێخی، سیلەیەکی چاوی هەر لە سەر من بوو بەڵام لەبەر شێخەکان نەیدەوێرا لەبزی بگەڕێ. پاش تاوێکی کە لەوێ گوێمان بۆ بەسەرهاتەکانی حەمەد هەڵخست ئەوجار شێخ گوتی: بڕۆوە بۆ ژوورەکەی نەوەکوو پۆلیس یا کەسێک بێت و بزانن لێرەی. عەبدولقادر کوڕی دەگەڵ ناردم و چوومەوە بۆ ژوورەکەی خۆم[1]. قەت ناتوانم چاکەی شێخی زینوێم لەبیر بچێت. ئاخر ڕێک پاشی هاتنەوەی حەمەدە مەنگوڕی، حکومەتی ئێران زانی کە کڵاوی چۆتە سەری بۆیە، بەتووندی دەسەر حکومەتی عێراقیی کرد کە بمگرن و تەسلیمم بکەنەوە. حکومەتی عێراق باش دەیزانی کە حەمەدە مەنگوڕیان لەباتی من گرتووە و تەسلیم بە ئێرانیان کردۆتەوە ئیتر ئەوجار ئاوای بۆ ناچێتە سەر و دەبێ بمگرێت و ئەو کێشەیە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە. بە قوربانی شێخی زینوێ بم، وای باڵ بە سەرمدا کێشابوو کە کەس نەیدەوێرا بۆ لام بێت. تەنانەت هەڕەشەی لە حەمەدە مەنگوڕی کردبوو کە بێتو زمانی هەلخلیسکێ، زمانی لە پشت سەری ڕا دەردەهێنێ. هەرچی لێیان پرسی تۆ، هەر بڵێ ناوم حەمەدە و بابم مەولوودە. گەر وا بڵێی هیچیت بۆ نابێ و لەکۆڵت دەبنەوە. بابم بەقوربانت بێ شێخ، ئاخر کێ ئەوکارە دەکات کە گیان و ژیانی خۆی و مریدەکانی بۆ کوردێکی ئاوارەی وەک من دە مەترسی بهاوێت. ئەوەی شێخ دەیکرد پێشمەرگایەتی بوو، کوردایەتی بوو. ئەوکاتە کە من لە عێراقێ بووم، شێخ کوڕێکی هەبوو نێوی «مستەفا» بوو. حەیف کە دە حیزبی شیوعیدا بوو. زۆر کوری چاک بوو. ئێستا کە قوتابی عێراقی دێن بۆ شۆڕەوی و لە زمان ئەوان دەبیسم کە مستەفا زۆر گۆڕاوە بەداخەوە.

ئەوە چەند مانگە لەو ژوورە تەسکەدا خۆم حەشار داوە. وەک دیل و زیندانی وام. هەر بە درەنگایی شەو ئەویش بۆ سەرئاوێ دەهاتمە دەر. لەولاشەوە پۆلیس وەک داڵ لێمدەگەڕێن تا بمگرن و تەسلیم بە ئێرانم بکەنەوە. زۆر دەترسام بە شوێنم بزانن و بەسەرم دادەن و بمگرن.

---

[1] سەبارەت بە بەسەرهاتەکەی ئەو "حەمەدی مەلودە مەنگوڕ"ـەی، بەڕێز "سەید عەبدولڕەحمانی حوسێنی نەقشبەندی"، لە کتێبی (سادات نقشبندی و جنبشهای ملی کرد در گذر تاریخ) وەرگێڕانی محمد بانەای، چاپی "ارومیە – موسسە انتشاراتی حسینی" لە لاپەڕەی ۲۰۵دا ئاماژەی پێداوە کە لەبەر گرینگی باسەکە، دەقە کوردییەکەیم لە لاپەڕەی ۳٥٦ داناوە.

## غەنی بلووریان

شەوێک بەفرێکی زۆر باریبوو. وڵات سارد و بەستەڵەک بوو. کوڕەکانی شێخ عەلائەدینی هاتنە ژوورەکەم و ئاگاداریان کردمەوە کە چەند مریدێکی سابڵاغی هاتوون و لە خانەقایەن تا بچم بۆ ئەوێ و بیانبینم. دڵم خۆش بوو و دە دڵی خۆمدا گوتم باشە دەگەڵ ئەو سابڵاغییانە چەند کاتێک بەسەر دەبەم و کەمێک خەبەریان لێ وەردەگرم. هەستام چووم. ئەو شەوە تا درەنگانێکی لەلایان بووم. پاشان هەستام کە بچمەوە بۆ ژوورەکەم، کەچی کوڕەکانی شێخی گوتیان لێرە بنوو، تازە شەو درەنگە و کەس نایەت، بەیانی نانەکەت بخۆ و بڕۆوە ژوورەکەت. منیش لەخودام تەڵەب بوو کەمێک زیاتر لەوێ بمێنمەوە. شەومان درەنگ کرد و بۆی نووستین. دەشیرین خەو دابووم وەختێک بەخۆم زانی زەلامێک سواری سەرم بووە. زەندەقم چوو و زۆر ترسام، دە دڵی خۆمدا گوتم کارم تەواوە تازە، گیرام. کە خۆم ڕاتەکاند، تەماشام کرد کابرا پێدەکەنێ. بە دەنگی ڕا ناسیمەوە کە «غەنی بلووریان»ـە.[1] ڕابوومەوە و دەستمان کردە ملی یەکتری. لە خۆشییان بە هیچ لێکنەدەبووینەوە. ئەو شەوە تا مەلابانگدانێ هەر قسەمان کرد و بەسەرهاتەکانمان بۆ یەکتر باس دەکرد. غەنیش ڕایکردبوو. کوڕێکی دی دەگەڵ بوو نێوی «محەممەد شاپەسەندی» بوو بەڵام ئەو شەکەت بوو و بۆی کەوت و نووست. ناحەقیشی نەبوو ئەو داماوە، لەقسان دە بەفری حاجی ئۆمەراندا بەجێدەمێنێت و بە زەحمەت گەیبوویە خەلانێ. خەڵک خەبەر بوونەوە بۆ نوێژکردن و منیش «غەنی»ـم هەڵگرت بردمەوە ژوورەکەی خۆم، گوتم با خەڵک لە نوێژان ببنەوە و نەمانبینن پاشان دەچینەوە بۆ خانەقایە. غەنیش وەک خۆم تەمبەڵ بوو لە نوێژکردن دا. حەزی لە نوێژ نەدەکرد. پێشتر کە لە خانەقا دەنووستم، بەیانی زوو سۆفییەکان ڕاستیان دەکردمەوە. دەبا بەو سەرمایەی بڕۆم لەسەر حەوزێ دەستنوێژان بشۆم. ئەوجار بێمەوە خانەقایە و نوێژ بکەم ئەویش بە جەماعەت. پاشان سۆفییەکان چەند نوێژێکی دیکەیان دەکرد و منی سەربەقووڕیش ناچار بووم تا لێدەبوونەوە نوێژم کردبایە. ئەوەندەی لە خەلان بووم، ئەوەندەم نوێژ کرد کە گەر پەنجا ساڵ نوێژ نەکەم، قەرزدار نابم هیچ، قەرزی پێشووشم داوەتەوە. تا بەهار داهات غەنی دەگەڵم لە خەلانێ بوو پاشان ئەو ڕۆیی بۆ «سولێمانی». ئەو سابڵاغییانەی دەگەڵیشم بوون و کاتی خۆی پێشمەرگە بوون ئەوانیش دەیانهەوێ بچن بۆ شارەکانی تر و لەڕێگا کە دەیانگرن دەڵێن ئێرانین. هەمویان گرتبوون و لە کەرکوک ڕایانگرتبوون و حکومەت پارەشی دەدانێ. منیش بەخێر عێراقیم و تەسکەرەم هەیە و ئەو دەردەم دەدەنێ. ناوێرم تاو ببینم. شەو و ڕۆژ لە ژوورێکی تەسک و ناخۆش دام کە هیوادارم بەنسیب دوژمنیشم نەبێ. لە ترس و دڵەڕاوکەیەکدا دەژیم نەبێتەوە. ڕۆژ بەدوای ڕۆژ ژیانم زیاتر پێ تاڵ دەبوو.

---

[1] مامە غەنی بلوریان لە کتێبی بیرەوەرییەکانی خۆیدا بە ناوی ئاڵەکۆک و لە لاپەڕەی ٨٠ باسی ئەو سەفەری دەکات و دەڵێ کە لە کۆتایی مانگی ڕەشەمەی ساڵی (١٣٢٦هـ/١٩٤٨ز) ڕووی داوە.

## گەڕانەوەی بۆ ناوچەی مەهاباد

ئەوکات حەمەدەمینی برام لە کەرکوک گیرابوو. کاخەزم بۆ نووسی کە کارێکی وا بکە لە گرتووخانە ڕابکەی و بێیە لام. بە کۆمەگی «کوڕی شێخ ئەحمەدی خانەقایە» لە گرتووخانە ڕایکرد و خۆی گەیاندە من لە خەلانێ. چەند نەفەر ئازەربایجانیش کە کاتی خۆی دیموکڕات بوون لە تەورێزێ دەگەڵم لە خەلانێ بوون. دوو کەسیان برا بوون بەناوەکانی «پولاد» و «بولود».[1] ئەوانیش کاتێک کە شێخی زینوێ دەچێتە هەولێری، پولاد دەچێتە لای شێخی و داوای لێدەکات کە شێخ کارێکی وا بکات ئەوان بێن بۆ زینوێ. شێخیش هەر پێنجیان دێنێت بۆ زینوێ. ئیتر ئەو جەماعەتە هەمووومان لە زینوێ و خەلانێ خڕ بووینەوە و ئاگامان لە یەکتر هەبوو. ڕۆژێک شێخ عەلائەدین پێیگوتم:

— حەمەد، ئەوە دەچم بۆ بەغدایە کارم هەیە. بۆتۆش دەچمە لای سەید عەلی حیجازی، دەستی لێهەڵناگرم تا تۆ ئازاد نەکات.

— بەبابەوەت بەقوربان بم، لە دونیا و قیامەت تۆ شک دەبەم.

شێخ چوو بۆ بەغدایە و پاشی چەند ڕۆژێک گەڕایەوە. عالەمەکە هەمووی چوون بەپیریەوە من نەبێ کە لەترسی پۆلیسان نەمدەوێرا خۆم وەدیار خەم. کە خەڵکەکە هەموو دەگەڵ شێخی هاتنەوە بۆ ناو دێی، کاتێک کە دەورەی چۆڵ بوو و تەماشام کرد پۆلیس لەوێ دیار نین، چوومە خزمەتی و زیارەتم کرد. فەرمووی:

— حەمەد وەدەرکەوە، بۆ هەرجێگایەک دەڕۆی ئازادی.

---

[1] سەفەرخان قەهرەمانیان لە کتێبی بیرەورییەکانی خۆیدا بەناوی خاطرات صفرخان – سی و دو سال مقاومت در زندانهای شاه – در گفتگو با علی اشرف درویشیان – ل ٨٣ سەبارەت بەو دوو کەسە ئاوا دەنووسێ: (ئەو دوو کەسە (پولاد و بوڵوت) لە کاتی شۆڕشی بۆڵشویکییەکانی دژی تزاری ڕووس لەساڵی ١٩١٩ هەڵدێن و دێن بۆ لای ئێران و دەگیرسێنەوە. هەڵبەت زۆر منداڵ بوون کە هاتن بۆ ئێران. زۆر لەزەبر و بەغیرەت و شەڕکەر بوون. لە دوای گەلاوێژی ساڵی ١٣٢٠ ئەو دووانە لە ناوچەی مەراغەی بۆخۆیان دەستەڵاتدار بوون. هەوەڵەکان دەگەڵ ئێمە بوون. ئەوانە لە ناوچەی مەراغە دوو یا سێ مانگان دەگەڵ دەوڵەت شەڕیان کرد. پاشان دۆڕان و هەڵاتن بۆ کوردستان تا ئاخری تەمەنیشیان لە کوردستان مانەوە). مامۆستا هەژار موکریانی لە کتێبی چێشتی مجێوردا لە زمان کاپیتان حەمەدی مەولودەوە دەڵێ (بڵوت قەدەرێکیش چەتەی مستەفا خانی خوێریاوا بوو). هەڵبەت بەو مانایەی کە چەکداری مستەفا خانی خوێریاوا بووە، دەنا مستەفا خان، ئاغا و مڵکدار بووە نەک چەتە. بەو بەدواداچوونەی کە بۆم کردووە ئەو دوو کەسە لە گوندی "قەرەداغ" لە ناوچەی شامات نیشتەجێ بوون. دوو نەفسەری فیرقەی دیموکڕاتی ئازەربایجان بوون کە پاش تێکچوونی کۆمارەکەیان لە تەورێز، هاوڕێ دەگەڵ کۆمەڵێک لە ئەفسەرە فارس و ئازەرییەکانی تر ئاوارەی کۆماری کوردستان بوون و پاش ڕووخانی کۆماری کوردستانیش پەنایان بردە باشووری کوردستان (عێراق). ماوەیەک لە زیندانەکانی ئەو وڵاتە دەگیرێن. پاشان دەگەڵ "صفرخان قهرمانیان" لە زیندان ڕادەکەن و لە سێبەری شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی (کەمالیزادە) لە زینوی و خەلانی، خۆ حەشار دەدەن.

لە جێوە داهاتمەوە و قۆندەرەکانیم ماچ کرد. ئیتر لەوڕۆژەوە ترسم لە پۆلیسان نەما و ئەوانیش کاریان بە من نەبوو. ئەوکەڕەت بە ئاشکرا دەچوومە زینوێ و ڕایەتێ. ڕۆژانە دەنێو خەڵکیدا بووم و بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ دەخولامەوە. بەوجۆرەی ڕامدەبوارد و تامم لە ئازادی دەکرد. پێشتر لەبەر برینی خۆم ئاگام لە ماڵ و منداڵم نەبوو. ئێستا کە ئازادم و دەتوانم لە عێراق بە ئازادی بژیم، خەمی منداڵان خەوی لەچاوان هەڵگرتووم. زۆریان ئارەزوو دەکەم. نەمدەزانی چۆنیان ببینم. لە لایەکیش پێمخۆش بوو کۆنەدۆست و هاواڵان لە ناوەوە ببینمەوە و بیاندوێنم تا بەشکوو بتوانین دیموکڕات ساز بکەینەوە و سەرلەنوێ دەستپێبکەینەوە. «پولاد» و «بولوت» زۆریان حەز دەکرد بچنەوە بۆ عەجەمستانێ و سەردانی ماڵ و منداڵانی خۆیان بکەنەوە، بەلام هیچ دەرەتانیان نەبوو. نە ڕێگا بەڵەد بوون نە دەیانوێرا. دەبوایە هەموو ڕێگاکە بەڵەدێکیان دەگەڵ بوایە. ڕۆژێک باسەکەم لەکن کردنەوە گوتم با بزانم هەر وا تامەزرۆن بۆ چوونەوە، پێمگوتن:

— من زۆر ئارەزووی ماڵ و منداڵەکانم دەکەم، ئەدی ئێوە؟ حەز ناکەن سەردانێکی وڵات بکەنەوە؟ دڵتان نایهەوێ بچنەوە ناو خەڵکی خۆتان؟

— بەرێوەڵڵا لە خۆداشمان تەڵەبە بەڵام چۆن؟ خۆ لە سنوور ئاودیو بین دەگیرێین.

— خەمتان نەبێ، من هەموو ڕێگاکە بەڵەدم و خەڵکەکە هەموو دەمناسن و تا لای میاندواوێتان دەبەم و لەوێش ڕا بۆخۆتان بەڵەدن و بە هاسانی دەتوانن بچنەوە بۆ ناو خەڵکی خۆتان و پاشانیش یەکدەگرینەوە و دێینەوە بۆ ئێرە. نایهێڵین کەس پێبزانێ.

— ئەدی ئەگەر گیراین؟

— تفەنگان پەیدا دەکەین و لەڕێگا هەرکەس پێشمان پێبگرێ تەقەی لێدەکەین. گەر تفەنگمان پێبێت کارمان هاسانترە.

— ئەدی چۆن تفەنگ پەیدا کەین؟

— هاسانە، من ئەوە دەمانچەیەکی برنەوی درێژم هەیە و بۆ ئێوەش شتێکی پەیدا هەر دەکەم.

کە زانیم ئەوان ڕازین، گورجێکی چوومە لای شێخی و گوتم:

— یا شێخ گەر ڕات لەسەر بێت، من و ئەو عەجەمانە زۆر ئارەزووی منداڵەکانمان دەکەین و دەمانهەوێ بڕۆین بۆ لایان و بیانبینین.

— دەی زۆر باشە بەڵام دەبێ ئاگاتان لەخۆتان بێت.

— بەسەرچاو هەر وادەکەین بەڵام گەر تفەنگمان پێبێت کارمان هاسان دەکاتەوە. ئەگەر جەنابت کۆمەگمان بکەی و لە خەڵکی دێیەکە پێنج تفەنگی خەراپۆکەمان بۆ وەرگری زۆر باش دەبێ.

— ئاخر ناتانگرن؟

— قوربان گەر ئێوە هیممەت بکەن و دوعای ئێوەمان لەپشت بێت ناگیرێین. من لەخۆم ڕادەبینم.

— دەی زۆر باشە، با بزانم.

قەت چاکەی ئەو شێخە ناتوانم لەیاد بکەم. هێندەی پێنەچوو ٣ تفەنگی پێنجتیر و سێتیری لە ڕەعیەتەکان هەستاند و دایمێ. ئێستا دوومان بێتفەنگ مابووینەوە.[1] چوومە لای «مینەی عەلی ئاغای» ڕایەتی و دوو تفەنگم لەویش وەرگرت و بۆ لای شەوێ خۆمان ساز کرد بۆ ڕۆییشتنەوە.

شەو کە تاریک داهات، وەرێکەوتین و حدودمان تێپەڕاند. شەوانە شەوڕەومان دەکرد و بە ڕۆژیش خۆمان حەشار دەدا تا چووینە «شامات»ـی[2]. من لەوێ بەڵەد نەبووم پولاد زۆر باش بەڵەد بوو. لەوێ چووینە ماڵێکی کابرا دۆستی پولادی بوو.[3] ئێوی «کەریمی زارایە» بوو. نازانم «سوڵتان ئاغای شێخ ئاغایی»[4] لەکوێ زانیبووی ئێمە لەو ماڵەین، پیاوێکی خۆی ناردبوو بەدواماندا کە دەبێ بێن بۆ ماڵە ئێمە. ئێمەش هەستاین چووین. تەماشام کرد بۆخۆی لە قەراغ دێی چاوەڕێمانە و هەموومانی برد بۆ ماڵە خۆی و زۆری حورمەت لێناین و سێ شەو و ڕۆژان نەیهێشت بڕۆین و دەپڵاو و گۆشتی گرتین. ئەو ماوەیەی کە لە ماڵە سوڵتان ئاغا بووین زۆرمان قسە لەسەر خۆمان کرد کە چ بکەین و چ نەکەین؟ ئەو فکرەمان هاتە سەر کە بڕۆین بۆ ئازەربایجانی شۆڕەوی و هەموومان لەسەر ئەو بڕیارە کۆک بووین. سوڵتانئاغا کە زۆری پێباش بوو ئەو کارە بکەین گوتی دەنێرمە لای «سەیدی زەمبیلی»،[5] ئەگەر گوتی بڕۆن، باشە دەنا. مەڕۆن. چەندی هاوارم کرد کە شێخ و شتی پێناوێ، چکارمان داوە بە شێخ؟ لەولای ڕا پولاد هەڵیدایە:

— من بە قسەی شێخ دەکەم، من دەزانم چ سەیدێکی گەورەیە.

— گوتم ئاخر تۆی عەجەم چکارت داوە بە سەیدی زەنبیلی ماڵ خراپ؟

— دەنا دایکم مرێ و بابم مرێ، بێ ئیزنی شێخ لە جێی خۆم نابزووم.

ئەوجار وای لێهاتبوو کە سوڵتانئاغا دەستی هەڵگرتبوو و دەیگوت کە پێویست ناکا پرس بە شێخی بکەن بەڵام پولاد پێی چەقاندبوو کە هەر دەبێ پرسی پێبکەین! بەو شەوەی سوڵتانئاغا پیاوێکی نارد بۆ لای سەیدی زەمبیلی و پرسی پێکردبوو، شێخێش گوتبووی نەکەن بڕۆن. لەسەر قسەی شێخی پەکمان کەوت و ئەو فکرەمان لەبیر خۆمان بردەوە. شەوێکی کە بۆ خەوتنان چووینەوە ماڵە کەریمی زارایە، بیرمان لەوە دەکردەوە کە ئێمە ئاوا بە پێیان ئەولاوئەولا بکەین تێدادەچین، باش وایە سەرەو ئەسپێک بۆخۆمان پەیدا بکەین. پولاد گوتی:

---

[1] کاپیتان ڕوونی ناکاتەوە کە دەو سەفەرەیاندا کێ و کێ دەگەڵیەتی. لە قسەکانی کاپیتان حەمەد ڕا وا دەردەکەوی کە ٥ کەس بوون. ١-"بولوت"، ٢-"پولاد"، ٣- کاک حەمەد، ٤- " عیسا" کوڕێکی سنەیی ٥- "صفرخان قهرمانیان"

[2] محاڵی شامات ناوچەیەکە لە ڕۆژئاوای شاری میاندواو و لە باشووری گۆمی ورمێ و ڕۆژهەڵاتی محاڵی شاروێران و باکووری محاڵی چۆمی مەجیدخان هەڵکەوتووە. چەند گوندێک لەخۆ دەگرێت کە زۆربەیان کوردنشینن.

[3] بە پێی گێڕانەوەی کاپیتانی کە لە داهاتوودا دەیخوێنینەوە ئەو گوندە ناوی تاڵاو بووە.

[4] بۆ ناسینی ئەو تێکۆشەرە بڕوانە لاپەڕەی ٤٦٩ی ئەم کتێبە.

[5] لە زاراوەی موکریاندا زۆرجاران جێگای دوو پیتی "ن" و "م" دەگۆڕدرێ وەک ئەنبار بۆ ئەمبار. حەمباڵ حەنباڵ. لێرەش زەنبیل کراوە بە زەمبیل. نووسەر هەوڵ دەدات کە وشەکە لەوەلا وەک ماکی خۆی بنووسێتەوە.

— من ئەو نێوەی هەموو بەڵەدم. خەڵکەکەی هەموو دەناسم و دەمناسن. «سارم ئاغا»ـیەک هەیە زۆر زاڵمە دەگەڵ خەڵک، ئەسپی چاکیشی هەیە، بۆ نەچین خۆیەک بە تەویلەکەی دادەین و ئەسپی خۆمان دەرکێشین و بڕۆین؟

هەموومان لەسەری ڕێک کەوتین و شەوێک چووین سێ بارگینی باشمان لە تەویلەکەی دەرکێشا. ئێمە پێنج کەس بووین، دوو ئەسپی دیکەمان پێویست بوو. پولاد گوتی:

— تازە کە وای لێهات، لە فڵانە دێی، (کە نێوەکەم لەبیر نەماوە)، کوێخایەکی لێیە لە ئاغاکەی بەدفەڕترە، با بچین سەری ئەو چاکەینەوە بەشکوو لە تەویلەی ئەودا ئەو دوو کەسەشمان بکەین بە سوار.

دێیەکە نیزیک بوو. من و پولاد چووینە تەویلەی کابرای و هاواڵەکانی تریشمان لە قەراغ دێی ئەسپەکانیان ڕاگرتبوو. من و پولاد یەکەو جڵەوی بارگینێکمان بەدەستەوە گرت تا بیکێشینە دەرێ. دەگەڵ لە تەویلەی وەدەرکەوتین، کابرا پێیزانی. من لە دواوە بووم و کووتوپڕ ڕاماڵی دا من. منیش دەستێکم بە جڵەوی بارگینەکەوە بوو دەستێکیشم بە تفەنگەکەمەوە. کابرا ڕۆ بوویە تفەنگەکەم. نێوقەدی تفەنگەکە بەدەستی من بوو قۆنداغیش بەدەستی ئەو. کابرا تفەنگەکە ڕادەکێشێت و منیش نایدەمێ. هاوکات کردی بە قیژەقیژێک نەبێتەوە. پێم شوورەیی بوو تفەنگم لەدەست دەربێنێت و بکەومە بەر تیزان، بۆیە هەرچۆنێک بێت جڵەوی بارگینم دەورێک لەدەستم هاڵاند و هەر بەو دەستەشم دەستم برد بۆ دەمانچەکەم تا فیشەکێکی تێسرەوێنم، چاک بوو پۆلاد بە فریای هات و تفەنگێکی دەبەر پێی کرد و کابرا تفەنگی منی بەردا و بە هات و هاوار کردنەوە هەڵات. ئێمەش سوار بووین و بۆمان تەقاند. ئەو شەوە تا توانیمان دوور کەوتینەوە و هاتینە شاخەکانی «توتئاغاجی»[1]. ڕۆژ لەوێ خۆمان حەشار دا. بیرمان کردەوە کە ئێستا ئەو کابرایە ئێمەی دیوە و کردی بەو بەزمە، لەوانەیە ئەمنییەی ئەو ناوچانە وەدوامان کەون، باشتر وایە ماوەیەک بڕۆینەوە بۆ عێراقێ بۆ نێو عێلێ، پاشان دیسان دێینەوە. هەر واشمان کرد و بە بارگینانەوە چووینەوە بۆ عێراقێ بەڵام لەبەر شێخی نەچووینەوە بۆ زینوێ، گوتمان تفەنگەکانمان لێدەستێنێتەوە. ماوەیەک لەناو عێلێ بووین و دوای چەند ڕۆژێک دیسان گەراینەوە بۆ ئێرانی. من بە هاواڵەکانم گوت کە جاری پێشێ لەبەر ئێوە نەمتوانی منداڵەکانم ببینم، ئەوجار دەبێ چاوم پێیان بکەوێتەوە. بۆیە دەبێ ئەوجارە کارێکی وا نەکەین بێینە بەرچاوان. ئەوکەڕەتەش دەگەڵیان چوومەوە بۆ لای «تاڵاو»ـی[2] ماڵە ئاشناکەی پولادی. خاوەن ماڵ گوتی لەوکاتەیەوە ئێوە بارگینەکانتان لە سارمی دەرکێشاوە، وەک سەگی هاری لێهاتووە و پیاوەکانی لە گیان ئەو خەڵکە بەربوون. دەست لەکەس ناپارێزن. کە ئەوەمان بیست ئاورمان گرت و گوتمان دەبێ عاقڵیان کەین. هەستاین چووین لەسەر ڕێگای پیاوەکانی سارمی، سیلەمان داکوتا. ماشێنێک هات و ڕامانگرت. چەند نەفەر سابڵاغیی ناسیاو و چەند ئاشنایەکی پۆلاد و ئەفسەرێکیش دەگەڵ ژنەکەی دە ماشێنەکەیدا بوون. ئەفسەر و ژنەکەییمان هێنانە خوارێ لە ماشێنەکە و پولاد

---

[1] "توت ئاغاچ" گوندێکی کوردنشینە کە لە ١٥ کیلۆمیتری باکووری مەهاباد هەڵکەوتووە.

[2] "تاڵاو" گوندێکە لە محاڵی شامات و لە ٢٤ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای میاندواو هەڵکەوتووە.

ئەفسەری داگرت. ژنەکەی دەستی کرد بە گریانێ. کە ژنە دەگریا زگم زۆر پێی سووتا. هەرچەند ئەوانە زگیان بە ژن و منداڵی ئێمە ناسووتێت. سەرباقی ئەوەش داوام لە پولادی کرد کە بەسیەتی و لەوە زیاتر دایمەگرە. کوڕێکی سنەییمان دەگەڵ بوو نێوی «عیسا» بوو، ئەویش خۆی لێخۆشکردبوو کە هەر دەیکوژم بەڵام نەمهێشت. کەمێکمان قسە دەگەڵ ئەفسەرەکە کرد و هەڕەشەمان لێکرد کە خەڵکی زەحمەت نەدات. تەگەری ماشێنەکەمان لە کار خست و بەجێمان هێشتن بەڵام کابرای ئەفسەر بارگە و بنەیەکی زۆری پێبوو هەموومان لێئەستاند و بارمان کرد و دوور کەوتینەوە.

یەکڕاست چووین بۆ لای سندووسی[1] (نێوی دێیەکەم لەبیر نەماوە) و لەلای ئاشنایەکی «سەفەرخان»[2]ماینەوە. کابرا ئەو بارگە و بنەیەی ئەفسەرەکەی کە پێمانبوو، بردی لە دەشتی تاقەتی کرد و ئێمەشی بردە نێو بێستانێکی کە هەمووی گوڵەپێغەمبەرە بوو. دە نێو گوڵەپێغەمبەرەیدا خۆمان حەشار دا. ژن و منداڵی کابرای، نان و چایان بۆهیناین و پاشان لەبەر شەکەتێ تەخت بۆی نووستین تا لای نیوەڕۆیە.

کە هەستاین لە خەوێ، کابرا بە خۆی و ژنەکەیەوە مریشکێکی زۆری ساز کردبوو. پاش نان خواردن بە خاوەن ماڵمان گوت کە ئەو کەلوپەلەمان بۆ بفرۆشە و پووڵەکەمان بۆ بێنەوە. من پێمگوت: دەڕۆمەوە بۆ لای سابڵاغێ و ناتوانم لەسەر فرۆشتنی ئەو شتانە ڕاوەستم، گەر بۆت مومکین دەبێ تۆ ۲۰۰ تمەنم بدەیە با بۆ منداڵەکانمی بەرمەوە. کابرا پارەکەی بۆ هێنام و گوتی ئەگەر فرۆشتم باقی پووڵەکەشت دەدەمێ، بەڵام لەو ۲۰۰ تمەنە زیاتر چاوم بە پارەی تر نەکەوتەوە. پولاد بڕیاری خۆی دا و گوتی من دەچمەوە بۆ «قەرەداغ»[3]ی و سەرێکی منداڵەکانم دەدەمەوە. سەفەرخان و هاواڵەکەشی گوتیان ئێمەش دەچینەوە بۆ «شووشەوانێ»[4] و سەرێک لە منداڵەکانمان دەدەینەوە. گێرە و کێشە زۆرە و لێرە باس ناکرێ.[5] خولاسە ئەوان ڕۆییشتن و تفەنگەکانیان بەسەردا بەجێهێشتم. من و عیسا ماینەوە بە ئەو هەموو تفەنگانەوە. ویستمان لەبەر تفەنگەکان بچینەوە عێراقێ بەڵام ئەوکات دیسان من نەمدەتوانی منداڵەکانم ببینمەوە.

---

[1] "سندوس" ناوی کۆنی محاڵی "نەغەدە"یە. کە ئێستاش بە گوند و دێهاتەکانی ئەوشارە کە دەکەوێتە نێوان سی گۆشەی باشووری گۆلی ورمێ و شاری نەغەدە و سنووری باکوری مەهاباد، دەگوترێ سندوس.

[2] ئەو کەسە صفرخان قهرمانیان ناوێتی. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە لاپەڕەی ٤٣٠ی ئەم کتێبە.

[3] قەرەداغ گوندێکە لە ناوچەی شامات و لە لای ڕۆژهەڵاتەوە ۳۹ کیلۆمیتر لە "تاڵاو" و ٤١ کیلۆمیتر لە میاندواو دوورە و دەکەوێتە ۳۲ کیلۆمیتری باکووری مەهاباد.

[4] ئەو گوندەیە کە سەفەرخان لێی لەدایک بووە و لێی گەورە بووە و خاو و خێزانەکەی لەوێ ژیاون و لە ۳ کیلۆمیتری شاری "عەجەبشێر" هەڵکەوتووە.

[5] سەرم بەسەر هەردووک کتێبی بیرەوەرییەکانی سەفەرخانیدا کرد (خاطرات صفرخان - سی و دو سال مقاومت در زندانهای شاه - در گفتگو با علی اشرف درویشیان. هەروەها لحظاتی از زندگی صفرخان قهرمانیان نووسینی: بهروز حقی) تا بەشکوو باسێک لە کاپیتانی تێدا بدۆزمەوە، بەداخەوە تەنانەت بۆ یەک وشەش باسی کاک حەمەدی نەکردووە. ئەوە بۆمان دەردەخات کە بە دڵهێشاوی لێک هەڵبڕاون و سەفەرخان نەیویستووە باسی کاپیتان بکات.

## دیتنەوەی منداڵەکانم

بە ناقایلی دەگەڵ عەجەمەکان لێکهەڵبڕاین. ئەوان ڕۆییشتن و ئێمەش تفەنگ و فیشکەدانی ئەوانیشمان لەخۆمان قاییم کرد و وەڕێ کەوتین. لە ئاستی «قەرەقەساب»ـی[1] تووشی دەستێک دەروێش بووین کە لە بازاڕی «قەباکەندی»[2] وەڵاغیان کڕیبوو و دەیانبرد بۆ عێراقێ بۆ فرۆشتن. من دەروێشەکانم باش دەناسی. یەکیان «سەید ئەحمەد» بوو کە زۆر هاواڵ بووین. پاشی چاک و خۆشی گوتیان وەرن سوار بن با بەیەکەوە بڕۆینەوە بۆ عێراق. من بە عیسام گوت:

— من دەڕۆمەوە بۆ لای سابڵاغێ و سەرێک لە منداڵەکانم دەدەمەوە و تۆش لەوانە باشترت دەست ناکەوێ، ساز بە دەگەڵیان بڕۆوە بۆ عێراقێ و ئەو تفەنگانەش بدەوە بە شێخی و پاشانیش من خۆم دێمەوە.

عیسام دەگەڵ دەروێشەکان خست و هەر دەروێشە و تفەنگێکیان دە شانی کرد و خواحافیزیمان لەیەکتر کرد. ئەوان ڕۆییشتن بۆ عێراق و منیش وردەوردە بە ڕێگای «مەحمەشە»ـیدا ملی ڕێگام گرت بۆ سابڵاغێ. بۆ لای بەیانی گەیمە باغی «قازی محەممەد»ـی[3] کە چوومە قۆناغێ، باغەوانەکە لە خەوێکی قووڵدا بوو، کە ڕاستم کردەوە و سەری هەڵێنا و منی بینی بە تفەنگەوە لەسەر سەری ڕاوەستاوم، لە ترسان قسەی بۆ نەدەهات. من ئەوم زوو ناسییەوە کە «مستەفای کوڕی مرادی بەفرفرۆش» بوو. مستەفا خۆی پێشتر پێشمەرگەی کوردوستان بوو. بە هێدی و هێمنی دواندم و پێمگوت کە مەترسە و من حەمەدم. کە ناسیمیەوە، ڕاست بۆوە و شاڵاوی بۆ هێنام و دەستی هاویشتە ئەستۆم و یەکترمان وەبەر ماچان دا. ئەوجار زوو خۆی خڕ کردەوە و ژنەکەشی نان و چای حازر کرد. پاشی نان خواردن بێخەوی و شەکەتی هێرشی بۆ هێنام. ئەوانیش لەناو بێستانی جێگایەکیان نیشان دام و گوتیان لێرە بنوو، ئێرە ئەمینە. پێش نووستنم بە مستەفام گوت کە چووی بۆ ناو شار، بە خورشیدی ژنم بڵێ حەمەد لە باغییە. کارێکی وا بکە منداڵەکان بێنێت و بێت. منیش چووم کە بنووم بەڵام لەو شوێنە نەنووستم کە نیشانی دام، چووم بۆ باغی «حاجی کاکە مینی» کە لەو باغە دوورتر بوو. هەرچەند لەبەر مەترسی خۆم و لەخۆشی دیتنەوەی منداڵەکانم لەسەر هەست نووستم و نەمهێشت شەکەتی بە سەرمدا زاڵ بێت، بەوحاڵەش سەرخەوێکم شکاند. پاشی خەوێکی کورت و خۆش، هەر وا کە ڕاکشا بووم، چاوم لە ئاسمانێ بڕی

---

[1] ئەوگوندە ئێستا سەر بە شاری نەغەدەیە و لە ١١ کیلۆمیتری باشووری "محمدیار" و لە ٣٤ کیلۆمیتری باکووری شاری "مەهاباد" هەڵکەوتووە.

[2] ئەو گوندە لە ١٠ کیلۆمیتری باشووری میاندواو هەڵکەوتووە و لە کۆنەوە بازاڕێکی وەرزانەی بەر و بوومی گوندنشینانی لێیە و لە ناوچە دوور و نیزیکەکان ڕا دەستکردی لادێیی و مەڕ و ماڵاتی لێدەفرۆشرێت.

[3] ئەو باغە بە (باغی ساوا) بەناوبانگ بوو کە باغی پێشەوا قازی محەممەد بووە.

که چەند بڵیند و تەرزە! هەزار ئاوات و ئارەزوو بەبەرچاومدا دەهاتن و دەچوون! دەیان خۆزگە و بریام بەسەر کردنەوە! هیوام دەخواست منیش ژیانێکی تەرازم هەبووایە و وەک بابی خەڵکی، منداڵەکانم لە باوەشی خۆمدا بان و ئاگام لێیان بوایە. بەڵام چ بکەم؟ کوردم و زۆرلێکراو. بەوە دڵخۆشی خۆم دەدایەوە کە منداڵەکانم لەوانەیە ئێستا لێم تێنەگەن بەڵام کە گەورەبوون و زوڵمی عەجەمانیان دیت، دەزانن کە باوکیان بۆ ئەو ژیانەی هەڵبژاردووە؟! ئەوکات دەزانن کوردبوون یانی چی! چاوەکانم کە وا لە ئاسمانی ساماڵ بڕیبوو فکر و خەیاڵ وەک بنێشت لەبەر یەک دەکێشرایەوە. بیرم لەوەی دەکردەوە کە منداڵەکانم ببینم چۆن دەتوانم خۆم ڕاگرم و ورە بەرنەدەم تا بە چەماوم نەبینن؟! تا کات زیاتر تێدەپەڕی، زیاتر ئۆقرەم لێهەڵدەگیرا و دڵەکوتەم هەڵدەکشا و هەناسەم قورستر دەبوو.

شەیتانم بە نەحلەت کرد و هەستام چوومەوە نێو بێستانی و خۆم دەنێو گوڵەپێغەمبەراندا مات کرد. لای چێشتانێ بوو و مستەفا هەر وەدیار نەکەوت. ئەوجار ژنەکەی نان و خواردنی بۆ هێنام، کە لە خواردنێ بوومەوە، ئێدی کەم‌کەم نیگەران دەبووم. لەپڕ تەماشام کرد ئەوە خورشید منداڵەکانی وەپێشخۆی داوە و دەهات چۆن! لەترسانیش زووزوو ئاوڕێکی لە دواوە دەدایەوە کە نەکا کەس ببینێت. دیار بوو کە خورشید بە منداڵەکانی نەگوتبوو دەوبەمە کن بابتان. نەیهێشتبوو کە مستەفاش لە کنیان باس بکات. کە هاتە نێو بێستانی و چاوی بە من کەوت، لە گابۆڕێی دا، دەگریا چۆن! وەک بارانی بەهاری ئاوی بەچاواندا دەهاتە خوار. ئامینی کچم تەمەنی ببوو بە ١٢ ساڵان، خانەی کوڕم ٦ ساڵەیە و فاتمیشم ئەوەندە چکۆلەیە کە نافامێ. ئامین منی ناسییەوە و ئامبازم بوو دەستی دە ئەستۆم کرد. بۆ ئەوەی منداڵەکانم تفەنگ و فیشەکم پێنەبینن و نەکا لەلای منداڵی گەڕەکێ باسی بکەن، پێشتر تفەنگ و فیشەکدانەکەم دە نێو دێراوێکیدا دانا و گیام بەسەر دادان و خۆشم لەوێ دانیشتم. لەوەلاوە خانەی کوڕم کە منی دیت لەناو گوڵەبەڕۆژاندا دانیشتووم، ڕووی تێکردم و وەدەنگهات و گوتی:

— مامە، ڕازی گوڵەپێغەمبەرەیەکی لێبکەمەوە؟

— حەز دەکەی سێیان لێبکەوە بەقوربانت بم. وەرە ماچێکم دەیە.

کە وا بە گەرمی جوابم دایەوە، تەماشایەکی سەیری کردم. دڵخۆش ببوو کە ئیزنم داوە گوڵەشامی لێکاتەوە. ئەو ئێستا منی نەدەناسی. هەر وەیدەزانی من باغەوانم. کە تەماشای دایکی و ئامینی کرد کە دەگرین و منیش دەستێکم دە ملی ئامین و دەستێکیشم دە دەستی دایکی دایە و خۆش‌خۆش ماچیان دەکەم و دڵخۆشییان دەدەمەوە و فرمێسکیان بۆ دەسڕمەوە، گوڵەشامییەکەی دانا عەرزی و هاتە پێشەوە و بە خورشیدی گوت:

— دایە ئەوە کێیە؟

ئەویش بە دەم گریان و هەنیسکەوە جوابی دایەوە:

— باوکتە ڕۆڵە گیان!

پیلی خانەم گرت و هێنامە پێشەوە و بەخۆمەوە گوشی و ماچم کرد و بۆنیم هەڵمژی. دیار بوو باوەڕی نەدەکرد. دیسان دایکی دڵنیای کردەوە، جا دەگەڵم ڕاهات. ماوەی سەعاتێک پێکەوە بووین. وردەوردە ترسم لێ پەیدا بوو کە نەکا سەرباز بێنە سەرم؟ خۆ ئەوانەم لەلا بێت هیچم پێناکرێ و دەگیرێم. ڕازیم کردن کە بڕۆنەوە و بڕێک پارەم پێبوو، دامنێ و بەڕێمکردنەوە. ئەوانم کە بەڕێکردەوە،ماینەوە من و مستەفا. ئەویش دەستیکرد بە پرتە و بۆڵە:

— تۆ زۆر دڵڕەقی و هیچ نەگریای، وای لەو دڵەی ئەتۆ هەتە و...

سەرجەم سێ ڕۆژان لەو باغە بووم. ڕۆژێکیان مستەفام نارد بۆ لای کوڕی قازی تا بێت ببینم. کوڕی ڕەش لای ئێوارێکی پەیدابوو. تا درەنگانێکی بە سێقۆڵی گەرمی قسان بووین و پاشان ڕۆیی.[1] بۆ بەیانی هاواڵەکانم زانییان کە لە باغیم، دیاربوو مستەفا پێیگوتبوون. ئەو ڕۆژە زیاتر لە ٢٠ نەفەر هاتنە لام. هەمووی وەختی خۆی پێشمەرگەم بوون.

---

[1] سەبارەت بەو دیدارە، وتووێژێکم دەگەڵ بەڕێز "عەلی قازی" کوڕی پێشەوای نەمر پێکهێناوە کە دەتوانن لە لاپەڕەی ٤٠٨ ئەم وتووێژە بخوێننەوە.

## قاوەخانەی «قازییاوا»[1]یە

پاشان دەگەڵ «هاشمە کوێری» وەڕێ کەوتم کە بڕۆمەوە بۆ عێراقێ. هاشم پێیخۆشبوو تا لاجانێ دەگەڵم بێت. ئەو شەوە هاتمە «قازییاوایە» کە دێیێکە یەک سەعات لە سابڵاغێ دوورە. لە ڕێیە ڕووم دە هاشم کرد و پێمگوت کە ئەوشۆ حەوسەلەی ڕۆییشتنم نییە. دەمهەوێ ئەوشۆ لادەمە قازییاوایە. کە ڕۆژ بۆوە تا لای شەوێ دەچمە ناو مێشەی و تۆش بڕۆ لە چایخانەی قازییاوایە نان‌ومانم بۆ بێنە ناو مێشەی. گوتی:

— خۆ چایچییەکە کوڕی «مینە کرمانجی»ـیە!

— جا خۆ پێشمەرگەی خۆم بووە و باشی دەناسم، با بڕۆینە وێ.

من لە نێو میشەی ڕاوەستام تا هاشم بزانێ کێ لە چایخانەیە. پاش تاوێکی هاتەوە گوتی:

— دوو قاچاغچی لێیە، یەکیان «ڕەحیم»ـە و ئەویتریان «سوڵتان پشتەگورگ»ـە. ئێستا نان دەخۆن، کە خەڵاس بوون دەڕۆنەوە ناو شار.

ئێمەش تا ئەوان لە نانی بوونەوە لە مێشە خۆمان خافڵاند و پاشان چووینە ژووری چایخانەکە. کە «محەممەدی مینە کرمانجی» چاوی بە من کەوت، لە خۆشییان خۆی دەباوەشی هاویشتم و دەستی کرد بە نووکەنووکێ! پاشان دانیشتین و ملمان دەبەر قسان نا. لە پاڵ قسانداا لێم پرسی:

— دەمهەوێ ئەوشۆ لێرە بمێنمەوە، دەڵێی چی و ناڵێی چی؟

— زۆر باشە. دوو مانگیش دەبێ نە ئەمنییە و نە سەرباز بەو ڕێگایەدا نەهاتوون. حەز دەکەی چەند ڕۆژان لێرە بمێنەوە. بە ڕۆژ بچۆ بۆ ناو میشە یان بۆ شاخ و بە شەوێش وەرەوە ئێرە بنوو.

— زۆر باشە.

کە لە قسان بووینەوە ئەو زوو چۆوە بۆ ماڵێ لەناو دێ و هێلکە و ڕۆنی بۆ هێناین و خواردمان. پاشی نانخواردن پووڵم دا بە هاشمی تا بچێتە شاری و پەستەکێکم بۆ بکڕیت، هاوکات خەوێکی قورس دایگرتم. بە محەممەدیم گوت: لەکوێ بنووم؟ بردمی لەدەرەوەی چایخانە جێگای بۆ ڕاخستم. محەممەدم وشیار کردەوە کە نەکا شتێک ڕوو بدات، زوو ڕاستم کاتەوە. گوتی ئەرخەیان بە و بەڕاحەتی بنوو. تفەنگ و دەمانچەکەم دەبن سەرم نا بەڵام فیشەکدانەکەم پێوەبوو، لێم نەکردەوە. کراسێکی ڕەشی عەجەمیم لەسەرەوە دەبەر کردبوو فیشەکدانەکانی داپۆشیبوو، دیارنەدەکرا کە لەبن کراسەکە چیم پێوەیە. بەو حاڵەوە بۆی چووم لە خەوێکی قووڵەوە. لەپڕ دیتم یێکێک ڕایتڵەکاندم. بە ترسەوە گوتی:

---

[1] "قازیئاوا - قازیاوا" گوندێک بوو لە ٨ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای مەهاباد کە ئێستا وەبن بەنداوی ئەو شارە کەوتووە. پاشان ئەو گوندەیان ڕاگواست بۆ قەراغ ئاوەکەی ئەو بەنداوە کە ئێستا لە ١٠ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای مەهابادە. ئەو گوندە ملکی بنەماڵەی قازی بوو.

— ڕاست بەوە. زووبە خۆت ڕزگار کە. سەرباز و «گوربان» وەسەرت گەڕان.

منیش زوو ڕاپەریم. تەماشام کرد تاو هەڵاتووە و براکەی محەممەد چایچییە و خۆی گەیاندۆتە من تا قوتارم کات. بەپەلە دەستم برد بۆ تفەنگەکانم کەچی، لەوێ نەمابوون. لەتاوان حەواکەوتم و تەماشام کرد ٣ نەفەر گروبان هاتنە بەردەرکی چایخانەی. منیش ئەوە لەبەر دمیانم. ئەوەندە بەختەوەر بووم کە خەبەری منیان نەدابوو، تەنیا خەبەری قاچاغچییان دابوو. هاتبوون قاچاغچییان بگرن. ئەو کەسەی کە خەبەرەکەشی دابوو دەگەڵ گروبانەکان بوو. کە چاوم بەوی کەوت، لە ئەژنۆ بەژێرم مرد. هێزم لێبڕا. ئەو کەسە نێوی «محەممەد» بوو، زۆر چاک منی دەناسی. وەختی خۆی بەیەکەوە لە ڕێگای ڕواندز فەعلە بووین. من بە ملکەچی تەماشاییم کرد تا نەمناسێنێت و بەگرتم نەدات. ئەویش بەچاو تێیگەیاندم کە مەترسێ. گروبانەکان ڕوویان دەمن کرد و لێیان پرسیم کە:

— سۆفی قاترت نەدیوە بەو ڕێگایەدا؟

گوتم نا!

محەممەدی جاسووس نەیهێشت گروبان پرسیاری دیکەم لێبکات و هاتە ناوقسان و پێیگوتم:

— سۆفی حەسەن ماندوو نەبی! ئەوە دەڕۆی بۆ شاری؟

— بەڵێ ئەڕێوەڵا دەچم بۆ شاری.

— ئێستا سۆفی بۆچی بارەگەنمەکەم بۆ نانێری بەس نییە؟

گروبانەکان پرسیان: ئەوە کێیە؟

— ئەوە خەڵکی «سەرووکانی»یە، ٣ مانگە بارێکم گەنم پێ قەرزدارە و بۆم نانێرێتەوە.

گروبانەکە ڕووی تێکردم و کەمێک بە گرژی گوتی: سۆفی بۆچی قەرزەکەی نادەیەوە؟

گوتم قوربان با بڕۆمەوە بەسەرچاو بۆی دەنێرم.

گروبانەکان تەماشای چایخانەیان کرد و بە چایچییەکەیان گوت کە قاترمان ڕای کردووە، ئەدی نەیانگوت کە لە قاچاغچییان دەگەڕێین. پاشان محەممەدی جاسووس بە گوروبانەکانی گوت ئێوە بڕۆن بۆ نێو دێی و منیش تەماشایەکی ئەو دەور و بەرەی دەکەم و دێمەوە لاتان. بەو شێوەیە ئەوانی بەڕی کرد و خۆی لە چایخانەکە مایەوە. کە گروبانەکان ون بوون، ڕووم دە چایچی کرد و نقورچێکم لێدا و گوتم:

— سەگباب کوا تفەنگەکانم؟

— ئەوەتانێ!

لەبەر دەرگای چایخانەکە هەندێک گوڵ چەقێندرابوون، ئەو چایچییە کە دەزانێ گروبان دێن بۆ چایخانەکە، یەکەم شت چاوی بەو تفەنگانە دەکەوێ و یەکڕاست لەبن سەرم دەریان دێنێت لەو جارەگوڵەیان داوێت. هەر چاک بوو گروبانەکان نەیانڕوانیبوو ئەو گوڵانە، دەنا قۆنداغەکەی جوان بەدەرەوە بوو. ئەو ڕۆژە ئەو «محەممەد یۆسف»ـە، زۆر پیاوانە ڕۆحی منی کڕییەوە. قەت لەبیری ناکەم. گوتی:

— خۆت کۆکەوە، من خەبەری قاچاغچییانم داوە، ئێستا لە شاری ڕا ئەمنییە دێن، ساز بە با بڕۆینە ناو مێشەی.

تا گروبانەکان چوونە ناو دێ بگەڕێن، ئێمەش بەرەو مێشە وەڕێکەوتین. لە ڕێگایە تێرمان قسە کرد. گوتی:

— لە سابلاغێ من بە شووبر دەزانن. پێمدەڵێن جاسووسی، ئەگەر جاسووس بام ئێستا تۆم بەگرتن دەدا و کۆڵێکم پارە وەردەگرت. من بۆ نان خۆم دەنێو ئەو گێژاوە هاویشتووە. ئێستاش زوو کاخەزێکم بۆ بنووسە و بمدەیە.

گوتم بەچاوان. هەر زوو قەڵەم و کاخەزم لە گیرفانم دەرهێنا و نووسیم:

ئەو کوڕە ڕۆحی منی کڕیێەوە.

دامە دەستی، گرتم و هەردوو لاچاویم ماچ کرد و گوتم تا ماوم چووکەی تۆم. ئینجا دەبوایە بڕواتەوە بۆ نێو دێی. ڕێنوێنی کردم کە لە میشەی خۆم تاقەت کەم و کاتێک ئەوان گەڕانەوە منیش بڕۆم و لەو ئارامانە نەمێنمەوە. بێتو پێت بزانن، خراپ دەبێ. لەو قسانەدا بووین، غەڵبەغەڵبی گرووبانەکان هات کە لە چۆمی دەپەڕانەوە. بۆ ئەوەی لاق و قولیان تەڕ نەبێ، سواری کۆڵی سۆفییەکی پیر دەبوون و ئەو داماوەش دەیپەڕاندنەوە. محەممەد گوتی:

— من دەڕۆم و نایەڵم واوە بێن، تۆش خۆت وەدەر مەخە، ئێستا دەیانبەمەوە بۆ شاری.

محەممەد منی بەجێهێشت و چۆوە بۆ لای گرووبانەکان لە چایخانە. من گیانی خۆم بەو محەممەدە قەرزدارم. زۆر ئاواتم بوو کە ڕۆژێک بێتەوە چاکەی بدەمەوە، بەڵام ڕۆژگار وای فڕێداوم کە وا وێدەجێت بە ئاوات نەگەم. وەختێک دایکی ئەو محەممەدە هاتە زینوێ. کوڕێکی تری لە بەغدایە بوو و دەیویست بچێت بۆ لای ئەو کوڕەی. من ماڵم لە خەلانێ بوو. منداڵەکانم هێنابوو خەلانێ و زۆر نەدار و ڕووت بووم.[1] دایکی لە خەلانێ هاتە ماڵم. لاڵ بم، ئێستاش لەسەر دڵمە کە هیچم نەبوو بیدەمێ.

ئەوان کە چوونە چایخانەکە، منیش بەنێو مێشەیدا چوومە ئەوبەری قازیاوایە. کە تەماشای ڕێگایەم کرد، پێنج نەفەر ئەمنییە لەژێڵلا دێن بۆ چایخانەکە. لەوێ برێک ڕاوەستان و تەماشایەکی دەوروبەری چایخانەکەیان کرد و پاشان چوونەوە بۆ شاری. منیش تۆزێک لەنێو مێشەکە خۆم خافڵاند و تەفەنگەکەم لەنێو مێشەی تاقەت کرد و چوومەوە چایخانە زگ چایچییەکە. گوتم:

— ئاخر کابرا تۆ بۆچی تفەنگت لەبن سەرم دەرهێنا؟ بەشکوو گرتبایانم؟! ئەودەم چیم کردبایە؟

گوتی کاکە، من هەموو ڕۆژێ زۆر درەنگ ڕاست دەبوومەوە. بەختی تۆ ئەورۆ زووتر ڕاست بوومەوە تا چاو و نانت بۆ حازر بکەم. لە ڕێگا تەماشام کرد ئەو گرووبانانەی بەرەو چایخانەکە دێن، گوتم با تا ئەوانە نەگەیونە سەری بچم لانیکەم تفەنگەکە لەژێر سەری دەرهێنم. تفەنگەکەم دەبردە نێو مێشەی

[1] بەداخەوە لەناو دەفەتەرەکانی کاپیتاندا ئەو بەشە کە ماڵ و منداڵەکانی دەبات بۆ "خەلان"ێی تێدا نییە.

بەڵام گرووبانەکان زوو گەینە دەرکی چایخانەی و چارم نەما و دەنێو گوڵەکانم نا. هەر چاک بوو نەیانڕوانییە ناو گوڵەکان دەنا، منیش و دێیەکەش و تۆش تێدا دەچووین.
بڕێک بەسەری ڕۆییشتم، باش بوو لەو بەلایەش بەسلامەت دەرچووین. ئەوجار ئاهێکمان هاتەوە و نان و چایکمان خوارد و جا چوومەوە نێو مێشەی و تفەنگم هەڵگرت و هەر بە نێو مێشەیدا چوومە بەر «دێبۆکر»ـی[1] و لەوێشڕا بە شاخیدا داگەڕامە «سەری مەیدانێ». لەوێ چایخانەیەکی لێبوو و چایچییەکە کۆنەدۆستم بوو نێوی «تەها» بوو. ئەوڕۆژە تا شەوێ لای تەها ڕامبوارد، شەو قاچاغچی هاتن و دەچوونەوە بۆ زینوێ. «مستەفای زینەتی»ـشیان دەگەڵ بوو. ڕەگەڵیان کەوتم و بۆ لای شەوێ گەییشتینەوە بۆ زینوێ. لەوێ یەک-دوو مانگ ڕامبوارد بەڵام خەمی منداڵان حەجمینیی پێنەهێشتبووم. دیسان هەوای چوونەوەم بۆ لای منداڵان کەوتەوە سەری. دەگەڵ عەبدوڵڵا کوڕەکەی شێخی قسەم کرد و تێمگەیاند کە بەتەمای چیم! پێمگوت کە بۆ تفەنگ بەکەس ناڵێم و تکام لێکرد کە دەمانچەکەی خۆییم بداتێ و منیش دەمانچەیەکم هەیە، دوو دەمانچان دە باخەڵم دەنێم و بە ڕۆژیش بڕۆم قەیدی ناکات. ماڵی ئاوەدان بێت بەڵێنی دامێ و گوتی: کەی ساز بووی وەرە لام دەمانچەکەت دەمێ. کوڕەکانی شێخی زۆریان جامین دەویستم، شێخ بۆخۆشی زۆری حورمەت دەگرتم. شەوێک چوومە لای شێخی و لە بڕیارەکەی خۆم ئاگادارم کردەوە و گوتم:

— ئارەزووی منداڵەکانم دەکەم، ئیزنم بدە سەرێکیان بدەم.

— گوتی بڕۆ بەڵام وشیاری خۆت بە.

هێندەی بڵێی یەک و دوو خۆم تێکنا، دەمانچەی کوڕی شێخیم وەرگرت و دەگەڵ چەند نانێک دەناو توربینێکم نا و لەکۆڵی خۆمم قایم کرد. دەمانچەکەی خۆشم دەبەر پشتێندێم نا و وەشاخی کەوتم. بە ڕۆژیش هەر دەڕۆییشتم تا گەیمە لاجانێ و لەوێشڕا هاتمەوە دەوروبەری سابڵاغێ. لەوێش چوومە باغی[2] و ناردم خورشید هات بەڵام منداڵەکانی نەهێنابوو. لێمپرسی:

— بۆ منداڵەکانت نەهێناوە؟

گوتی ئامین لە قوتابخانەیە و خانەش نەموێرا دەگەڵ خۆم بیهێنم. ئاخر، جاری پێش کە هاتبوویەوە بە هەموو کەسی گوتبوو کە دەگەڵ دایکم چووینە لای بابم، بۆیە نەموێرا ئەوجارە بیهێنم.
تاوێک لام بوو و بە قسان گەرم داهاتین و بەدەم گریانەوە دەیگوت:

— بۆ هاتوویەوە؟ ئاخر دەگیرێی! ئەودەم قوڕێ کوێ بەسەرماندا کەین؟

---

[1] "دێبۆکر" لە ٧ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای گوندی "قازیاوا" و لە ١٧ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای "مەهاباد" هەڵکەوتووە و بە ناوچەی مەنگورایەتی هەژمار دەکرێت.

[2] بە ڕوونی دیار نییە کە مەبەستی کامە باغە؟ ڕەنگە دیسان چووبێتە باغی پێشەوا قازی محەممەد (باغی ساوا) یا بە ئەگەری زۆر مەبەستی باغەکەی خۆیەتی کە ئێستاکە شوێنەواری نەماوە و خانووبەرەی لێ سازکراوە و بە گەڕەکی "باغی سمایل ئاغا" بەناوبانگە.

منیش کەمێکم ورە دایەوە و هەوڵم دا ترسەکەی لە دڵ بڕەوێنمەوە و هێوەری بکەمەوە. پاشان گوتی: ئەگەر دەتهەوێ دەچم ئێستا منداڵەکانت بۆ دێنم؟

— نا تازە قەیدی ناکا بەڵام بۆ بەیانی وەرەوە و منداڵەکانیش دەگەڵ خۆت بێنە.

بە ناقایلی باشەیەکی لەزاری هاتە دەر و بەجێیهێشتم.

شەو لە باغی نەمامەوە و چووم بۆ «ئیندرقاش»ـی ماڵە برای «عەزیز بەگی». یەکجار زۆری حووڕمەت گرتم. ئەو سەفەرەی بەتەنێم و یەک شاییم پێنەبوو. گوتم دەڕۆمە لای ئاغایان بۆ سواڵ کردن. شەو خانەخوێیەکەم ناردە لای کوڕی «کەریم ئاغای» تا بەشکوو بۆی ممکین بێت و پارەیەکم بۆ بنێرێت؟ «عومەر ئاغا» ٥٠ تمەنی بە نۆکەرەکەیدا بۆ ناردم کە نێوی «مارف» بوو. مارف گوتی: عومەر ئاغا دەڵێ بڕوا لە دێیەکە تا «کەریم ئاغا» نەیزانیوە، ئەگەر بزانێ خەراپ دەبێ بۆ ئەو. مارف کە زۆرم بۆ بەپەرۆش بوو، گوتی» باشتر وایە بڕۆی تا ئەو نەیزانیوە.

چوومەوە ماڵی خانەخوێیەکەم و هەر قوونم دادا، دوو نەفەر پیاوی کەریم ئاغای وەژوور کەوتن و گوتیان: ئاغا دەڵێ زوو بڕوا لە دێی. خانەخوێ گوتی: با نانومانێکی بخوات پاشان بڕوات. نۆکەرەکە بە تووڕەییەوە وەدەنگهات و گوتی ئاخر تۆ نازانی نا، با بڕوات باشترە. دەگەڵکوو وای گوت، ترسم لێنیشت و گوتم با پەندێکیان بەسەر نەهێنن، ڕاست بوومەوە و خوداحافیزیم کرد و چەند نانێک و بڕە پەنیرێکم وەرگرت و وەدەر کەوتم. پیاوەکان تا سەر چۆمی دوابەدوام هاتن، کە ئەرخەیان بوون لە چۆمی لامداوە ئینجا گەڕانەوە. منیش لەوبەری چۆمی لە پەسیوێکی تۆزێک نووستم. کە خەبەرم بۆوە و دیتم شەو درەنگە، ئەوجار وردەوردە هاتمەوە باغی. هێشتا شەوی ماوە، چوومە نێو دێراوێکی دیسان نووستم، وەختێک خەبەرم بۆوە دیتم ڕۆژ بڵیندە. هەستام نان و پەیترم دەرهێنا و ملم لە خواردنی نا. لە دووڕ ڕا تەماشام کرد خورشید منداڵەکانی دەگەڵە و زەلامێکیشی لەپێش دەڕوات، کە تۆزێک هاتنە پێشەوە دیتم «سەید مەحموودی جندۆکە»ـیە. هەر نێوەکەی وایە. بڕێک دەگەڵ جندۆکەی یەکترمان بەخۆمانەوە گوشی و چاو و دڵمان پێک ڕوون بوونەوە، بەڵام دەگەڵ خورشیدی دەستیان کرد بە گریانێکی نەبێتەوە. هەر پێمدەکرا دڵخۆشییان بدەمەوە. بە حاڵیکی هێوەرم کردنەوە. ئینجا دانیشتین دەگەڵ منداڵەکان خەریکی قسەکردن بووین و ڕامدەمۆسین و بۆنم دەکردن. خانەی کوڕم ئەوجار دەمناسێتەوە و خۆم دەباوەشی دەهاوێت و پێیدەگوتم:

— بابە ئەدی بۆ نایەوە ماڵێ؟ عەجەمان دەتگرن؟

زۆریان دەگەڵ دانیشتم و لێیان تێر نەدەبووم. ئەو ٥٠ تمەنەی پێمبوو دام بە خورشیدی و بەڕێمکردنەوە بەڵام نەمگوت لەو دەورە دەسووڕێمەوە، گوتم دەڕۆمەوە بۆ عێڕاقێ. هەموو دەستیان کرد بە گریانێ، گریانێک کە بەردی دەتواندەوە. بەو حاڵە بەجێیان هێشتم. منیان بەیەکجاری ڕووخاند. حاڵم زۆر خەراپ بوو، وەک مار جینگڵم دەدا. فرمێسکی منداڵەکانم و

هەنسیکەکانیان، بەهیچ لەبەرچاوەکانم لانەدەچوون. ئەو ڕۆژە فکری پیس‌پیسم بەسەریدا دەهات، هیچکات خۆم وا زەلیل و بێدەرەتان نەدیبوو. هەرچۆنێک بێت دڵخۆشیی خۆمم دەدایەوە و ئەو نەهامەتیانەشم بە بەشێک لە کوردایەتی دەزانی و ناڵە و فرمێسکی منداڵەکانیشم بە دارەدارەیەک بۆیان دادەنا تا بزانن ڕێی کوردایەتی تووش و سەختە و دەبێ خۆی بۆ حازر بکەن. بەو قسانە کەمێک هاتمەوە سەرحاڵ و بە دڵتەنگی ملی ڕێگام گرت و بەنێو باغی‌دا چوومە سەر چۆمی و هەر بە جلەوە خۆم بەچۆمی دادا و تاوێکی زۆر لە ئاوەکەدا مامەوە. ئینجا هەر بە تەڕی چوومە نێو میشەی «حەسەن خانی» و لەسەر ڕوو بۆی کەوتم. وەختێک ڕاست بوومەوە لای تاوپەڕانە و شانسم هێنا گەرما بوو، دەنا نەخۆش دەکەوتم.

تۆزێک خۆم خافڵاند و کە شەو نیشت، ملی ڕێگام گرت و چووم بۆ «لەج»[1]ـێ و لام دا بۆ ماڵە «حەمەدی». ئەوانە چەند بران و حەمەد برای چووکەیانە و بەداخەوە نێوی براکانی دیکەم لەبیر چۆتەوە. لە دەرکێم دا و دەرکەیان لێکردمەوە لەپێشدا نەیانناسیم و هیچ موبالاتیان پێ نەدام تا لەپڕ برا گەورەکەی ناسیمی، ئەوکەڕەتەی لێم هاڵان. ژنەکانیان لە دیوێکی دی بوون کە بیستیان، هەموو بە ورد و درشت لێم وەخڕ بوون و زۆرم بۆ بەپەرۆش بوون. دایکەکەیان هۆڕهۆڕ بۆم دەگریا. زوو سەماوەریان ساز کرد، هێلکە و ڕۆنیان بۆ دانام، خواردم و چام بەسەردا کرد. لە قساندا گەرم ببوین تا ڕۆژ بۆوە. براگەورەکەی بە سەڵاحی نەزانی لەناو دێ بمێنمەوە، بردیانم بۆ چادران تا لەوێ بنووم. چادرەکان لەوبەری چۆمی بوون، لەوێ چیغیان گرتبۆوە، چووین بۆ ئەوێ و جێگایان بۆ چاک کردم. ئەو جێگایەی من لێیدەنووستم، کەس شکی نەدەکرد. ئەوەندە کفت بووم کە نەمزانی چۆنم خەو لێکەوت. با زۆری لەسەر نەڕۆم، ئەو برایانە ۳ ڕۆژان بە تێر و تەسەلی، بە ڕێز و حووڕمەت، ڕایانگرتم. شەو حەمەد کە براچووکە بوو و نۆکەری «حەمەلان»ـیش بوو، هاتە لام و تەگبیرم پێکرد کە دەڵێی چی بنێرمە لای حەمەلانی بۆ پارە؟ گوتی:

— زۆر باشە بەڵام من دەچم پێیدەڵێم. ئەگەر تۆی ویست، دەتبەم بۆ لای، ئەگەریش لێیپرسی بەتەنێی، بڵێ چەند نەفەرم دەگەڵە و ئەوان لە شاخین و چاوەڕوانی منن.

گوتم باشە!

ئەو چوو بۆ لای حەمەلانی کە ئاغای دێ بوو. لەجێ دوو بەشە و دوو ئاغاشی هەیە. یەکیان حەمەلان بوو یەکیشیان «سمایل ئاغای کوڕی سلێمان ئاغای ئیندرقاشی». بە حەمەلانی دەڵێ:

— ئەوە حەمەدی مەولوودی لە قەراغ دێیە. من دەچوومەوە ماڵێ، تەماشام کرد ڕەشاییەک دیارە، کە چوومە پێشێ گوتم چ کەسی؟ لێم هاتە پێش و گوتی من ناناسی؟ تەماشا دەکەم دەمانچەی ڕووتی بە دەستەوەیە. ڕوانیم ناسیم حەمەدە. گوتی بڕۆ بە ئاغا بڵێ پارەم بۆ بنێرێ!

---

[1] گوندێکی مێژووییە کە لە ۲۵ کیلۆمیتری باکووری مەهاباد و لەسەر ڕێی میاندواو - دارەلەک - ورمێی هەڵکەتووە.

وای بە ئاغا گوتبوو کە نەیتوانیبوو بەتەنیا قەرار بدات. ناردبووی بە دوای سمایل ئاغای تا بەیەکەوە تەگبیرێک بکەن. لە دیوەخانێ بەیەکەوە گردببوونەوە و بە حەمەدی پیاویان گوتبوو بڕۆ حەمەدی مەولوودی بانگ کە با بێتە ئێرە. حەمەد بە هەڵەداوان هات و منی برد بۆ لایان. کە چووین هەرتک ئاغا لەبەر دەرکێ ڕاوەستابوون. سڵاوم کرد و چاک و چۆنیان دەگەڵ کردم و بڕێکمان قسە کرد و دەریانهێنا هەریەکە و ١٠٠ تمەنیان دامێ و سوێندیان خوارد بە قەبری باوکیان کە لەوە زیاتریان دە ماڵدا نییە. بە حەمەدیشیان گوت بچۆ لەماڵێ کۆڵێکی نان و پێخۆر بۆ داگرە بۆ هاواڵەکانی. گوتم نانمان زۆر پێیە و نەمویست. ئەوەندەشیان ڕەجا لێکردم کە لە ملکی ئەواندا هیچ کارێکی نەکەم کە دەگەڵ دەوڵەتێ کێشەیان بۆ ساز بێت. حەمەدیشیان ڕاسپارد تا بەڕێم کات. دەگەڵ حەمەدی هاتینەوە بۆ چادران و لەوێ خۆم تێکوەرپێچا کە بڕۆم بەڵام حەمەد گوتی:

— بەقسەم دەکەی بچۆ بۆ «دارەلەکی»[1]، لەوێش پووڵێکی لە ئاغاکانی ئەوێ وەرگرە و پاشان بۆ کوێ دەچی بچۆ!

لەوێ کەس ناناسم. بچمە ماڵە کێ کە بینێرمە لای ئاغاکان و جێی مەتمانە بێت؟

«مرادی ئاشە خاڵی» پیاوی «حەسەن ئاغا»یە. وەپێشم کەوە دەگەڵت دێم، ماڵەکەت نیشان دەدەم و بۆخۆم دەگەڕێمەوە. پێم خۆش نییە من ببینێت و تۆش باسی من لای ئەو مەکە.

گوتم زۆر باشە!

چادرەکان لە دارەلەکی نیزیک بوون. حەمەد دەگەڵم هات و ماڵە مرادی نیشان دام و گەڕایەوە. شەو ڕاکشابوو و وڵات تاریک و تنۆک بوو. چووم لە دەرکێم دا و دەرگا کرایەوە. ئەگەر دەبینم خۆ ئەو مورادە دەناسم، هاواڵ قاچاغچیمە و زۆر دۆستین! ئەو لەو تاریکاییەدا منی باش نەدەدی. گوتی تۆ کێی؟ گوتم حمەدی مەولوودیم. هێشتا قاچم لە دیوی دەرێ بوو کە ئانبازم بوو و دەستی هاویشتە ملم و بەربووە ماچکردنم و هەڵیهێنام و دە دیوی ژوورێی هاویشتم. ئەو لە من خۆشحاڵتر بوو. باوەڕی نەدەکرد ئەمن بم کە لە دەرگای ماڵەکەی دەدەم. مراد ٣ ژنی هەبوو. گوڕاندی بە سەریاندا، ڕاست بنەوە. ماڵتە هەمووی خوودار[2] کردن! ئەو بەستەزمانانە عەبەسابوون![3] وای کرد بە گوڕە و هەرا، کە یەکپێ ڕاستبوونەوە، دەستووری دا: زووبن نانومان حازر کەن. نەمگوت کە لەلای حەمەدی نانم خواردووە و هەر گوتم کە نان و پێخۆرم پێبووە و خواردوومە و برسیم نییە.

موراد بڕێک شێتۆکەیە، لە حەیفی ئەوەی گوتومە نانم خواردووە، دەهری بوو و ژنەکانی داگرت بە جنێوان. دەستوپێی پێ ون کردن، هەر تێکیان داویشت، نەیاندەزانی چ بکەن، من نەموێرا چ بڵێم، بێدەنگ بووم و خۆم گێل کرد. بەو شەوە درەنگەی پڵاوی پێ سازکردن و مریشکی کوشتەوە

---

[1] گوندێکە لە ٢٣ کیلۆمیتری باکووری مەهاباد و لەسەر ڕێی میاندواو - دارەلەک - ورمێی هەڵکەتووە.

[2] لە "خێدار" یان "فێدار"ـەوە هاتووە. بە عارەبی نەخۆشی "صرع"ـە. لە موکریان بە "خوودار"ـش دەیڵێن.

[3] "حەپەسان"، "واقمان"، "وڕمان"

و نانمان خوارد و تا نیزیک بەیانی دانیشتین و ملمان لە قسەکردن نا. ئەو شەوە خەوی لە چاوی ئەو ژن و منداڵانە حەرام کرد. ئەوانیش دەگەڵمان تا بەیانی قوت ببوونەوە و خەونووچکە دەیبردنەوە و نەیاندەوێرا بنوون. پاشان منداڵە وردەکانی ترساند کە نەکەن لای کەس باس بکەن کە کەسمان لە ماڵێیە! جا کە هیلاک بووین جێگایان بۆ لە ژوورێکی بۆ چاک کردم و لێی‌نووستم.

**(ئەو بەشە لە ناوەڕاستی دەفتەری چوارەمدا هاتووە کە لەبەر ڕەچاوکردنی کاتی ڕووداوەکان و هەروەها پێوەندییان دەگەڵ درێژەی باسەکان گواستوومەتەوە بۆ ئێرە لە کۆتایی بیرەوەرییەکانی کاپیتان - وریا).**

## سووتانم لە نێوان شەڕی مەلا مستەفا بارزانی و ڕەحیمی قازیدا

جا لێرەدا ئەوەم وەبیر هاتەوە کە وەختێک ئەمن چووم بۆ خاکی شۆڕەوی، «قادری مەحموودزادە»[1] چوبوو لای مەلا مستەفا باسی منی کردبوو مەلاش لە جوابدا گوتبووی:

— ئەرێ ئەوە چییە هێندە باسی حەمەدی دەکەی؟ ئەو خوێڕییە چییە؟ باسی ئەو مەکە لای من، بەسە.

جارێکی لە شەڕەکانی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ چووم بۆ شنۆیە، لەوێ شێخ ئەحمەد زۆری حەول دا لەلای بمێنمەوە و نەچمەوە بۆ تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕی. ئەو دەیزانی شەڕکەر و لەزەبرم و ئەو هاواڵانەشم لە خۆم باشترن، بەڵام ویژدانم قەبوڵی نەکرد. دەمزانی مەلا مستەفا و هاواڵەکانی لە مەترسی دان، بۆیە هاتمەوە محاڵی مەرگەوەڕ. کە هاتمەوە، مەلا مستەفا تۆزێک لە من تۆریا بوو، وادەکا:

— تۆ بۆ لەلای من ڕۆییشتووی و منت بەجێهێشتووە و چوویتەوە بۆ شنۆیە؟

---

[1] خوالێخۆشبوو "قادر مەحموودزادە" یان "دوکتور ئاسۆ" یەک لە دامەزرێنەرانی ڕێکخراوی لاوان بوو کە دەگەڵ "غەنی بلووریان" لە سەردەمی کۆماردا پێکیانهێنا و پاشان تێکەڵ بە حیزبی دیموکرات بوونەوە. ناوبراو یەک لەو خوێنکارانە بوو کە لە بەهاری ١٣٤٦ هەتاوی لەلایەن دەوڵەتی کوردستانەوە ڕەوانەی باکۆ کرا تا لەوێ بخوێنن بەڵام، پاش تێکچوونی کۆمار هاتەوە سابلاغ. ئەوجار پاشی چەند ساڵێکی تر پەڕیوان دەبێتەوە دیسان دەچێتەوە باکۆ و لەوێ پاشی چەرمەسەرییەکی زۆر دەتوانێ بڕوانامەی پزشکی وەربگرێت. دوکتور ئاسۆ لە "باکۆ" و لە "کوبا" دەژیا و دەگەڵ کاپیتان حەمەد دیداری دەکرد و زۆری لێ نیزیک بوو. بەڕێزی بیرەوەرییەکانی خۆی نووسیوەتەوە بەناوی (خاطرات پرماجرای قادر محمودزادە "دکتر آسو")

تکایە پرسیاری لێبکەن کە بۆ ئەودەم من خوێڕی نەبووم و باش بووم؟ ئەدی ئەوکاتە کە چواردەوریان گیرابوو و چووم بە خۆی و بە دوازدە ئەفسەرەکانییەوە لە مردن ڕزگارم کردن، بۆ ئەودەم خوێڕی نەبووم و باش بووم؟ ئێستا ئەوە لە خاکی شۆڕەوی دەگەڵ «ڕەحیمی قازی»[1] و «عەلی گەلاوێژ»[2]ی لەسەر میراتی کوردوستان کێشە و هەرایان بووە و یەک گوتویەتی من لەسەر تەختی کوردوستان دادەنیشم و تاجی کوردوستان لەسەر دەنێم و مەلا مستەفاش گوتویەتی من رەئیس‌جمهوری کوردوستانم و بەو شێوەیە لە سەر میراتی کوردوستان کەوتوونەتە گیانی یەکتر.



[1] لە لاپەڕەی ٤٧١دا زیاتر لەسەر دوکتور ڕەحیم قازی بخوێننەوە.

[2] بەڕێز"عەلی گەلاوێژ" (ئاگری) لە ساڵی ١٩٢٣ لە گوندی "سارووقامیش" لەدایک دەبێت. خوێندنی سەرەتایی لە تەورێز دەخوێنێت و لە سەردەمی کۆماردا بە پلەی کاپیتانی دەگات. لەلایەن دەوڵەتی کوردستانەوە دەگەڵ ٦٠ کەس خوێندکاری تر لە ئاوریلی ساڵی ١٩٤٦ دا بۆ خوێندن نێردرا بۆ مەدرەسەی نیزامی باکۆ. پاشی تێکچوونی کۆمار دەگەڵ چەند خوێندکارێکی تر لە ئازەربایجان مایەوە. لەوێ درێژەی بە خوێندن دا و بڕوانامەی دوکتۆڕای لە بەشی ئابووری وەردەگرێ. بەڕێزی هەم دەستی نووسینی هەبووە و هەم لە ساڵی ١٩٤٧ز بێژەری ڕادیۆ "کۆمەڵ" لە باکۆ بووە کە لە موکریان بە ڕادیۆ "دزە" مەنشوور بوو. ماوەیەکیش بێژەری ڕادیۆ "پیک ایران" بوو لە بوڵغارستان. . پاشی سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران وەک ئەندامێکی حیزبی توودە گەڕایەوە بۆ ئێران و دواتر لە ساڵی ١٩٨٣ بە تاوانی ئەندامێتی ئەو حیزبە گیرا و لە ساڵی ١٩٨٨ لە تاران لەسێدارە درا.


خوالێخۆشبوو دوکتور ڕەحیمی سەیفی قازی

من پێنج ساڵان بە تاقی‌تەنیا لە شارێکی بچوکی ئازەربایجان بەناوی «کوبا»[1] دەژیام و ئاگام لە کاری ئەوان نەبووە و تەنانەت نە مەلا مستەفام دیوە و نە ئەحواڵی پرسیوم نە نامەیەکی بۆ ناردووم تا تێیدا بنووسێت ملت شکێ بۆ ئەو کۆڵە خزمەتەی بە منت کردن و گردەڕانت ورد بێ بۆ ئەو چاکانەی دەگەڵ منت کردن. سەرەرای ئەوەش بەمن دەڵێ خوێڕی؟ یا ئەو کوردانەی دی، لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا یەکیان ئەوەندە دەمارەیان نەبوو بڵێن با حاڵ و ئەحواڵێکی ئەو کابرایەی بپرسین ئاخر ڕۆژێک لە ڕۆژان ناسیومانە و خەڵکی شارێکین و هاوزمانین و لەسەر کورد و لەسەر کوردوستان ماڵ و منداڵی بەجێهێشتووە و ئاوارە و دەربەدەر بووە. لە ماوی ئەو پێنج ساڵەدا من دوو کەڕەت هاتوومەتە باکۆیە و هەر کەڕەتەی دوو ڕۆژانی لێبووم، ئینجا لەوێ چاوم بەو کوردانەی دی کەوتووە. ئەودەم نەمزانیبوو کە مەلا مستەفا هەر لەکوێشە. چەند نەفەر سابڵاغی کە خۆیان کردبوو بە برازای مەلا مستەفا و پێیان دەگوت «مامە» و لای مەلا دەیانخوارد و دەنووستن و هەموو مانگێ چەندسەت «مەنات»ـی[2] بۆ بڕیبوونەوە و بە قسەی ئەوان لە من تۆڕیا بوو. منی بە پیاوی ڕەحیم قازی لەقەڵەم دابوو. منیش بە ئاوری ڕەحیم قازییەوە سووتابووم. جا ئەوانە برازای بوون و من بێگانە! ئاخر مەلا مستەفا ئەوەندەی هۆش نەبووە کە دەبوایە زانیبای کە گەر من هاتبامە لای، ئەوانەم هەر بە شەقان لە دەورەی مەلا وەدەر دەنا. هەر

[1] کوبا یان قوبا (Kuba - Quba) شارێکە لە ١٦٨ کیلۆمیتری باکووری "باکۆ یان بادکوبە" پێتەختی وڵاتی ئازەربایجان هەڵکەوتووە.

[2] دراوی فەرمیی وڵاتی ئازەربایجان، "مەنات"ی ناوە و دراوە وەردەکەشی (گپیک - qəpik)ە. وشەی مەنات بە ڕەچەڵەک ڕووسییە "монета" (مۆنێتا). پێش تێکەڵاوی وڵاتی ئازەربایجان دەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت، ناوی دراوەکەی هەر "مەنات" بوو. لە ساڵی ١٩٢٣ کە ئەو وڵاتە بە فەرمی تێکەڵ بە سۆڤیەت بووە و بانکی ناوەندی سۆڤیەت لە باکۆ نوێنەرایەتی دەکاتەوە، ئابووری ئازەربەیجان بە فەرمی گرێدەدرێت بە ئابووری شۆڕەوی و دراوەکەیان دەکرێت بە "ڕوبڵ" کە ڕوبڵێک یەکسان بوو دەگەڵ یەک "مەنات". لەلایەن خەڵکی ئەو وڵاتە هەم وەک مەنات و مەیش وەک ڕوبڵ حیسابی بۆ دەکرا و ناوی دەهات.

ئەوانە گوێی مەلایان پڕ کردبوو کە گۆیا من پیاوی ڕەحیمم. بە قسەی ئەو هەتیوە بەڕەڵڵایانە لە خزم و تایفەی خۆیشی تۆرابوو.

ئەوە لە دوایە کە عێراق تێکچووە و «شێخ لەتیف» هاتۆتە باکۆیە و منی تەڵەب کردووە. منیش لە کوبایە ڕا هاتوومە باکۆیە و ئیتر پاشی شێخ لەتیفی نەیانهێشت بچمەوە بۆ کوبایە و گوتیان لە باکۆیە دانیشە و لێرە بژی. ئەودەم کە هاتوومەتە باکۆیە ئەو قسانە دەبیسم و بۆم دەگێڕنەوە کە مەلا مستەفا و ئەو تاقمە، چۆنیان دم دە جەرگی یەکتر ناوە دەنا، ئاگام لە هیچ نەبووە. ئەو چەند وەختەی ئەو هەموو حەیسوبەیسە ڕووی داوە و منیش بێخەبەر لە هەموو شتێک. پاشەملە چۆنیان کوتاوم؟ بە کێیان فرۆشتووم و بە چەندیان مەزەندە کردووم؟ هەر بۆخۆیان دەزانن! من ئاگاداری هیچ نەبووم. لە ڕاستیشدا لەوە زیاتر چ چاوەڕوانییەکیشم لە ئەوانە نییە. دەگەڵ ویژدانی خۆم پاکم و لە هەمووکەسیش بێباکم. نە بە نانی ئەوان بووم و نە قەرزی ئەوانم لەسەرە. من لە منداڵییەوە وا بار هاتووم کە لە هەموو عالەم بێمنەت بم و کەس بە گەورەی خۆم دانەنێم، جگە لە نیشتمانم. کەسیش بە دوژمنی خۆم نازانم، جاش و پیاوی دەوڵەت نەبێ. ئیتر ئەو تاقمەش چ دەڵێن با بڵێن. ئەو جەماعەتە داخ و دەردیان زۆرە، بەڵام کۆڵەسەوادەکەم چاک کار ناکات هەمووی بنووسم. جا وەرە قوڕی هەموو دونیایە وەسەری خۆت مەکە کە لەبەر میرات بەشکردنی کوردوستان و خۆکردن بە کوێخای کوردوستان، هۆشی ئەوەیان نییە وەدوای خوێندن و سەنعەتێکی بکەون! ئاخر لە وڵاتی شۆڕەوی خوێندن زۆر هاسان و بەلاشە، لە قوتابخانە لیباس و خەرجی، هەمووی لەسەر دەوڵەتە. مەلا و ڕەحیمیش لەسەر پیاوەتی کردنی لەسەر ئاوی حەمامێ و خۆ بەسەر یەکتر ڕانان و تەخشان و پەخشان کردنی خاکی کوردوستان سەریان لەو لاو و جحێڵانەی بارزانیش شێواندبوو و نەیانهێشت فێری سەنعەت و خوێندن بن. هەمووی بە کوێری گەڕانەوە بۆ کوردوستان. ئەگەر ئەو گەنجانە هەر کامە و شتێکیان خوێندبایە، زۆری کۆمەگ بە کوردوستان دەکرد بەڵام هەر کامە و شۆفارێکیان چووبوو دەبن هەنگڵێوە، هۆشیان لێبڕابوو. چ نەمابوو بە یەکتری نەڵێن.

ڕەحیم کوڕێکی ئاسایی بوو، تێستاش کەس ئەو ناناسێت، تاڵ و سوێری نەدیبوو، منداڵ بوو، ناردبوویان بۆ خوێندن. لەبەر خاتری گۆڕی قازی حورمەتیان بۆ دادەنا، کەچی دەگەڵ مەلای دابەستبوو. ئەودەم دەوری «باقرۆف»ـی بوو. باقرۆف پیاوی وەک ڕەحیمی خۆشدەویست. بە قسەی کەسانی وەک ڕەحیمی قازی زۆر کەسی ئازار دا و تووشی بەڵایەی کردن، یەکیان من. کە هاتمە خاکی شۆڕەوی هەر ناوی مەلام دەهێنا و دەمگوت مەلامستەفا من دەناسێت. ئەوە منیش نازانم کە ڕەحیم لەلای باقرۆف و دەوڵەتی ئازەربایجانەوە وەک مار بە مەلا مستەفایەوە داوە و وای بۆ تێچاندووە نەبێتەوە. منی داماو و لە هەموو شتێک بێخەبەریش هەر دەمگوت مەلا مستەفا دەناسم. هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کە واریدی خاکی شۆڕەوی بووم لەسەر ئەو قسەیەی گرتیانم و

یەکسەر لە زیندانیان کردم. زۆریان ئەزیەت و ئازار دام. دەمێک دەیانگوت تۆ جاسووسی و دەمێکیش دەیانگوت «شێخ»[1] ئەتۆی ناردووە بۆ لای «سەید عەزیزی»[2]. خولاسە منیان دانابوو بە خائین و جاسووس. هەرچی باسی خۆمم بۆ دەکردن و دەمگوت بڕۆن لەو کوردانەی ئێرە بپرسن، ئەوان هەموو ئەمن دەناسن، کەچی کەس نەبوو باوەرم پێبکات و کەسیش نەبوو بە فریام بگات.

بەڵێ، لەولا مەلا بە پیاوی ڕەحیم قازیم دەناسێت و خۆم لێنادات و بە خوێڕیم ناو دێنێت، لەولاشەوە ڕەحیم کە زانیبووی ناوی مەلا مستەفام هێناوە، لێم بە ڕق داکەوتووە و خۆم لێنەناس دەکات. خواش کارێکی وای کرد کە باقرۆف و دەستە و دایرەکەی بە خائین دەرچوون و هەموو بە جەزای خۆیان گەییشتن و تەرتوتونایان کردن. ئینجا من بەڕەڵلا کرام و حوڕمەتیان گرتم. کە هاتمە دەرێ بە ڕەحیمم گوت ئاخر پیاوی چاک ئەوەندەی من لە گرتووخانە بووم بۆ تاقە جارێک لە منت نەپرسی؟ جوابەکەی ئەوە بوو: نەمزانیوە. درۆی دەکرد، ئەو ماشەی باقرۆفی بوو. تەنانەت ڕۆژێکی هاتە ئەو گرتووخانەیەی کە منی لێ گیرابووم. لە داڵانەکەی بەرانبەرم تێپەڕی و لە ئاستی من ڕووی دەولای کرد.[3]

---

[1] دەبێ مەبەستی کاپیتان خوالێخۆشبوو "حاجی سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی" (شەمزینی - گەیلانیزادە) کوڕی "شێخ عەبدولقادر"ی ساداتی نەهری بووبێت کە دەبێتە باوکی "سەید عەبدولعەزیزی" شەمزینی.

[2] دەبێ مەبەستی کاپیتان سەید "عەبدولعەزیزی شەمزینی" بووبێت کە کوڕێ حاجی سەید "عەبدوڵڵا ئەفەندی" کوڕی "شێخ عەبدولقادر" لە سادات و خانەدانی نەهری. ئەویش یەک لەو ئەفسەرانە بوو کە ڕیزەکانی ئەرتەشی عێراقیان بەجێهێشت و دەگەڵ پێشمەرگەکانی بارزانی تیکەڵ بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوون. هەروەها یەک لە ئەندامانی حیزبی "هیوا" بوو. وەک خوێندکار لە بەهاری ١٩٤٦ی زایینی دەگەڵ ٦٠ لاوی تر ناردرایە باکۆ و هەر لەوێ مایەوە. سەید عەبدولعەزیز گەیلانیزادە ڕۆژی پێنجشەممۆ ١٣٧٧/١٢/٢٧ی هەتاوی لە شاری ورمێ ماڵئاوایی لە ژیان کرد.

[3] لەسەر ئەو ناکۆکییەی کە کاپیتان باسی دەکات لە وێبلاگی ڕوانگە بابەتێکی تەسەلی لەسەر نووسراوە بە ناوی (ناکۆکی نێوان ناوەندی کوردە موهاجیرە سیاسییەکانی مەسکەو و باکۆ- جەمیل حەسەنلی) کە بۆ زانیاری زیاتر دەتوانن سەردانی بکەن. هەروەها بەڕێز "ڕەحمان حەلەوی" لە کتێبی (از مهاباد تا بایکانور) لە لاپەڕەی ٨٩ ئاماژەی بەو ناکۆکییانە کردووە.



وێنەیەک لە دانیشتنێک لە کاتی سەفەری مامۆستا هەژار موکریانی بۆ ئازەربایجان - باکۆ ساڵی ١٩٦٢ز دانیشتوان لە ڕاستەوە: ئەوەی سەری دیارە نەناسراوەتەوە. ڕەحیم سەیفی قازی، مامۆستا هەژار، .ساری وێلی (هونەرمەندێکی ئازەری)، نەناسرا. ڕاوەستاو لە ڕاستەوە: عەبدولقادر مەحموودزادە (دوکتۆر ئاسۆ)، محەممەدی مەولودی (کاپیتان محەممەد مەولودیان)، جەعفەرپور(هونەرمەندی ئازەربایەجان)، نەناسراو

## نووسراوەکانی دوکتۆر ئاسۆ

**کتێبی: (خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو)، نووسینی: دکتر قادر محمودزاده (آسۆ)**
(لەو بەشەدا دوکتۆر ئاسۆ (قادر مەحموودزادە) باس لەو سەردمە دەکات کە لە زیندانەکانی سیبیریا گیراون. ئێستا کە ستالین مردووە هێناویانن بۆ زینداتێکی تر هەر لە سیبیریا و کەمێک دۆخیان باشترە) وەرگێڕانی لە فارسییەوە: وریا ماملێ.

**دیتنەوەی محەممەدی مەولودی لە زیندانەکانی شۆڕەوەی - لاپەڕەی ٢٦٠**

لەپاش دوو ڕۆژ مانەوە لە [ازبورنی پونکت- ئێزبۆرنی پوونکت، (ئەو ناوچەیەی کە زیندانییەکانیان لێ کۆکردبوونەوە)] بەیانی زوو عەزیزی هاوڕێم (مەبەستی عەزیز فەرهاد)ـە بە شادی و کەیفخۆشییەکی زۆرەوە لە حەوشە گەورەکەی «لاگیر» هاتە ژوورەوەی «براک» و گوتی:

— خەبەرێکی خۆشم پێیە!

— گوتم: چی بووە؟

وەمزانی بەڕەڵلامان دەکەن.

— گوتی: حەمەدی مەولودی (محەممەدی مەولودیان)م دیت!

سەرم سووڕ ما!

— گوتم: ئاخر حەمەدی مەولودی لەکوێ و ئێرە لە کوێ؟ ئەو لە ئێرانە و بە دژی ڕژێمی پاشایەتی شۆڕش دەکات.

— گوتی: هەستە با بچین بە چاوی خۆت بیبینە! بە هێمنی گازیکە نەکا لە خۆشییان ببورێتەوە.

من دەگەڵ عەزیزی لە ژووری براک وەدەرکەوتین و لە دوورەوە دیتمان ئەوە حەمەدی مەولودی، ئەو سەرهەنگەی (مایۆر) زەمانی قازی محەممەدی و ئەو قارەمانە نەتەوەییە، سەرقاڵی کۆکردنەوەی قونیچکە سیغارانە کە لە حەوشەی زیندانەکە فڕێ دراون. هەموویانی کۆ دەکردەوە و بڕەتووتنەکانی دەپاڵ پەڕە ڕۆژنامەیەک یا هەر کاغەزێکی تر دەکرد و سیغارێکی لێ ساز دەکرد مژی لێدەدا تا خەم و ناسۆری ناخیی بە دوکەڵی ئەو سیغارە وەدەرهاوێت. ئەو دیمەنە دزێوە ڕایچڵەکاندم.

— عەزیز گوتی: ئیستێ بگرە، من ئێستا بە جەفەنگان دەیدوێنم و لێیدەکەم بە گاڵتە.

عەزیز خۆی لە سووچێکی شاردەوە و بانگی کاک حەمەدی کرد:

— حەمە! حەمە! ئاغای مەولودیان!

کاک حەمەدی مەولودی کە داهاتبۆوە بۆ قونیچکە سیغاران قووشقی بوو و یەکپێ لەجێێ خۆی

ڕاست بۆوه چاوی له دەوروبەری خۆی دەگێڕا، گوێچکەی خووراند و قامکە گچکەکەی جوان له گوێچکەی ڕاکرد و شڵەقاندی، وەیزانی گوێی زرینگاوەتەوه یان به هەڵە گوێی لێ بووه.

که دیتی دەنگەکە نەما دیسان داهاتەوه و خەریکی قونیچکە سیغار کۆکردنەوه بۆوه. ئەوجاره عەزیز به دەنگێکی بەرزتر و شەقتر هاواری کرد:

— حەمەدی مەولودی! کاک حەمەد!

مەولودیان ئەوجاره وەک شێتانی لێهات و چاوی لەملاولەولا دەگێڕا تا عەزیز خۆی لێ ئاشکرا کرد و بۆ لامان هات. کاک حەمەدی داماو که ئێمەی دیت، زوو ئێمەی ناسییەوه و به هەڵەداوان لێمان نیزیک بۆوه و ڕاماڵی کردین. ماڵتانە، وەک منداڵان له گابۆڕێی دەدا و دەئامێزی وەردێنایین.


دوکتور ئاسۆ (قادر مەحموودزاده) و کاک حەمەدی مەولوده چرچی

ئێمه ئەومان هێنا لای خۆمان و دەگەڵمان بو به هاوسەفەرمان. من و عەزیز له ئۆردوگای بێگاریی، به کارکردن پارەیەکی باشمان وەکۆ کردبوو. بەو هۆیەوه له ناو هاوڕییان و زیندانییەکاندا به چینی دەوڵەمەند دەناسراین. قسەمان دەڕۆیی بۆیه، به بۆنەی دیتنەوەی قارەمانی نەتەوەیی کورد و دوژمنی شێلگیریی ڕژێمی پاشایەتی، له لاروک (دوکان)ی ئۆردوگاکە، گۆشت و برینج و ڕۆن و باقی کەلوپەلمان کڕی و به هاوکاری دۆستان پڵاوێکی باش و خۆشمان لێنا و لێدا. بۆ فراوین دەوری ۱۰ کەسمان بانگهێشتی سەر سفرەکەمان کردبوو. له دەوری یەکتر کۆببوینەوه و دەمانخوارد به شیوەی دۆزینەوەی کاک حەمەدی پێدەکەنین که چلۆن واق مابوو. ئیتر ئەو ڕووداوه ببو به هەوێنی فشه و گاڵتەمان. کاک حەمەد ماوەیەکی دوور و درێژ بوو که وەها سفرەیەکی گەرمی نەدیبوو هیچ، ڕیخۆڵەکانیشی وەها چێشتێکی چەوریان نەهاڕیبوو.

قورتمان له پڵاو و گۆشتەکه بڕی و دەنکمان لێ نەهێشتەوه که لەسەر شەرەفی کاک حەمەد خواردمان. کاک حەمەد هەر دەردی دایه. لای خەوتنان دیتمان که کاک حەمەد حاڵی تێکچووه! له مەباڵێ نایەته دەر. بەداخەوه قوونەفیرەی خوێنی (ئیسحالی خوێنی) گرت و ژانه زگێکی توونه و ژگچوون، بەجارێک تێکی دا. وردەورده ڕەنگ و ڕووی مردووانی گرت و دەستمان لێ شووشتەوه. بەپەله چووین له ژووری پزیشکی زیندان دەرمانمان بۆ وەرگرت و به قسان دڵخۆشییمان دەدایەوه

بەڵام کاک حەمەد حەجمینی لێهەڵگیرابوو.

کاتێک کە خەڵکەکە بڵاوەیان کرد و من و عەزیز لەبان سەری بووین، ڕووی دەمن کرد و وەسیەتی بۆ دەکردم. گوتی:

- میرزا قادر، ئەمن دەمرم و چاوم بە وڵاتی خۆمان ناکەوێتەوە، وەسیتتان بێت ئەوەی پێتان دەڵێم بۆم بەدی بهێنن.
- گوتم: کاک حەمەد ئینشاڵڵا چیتان لێنایەت و سڵامەت دەبن. شتی وا مەفەرموو. بەڵام چیت دە دڵ دایە بیفەرموون و لەسەر چاومی دادەنێم.
- کاک حەمەد فەرمووی: لە سابڵاغێ باغێکم هەیە، نیوەی ئی خۆمە و نیوەشی ئی «عەلی تووتنچی»ـیە، کوڕی «حاجی کەریم شیری»، تاجر و بازرگانی بەناوبانگی تووتن لە سابڵاغ. لە ناوەڕاستی باغەکەماندا، دارێکی قەیسی تێدایە و ئی منە. گەر گەڕایەوە بۆ وڵات چوویەوە بۆ سابڵاغ، نەهێڵی عەلی توتنچی ئەو دارەقەیسییە داگیر بکات. کارێکی وا بکە کە ئەو دارە بە منداڵەکانی من بگات بە کوڕەکەم «خانە» و کچەکەم «ئامین».

من و عەزیز لە فرقەی پێکەنینمان دا بەڵام کاک حەمەد گوتی بە جەفەنگی مەگرن و زۆر بە ڕژدی باسی ئەو دارەی دەکرد.

ئەوەش وێنەیەکی بەرچاو لە دڵپاکی و ساکاری پیاوێک کە ڕۆژگارێک فەرماندەی کۆمەڵێک لە گیانفیدایانی خۆنەویستی نیشتمان بوو.

## لاپەڕەی ٢٦٣

ئێمە لەو زیندانە کارمان نەدەکرد، چاوەڕوانی چارەنووسمان بووین. دەیانویست لەپاش مردنی ستالین کاری ئێمەش ڕاست بێنن و بە لایەکمان دادەن. زۆربەی بەندکراوەکان خوازیار بوون بگەڕێنەوە بۆ ئێران. بۆ ئەوان گرنگ ئەوە بوو کە لەو جەهەننەمەی دەرباز بن ئەگینا، چ بە خەیاڵیان نەدەهات کە لە ئێران کامە ڕژێم لەسەر کارە؟ ڕژێمی پاشایەتییە؟ فاشیستییە؟ یان نەتەوەییە. چوون هەموو ئەو ڕژێمانەیان پێ لەو جەهەننەمەی ستالین و شۆڕەوی پێباشتر بوو و بە گیان و دڵ ئامادە بوون بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان بەبێ لەبەرچاوگرتنی تەنگ و چەڵەمەکانی. لەو نێوەندەدا چارەنووسی من و عەزیز و ئەحمەد قەرەچەمەنی و سەعید خانیان و محەممەدیی و حەمەدی مەولودی (محمد مولودیان) جیاواز بوو.

حەمەدی مەولودی حوکمی لەسێدارەدانی هەبوو و هەر پێی لە خاکی ئێران دانابا، لە سێدارەیان دەدا...

## لاپەڕەی ٢٦٨

... پاشی چەند ڕۆژان من و عەزیز فەرهاد و حەمەدی مەولودی‌یان بۆ ژیان و کارکردن ڕەوانەی شاری «قوبا» کرد کە شارێکی سرووشتجوان بوو. باغەسێوە زۆر و زەبەندەکانی ناوباگی هەبوون. دیارە چوونی ئێمە بۆ ئەو شارە لەسەر ڕێنوێنی هەندێک لە دۆستەکان بوو ئەگینا ئێمە هیچ

شوێنێکمان پێنەدەزانی.

لەوێ زوو لە سۆخۆزی ژمارە ١٢ لە نیزیک شاری «قوبا» حەمەدی مەولوودی کرا بە پاسەوانی باغی سێوان و هەر لەوێ ماڵیان دایە و ئەسپێکی باشیان خستە ژێر پێ و تاپڕێکی ڕاویشیان لە مستی نا...

## لاپەڕەی ٣٠٤

... حەمەدی مەولوودی لە سۆخۆزی ژمارە ١٢ ژنی هێنا و بوو بە بنەماڵە و کچی بوو کە ناوی نا «ڕووناک»...

## لاپەڕەی ٣٧٩

... شێخ لەتیف پیاوێکی قسەخۆش و خۆش مەشرەب بوو. قەڵەو و کەمجووڵە بوو. کاتی خۆی لە عێراق دەگەڵ کاک حەمەدی مەولودی لە کوردستان دوور دەخرێنەوە و بەیەکەوە لە زینداندا دەبن. بەیەکەوە زۆریان شۆخی و جەفەنگ دەکرد.

شێخ لەتیف بە نەقڵی بزنەکەی حەمەدی مەولودی زۆر پێدەکەنی و بەزمی ساز دەبوو. نەقڵی ئەو بزنە تا ماوەیەکی وێردی زمانی کوردان بوو. وەک دەگێڕنەوە حەمەدی مەولودی لە سۆخۆزەکەی کاری لێدەکرد لە نیزیکەی شاری «قوبا»، بزنێک دەکرێ و تا کەڵک لە شیرەکەی وەرگرێ. ئێرانییەک قۆشمە بە پێکەنینی خۆی دێت و بە کاک حەمەد دەڵێ کە منداڵێک بەڕەڵا بزنەکەتی ...وە. کاک حەمەدی سادە و ساکار وەدەزانێ ئەو کوڕە بەڕاستییەتی، تۆ وەرە بزنەی بگرە و چەقۆی وەبەر ملێ بنێ و کەوڵی بکە و گۆشتەکەشی باوێ بەر دمی سەگان.

لە نێوان ئێمە هاوشارییاندا، ئەو کارەی کاک حەمەد دەگەڵ ڕووداوێکی دیکە پێکمان دەگرت و هێندەی دیکە زیاتر پێدەکەنین. یەک لە هاوشارییەکامان ژنەکەی چاوی لەدەرێ بوو. پیاوەکەشی وەک ئەوەی وابوو کە هیچ ڕووی نەداوە، نە بای پێداهاتووە و نەباران. ئەوەندە بێدەمار و پشتملپان بوو کە ببوو بە وێردی زمانی خەڵک. جا ئێمەش بزنەکەی کاک حەمەدیمان لە بەرامبەری ژنی ئەو کابرایەی دادەنا و دەمانگوت جا وەرە حەمەدی مەولودی بزنەکەی لەسەر کارێکی کە لەسەر ویستی بزنەکە نەبووە و نەکراوە، ئاوا سزا دەدات و لێی خۆش نابێ بەڵام، کابرا ژنەکەی ئاوی لە ئاوەڕۆیە دەرکردووە کەچی، ئێستاش خۆی پێ پیاوە و سمێڵێکی قنجی داناوە و خاوەن پلە و پایەیە و بەسەر چەند خەڵکێکی داماو و نەداردا فیز لێدەدا و خۆی ڕادەنێ و فەرمان دەدا. ئیتر بزانێ یان نەزانێ ژنەکەی دڵی کەس ناشکێنێ و شەڕەفی بۆ نەهێشتۆتەوە...

## لاپەڕەی ٤٥٢ تا ٤٥٥

### (باسی کاک حەمەدەمین ڕاتب | ڕاتبی برا و پوورزای کاپیتان)

... لە هاوینی ئەو ساڵەدا نامەیەک هاتە ماڵم کە لەلایەن ئیدارەی ئاسایشی شۆڕەوەی بەناوی

(تیم.گێ.بێ)وە نووسرابوو و داوای منیان کردبوو. ئەو ئیدارە تۆقێنەرە نامەی بانگهێشت بۆ هەرکەس بنێرێت، بەدڵنیاییەوە خێر نییە و گۆنگەڵی بەدواوەیە. کورد و کرمانجی دەبێ دەست لەخۆت بشۆیەوە. من دەگەڵ ڕەعنای هاوسەرم لێکمان دایەوە کە بچم. وەسێتم کرد و ڕەعناش ڕوو بە قوبلە دوو دەستی لە حەوا کردن و بە چاوی بەگریانەوە لە خودای دەپاڕایەوە تا یارمەتیمان بدات. یای فاتمی جیرانیشمان لە باسەکە ئاگادار کردەوە.

لە کاتژمێری دیاریکراو چوومە ئیدارەی پۆلیسی نهێنی شۆڕەوی، ڕێک لەو شوێنەی کە هەشت مانگان گیرابووم. ترس و دڵەڕاوکە هەموو جەستەمی داگرتبوو. نەمدەزانی چ باسە و بۆ بانگیان کردووم؟ هێندەم دۆعا کردبوو و نزام بردبوو کە خوداش لەدەستم وەئامان هاتبوو. لەبەر دەرگای چاوەڕوانیی، بەپێوە ڕاوەستام. پاش نیو کاتژمێر بانگ کرام بۆ ژووری ئەولاتر. ئەفسەرێکی پلەدار، بالابەرز، موو ڕەش و سمێڵ قەیتانی لەپشت میزەکەی دانیشتبوو. زۆر بە مرچ و مۆنی و ویشک و برینگ وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە و بە هێما تێیگەیاندم کە دانیشم. کاتێک لەسەر ئەسکەملەکەی دانیشتم، پرسیی:



کاک حەمەدەمین ڕاتب. ئەو وێنەیە لە باکۆ گیراوە.

— (حەمەدەمین تۆرابی) دەناسی؟

— گوتم: هیچ زانیاریم لەسەری نییە.

وێنەیەکی لە ناو پاژۆ (هەڤنڤیس، فایل، دۆسییە، پروندە)یەکی ئەستوور دەرهێنا و پێشانی دام. هەرچی لێی ورد بوومەوە، نەمتوانی بیناسمەوە. ئەو کەسەی لە وێنەکەدا دیار بوو کەسێکی کز و برۆتاشراو و چاو لە قووڵەوەچوو بوو کە پیاو بە دیتنیی زەندەقی دەچوو. سەرتان نەهێشێنم، هەرچی کردم و کراندم نەمناسییەوە. بە کابرام گوت کە نایناسمەوە و ئەو کەسەم قەت نەدیوە.

کابرا گوتی:

— ئەوە کەسە برایەکی هەیە لە «قوبا» بە ناوی محەممەد مەولودیان (حەمەدی مەولودی)!

کە وای گوت، زوو زانیم کە ئەوە حەمەدەمینە، کوڕی سۆفی مەولودی. بیستبووم کە لە سەر سنووری عێراق ئەمنیەکانی شای دەیگرن و لە زینداندا ئەوەندەی ئەشکەنجە و ئازار دەدەن کە شێت دەبێت و تازە نابێتەوە مرۆڤێکی ئاسایی. بە کابرای ئەفسەرم گوت کە:

— گەر ئەوە هەمان حەمەدەمین بێت!؟ لە ژێر جەزرەبەی ساواک و جەللادەکانی ڕژێمی پاشایەتیدا نەیتوانیوە زیاتر بەرگەبگرێت و تێکەڵی کردووە.

تەواریش ئەفسەرە ئازەرییەکە بە زمانی ڕووسی و تورکی تێیگەیاندم کە:

— دوکتۆر لە زیندانی (پسخولوژ) پشکنینی بۆ کردووە و نووسیویەتی کە ساغ و سەلیمە. ئێستا ئەو لە نێوان ئەو کەسانەی کە دەیانناسێت و ناوی داوە، یەکیان ئەتۆی و دەڵێ کە قادر دەمناسێت!

— گوتم: تەواریش سەروان، ئەوە پیاوێکی بێزەڕ و نەخۆشە، لە چوار گۆشەی جیهان ڕاونراوە، نە لە عێراق و نە لە ئێران نەیانهێشتووە بژیی بۆیە، پەنای بۆ وڵاتی سۆڤیەت هێناوە. جێی خۆیەتی کە بە دلۆڤانییەکی سۆسیالیستی لێی بڕوانن و بیبەنە لای براکەی حەمەدی مەولودی لە شاری «قوبا» تا لەوێ ژیانێکی شایانی مرۆڤانە بۆخۆی بونیات بنێت.

پاشی ئەو قسە و باسە و ئەو پرسیار و وەڵامانە من ئیزن درام کە بگەڕێمەوە ماڵە خۆم. لەو ڕووداوە مانگێک تێپەڕی. ڕۆژێک لە دەرگای ماڵیان دا. دیتم کە ئەوە حەمەدەمینە بە سەر و سەکتێکی زۆر وێران و چڵکن. جلەکانی کۆن و دڕاو، تا بڵێی کۆڵەوار پەنای بۆ من هیناوە. زوو ناردمە حەمام و دەستێک جلی تازە و خاوێنم دایە دەگەڵ کڵاوێکی شاپۆی بەنرخ، کەوشی تازە و چاویلکەی ڕەش و کراوات و کاتژمێرێکی دەستی و یەکی گیرفانیش، کامێرایەکی وێنەگرتن و لە کورتە ببڕێنمەوە، هەرچی بۆ پیاوێکی کەشخە و پەرداخ پێویست بوو پێشکەشم کرد و پووڵێکی باشیشم دە گیرفانی نا. پاشی دوو ڕۆژ میوانداری کردنی کاک حەمەدەمین لە ماڵە خۆم، چوو بۆ لای ڕەحیم ئاغای قازی. ئەویش لەلایەن فیرقەی دیموکڕاتەوە کۆڵێکی دەست و دیاری و یارمەتی بەرچاو بۆ کۆکردەوە و پێیدا. «عشق خان» برای ئارامی هەرمەنی گاراجدار، پیاوێکی وێچوو و وەنێوکەوتووی شاریمیاندواو و فیرقەی دیموکڕات بوو. ئەو پێشنیاری کرد کە حەمەدەمین بەرێتە لای خۆی و ئەو باغەی کە بەدەستەوەیەتی بە حەمەدەمینی بسپێرێت و مانگانە ٥٠ ڕوبڵی وەک مەعاش بداتێ و کەرەسەی ژیانی بۆ دابین بکات و خواردنیشی بداتێ. تەنانەت گەر حەزیشی لێبێت، ژنی بۆ بخوازێت و شەوانەش بینێرێتە خوێندنگا. خوالێخۆشبوو عشق خان زۆری چاکە بۆ کاک حەمەدەمین هەبوو.

حەمەدەمین بەردەوام سەردانی کاکی دەکرد و هەمووجارێش لێیان دەبوو بە دمەقاڵە و جنێو و بۆڵەبۆڵی برایانە، وەها کە جێی ساغی کاکی نەدەما کە جنێوی پێنەدات، ئینجا دەگەڕایەوە بۆ باکۆ. لەوێش کە هاوڕێکان و دۆستانی لۆمەیان دەکرد و بەسەری دەڕۆیشتن، دیسان دەچۆوە لای عشق خان کن ماڵ و حاڵیی خۆی.

شەڕ و هەڵڵای حەمەدەمین ببوو بە بنێشتەخۆشکەی زاری خەڵک و ئیتر هەمووکەس لەوە تێگەیبوون و دڵنیا ببوون کە حەمەدەمین تێکەڵی کردووە و ئاکارەکانی و ناخەفتنەکانی ئاسایی نییە.

عیشق خان تاپرێکی دابوو بە کاک حەمەدەمین تا شەوانە پاسەوانی باغەکەی پێ بدات و کە چاوی بە گورگ، بەراز، چەقاڵ و ئاژەڵی دڕ کەوێ، بە تاپرەکە تێیانگرێ. ڕۆژێک کاک حەمەدەمین دەگەڵ کابرایەکی ئازەری لیی دەبێتە دمەقاڵە و ڕەپێی دەنێ. کابرای ئازەری هەڵدێت. کاک حەمەدەمینیش بە تاپرەکەی لە پشتەوەڕا فیشەکی پێوەدەنێ و هەموو ساچمەکانی لە سمتەکانی کابرا ئازەری بەتاڵ دەکات. هات و هاوار دەست پێدەکات کە حەمەدەمین ئەو پیاوە بێئەنوایەی کوشت. حەمەدەمین کە ئەو هەرا و بگرە دەبیسێت، لەترسان ڕادەکات و لە تاریکی شەودا دەچێتە ماڵی کاک عەلی گەلاوێژ. هەر لە دەرگا دەدات بە کاک عەلی دەڵێ کە پیاوم کوشتووە و خۆم دەماڵت هاویشتووە. کاک عەلیش کە باش لە قانوون و دۆخی شۆڕەوی ئاگادارە و هەروەها ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکڕاتی ئازەربایجانە وەردەگەڕێتەوە و پێیدەڵێ:

«بۆ کاک حەمەدەمین پێتوایە ئێرە کوردستانە کە هەرکەس کەسێکی بکوژێ بچێتە ماڵە شێخ و ئاغایەکی و خۆی حەشار بدات؟ مەگین نازانی ئێرە خاکی شۆڕەوییە و کەڵ بە موو بەندە؟ ئێستاش دانیشە با چارەیەکت بۆ بدۆزمەوە».

هاوکات کە کاک حەمەدەمین لە داڵانەکەی ماڵە کاک عەلی گەلاوێژ بە پەشۆکاوی دێت و دەچێت تا بەڵکوو کاک عەلی دەراوێکی ڕوونی بۆ بدۆزێتەوە، کاک عەلی تەلەفۆن دەکات بۆ ئیدارەی ئاسایش - پۆلیس و (میلیسیا)ی شۆڕەوی. پاش تاوێکی کەم، دێن کاک حەمەدەمینی داماو تێکوەردەپێچن و دەیگرن.

کە ماوەیەک لەو ڕووداوە تێپەڕی، بیستمانەوە کە کاک حەمەدەمینیان بە پێنج ساڵ زیندانی و بێگاری لە (لاگیر)ەکانی سیبیریا حوکم داوە. بەداخەوە کاک حەمەدەمین لەوێش هەدای نەدەدا و پێشی بە دمی خۆی نەدەگرت و دەگەڵ خەڵکی بەشەڕ دەهات و جنێوی پێدەدان و زێندینەکانیش تێیانهەڵدەدا. ئەو کارانەی وای کردبوو کە ماوەی زیندانییەکەی بۆ درێژ بکەونەوە.

بە هەڵکەوت دەکەوێتە هەمان (لاگیر) کە دوکتۆر مستەفا شەڵماشی لەوێ بەند کراوە. دەگەڵ ئەو دەبێتە هاومەنزڵ. دوکتۆر مستەفا کە ئاکار و کردەوە نابەجێیەکانی کاک محەمەدەمین دەبینێت، بەسەری دەچێت و نەسیحەتی دەکات تا نەیانکاتەوە بەڵام، حەمەدەمین قەڵس دەبێت و پەلاماری دوکتۆر مستەفا دەدات تا لێیبدات کە بەندییەکانی تر وەسەر دەگەڕێن و دوکتۆر مستەفا لە چنگی کاک حەمەدەمین ڕزگار دەکەن.

حەمەدەمین پێش ئەوەی دەزیندانێ کەوێ، دەگەڵ کاک حەمەدی مەولودی برا گەورەی، بەردەوام شەڕی دەکرد و نەدەحاواوە. حەمەدەمین بە کاکی دەگوت کە: «کاکە گیان من هاتووم خزمەتت پێبکەم و نۆکریت بکەم». ئاغای مەولودیانیش (حەمەدی مەولودی)، لە وەڵامدا دەیگوت: «من لە چنگی ئێوە لە عێراق هەڵاتم هاتمە شۆڕەوی، ئێستا نازانم لە داخ ئێوە لێرەوە بەرەو کوێ هەڵێم؟

حەمەدەمین چەندجارێک ویستبووی کە لە زیندان هەڵبێت و هەمووجارێش دەگیر کەوتبۆوە و هەمووجاریش ماوەی زیندانییەکەیان بۆ درێژ دەکردەوە. تا ئەوکاتەی کە ڕژێمی سوسیالیستی شۆڕەوی تێکرووخا (١٩٩١ز) و ئاڵۆزی و بشێوی پەیدا بوو و سنوورەکان کرانەوە و حەمەدەمین توانی بگەڕێتەوە بۆ ئێران و لە دەوری بەنداوی سابڵاغێ کەپرێکی دروست کرد و تێیدا دەژیا. حەمەدەمین کە هاتیشەوە سابڵاغی دەگەڵ خزم و کەسەکانی دانووی نەدەکوڵا و بەردەوام دەگەڵیان بەشەڕ دەهات و ناکۆک بوو. خودا وەخێرێ گێڕی.[1]

**لاپەڕەی ٤٧٨ تا ٤٧٩**

کاک حەمەدی مەولودی کە لە ئێمە بەتەمەنتر و بەساڵاچووتر بوو، پیاوێکی دڵناسک بوو. زووزوو لێمان دەڕەنجا و زیز دەبوو. دوو ماڵی هەبوو، یەک لە «قوبا» ئەوەیتریش لە «باکۆ». لە باکۆ بە یادی ڕۆژانی پێشمەرگایەتی، پارتیزانیی، قاچاغچێتی و هەروەها هەڵگەڕانەوەی لە دەوڵەتی ئێران، دیواری ماڵەکەی کونکون کردبوو. وەک ئەوە وابوو کە لە هەموو لایەکەوە بیپێکن و لە ژێر

---

[1] مام حەمەدەمین یان مام حەدەمەین (وامان بانگ دەکرد) هەر وەکوو دوکتور ئاسۆ ئاماژەی پێداوە، زڕبرای نەمر کاپیتان بوو. چالاکێکی سیاسی بوو کە دەگەڵ نەمر سولەیمان موعەینی، مامە غەنی بلوریان و کاک جەلیل گادانی و کۆمەڵێکی تر لە تێکۆشەرانی گەل، بە تاوانی ئەندامبوون لە حیزبی دیموکراتی کوردستان لە زیندانی تەورێز و زیندانی قەسر لە تاران بۆ ماوەی ١٠ ساڵان ئەشکەنجەی زۆر درا و بە وتەی کاک جەلیل گادانی لە ژێر ئەشکەنجەدا باری دەروونی تێکچوو و خۆی نەگرتەوە کە کاک جەلیل شاهیدی هەموو بەسەرهاتەکەی ناو زیندان بوو کە چۆن مام حەدەمین لەپاش ئەشکەنجەدانی، کتوپڕ باری دەروونی تێکچوو. مامۆستا محەممەدی خزریش لە پەڕتووکی (لە قەرەشلاخەوە بۆ سوئێد ل ٢٣٨) لەسەر کاک حەمەدەمین دواوە و بە هەمان شێوەی کاک جەلیل گادانی باسی دەکات. دوای کوێرەوەری، ئەشکەنجە، ئازار، ماڵوێرانی و دەربەدەریەکی زۆر لە ساڵی ١٩٩١ گەڕایەوە سابڵاخ، بەڵام بەداخەوە باری دەروونی ناسەقامگیر بوو. خزموکەس زۆریان حەوڵ دەگەڵدا کە لە ماڵی ئەوان بمێنێتەوە یان ئیزنیان بدات ماڵی بۆ بگرن. بەڵام هەراهەرا و گرمەگرمی ناو شار، ئەوی ئازار دەدا. لەکن جەزیرەی مەهاباد کەپرێکی لە چەلەنگ و مەقەبیا و شڕوشاڵات ساز کردبوو و لەوێدا دەژیا. خەڵکی بە ئەمەگی سابڵاخ و دەوروبەر زۆر چاکیان ئاگا لێبوو. مرۆڤێکی یەکجار نیشتمانپەروەر بوو و هەتا ئێسقان باوەڕی بە کوردایەتی و ئازادی و یەکسانی هەبوو و کوردوستانی بە قیبلەی خۆی دەزانی، هەر بۆیەش لە ناو خەڵکدا زۆر خۆشەویست بوو. لە یادمە کە سوێندی دەخوارد دیگوت: ( بە خاکم، بە نیشتیمانم، بە کوردستانم، بە ئاڵام، بە زمانم). لەسەر ڕاوێژی مام حەدەمین هەموو منداڵی بنەماڵەش لێی فێر ببوون و ئەوانیش هەروا سوێندیان دەخوارد. یەکێک لە منداڵەکان (ڕامیار) کە لە هەمووان گچکەتر بوو و لە مانای "زمان"، وەکوو زمانی دایکی (کە مەبەستی سوێندەکەی مام حەدەمین بوو) تێنەدەگەیشت و پێی وابوو مەبەستی مام حەدەمین زمانی ناو زارە. کە سوێندی دەخوارد، کاتێک دەگەییشتە ئەو بەشەی کە دەیگوت سوێند بە زمانم، ددانیشی دەگەڵ دەخست و دەیگوت: ( بە خاکم، بە نیشتیمانم، بە کوردستانم، بە ئاڵام، بە زمانم، بە ددانم.....) ئەو بە ددانمە تا ماوەیەکی زۆر ببوو بە جێگای جەفەنگ و پێکەنینی کۆبوونەوەکانی شەوانەمان. بەداخەوە لەسەر ڕێگای جەزیرەش نەیتوانی هەڵبکات لەبەرئەوەی هاتوچۆی زۆر بەسەرەوە بوو، بۆیە لە دۆڵی مەعدەن لە سەرەوەی باخی مکائیل کۆنە ژوورێکی بێدەرک و پەنجەرەی لێبوو و ئەوێی کردە مزڵی خۆی. ئەوێ شوێنێکی ئارام و بێدەنگ بوو. مخابن کە لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٠ی زایینی بە هۆی ڕاوەستانی دڵ تەرمی بێگیانی ئەو دڵسۆزەی نیشتمان لەو ژوورەدا دەدۆزرێتەوە. ڕۆحیان شاد و یادیان هەرمان.

چاوەدێری دابێت، جا چ لە ناو ماڵەکەیدا یان لە دەرەوە ڕا. وای لەو دار و دیوارە کردبوو کە بتوانێ چاوی لە هەموو کەلێن و قووژبنی ماڵەکە ببێت تا بە خەیاڵی نەکا بێن دەورەی بدەن یا دەرفەتی ئەوەی هەبێت کە بۆی دەرچێت و هەڵێ.

کاک حەمەد بۆ هەموومان چەشنی مەلا نەسرەدینێک بوو. پیاوێک بوو خۆشمەشرەب و قسەخۆش. قەت لێی ماندوو نەدەبووی. بەداخەوە جاروبار بەبێ هیچ هۆکارێک قەڵس دەبوو و دەغەزرا و پاش تاوێکی تر دەیزانی کە لەخۆڕا غەزراوە و هەڵەی کردووە، جا دیسان دەهاتەوە لامان.

کاک محەممەدی مەولودیان (حەمەدی مەولودی، بە محەممەدی ڕاتبی‌ش دەناسرێ) لە زەمەنی ئەمر قازی محەممەد، پلەی «کاپیتان»ـی هەبوو. پاشان پلەکەی بەرز بۆوە بوو بە سەرهەنگ. فەرماندەیەکی چالاک و لەزەبری هێزی پێشمەرگە بوو. ئەو لە ڕابردووی خۆی زۆر شتی خۆشخۆشی بۆ باس دەکردین. دەیگوت:

کاک حەمەدەمین ڕاتب - ڕاتبی. ئەو وێنەیە لە مەهاباد و کاتی گەڕانەوەیان لە دوای ڕووخانی شۆڕەوی گیراوە. سپاس بۆ وەستا عەبدوڵای خەیات و هاورێکەی کە ئەم وێنەیەی بۆ ناردم.

کاتێک پێشم بە لەشکری سەربازانی شای گرت کە دەیانویست لە سەقزەوە بچنە سەردەشت، دوو سەرهەنگیان دەگەڵ بوو کە بەدیلم گرتن. چاوم بە قەفەسێکی کەوت کە دوو کۆتری تێدابوو. کە کۆترەکانم لە قەفەسەکەیان دەرهێنا، سەرهەنگ هاواری لێ بەرز بۆوە کە: ئەوە چ دەکەی؟ ئەوانە کۆتری نامەبەرن. کاک حەمەدیش لە وەڵامی سەرهەنگی شاهەنشاهیدا سەری هەرتک کۆتران هەڵدەقەنێ و دەڵێ: ئەوە دەیانکەم بە کەباب تا جارێکی دی نامەی ئێوە بۆ دام و دەزگای سەلتەنەتی نەگوازێتەوە.

کاک حەمەد پێش دەرکەوتنی لە ئێران و هاتنی بۆ شۆڕەوی، (پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان) ماوەیەک لە ناوچەکانی مەهاباد و بۆکان و سەردەشت دەگەڵ هێزەکانی دەوڵەت شەڕی چریکی دەکرد. لە ساڵەکانی ١٣٢٨ و ١٣٣٠ هەر ڕووداوێک ڕوویدابا یان گورزێک لە هێزەکانی دەوڵەتی درابا یان لە سەربازەکانی دەوڵەت کوژرابان، یەکسەر بەسەر کاک حەمەدیان دادەهێنا و دەوڵەت دەیگوت کاری (محەممەد مەولودیان)ـە. بۆ بەزیندوویی گرتنی ئەو لە لایان دەوڵەتی

شاهەنشاهییەوە خەڵاتێکی گرینگ و بەرچاو تەرخان کرابوو تا بیدەن بەو کەسەی کاک حەمەدیان بۆ بگرێ.

لە کۆتایی ساڵی ١٣٣٠ لە ڕێگای کێوەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێرانەوە، یانی هەمان ڕێگای کە مەلا مستەفا بارزانی و خەباتگێڕەکانی پێیدا هاتبوونە شۆڕەوی، کاک حەمەدش هات بۆ خاکی شۆڕەوی و داوای پەنابەرێتی کرد. یەکەوبەدوو دەیگرن و سێ ساڵان دە زیندانی دەکەن و بۆ (لاگیر)ـەکانی سیبیرییان نارد و بێگارییان پێدەکرد. وەک لە پێشووتریش باسم لێوەکرد، لە دۆخێکی دڵتەزێندا کاک حەمەدم دۆزییەوە و لەخۆمانم نیزیک کردەوە. محەممەد مەولودیان دەیگوت لە تێرۆڕی قازیزادەدا تێدابووم بەڵام ئەو نەیکوشتووە. تەنانەت حەسرەتی دەخوارد کە بۆ دەگەڵ ئەو شەڕئەنگێزانە هێرشی کردۆتە سەر ماڵە کەسێکی تر و کوشتیان و ماڵ و دارایيەکەیان بەتاڵان برد.

ئەو بەردەوام ئاواتی وا بوو کە خێزانەکەی دەگەڵ تاقەکوڕەکەی بە ناوی «خانە» (لە بنەڕەتدا (ناوی عەبدولڕەحمانـە بەڵام، لە خۆشەویستییان پییان گوتووە «خانە» - نووسەر) بێن بۆ لای لە شۆڕەوی و دەگەڵ ئەو بژین. ئەو نیگەرانی ئەوە بوو کە کوڕەکەی ڕێبازی بابی نەگرێتە بەر و خۆ بدۆڕێنێ و ببێتە جاش و پیاوی ساواک و دەوڵەت. لە باکۆیە دەگەڵ ڕەحیم ئاغای قازی بەردەوام شەڕ و کێشەی هەبوو. دەگەڵ یەکتر نەدەسازان. کاتێک هەستی بەوە دەکرد کە ڕەحیم ئاغا لە ماڵ نییە، دەچوو بۆ ماڵیان و هەرچی دڵی ویستبای هەڵیدەگرت و دەیبرد وەک ڕادیۆ، تێلێڤیزیۆن و هتد. ژنەکەی ڕەحیم ئاغاش دەستی وەبەر نەدەهێنا و هیچی پێنەدەگوت. تەنانەت ڕەحیم ئاغاش قەت هیچی پێنەدەگوت و خۆیشی لێ تووڕە نەدەکرد. بە پێچەوانەوە دەیگوت کە چ ناکرێ دەگەڵ کاک حەمەدی، ئەو سەرپشکە و ئیختیاری ماڵی منی هەیە.

ڕۆژێکی کاک حەمەد هاتە ماڵمان و لەبەر دەرگای ماڵمانەوە بە پێکەنین و خۆشحاڵییەوە بە ڕەعناخانمی هاوسەرمی گوت: مزگێنیم دەیە، ڕەحیم ئاغا بەردی گورچیلەی هەیە و لە نەخۆشخانە کەوتووە. دەزانی ئەو بەردە چییە؟ ئەوە هەمان زەردەچێوەیەیە کە لە ئێرانەوە بۆیان ناردبووم و ڕەحیم ئاغا لێی خواردم و نەیدامەوە. ئێستا لێی بووەتە بەردی گورچیلە.

بەو قسەیە دەیویست پێمان بڵێ کە هەرکەس زوڵمی لێبکات، خودا ئاوای بەسەر دێنێ. ئەوە لە حاڵێک دابوو کە بۆخۆی لەو ژیانە پڕ ڕەمز و ڕازەی خۆیدا زورداری دەگەڵ سەدان کەس کردبوو. کە واتە باش وایە کەس لە زاکونی وەگەڕ خۆ گێل نەکات، لەبەرئەوەی ڕۆژێک دێت کە ڕۆژی وەرگەڕێ. دەڵێن لەپاش شۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ ئیزنیان دابوو بە کاک حەمەد کە بگەڕێتەوە زێدی خۆی، لە خۆشیان جەڵتە لێیدەدات و گیان دەدات و لە گۆڕستانی باکۆ دەینێژن.

**لاپەڕەی ٥٢٢**

دەو لاپەڕەیەدا دەڵێ : کاک حەمەد کە بۆخۆی چەند ساڵان لە عێراق ژیابوو زۆری حەوڵ دا تا من نەچمەوە بۆ عێراق.

## ڕۆژنامەی «کوردستان»ـی ژمارە ٨٥ لاپەڕەی ٢

ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان
(پێنجشەممۆ ٢١ی خەرمانانی ١٣٢٥)

[ لە میرەدێوە

**سوپاس**

ئەمن محمد مولودی بەخۆم و پێشمەرگەکانمەوە کە ماوەیەک بوو لە گوندی بەڵەجەڕ کارمان پێ ئەسپێردرابوو ئاغایانی بەڵەجەڕ بە نێوی مامەند ئاغا و فارس ئاغا و برایانی مامەند ئاغا هەمیشە بە بوونی ئێمە شاد و خۆشحاڵ بوون و هەموو ڕۆژێ دیدەنیان لێ دەکردین و دەیانگوت ئێمە بە بۆنەی خۆمان لە هیچ جۆرە خۆدەپێناوانێک کۆتایی ناکەین و ئامادەین بە ماڵ و بە گیان دە ڕێی ئازادی و پاراستنی ئاڵای موقەدەس و بە دوژمنایەتی ئیرتیجاع گیانبازی بکەین. دیسان ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان تەواوی پێشمەرگەکانی بەڵەجەڕیان دیدەن کرد و جێژنەپیرۆزەیان لێ کردین. لە بەرواری ٩-٦-٢٥ لە لایان جەنابی پۆتپۆلکۆنیک مستەفا خۆشناو بە ئێمە ڕاگەیەندرا کە پۆستی بەڵەجەڕ بگوێزینەوە بۆ «میرەدێ». ئاغایانی بەڵەجەڕ بە گوێزینەوەی ئێمە زۆر غەمناک بوون و تا میرەدێ دەگەڵمان هاتن و بەڕێیان کردین.

کە چووینە پۆستی میرەدێ، ئاغای ڕەسوڵ ئاغای جەوانمەردی هات بە پیرمانەوە و لە پۆستی میرەدێش دیدەنی لێ کردین و لە ماوەی چەند ساعاتان کە لەکنمان دانیشتن ڕەسوڵ ئاغا بە قورئانی مەجید سوێندی خوارد کە: (ئەمن بە نۆبەی خۆم ئامادەم دە ڕیی ئازادی و پاراستنی خاکی کوردستان و ئاژینی دەستووری پێشەوای مەحبوبدا لە هیچ جۆرە خۆدەپێناوانێک ڕوو وەرنەگێڕم).
پاشان دەستی لەناو دەستی هەمووان نا و زۆر بە دڵخۆشی و شادمانی بەجێی هێشتین،

ئێمە ئەو ئاغایانە: ڕەسوڵ ئاغا، مامەن ئاغا، فارس و سایری بە کوردێکی نیشتمانپەروەر دەزانین و زۆریان سوپاس و قەدرزانی لێدەکەین.

کاپیتان محمد مولودی ]

لەمیرەدیەوە

# سوپاس

ئەمن محمد مولودی بەخوم وپیشمەرگەکانمەوە کەماوەیەك بوو لەگوندی بەلەجەر کارمان پی ئەسپیردرابوو آغایانی بەلەجەر بەتیری مامندآغاو فارس آغاو برایانی مامند آغامەمیشە بەبونی ئیمەشادو خوشحال بوون وهەموو روزی دیدەنیان لی دەکردین ودەیانگوت ئیمەبەنوبەی خومان لەهیچ جورە خودەبیناوتانیک کوتایی ناکەین وآمادەین بەمال وبەگیان دەری آزادی و پاراستنی آلای مقدس وبەدوژمنایەتی ارتجاع گیانبازی بکەین دیسان روژی جیژنی رمضان تەواوی پیشمەرگەکانی بەلەجەریان دیدەن کردوجیژنەپیروزەیا لی کردین لەبەرواری ۹-۶-۲۵ لەلایەن جنابی بوت پولکونیك مصطفی خوشناو بەئیمەراگەیندرا کەپوستی بەلەجەر بگوێزینەوە بومیرەدی آغایانی بەلەجەر بەگوێزینەوەی ئیمە زورغمناك بوون وتامیرەدی دەگەلمان هاتن وبەریان کردین .

کەچوینە پوستی میرەدی آغای رسول آغای جوانمردی هات بەپیرمانەوە ولەپوستی میرەدیش دیدەنی لی کردین ولەماوەی چەندسەعاتان کەلەگەلمان دانیشتن رسول آغا بەقرآنی مجید سویندی خوارد کەئەمن بەنوبەی خوم آمادەم دەری آزادی وپاراستنی خاکی کوردستان وآزێنی دەستوری پیشەوای محبوب دالەهیچ جورەخودە بیناوتانیك روومرنەگیرم پاشان دەستی لەناودەستی هەموان ناوزور بەدلخوشی وشادمانی بەجیی هیشتین .

ئیمە ئەوآغایانە : رسول آغا . مامند آغا فارس وسایری بەکوردیکی نیشتمان پەروەر دەزانین وزوریان سوپاس وقدر زانی لیدەکەین

کاپیتان محمد مولودی

ڕۆژنامەی "کوردستان"ی ژمارە ۸۵ لاپەڕەی ۲
ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان
(پێنجشەممۆ ۲۱ی خەرمانانی ۱۳۲۵)

## نووسراوەکانی دوکتۆر کەماڵ مەزهەر

دوکتۆر کەماڵ مەزهەر لە کتێبی «کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا» بەرگی یەکەم و چاپی دووهەم کە لە ساڵی ۲۰۰۹ چاپ کراوە وەرزێکی تەرخان کردووە بە ڕووداوەکانی کۆماری کوردستان لە بەڵگەنهێنییەکانی دەوڵەتی ئینگیلسدا. لە بەشێکدا باس لە وەسیەتنامەی پێشەوای نەمری کوردستان دەکات کە بە خەتی مامۆستا مەلا «سەدیقی سیدقی» نووسراوە. جا مامۆستا کەماڵ مەزهەر هەوڵیداوە کە تیشک بهاوێتە سەر وەسیەتنامەکەی پێشەوا و لە ڕوانگە جۆراوجۆرەکانەوە هەڵیسەنگێنێت تا بەرپەرچی ئەو وەسیەتنامانە بداتەوە کە بە درۆ هەڵبەستراون بۆ پێشەوا. لە درێژەدا باسێکی کاپیتان دەگێڕێتەوە لەو پێوەندییەدا کە دەقاودەق لێرە دایدەنێمەوە.

**داستانەکەی محەممەدی مەولود**

حەز دەکەم کۆتایی ئەم بابەتە بە کورتەباسێکی یەکێک لە ڕۆڵە هەرە دڵسۆز و ساکارەکانی مەهاباد بهێنم کە ناوی محەممەدی مەولودە، لە ساڵی ۱۹٦۱وە دکتۆرە نەسرین فەخری و دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ و من لە نیزیکەوە ئەو زاتەمان ناسی و بە دڵ خۆشمان ویست و ڕێزێکی تایبەتیمان لێی دەنا.

خوالێخۆشبوو محەممەدی مەولود پیرە کوردێکی ساکار و ڕەشید و بە جەوهەر و لای خەڵک خۆشەویست و ڕێزدار بووە، هەر زوو هەستی کوردایەتی ڕەسەن پاڵی پێوە ناوە ببێتە پێشمەرگەیەکی دڵسۆزی کۆماری مەهاباد (کوردستان) و نیزیک خودی قازی محەممەد. ئاوا بوونی خۆری ئەو کۆمارە و لە سێدارەدانی پێشەوا و هاوەڵەکانی و کردارە چەپەڵەکانی دوژمن ناخی دەروونی خاوێنی دەهەژێنن، خۆی دەگەڵ خۆیدا بڕیار دەدات تۆڵەیەک بستێنێت، بیری ساکاری ئەم نەخشەیەی بۆ دادەڕێژێت - ئەو مەلایەی بەر لە سێدارەدانی تەڵقینی قازی محەممەدی داوە خۆڵ و دۆی بەسەردا بکات و بە سواری کەرێک چەند بۆی بلوێت هێند شاربەدەری بکات (۱۳۵)، ئەنجام محەممەدی مەولود پەنا دەباتە بەر وڵاتی سۆڤیەت و لە شاری باکۆی پایەتەختی ئازەربایجان تا کۆچیدوایی لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا بە قەدرەوە ژیا.

**دوکتۆر کەماڵ مەزهەر لە پەڕاوێزێکدا بە ژمارە (۱۳۵) کە دایناوە ئاوا دەنووسێت:**

(۱۳۵) شایانی باسە محەممەدی مەولود بۆخۆی زۆر دەگمەن توخنی ئەو باسە دەکەوت، بەڵام گەلێک جار دوکتۆر ڕەحیمی قازی و دوکتۆر عەلی گەلاوێژ و کاک عەبدوڵڵای برای دوکتۆر موراد و

ژمارەیەک ئازەریی وەک دوکتۆر ڕۆئینیدێژ ئەم باسەیان بۆ گێڕاومەتەوە، هەروەها بە بۆنەی ساڵ یادی مەهابادەوە پوختەیم لە وتارێکمدا نووسی کە پێم وایە لە ڕۆژنامەی (کوردستان)بڵاو کرایەوە، بەو بۆنەیەوە برای بەڕێز مامۆستا عەبدوڵڵای حەسەنزادە ئاگاداری کردم کە ئەو مەلایە ناوی مەلا سدیق بووە و پیاوێکی خەراپ نەبووە، پێی وابووە بەو کارەی ئەرکێکی ئایینی بە جێ دەگەیەنێت، برای بەڕێز مامۆستا هاشمی کەریمیش لەم ڕۆژانەدا لە لەندەن ئەمەی دووپات کردەوە و بەپێی گێڕانەوەی دیموکراتەکانی ئەودیو ساڤاک[1]، بە زۆر هەڕەشەی کوشتن، گەلێک لە پیاوە ئاینییەکانی مەهاباد و دەوروبەریان ناچار کردووە قسەی ناشیرین دژی کۆماری مەهاباد (کوردستان) و پێشەوا بکەن و تەنها مەلایەک زاتی کردووە بەرپەرچیان بداتەوە و لەسەر ئەوە شەهیدیان کردووە.



دوکتور کەماڵ مەزهەر

[1] (سازمان اطلاعات و امیت کشور) بە کورتکراوەیی (ساواک)، لە کۆتایی ساڵی ١٣٣٥ی هەتاوی (١٩٥٦ز) دامەزرا. بە دڵنیاییەوە ساواک نەبووە، ڕەنگە دوکتور کەماڵ مەبەستی (روکنی ٢)ی ئەرتەش بووبێ کە هەمان کاری ساواکی دەکرد.

## بیرەوەرییەکانی ڕەئیس بەکر


ڕەئیس بەکر

(عەقید عەبدولکەریم حەوێزی)
گەشتێک بەناوی کۆماری کوردستاندا
١٩٤٤ - ١٩٤٧
بڵاوکراوەی: ئاراس
چاپی دووهەم
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە
هەولێر - ٢٠٠١

(بەکر عەبدولکەریم حەوێزی) کە زیاتر بە (ڕەئیس بەکر) ناودێرە، یەک لەو ئەفسەرانەی عێراق و خەڵکی باشووری کوردستان بوو کە پلە و پایەی سەربازی خۆی لە دەوڵەتی عێراق بەجێهێشت و تێکەڵ بە هێزی پێشمەرگەی کۆماری کوردستان بوو. لەلایەن وەزیری شەڕی کۆمارەوە، بەڕێز حەمە حوسێن خان سەیفی قازی، کرا بە فەرماندەی جەبهەی سەردەشت.

**لاپەڕەی ٧٨**

(لێرە باس لە وەرگرتنی ماموریەت دەکات لەلایەن پێشەواوە تا بچێتە ڕەبەت و ببێتە فەرماندەی ناوچەی سەردەشت و بانە چوون لەوێ جگە لە حەمەدی مەولودی کەسی تری لێنییە - نووسەر)

ڕۆژی دوای ئەوە کە گەیشتمە مەهاباد چوومە سەردانی حەزرەتی پێشەوا کە لەوێ کۆمەڵێک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی لە خزمەتدا بوون. کە چاوی پێمکەوت فەرمووی: « بۆچی وا درەنگ هاتی، ئەوا چەند ڕۆژێک دەبێت کە ناردوومە بە شوێنتا و چاوەڕێت دەکەم». پێموت کە هیچ فەرمانێکی بەو جۆرەم بۆ نەهاتووە، ئێستەش کە لێرەم بە هۆی پشوودانی خۆمەوە هاتووم. ئەوجار فەرمووی: «هەرچەند ئەورۆ فریا ناکەوی، بەڵام هەر ئێستێ بە دواوە هەرچی سەربازێکی بارزانی لە نێو مەهابادا، دی و دەستت دەکەون، کۆیان بکەرەوە سبەینێ دەچیت بۆ ڕەبەت.

هەرچی ئازووقە و پێویستییەک هەبێت بۆت دەنێرین چونکە نێوچەی گەورک زۆر شڵەژاوە و عەشیرەتەکانی بانە لایەنگری حکومەتی تاران دەکەن. جا لەو نێوچەیە جگە لە حەمەدی مەولود

و (٢٨) کەس زێتر هێزی دیکەمانی لێ نییە. ئەو عەشیرەتانەش ئەمەیان بە هەل زانیوە و هێرشیان بردۆتە سەر نێوچەکە. لەبەر ئەوە عەشیرەتی گەورک نەیانتوانیوە بەرەنگاریان بنەوە و هەڵاتوون و خۆیان گەیاندۆتە ڕەبەت و زۆربەی دێهاتەکانیشتیان سووتێندراوە. بۆیە دەنهەوێ کە بە زووترین کات بگەیتێ ئەوێ و هێندی پێت دەکرێ بارزانیش کۆ بکەرەوە. دەستەڵاتشت دەدەمێ کە تیپێک لەوان و لە عەشیرەتەکان و دانیشتوانی نێوچەکە و خەڵکی دیکە پێک بێنە و چەکداریان بکە و هەر یەکەشیان مانگانە (١٢٠ تمەنیان دەدرێتێ، دەگەڵ ئازووقەی پێویستی خۆیان و ماڵ و منداڵیان.

## شەڕی مەکڵاوێ لاپەڕەی ٩٢

مەکڵاوە گوندێکە، کەوتۆتە سەر ڕێگای نێوان سەردەشت و بانە. لەوێ پۆستێکی ئێمە بە سەرکردایەتی کاک حەمەد مەولود، بۆ چاوەدێری ئەو ڕێگەیە داندرابوو. مانگێ تیری کردبوو بەسەر کۆبوونەوەکەماندا، دەگەڵ سەرلەشکر ئایرووم، چوار بارزانی بۆ کڕینی هەندێک شتومەکی پێویست بۆ مەکڵاوە دەچوون دەبینن کە ستونێکی (رتڵ) سەربازی ئێرانی، (٤) تانک و زرێپۆشیان دەگەڵ و ماشێنەکانیشیان بە سەرباز و چەک تەنراوە و نیازیان هەیە لە مەکڵاوە بەرەو سەردەشت تێپەڕن. سەرلەشکر ئایروومیشیان دەگەڵ دەبێت.

بارزانییەکان دەستوبردانە دادەمەزرێن و ئیشارەت دەدەنە ماشێنەکەی سەرلەشکر کە ڕابوەستێ. لەو کاتەدا کە ماشێنەکەی سەر لەشکر دەیهەوێ دوور بکەوێتەوە نارنجۆکێکی تێدەسرەوێنن، بەڵام بەداخەوە هیچیان ناتەقێنەوە، لەم هێنانە و بردنەدا شەڕ بە گەرمی دەستپێدەکات، جەماعەتی حەمەدی مەولودیش کە لە نێو گوند دەبن دەکەونە نێو شەڕەکەوە، مەکڵاوەش زۆر لە ڕەبەتەوە دوور نییە و دەگەڵ بەدەنگهاتنی تەقەکان دەستوبردانە چەند بارزانییەکم ئامادە کرد، لە هەمانکاتیشدا (١٠٠) سواری گەورک کە دەگەڵ کاکەڵڵا ئاغا لە ڕەبەت بوون پێکەوە بەرەو مەکڵاوە ڕۆییشتن، ویستمان لە دوو لاوە ئابڵۆقەی شەڕەکە بدەین، پێش ئەوەی بگەینە ناو شەڕەکە دوژمن چاوی بە هێزەکەمان کەوت کە بەهاوکاری کاک حەمەد مەولود و هێزەکەی دەچین، هێندەیان پێکرا، کە بەرەو سەردەشت هەڵبێن، کە گەیشتینە مەکڵاوە دیتمان، چواردە کەس لە دانیشتووانی گوند بە دەستی دوژمن شەهید و بریندار کراون، سەربازێکی [پێشمەرگە] کاک حەمەد مەولودیش شەهید کرابوون، زۆر بەپەلە بریندارەکانم ڕەوانەی مەهاباد کرد، کە لەوێشەوە بنێردرێن بۆ نەخۆشخانەی تەورێز، چوار منداڵی بێباوک لە یەک ماڵدا خەراپ بریندار کرابوون.

سەبارەت بەو ڕووداوە ڕاپۆرتێکمان بۆ مەهاباد نووسی و ئەوانیش تارانیان ئاگادار کرد لە چۆنییەتی شکاندنی پەیمان و ڕێکەوتننامەی هەردوو لا، لە لایان سەرلەشکر ئایروومەوە داوایان لە

تاران کرد کە زۆر بە توندی ئاپرووم سزا بدرێت. پاشان فەرمانێکم لە لایان پێشەوای بەڕێز بۆ هات (ئەو هێزەی من پێوەندی تەنێ بە شەخسی پێشەوا هەبوو، لەبەر ئەوە فەرمانم لە هیچکەسێکی دیکە وەرنەدەگرەت) کە جارێ ئێمە هیچ هێرشێک نەکەینە سەریان، بەڵکوو لێژنەیەک لە نوێنەرانی تاران - مەهاباد بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم کارەساتە پێک بێت تا تاوانباری هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتننامەکە سزا بدرێت.



## نووسینەکانی کەریم حیسامی

کتێبی (لە بیرەوەریەکانم، بەرگی - یەکەم، لە منداڵیەوە تا ساڵی ١٩٧٥، نووسینی: کەریمی حسامی، لاپەڕەی ١٩٩).

پێویستە بگوترێ کە ئەم ڕووداوەی کە کاک کەریمی حیسامی دیگێڕێتەوە لە ساڵی (١٣٣١ھ - ١٩٥٢ز) ڕووی داوە. بڕواننە لاپەڕەی ١٩٨

حەمەدی مەولودی

ڕۆژێک لە دوکان دانیشتبووم، برادەرێکی حیزبی لە شنۆیە ڕا گەیشتێ و پەشۆکاو بوو، گوتی: «ژاندارمەی «دەشتەبێڵ» حەمەدی مەولود و محەممەدی عەولا چەپە و هاشمیان گرتووە و ئێستا هێنایانن بۆ نەغەدە و لە ژاندارمەری حەپسن. هەساتم و چوومە ژاندارمەری. بە ئاجودانم گوت: «بیستوومە چەند دز لە شنۆ گیراون، هاتووم بزانم کێن و چۆن گیراون؟ تا بۆ ڕۆژنامە بنووسم».

ئاجودان گوتی: دز نین، خەڵکی مەهابادن زەمانی دیموکڕات هەڵاتوون، تاوانی قەتڵیان لەسەرە.

- دەکرێ بیانبینم؟ ڕەنگە بیانناسم!
- بچۆ، ئەوە لە زیندان دان.

کە چوومە زیندان ڕاست بوو، کا حەمەدی مەولودی و محەممەدی عەولا چەپە و هاشم بوون. لێم پرسین:

- چتان گوتووە؟ لە کوێ گیراون؟
- گوتیان: لە پاسگای (کانی سپی)لە دەشتەبێڵ گیراوین و گوتومانە هاتووین خووری بکڕین. عیلاجمان نەکەی، نەجاتیمان نایە.

چوومە لای ئاجودان. گوتم: دەیانناسم. بە خۆڕایی بۆ خەڵک تووشی زەحمەت دەکەن. ئەوانە کاریان خووری کڕینە و هیچیان لەسەر نییە.

- باشە، ئێمە دەیاننێرینە مەهاباد، لەوێ بەریان دەدەن.
- بۆ دەیاننێرنە مەهاباد؟ لێرە من دەمە دەستەبەریان، ئازادیان کە.
- ئەدی من لێرە کا بخۆم؟
- باشە شیرنی تۆ من دەیدەم.
- بچۆ لە نێو بازاڕ شاهیدنامەیەک بەرە، چەند کەس ئیمزای بکەن کە ئەوانە بێتاوانن.

هاتمەوە بازاڕ و شاهیدنامەم بە دە کەس ئیمزا کرد و بردمەوە لای ئاجودان. پێنج تمەنم دایە و هەرسێکم هێنا دەر و دەگەڵ برادەرێک ناردمنە باڵغچی ماڵی خۆمان. لە بازاڕ سەت تمەنم کۆ کردەوە، لیباسم بۆ کڕین، سێ ڕۆژ لە باڵغچی حەسانەوە و ڕۆیشتن. بە داخەوە کا حەمەدم نەدیتەوە بەڵام، پاش چەند ساڵ هاشم و محەممەدم لە عێراق دیتنەوە.

## نووسینەکانی عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری

(عەبدوڵڵا ئاغای پشدەر)

کتێبی: (یادداشتەکانم) بە پێنووسی (عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری) بەشی یەکەم - بەغدا ١٩٩٢




**لە لاپەڕەی ٤٢**

(لێرەدا نووسەر دە یادداشتەکانی خۆیدا بۆ باسکردن لەسەر دۆخی کۆماری کوردستان پشت دەبەستێ بە بینراوەکانی خۆی و وتەکان چەند کەسایەتییە بەرپرس لەناو کۆماردا کە یەکیان کاپیتان حەمەدی مەولودە - وریا)

**لە لاپەڕەی ٨٥**

سەبارەت بە شەڕی قارەمانانەی کاک حەمەدی مەولودە چرچی لە گوندی (بناویلێ)ی ناوچەی سەردەشت ئاوا دەنووسێ: حکومەتی تاران یەکەمجار لە ناوچەکانی سەقز و بۆکان دەستیان کردە جم و جۆڵ و هاتنە پێشەوە و بڕیارنامەی شەڕوەستاندونیان خستە ژێر پێی خۆیان. لە خەتی (بانە)ـشەوە بەرەو سەردەشت هاتن و لە گوندی (بناویلێ) کە دەکەوێتە مابەینی (بانە) و (سەردەشت) پێش بە سوپای ئێران گیرا و بە سەرکردایەتی (حەمەی مەولود) سەرلقێکی سەربازی کۆماری مەهاباد کە لەو ڕێگایە واجبی پێسپێرابوو بە توندی لە سوپای ئێرانیان دا و زیانیکی زۆریان پێگەیاند و نەیانهێشت بگاتە سەردەشت.

**له لاپەڕەی ٨٧**

نووسەر سەبارەت بە شەڕ لە گوندی (میر شێخ حەیدەر) ئاوا دەنووسێ:

دوای چەند شەو و ڕۆژ شەڕ و لێکدان ئەوەبوو بەکر ئاغا خۆشی هات بۆ بەرەکەمان وەکوو سەردان و پشکنین (تفتیش) و زۆر ڕازی بوو ئیشوو کاری (بەرە) و ڕێکخستنمان و لەسەر داوای ئێمە (حەمەی مەولود)ـیش لە ناوچەی (ڕەبەت)ـەوە گووازتەوە لای ئێمە بە خۆی و لقێکی سەربازییەوە چونکە بەرەی ئێمە کلیلی دەرگای سەرکەوتن بوو و هەموو گڕ و گەرمای ئاگری شەڕ کەوتبوو سەر ئەو بەرەیە.

**له لاپەڕەی ٩٢**

نووسەر باسی پاشەکشەی حەمەدی مەولودی دەکات پاش بیستنی خەبەری ڕووخانی کۆمار و دەڵێ: لە ڕۆژی ١٧ی کانونی یەکەم (سەرماوەز-آذر) وەکوو لەبیرمە زۆر سەرکەوتنمان وەدەست هێنابوو و زۆر خۆمان لە سەربازگەی سوپا نیزیک کردبۆوە هەر بۆ شەوی داهاتوو واتە شەوی ١٧-١٨ کانونی یەکەم لە کاتێکدا کە بەو سەرکەوتنە زۆر دڵخۆش بووین و من خۆم بە هۆی ماندووبوون و هیلاکی گەڕامەوە بارەگا چونکە دوو شەو بوو نەخەوتبووم و چەند خزمێکیشمان لە ئالانەوە هاتبوون بە چەند چەکدارێکەوە بۆ ئەوە خۆیان بەشداری داگیرکردنی سوپای ئابلۆقەدراوی سەردەشت بکەن و ئەو شەوە میوانی ئێمە بوون تاکوو بەرەیان بۆ دەستنیشان بکەین. ئەوەبوو سەعات ١٢ی نیوەشە خەوتم و لە سەعات یەکی پاش نیوەشەوا یەکێک بە دەنگێکی (بزڕکاوە)وە بانگی کردم وتی: کاک عەبدوڵڵا هەستە لە خەو، خەبەرێکی زۆر ناخۆشم هێناوە (یاخوا ملم بشکێت). منیش هەڵسام و وتم چییە؟ چی قەوماوە؟ دیتم (سەید حەسەن) خەڵکی مەهاباد کە ناسیاوی خۆمان بوو ئەگریا و لە ڕێگاوە بە پەلە هاتبوو وتم چییە؟ بۆچی ئەگری؟ وتی: قووڕ کراوە بەسەرماندا و پشتی هەمووومان شکا. کۆماری مەهاباد ڕووخا. منیش واقم وڕ ما و نەمتوانی قسە بکەم و هەرچی بیرم کردەوە بزانم ئەمە خەونە یا نا؟ بۆم ساغ نەئەبۆوە چونکە سەید حەسەن خۆی هێندێ درۆ و شتی هەبوون و لەوانەشە گاڵتەمان پێ بکات. ناوبراو جانتاکەی خۆی ڕاکێشا و چەند بەیانێکی لەو بەیانانەی کە قازی محەممەد مۆری کردبوون هێنا دەرەوە و دایە دەستم. کاتێ خوێندمەوە وام هەست کرد کە وا گرانایی و قورسایی ئەم شاخ و کێوانەی کوردستان کەوتووەتە سەر شانم. ڕاستی بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەک نەمتوانی قسە بکەم لەبەر گریان.

لەدواییدا ناردم بە شوێن حەمەی مەولودا. کە ئەویش بە ڕێکەوت ئەو شەوە هاتبووە بارەگای خۆی. بەیاننامەکەم دایە دەستی. کاتێک خوێندییەوە هەر شێت بوو. خەریک بوو لە هۆشی خۆی بچێت. دوای ماوەیەک گریان وتی تکام وایە چەند چەکدارێکی خۆتانم دەگەڵدا بنێرە هەتاکوو ئەگەمە گوندی (هەمران) لای زێڕۆ بەگ چونکوو ئەترسم عەشایر لەم سەر ڕێگایانە شەڕمان

پێبفرۆشن بۆ خاتری چەکەکانمان و ئەگەر گەیشتمە لای زێرۆ بەگ لەوێوە هەموومان ڕوو ئەکەینەوە لای مەهاباد. هەرچەند کە ناشزانین داخوا وەزعی مەهاباد چۆنە و سوپای ئێران گەیەشتۆتە مەهاباد یا نا؟ چونکە سەید حەسەن ڕۆژی ١٧ لە مەهاباد دەرچووبوو و ئەو ڕۆژە سوپای ئێران نەگەیشتبوو مەهاباد. ئیتر من سێ چوار چەکداری خۆمم دەگەڵ حەمەی مەولودا ڕەوان کرد چونکە خەڵکی ناوچە کە هەموو کەسی منی ئەناسی و کەی نەیوێرا بیر لە ڕووتکردنی ناوبراو بکەنەوە بە هۆی چەکداری ئێمە کە دەگەڵیا بوو. بەڵام ناوبراو لە هەمران فریای زێرۆ بوگ نەکەوتبوو چونکە ئەویش وەکوو ئێمە ئاگادار کرابوو و بەیاننامەکانی پێگەیشتبوون و هەر بە پەلە لە ترسی عەشایری گەورەک و مەنگوڕ دەرچووبوو بۆ لای مەهاباد. لە دواییدا زانیمان کە زێرۆ بەگیش و حەمەی مەولودیش هەردووکیان تووشی هەندێ پیاو خراپ و ڕێگران هاتبوون بەڵام خوا ڕزگاری کردبوون و بە سەڵامەتی گەیشتبوونە دەوروبەری مەهاباد و لەو گوندانەی ئەوێ چەند ڕۆژ مابوونەوە. بەیاننامەکەی قازی محەممەد بریتی بوون لەو چەند دێڕانەی خوارەوە:

(برایانی بەڕێزی بەرەی....

وێڕای ڕێز و سڵاو. ئاگادارتان دەکەم کەوا سوپای ئێران گەیەشتە تەورێز و حکومەتی (جەعفەر پیشەوەری) ڕووخا بەبێ ئەوەی هیچ بەرگری لە خۆی بکات. بۆ ئێمە لەپاش هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەیەکی زۆری کێشەکانمان لە هەموو ڕوویێکی سیاسی و عەسکەرییەوە، بڕیارمان دا کە وا بەرەکانی جەبهەکانی شەڕمان چۆڵ بکەین و بەرەو پیری سوپای ئێران بۆ بەخێرهێنانیان. ئینجا تکام وایە کە ئەوانەی عێراقین بگەڕێنەوە عێراق و ئەوانەی ئێرانیشن خۆیان بدەن بە دەستەوە لە نیزیکترین شوێنی سوپای ئێران.

براتان محەممەدی قازی)

**لە لاپەڕەی ١٠٥**

سەبارەت بە پەنابردنی حەمەدی مەولودی بۆ عێراق ئاوا دەنووسێت:

... ئەوکاتە سەرۆک عەشیرەتەکان ئەوەندە نفوز و دەستەڵاتیان هەبوو کە وا خەڵکی لێقەوماو و دەربەدەر لای خۆیان پەنا بدەن و تا چەند کەسێکی خەڵکی مەهاباد هاتنە لای مەحموود ئاغای هێرۆ لەوانە یێکێکیان سەید مستەفای سیدی و ئەویتریان حەمەدی مەولود بوو. مەحموودئاغا زۆر ڕێزی لێگرتن و لەدواییدا سەید مستەفا فەرمانی بەخشینی (عەفو) بۆ دەرچوو و گەڕایەوە مەهاباد و حەمەی مەولودیش ماوەیەک هاتە قەڵادزێ تا دەفتەر نفوسی عێراقیشی بۆ وەرگیرا بەڵام لە دواییدا ڕۆییشت بۆ ڕووسیا لە ڕێگای قاچاغەوە و لەوێ بە پەناهەندە وەرگیرا.

# کتێبی: اسناد احزاب سیاسی ایران - (۱۳۲۰ - ۱۳۳۰) - به کوشش بهروز طیرانی



وزارت کشور

شهربانی کل کشور

وزارت کشور ۱۵/۸/۲۵

باستحضار میرساند. شهربانی سنندج بشماره ۷۴۲ـ ۲۵/۷/۳۰ گزارش میدهد محمد مولود نام مهابادی که سابقاً قاچاقچی بوده و چنانچه از سال ۱۳۲۰ باعده از قاچاقچیهای دیگر باصفهان تبعید شده بودند اخیراً بسمت نمایندگی حزب جوانان مهاباد منصوب و بدهات اطراف سقز رفته و جوانان ۱۵ الی ۳۰ ساله را بحزب مزبور دعوت و نام نویسی و نشان قرمز از پارچه بسینه آنان داده و از هر کدام ماهیانه مبلغی اخذ و بمهاباد میفرستد

از طرف رئیس شهربانی کل کشور - پاسیار اعتصام وزیری

[وەزارەتی ناوخۆ - سەرۆکی گشتیی شارەبانی ئێران - ژمارە ۱۱۱۵۱-۷۱۲۶-۱، ڕێکەوتی ۱۳-۸-۱۳۲۵ (نهێنی)

بۆ وەزارەتی ناوخۆ

ئیدارەی پۆلیسی شاری سنە بە ژمارەی (۷۴۲) - ۲۵-۷-۳۰ پێتان ڕادەگەیێنێ کە کەسێک بە ناوی محەممەدی مەولود خەڵکی مەهاباد کە پێشتر قاچاغچی بووە، وەک دەڵێن لەساڵی ۱۳۲۰ دەگەڵ کەسانێکی تر لە قاچاغچییەکان بۆ شاری ئیسفەهان دوورخراوەتەوە، ماوەیەکە بە نوێنەری حیزبی جەوانان مەهاباد هەڵبژێردراوە و بە دێ و دێهاتی ناوچەی سەقزدا دەگەڕێ و ئەو لاوانەی کە لە تەمەنی ۱۵ تا ۳۰ ساڵە دان ڕادەکێشێتە ناو حیزبەکەیان و ناونووسیان دەکات و هێمایەکی سوور کە لە پارچە دروست کراوە لە سینگیان دەدات و لە هەرکامیان مانگانە بڕە پارەیەک وەردەگرێت و دەینێرێتەوە بۆ مەهاباد.

**لە لایان سەرۆکی گشتیی شارەبانی ئێران - پاسیار یەکەم حیسام وەزیری - واژۆ]**[1]

---

[1] ئەو بەڵگەیە لە کتێبی اسناد احزاب سیاسی ایران - (۱۳۲۰ - ۱۳۳۰) - به کوشش بهروز طیرانی - انتشارات اسناد ملی ایران - ۱۳۷٦ - لاپەڕەی۳۷۷ بڵاو کراوەتەوە و هەروەها لە ناوەندی ئارشیوی (اسناد ملی ایران) هەیە.

## بیرەوەرییەکانی مامە «غەنی بلوریان» سەدەی کارەسات

نووسینی: برایم فەڕشی

ل.١٥ - پێش ئەوەی نیروی موتەفقین واریدی کوردستان بێ، پۆلیسی ڕەزا خان بۆ ئەوەی پێش بە بڵاوکردنەوەی ئەو فیکر و بیر و باوەڕە نەتەوایەتییە بگرێ، تەدارکی هێرشێکی بینی، هەر ئینسانێکی کە هەستی لێدەکرد قاچاغچییە و هاتوچۆی عێراق دەکات و لە ڕێگای هێنانی گۆڤاری گەلاوێژەوە، بیر و باوەڕی نەتەوایەتی بڵاو دەکاتەوە، هێرشی کرایە سەر. لە ناوچەی میاندواو و مەهاباد و دەوروبەر کۆمەڵێکیان گرت و لە کوردستان دووریان خستنەوە بۆ باشوور و باکووری ئێران و شیراز و کرمانیان ڕەوانە کردن. لە نێو ئەواندا حوسێنی فروهەر و محەممەدی مەولودی ئەو دوونەفەرە تەنها کەسانێک بوون کە لەو هێرشەدا دەستگیر کران کە دەستیان لە جەریاناتی کۆمەڵەی ژ.ک و هێنانی ئەو گۆڤارە لە عێراقەوە بۆ داخیلی ئێران هەبووە. ئەو دوو کەسە، کە ئەودەمی حوسێنی زێڕینگەریان پێدەکوت دوایە شۆرەتی خۆی گۆڕی و کردیە حوسێنی فروهەر، لە زیندانی برازجان دەگەڵ ئێمە بوو ١٥ساڵ حوکم درابوو، لەوێ مەسلول بوو و دوایە هاتە دەرێ، ئازاد بوو مرد.

حوسێنی فروهەر یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک بوو. ڕەحیم لەشکری کارمەندی ئیدارەی فەرهەنگ ، حەمەدەمینی خاتەمی کارمەندانی پایەبەرزی سەبتی ئەحواڵی مەهاباد، ڕەحمانی کەیانی، قادری قادری، قادری مودەرەسی ئەو ئینسانانە بوو کە بنەمای کۆمەڵەی ژ.ک یان دامەزراند.

بەڵام ئەوانە هیچیان نەگیران، تەنها کەسێک کە گیرا حوسێنی فروهەر بوو و دەگەڵ حەمەدی مەولودی. ئەودەم بازجوویی بەو جورە و بەو شکڵەی نەبوو، تەحقیق بکەن بازجویی بکەن و شکەنجە بکەن، ئەسرار وەرگرن. حکومەت نەیدەویست دەنگەکە بەرز بکاتەوە و پەخش بێتەوە کە ئەوانە لەسەر مەسەلەی میللی گیراون، بەڵکە بەنێوی قاچاغچی ئەوانیان گرت. هەرچی قاچاغچی بوو خڕیان کردەوە، ئەوەی تێیدابوو و تێیدا نەبوو و هات و چۆی عێراقی دەکرد، گیرا، بۆ ئەوەی ئەو هات و چۆیە ببڕن.

ساڵی ١٣٢٠ ئەوانە گەڕانەوە، هاتنەوە مەهاباد و لە ساڵی ١٣٢٠ەوە خەباتی کۆمەڵەی ژ.ک سەری گرتەوە، سەر لە نوێ بە جیددی تر دەستی پێکردەوە. پاش ئەو هێرشە ئەوانەی نەگیرابوون و مابوونەوە جموجۆڵیان نەما و پاشەکشەیان کرد و کۆمەڵەی ژ.ک بێ چالاکی مایەوە. بەڵام ئەوانە بە عینوانی شەونشینی حەوتووی جارێک شەوانە لەم ماڵ و ئەو ماڵ لە دەوری یەک خڕدەبوونەوە و کاری حیزبایەتی تەنیا بۆ ئەوەی بوو، ئیرتباتیان بەیەکەوە نەبڕێ.

## ل.١٦ سینەمای سەیار و ئینگلیسییەکان

- کە ڕێکخراوی لاوانی کوردمان دامەزراند و چالاک بووین و کارمان دەست پێکرد، ڕۆژێک ماشێنێکی ئینگلیسی هات سینەمای سەیاری هێنابوو بۆ چوارچرای مەهاباد، لەوێ جەنگی بەینی ئالْمان و ئینگلیستانیان نیشان دەدا. کە ئێمە هاتینە دەرێ چووین، وەکوو وا تەبلیغ کرابوو ئەو ئەفکارەی کە هاتبوو دەمێشکمانەوە وامان هەست کردبوو، وامان بە گوێدا خوێندرا بوو لەولا و لەولا، مشەخەس {دیار} نییە ئینسانێکی مشەخەس تەبلیغی کردووین. لە جێگایان کە دادەنیشتین بەعزە کەسێک زیاتر ئێمە ئینگلیسی مان بە دوژمنی کورد دەناسی، چوونکوو وا باس دەکرا کە ئینگلیس بوو کە تەقسیمی کوردستانیان کردوە. نەیانهێشت کورد ببێتە شت و بە حکومەت بگا. زۆرتر ئیحساساتی ئێمە دژی ئینگلیسی زۆر شەدید {توند} بوو بەو بۆنەوە ئەوەش کە گوتیان ئینگلیسیە و هاتووە نمایش دەدا و ئەوانە معاوینی کونسوولی تەورێزن، ئێمە هاتین بە دژی ئەوانە دەمونستراسیونێکمان ساز کرد.

عەکسی ئیستالینمان هێنا و لەسەر ماشێنمان دانا و هاتین بە دەوری چوارچراکەدا گەڕاین و بە دەوری ئەو کابرایەدا. سینەماکەمان قەتع {بڕی} کرد و پەردەکانمان دەدڕاند و پەردەی سینەمامان سەنگباران کرد. خەبەریان بە قازی محەممەد دا کە جەریانێکی وا هەیە قازی محەممەد هات و نەسیحەتی ئێمەی کرد و گوتی ئەوە شەخسییەتێکی خاریجییە و هاتۆتە وڵاتی ئێمە، دەبێ ئێمە بەرخوردێکی عاقڵانە و نەجیبانە بکەین و نابێ ئەو جوورە حەڕەکەتانە بکەین و ئەو فیلمە دەدرێ، کێ پێیخۆشە تەماشای بکا و کێ پێیناخۆشە تەماشای نەکا، بەرخوردی توند مەکەن. ئەمەی ئارام کردەوە بەڵام تەزاهوڕاتەکەمان کردبوو. کارەکەی خۆمان کردبوو پاشان ئەو کابرایە چووبوو لە لای مەقاماتی شۆڕەوی شکایەتی کردبوو کە مەنتەقەی ئێوە شلوقە و عەناسورێک بە تەحریکاتی شۆڕەوی وای تەوجیە کردبوو، هاتوون ئەو کارەیان کردووە و ئیهانەیان بە مەئموری سیاسی ئینگلیس کردووە. تعدادێک ئەفسەری ڕووس هاتن بۆ تەحقیق {لێکۆڵینەوە} کردن. ئەڵبەتە ئەمن ئەوانە دەڵێم ئەوانە قابیلی حەزفن. ئەوانە بۆ ئیتلاع. هاتن تەحقیقاتیان لە ئێمە کرد کە ئەو کارە بۆ کردووتانە و ئەو ئاڵا سوورە چییە هەڵوداوە لەسەر چوارچرایە، ئێمەش ئاڵایەکی سوورمان لەوێ دابوو. بۆ ئەو سازمانی جەوانانەی کە دروستمان کردبوو، ئاڵایەکی سوورمان دابوو لەسەر بەردەکە و ئەو جێگایەی کە مجەسەمە دروستکرابوو لە چوارچرا.

کێ بە ئێوەی کوتوە ئەو ئاڵایە هەڵکەن و کێ بە ئێوەی کوتوە کە موزاحیمی خەڵک بن؟ کێ بە گوتووە ئێوەی بکەن بچن تەزاهوڕات بکەن و کێ بە ئێوەی کوتوە عەکسی ئیستالین بینن و ئەو ئاڵا سووره ئی ئێمەیە و بە ئێوە مەڕبوت نییە. منیش جوابم داوە ئەو ئاڵا سوورە ئاڵای شۆڕشی کوردە و هیچ مەڕبوت بە ئێوە نییە، چەکوچ و داسی ئێوەی پێوە نییە ئەگەر چەکوچ و داسی

ئێوەی پێوە بایە، ئێمە لێمان نەدەدا. ئەوە ئاڵای شۆڕشی خۆمانە. من بە زبانی ساکاری خۆم دیفاعم کرد. منیان هێنا گرت و حوسێن فروهەر و محەممەدی مەولود و تێعدادێکی دیکەشیان گرتن. بۆ ئەوە نیشان بدەن کە ڕەسیدەگیمان کرد و تەنبێمان کردن و فڵاتمان کردن. گوزاریشێکی بدەنەوە بە مەقاماتی خۆیان. هەشت، نۆ، دە، ڕۆژان ئەوانیان لە قاوەخانەیەکی ڕۆژانە ڕادەگرت و شەوانە دەچوونەوە ماڵێ و ڕۆژانە دەهاتنەوە قاوەخانەکە. منیش سەرهەنگێکی ڕووس بوو بڕێکی گوێ کێشام و گوتی تۆ دەبێ دەرس بخوێنی و دەست لەو کارانە هەڵگرە بڕۆ دەرس بخوێنە و ئەو ئاڵایەش بێنە خوارێ لەوێ.

## ل.١٧ دانیشتنی ڕێکخراوە لاوان دەگەڵ کۆمەڵەی ژ.ک

موزاکەرەی ئێمە دەگەڵ کۆمەڵەی ژ.ک لە ماڵە حەمەدی مەولودی کرا. نوێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک سەدیق حەیدەری و دڵشادی ڕەسوڵی و زەبیحی بوون. من و کوڕێکی تر بە نێوی عەزیز فەرهادی نوێنەرانی سازمانی جەوانانی کورد بووین. پێشتر لەلایەن جەمعی خۆمانەوە لەنێو باغی هەڵبژێردراین کە بچین قسە دەگەڵ ئەوانە بکەین. ئەوانی مەسائیلیان مەترەح کرد کە ئێوە چیتان دەوێ؟ دەرخواستو {داوا} چییە؟ ئێمەش بە شکڵێکی ساکار کوتمان ئێمە خواستمان ئەوەیە کوردستانی ئازاد بکەین. کۆمەڵەی ژ.کیش ئەودەمی شوعاری کوردستانی گەورەی هەبوو. دەگەڵ حیزبی هیوا لە عێراق پەیوەندییان هەبوو. پێشتریش لە سنوور زەبیحی و ئەوان دانیشتنیان دەگەڵ میرحاج و ئەوان هەبووە. ئێمە کوتمان خواستەکەمان ئەوەیە موبارەزە دەکەین بۆ کوردستان و ئیتیحادی شۆڕەویش بە دۆستی میللەتی کورد دەزانین و دژی ئینگلیسین و ئینگلیس دوژمنی میللەتی کوردە.

## ل. ٢٧ سارق موسەلەح ، قاچاغچی و مەسەلەی نەتەوایەتی

لە کوردستانی ئەودەمی دا قاچاغچی هێرۆئین و تریاک نەبوو، عناسورێک بوون ماڵوتجارەیان وارید دەکرد و ئەوانە ئیرتباتی حیزبیشیان بەرقەرار دەکرد. نەشریاتی کە لە عێراقەوە دەهات بە وەسیلەی ئەو قاچاغچییانەوە دەهات. حوسێنی زێڕینگەران، حەسێن فروهەر بۆخۆی یەکێک لەو قاچاغچییانە بوو کە بۆخۆی لە موئەسیسینی کۆمەڵیی ژ.ک بوو و تەفەککوری میللی لە عێراقێ دەرک کرد، لە قاچاغچیگەریدا. ئەو ئەفکارەی هێناوە لە سابڵاغێ عیددەیەکی لە خۆی کۆکردەوە. کۆمەڵەی ژ.ک یان تەشکیل کرد. حەمەدی مەولودی یەکێک لەو قاچاغچییانە بوو.

بەنابەرین قاچاغچی بەو مەفهومی نەبوو. قاچاغچی لە بازاڕی مەهابادێ ئیعتیباریان هەبوو. قاچاغچی لە مەرزی عێراقێ ڕا هەتا واریدی پیرانشار دەبوون، واریدی مەهاباد دەبوون. دەو

مەسیرەدا دە دوازدە ماڵیان دەژیاند، بێجگە لە شاری. ئەسپیان دەنارد ماڵوتجارەیان موتەفەرق دەکرد. لە ماڵی موختەلف لە دێی موختەلف پەخشیان دەکرد بۆ ئەوەی گمرک نەیانگرێ. ژاندارمەری نەیانگرێ. دەهاتنەوە مەهابادێ ٦،٧ ڕۆژان لە مەهابادێ دەبوون، خۆیان بە مەئموورەکان نیشان دەدا و لە بازاڕێ دەگەڕان و شەوانە بە قاچاخ دەیاننارد، بۆخۆیان نەدەچوون، دەستیان هەبوو، ئەو دەستانەیان دەنارد ئەو ماڵوتجارەیان دێناوە، واریدی شاریان دەکرد.

بەنابەرئین قاچاغچی تاجیرێک بوون کە ماڵ و جنسی غەیری گومرگیان لە عێراق واریدی ئێران دەکرد و دەیانفرۆشت بە قیمەتێک. هەر قاچاغچی حەددی ئەقەل لە دەورەی ٨،٩، دە ماڵ لە دەوریان زیندگی دەکرد. ساریق موسەلەحیش لەنێو کوردستانیدا، لە عورفی کوردستانیدا ئەوە بووە، موسەلەح چوونکوو دەگەڵ ژاندارمی بەشەڕ هاتووە، چوون موخالیفی حکومەتی مەرکەزی بووە، خەڵک حیمایەتی لێکردوون.

ئەمەر پاشای ساریق موسەلەح یان حەمەتاڵی مەشهوور، یان مام ڕۆستەمی مەشهور کە ئەوانە سارق موسەلەح بوون. ئەوانە لە زەمانی ڕەزاشا سارق موسەلەح بوون لە سۆسنایەتی و ناو مەنگوڕان و گەورکایەتی ئەتڕافی سەردەشت ئەوانە نفوزیان هەبوو لە نێو جەنگەڵدا. دێهقانان کۆمەگیان پێدەکردن. چاویان بوون، ئیتیلاعاتیان پێ دەگوتن. ژاندارم هاتبان خەبەریان پێدەدان. ئەوانە دەگەڵ خەڵک خەراپەیان نەدەکرد. خەڵکیان ڕووت نەدەکرد، ئەوان ڕێگایان بە ژاندارمەی دەگرت نەیاندەهێشت ژاندارم ئەمنیەتی هەبێ لە مەنتەقەدا. جلوگیریان دەکرد. ئەو سارق موسەلەحانە تەفوکوری ناسیۆنالیستی و ڕووحی میلیان هەبوو، بەڵام بەو شکڵەی عەرزی ئەندامی دەکرد. ڕووحی میلییە. بەو عیللەتەش ئەو سارق موسەلەحانە وەختێک تفەگێکیان ئەستاندایە یان ئەسپی مالیکێکیان ڕفاندبایە کۆمەکیان دەکرد بەو دێهقانە فەقیرانەکە یەتیم ماوەتەوە، باب و کەس و کاری نەماوە. یەتیمەکانی ئیدارە دەکرد، یا « عەشە هی مێزی»[1] لە ئەتڕافی سنەی کە یەکێک لە سارق موسەلەحەکانی گەورەی ئەتڕافی سنەیی بوو. مەشهوورە عەشە هی مێزی. هەشەمێز دێیەکە لە ئەتڕافی سنەی ، ئەتڕافی مەنتەقەی بەینی سنە و مەریوان، ئەو شەخسە ئینسانێک بوو ١٥،١٤ ساڵان سارق موسەلەح بوو. زەمانی ڕەزاشا سارق موسەلەح بوو. زەمانی محمدڕەزا شاش سارق موسەلەح بوو. کابرایەکی بە حورەمت و ساحێب ئیحتیرام بوو. ئەمە ئیستیفادەمان لەوانە دەکرد. ئەوانە لەنێو ڕووستاییاندا نفوزیان هەبوو. نفووزی کەلامیان هەبوو...

---

[1] (هەشەمێز) گوندێکە کە لە ٥٣ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژئاوای شاری سنە و لە ناوچەی هەورامان هەڵکەوتووە.

## بیرەوەرییەکانی مامە «غەنی بلوریان» ئاڵەکۆک

**بەسەرهاتەکانی سیاسی ژیانم - ستۆکهۆڵم - ١٩٩٧ - کۆکردنەوە و ئامادەکردنی حامید گەوهەری**

کاکە مین باسی «چەتە»کانی سەردەمی پاشایەتی ڕەزاشای بۆ دەکردم و دەیگوت «چەتە»کان پیاو خەراپ نەبوون، واتە دزی و ڕێگرییان نەدەکرد و لە حکومەت و ژاندارم عاسی بوون. لە سەردەمی دەسەڵاتداریەتی ڕەزاشادا ژاندارم خەڵکی گوندەکانی کوردستانی هەراسان کردبوو. تەشقەلەیان پێدەکردن و بیانوویان پێدەگرتن و دایاندەپڵۆسین. بەرتیلیان لێدەستاندن و لە ژیان جاڕزیان کردبوون. لەبەر ئەوە لە نێو گوندەکاندا مرۆڤی ئاوا هەڵدەکەوت کە دەست لە ژیان بەردا و لە قینی ژاندارم وە چیا کەوێ و ببێ بە چەتە. ئەوان ڕێیان بە ژاندارمە دەگرت و دەیانکوشتن و چەکیان دەکردن و جاروبارەش ئەسپ و وڵاخی سەرۆک عەشیرەتە دەوڵەتخوازەکانیان دەبرد. هەر ئەو چەتانەش بوون کە داکوکییان لە گوندییەکان دەکرد و دەستی فەقیر و هەژار و ژنی هەتیوباری گوندەکانیان دەگرت و یارمەتییان پێدەکردن، خەڵکی لادێ چاو و گوێیان بوون و هاتووچوو کردەوەی ژاندارم و ئاغا ملهوڕەکانیان پێڕادەگەیاندن و یارمەتییان دەدان. جل و لیباسیان بۆ دەشوشتن و قەند و چای خۆیان لە زاری منداڵەکانیان دەگیراوە و بۆ چەتەکانیان دەبرد. کاکە مین مێشکی پڕ بوو لەو زیانیاریانەو هەمیشە لێیدەکۆڵیەوە تا پتر سەریان لێدەرەێنی، ئەو ڕۆژانە هەر گوێی بە رادیۆوە بوو. هەرچەندە ئەوکات خەڵک کەمتر رادیۆی هەبوو، بەڵام ئێمە ڕادیۆیەکی Blupunktی باتریداری ئاڵمانیمان هەبوو، کە کاکە مین قەت لێی جیا نەدەبۆوە و هەموو هەواڵەکانی دەگرت.

ئەو هەروەها لەمەڕ قاچاغچییەکانی سەردەمی ڕەزا شاش دەدوا و دەیگوت وا بیر نەکەیئەوە قاچاغچی ئەو سەردەمی شار مرۆڤی خوێڕی و تریاک و هەشیش فرۆش بوون. ئەوان کەسانێک بوون بۆ ئەوەی گومرگ بە دەوڵەتی ئێران نەدەن و شتومەک بە هەرزان لە گەرمێن بێنن، بە نهێنی سەفەریان دەکرد و دۆڵ و چیاکانی کوردستانیان دەبڕی و زۆرجاریش تووشی مەترسی دەبوون، ئەوان بە گشتی کوتاڵ، پەڕە سیغار، عەتر، سابوون، چایی و شتی لەو بابەتەیان دهینا و خەڵکێکی زۆر لە شار و گوندەگان بە هۆی مامەڵە دەگەڵ ئەوان ژیانی خۆیان دابین دەکرد. ئەوان بە کۆمەڵ و پرچەک هاتووچۆی گەرمێنیان دەکرد و جارجارەش دەگەڵ ژاندارمە پێکهەڵدەپڕژان و بە کوشتنی ژاندارمەیەک دەبوونە نوقڵی مەجلیسان و خەڵکی شار و دێیان شاد و دڵخۆش دەکرد. ئەو قاچاغچییانە مرۆڤی بە هەست و کورد دۆست و نیشتمانپەروەریان تێدابوو کە لە گەرمێنەوە گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردیان دەگەڵ خۆیان دهێنا و دەیانگەیاندە دەست دۆست و هەواڵانی ڕووناکبیریان. لەبەر ئەمە لای خەڵک بە حورمەت بوون و ڕێزیان لێدەگیرا..

ئەوسا جموجۆڵی سیاسی بواری نەبوو ، هەر چەشنە بزاڤێکی سیاسی لە ئێران و بەتایبەتی لە

کوردستان دا بە توندی سەرکوت دەکرا. لەو هەل و مەرجەدا ژمارەیەک رووناکبیری مەهاباذ بۆ ئەوەی پۆلیس دەستیان پێنەگا دەستەیان ساز کردبوو، و هەر شەوەی لە ماڵێک کۆ دەبوونەوە و جۆرابێنیان دەکرد، شەوچەلـەیان دەخوارد و گوێیان دەدایە قەوانی سـەید «عەلی ئەسغەر» و باسی کوردایەتیان دەکرد. لە نێو ئەو گروپ و دەستانـەی شەوانەدا ژمارەیەک رووناکبیری چالاک و بە کردەوە، دامەزراندنی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردیان هێناوەتە بەر باس، ئەوان شەوێک لە شەوانی ڕەمەزانی ١٣١٧- ١٩٣٨باسی دامەزراندنی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردیان کردوە. کاکە مین دەیگوت ئەو دیاردەیـەی لە زمانی هەڤاڵێکی هاوگەڕەکی بە ناوی «ڕەحمان» بیستبوو، ئەو بە ڕاشکاوی نـەیدەگوت ڕحمان کێیە، بەڵام لە توپیی قسەکانیدا کە لەناوی تیکوشەران دەدوا دەرکەوت کە ڕەحمان کێیە؟

... پاشان خۆی قیت کردەوە و دەستی لە باخەڵی نا و لە سەرەخۆ کوتە کاغەزێکی چرووکی و چرێشاوی و دوولەتی دەرهێنا و بە هێمنی و بە دەنگێکی نزم گوتی: دا وەیخوێنەوە ئەوە هەمان بـەیاننامـەیە کە خەڵک باسیان لێدەکرد و بە دیواری مزگەوت و بازاڕەکانی شاریان لکاندبوو.

هەرچۆنێک بوو دەقی بـەیاننامە - دەست نووس- کەم خوێندەوە. لەودا داوا لە جەماوەری کورد کرابو، کە بە هانای ئەو لاوانەوە بچن کە بو کوردستانێکی سەربەخۆ خەبات دەکەن. کاکە مین دەیگوت: پۆلیس بە تاوانی ئەو بلاوکراوەیە گەنجێنکی بە ناوی «حاجی خوسرەوی» گرتووە و چەند کەسیشی لەو پێوەندیەدا بو هەرێمی ژوورووی ئێران یانی «شیراز» و «کرمان» دوور خستوتەوە. ئەوانـەی کە من شارەزایانم «حوسینی زیرینگەران» و «محەمەدی راتبی» (حەمەدی مەولودی)ن کە دورخراونەتەوە. ئەو لە درێژەی گوتنەکـەیدا ڕایگـەیاند دەنگو دەشار کەوتبوو کە «حاجی» یان شکەنجە کردوە و تەنانەت دەیانگوت لوتیان بڕیوە، بەڵام هیچی نەدرکاندوە.

شەوێکی تر، کاکە مین سەری باسەکەی کردەوە و گوتی دەڵێن لە ڕەوتی ئەو گفتوگۆیانەدا کە هەڤالان بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سیاسی کردویانە، ژمارەیەک گەنجی خورت، بەڵام کەم ئەزموون ڕایان وابووە کە دامەزراندنی هەر ڕێکخراوەیەک بۆ ڕاکێشانی سەرنجی جەماوەر بۆ لای ژ-ک پشتگیری کردنیان لەو، بانگەوازێک بە نەهێنی بڵاو بکرێتەوە بەڵام زۆربـەی هەڤاڵان دەگەڵ ئەو بیرە نەکەوتوون و ئەو هەنگاوەیان بە کردەوەیەکی ناوەخت زانیوە، کەچی ئەو چەند کەسە بە بێ ئیزنی لایەنەکـەی تر بۆخۆیان ئەو کارەیان ئە نجام داوە و بوون بە هۆی وشیار کردنەوەی پۆلیس و گیرانی هەڤاڵانیان، لە نێو ئەو بەشەدا ناوی «عەزیزی زەند»ـی (عەزیز ئاڵمانی) و «عەبدولڕەحمانی زەبیحی» لە سەر زاران بو.

کاکە مین بە گوێرەی گوتنی دۆستانی، ناوی گروپێکی دەبرد کە لە دەستـەی شەوانەدا بەشدار بوون، بەڵام پاشان بۆم دەرکەوت، کە ئەو بۆ خۆیشی یەکێک لەو کەسانە بووە، کە لە گروپی ئەو هاوڕێیانە دا بەشداری کردوە. ناوبراو، ناوی ئەو کەسایەتییانەی بەمجورە ڕیز دەکرد: قاسمی قادری

ماموستای قوتابخانە، سەعیدی یۆسفی کارمەند، محەمەدئەمینی خاتەمی کارمەند، محەمەدی ئەسحابی ماموستای قوتابخانە، عەلی مەحموودی مامۆستای قوتابخانە، ڕەحیمی لەشکری کارمەند، ڕەحمانی کەیانی دوکاندار، قادری مودەڕیسی کارمەند، ڕەحمانی سەدیقی ڕووناکبیر، ڕەحمانی زەبیحی گەنج، حاجی خوسرەوی گەنج، محەمەدی ڕاتبی (حەمەدی مەولودی)، حوسێنی فروهەر (حوسێنی زێڕینگەران)، محەمەد ڕەسوولی وەتەمیشی ناسراو بە (سەرسوور)، عەبدولی کەرباسی، محەمەدی قاسمی (مەلەک) بەرگدرو، ڕەحمانی ئیمامی کارمەند. محەمەدی نانەوازادە ڕووناکبیر، محەمەدی بابانزادە ڕووناکبیر، نەجمەدینی تەوحیدی کارمەند، محەمەدی علمی کارمەند. محەمەدی یاهو کارمەند، ڕەحمانی عەلەوی خوێندکار، عەزیزی زەندی (عەزیز ئالمانی) ڕووناکبیر، مەلا عەبدوڵڵای داودی (مەلای حەجۆکی) ڕووناکبیر، محەمەدئەمینی شەڕەفی دوکاندار و حەبیبی سابوونچی (مێرەکەڕێ). دواجار دەرکەوت ژمارەیەک لەو تێکوشەرانە لە سالی ۱۳۱۷- ۱۹۳۸ دا ڕاستەوخو دەستیان هەبووە لە دامەزراندنی کۆمەڵەی «ژ- ک» دا و بۆ منیش دەرکەوت کە کاکە مین ئەندامی ژ- ک بوو.

### لاپەڕەی ۳۳

کۆبوونەوەیەکی دوولایانە لە نێوان ئێمە و سێ نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ک بە ناوەکانی دڵشاد ڕەسووڵی»، «سەدیقی حەیدەری « و «عەبدولڕەحمانی زەبیحی» لە ماڵی «محەمەدی ڕاتبی» (حەمەدی مولودی) لە گەڕەکی خڕێ» پێکهات. دڵشاد ڕەسووڵی درووشمی سەرکەوێ خەباتی ژ.ک بۆ ڕزگار کردنی کوردستانی گەورە و دامەزراندنی دەوڵەتی کورد کۆبوونەوەکـەی کردەوە. دەربارەی ڕێبازی کۆمەڵە و بزووتنەوەکانی پێشوی کورد قسەی کرد و گوتی: لاوان دەبی پشتی خەباتی کۆمەڵـەی ژ.ک بگرن. ئینجا سەدیقی حەیدەری و ڕەحمانی زەبیحی هەر کامەیان لەمەر چۆنیەتی ئەندام بوونی ئێمە لە کۆمەڵەدا قسـەیان کرد و ئامانجی کۆمەڵەیان دەربارەی یەکیەتی و هاوخەباتی کورد شی کردەوە....

### لاپەڕەی ۳۸

... بابەکانمان بە تێکرایی بەرەو گاراژ هاتن، کە ئێمە بەرنەوە و بەرگری لە کارەکەمان بکەن و نەهێڵن لە دایکی نیشتماندا یاری بکەین. لە لایەن ڕێبەرایەتی کۆمەڵەی ژ.ک ـەوە حەمەدی مەولودی «بۆ چاوەدێری کردن لە ئێمە دیاری کرابوو. ئێمە بەومان گوت بچێ پێشیان بگرێ و بیانگێڕێتەوە. کاک حەمەد بەرە و پیریان چوو بوو و گوتبووی:

من لە لایەن سەرکردایەتی ژ.ک ـەوە بۆ چاوەدێری کردنی ئەو کۆڕەی نومایش داندراروم و لە ترسی ئەوەی نەکا بە چوونی ئیوە بو نێو گاراژ کارەساتێک بقەومێ، ناتوانم ڕێگەتان بدەم بچنە نێو گاراژ، تکاتان لێدەکەم بگەڕێنەوە.» ئەوان گەڕابوونەوە بەڵام وێکڕا چووبوون بۆ مەحکەمـەی قازی» و ڕووداوەکـەیان بو قازی محەمەد گێڕابۆوە. قازی بە زەردەخەنەوە پێشوازی گەرمی، ئەوانی هێدی

و ئارام کردبۆوە و گوتبووی:

- ڕاوەستێ ڕۆژی نومایش خۆم لێتان دەگیرمەوە تا بزانن ڕۆڵەکانمان چەندە مەردن...

## لاپەڕەی ٥٤

دوو سێ ڕۆژژ پاش گەڕانەوەی قازی لە تەورێز، زانیم کە میرحاج و مستەفا خۆشناو خۆیان کۆ کردۆتەوە و لە بارەگای ژ.ک بڕۆن. پرسیارم لێکردن

- ئۆغر بێ؟
- هێندێک گیر و گرفت هەیە دەمانهەوێ بچینە باغی «سەعیدی حەمە قالەی» باخەکەی بە باغی «مە عاریف» دەناسراو لەوبەری کاک سەعید لایەنگرانی کۆمەڵە باغی «عەزیز ئاغا»ـی هەڵکەوتبوو، کە ئێستا نەخۆشخانەی «سیل»ـی لێ دروست کراوە. گوتم:
- ناکرێ میوانی ڕێکخراوی لاوانی ژ.ک بن و ئێمە پتر لە یارمەتیتان کەڵک وەرگرین؟
- لە بەرژەوەندی هیچ لایەنێکدا نیە کە ئێمە لێرە بین. ئێمە دەڕۆین، بەڵام داوات لێدەکەین جارجارە وەرە باغی کاک سەعید و سەرمان لێ بدە.»

شەوێک بو چاوپێکەوتنیان چووم باغی کاک سەعید، دیتم میرحاج و مستەفا خۆشناو دەگەڵ «حەمەدی مەولوودی«، «محەمەدی سەلیمۆکەی»، «سمایلی پیرۆزی»، «باقی حەسەنە شەلی»، حاجی حەسەنە شەلی»، «مارفی پوورزەریفی» و «هاشمی کورد» لە ژێر شۆقی فانووسێک دانیشتوون و نامیلکـەیەکیان بە دەستەوە. جیا لە هاشم ئەوانی تر نەخوێندەوار بوون. منیش چووم لە لایان دانیشتم. میرحاج نامیلکەکـەی دامی و گوتی: ئەوە بە فارسی نووسراوە، دەکرێ بۆمان بخوێننییەوە بزانین چی تێدایە؟» نامیلکەکەم لێ وەرگرت. دەفتەرچـەیەکی بچوکی چرچ و چۆڵ بوو. لە سەری نووسرابوو «حزب توده چه میگوید و چه میخواهد» واتە حیزبی تودە چ دەڵێ و چ دەخوازێ. نووسراوەکەم بۆ خوێندنەوە ، بەڵام شتێکی ئەوتۆم لێ بەدی نەکرد کە بۆنی «چەپی تێدا بێ، هیچ باسێکی دەربارەی سوسیالیزم و مارکس و لێنینی تێدا نەبو. گشت داواکان لە چوارچێوەی یاسای بنەڕەتی ئێراندا زەق کردبووە. بۆم ڕوون نەبوو ئەو نامیلکـەیـەیان چون وەدەست هێنابوو، بەڵام پاشان زانیم «عەزیزی زەند» (عەزیز ئاڵمانی) و «غەفوری مەحموودیان» خە ریکن بە لایەنگری کردن لەو نامیلکەیە شەوانە لە گەڕەکی مزگەوتی (سور) کۆ دەبنەوە و گفتوگۆی لەسەر دەکەن. ئەو کردەوەیە بوو بە هۆی نارەزامەندی گروپێک لە نێو کۆمەڵەی ژ.ک دا. ڕێبەرایەتی ژ.ک زۆر یەکی لە چوارچرای شاری مەهاباد پێک هێنا، کە خەڵکێکی زۆر بەشداریان تێدا کرد. لەو زۆر یەدا «قازی» لەمەر شێوەی هەڵسوڕانی سیاسی وتاری دەدا . لەوکاتەدا کە قازی قسـەی دەکرد، لە نێو جەماوەرەکە دا دەنگۆ داکەوت، کەسانێک دەیانهەوێ هێرش بکەنە سەر کۆبوونەوەکە و تێکی دەن. من لە نێو خەڵکەکەدا بووم کە دیتم گروپێکی چەکداری دوازدە کەسی لە هاوڕێیانی «حاجی

حەسەنە شەلی» هاتنە نێو خەڵکەکە، خەڵکەکەش بە نارەزامەندی تەماشای ئەوانیان دەکردن و ئەوانیش لە نێو خۆیاندا هەر بۆڵەیان بوو، بەڵام دەستیان نەبزاوت. چەند رۆژ دوای ئەو کۆبوونەوەیە، غەفوری مە حمودیان لە کوچـەی جولەکان کوژرا. ژمارەیەک دەیانگوت ناوبراو دژی کۆمەڵە پەیوەندی بە تارانەوە هەبووە و هێندێکیش دەیانگوت ئەو مرۆڤێکی سیاسی و دژ بە ژ.ک بووە، بەڵام زۆربەی شارەزایان لەو باوەڕەدا بووون کە غەفوری مەحموودیان سەر بە «هاشم ئۆف»ـە یەکێک لە کاربەدەستانی سۆفیەت لە «ورمێ» بووە. هەرچی بوو کوژرانەکـەی غەفوری مەحموودیان رەنگ و بۆنی سیاسی هەبوو، و ئێستاش بە دروستی ڕوون نەبۆوە بۆچی کوژرا؟ بە دوای ئەو ڕووداوەدا، «عەزیزی زەند» مەهابادی بە جی هێشت و چۆوە تەورێز و لەوێ نیشتەجێ بوو. ناوبراو دەگەڵ چەند هاوفکری سیاسی خۆی لقی حیزبی تودەی لە ئازەربایجان دامەزراند، بەڵام بە دوای دروست بووتی «فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان» لە تەورێز، عەزیزی زەند و هەڤاڵانی نێوی ڕێکخراوەکـەیان گۆڕی و تێکەڵی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوون، ئیتر ئەوسا عەزیزی زەند کاری نەما و چووە تاران و لەوێ مایەوە. ئەو ڕەوتە پێشان دەدا کە غەفوری مەحموودیان و «عەزیزی زەند» سەر بەو بیرە سیاسییە بوون کە هاشم ئوف ویستویەتی. یانی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی چەپی سەر بە ڕێباز و بیروبۆچوونی کاربەدەستانی سۆڤیەت لە کوردستان و ئازەربایجاندا. ئەگەر ئەو بوچوونە ڕاست بێ، مەحموودیان لەو ڕێگایەدا سەری دانا نەک لە ڕێگای پێوەندی دەگەڵ تاراندا.

## لاپەڕەی ٨٠

... سەدیقی خاتەمی ئەندامی کۆنی حیزب بوو. لە سەردەمی کۆماردا، پێشمەرگە و نووسەری بنکەی پێشمەرگەی کۆماری کوردستان لە گوندی «مەکڵاوێ» لە نزیک سەردەشت بوو. کاپیتان «حەمەدی مەولودی» فەرماندەی ئەو بنکەیە بوو. ئەوکات، سەردەشت بە دەست ئەرتشی ئێرانەوە بوو و (سەروان کەشاوەرز) فەرماندەی سەربازخانەی سەردەشت بوو. کاتێک هێزەکانی سۆڤیەت ڕژانە نێو خاکی ئێران، خۆیان لە سەردەشت نەدا و ئەوێ وەک خۆی مابۆوە. شاری سەردەشت سەر بە کۆمار نەبووە بەڵام گوندەکانی دەوروبەری دەگەڵ کۆماری کوردستان بوون. چونکە (کاپیتان مەولودی) خوێندەواری نەبوو، سەدیقی خاتەمی ئەرکی نووسینەکانی ئەوی بەرێوە دەبرد.

ڕۆژێک ئەرتەش هەوڵ دەدا ئەو بنکـەیە بگرێ. پیرێژنێک لە نێو دارستانەکانی نزیک بنکەی مەکڵاوێ خەریکی دار کۆکردنەوە دەبێ، هەر کە چاوی بە سەربازان دەکەوێ، بە پەلە خۆ دەگـەیەنێتە پێشمەرگەکان و ئەوان ئاگادار دەکا، چونکە دوژمن گەمارۆی گوندەکـەی لە پیشمەرگەکان تەنگ کردبۆوە، ئەوان نـەیانتوانی بوو لە مقەڕەکـەیان بیننە دەر و بە ناچار دیواری مقەڕەکەیان کون کردبوو، و لە بەرامبەر تانک و تۆپی دوژمن ڕاوەستابوون و دەستیان کردبۆوە.

دوژمن دەگاتە سەریان و دیواری مەقەڕەکەیان بە سەردا دەڕوخێنێ یەکیک لە پێشمەرگەکان بە (کوکتۆل مۆلۆتۆف) هێرشی کردبووە سەر تانکی دوژمن کە بە داخەوە کوژرابوو. سەرئەنجام پێشمەرگەکان لە تاریکی شەو کەڵکیان وەرگرتبوو و توانیبوویان خۆ دەرباز بکەن و بچن بو نێو دارستانەکە. سەدیق خاتەمی یەک لەو پێشمەرگانە بوو کە لەو شەڕەدا ئازایانە دەستی کردبۆوە.

لە کۆتایی مانگی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٢٦- ١٩٤٨، حکومەت ناوی مەشمولەکانی هەڵاوەسی و هەر وەکو چاوەڕوان دەکرا، من و شاپەسەند لە ڕیزی ئەواندا بووین. بەم پێیە مەهابادمان بەجێهێشت و بە ڕۆژئاوای مەهاباد و ڕێگای «مەیدان» دا پرسان پرسان خۆمان گەیاندە ناوچەی پیرانشار و چووینە گوندی کە (گەسگەسک)، سەید «تەها» کوری شیخ (عەلائەدین) ئەوکات لە گەسگەسک نیشتەجێ بوو. شەو لە گەسگەسگ ماینەوە و بەیانی زۆر دەگەڵ سۆفێکی مریدی شیخ «عەلائەدین» بەرەو گوندی «خەلان» وەڕێ کەوتین. (کۆنەلاجان) مان وە پشت سەر نا و بە «دۆڵە نێ» دا خۆمان گەیاندە ماڵی شێخ عەلائەدین لە گوندی خەلان.

## لاپەڕەی ١١٧

من بەرپرسی پێوەندی دەگەڵ شارەکانی سەردەشت و سنە بووم، عەزیز بەرپرسی سەقز و بۆکان بوو. ڕەحیمی سوڵتانیان بەرپرسی نەغەدە و پیرانشار بوو. هاشمی حوسینزادە کە کادرێکی لێوەشاوەی حیزب بوو، نێردرا بۆ سەقز تا بە نهێنی لەوێ بژی و هاریکاری کۆمیتەی سەقز بکات. هەروەها هاشمی حوسین زادە و سەدیقی خاتەمی ئەندامی کۆمیتەی جوتیاران بوون، هاشم بە کاروباری ناوچەکانی «چۆمی مەجید خان» و «شامات» و «محاڵ» ڕادەگەیشت و سەدیقی خاتەمی ناوچەکانی گەورک و مەنگوڕی سەرپەرەشتی دەکرد.

ئێمە بۆ ئەوەی جوتیاران بەرەو حیزب ڕاکێشین، دەگەڕاین سەرۆکی تیرەی عەشیرەتەکانمان دەدۆزییەوە. ئەگەر توانیبامان ئەو بۆ لای حیزب ڕاکێشین، تەواوی کەسانی سەر بە تیرەی ئەومان لە حیزبدا کۆ دەکردەوە. هەروەها، ئێمە بە شوێن کەسانی وەک (هۆمەر پاشای جەنگەڵ) و (مام ڕۆستەم) دا دەگەڕاین. هۆمەر پاشای جەنگەڵ و مام ڕۆستەم لە عەشیرەتی سوێسنێ چەتەی سەردەمی ڕەزاشا بوون، ئەوان لە ناوچەکانی مەنگوڕ، مامەش، گەورک و سوێسنایەتیدا ناسراو و ناودار بوون و جوتیاران یارمەتیان پێدەکردن و لە بەرامبەر حکومەتدا دەمانپاراستن. ئێمە، ئەوانمان ڕەگەڵ خۆمان دەخست و بەمجۆرە جوتیارەکان پشتی حیزبیان دەگرت. ئەو چەتانە دژی خەڵک نەبوون و خەڵکیان ڕووت نەدەکرد، بەڵکو ئاسایشی ژاندارمەیان تێک دەدا و نەیاندەهێشت ئازار بە خەڵک بگەیەنن. بە گشتی ئەوان خاوەنی بیری ناسیۆنالیستی و کوردایەتی بوون و ڕۆحی نەتەوەییان هەبوو و بەمجورە هەستی خۆیان دەردەبری ئەوان ئەگەر چەکێکیان وەچنگ کەوتبا، یان ئەسپی مالکێکیان ڕفاندبا، لە جیاتی یارمەتیان بە جوتیارە هەژارەکان دەکرد.

خەڵک بە چاوی ڕێز و حورمەتەوە تەماشای دەکردن و بە ئینسانی باشی نیو کۆمەڵیان دەناسین و لە کارەکانیاندا پرسیان پێدەکردن. بە گشتی، لە ژیانی کوردەواری ئەو سەردەمدا، دیاردەی چەتەگەری ئەو مانا و مەفهوومەی نەدەبەخشی، کە لە نێو فەرهەنگی فارس و عەرەب و تورکەکاندا هەیبوو. چەتەگەری لە نێو کورداندا بە دیاردەیەکی گرنگ دەژمێردرا هەر وەکوو قاچاغچی کوردیش ئەو مانایەی نەبوو، کە لە نێو نەتەوەکانی تردا مانایان دەکردەوە، دیارە ئەمرۆ ئەو دیاردەیە لە نێو خەڵکی کوردیش وەک پێشوو نەماوە. ئەوکات، لە کوردستاندا کوردان قاچاغچیەتی تریاک و هێرۆئینیان نەدەکرد. قاچاغچییەکانی ئەو سەردەم سەرەڕای هێنانی کووتاڵ، چا، پەڕە سیغار، عەتر و شتی تری لەم بابەتانە، ئەرکی گرنگی پێوەندی حیزبیان بە ملەوە بوو، و نامە، کتێب و ڕۆژنامـەیان لە باشووری کوردستانەوە دەهێنا. حوسێنی زێڕینگەران و حەمەدی مەولودی، دوو ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ژ.ک، یەک لەو قاچاچییانە بوون، کە هەستی کوردایەتییان لە نێو خەڵکدا بەهێز دەکرد.

هەرکام لە قاچاغچییەکان بە لانیکەمەوە ١٢-١٠ بنەماڵـەیان لەسەر ڕێگای هاتووچۆی خۆیان لە نێوان باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دەژیاند و لە نێو شارەکانیشدا خەڵکێکی زۆر سودیان لێدەبردن، بە گشتی دەکرێ بڵێین ئەوان بازرگانێک بوون کە گومرگیان بە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان نەدەدا.

جیا لەوانە چەند کەسێکی تریش هەبوون بە ناوەکانی «بەحرالعلوم»، «قاسمی ئەحمەدی» و «عەلی عەجەم» کە پێشتر ئەفسەری «فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوون و لە سەردەمی «پیشەوەری» دا ڕایان کردبوو و هاتبوون لە کوردستان گیرسابونەوە. ئاغاکان ئەوانـەیان ڕاگرتبوو، و بو خوێندەوار کردنی منداڵەکانیان کەڵکیان لێوەردەگرتن. ئەوانیش بۆ خۆیان فێرە کوردی ببوون و ژنی کوردیان هێنابوو. ئەوانە تیکەڵاوێکی زۆریان دەگەڵ خەڵک هەبوو، چونکـە یارمەتی خەڵکیان دەدا خەڵک ڕێزی لێدەگرتن، بەڵام پاشناوی عەجەمیان هەر لەسەر بوو.

ئەوان نامەیان بۆ خەڵک دەنووسی و پینەچێتیان دەکرد. بەحرلعلوم، گوند بە گوندی ناوچەکانی گەورک، مەنگوڕ، شامات و محاڵ دەگەڕا و بەبی وەرگرتنی پارە پێڵاوی خەڵکی چاک دەکردەوە. ئێمە ئەوانەمان کرد بە ئەندامی حیزب و بە هۆی ئەوانەوە ژمارەیەکی زۆرمان بۆ نێو حیزب ڕاکێشا. ئەوکات، حیزب لە گوندەکاندا شانە و کۆمیتـەی هەبوو، و خەڵک بە تێکرایی باش بوون و کەس سیخوڕی بو دوژمن نەدەکرد. تەنانەت ئەو کاتەش کە ئێمە لە مەهاباد ڕامان کردبوو و لە گوندەکاندا مابووینەوە و کاری حیزبیمان دەکرد، ئاغاکانی سەر بە (ڕوکنی ٢)ش گیروگرفتیان بۆ نەدەخولقاندین.

(حەمەدی کیسەڵان) بۆ خۆی دەیگوت بۆ «روکنی٢» کار دەکات، بەڵام ئەگەر ئیمە ڕۆژێک بە نزیکی دێیەکـەیدا تێپەڕ باین و لامان نەدابا و نانێنکمان دەگەڵ نەخواردبا، دەهات و گلـەیی

لیدەکردین. ئاغاکان دەهاتن بۆ لای ئێمە و دەیانگوت: «ئێمەش مالین و پیاوەتیمان لە دەست دێت، پیمانخوشە خزمەتتان پێ بکەین. ئێمەش هەرجارەی ٤ - ٥ کەس دەچووینە لایان و لە ماڵیان دەماینەوە و لە پەناوەش کارەکانمان دەکرد و ئەوانیش خزمەتیان پێدەکردین. بە دوای تە واو بوونی کارەکانمان، خانە خوێیەکانمان دەیانگوت: «ئێوە بڕۆن و منیش دەچم ڕاپۆرتێک دەنووسم بۆ «ڕوکنی ۲» و دەڵێم فلان کەسێکم دیتووە.

## چپ در ایران، به روایت اسناد ساواک، حزب دموکرات کردستان ایران،جلد اول
## لاپەڕەی ۳۳



[ ڕێکەوت: ۱۹-۹- ۳۷
ژمارە: ۵۹۲-٤ب۲

یەکێک لە ئەندامانی حیزبی کۆمەڵە [مەبەستی کۆمەڵەی ژێ. کاف.ـە] کە دە ساڵی ۲۵ [۱۳۲۵ه] هەڵاتۆتە عێراق ئێستاش لە نێوان ئێران و باکۆ قاسیدە و پێیەکی لە ئێرانە و پێیەکی لە باکۆ و وێنەکانیشمان هەنە.

یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵە [مەبەستی کۆمەڵەی ژێ. کاف.ـە] لە دەرفەت کەڵکی وەرگرتووە و هەڵاتۆتە عێراق و ماوەیەکی زۆرە لەوێ دەژی. وا دیارە کە ئەو ماوەیە بە شێوەی قاچاخ هاتۆتەوە ناوچەی مەهاباد - شنۆ - سەردەشت و بۆکان. بەردەوام لە نێوان کوردەکان و ئەندامانی کۆمەڵە لە پێوەندی دایە....

- عەبدوڵڵا بارزانی ....

- محەممەد مەولود خەڵکی مەهابادە. یەکێک لە لەزەبرترین و بەتواناترین ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک ـە. ناوبراو بەردەوام لە نێوان عێراق - تورکیە - ئێران و باکۆ لە هاموشۆ دایە. ناوبراو لە چالاکترین و شارەزاترین کەسەکانی ناو کۆمەڵەی ژ.ک بووە کە ساڵی ۱۳۲۵ هەڵاتۆتە عێراق.

- دڵشاد ڕەسوڵی ...

## سادات نقشبندی و جنبشهای ملی کرد در گذر تاریخ

**نووسینی «سەید عەبدولڕەحمانی حوسێنی نەقشبەندی»، وەرگێرانی محمد بانەای، چاپی «ارومیە - موسسە انتشاراتی حسینی» لە لاپەڕەی ٢٠٥ - ٢٠٧**

**(وەرگێڕ لە فارسییەوە بۆ کوردی: وریا ماملێ)**

### (و - ٥) کاک حەمەدی مەولوودە چرچی

کاک حەمەد پیاوێکی بەغیرەت و شۆڕشگێڕ بوو. فێڵەزان و ساختەچی نەبوو. پێش ئەوەی شەهید قازی محەممەد لە ساڵی ١٩٤٦ ببێتە سەرۆک کۆماری کوردستان، کاک حەمەدی وەک یەک لە دۆستە نیزیکەکانی خۆی بە ئەژمار دەهێنا. چونکە یەکجار بەغیرەت و دلێر و نەترس بوو و هەروەها لە بەرانبەر دوژمناندا کەسێکی بەهێز بوو. کۆماری کوردستانی لە ناخی دڵەوە خۆشدەویست و لە هەمانکاتیشدا کەسێکی ئەمەگناس و پەیماندار و چاکەلەبیر بوو. هەربۆیە لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا بە یەک لە کەسە هەرە نیزیکەکانی پێشەوا قازی محەممەد دەناسرا. ناوبراو دۆستی گیانیگیانی کەسێک بوو بە ناوی (مستەفا زینەت)[1] کە بەردەوام دەگەڵ یەکتر بوون و لە هەموو کار و چالاکییەکانیدا کاک مستەفا هاوکاری بوو. جگە لەوەی هەردووکیان لەسەرەتاوە و بە باب و بە باپیریانەوە لە موریدانی ماڵباتی بەڕێزی ساداتی نەقشبەندی بوون، هەروەها لەبەر ئەو هۆکارگەلەش کە حەزرەتی شێخ عەلاوەدین گشت پەنابەرەکان و ئەو کەسانەی لە دەست زوڵم و بێدادی دەستەڵاتدارانی بەدکار و زۆردار ڕایاندەکرد، بە باوەشی گەرمیان وەریدەگرتن و، هەمەلایەنە یارمەتی دەدان و ماڵەکەی بۆ کردبوون بە ئەنوا و حەشارگە و داڵتەماڵیان. دەگەڵکوو داو و دەهۆکان لە دژی کۆماری مەهاباد[2] سەرکەوت و ئەو کۆمارە لە زستانی ساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی تێکچوو، کاک حەمەد و کاک مستەفا پەنایان بۆ گوندی «خەلان» هێنا. حەزرەتی شێخ فەرمانی دا یەکەو ماڵێکی گونجاویان بۆ ئامادە بکەن و چەند کەسێکیشی نارده مەهاباد تا ماڵ و منداڵەکانیان بۆ بێننە خەلانێ. براکەی کاک حەمەدی، بەڕێز «حەمەدەمین»ـی مەولودە چرچی یەک لە ئەندامانی بنەماڵەکەی بوو[3] کە بۆ ماوەی چەند ساڵان

---

[1] مەبەستیان خوالێخۆشبوو "مستەفا زینەتی"ـیە.

[2] کۆماری کوردستان دروستە نەک مەهاباد. لەبەر ئەوەی لە کتێبەکەدا وا نووسراوە بۆیە منیش لێرە دەقادەق نووسیومەتەوە.

[3] ڕەنگە بەڕێز کاک سەید عەبدولڕەحمانی نەقشبەندی بەباشی ڕووداوەکانی نەهاتبێتەوە زەینی بەڵام وەک لە نووسینەکانی کاک حەمەد ڕا دەردەکەوێ پێشتر ماڵی مستەفا زینەتی لە خەلانێ بووە کە کاک حەمەد دەچێتە خەلانێ. پاشان کە کاک حەمەد لە خەلانێ دادەمەزرێ، بە شوێن حەمەدەمینی برایدا دەنێرێتە زیندانی کەرکوک، تا لەوێ ڕابکات و بێت بۆ خەلان. هەروەها بنەماڵەی کاک حەمەدی کەمێک زیاتر لە ساڵێک و پێش سەفەرەکەی کاپیتان بۆ شۆڕەوی لە ساڵی ١٣٣٠ چوون بۆ خەلانێ.

لە ژێر سێبەری حەزرەتی شێخ عەلاوەدین دەژیان و گشت بژێوی ژیانیان لەلایەن جەنابی شێخەوە دابین دەکرا.

لێرەدا دوو ڕووداوم لەبیر ماوە کە بۆتانی دەگێڕمەوە:

- نێوانی حکومەتی عێراق و دەوڵەتی ئێران خۆش ببوو. دەوڵەتی ئێران داوای لە حکومەتی عێراق کرد کە دەبێ بە زووترین کات و بێدواکەوتن حەمەدی مەولودە چرچی بدەنەوە بە ئێران تا بە تاوانی داگیرکردنی چەکوچۆڵی شەڕی دەوڵەتی ئێران، دادگایی بکرێت. وەزارەتی دەرەوەی ئێران بۆ چەندەمینجار و لەوپەڕی پێداگری و مکوڕیدا، داوای کاک حەمەدی دەکردەوە و دەستی هەڵنەدەگرت. بە ویستی خوا، لە گوندی خەلانێ پەنابەرێکی دیکەی لێبوو بە ناوی «حەمەدی مەولود». لەبەر ئەوەی کە نێوانی دوو دەوڵەتی ئێران و عێراق لەسەر کاک حەمەدەی مەولودە چرچی تێکنەچێت و لەلایەکی تریشەوە داواکراوەکەش (کاک حەمەدی مەولودە چرچی) پارێزراو بێ، حەزرەتی شێخ داوای لەو کەسە کرد کە ناوی (حەمەد مەولود مەنگوڕ) بوو خۆی بە پۆلیسی عێراق بناسێنێ تا ئەو بدەنەوە بە ئێران. بەڵێنیشی پێدا پاشی چەند ڕۆژان لە زیندان ڕزگاری بکات و بیگەڕێنێتەوە ناوماڵومنداڵی خۆی.

جێگری ناوەندی پۆلیس (ئیسماعیل ئەفەندی) حەمەدە مەولودە مەنگوڕی وەرگرت و لە سنووری حاجی ئۆمەران دایەوە بە ئەفسەرەکانی ئەرتەشی ئێران. ئەوانیش بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر بردبوویانە نەغەدەی. زیاتر لە چەند کوردی مەهابادی کە سەر بە دەوڵەت بوون و پێشتر کاک حەمەدی مەولودە چرچییان دەناسی و تەنانەت هاموشۆشیان دەگەڵ یەکتر هەبوو، بانگ دەکەن تا بزانن ئەوە هەمان حەمەدی مەولودە کە بەشوێنیدا وێڵن؟ پاشی لێکۆڵینەوە و بێنەوبەرەی زۆر، بۆ بەرپرسانی ئێرانی ئاشکرا دەبێ کە ئەو کەسە بە هەڵە گیراوە و ئەو کەسە نییە کە لێی دەگەڕێن! لە ئاکامدا دەینێرنەوە خەلانێ. زۆریان داوای لێبوردن لە حەزرەتی شێخ کرد و گوتیان:

— بەداخەوە ئەو خەبەرەی لەلایەن وڵاتفرۆشان و نەمامەکانەوە لە گوندەکانی سەرسنوور گەیبوو دەستمان، هەڵە و درۆ بووە.

ئەو نیشتمانفرۆشانە ئامانجیان لەو خەبەرە هەڵە و نەمامییانە ئەوە بوو تا گوشار بۆ حەزرەتی شێخ بینن تا داڵدەی ئەو پەنابەر و لێقەوماوانەی لە دەست بێدادی حکومەتی محەممەد ڕەزا شا هەڵدێن، نەدات. بە خۆشییەوە ئەوجارەش سەریان وە بەرد کەوت و سەرکەوتوو نەبوون. بەو شێوەیە لە سێبەری بڕیاری ژیرانە و بەجێی حەزرەتی شێخ عەلاوەدین، کاک حەمەدی مەولودە چرچی لەو داوەش ڕزگاری بوو. (سپاس بۆ خودا)

- لە ساڵی ١٩٤٧ز نامەیەک لەلایەن حاج سەید بابەشێخ (سەرۆک وەزیرانی کۆماری مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٦ز) گەیشتە دەستی حەزرەتی شێخ عەلاوەدین. ناوەرۆکەکەی بەو شێوەیە بوو: [ بە نیاز بووم بۆ یەک لە منداڵەکانم زەماوەند بکەم. بۆ کڕینی کەرەسەی پێویست چەند کەسێکم نارده سابڵاخ. لە گەڕانەوەدا کاروانەکەیان لە قاوەخانەی «گردەبەردان» لەلایەن حەمەدی مەولودە چرچ و هاوڕێکانی کە هەموویان چەکدار بوون پێشیان پێدەگرن و ڕووتیان دەکەن و تەواوی جلکی بووک و گیاز و خواردەمەنییەکەیان بە نهێنی و دوور لە چاوی ئێوە هێناوەتە خەلانێ. سەرەڕای ئەوەی بارەکەی دەست بەسەرداگرتووە، بە یەک لە

باوەڕپێکراوەکانی من کە دەگەڵ کاروانەکەی بووە گوتووە کە بە حاج سەید بابەشێخ بڵێن: من حەمەدی مەولودە چرچیم، ئەو کارەم بۆیە کرد لە تۆڵەی فڵانە ڕووداو. ئەو ڕووداوە خۆی (حاجی سەید بابەشێخ) لێی خەبەرداره.] بەڕێز حاجی سەید بابەشێخ لە نامەکەدا داوای لە حەزرەتی شێخ عەلاوەدین کردبوو کە ئەو ماڵەی لە حەمەدی مەولودە چرچی وەرگرێتەوە و بۆی بنێرێتەوە مەهاباد.

حەزرەتی شێخ، حەمەدی بانگ دەکات و نامەکەی بۆ دەخوێنێتەوە و بە کاک حەمەد دەڵێ: (گەر کاری ئێوەیە، بەبێ قڕە و بەبێ هیچ دوودڵییەک ماڵەکە دەبێ بدەنەوە بە حاجی سەید بابەشێخ و نابێ دەنکی کەم بێ. دەمهەوێ هەر ئەمڕۆ بیاندەمەوە بە نوێنەرەکەی حاجی سەید بابەشێخ تا بۆی بەرێتەوە.) حەمەدی مەولودە چرچی لە ژێر ئەو کارەی نەدا و ڕاشکاوانە هەموو ڕاستییەکەی بە شێخ گوت و گشت ماڵەکەی دایەوە بە حەزرەتی شێخ عەلاوەدین و ئەویش بۆ حاجی سەید بابەشێخی ناردەوە. کاتێک کاک حەمەد ماڵەکەی دەدایەوە بە حەزرەتی شێخ عەلاوەدین، لە بنە خۆیەوە دەیگوت: (لە تەواوی تەمەنمدا ئەوە یەکەمجارە دەبینم کە شێخێک لەسەر شێخێک بکاتەوە). دیسانیش هەر بۆخۆی وەڵامی خۆی دەدایەوە و دەیگوت: (ئەو کارە لە خەلانێ جێی سەرسووڕمان نییە، لەبەرئەوەی حەزرەتی شێخ عەلاوەدین کاری نەشیاو لە هیچکەس و لە دژی هیچکەس قەبوڵ ناکات.)

پاش ماوەیەک بەڕێز شێخ لەتیفی حەفید بۆ چاوپێکەوتنی حەزرەتی شێخ عەلاوەدین هاتە گوندی «خەلان»ـێ. لەوێ کاک حەمەدمان بە شێخ لەتیف ناساند.[1] کاتێک دەیویست بەگەڕێتەوە داوای لە حەزرەتی شێخ عەلاوەدین کرد تا ئیزن بدات کاک حەمەدی مەولودە چرچی دەگەڵ خۆی بەرێتە لای خۆیان لە گوندی (نەوتێ). حەزرەتی شێخ عەلاوەدین ڕازی بوو و کاک حەمەد بۆ ماوەیەک لەلای شێخ لەتیف مایەوە.[2] پاش ماوەیەک بۆ جاری دووهەم گەڕایەوە بۆ خەلانێ. ئەوجارەیان ئیزنی لە حەزرەتی شێخ عەلاوەدین وەرگرت و بە نهێنی ڕێگای وڵاتی شۆڕەوی گرتەبەر (سۆڤیەت) و ئیتر لەوکاتەوە هیچ هەواڵێک و زانیارییەکمان لێی نییە.

پاش ئەوەی لە ئێران لێبوردنی گشتی درا، برای کاک حەمەدی بەناوی حەمەدەمین دەگەڵ باقی ئەندامانی بنەماڵەکەی گەڕانەوە بۆ مەهاباد.

---

[1] وەک لە بیرەوەرییەکانی کاپیتان حەمەددا خوێندمانەوە یەکەمجار کاپیتان دەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانی خۆی لە کۆمەڵەی ژ.ک، لە ماڵی شێخ لەتیف دەگیرسێتەوە. بەوپێیە کاپیتان و شێخ لەتیف پێشتر یەکتریان ناسیوە.

[2] لەو سەفەرەدا کاپیتان بە ماڵ و منداڵەوە چووبوو بۆ نەوتێ لای نەمر شێخ لەتیف.

## مامۆستا مەلا «عەبدوڵڵا حەسەنزادە» (حەیاکی)

تۆڕی میدیایی «ڕووداو» لە بەرنامەیەکی خۆیدا « بە ناوی «پەنجەمۆر»، میوانداری لە بەڕێز مامۆستا مەلا «عەبدوڵڵا حەسەنزادە» کە بە مامۆستا مەلا «عەبدوڵڵا حەیاکی»ـش مەنشوورە کرد و لەسەر مێژووی خەباتی بەڕێزیان دوان.[1] لە خولەکی ۰۵:۰۵:۰۰ی بەرنامەکەدا باس لە ژیانی منداڵیی مامۆستا کرا، و تێیدا مامۆستا دەفەرموێ کە من لە سەدەرمی کۆماری کوردستاندا منداڵێکی ٦ - ٧ ساڵانە بووم لە گوندێکی ناوچەی سەردەشتێ. لە ڕاستیدا زۆر شتم لە یاد نییە، بەڵام بنکەیەکی پێشمەرگەی کۆمار لە گوندی «هەمران» بوو و بەو هۆیەوە ئەخباری کۆمارمان زۆر بۆ دەهات و دەمانبیستن.

پێشکەشکاری بەرنامەکە لە مامۆستا دەپرسێ:

- مامۆستا وەک لەبیرتان مابێ کێ لە فەرماندەکانی ئەوکاتە لەو ناوچەیەدا ناوبانگی هەبوو؟
- مامۆستا: ئەوەی زۆر مەشهوور بوو لەوێ، پیاوێک هەبوو بە ناوی «حەمەدی مەولوودی». خەڵکی مەهابادێ بوو. دوایەش کە کۆمار تێکچوو چۆ بۆ ئیتیحادی سۆڤییەت و لە ساڵانی ئەخیردا ئەمری خودای کرد. ئەو بە کاپیتان دەناسرا، کاپیتان حەمەدی مەولوودی. ئەوە یەک - دوو جار هاتە گوندەکەی ئێمە. لە پاشان ناوی «زێڕۆ» هەبوو، «زێڕۆی هەرکی»، ئەوانە ناویان دەهات.
- پێشکەشکار: ئەوانە لە ئازایەتیدا ناوبانگیان هەبوو یا لە چیدا بوو؟
- ئەوانە وەک فەرماندەی نیزامی بوون. بەتایبەت حەمەدی مەولوودی وەکوو ئەفسەرێک تەلەقی دەکرا چوونکی یەک لەو پێشمەرگانە بوو کە تەدریب و ڕاهێنانی سەربازی دیتبوو. لەبەر ئەوە بەنێوبانگ بوو. دیارە ناوی خەڵکی دیکەش لە ئەو گەورەتر هەبوو وەکی قازی محەممەد و سەیفی قازی و حاجی بابە شێخ و مەلا مستەفای بارزانی بەڵام لە مەنتەقەکەی ئێمە ناوی ئەوانە هەبوو.

---

[1] https://youtu.be/IaYHsSQAHYk?t=291

## وتووێژی بەڕێز عەلی کەریمی دەگەڵ نەجمەددین تەوحیدی[1]

بەڕێز نەجمەددین تەوحیدی یەک لە خوێندەوارەکانی زەمەنی خۆیان و ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک بووە. بەڕێز عەلی کەریمی لە ڕێکەوتی ١٩٩٩/٠٥/٢٢ کاتژمێر ١٨:١٢، کاتێک کە بەڕێز تەوحیدی لە ئێرانەوە بە سەفەر دەچێت بۆ وڵاتی سوئێد، هەڵ دەقۆزێتەوە و سەردانی دەکات و وتووێژێکی گرینگی دەگەڵیان پێکدێنێ و سەبارەت بە ڕووداوەکانی سەردەمی کۆمار و بەتایبەت ئەو باسانەی کە پەیوەست بوون بە نەمر مامۆستا عولەما ( عەبدولڕەحمانی زەبیحی) دەگەڵیان دێنێتە بەر باس. لە ناوئاخنی وتووێژێکی ٥٦:٤٠ خولەکیدا و لە خولەکی ٠٠:١٢:١٣ ـدا لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کاک عەلیدا کە لێی دەپرسێ: دەنێو کۆمەڵەیدا (مەبەستیان کۆمەڵەی ژ.ک ـە)، ڕابیتەی ئەندامەکان لە بواری پاکی و سەداقەتەوە چۆن بوو؟

**نەجمەددین تەوحیدی:** ئەوکاتە موقەدەسات زۆری حوکمی دەکرد. خەڵک زۆر بە بیر و باوەڕ بوو لە ڕووی مەزهەبەوە. یانی پێیان وابوو کە گەر کارێکی دەگەڵ یەکێک لە ڕەفێقەکانی خۆیان بکەن، ئەوە خەیانەتێکی گەورەیان کردووە و چاویان کوێر دەبێ. تەنانەت جارێکی حەمەدی مەولوودی کە پیاوێکی بێسەواد و نەخوێندەوار بوو؛ خۆ ناوتان بیستووە؟

**عەلی کەریمی:** بەڵێ.

**نەجمەددین تەوحیدی:** جا حەمەدی مەولوودی زۆر بە شەهامەت بوو، پیاوێکی حیسابی بوو. ڕۆژێکی بە پرتاو هاتە ئیدارەی بۆ لام و گوتی بۆ خاتری خودای چیم لێدەکەی؟ گوتم: چ بووە؟ چ قەوماوە؟ گوتی: چاوم کوێر دەبێ. گوتم: بۆ؟ چیت کردووە؟ بۆ کوێر دەبی؟ گوتی: بە بەر دەرکی «حەمامی پووتی»ـدا ڕادەبردم. دیتم ژن لە حەمام دەهاتنە دەرێ و بە لەچکەکەیان خۆیان باوەشێن دەکرد و عارەقەی حەمامێیان لێدەکردەوە. لەناویاندا ژنی «حامیدی مازووچی» تێدابوو، پاشان زانیم کە ئەوە ژنی حامیدی «مازووچی»ـیە. منیش چاوم پێیکەوتووە. تازە دڵنیام کە هەر کوێر دەبم. چیم لێدەکەی؟ چی بکەم ئێستا؟[2] ئەوەم بۆیە بۆ گێڕانەوە تا بزانن ئاوا پاک بوون

---

(١https://youtu.be/Jrfqh٥٩XZjc?t=(٧٩٣

[2] کاتێک کە کۆمەڵەی ژ.ک ئەندامیکی وەردەگرت، پێشتر سوێندیان پێ دەخوارد جا شەرەفی ئەندامێتیان پێدەبەخشی. مامۆستا هەژار موکریانی لە چێشتی مجێور و لە لاپەڕەی ٥٧دا ئاوا باسی سوێندەکە دەکات: سوێندنامەکە حەوت بەند بوو. بەداخەوە بەتەواوی لەبیرم نەماوە، بەڵام تێیدابوو کە: «بە قورعان و ئاڵای کوردستان و شەرەفم سوێند دەخۆم لەمڕۆوە بە دڵ و گیان بۆ ئازادی کوردستان تێدەکۆشم و تا مردن قوسوور ناکەم؛ هیچ بەرژەوەندییەک وەپێش بەرژەوەندی خزمەت بە وڵاتەکەم ناخەم؛ برای حیزبیم بەقەد خۆم خۆش دەوێ؛ هەتا مردن بە زمان، بە قەڵەم، بە ئیشارە و بە هیچ جۆرێ خەیانەت بە حیزب ناکەم و ڕاستی لێ ناڵێم و ناوی نهێنی ئەندامان لای کەس نادرکێنم» مەبەستی کاپیتان ئەوە بووە کە لەبەر ئەوەی سوێندی بۆ کۆمەڵە خواردووە کە قەت خیانەت بە کۆمەڵە و هاوڕێکانی نەکات و ئێستا کە چاوی بە ژنی حامید مازوچی کەوتووە وەدەزانێ ئەو کارە خیانەتە و چاوی کوێر دەبێ.

پێکەوە. ئەرێوەڵڵا! خودا شاهیدە عەینی قسەکانی حەمەدی مەولوودی ئاوا بوو. دەیگوت فڵان کەس، تازە من کوێر دەبم.

ڕۆژێکی حەمەدی مەولوودی چووبوو ١٢ نەفەر ئەفسەری دەرجە یەکی ئێرانی لە «میرەدێ»ـی ڕا بە ئەسیری هێنابوونەوە. جا من ڕۆژێک دیم ئەوە جەماعەتێک ئەفسەر لە لای قازی محەممەد ڕاوەستاون، پرسیم ئەوانە کێن؟ بۆ لەلای قازی ڕاوەستاون؟ گوتیان ئەوانە حەمەدی مەولوودی لە جەبهەی میرەدێی ڕا بە یەخسیر گرتوونی. جا پەیمانیان دەگەڵ ئێرانێ هەبوو کە هەرچی دەینێرن دەبێ مەئموورینی مەهابادێ کۆنترۆڵی کەن نەبادا چەک و ئەسلەحەی بنێرن بۆ بانە و سەردەشت. تەنیا خواردەمەنییان ئیزن دابوو کە دەربازی بێ. حەمەدی مەولوودیش تەماشای کردبوو کە ئەو ئەفسەرانە ئەسلەحەیەکی زۆریان شاردۆتەوە تا بیبەن دەربازی کەن. وەڵڵاهی، بە سەری تۆ، ئەو شەوەی پەزیراییەکیان لێ کرد، نەبێتەوە. هەر «کۆنیاک»ـیان دانێ.

**خوێنەری هێژا؛ پێش ئەوەی لاپەڕەی بیرەوەرییەکانی مامۆستای گەورەی کورد مامۆستا هەژار هەڵدەینەوە، با پێشتر سەرنجێکی ئەو کورتەباسانە بدەین**

## پێشمەرگە

کتێبی ڕۆمانی پێشمەرگە - نووسینی د. ڕەحیمی قازی یەکەم ڕۆمانی کوردییە بە زاراوەی سۆرانی و لەسەر قارەمانێتی و لەزەبربوونی پێشمەرگە نووسراوە.[١] لە پێشەکی ئەم کتێبەدا و لە لاپەڕەی ٨، نووسەر باسێکی کورت لەسەر دۆزینەوەی وشەی (پێشمەرگە) دەوروژێنێ و بۆمان باس دەکات کە ئەم وشەیە چۆناوچۆن بوو کە ساز کرا و دۆزرایەوە؟ تێیدا ئاوا دەڵێ:

[... وشەی پێشمەرگە، دیاری و بیرەوەرییەکی بەنرخ و خۆشەویست و بەڕێزە کە لە یەکەمین کۆماری نەتەوایەتیی خودموختاری کوردستانەوە، بۆمان ماوەتەوە]. پاشان نووسەر کورتەیەک لە ڕووداوەکە باس دەکات بەڵام لە لاپەڕەی ١٠٩و ١١٠ی هەمان کتێبدا ڕاستی ڕووداوەکە ئاوا دەگێڕێتەوە:

---

[١] بە باوەڕی ساخکەرەوەی (کوردبوون) و زۆر کەسیتریش، لە ڕۆمانی (پێشمەرگە)ـدا، کە پێشمەرگەیەک بە ناوی (پیرۆت) ڕۆڵ دەگێڕێ، دەبێ کاپیتان حەمەدی مەولوودی بووبێ. بەو پێیەی کە کاک حەمەد لە باکۆ دەگەڵ د. ڕەحیم قازی بەیەکەوە ئاوارە بوون و بەردەوام دەگەڵ یەکتر بوون، دوور نییە کە لە بەشێکی زۆر لە ڕۆمانەکەدا، ژیان و بەسەرهاتی کاپیتانی کردبێتە هەوێنی ئەو ڕۆمانە. چون ڕۆڵی پیرۆت لەو ڕۆمانەدا زۆر دەگەڵ کەسایەتی کاک حەمەد و قارەمانەتییەکانی یەک دەگرنەوە.

[جا کاک بینایی[1] بە (هێمن)ـی[2] ئەسپاردبوو کە بۆ گەلێک وشەی فارسی و عەرەبی کە لە ڕێڕەوی خەباتی سیاسیدا بەکار دەهێنرێن وشەی کوردی پەتی بدۆزنەوە و لە کاری بێنن. هێمن بە سەرۆکی کۆمیسیۆنێک کە بۆ ئەم کارەی دیاری کرابوو داندرابوو. هێمن لە وەڵامی کاک بیناییدا گوتی:

— قوربان وەڵڵاهی قسەیەکی هێندە خۆشم پێیە کە ئەگەر بۆت بگێڕمەوە ڕەنگە باوەڕم پێ نەکەی. ئەوە دوو ڕۆژ بوو ژمارەیەک لە برادەرانی خوێندەوار و هونەرمەند و پسپۆڕ و زمانناسم وەکۆ کردبوو کە بزانن لە زمانی کوردیدا لە جیاتی وشەی سەرباز و نیزامی و عەسکەر و مجاهید و فیدایی، چ وشەیەک لەکار بێنین، زۆرمان قسەو باس لەسەر کرد، کێشە و هەرایەکی گەورە پەیدا بوو، بەڵام نەتیجە وەگیر نەکەوت. هەموو ماندوو و شەکەت بووین و داوای چامان کرد. پیرەپیاوێکی دنیادیتوو[3] چای بۆ هێناین و بە پێکەنینەوە گوتی با نەخوێندەواریش بم، خۆ کافر نابم بڵێم کێشەی مامۆستاکان لەسەر چییە؟ لە وەڵامدا پێمانگوت کە بە پێچەوانە، ڕەنگە بتوانی یارمەتیشمان بدەی. جا بڵێ بزانین لەباتی سەرباز لە کوردیدا چیت پێ شک دێ؟ پیرە دیسان پێکەنی و گوتی: بێبەڵا بن، بۆ هێندە خۆتان ماندوو دەکەن. مەگەر نەتانبستووە لە ڕابردوودا لەنێو کوردەواری بە پیاوی لەخۆبوردوویان دەگوت (پێشمەرگە).

جا ئەوە هاتوومەتە خزمەتت ئەو خەبەرەت پێبدەم چونکە دەزانم خەبەری وات زۆر پێخۆشە. کاک بینایی ئەو وشەیەی زۆر بە دڵ بوو. لە خۆشیان چاوی پڕ بوو لە ئاو و لە وەڵامی هێمندا گوتی:

— بێبەشی و زوڵم و زۆرداری لە حەدبەدەر، هەموو کوردێکی خاوەن شەرەفی کردۆتە نیشتمانپەروەر و ئەو هەستە نیشتمانپەروەرییە پشتیوانێکی بەهێز و دانەواوە بۆ وەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی گەلەکەمان. جا بزانە ئەو پیرە نەخوێندەوارە تا چ ڕادەیەک خاوەنی هەستی نیشتمانپەروەرییە کە ئەو وشە جوان و پڕمانایەی لەسەر قامووسی زمانی نەتەوەکەمان زیاد کردووە. بەڕاستی پیاو کە ئەو وشەیە دەبیستێ خۆبەخۆ کوردێکی کۆڵنەدەر و ئازا و بەکار و نەترس و کارچاکی دێتە پێش چاو و هەویا و هومێدی پتر و قایمتر دەبێ].

---

[1] (بینایی) ناوی نهێنی پێشەوا قازی محەممەد بوو لە کۆمەڵەی (ژ.ک)ـدا.

[2] (هێمن) لە ڕاستیدا ناوی نهێنی مامۆستا محەمەد ئەمینی شەیخولئیسلامی (مامۆستا هێمن) بوو لە سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ک، کە پاشان وەک ناوی ئەدەبی کەڵکی لێوەرگرت.

[3] لە دیمانەیەکی تێلێڤیزیۆنیدا، بەڕێز کاک هاشمی کورد یەک لە پێشمەرگەکانی کۆمار، ناوی ئەو پیاوە دنیادیتووە دێدرکێنی و دەڵێ کەسێک بووە بە ناوی (ئەحمەد دەسماڵ).

کاک ڕەحیم قازی هەم ئەندامێکی بنەماڵەی سەربەرزی قازییە، هەم یەک لە ئەفسەرەکان بووە کە نێردراوەتە باکۆ، هەمیش لە نیزیکەوە ئاگاداری هەموو ڕووداوەکان بووە و گەر بۆخۆیشی لە ناخی ڕووداوەکان نەبووبێ، ئەوە سەرچاوەی باوەڕپێکراو وردەڕیشاڵی ڕووداوەکانیان بۆ باس کردووە. خۆزگە زیاتر باسی ئەوەی دەکرد کە دەوڵەتی کوردستان بۆ پێویستییان بەم وشەیە هەبووە؟ کێ بووە ئەو وشەیەی پێشنیار کردووە؟ یان جیا لە مامۆستا هێمن، ئەو کەسانە کێ بوون کە هەڵبژێردراون تا ناوەکە بدۆزنەوە و زۆر پرسیاری تریش.

هەر لەو پێوەندییەدا مێژووناس و گەڕێدەی کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا «کەریم زەند» کە خۆی لەسەردەمی کۆماری کوردستان لەوێ بووە ڕووداوەکە کەمێک زیندووتر لە دیمانەیەکی تێلێڤیزیۆنیدا دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

[لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا، بە فەرمانی پێشەوا قازی محەممەد لێژنەیەک دانرا بە مەبەستی دۆزینەوەی ناوێک بۆ هێزی کوردیی، لیژنەکە بریتی لە هەژار موکریانی، هێمن موکریانی، محەممەد تۆفیق وەردی و کەریم زەند بوو. ئەم لێژنەیە لە دانیشتنێکی تایبەتدا، گەلێک ناویان تاوتوێ کرد. لێژنەکە هەر لە مشتومڕدا بوون کە لە ناکاو خزمەتگوزارێک کە لەوێ بووە و بەردەستیی دەکردن و ناوی میرزای ڕەشیدی بوو گوتی: ئاغایان دەبینم ئێوە چەند کاتژمێرێکە خەریکن کە ناوێکی شیاو بدۆزنەوە، لە کاتێکدا ئێمە ناوی پێشمەرگەمان هەیە، لەمێژە بەکار براوە. لێژنەکە ناوەکەیان بە شادومانییەوە وەرگرت و ناوی پێشمەرگەیان پێشکەشی پێشەوای مەزن کرد، ئەویش زۆر لای پەسەند بوو و ناوی پێشمەرگە بە فەرمیی ناسرا.]

## چەتە و قاچاغچی

ئەو دوو ڕووداوەی کە پێشتر باس کران، تا ڕادەیەکی زۆر یەک ناوەڕۆکیان هەیە و تێیاندا دەردەکەوێ کە پێشتر ناوێک بۆ هێزی چەکداری کوردەکان بوونی نەبووە، بۆیە ویستوویانە ناوێک بۆ ئەو هێزانە بدۆزنەوە. لێرەدا پرسیار دێتە گۆڕ کە ئاخۆ پێش دروستبوونی کۆمار، کورد دژی حکومەتەکان شەڕیان کردووە؟ گەر شەڕیان کردووە چەکدارە کوردەکان ناویان چ بووە؟ خەڵک چۆنیان ناو لێناون؟ ئەدی حکومەتەکان یا پیاوانی حکومەت بە چ ناوێک ناویان بردوون؟ ئەو چەکدارە کوردانە چ پێگەیەکیان لەناو دڵی کۆمەڵگای کوردیدا هەبووە؟

بۆ هەڵسەنگاندن و شرۆڤە لەسەر هەر بابەتێکی کۆن و مێژوویی، مرۆڤ دەبێ خۆی لە کات و زەمانی ئەو سەردەمدا ببینێتەوە و کۆمەڵگای ئەوکات بێنێتە پێش چاوەکانی خۆی و لەمپەر و خاڵە بەهێزەکانی ئەودەم ببینێت دەنا، شرۆڤەکان و ڕای بە لاڕێدا دەڕوات.

شاراوە نییە کە سەردەمانی کۆن پێگە و دەستەڵاتی عەشیرەتەکان وەک هێز و هەروەها پیاوانی ئایینی لە بواری ئایینی، یەکلاییکەرەوە بوون و قسەی یەکەمیان کردووە لە دابین کردنی ئاسایش

له کۆمەڵگای کوردەواری. لەو نێوەدا تەنیا عەشیرەتەکان بوون کە هێزی چەکداریان هەبووە کە پێیان گوتراوە چەکدارانی فڵانە عەشیرەت (دەگمەن شێخێکیش چەکداریان هەبووە). حکومەتەکان لە ڕێگای ئەو دوو دیاردەیەدا توانیویانە دەستەڵاتی خۆیان بەسەر کورددا بسەپێنن.
لە دەقە مێژوویەکاندا بە دەیان شۆڕشی بچووک لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان ڕوویانداوە وەک یاخیبوونەکانی «حەمە هەتیو»، «حەمەتاڵ»، «خەلیل قەننە کون»، «هۆمەر پاشای جەنگەڵ»، «مام ڕۆستەم» و ... کە زۆربەیان یاخیبوونێکە لە دەست ئاغاکانی عەشیرەت و ئەمنییەکانی حکومەت. ڕوون و ئاشکرایە کە لە لایەن حکومەت و عەشیرەتەکانەوە ئەو کەسانە بە ناشیرینترین شێوە پێشانی خەڵک دەدرێن و هەزاران ناو و نرتکە و بوختانیان بۆ هەڵدەبەستن و وەک دز و ڕێگر و چەتە و ... باسیان دەکەن. وەک چۆن ئێستا لە ئێران بە پێشمەرگە و قارەمانەکانی کورد دەڵێن تێرۆڕیست و پیاوکووژ و .... یا لە تورکیە بە گەریلا و خەباتگێڕانی کورد دەڵێن تێرۆڕیست و «چەتە». شاراوەش نییە کە پێشمەرگە و گەریلاکانی کورد لەناو دڵی هەر کوردێکی بەشەرەفدا جێیان هەیە و وەک ڕەمزی کوردایەتی چاویان لێ دەکرێ.
بە دڵنیاییەوە کەسانێک کە زۆرداری دەیانگەیێنێتە سەر ئێسکانیان و لە ئەنجامدا یاخی دەبن، شۆڕش هەڵدەگیرسێنن و ئامادە دەبن گیانی خۆیان بۆ ئامانج و مەبەستەکەیان دابنێن، بۆ داکۆکی لە خۆیان لە بەرانبەر دوژمنەکانیاندا زمانی شەڕ و تێکهەڵچوون بەکار دێنن. لەو گرژییانەدا ڕەنگە دەستکەوتی وەک چەکوچۆڵ، ئەسب، یا هەر چەشنە کەرەسەیەک دەستیان بکەوێ کە بۆخۆیان ناوی لێدەنێن «دەستکەوت» و دوژمنیش پێیان دەڵێ «تاڵانکردن» و بە ئەنجامدەرانیش دەڵێن «چەتە و تاڵانچی و دز» یا هەر چەشنە ناوێکی نەشیاو، کە تا ئێستاش ئەو ڕەوتە بەو شێوەیەیە. لەخۆڕا نەبوو کە لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا بەرپرسان وەخۆ کەوتن تا ناوێک بۆ هێزی چەکداری کۆمار بدۆزنەوە کە لە ئاکامدا وشەی پیرۆز و پڕفەڕی (پێشمەرگە)ـیان دۆزییەوە.
مامە غەنی بلوریان لە بیرەوەرییەکانی خۆیاندا بە ناوی «ئاڵەکۆک» کە کاک حامید گەوهەری بڵاوی کردۆتەوە و هەروەها لە کتێبێکی تردا بە ناوی (سەدەی کارەسات) کە بەڕێز برایمی فەرشی بڵاوی کردۆتەوە و لە لاپەڕەکانی پێشتر بە تەسەلی خوێندمانەوە؛ لە زمان «کاکە مین»ـەوە بەجوانی پێناسەی بەرەی گەل و بەرەی دوژمنانی بۆ کردین. بۆی باس کردین کە زۆربەی ئەو کەسانەی بە دز و ڕێگر ناویان دەهێنان، هێزی داکۆکیکار لە گەل یان شۆڕشگێڕانێک بوون کە بە دژی دەستەڵاتی زاڵ و زاڵمدا تێکۆشانیان دەکرد. هەر لەو پێوەندییەدا خوالێخۆشبوو (عەقید عەبدولکەریم حەوێزی ناسراو بە ڕەئیس بەکر) لە کتێبی بیرەوەرییەکانی خۆیاندا بە ناوی گەشتێک بەناوی کۆماری کورستاندا لە لاپەڕەی ٨٠ دا ئەو باسە دەورووژێنێت و ئاوا لەسەری دەدوێ:
[... هەڵبەتە بەردەوام داگیرکەرانی کوردستان مەسەلەی ئایین و ئاینزانیيەتییان کردۆتە چەکێکی خۆرت دژ بە کورد و خواستەکانی و هەمیشە کۆمەڵگای کوردەوارییان بەو چەکە

تۆقاندووه و سەرپاکی بزووتنەوەی ئازادیخوازەکانی کوردیان بە چەتە و ڕێگر پێشان داوە و سەدان پڕوپاڵانتەی هەرزانیشتیان بۆ هەڵبەستووە کە گۆیا ئەو بزووتنەوانە دژ بە دەستەڵاتی پاکی ئیسلامە، نەک هەر ئەوە بەڵکوو وێرانکردنی کوردستان و کوشتنی گچکە و گەورەی کوردیان بە حەلاڵ داناوە. بە نێوی ئاینی ئیسلامەوە بیر و هەستی نیشتمانییان لە نیو کۆمەڵگەی کوردەواریدا کپ کردووە و سووتاندووە....]

لە وەرگێڕانێکی مامۆستا شێرکۆ هەژاردا بە ناوی «مائۆ، چیرۆکی نەزانراو» نووسینی جونگ چانگ و جۆن هەڵیدای - بەشی دوو، نووسەر باس لە نسکۆ، سەرکەوتنەکان و ڕووداوە نەبیستراوەکانی (مائۆتسی – تونگ)، ڕێبەری ئەفسانەیی گەلیی چین دەکات. لە بەشێکدا باس لەوە دەکات کە مائۆ لە سەرەتای شۆڕشە کۆمۆنیستییەکەوە هێزی چەکداری پێکهێناوە و بۆ گەیشتن بە ئامانجە کۆمۆنیستییەکانی بەرەو چیاکان هەڵکشاوە و چەتەیی کردووە. واتە ماڵی دەوڵەمەند و زۆردارانی تاڵان کردووە. لە لاپەڕەی ٨٠ ڕا باس لە یەکەم ڕۆژەکان دەکات کە مائۆ توانیوێتی دەست بەسەر هێزێکی چەکداردا بگرێت کە ١٥٠٠ پیاو دەبوون. بۆ نیشتەجێبوونی ئەو هێزە لە شوێنێک، ڕووی لە زنجیرە چیای «جینگگانگ» (Jinggang) کرد کە دەوری ١٧٠ کیلۆمیترێک لە باشووری «وینجیئاشی» (Jiangxi) دوورە کە هەر لەمێژەوە مەڵبەندی «چەتان»[1] بوو. مائۆ بڕیاری دا کە ئەوێ بکاتە بنکەی کاری. مائۆ نێوانی دەگەڵ چەتەیەکی سەرکەوتووی ئەو مەڵبەندەدا هەبوو کە ئەویش ٥٠٠ کەسی هەبوو. ئەوانە بە ئیجارەی زەوی و باج ئەستاندن لە خەڵکەکە دەژیان. ...

لە درێژەدا کتێبەکە دەڵێ:

[...کاتێک کە مائۆ بە سەربازەکانی گوت کە ئەوان خەریکن دەبن بە «ئاغای شاخ» – چەتە -، ئێگجار زۆر حەپەسان، چونکە ئەوان بۆ بوونە چەتە نەبوو کە چووبوونە ڕیزی شۆڕشی کۆمۆنیستەوە، بەڵام، کە بەناوی پارتەکەوە دەدوا دڵنیای کردنەوە کە ئەوان دەبوونە چەتەی تایبەتی - بەشێک لە شۆڕشێکی نێونەتەوایەتی. مائۆ پێی‌گوتن کە چەتەیی باشترین هەلێک بوو لەبەر دەمیان چونکە: « قەت هیچ ئاغایەکی شاخ لەناو نەدراوە، چ جای بە ئێمە دەگات»....]

ئەو نموونانە و دەیان نموونەی تریش باس لەوە دەکەن کە لە هەر شوێنێک زوڵم و زۆرداری هەبێ، دەنگی ناڕازیش هەیە و هەرجار بە شێوەیەک خۆ دەنوێنێ. ئەوە مافی هەر مرۆڤێکە کە بەرانبەر بە زۆردار دژکردەوە پێشان بدات. چاوەڕوانیش لە نەیارانیان ناکرێ کە بە فریشتە و پەری ناویان بێنن بە دڵنیاییەوە بە ناحەزترین شێوە نێویان لێ دەنێن.

---

[1] ئەو شوێنە ( Jinggang Mountians / 井冈山 /Jinggangshan) لەبەر شۆڕشی مائۆ بە شوێنی لەدایکبوونی سوپای سووری چینی و (بێشکەی شۆڕشی گەلیی چین) دێتە ئەژماردن و لایان پیرۆزە و ساڵانە بە میلیۆنان کەس سەردانی ئەو زنجیرە چیایە دەکەن. تەنانەت بە زمانی چینیش ئەو ناوچەیە بە کوێستانی (چەتان) ناودێرە.

## چێشتی مجێور - بیرەوەرییەکانی مامۆستا هەژار موکریانی

کتێبی: چێشتی مجێور، نووسینی: عەبدوڕەحمان شەڕەفکەندی (هەژار)، ئامادەکردن و سەرپەرشتی چاپ: خانی شەڕەفکەندی، چاپی یەکەم، ساڵی ۱۹۹۷

نەمر مامۆستا هەژار موکریانی لە کتێبی چێشتی مجێوردا سەبارەت بە کاپیتان حەمەدی مەولوودی لە لاپەڕەی ۳۳۰ ڕا ئاوا دەنووسێت:

[لە نیوەڕۆیەکدا لە فڕگەی باکۆ دابەزیم. حەشامەتێکی زۆر بە گوڵەوە هاتبوونە بەخێرهێنانم. وەتاغێکیان لە ئوتێل توریست دامێ. کوردەکانی وڵاتی خۆمان لە باکۆ: دوکتۆر ڕەحیم قازی، عەلی گەلاوێژ، دوکتۆر قادری مەحموودزادە و ژنە سابڵاغییەکەی، عەبدوڵڵا (برازای دوکتۆر مرادی ڕەزماوەری کرماشانی)، حەمەدی مەولودە چرچ - کە کۆنە هەواڵی زەمانی کۆمەڵەم بوو - یەکجار زۆری ئازەربایجانی هەواڵیشم دیتنەوە کە لە تەورێز ئاشنا بووین...

... دڵم بە دیداری ئەو هەموو دۆست و ئاشنایانە گەشایەوە. شەوانە تا سەعات یەک و دووی شەو دەورم چۆڵ نەدەبوو. کە خەڵک بڵاوەیان دەکرد، تازە حەمەدی مەولوود سەرپێکی قسانی فت دەکرد و قەت نەیدەهێشت تا وڵات ڕووناک دەبوو چۆرتێک بدەم. قسەی ڕابردووی خۆی بۆ دەکردم؛ دەشیگوت: << ئەوەک بمرم، تۆ لەبیرت نەچێ، بینووسە...>>. وا بیست و چوار ساڵ لەو دەمە ڕابردووە؛ حەمە مردووە؛ منیش زۆرم سەرگوروشتەی ئەو لەبیر نەماوە. بەڵام هەرچۆنێک بێ سەرچڵ بۆت دەگێڕمەوە.

جارێ با بزانین حەمەم لە کەیەوە ناسیوە: حەمەی مەولوود، پیاوێکی نەخوێندەوار، دز، زۆر سەرشێت و شەڕفرۆش بوو. سابڵاغی وەزاڵە هێنابوو. دزی بە ئاشکرای دەکرد. جارێک دەچێتە ژوور لە ماڵە جوولەکەیەک. جوولەکە دەگەڵ ژنەکەی نوستوون. حەمەد دەستەنوێنێک هەڵدەگرێ، پانەوپان لە دەرکەوە ناچێ، جوولەکە بانگ دەکا: کاکە هەمەد گیان، تیلاوتیل! ئاوا بۆت دە دەرکەوە ناچی!

لە دامەزراندنی «ژێ-کاف»دا هاتە حیزبەوە. پیاوێکی بەبڕشت و موخلیس بوو. «ژێ-کاف» کە دە پێشدا خەڵکی دەترساند، تفەنگهاویشتن و ترساندن لە عوّدەی حەمەد بوو. دەگەڵ هێزی چەکداری کۆمەڵە لە هاوکارە هەرە ئازا و بە کارەکان، لە شەڕی مەکلاوێی دەوری سەردەشت، لە ئەترافی سەقز، ناوی دەرکرد. پڵینگێک بوو لەبەر هەزار کەس نەدەپرینگاوە. هەموو زۆرمان خۆش دەویست.

عارەق خۆرێکی بێوێنە بوو. پیرە پێشمەرگەیەک بۆی گێڕامەوە کە حەمەد لە مەکلاوێ دەناو ماڵێکدا قەتیس مابوو؛ دووژمن دەوری دابوو؛ ئاگریان بە ماڵەکەوە نابوو. چەند کەسێکی گیانباز خۆمان گەیاندێ. دیوارمان بڕی:

— حەمەد وەرە خۆت خەلاس کە.

— عارەقتان بۆ هێناوم؟ ئەگەر نەتانهێناوە بڕۆن، من هەڵنایەم!

دوای ئەوە قازی خۆی تەسلیم کرد و بارزانی بەرەو شنۆ کشانەوە، حەمەد ڕەگەڵیان کەوت و لە هەموو شەڕەکانی دەوری قاڕنێ و دەشتی شنۆدا زۆر بە ئازا ناوی دەرکرد. ئەویش وێڕای شێخ ئەحمەد و بارزانییەکانی کە چوونەوە عێراق، خۆی تەسلیمی عێراق کرد و دوو ساڵ لە کەرکووک گیرا. پاش حەپس ماوەیەکی زۆر سەرگەردان مایەوە. بیستبووی کە شێخ لەتیف بۆ ناسرییە لای بەسرا دوور خراوەتەوە، خۆی گەیاندبوویە. بە خێری ئاسلامەتی ببوە چێشتلێنەر و پیاوی بازاڕی شێخ. شێخ لەتیف دەیگوت دە ماڵی

کولی کردبووم و نەمدەوێرا هیچ متەق بکەم. زۆرم شێخە عەرەب و پیاوی گەورەی کورد لێ میوان دەبوو. چێشت یان زۆر سوێرە، یان زۆر بێ خوێ؟

— کاکە حەمەد بۆ وات کردووە؟

— ئەو میوانانەم پێ خوێنتاڵ بوون!

کاڵەکی دەکڕی، هەمووی قاش دەکردن.کامی بێتامە لەبەر من و میوانانی دادەنا!

ڕۆژێک ئیشتیای گونە بەرانم کرد. حەمە ڕۆیشت پڕی بوغچەیەکی هێنا.

— ئەو هەموو چییە؟

— کوڕە هەر لێی گەڕێ!چووم بە قەسابەکەم گوت: «گون!» تێم نەگەیشت. هەردوو دەستم کردە گوێ باڕاندم و دەستم بۆ گونی کابرای برد! چەندین قەسابی بانگ کرد و بۆی گێڕانەوە. هەر کەسیان چەندی گون لە لا بوو هێنایان و قەرارە هەموو ڕۆژ بۆم کۆ کەنەوە و پووڵیش نەستێنن!

لە بەغدا شاگرد عەکاس بووم؛ ڕۆژێک لەبەر دەرگای دوکان وێستابووم؛ حەمە پەیدا بوو؛

— هەژار دینت وا لێدەکەم! دونیات بۆ گەڕام. وازم لە شێخ هێنا!

بردمەوە مەنزڵەکەی کە دەگەڵ حەمەی ڕەشادی پێکەوە بووین. شەوێک حەمەی ڕەشادی چوار برادەری تری لە سەر شەڕەفی حەمەی مەولوود دەعوەت کردبوو. سفرەی عارەقیان ساز دا.

— کا حەمەد فەرموو.

— کاکە ئەو جیقنە-جیقنە عارەق خواردنەوەم بە کەیفێ نییە. ئێوە بخۆنەوە، تا نۆرەم هات بۆم دەو قاپە قووڵە بکەن!

پتر لە نیو بوتڵ عارەقی بۆ کۆ ببۆوە. بە یەک بین بە سەریەوە نا و یەک جێ تەخت لیی کەوت و تا بەیانی دەرەنگ وەهۆش نەهاتەوە!

چەند ڕۆژێکی زۆر خۆشمان پێکەوە ڕابوارد. ئێوارەیەکی سەرما کە چوومەوە، حەمەد خۆی ساز کردووە دەڕوا. ڕەشادی گوتی: دەترسم دڵی لە ئێمە هێشابێ. گوتم: نا، حەمەد چەند ساڵە دزی و چەتەیی نەکردووە، فیل کەوتۆتەوە یادی هیندووستان! حەمەد گوتی: ئای ڕەحمەت لە بابت. بەخودای بۆیە دەڕۆم!

لە گوندی خەلان، لە نیزیک سنووری ئێران ببوە میوانی شێخ عەلائەددین. وەزارەتی دەرەوەی ئێران چەند جارێک لە عێراقی خواستووە کە حەمەدی مەولوودە چرچ زۆری سەرباز و پۆلیسی ئێمە کوشتووە و دەگەڵ بارزانیان هاتۆتە عێراق، بماندەنەوە، فایدەی نەبوو. کە زانراوە وا لە خەلانە، قوڵیخانی قەرەپەپاغ و سەرهنگێک دەنێرنە ڕەواندز، دەنێرن حەمەد دەگرن. حاکم لە ڕەواندز کوردێکە.

— کوڕە تۆ ئێرانیت؟

— نەخێر قوربان خەڵکی خەلانم و عێراقیم. ئەو قوڵیخانە دەڵێ دەیناسم و هاوسەنگەرم بووە.

— قوربان هەرسێک تەڵاقم کەوتبێ، بە حەیاتم نەفەسم لە ترياک نەداوە!

— یانی چی؟

— یانی ئەگەر ئێرانی بام وەک جەنابی سەرهەنگ ئاو بە لووتمدا دەهاتە خوار و ملم چرچ و باریک و ڕەنگ تولخ دەبووم!

حاکم دەڵێ: برۆ، تۆ عێراقیت، ناتگرم!

کابرایەکی زینوەیی ناوی حەمەی مەولود، دەچێتە دیوی ئێران چا بفرۆشێ؛ دەیگرن:

— ناوت چییە؟

— حەمەی مەولود!

بیبە ورمێ و ڕۆژێ دوو جار دارکاری بکە تا دوو مانگ.

— ڕاستی بڵێ!

— نازانم

قوڵیخان دەبەن کە: ئەوە کوشتوومانە لەبن داراندا؛ دەڵێ ئەوە نیم کە ئێوە دەڵێن. قوڵیخان کابرا دەبینێ، دەڵێ: خوا هەڵناگرێ ئەو بەدبەختەتان بۆ گرتووە؟ ئازادیان کرد و هاتەوە زینوێ. منیش وەک خەڵکی تر پێیەوە چووم.

— دەی کاکە حەمە چۆن گیرای؟

— کوڕە هەر لێگەڕێ، نازانم چ سەگبابێک ناوی وەک ناوی منە، دەڵێن زۆری پۆلیس و ئەفسەر کوشتووە. دوای دوو مانگ لێدان و تێهەڵدان بەرەڵا کرام. ئاخ ئەو سەگبابەم گیر بینایە و خوێنیم بخواردایەتەوە!

— چیم دەدەیەی پێت بڵێم؟

— هەرچی تۆ بڵێی.

— بوغچە جغارەیەک بێنە!

— ها بە قوربان!

— کاکە ئەم برایەی خۆت بوو! منم ئەو حەمەدی مەولودەی تۆیان لە باتیان گرت!

— دەک ماڵت بە سێ چەپی قوڕێ گیرێ! جا ئێستا بڵێم جی؟!

— هیچ مەڵێ، تۆزێکیش توونتم بدەیە و چایەکەش بلێ دەم کەنەوە!

لە کەرکووک شاگرد عەکاس بووم. حەمەم لێ پەیدا بوو:

— کاکە لە کەرکووک کاسبیەک دەکەم ...

ماوەیەک فیشەکی بە قاچاغ دەبردە سولەیمانی. بە هۆی مەجیدی کاکەوە کارێکم لە بیمارستانی گەورەی کەرکووک بۆ دۆزییەوە، شەوانە پاسدار بێ و بە ڕۆژ ئازاد. حقووقیش مانگێ دە دینار. زۆر زوو خۆی خۆشەویست کرد. دوکتۆر عەبدولڕەزاق (سەرۆکی بیمارستان) گوتبووی: شەهادە جنسیەت بۆ وەردەگرم تا بتوانم حقووقت بۆ زیاد کەم.

ڕۆژێک گوتی: قەرزێکم لەسەر عەبدولخالقی حاجی ئەڵڵایە - کە سابڵاغیەکی قاچاغچی بوو - قەرار بووە دەمانچەم بۆ بکرێ، پووڵەکەی خواردووە. ئێستا بە قەتار لە بەغداوە دێت. دەڵێی چی؟

— حەمەد شەڕ و هەرا ساز مەکە! تۆ بۆخۆت قاچاغی.

ڕۆیشت. هاتەوە گوتی: لە قەتار هێنامە خوار پووڵەکەم لێ ساندەوە.

جارێکی تر هات گوتی: من دەچمە ڕووسیا، تۆ نایەی؟

— نەخێر.

هەر ئەو شەوە تفەنگی دابۆوە بە بیمارستان و ڕۆیشتبوو. ئیتر لەو ساڵەوە کە هەزار و نۆسەد و پەینجا و یەک بوو، نەمزانی چی بەسەر هات. لە ساڵی شێست سەفەرەکەی بۆ گێرامەوە:

« لە کەرکووکەوە هاتمە دزەی مەرگەوەڕ، حاجی سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی گوتی: منیش پیاوێک دەنێرم خەبەرێکی سەید عەزیزی کوڕم بزانێ. کابرا سەیدێکی تووتنفرۆش بوو. بارێک تووتنی قاچاغی هێنا و ڕۆیشتین. لە ڕێ نسحەتی کردم: تۆ شکاکی نازانی لێت دڕدۆنگ دەبن؛ خۆت لاڵ و کەڕ کەی باشە. دەچووینە هەر ماڵێک ببوومە بەزمی ژنان! ئاویان پێ دەکێشام؛ دەستیان بۆ قوونم دەبرد! بەو حاڵە بە ناو جەلالیاندا گەیشتینە نیزیک سنوور. خانەخوێکەمان دەمانچەیەکی لێ ساندین کە شارەزایی سەر ئاراسمان بکا. دەگەڵ سەید خۆمان لە ناو گیشە گیادا شاردەوە کە بە ڕۆژ ئێرانی نەمانبینن. شەو کە خەبەرم بۆوە عاسمانی پڕ لە ئەستێرە، نازانم چ وەختە:

— سەید! سەید!

نەخێر خەبەر نییە. بە تەنیا هاتمە سەر چۆمی ئاراز. جلەکانم نایە نێو ڕانکەکەم، قوتووی تووتن و پەڕم دە کەناری سەرکڵاوە چەقاند. خۆم بە چۆمدا دا. لە نێرینەی چۆم ماندوو بووم، ڕفاندمی، بێهۆش بووم. بەرەبەیانێکی تاریک چاوم هەڵێنا: ڕووت، نە ڕانک نە کڵاو، لە ڕان بەرەژوورم لەسەر ڕەڵم و لاقم لە ئاو دایە. چرا دیارن. خوایە ئێرە ئێرانە یا ڕووسیایە؟ سەگبابێک جارێک فێری دوو کەلیمە ڕووسی کردبووم، ملم لێ نا:

— ئیدی سودا! (وەرە ئێرە)

لە پڕ شەش سەربازی ڕووس ڕووی تفەنگیان تێ کردم و دەستیان بەستم. دەلەرزیم، یەکیان پاڵتۆکەی خۆی بە شانم دادا. هاوارم دەکرد سیغار! سیغار! چەند نەفەسێکیان بە دەممەوە کردم. بردیانمە باکۆ، دە حەپسێکی تاریکدا خۆم دیتەوە. تاقە یەک نەفەری تێدا بوو؛ لە سووچێک کروشمەی کردبوو. سیغار! سیغار! کابرا پاکەتێکی تووتنی ماخۆرکا کە هەمووی قسڵ و زەڕنیخە، بۆ هێنام. یەک مژ کێشام. هەر ڕاست بوومەوە و ملم دە ملی کابرا نا، یەکترمان وەبەر شەقان دا! پاسەوان لە فیتەی دا، هاتن:

— خەبەر چییە؟

— هیچ قوربان گاڵتەمان دەکرد!

کابرای هاوزیندانم جوولەکە بوو؛ گوتی: بە تۆمەتی دزی لە بانک گیراوم، ئەدی تۆ؟

— جارێ نازانم...

بردیانم بەر لە هەموو شتێک بە زەڕەبینی درێژۆکە لە قووڕمەوە تەماشای ناو ڕیخۆڵەیان دەکردم کە وەرەقەم نەخواردبێ.

— چکارەی؟

نەقڵی خۆم گێڕاوە.

— دەی بۆ دەڵێی ڕووسی نازانم؟ ئەدی بۆ لەسەر چۆم بە ڕووسی دەدوای؟

— هەر ئەو دوو کەلیمەم دەزانی، ئەگەر ئەو کابرایەی فێری کردووم تووشی بم دەبێ بیکوژم!

— نەخێر تۆ جاسووسی ئینگلیسانی، شێخ عەبدوڵڵا تۆی ناردووە.

— ده ئێوه ده تەیارێکم نێن، بۆمبام بدەنێ؛ تا بچم به سەید عەبدوڵڵای دادەم!

— ئەو قسانه بۆ خۆت باشه...

جووله‌کەی هەواڵم بەو شەڕەشەقە زۆر کەیفی هاتبوو؛ هەموو ڕۆژ حەڵوایەکی به شەقامان دەکرد. ڕۆژی یەکشەممە خزم و قەومی هاتبوونه دیتنی، گوتی: هەمووتان بچن جغاره بێنن! باوەشێک جغارەم بۆ هات و بوومه شای له سەر تەخت! له باکۆ ڕا ڕاپانگوێزتم بۆ زیندانی فلان، لەوێوه بۆ فلان شار... (ڕەنگه ناوی پەنجا شاری گوتبێ که لەبیرم نەماون). له زیندانێکدا ئەفسەرانی ئەڵمانیش هەبوون؛ زۆر خۆش دەژیان. له تاو هەڵاتەوه دەهاتنه بەر تاو؛ وەرزیشیان دەکرد؛ جگەرەی باشیان هەبوو. دوای ئەوان بۆ نیوسەعات ئێمه دەچووینه حەسار، قونچکه سیغارەکانیامان هەڵدەگرتەوه، زیندانیەکی ڕووسمان دەگەڵ بوو، نەقیزەی دروست کردبوو؛ تا من دوو قونچکم هەڵدەگرتەوه، ئەو هەمووی دەچنینەوه. خاکەندازێکی ئاسنم لەسەری دا، نوقمی خوێنم کرد. لەوێش ڕاپانگوێزتم. نزیکەی دوو ساڵ لەو زیندان بۆ ئەو زیندان ڕاگوێزرام، تا ستالین مرد. باریان کردم هێنامیانه سەحرای کەرەکەڵپاغ، چەندین ملیۆن حەشامەتی تری لێ بوو که له سیبریا و هەموو زیندانەکانی شۆڕەویەوه هێنرابوون. دەتگوت حەشری نێرەکره! برسی و ڕووت و سەرگەردان به ناو ئەو هەزاره زیلەدا دەخولامەوه بەڵکوو یەکێک پارچه نانێکم بداتێ. کابرایەکی ئەرمەنی، دیار بوو پووڵی زۆره، گوتی: ئەرێ تۆ له ئاشپەزی دەزانی؟

— عەجەب کەرێکی! بەدبەخت من ئاشپەزی کوڕی شێخ مەحموود پادشای کوردستان بووم! چێشتم بۆ لێدەنا و خزمەتم دەکرد و له خێوەتەکەی دەنوستم. گۆلاوێکی لێ بوو، قاپەکانم لێدەشووشت. هەتیوێکی قوتەم لێ پەیدا بوو، به تورکی تێی ڕاخوڕیم:

— ناوت؟ کوێندەری؟ چکارەی؟

هەر تۆقیم. ببێ و نەبێ ئەوه پۆلیسی سڕییه و دەمبەنەوه زیندان.

— برا من فەقیرم، کوردم، هاتووم بەڕێم کەنەوه بۆ عێراق.

بانگی کرد:

— مارف وەره ئەوه حەمەدی مەولووده له من ترساوه!

قادری مەحموودزاده و مارفی فەرهادی[1] هەردووک سابلاغی، که سێ ساڵ پێش هاتبوون دەربارەی دروست کردنی حیزبی لاگری ڕووسان قسه بکەن؛ هەر له سنوور گرتبوونیانن و بردبوویاننه سیبریا. ئەو مابەینه به ڕۆژ داریان پێ شکاندوون و به شەو ده حەپسیان کردوون. ئەوانیشیان هێناوەته لای من. قاپ و قاچاغم هەر لەوێ به جێ هێشت و چوومه لای سابلاغیان.

ئەوانیان قبووڵ کرد بچنه باکۆ، هەوڵیان بۆ منیش دا، بردیانمه ئازەربایجان له گوندێک به ناو «کوبا» له سەد کیلۆمیتری باکۆ کرامه پاسەوانی باغاتی دەوڵەت. ئەوێم زۆر خۆش بوو. بەڵام ڕەحیم قازی ناچاری کردم بێمه باکۆیه. حقووقی پەناهەندەگی وەردەگرم؛ خانووم دراوەتێ. ئەوه تۆم لێره دیتەوه...

باشه کاکه حەمه، وەختی له بەغداوه چوویه خەلان به هەوای دزی و چەتەیی کردن چیت به چی کرد؟

---

[1] ئەو کەسه ناوی عەزیزی فەرهاد بووه نەک مارف فەرهاد، وا دیاره مامۆستا هەژار ناوەکەی لەبیر چۆتەوه بۆیه به هەڵه نووسیویەتی.

لە خەلانەوە تفەنگێکم پەیدا کرد. دەپێشدا بە تەنیا دەچوومەوە دەوری سابڵاغ. لە هەرکوێ ئەمنیەیەک، ئەفسەرێکم دەس کەوتبا دەمکوشت و کەلوپەلەکە و ئەسپ و چەکەکەم دێناوە بە دزی دەمفرۆشت. پۆلیس وەک چاوتێشە لێم دەگەڕان. ڕۆژێک خۆم کرد بە چایخانەی قازیاوادا؛ کە لەوبەری چۆم بوو. قاوەچی گوتی: نامە (دەبێ هەڵەی تایپ ڕووی دابێت و ئەم وشەیە مامەیە نەک نامە - وریا) خۆت بشارەوە! دەستەیەک ژاندارم و شارەبانی هاتن لە تۆیان دەپرسی و ڕەنگە بگەڕێنەوە. غارم دا لە بن کەندالێک، لە ناو سپینداراندا (دەبێ هەڵەی تایپی ڕووی دابێ، سپیدار دروستە نەک سپیندار - وریا) خۆم درێژ کرد. شارەبانیەکی کوردی سابڵاغی هاتە سەر کەندال، ڕاست بەسەر مندا میزت! لێی ڕاست بوومەوە:

— سەگباب دەتکوژم!

— حەمەد دەغیلە ڕاکە، ئەوە لە تۆ دەگەڕێن!

بۆ شەریکە چەتە، «بلوت» ناوم ڕەگەڵ کەوت کە ئازەربایجانی و زەمانی پیشەوەری ناوبانگی هەبوو؛ قەدەرێکیش چەتەی مستەفاخانی خوێڕیاوا بوو. ئەویش لە حەپسی کەرکووک ئازاد کرابوو. ئەوجار دەگەڵ قالە تەگەرانی و چەند چەتەیێکی تر کە ببووینە هەژدە کەس لە ئێران کەوتینە کار. جارێک برایمە سووری قاچاغچیمان ڕووت کرد کە دەیانگوت خەبەر بە دەوڵەت دەدا. دوو باری بارگین کوتاڵمان لێ ساند، هێنامانە وزندەرێ، لە دەشت دە ناو گیشە گیامان خست. سبەی هاتینەوە بارمان کرد و چووینە پشتی دەرمانی. لەوێ زانیمان کە گیا خراوەتە جێگای کوتاڵ و چەند تۆپێکمان لێ دزراوە. هاتمەوە تەشقەڵەم دە خەڵکی وزندەرێ هالاند. ئاخری بە تفەنگێکی تاپڕ دەستم لە شەڕ بەردا. ماڵمان بردە قاراوا. دایکە دزێکمان پەیدا کرد کە لە بۆکان بۆمان بفرۆشێ. ماڵی برد و نەهاتەوە. مایەباش دەرچووین!

شەوێک لە پشت تورجان لە کێوی وەستا مستەفاوە ناردمانە ماڵی حاجی بابە شێخ کە نانمان بۆ بنێرێ. بۆ هەژدە کەس نۆ نانی ناردبوو! قەرارم کرد تۆڵەی لێ بکەمەوە.

بڕیارمان دا ئاغای زەلام زەلام ڕووت کەین. چووینە سەر شەهابی بەردەزەرد، دەست و لاقمان بەست؛ بردمانە ئەشکەوتێک. «پەپوولە زێڕم دەیە بەرت دەدەم»، داوای پەنجا هەزار تمەنمان کرد. مەلا هات و پاش چەقەی زۆر پێک هاتین بە شەش هەزار ڕازی بین. پووڵمان وەرگرت و ئاغا ڕۆییشت و پتر لە چوارسەت تفەنگچی کورد و ئێرانی دەوریان داین. کردمانە شەڕ، پیاوێکمان لێکوژرا. لە تاریکایی شەودا - کە دەورمان گیرا بوو- یەک لە دوژمنەکان گوتی: وەرن لە لای منەوە دەرباز بن! ڕێگەی داین و کەلاک بە کۆڵەوە دەرچووین، ئیتر لێک بڵاو بووین. خۆم و سێ کەس هاتینە قاوەخانەی بەردان. هەژ - نۆ بارگین و ئێستر بە بارەوە بەسترابوونەوە. گوتیان جیازی بووکی حاجی بابە شێخە. دەمم هەڵبەست و بارمان برد و ڕۆییشتین. گەڕامەوە گوتم: بە حاجی بابە شێخ بڵێن حەمەی مەولوود ماڵەکەی برد؛ چونکە ئەو بۆ هەژدە کەس نۆ نانی ناردبوو! ماڵمان لە عێراق فرۆشت. نامەی حاجی بابە شێخ بۆ شێخ عەلائەدین هات. گرتیانم، ئاخر پووشکەیان لێ ساندمەوە. نەمدەزانی شێخ لە سەر یەکتری دەکەنەوە!

کاک هەژار! من لە دونیادا زۆرم تاڵ و سوێری دیوە؛ با ئەوەشت بۆ بگێڕمەوە: نازانم کام ساڵ بوو، ڕەنگە تۆ لەبیرت بێ، زۆریان سابڵاغی بە تۆمەتی قاچاغچیەتی بۆ شیراز دوور خستنەوە؛ منیش یەکێک لەوانە بووم. نە حقووق، نە بژێو، بەرهەڵدا، بڕۆ کار پەیدا کە! دەچووم لە مەیدان دەگەڵ فاعلان ڕادەوەستام، جاروبار کاری قوڕەکاریم دەست دەکەوت. لە ماڵێک فەعلە بووم؛ پیرێژنی خاوەن ماڵ گوتی وەرە ببە نۆکەرم! ئیجازەی لە شارەبانی ساند و پێناسەکەمی لای خۆی گل دایەوە؛ بوومە نۆکەر. گەسک لێدە!

کاروباری ماڵە بکە!پاشان دەگەڵ دوو منداڵان بچمە دەر بیانگێڕم. شاییەک پووڵی گیرفانی نەدەدامێ. منداڵ یەکی دوو قڕانیان ڕۆژانە دەدەنێ؛ شتێکم لەوان دەدزی بۆ جگەرە. جگە لە ماندووبوونی زۆر و بێ پووڵی و ئاتاجی، بۆڵە و جنێوی پیرێژن لە گیان وەڕەزی کردبووم. بڕیارم دا خۆم لە پۆلیس بدزمەوە و ڕاکەم. خۆ ئاشکرێ بە جادەدا بڕۆم. ڕێگەی لادێم گرتە بەر؛ نابەڵەد. بە خەیاڵ دەچمە ئیسفەهان، جارێک چوار شەو ڕۆیشتم، کۆچەری قەشقایی تێیان گەیاندم کە ڕێگەم هەڵە کردووە؛ گەڕامەوە. بە شەو دەڕۆیشتم، بە ڕۆژ خۆم دەشاردەوە کە ئەمنیە نەمبینن. لە دێهات سواڵی نانم دەکرد. بەیانییەک لەبن بەردێک نوستبووم؛ ئەمنیەک بە سواری تێی ڕاخوڕیم:

— تۆ چیت؟!

— ئاغا گیان دەگەڵ کابرایەک لە ئیسفەهان پێکەوە کرێکار و شەریک بووین، پووڵەکەی منی دزیوە؛ لەو دەگەڕێم!

— درۆ دەکەی!تۆ ڕەنگە لە هەڵاتووەکانی شیراز بی؛ بەڵام هێندە ڕووت و کەسیفی ناتگرم!

— ئاغا گیان خێرێکم پێ بکە!

— مردووت مرێ کێ بیستوویەتی سواڵ لە ئەمنییە بکرێ؟!

قڕانێکی دامێ، جلەکانم هەمووی بە دڕووانەوە چووبوون. وا شڕوشڕۆڵ ببووم هەموو لەشم بە دەرەوە بوو. ئەمجار نەمدەوێرا بچمە سواڵی نانیش. منداڵەورکە بەردیان تێدەگرتم و بە «شێتە شێتە» شوێنم دەکەوتن. ئێوارەیەک لەلای هەمەدان گەیمە قاوەخانەی سەر ڕێگا. کابرا خەریک بوو دایخا. هەرام لێ کرد: دایمەخە! درگای بۆ کردمەوە. گوتم: چای دەم کە! پتر لە دە چام خواردەوە. نان و هێلکە بێنە، زوو بە! نانم خوارد. کابرا گوتی: من دەچمەوە دێ، تۆ شەو لێرە بخەوە و دەرکە داخە.

— ناترسی دزیت لێ بکەم؟

— نەخێر ناترسم.

— بەیانی لەبیرت نەچێ قەیماغ بێنی، نانی تازەش خەراپ نییە!

— بەڵێ بە چاوان!

بەیانی کابرا بە باوەشێک نان و قەیماغ و پەنیرەوە هاتەوە. تێر لەوەڕام و پتر لە دە چای شیرنم خواردەوە. ڕووم تێکرد:

— مەشەدی دەزانی چییە؟

— بەڵێ دەزانم، یەک شاییت پێ نییە و حوکم دەکەی بێنە بخۆم!

دە بوغچەیەکدا دوو نردوو نان و دوو سەلکە پەنیری بۆ پێچامەوە، دوو قڕانیشی دامێ کە لە ڕێگە بە چای بدەم. هێندێکیش قەند و چای وشکی دامێ.

گەیبوومە ناو کوردان. ئێوارەیەک لە قەراغ دێیەکەوە لامدا؛ لە ماڵێک داوای کەتریم کرد. ژنەکەی کەتری دامێ و لەسەر کوچکاورم دانابوو بکوڵێ. مێردەکەی هاتەوە؛ شەقێکی لە کەتری هەڵدا و بە پاڵەپەستۆ دەری کردم.

سەرت نەیەشێنم! چل و پێنج شەو و ڕۆژ بە ڕووتی و سواڵکەرینەو ڕێگایەم پێوا. چوومە گوندی دەرمان. گوتیان «میرزا قادر» کوڕی حاجی ساڵحی موشیری - ئەو هەرە پووڵدارە هەرە خەسیسە بەناوبانگەکەی سابڵاغ کە ئەو گوندەشی هەبوو- لێرەیە. هەر دوور لە دەرگای حەسارەوە دیتمی تمەنێکی بۆ ناردم؛ گوتی:

برۆ لیرە مەمێنەوە! لە عومرمدا هەر ئەو جارە فرمێسکم بە چاودا هاتووە... تەمەنم بۆ فڕێ دا و دەرکەوتم. هاتمە گوندی زگدڕاو کە ئاغاکەی میرزا کەریمی شاتری بوو. ئەویش وەک میرزا قادری سابڵاغی و دەیناسیم. مەیدان ئەسپێک منداڵی دێ بە قۆچەقانییەوە بە پیرمەوە هاتن: «شێتە شێتە» ڕاویان نام. لەتاوان خۆم بە ئاودەستخانەی مزگەوتا کرد. بەختی من کوێخا لە ئاودەست بوو، منداڵی لێ دەرکردم. چوومە باغ کە گوتیان ئاغا بە ماڵەوە لەوێیە. هەر کە دیتیانم مات مان. حوسنی خانمی ژنی ئاغا بانگی کرد:

— سەرت دەقوڕێ نێی! خۆ ئەوە گەڵوگونت هەموو بە دەرەوەیە، بچۆ پشت دارێک!

جاجمێکیان بۆ هێنام دە خۆمەوە پیچا. هەر دەسبەجێ مەنجەڵێ پڵاوی هێنا. بە یەک هەڵپە خواردم. زۆر زوو یەکی تری لە پێش دانام؛ ئەوسا تێرم خوارد. خانم ناردی دەستێ جلکی تازەیان بۆ هێنام. ئاویان گەرم کرد؛ خۆم شۆشت. بە ڕاستی حوسنی خانم لە هەموو پیاوان پیاوتر دەرچوو...

دە ڕۆژ وای بەخێو کردم، تەواو بووژامەوە. کە گوتم دەچمەوە سابڵاغ، جلکی ژن و منداڵەکانم و چل تمەنی پووڵ دامێ. لە سابڵاغ هەموو ڕۆژ پۆلیس لە منی پرسیبوو؛ کە هەڵاتووە دەبێبگیرێت. هەر ئەو شەوە بوومەوە چۆلنشین[1] و یاریدەی قاچاغچیانم دەدا و جار-جاریش دزیم بە بەرەوە دەکرد. لەو ڕێگەیە فێری گەداییش ببووم. ئەگەر لە گوندێک دەمزانی دزیم بۆ ناکرێ، سواڵم دەکرد. دەربەدەر مام تا ڕەزاخان تێک چوو. هاتمەوە و بوومە خزمەتکاری کوردایەتی و دەگەڵ تۆدا بوومە ئاشنا. هێشتا کۆمەڵەی «ژێ-کاف» دانەمەزرابوو، ڕۆژێک چوومە زگدڕاو. بەسەر تەقەدا کەوتم. ئاغایانی دەوروبەر هاتبوون زگدڕاو تاڵان کەن. تفەنگێکم وەرگرت و بەربوومە گیانی دوژمنان. هەڵمقەندن و کەوتمە دوویان. یەکیان هەرای کرد: ئەو سەگبابەتان نەدیوە دەڵێی بەرگری لە ماڵی بابی دەکا!

با ئەوەش لە حەمەد بگێڕمەوە:

لە کەرکووک چووبوە چاخانەیەک، گوتبووی کەباب دەخۆم. ناردبوویان کەبابیان بۆ هێنابوو. کە هەستابوو بە خاوەن چاخانەکەی گوتبوو:

— کاکە دەست خۆش!

— یانی چی؟

— لە وڵاتی مە، پیاو ئەگەر پووڵی نەبوو دەڵێ دەس خۆش!

— جوابەکەی چییە؟

— سەر خۆش؟

— بەو شەرتە سەرخۆش، هەموو ڕۆژ بێیەوە لام «دەس خۆش، سەرخۆش» بکەین!

ڕۆژێک لە چاخانە دانیشتووە، پۆلیسێک دێتە بەردەمی:

— مام قادر دونیات لێ گەڕام، ئەم ئیحزارە ئیمزا کە.

— برۆ من قادر نیم!

---

[1] چۆلگەرد، چۆلنشین، هۆبەنشین، هۆبەیی، هەوارچی، تاوڵچی، چادرنشین.

– به خوا دەتناسم، مام قادری و دەبێ ئیمزای کەی!

– کوڕە هەرسێک تەڵاقم کەوێ من حەمەدی مەولوودە چرچەم، بە تۆمەتی قەتڵی پۆلیس و ئەفسەری ئێران لە عێراق و ئێران لێم دەگەڕێن بمگرن!

کابرای چاخانەدار ڕاست پیلی پۆلیس دەگرێ:

– کاکە ئەوە برای منە، تازە لە شێتخانەمان هێناوەتەوە، تا نەیکوشتووی ڕاکە!

زۆر لۆمەی حەمەش دەکا کە ئەو سەرگەرمییە بە هیلاکت دەبا...]

**(کۆتایی بیرەوەرییەکانی مامۆستا هەژار سەبارەت بە کاپیتان حەمەدی مەولوودی)**



مامۆستای مەزنی کورد، عەبدولڕەحمان شەڕەفکەندی، (هەژار)

## «چێشتی مجێور» و سووکە ئاوڕێک!

لە دێڕەکانی دادێ، هەوڵم داوە شرۆڤەیەک لەسەر هەندێک دێڕ و دەستەواژە کە مامۆستای نەمر، هەژاری موکریانی لە چێشتی مجێوردا بەکاری هێناون بنووسم کە مەبەست لێی نە داکۆکی کردنە لە کاپیتان حەمەد و نە بەرپرچدانەوەی قسەی مامۆستا هەژارە. ساخکەرەوە و کۆکەرەوەی ئەم کتێبە لە درێژەی خوێندنەوە، لێکۆڵینەوە و بەدواداچووندا، هەندێک خاڵی هاتنە بەرچاو کە بە دروستی دەزانێ لێرە باسیان لەسەر بکات و بەستێنێکی بێلایەنانە ساز بکات کە تێیدا خوێنەر خۆی بڕیار بدات.

ڕەنگە لە زۆر وێستگەی ژیانیی کاپیتاندا، زۆر شت ڕوویاندابێ کە نووسەری ئەو دێڕانە لێی بێخەبەر بوویێت و مامۆستا هەژار و زۆر کەسی تر لێی ئاگادر بووبن. ئەو خاڵەش دەبێ لەبەرچاو بگرین کە کاتێک ڕووداوەکان کۆن بوون و تۆزیی زەمەن لەسەریان نیشت، مرۆڤ ناتوانێ بە دڵنیاییەوە لەسەر ڕووداوەکان بدوێ، مەگین بەڵگەی پشتنەستوور و قەباڵەی دەنگدلێر دەبن هەنگڵتدا بێ، دەنا هەرچی بگوترێ تەنیا لە خانەی (وتی‌وتی) دا خۆی دەبینێتەوە و چ نرخی زانستی و مێژوویی نابێت، بۆیە هەوڵم داوە لە درێژەی باسەکەدا پشت ببەستم بە هەندێک بەڵگە و سەرچاوە تا بتوانم بەرچاوڕوونییەک ساز بکەم کە خوێنەر لە دەلاقەیەکی ترەوە بڕوانێتە مژارەکە.



لە ڕاستەوە خوالێخۆشبووان کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچی و مامۆستا هەژار موکریانی - باکۆ - ١٩٥٩ز

مامۆستا هەژار و کاک حەمەد سەرەڕای مەودای زۆری تەمەنیان، بەیەکەوە دۆست و ناسیاو بوون و سابڵاغی‌ئاسا، جەفەنگباز و قسەخۆش. نەمر مامۆستا هەژار لە چێشتی مجێوردا دەفەرموێ: [**حەمەدی مەولوودە چرچ (کە کۆنە هەواڵی زەمانی کۆمەڵەم بوو).**] هەر خودا دەزانێ ئەو دوو کۆنە هەواڵە کاتێک گەیونە کن یەکتر، چۆنیان کات بە گاڵتە و قسەی نەستەق و بیرەوری تاڵ و

سوێر تێپەڕاندووە! هەم مامۆستا هەژار لە ژیانی ئاساییدا بە کەسێکی جەفەنگباز و قسە خۆش ناسراوە و هەم کاپیتان بە کەسێکی هاوشێوە. ئاساییە کە دوو هاوڕێ کە ڕۆژگارێکی خۆش و ناخۆشیان بە یەکەوە ڕابواردووە و لە گەرمی و ساردی ڕۆژگار یەکتریان بینیوە، کاتێک لەسەر یەکتر قسە بکەن یا بنووسن، جەفەنگ و پێکەنین لە لێویان هەڵرژێ و تەعاروف و شەرم وەلا نێن. ئیتر ئەو جەفەنگانە لە کتێبێکدا وەک چێشتی مجێور کە بنووسرێن یا نەنووسرێن، ئەوە خاڵێکی ترە و زانایانی خامە بەدەست دەبێ ڕای لەسەر بدەن.

مامۆستا هەژار کاتێک کە دەچێ بۆ ڕووسیە و لە باکۆ چاوی بە کاپیتان حەمەد دەکەوێ، چەند شەوان بەیەکەوە ڕۆژ دەکەنەوە. لە لاپەڕەی ٣٣٠ چێشتی مجێوردا ئاماژەی بە سەفەرەکەی باکۆ داوە و ئاوای باس دەکات:

**[... کە خەڵک بڵاوەیان دەکرد، تازە حەمەدی مەولوود سەرپیکی قسانی فت دەکرد و قەت نەیدەهێشت تا وڵات ڕووناک دەبوو چۆرتێک بدەم. قسەی ڕابردووی خۆی بۆ دەکردم؛ دەشیگوت: «نەوەک بمرم، تۆ لەبیرت نەچێ، بینووسە...». وا بیست و چوار ساڵ لەو دەمە ڕابردووە؛ حەمە مردووە؛ منیش زۆرم سەرگوروشتەی ئەو لەبیر نەماوە. بەڵام هەرچۆنێک بێ سەرچڵ بۆت دەگێڕمەوە...]**

وا دەردەکەوێ کە کاپیتان زۆر بەسەرهاتی خۆی بۆ مامۆستا هەژار گێڕاوەتەوە کە ڕەنگە مامۆستا هەژار هیچ گرینگی پێ نەدابێ، بۆیە وەک بۆخۆیان دەڵێن کەمێکی لەبیر ماوە و ئەوانیشی لە چێشتی مجێوردا نووسیوە، جگە لە دوو ڕووداو نەبێ، باقی تر کاپیتان بە وەردەڕیشاڵەوە لەم کتێبەی بەردەستتاندا نووسیویەتی کە دوور و نیزیک جیاوازییان هەیە دەگەڵ یەکتر کە هیوادارم خوێنەرانی هێژا پێکیان بگرن و جیاوازییەکانیان ببینن.

دیارە مامۆستا هەژار بە شێوەگێڕانەوەی خۆی، وەستایانە نووسیویەتی و ویستوویەتی کە بزە بخاتە سەر لێوی خوێنەر و وەک کۆمێدیاییەک دەیڕازێنێتەوە. لە زۆر شوێنان کە نەقڵەکەی لەبیر چۆتەوە یا نەیویستووە ناوێک لە هەڵسووڕاوە سەرەکییەکە بێنێ (جا بە هەر هۆیەک بێ)، بۆخۆی داستانەکەی ڕێکوپێک کردووە و هەڵسووڕاوی بۆ دۆزیوەتەوە. بۆ نموونە دوکتۆر ئاسۆ (قادر مەحموودزادە) کە بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە باکۆ بووە، لە نیزیکەوە دەگەڵ کاپیتان ژیاوە و ڕەنگە بەهەڵەدا نەچووبم کە بڵێم، دوکتۆر ئاسۆ، کاپیتان حەمەدی لە کەس‌وکاری کاپیتان باشتر ناسیوە و نیزیکترین کەس بووە لێی، بۆیە لە کتێبەکەی بەڕێزیان زۆر زانیاری بەنرخ سەبارەت بە کاک حەمەد دەست دەکەوێ. دوکتۆر ئاسۆ لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نەقڵێک دەگێڕێتەوە و ئاوا دەڵێ:

**[... کاک حەمەد لە باکۆیە دەگەڵ ڕەحیم ئاغای قازی بەردەوام شەڕ و کێشەی هەبوو. دەگەڵ یەکتر نەدەسازان. کاتێک هەستی بەوە دەکرد کە ڕەحیم ئاغا لە ماڵ نییە، دەچوو بۆ ماڵیان و**

**هەرچی دڵی ویستبای هەڵیدەگرت و دەیبرد وەک ڕادیۆ، تیلیڤیزیۆن و هتد. ژنەکەی ڕەحیم ئاغاش دەستی وەبەر نەدەهێنا و هیچی پێنەدەگوت. تەنانەت ڕەحیم ئاغاش قەت هیچی پێنەدەگوت و خۆیشی لێ تووڕە نەدەکرد. بە پێچەوانەوە دەیگوت کە چ ناکرێ دەگەڵ کاک حەمەدی، ئەو سەرپشکە و ئیختیاری ماڵی منی هەیە...]** کەچی، مامۆستا هەژار هەمان نەقڵ کە ناوەکانی گۆڕیون و بە ڕاوێژی خۆیان ڕازاندوویەتەوە و بەراستیش بزە دەخاتە سەر لێوان، ئاوا دەیگێڕێتەوە:

**[... دزی بە ئاشکرای دەکرد. جارێک دەچێتە ژوور لە ماڵە جوولەکەیەک. جوولەکە دەگەڵ ژنەکەی نوستوون. حەمەد دەستەنوێنێک هەڵدەگرێ، پانەوپان لە دەرکەوە ناچێ، جوولەکە بانگ دەکا: کاکە هەمەد گیان، تیلاوتیل! ئاوا بۆت دە دەرکەوە ناچی!...]**

پیاو نازانێ کە ئەو نەقڵەی مامۆستا هەژار، پێشتر لە کوردستان و لە هەڕەتی لاوێتی و بێدەرەتانی کاپیتان ڕوویداوە یا نا؟ بەڵام **دوور نییە** ئەو نەقڵە هەمان نەقڵەکەی دوکتۆر ئاسۆ بووبێت و لە باکۆ ڕووی دابێ و هەم دوکتۆر ڕەحیمی قازی و هەم دوکتۆر ئاسۆ و هەم باقی کوردەکانی دانیشتووی باکۆ بۆ مامۆستا هەژاریان گێڕابێتەوە، کەچی مامۆستا هەژار ناوەرۆک، ڕووکار و ڕەهێڵەی نەقڵەکەی ئاوا گۆڕیوە، کە دووریش نییە ئەسڵی ڕووداوەکەی لەبیر چووبێتەوە یان نەیویستبێ ناوی هەڵسووڕاوەکە بەرێ و لە جیاتی دوکتۆر «ڕەحیمی قازی»، کردوویە بە «کابرای جوولەکە». گەر کتێبی «چێشتی مجێور» بخوێنینەوە دەزانن کە مامۆستا هەژار ئەو کەسانەی کە سەردەمی خۆی ڕەخنەگری زیندوویاد مەلا مستەفا بارزانی بوون، نەکەوتوونە بەر دڵی نەمر مامۆستا هەژارەوە و بە چەشنێک نوقوورچی نووکی تیژیی خامەی تێکوتاون. وەک لە لاپەڕەکانی پێشووتر و لە بەشی **(سووتانم لە نێوانم شەڕی مەلا مستەفا و ڕەحیمی قازی دا)** خوێندمانەوە؛ کاک حەمەد سەرباقی ئەوەی ئەوپەڕی ڕێز و دڵسۆزی بۆ نەمر مەلا مستەفا پێشان داوە و تەنانەت دوو لە وێنەکانی ئەو خوالێخۆشبووەی لە ئاڵبۆمی وێنەکانیدا بە یادگار هەر ڕاگرتووە، بەڵام ڕەخنەی جیددیشی لێگرتووە. ئاخۆ بڵێی مامۆستا هەژار ئەو ڕەخنانەی لە کاک حەمەد بیستبێت و بە دڵی نەبووبێ؟ یا ئەو دڵدەوڵەمەندی و مێرخاسییەی کابرای جوولەکە کە دەگەڵ کاک حەمەدی کردووە و دەستی وەبەر نەهێناوە، نەیویستووە بە ناوی خوالێخۆشبوو ڕەحیم قازی دەرچێ، لەبەر ئەو نێواناخۆشییەی کە کاک ڕەحیم دەگەڵ مەلا مستەفا بارزانیدا هەیبووە؟ یا هەر هۆکارێکی تر!؟

لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە نموونەیەکی تر لە کتێبەکەی دوکتۆر ئاسۆ بخەمە ڕوو تا کەسایەتی کاپیتان و پێوەندییان دەگەڵ دوکتۆر ڕەحیم قازی بۆ ئێوە خوێنەرانی هێژا باشتر وێنا بکرێ کە



فرۆکەخانەی باکۆ - ئازەربایجان ساڵی ١٩٥٩ز کاتی پێشوازیکردن لە مامۆستای مەزنی کورد مامۆستا هەژار موکریانی.
لە ڕاستەوە: دوکتور عەلی گەلاوێژ، دوکتور ڕەحیم سەیفی قازی، کاک حەمەدی مەولودە چرچی، مامۆستا هەژار موکریانی، ئەو کەسەی کە گوڵەکە دەدات بە مامۆستا هەژار بەڕێز دوکتور ئاسۆیە و ئەو کەسەی کە سەری لە نێوان مامۆستا هەژار و دەکتور ئاسۆ دیارە، نەناسراوەتەوە.

کاپیتان تەنیا ویستوویەتی خوالێخۆشبوو ڕەحیم قازی ئەزیەت بکات، دەنا خۆی لە ئازەربایجان دوو ماڵی هەبووە و لە هیچ پەکی نەکەوتووە. لە لاپەڕەی ٤٧٩ ئەو نەقڵە دەگێڕێتەوە:

**[...ڕۆژێکی کاک حەمەد هاتە ماڵمان و لەبەر دەرگای ماڵمانەوە بە پێکەنین و خۆشحاڵییەوە بە ڕەعنا خانمی هاوسەرمی گوت: مزگێنیم دەیە، ڕەحیم ئاغا بەردی گورچیلەی هەیە و لە نەخۆشخانە کەوتووە. دەزانی ئەو بەردە چییە؟ ئەوە هەمان ئەو زەردەچێوەیەی کە لە ئێرانەوە بۆیان ناردبووم و ڕەحیم ئاغا لێی خواردم و نەیدامەوە. ئێستا لێی بووەتە بەردی گورچیلە. بەو قسەیە دەیویست پێمان بڵێ کە هەرکەس زوڵمی لێبکات، خودا ئاوای بەسەر دێنێ...]**

بەڵێ، کەسایەتی کاپیتان وا بووە، زانیوێتی کە نازی لەلای دۆستەکانی کڕیاری هەیە، زانیوێتی گەر ماڵی ڕەحیم ئاغا گشتی لەکۆڵ بنێ دەستی وەبەر ناهێنێ. ویستوویەتی بەو کارانە هەم ڕەحیم ئاغا ئەزیەت بکات و تۆڵەی لێ بکاتەوە (لەبەر ئەوەی پێیوابووە ڕەحیم ئاغا زەردەچێوەکەی لێخواردووە یا دەستنووسەکانی بردووە و نەیداوەتەوە یان ...) و هەم بیانوویەک بۆ جەفەنگ و پێکەنین بخولقێنێ دەنا، لە وڵاتێکی کۆمۆنیستی و تا سەر ئێسقان بە کاری (ئیتیلاعاتی و ئیستیخباراتی) تەنیو! بە ڕۆژی ڕووناک! بچی بۆ ماڵی خەڵک! دزییان لێ بکەی و خاوەن ماڵ بتبینێ

و هیچت پێنەڵێ! نە بووە و نە کراوە! ئەو دزە غەوارەیەش ئێستا لە دایک نەبووە کە بتوانێ لەو دۆخە ئاستەمەدا دزی بەو چەشنە بکات. ئەویش لە حالێکدا کە ڕەحیم ئاغا ئەندامی سەرکردایەتی فیرقە بووە، دەستی درێژ و لەناو دەستەڵاتی ئازەربایجاندا خاوەن پلە و پایە و دۆست و ناسیاو بووە.

یان لە ڕووداوی شەڕی بەناوبانگی گوندی «مەکڵاوێ» کە هەم مامە غەنی بلوریان و هەم ڕەئیس بەکر حەوێزی کە فەرماندەی ئەو جەبهەی سەردەشت بووە بە وردی باسیان کردووە، کاپیتانیش لەم کتێبەی بەردەستتاندا بە چڕی باسی هەموو ڕووداوەکەی گێڕاوەتەوە و وەک بینیوتانە زۆر بێ پەردە و بێباکانە لەسەر وردەکارییەکان دواوە بەڵام کاتێک گێڕانەوەی کاپیتان و مامۆستا هەژار پێک دەگرین، جیاوازییەکی زەق خۆ دەنوێنێ. دەتوانین بە ئاشکرا بڵێین کە ئەو شێوە گێڕانەوەیە و ئەو جیاوازییانە لە ئاخەفتنی هەردوو خوالێخۆشبوو بە ڕوونی دێتە بەرچاو.

بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی باسەکە ئاماژە بە کتێبی (**سادات نقشبندی و جنبشهای ملی کرد در گذر تاریخ**) دەکەم کە لە لاپەڕەکانی پێشوودا خوێندتانەوە. بە دڵنیاییەوە باسەکەی (**حەمەدی مەولوودە مەنگوڕ**)ـتان چاو پێکەوتووە. ئەو کتێبە لە زمانی کوڕی حەزرەتی شێخ عەلائەددینەوە نووسراوەتەوە کە هەردووک کاک حەمەدەکانی لە نیزیکەوە ناسیوە و ڕووداوەکەی لە نیزیکەوە بینیوە. هەمان نەقڵ خودی کاپیتان حەمەدیش بە وردی ئاماژەی پێداوە و بە دڵنیاییەوە چاوتان پێیکەوتووە. وەک دەبینن موویان لەبەینەوە ناچێ، ئەوەندە وێکدەچن و لێکنیزیکن. بەڵام هەمان نەقڵی (حەمەدە مەنگوڕ)ی لە ڕاوێژەکەی مامۆستا هەژاردا هەیە کە زەوی تا ئاسمان جیاوازن و مامۆستا هەژار بە کەیفی خۆی وەرگەڕاوەتە ڕووداوەکە و ترش و خوێی کردووە تا بزە بخاتە سەر لێوی خوێنەر.

وەک دەیبینن ژیانی کاپیتان حەمەد پڕ بووە لە نەهامەتی. ڕۆژ نەبووە کە دەگەڵ مەرگ، برسێتی، بێبەرگی، ئەشکەنجە، زیندان، ئاوارەبوون و شاربەدەر کردن دەستەملان نەبووبێ. وەک خۆی باسی دەکات (لە تەمەنی منداڵیدا) هەموو دزییەکی کردووە تا لەتەنانێکی گیر بکەوێ و لە برسان نەمرێ و پەسیوێک بدۆزێتەوە تا ڕێژنەی بارانی بەهاری تەڕی نەکات، بەفری زستانی بەسەریدا نەبارێ، گەرمای هاوین شەکەتی نەکات و تەزووی پاییزی سڕی نەکات. ڕوون نییە ئێمە لەو سەردەمیدا بووباین و لەو بارودۆخەیدا کە کاپیتان تێیدا بووە ژیا باین، چۆن دەبووین؟ ئاخۆ چ کەسایەتییەکمان لێ دەردەچوو؟ مامۆستا هەژار لە چێشتی مجێوردا بەدەیان و بەسەتان ڕووداوی ورووژاندووە و لەسەر سەدان کەسیش دواوە. وەک بەڕێزیان لە پێشەکی کتێبەکەیاندا باسی لێوەدەکات و دەفەرموێ:

**[...گێڕانەوەی بەسەرهاتم لە ژیاندا، قسەی بەر ئاگردانە و چیرۆکێکە بۆ لاوێکی دەگێڕمەوە. ئیتر نامەوێ بڵێن ئەدەبی نییە و عیلمی نییە. پێی ناوێ فلانی بڵێ بۆ لەو جێگەی وای نەگوتووە؟**

**بۆ فلانە وشەی عارەبی یان فارسی دەکار هێناوە؟ ئەگەر ڕاستت دەوێ بە زمانێک نووسراوە کە لە مەجلیسان قسەی پێدەکەم و هیچ خۆم پێوە ماندوو نەکردووە کە ئاسەوارێکی ئەدەبی بێت. ئەو کاری کە بۆ شەڕەفنامەم کردووە و خۆم دەگەڵ ماندوو کردووە و بیر و مێشکم هەڵکوشیون، لێرەدا باسیان نییە...]**

هەر بە پێی قسەکانی مامۆستا هەژار، مرۆڤ دەتوانێ خۆی ڕازی بکات کە بۆ لەو کتێبەیدا نەچۆتە ناو ناخی باسەکان؟ بۆ ڕۆنەچۆتە ناو کاکڵی ڕووداوەکان؟ دەنا، ئەو مامۆستا مەزنەی کوردان و (بەتایبەت ئی من) گەر ویستبای ڕووداوێکی مێژوویی، هەمەلایەنە شی کاتەوە، هەڵیوەشێنێتەوە و لەبەریەکی نێتەوە، بە دەیان کتێبی وەک چێشتی مجێوری ڕەش دەکردەوە. نەمر مامۆستا هەژار سەبارت بە کاپیتان حەمەد دەفەرموێ کە:

**[...جارێ با بزانین حەمەم لە کەیەوە ناسیوە: حەمەی مەولوود، پیاوێکی نەخوێندەوار، دز، زۆر سەرشێت و شەڕفرۆش بوو. سابلاغی وەزاڵە هێنابوو...]**

کاپیتان خۆیشی هیچ حاشای لێ نەکردووە و لەم بیرەوەرییانەیدا باسی کردووە. وەک لەو بیرەوەرییانەدا دیتتان کاتێک توانیوێتی کار بکات، شانی وەبەر کارکردن داوە و لە کرێکاری ڕا، تا بەردەستی وەستای. لە شاگرد قاوەچێتی ڕا تا شاگرد کەبابچێتی. لە شوانکاری ڕا تا کرێکاری لە ڕێگای هامیلتۆن. لە گۆزە فرۆشتن ڕا تا کاروانچێتی. لە قاچاخچێتی ڕا تا بازرگانی کردن لە نێوان شارەکانی ناوچەکەدا. هەر هەمووی کردووە. ئیتر دزی کردنی کاپیتان بەشێک بووە لە ژیانی منداڵێتی ئەو کە لە تەمەنی ٦ و ٧ ساڵ بۆ سەروو بووە و تا دەگاتە ١٣ و ١٤ ساڵ. کە کاتێک بەسەرهاتەکەی دەخوێنینەوە و خۆمان بە جێی ئەو دادەنێین، بە دڵنیاییەوە ئەو حەقەی پێدەدەین کە بۆ ئەوەی لە برسان نەمرێ بچێت جووتە کەوشێک لە مەحکەمەی قازی، بەڕەیەک بەسەر دیوارەوە، مەلافەیەک لە تەنافی ماڵان و ... لێکاتەوە و بیانفرۆشێ تا پارۆنانێک بخوات و پێی بژیی. دیاریش نییە کە هەرکام لە ئێمە (بە مامۆستا هەژاریشەوە)، گەر لە شوێن کاک حەمەدی منداڵ بووباین، چۆن دەردەچووین و چیمان لێدەردەهات؟

پاشان کاپیتان کە تەمەنی گەورەتر بووە و لە هێز و باهۆی خۆی ڕادیوە، بە ڕەنج و تێکۆشانی خۆی بووەتە یەک لە قاچاغچییە گەورەکانی ناوچەکە و دەگەڵ حوسێنی زێڕینگەران (فروهر)، سەعیدی حەمەقالە، برایمە سوور، عەلی ڕیحانێ و برایمی حاجی ئەڵڵا (ئیلاهی) و کێ و کێ، هەم سامانیان کۆ کردۆتەوە و هەم توانییان گەورەترین کاریگەری دابنێن لە گەشەی بیری کوردایەتی و نەتەوەیی لە مەهاباد و بونیاتنانی یەکەم حیزبی مۆدێرنی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان وەک (حیزبی ئازادیی کورستان) کە پاشان بوو بە بەردی بناغەی (کۆمەڵەی «ژێ-کاف») و (حیزبی

دیموکڕات).[1] هاوکات ببێته باوەڕپێکراوی تایبەتی پێشەوا قازی محەممەد و لە ژێر ئەمری بەڕێزیاندا ئامادە بووە گیان دابنێ و مەترسیدارترین جەولەکانی پێ بسپێرێ، وەک قارەمانی کوردستان میداڵی پێ ببەخشی، بچێ لە تاران بکوژرێت، یان هەر بە پێی ئەمری پێشەوا دەکرێتە پارێزەری بازاڕی مەهاباد لە بەرانبەر هێرشی عەشایردا و مڵک و ماڵی خەڵکی مەهەباد بە ئەو دەسپێردرێ و لە ئاکامدا دەبێتە سەرۆکی ئیدارەی پۆلیسی مەهاباد و ئاسایشی ئەوشارەی لە ئەستۆ دەبێ. جیا لەوەی کە کاپیتان ببوو بە یەک لە دەوڵەمەندەکانی شاری سابلاغ و مڵک و زەوییەکی زۆری لەپاش بەجێما. هەرچەند دەوڵەتی پاشایەتی ئێران بە خۆی داگیری کرد و لە حکومەتی مەلایاندا بەشێکی کەمی دەستی منداڵەکانی کەوتەوە کە هەنووکەش منداڵ و نەوەکانی لەبەر ئەو مڵک و ماڵە حەساونەوە.



لە ڕاستەوە خوالێخۆشبووان کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچی و ماموستا هەژار موکریانی - باکۆ - ١٩٦٢ز

بەداخەوە ماموستا هەژار یا لە مێژووی ژیانی کاپیتان ئاگاداریی نەبووە یان نەیویستووە باسی ئەو مێژوویە پرشنگدارەی کاپیتان بکات کە کاک حەمەد دەگەڵ حوسێنی زێڕینگەران (فروهەر) و سەعیدی حەمەقالە کە هەموویان کوڕەهەژار و بێنەنوای سابلاغ بوون، بەیەکەوە قاچاغچێتییان کردووە و بەیەکیشەوە بەردی بناغەی یەکەم حیزبی مۆدێرنیان لە ئاست ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا داناوە و لەسەری تارێندراو و شاربەدەر کراون بۆ «شیراز» و شیرازەی ژیانیان پێی هەڵوەشاوە کە سەرچاوە مێژوویەکان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد و حیزبی دیموکڕات لەسەر بناغە و بنچینەی حیزبی ئازدیی کوردستان (بە کەمێک گۆڕانکارییەوە) بونیاد نرا و پاشان خەڵکانی تر هاتن و بوون بە ئەندامی کۆمەڵە. سەیر نییە! بۆ ماموستا هەژار خۆی لەو باسە نەداوە؟ چۆن دەبێ کەسایەتییەکی هەڵسوڕاوی وەک ماموستا هەژار لە سەردەمی کۆماردا، کە خامەیان سەرتۆپی کوردایەتییە، ئەو مێژوویە باس نەکات؟ مەگین بەڕێزیان ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک و حدک نەبوو؟ یا هەر زانیاری

---

[1] بڕوانە لاپەڕەی ٤٧٨ ئەم کتێبە.

لەسەر نەبووە؟ بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە مامۆستا هەژاری نەمر تەنیا نووسیویانە [لە دامەزراندنی «ژێ-کاف»دا هاتە حیزبەوە.] بێ ئەوەی باس لەو مێژوویە بکات کە باسی کرا و دەیان سەرچاوەی مێژوویی وەباڵی بۆ لە ئەستۆ دەدەن. دیارە بەو چەند دێڕەی کە لە پێشەکییەکەیان نووسیویانە مرۆڤ وا لێدەکات کە ئەو مافە بدات بە مامۆستا هەژار کە مەبەستیان شی کردنەوەی ڕووداوە مێژووییەکان نەبووە دەنا، گەر ویستبای لەسەریان بدوێ جیا لەوەی بۆخۆی لەو سەردەمدا یەک لە هەڵسووڕاوە چالاکەکان بووە، دەیتوانی کەڵک لە دەیان و سەدان سەرچاوەی بەکەڵک وەرگرێت و ڕۆح وەبەر مێژوو بێنێ، وەک چۆن ڕۆحی وەبەر وێژە، شیعر و وەرگێڕان هێناوە.

گەورە زانای کورد مامۆستا هەژار لە بەشێکی بیرەوەرییەکانیدا ئاوا باس لە چەتەبوونی کاپیتان دەکات و دەڵێ: [**...ئێوارەیەکی سەرما کە چوومەوە، حەمەد خۆی ساز کردووە دەڕوا. ڕەشادی گوتی: دەترسم دڵی لە ئێمە هێشابێ. گوتم: نا، حەمەد چەند ساڵە دزی و چەتەیی نەکردووە، فیل کەوتۆتەوە یادی هیندوستان! حەمەد گوتی: ئای ڕەحمەت لە بابت. بەخودای بۆیە دەڕۆم!...**]

لێرەدا باش دەبوو کە مامۆستا هەژار بە ڕوونی دەستەواژەی «چەتە» و «چەتەیی کردن»ـی بۆ خوێنەر ڕوون کردبایەوە و سنوورەکانی دەگەڵ یاخیبوون ڕائەنگاوتبا تا ئەو باسە نەبێتە بنێشتەخۆشکەی زاریی هەندێک نەخوێندەوار کە وەدەزانن دونیا هەر ئەوەندەیە کە ئەوڕۆ ئەوان دەیبینن و مێژوو هەر ئەوەندەیە کە لەچێشتی مجێور دایە و خۆیان ماندوو ناکەن تا بخوێننەوە و ئاستی زانیاری خۆیانی پێ بەرنە سەر و لە شرۆڤە کردنی باسەکان جیهانبینییەکی باشتریان هەبێ. کە مامۆستا هەژار ئەو شیکردنەوەیەی نەکردووە، وەک پێشتر باس کرا، گلەیی لێ ناکرێ، لەبەر ئەوەی گەر لەسەر هەر وشەیەک لێکدانەوەی زمانەوانی، مێژوویی و ئەدەبی کردبا، نە کات بەرگەی دەگرت، نە پەڕ، دەنا چاوەڕوان دەکرا کە جەردە، پیاوکوژ و ڕێگر کە بۆ ڕووتکردنی خەڵکی ئاسایی ڕوویان دەو کارە دەکرد، دەگەڵ ئەو کەسانەی کە بۆ نیشتمان و لە دژی داگیرکەر و زۆرداران گورزیان دەوەشاند، جوێی کردبایەوە.

بەپێی پرسیارێکی مامۆستا هەژار و وەڵامەکەی کاپیتان حەمەد کە لە (چێشتی مجێور)ـدا هاتووە، بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێ کە کاپیتان حەمەد تا چ ڕادەیەک چەتە بووە و چۆنی چەتەیی کردووە و چۆن فیلەکەی کەوتۆتەوە یادی هیندوستان؟ کاتێک مامۆستا هەژار پرسیاری لێدەکات کە:

**باشە کاکە حەمە، وەختی لە بەغداوە چوویە خەلان بە هەوای دزی و چەتەیی کردن چیت بە چی کرد؟**

لە گشتی وەڵامەکەی کاک حەمەددا کە مامۆستا هەژار بە دەستی خۆی نووسیونی، نابینرێت کە کاک حەمەد بە ماڵی خەڵکی ئاسایی دادابێ و خەڵکی خۆی ڕووت کردبێ. بەڵکوو دەڵێ کە **بەسەر ئەمنیە، ئەفسەر، پۆلیس، ژاندارم، سیخوڕی دەوڵەت و ئەو ئاغایانەی لەناو حکومەتدا**

**دەستیان درێژ بووە، داداوە.** ڕێک هەمان کار کە **پێشمەرگە و تێکۆشەرانی گەل و نیشتمان** دەیکەن. ئەوکارەی کە پێی دەگوترێ **شۆڕش و خەبات.** بە پێی ئەو وتووێژەی کە ساخکەرەوەی ئەم کتێبە دەگەڵ بەڕێز کاک عەلی قازی کوڕی هەرگیز نەمر «پێشەوا قازی محەممەد» کردوویەتی،[1] کاک حەمەد هۆکاری هاتنەوەی بۆ ناوچەکە، هەڵگیرسانەوەی شۆڕش بوو، هەروەک کاپیتان بە ڕوونی لە بیرەوەرییەکانیدا باسیان دەکات.

دیسان هەر بە پێی قسەکانی مامۆستا هەژار لە چێشتی مجێوردا، مرۆڤ پرسیارێکی زەق و گەورەی لا دروست دەبێ! مامۆستا دەفەرموێ کە: **(وەزارەتی دەرەوەی ئێران بە فەرمی داوای لە دەوڵەتی عێراق کردووە کە بە هۆی ئەوەی حەمەدی مەولودی پۆلیس و ژاندارمی ئێمەی زۆر کوشتووە و وا و وا گورزی لە دەوڵەتی شاهەنشاهی وەشاندووە، بۆیە دەبێ بیگرن و بیدەنەوە بە ئێران).** ئەو تاوانانە چی بەسەر دزێتی و چەتەییەوە داوە؟ گەر کاک حەمەد دز و چەتە بووە ئەدی بۆ لە نێوان دوو دەوڵەتی ئێران و عێراقدادا جێی نەبووە تێیدا بسرەوێ و تەنیا داوای ئەو کراوەتەوە و سەرهەنگ و لێپرساوی تایبەتیان بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ناردۆتە عێراق، بەڵام داوای زۆر لەو کەسانەی کە چالاکی وا ناوداری زەمانی کۆمار بوون و پلە و پایەیان لەناو کۆماردا چوار هێندەی کاپیتان بووە، نەکراوەتەوە، بە مامۆستا هەژاریشەوە؟

ئەو بەڵگەیەی دەیبینن بەڵگەیەکی فەرمی و نهێنی دەزگا ئاسایشییەکانی دەوڵەتی ئێرانە، کە لە سنە ڕا بۆ وەزارەتی ناوخۆ و ڕووکنی ٢ کە پاشان بوو بە ساواک نووسراوە و باسی کاپیتانی دەکات. با بە یەکەوە بیخوێنینەوە و بزانین دوژمن چۆن کاپیتان دەناسێنێ؟ بە چ ناوێک پێناسەی دەکات؟ دز، چەتە یا پێشمەرگە و قارەمان؟

[وەزارەتی ناوخۆ - سەرۆکی گشتیی شارەبانی ئێران – ژمارە ١١١٥١-٧١٢٦-١، ڕێکەوتی ١٣-٨-١٣٢٥ **(نهێنی)**

بۆ وەزارەتی ناوخۆ

ئیدارەی پۆلیسی شاری سنە

بە ژمارەی (٧٤٢) – ٢٥-٧-٣٠

---

[1] بڕوانە لاپەڕەی ٤٠٨



وزارت کشور

شهربانی کل کشور

باستحضار میرساند: شهربانی سنندج

گزارش میدهد محمد مولود نام مهابادی که سابقاً قاچاقچی بوده و

از سال ۱۳۲۰ با عده از قاچاقچیهای دیگر باصفهان

تبعید شده بودند اخیراً بنمایندگی حزب جوانان مهاباد

اطراف سقز و جوانان ۱۵ الی ۳۰ ساله را

بحزب مزبور ... و نشان قرمزی از پارچه بسینه

آنان ... و از هر یک ماهیانه مبلغی ... بمهاباد میفرستد

از طرف رئیس شهربانی کل کشور

پێتان ڕادەگەیێنێ کە کەسێک بە ناوی **محەممەدی مەولود** خەڵکی مەهاباد کە پێشتر **قاچاغچی** بووە، وەک دەڵێن لە ساڵی ١٣٢٠ دەگەڵ کەسانێکی تر لە **قاچاغچییەکان** بۆ شاری ئیسفەهان[1] دوورخراوەتەوە، ماوەیەکە بە **نوێنەری حیزبی جەوانان مەهاباد** هەڵبژێردراوە و بە دێ و دێهاتی ناوچەی سەقزدا دەگەڕێ و ئەو لاوانەی کە دە تەمەنی ١٥ تا ٣٠ ساڵە دان ڕادەکێشێتە ناو حیزبەکەیان و ناونووسیان دەکات و هێمایەکی سوور کە لە پارچە دروست کراوە لە سینگیان دەدات و لە هەرکامیان مانگانە بڕە پارەیەک وەردەگرێت و دەینێرێتەوە بۆ مەهاباد.

لە لایەن سەرۆکی گشتیی شارەبانی ئێران - پاسیار یەکەم حیسام وەزیری - واژۆ][2]

هەروەها بەڵگەیەکی قایم و پشتەستووری دیکە لە دەوڵەتی پاشایەتی ئێران دەخەمە بەر دیدی خوێنەری هێژا کە تێیدا باس لە کەسایەتی، تاوانەکان و ڕۆڵی کاپیتان دەکات. ئەو بەڵگەیە لە ئارشیوی ڕێکخراوی ئیستیخباراتی و هەواڵگری «ساواک» بە شێوەی نهێنی هەڵگیراوە و پاش تێپەڕبوونی زیاتر لە ٥٠ ساڵ لە کتێبی (چپ در ایران، به روایت اسناد ساواک، حزب دموکرات کردستان ایران، جلد اول، لاپەڕەی ٣٣ دا) بڵاویان کردۆتەوە. ئەو بەڵگەیە ئاوا باسی کاپیتان دەکات:

[1] ئەو شارە ئیسفەهان نەبووە و شیراز بووە.

[2] ئەو بەڵگەیە لە کتێبی اسناد احزاب سیاسی ایران – (١٣٢٠ – ١٣٣٠) – بە کوشش بهروز طیرانی – انتشارات اسناد ملی ایران – ١٣٧٦ – لاپەڕەی٣٧٧ بڵاو کراوەتەوە و هەروەها لە ناوەندی ئارشیوی (اسناد ملی ایران) هەیە.

[ ڕێکەوت: ١٩-٩- ٣٧
ژمارە: ٥٩٢-٤ب٢

یەکێک لە ئەندامانی حیزبی کۆمەڵە[مەبەستی کۆمەڵەی ژێ. کاف.ـە] کە لە ساڵی ٢٥ [١٣٢٥ه] هەڵاتۆتە عێراقێ ئێستاش لە نێوان ئێران و باکۆ قاسیدە و پێیەکی لە ئێرانە و پێیەکی لە باکۆ و وێنەکانیشمان هەنە.

یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵە [مەبەستی کۆمەڵەی ژێ. کاف.ـە] لە دەرفەت کەڵکی وەرگرتووە و هەڵاتۆتە عێراق و ماوەیەکی زۆرە لەوێ دەژی. وا دیارە کە ئەو ماوەیە بە شێوەی قاچاخ هاتۆتەوە ناوچەی مەهاباد - شنۆ - سەردەشت و بۆکان. بەردەوام لە نێوان کوردەکان و ئەندامانی کۆمەڵە لە پێوەندی دایە....

- عەبدوڵڵا بارزانی ....
- محەممەد مەولود خەڵکی مەهابادە. یەکێک لە لەزەبرترین و بەتواناترین ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک ـە. ناوبراو بەردەوام لە نێوان عێراق - تورکیە - ئێران و باکۆ لە هاموشۆ دایە. ناوبراو لە چالاکترین و شارەزاترین کەسەکانی ناو کۆمەڵەی ژ.ک بووە کە ساڵی ١٣٢٥ هەڵاتۆتە عێراق.
- دڵشاد ڕەسوڵی ....]

حزب دمکرات کردستان / ۳۳

تاریخ ۳۷/۹/۱۹
شماره: ۲/۵۹۲ ب ۴

یکی از عمال حزب کومله که از سال ۲۵ بعراق متواری شده‌اند فعلاً رابط ایران و باکو هستند که عکس آنها در دست است
یکی از عمال کومله با استفاده از موقعیت متواری شده و مدتها است در عراق بسر برده اینک اخیراً بطور قاچاق وارد مناطق مهاباد - اشنویه - سردشت - بوکان شده مرتباً رابطه بین اکراد و عمال کومله میباشد



۱ـ عبداله بارزانی یکی از رؤسای بارزان که در سال ۲۶ در عراق تحت تعقیب بوده است نامبرده روی آشنائی با عمال قاضی محمد در منزل وی پنهان شده بود و در سال ۳۲ [۱۳۳۲] بتهران آمده با حربه یکدستگاه تاکسی مشغول امرار معاش خود بوده و سرگرمی جهارروله ... که همیشه عمال کومله در آنجا جمع میشوند اینک نامبرده بمحض جریان اخیر عراق بعراق مراجعت کرده است و ... به تهران آمده و رفت نموده و رابطه بین عمال کومله تهران و عشایر بارزان و عشایر منطقه مهاباد شده است
۲ـ محمد مولود اهل مهاباد یکی از زبردست‌ترین افراد عمال حزب کومله ـ ژ ـ ک است نامبرده همیشه رابطه بین عراق ـ ترکیه ـ ایران ـ باکو بوده است نامبرده از زبده‌ترین افراد کومله بوده که از سال ۱۳۲۵ بعراق متواری شده بود
۳ـ دلشاد رسولی اهل عراق که از بدو تأسیس حزب کومله کردستان ...

(چپ در ایران، به روایت اسناد ساواک، حزب دموکرات کردستان ایران، جلد اول، لاپەڕەی ٣٣)

بەڵێ، ئەو بەڵگانە دوژمن نووسیویەتی. تێیدا کاپیتان وەک مەترسییەک بۆ دەوڵەتی شاهەنشاهی دەناسێنی. ئەو دوژمنەی بۆ ڕووخاندنی کەسایەتی نەیارەکانی لە هیچ بوختان و ناوزڕاندنێک دەست ناپارێزێ. گەر کاپیتانی بە دز و چەتە و ڕێگر ناسیبا، هیچ شەرمی نەدەکرد و چاوی دەقووچاند و دەینووسی. وەک دەبینن یا بە **قاچاغچی** ناوی هێناوە یا بە **(چالاکترین،**

**لەزەبرترین، شارەزاترین و بەتواناترین ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک)** پێناسەی دەکات. هەروەها باس لە تێکۆشانی ڕێکخراوەیی کاک حەمەد دەکات. تەنانەت باس لە **پارە وەرگرتن لە لاوان دەکات بۆ کۆمەڵەی ژ.ک.** گوشارەکانی کاپیتان بۆ سەر حکومەت ئەوەندە کاریگەر بووە کە دەیانزانی ئەو ناو و ناتۆرە ناحەزانە، کەسایەتی نەتەوەیی کاپیتان لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا خەوشەدار ناکات، بۆیە لەو بەڵگانەدا دەق و دۆغر ڕاستییەکانیان بۆ بەرپرسانی سەرووی خۆیان باس کردووە.

ئیتر ئەو ڕاستییانە و دەیان و سەدان سەرچاوەی تر لەبەردەست دان کە پێمان دەڵێن بۆ یەکەمجار لە سەردەمی کۆماری کوردستان، وشەی پێشمەرگە ساز کرا؟ چونکە پێشتر بە هەموو ئەو کەسانەی وەک کاپیتان حەمەدی مەولوود، حەمەتاڵ، حەمە هەتیو و... کە لە دژی حکومەت و پیاوانی حکومەت و ئاغاکان یاخی دەبوون و داکۆکییان لە مافی خۆیان و بێدەرەتانان دەکرد و شۆڕشیان دەکرد، دەگوترا: «چەتە». وەنەبێ کە خەڵکەکە ئەو ناوەیان لەسەر دابنێن نەخێر؛ لەلایەن داگیرکەران و پیاوەکانیان، کە گورزیان وێدەکەوت ئەو دەستەواژەیەیان بەکار دەهێنا، وەک چۆن ئێستا بە پێشمەرگە، شەڕڤان، شۆڕشگێڕ و گەریلاکانمان دەڵێن تیرۆریست و چەتە و لەو شتانە. خۆ نەدەکرا لە سەردەمی کۆماریشدا هەر بەو وشەیە یان هەندێک وشەی بێگانە و نامۆ وەک (قۆلسوور، سەرباز، عەسکەر، جەیش و ...) هێزی پێشمەرگەی کوردستانیان پێناسە کردبا؟ کە واتە، دەبوایە وشەیەکی تریان بۆ دۆزیبایەوە کە «پێشمەرگە» جێی خۆی گرت و ئیتر لەو سەردەم ڕا هەم بە هێزی پێشمەرگەی دەوڵەتی کوردستان و هەم بە گشت ئەو کەسانەی کە لە دژی حکومەت و زۆرداران چەکیان هەڵدەگرت، دەگوترا پێشمەرگە یان شۆڕشگێڕ. سەرباقی هەموو ئەو ڕاستییانەش لە یەک شوێنیش نادۆزرێتەوە کە کاپیتان چەتەیی کردبێ جگە لە تاڵانکردنی ماڵی حکومەت و پیاوەکانیان وەک زەبر وەشاندن لێیان و دەستکەوت بۆ درێژەپێدانی ئامانجە نەتەوەییەکانیان.

هەر سەبارەت بەو باسە لە ساڵی ٢٠١٥ دەگەڵ مامۆستا شێرکۆ هەژار موکریانی دیالۆگێکی بەسوودمان کرد. مامۆستا شێرکۆ ئاوایان فەرموو:

**[...بەکارهێنانی وشەی « دزی» و « چەتەیی» و ئەو شتانە لەلایەن هەژارەوە یا هەر کەسێکی ترەوە، بە بێ ئەو ڕوونکردنەوەیەی ئێوە کە زۆر پێویست و لە جێی خۆیدایە، درشتکارییەک دەنوێنێت. سنووری نێوان « چەتەیی» و یاخیبوونی کورد لە داگیرکەرانی نیشتمان، زۆر وابووە زۆر ناڕوون باسکراوە و لە قەرینە (کۆنتێکست)ی واقیعیی خۆیدا پیشان نەدراوە. ئەینا خۆ هەر لە جزیرەی ڕۆژئاوای کوردستان، ئەولادی «حاجۆئاغای هەڤیرکان» کە باسی ڕاپەڕینی خۆیان بۆ کوردایەتی لە دژی مستەفا کەمالی تورکیا دەکرد، وشەی «پێشمەرگە»یان بەکار نەدەهێنا، دەیانگوت: (وەختەک ئەم ژ بۆ کوردستان چەتە بوون). خودی مائۆ تسی تونگ، یەکەم هەنگاوی**

**پێکهێنانی لەشکری بە چەتەیی دەست پێکرد، هەر بە حەرفی چەتەیی، لە چیای بەناوبانگی چەتان...]**

بەڵێ، ڕێگری کردن لە لەشکری داگیرکەر و پیاوەکانیان، لێخەفتانیان، بەسەرداداان، تاڵانکردن و دابەشکردنی دەستکەوتەکانیان بەسەر بنەماڵەی شەهید، هەتیو و بێدەرەتانەکان، هەروەها بۆ بژێوی خۆیان و بۆ درێژەپێدانی ئامانجەکانیان بە دڵنیاییەوە شانازییەکی گەورەیە. گەر ئەوانە پێشتر پێیان دەگوتن «چەتە»، ئێستا پێیان دەگوترێ «پێشمەرگە» و لە وێژەی ڕۆژئاواییەکانیشدا ئەفسانەیان لێ ساز دەکەن و بە «پارتیزان» و «ڕابین هوودەکان (ڕابین هوود – Robin Hood)» وەسفیان دەکەن. بە ئەگەری زۆر مامۆستا هەژاریش مەبەستیان هەر ئەوە بووە بۆیە دەڵێ: (فیل کەوتۆتەوە یادی هیندوستان).

لێرە کە باسی ڕابین هوود کرا، بیرەوەرییەکی منداڵیم هاتەوە یاد لە نەنکم واتە «خورشیدی ڕەهبەر»، ژنی کاپیتان، ئاوا لە سەر کەسایەتی هاوسەرەکەی دەدوا: (کاک حەمەد خەمخۆر، پشتیوانی هەژاران و دژی نادادپەروەری لە کۆمەڵگەدا بوو. کە زانیبای کەسێک پێویستی بە یارمەتی هەیە، لە هیچ درێغی نەدەکرد و لە زاری خۆی و ماڵ و منداڵی دەگێڕایەوە بۆ هاوکاریکردنی. کە خۆشی نەیتوانیبا و دەستی نەڕۆیشتبا یارمەتی لێقەوماوەکە بکات، بۆی لە دەوڵەمەندەکان و دەسترۆیشتۆکانی شار وەردەگرت، جا چ بە تۆبزی با، چ بە دڵخواز. هەر بۆیەش لە ناو خەڵکی هەژار و بێدەرەتاندا یەکجار خۆشەویست و جێگای مەتمانە بوو و لە ناو ئاغاوەت و دەوڵەمەنداندا گۆشتی تاڵ بوو.) هەرچەند لەناو گەلی کوردیشدا هەن کەسانێک کە کاک حەمەدەکان بە (ڕابین هوود – Robin Hood) و قارەمانی نەتەوەی خۆیانی دەناسن و کتێب و لێکۆڵینەوەی خۆیانی پێشکەش دەکەن، وەنەبێ کە هەر لەناو گەلانی‌تر دا ئەو دیاردە جوانە هەبێ. خوالێخۆشبوو مامۆستا «ڕەحیم سابیر» لە کتێبی (حکومەتی میللی کوردستان – لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی مێژوویی – چاپی یەکەم ٢٠١١)ـدا خوالێخۆشبوو کاپیتان محەممەدی مەولودە چرچی وەک یەک لەو پێشمەرگە و نیشتمانپەروەرە کوردانە ناو دێنێ



و له ڕێزەی پێشەوا و هاوڵەکانی و هەروەها له ڕێزەی عەبدولڕەحمانی زەبیحی (مامۆستا عولەما) دادەنێ کە کتێبی خۆی پێشکەش کردووە و لە یەکەم لاپەڕەکانیدا دەنووسێ:

**[ پێشکەشە بە:**

**– پێشەوا قازی محمدی شەهید و هاوڕێکانی.**

**– عبدالرەحمان زەبیحی (مامۆستا عولەما). تاقانە نیشتمانپەروەرەکەی کورد.**

**حەمەی مەولوود (ئەو پێشمەرگە پاڵەوانەی کە تا دوا ساتەکانی ڕووخانی حکومەتی میللی کوردستان بەرگری کردووە.)]**

ڕۆحی هەردوو قارەمان، هەردوو دڵسۆزیی نیشتمان، مامۆستا هەژار و کاپیتان حەمەدی مەولوود شاد و یادیان هەرمان.



حکومەتی میللی کوردستان

پێشکەشە بە :

- پێشەوا قازی محمدی شەهید و هاوڕێکانی.

- عبدالرەحمان زەبیحی (مامۆستا عولەما) . تاقانە نیشتمانپەروەرەکەی کورد.

- حەمەی مولوود (ئەوپێشمەرگە پاڵەوانەی کە تا دوا ساتەکانی ڕووخانی حکوومەتی میللی کوردستان بەرگری کردوە).

کتێبی:
(حکومەتی میللی کوردستان - لێکۆڵینەوەیەکی
سیاسی مێژوویی - چاپی یەکەم - ٢٠١١ -
نووسینی: ڕەحیم سابیر لاپەڕەی ٧)

## سەفەری کاپیتان دەگەڵ نەمر حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی بۆ شۆڕەوی

چەند ساڵ پێش، بەڕێز محەممەد ڕەزا سەیفی قازی دوو وێنەی بڵاو کردەوە لە نەمر حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی لەڕێکەوتی ٢٩ و ٣٠ مانگی ٩ی ساڵی ١٩٤٦ی زایینی لە شارێکی شۆڕەوی گرتبووی بە ناوی (Кисловодск – Kislovodsk) ئەو ناوە لە زمانی ڕووسیدا بە مانای _ئاوی ترش) دێت، ئاخر ئەو ناوچەیەی کە ئەو شارەی لێ هەڵکەوتووە پڕە لە سەرچاوەی ئاوی کانزایی و ترش و گازدار کە لە کوردیدا پێیان دەڵێین ئاوی گڕاوان. ئەو شارە لە باشووری وڵاتی ڕووسیە هەڵکەوتووە و بە شارێکی گەشتیاری و جوان ناسیاوە. ژۆزێف ئیستالین زۆر بەو شارە سەرسام بووە و لەوێ کۆبوونەوە



وێنەی ژمارە یەک

لە ڕاستەوە: نەمران کاپیتان حەمەدی مەولوودیان و حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی لە شاری کیسڵۆوۆدسک ی ڕووسیە ساڵی ١٩٤٦

گرینگ و نهێنییەکانی ڕێک دەخست. لەو شارە جگە لەوەی کارگەیەکی گەورەی قورخانەی لێبووە، هاوکات نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ و دەماری لێبووە کە لەو سەردەمدا پێشکەوتووترین کەرەسەکانی لێ دەست دەکەوت و گەورەترین نەشتەرگەرییەکانی لێدەکرا.

لە وێنەکاندا نەمر حەمە حوسێن خان کەسێکی دەگەڵە کە کاک محەممەد ڕەزا بە دڵنیاییەوە دەیفەرموو کە ئەو کەسە کاپیتان حەمەدی مەولوودە. هاوکات دیتم کە کاک حەسەنی قازی گومانی لەسەر وێنەکە بوو کە ئەو کەسە کاپیتان حەمەد بێ! بەڵگەی کاک حەسەن ڕێکەوتی سەر وێنەیەکەی کە ڕێک دەکاتە کۆتاییەکانی تەمەنی کۆمار و ڕێک ئەو کاتەیە کە کاپیتان لە جەبهەی سەردەشت بووە. هەرچەند ڕواڵەتی ئەو کەسەی کە لە وێنەکەدایە چ لە ڕوانگەی بەژن و باڵاوە و

چ لە ڕوانگەی سەروسیماوە وەک کاک حەمەدی دەچوو و تەمەنەکەشی دەگەڵ تەمەنی ئەو سەردەمی کاپیتان نیزیک بوو.

بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر کاتم نەبەتڵاند و یەکڕاست پێوەندیم بە دایکمەوە گرت، بۆم باس کرد و لێمپرسی ئاخۆ بابت هیچکات دەگەڵ حەمە حوسێن خان سەفەری کردوە بۆ ئازەربایجان یا یەک لەو وڵاتانەی شۆڕەوی کۆن؟ دایکم لە وەڵامدا فەرمووی کە ئاگادار نیم، یەک لەبەر ئەوەی ئەوکات من منداڵ بووم و نایەتەوە بیرم و لە دایکیشم نەبیستووە کە بابم سەفەرێکی ئاوای کردبێ. یان کردوویەتی و بە دایکمی نەگوتووە. ئاخر ئەو سەردەم وا بوو کە پیاوەکان بێ ئەوەی پرس بە ماڵێ



وێنەی ژمارە دوو

لە ڕاستەوە: نەمران حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی و کاپیتان حەمەدی مەولوودیان لەبەر دەم پەیکەری ژۆزێف ئیستالین لە شاری کیسلۆووۆدسک ی ڕووسیە ساڵی ١٩٤٦

بکەن، سەفەریان دەکرد و جاری وا هەبووە بە دوو مانگ و سێ مانگ نەدەهاتنەوە ماڵێ. بەتایبەت باوکم کە زۆربەی تەمەنی بە قاچاغی دەژیا، ناچار بوو بە پارێزەوە هەنگاو هەڵێنێتەوە تا کەس شوێن و جێگای پێنەزانێت. هەروەها ئەو قاچاخچی بوو و شەو و ڕۆژیی دیار نەبوو. جاری وابوو بە وەعدەی ٢ ڕۆژان دەڕۆیی بەڵام ٢ مانگی دەگرت جا دەهاتەوە، بۆیە من هیچ زانیاریم نییە لەو باسە و ڕەنگە چووبێت، بەڵام بە ئێمەی نەگوتبێ و ئێمە نەیزانین.

ئەودەم دەفتەرەکانی کاپیتان چ سەر و سۆراخیان نەبوو و منیش بە گرینگم نەگرت، تا ئەو دەفتەرانە کەوتنە دەستم. بەهۆی فرەڕەهەندبوونی کتێبەکە درەنگ کەوتمە سەر لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر وێنەکان. بەداخەوە دایکیشم کۆچیدوایی کرد و بەجێی هێشتین. دادە «شەونم»ـی خوشکم و کاک «ئارمان»ـی خوشکەزام، لەناو کاخەزەکۆن و وێنە کۆنەکاندا وێنەیەکیان دۆزییەوە کە کاتێک بۆیان ناردم واق مام. وێنەیەک بوو هاوشێوەی وێنەکانی کاک محەممەد ڕەزا، بە هەمان ڕێکەوت، بەڵام لە شوێنێکی جیاواز تر. ئیتر هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە ئەوە بە هەڵکەوت نییە کە

وێنەیەکی هاوشێوە لە ماڵی ئێمە لەناو شمەکەکانی ماڵماندا دەدۆزرێتەوە. بەو پێیەی ئەو وێنانە تەنیا لە ماڵی کچی کاپیتان هەبوون و لە ماڵی کوڕی حەمە حوسێن خان، کەواتە هەنگاوێکی گەورەمان بەرەو ساخکردنەوەی مێژووی وێنەکە دەبات و لە پێداگرییەکەی کاک محەممەد ڕەزا نیزیکترمان دەکاتەوە.

بۆ زانیاری زیاتر پێوەندیم کرد بە کاک محەممەد ڕەزاوە و بە تێر و تەسەلی سەبارەت بە وێنەکان دوایین. یەکەمجار پێمنەگوت کە وێنەیەکی هاوشێوە لە ماڵمان دۆزاوەتەوە. سەری قسانم دەگەڵ کردەوە و زۆر پێداگرانە دەیانفەرموو کە ئەو کەسە کاک حەمەدی مەولوودە و تەنانەت دەیانفەرموو کە بەساڵاچووانی بنەماڵەکەشیان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە. کاتێک کە منیش دەنگم لەو وێنەیە دەرهێنا کە لە ماڵمان دۆزراوەتەوە، هێندەی تر لۆمەی منی دەکرد کە چۆن نەتزانیوە ئەوە باپیرتە؟ ئێستا ئەو لە جاران زیاتر لەسەر قسەی خۆی سوورە کە ئەو کەسە کاپیتان حەمەدی مەولودە.

دەگەڵیان کەوتمە قسان لەسەر هۆکاری سەفەری ئەو دوو نەمرە بەیەکەوە. بەڕێزیان دەیانفەرموو کە» (ئەوکات حەمە حوسێن خان کێشی زۆر چووبوو سەر، لاقەکانی وەژان کەوتبوون. هەناسەبڕکە دەبوو. جووڵەی زۆر پێنەدەکرا. ئەو کە کەسێکی چالاک و



وێنەی ژمارە سێ
لە ڕاستەوە: نەمران کاپیتان حەمەدی مەولوودی و حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی لە شاری کیسلۆوۆدسک ی ڕووسیە ساڵی ١٩٤٦
ئەوە هەمان وێنەیە کە لە ماڵمان دۆزراوەتەوە

هەڵسووڕاو بوو بەو بابەتە زۆر ناڕەحەت بوو، بۆیە بڕیار دەدات کە بچێت بۆ شۆڕەوی تا لەوێ چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە.)[1]،[2]

لە درێژەی بەدواداچوونەکانم بۆ ئەو کتێبە، دێڕەکانی یەک لە بەڵگەنامەکانی ئیدارەی ڕوکنی ٢ (ساواک) سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، بەڵام هیچ لێی تێنەدەگەییشتم. لە کتێبی ((چپ در ایران، به روایت اسناد ساواک، حزب دموکرات کردستان ایران، جلد اول، لاپەڕەی ٣٣) بەڵگەیەکی تێدایە باس لەوە دەکات کە: **(محەممەدی مەولودی بەردەوام لە نێوان عێراق، تورکیە، ئێران و باکۆ لە هاتوچۆ دایە)**. ئەو دێڕە زۆر نامۆ بوو، لەبەر ئەوەی هیچکات نەمانبیستبوو کە کاپیتان لە باشووریی کوردستان و شیراز بەولاوە ڕێگای دوور چووبێ. ئێستا کە ئەو وێنانەی دەبینین و قسەکانی ئەو بەڵگەنامەیە لەکن یەک دادەنێین، دەبینین کە بەڵێ، هەموویان بەرەو قسەکەی کاک محەممەد ڕەزامان دەبەن و بۆمان زیاتر ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کەسە، کاپیتان حەمەدی مەولوودە. ڕەنگە کاپیتان لە کۆی یادداشتەکانیدا ئاماژەی بەو سەفەرە دابێ، مخابن کە وەکوو زۆر لە وێستگەکانی ژیانی ئەو قارەمانە، ئەو بەشەش فەوتاوە، دەنا دەکرا زۆر شتی لێ هەڵکڕێنین و تێیدا (**گەر سەفەرێکی وەهای کردبێ**) تیشک بهاوێتە سەر ئەو بەشە لە مێژووی خۆی و نەمر حەمە حوسێن خان.

---

[1] بە هۆی ئەوەی کە سەفەرەکەیان لەو کاتەدا بووە کە ڕووسەکان ئێرانیان داگیر کردووە و بنکەیان لە مەهاباد و ناوچەکەدا هەبووە و بەردەوامیش لە پێوەندییەکی پتەودا بوون دەگەڵ بنەماڵەی قازییەکان، ڕەنگە ئەوان پێشنیاری ئەو سەفەرەیان بە حەمە حوسێن خان دابێ.

[2] بەڕێز ڕەحمانی حەلەوی لە کتێبەکەیاندا بە ناوی (از مهاباد تا بایکانور) باسی ئەو سەفەرەی نەمر حەمە حوسێن خانی سیفی قازی کردووە.

## کۆچیدوایی کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچی (١٩-٤-١٩٧٩ز)

سەبارەت بە ژیانی کاپیتان حەمەدی مەولوودی لە ئازەربایجان، تێکۆشام تا دەگەڵ یای ڕووناک کچی کاپیتان وتووێژێک بکەم و هەندێک لە بیرەوەرییەکانیم بۆ باس بکات. یای ڕووناک تەنیا کەسێکە کە ئاگاداری لە دواساتەکانی ژیانی کاپیتان هەیە. پوختەی ئەو وتووێژە بەو چەشنەیە:

یای (ڕووناک - **Рунак**) کچی کاپیتان

— (من لە تەمەنی چوارساڵیمەوە لە شاری ئیڤانووڤوو - *Ivanovo*[1] لە ڕووسیە گەورە بووم و دەرسم خوێندووە. ئەو خوێندگایە تایبەت بووە بە منداڵی ئەو کەسایەتییە شۆڕشگێڕانەی کە لە سەرانسۆی جیهاندا شۆڕشیان گێڕاوە و ئێستا ڕوویان لە شۆڕەوی کردووە. واتە منداڵی لە هەموو نەتەوەکانی جیهانی لێبوو. باوکی منیش وەک شۆڕشگێڕێک ئەژماردەیان دەکرد بۆیە منداڵەکەیان لەوێ دانابوو بۆ خوێندن. تەنیا لە بۆنەکاندا یان لە پشووەکاندا دەهاتمەوە لای بابم، زۆر بەداخەوە نە ئەوەندە کات و شانسەم هەبوو کە بەتایبەتی دەگەڵی دانیشم و لە وردەکارییەکانی ژیانی بکۆڵمەوە، نە

---

١ شاری ئیڤانووڤوو یان Ivanovo یان **Иваново** شارێکە کە لە ٣٢٣ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مۆسکۆ هەڵکەوتووە کە دەوری ٥ کاتژمێرێک و نیو لە مۆسکۆ دوورە. بە گەورەترین شاری پیشەسازی لە بواری پارچە درووستکردن هەم لە ئاستی شۆڕەوی و هەم لە ئاستی ئەورووپا دێتە ئەژماردن. هەروەها یەکەمین خوێندنگای شەوانەڕۆژی و ناونەتەوەیی لە جیهاندا لەو شارە دامەزراوە. منداڵی ئەو شۆڕشگێڕ و پیاوە سیاسییە گەورانەی جیهانی لێبوو کە باوکیان یا دایکیان لەسەر بیری چەپ گیانیان لە مەترسی کەوتبوو و ئاوارەی شۆڕەوی بوون. منداڵی سەرانسۆی جیهانی لێبووە و پەروەردەیان کردوون. لە ئامریکای لاتینەوە تا چین لە ئەورووپاوە تا ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و ئافریقا، هەموویان لەسەر ئەو ئەساسە پەروەردە دەکران تا بتوانن لە کاتی پێویست لە وڵاتەکانی خۆیاندا شوێندانەری دابنێنن لەسەر خەڵکی وڵاتەکەیان بۆ بەرژەوەندی شۆڕەوی. یای ڕووناکیش بە هۆی ئەوە کە باوکی وەک یەک لە شۆڕشگێڕەکانی کورد لە وڵاتی شۆڕەوی پێناسە دەکرا، لەو خوێندنگایە پەروەردەیان کردووە. یای ڕوناک دەیگێڕێتەوە لەبەر بواری ئاسایشی بۆ هەموو منداڵەکان ناوی خوازراویان بۆ دانابووین و بە ناوی ئەسڵی خۆمان کەس بۆی نەبوو بانگمان بکات و تەنانەت بۆخۆشمان بۆمان نەبوو کە ناوی ئەسڵی خۆمان باس بکەین. کە کەمێک گەورەتر بووین ئینجا دەگەڵ منداڵەکانی دی کە لێک نیزیک دەبووینەوە لە ناوی ئەسڵی و بەسەرهاتەکانیان تێدەگەیشتین.

ئەوکات ئەو  بیر و مشووورەی ئێستاکانەم هەبوو کە ئەو شتانە بە گرینگ بزانم و بیانووسمەوە.
جارجار دەمدیت کە کاخەز و پێنووسی لەبەردەستە و دەنووسێ. دەمگوت ئەوە چ دەکەی؟ چ دەنووسی؟ دەیگوت ئەوە مێژوویە، ئەوە بیرەوەرییەکانمە، ئەوە تاریخی کوردستانە، ئەو شتانەیە کە بەسەر خۆم و وڵاتەکەم هاتووە. زۆر شتی بۆ دەگێڕامەوە و کەم شتم لەبیر ماوە. یەک لەو شتانەی قەت لەبیری ناکەم و دەرسێکی گەورەم لێوەرگرت ئەوەبوو کە:
ماڵمان لەناو باخدا بوو، من چکۆلە بووم و شەوانە لای تاریک بوونێ دەترسام. زۆرجاران کە دەچوومە ماڵە خاڵم، بە پێیان دەهاتمەوە ماڵە خۆمان، دەتدی کە تاریک دەبوو، ترسێکی سەیرم ڕێدەکەوت. ڕۆژێک گوتم بابە من دەترسێم. ئەویش بە منی دەگوت کە ئەتۆ کچە کوردێکی و هیچ شتێک لەو دوونیایەدا نییە کە کورد لێی بترسێ. کورد کە لەدایک دەبن، ترس لە زگی دایکیاندا بەجێدێڵن جا دێنە سەر دونیا. وا بە جوانی و بە هەستەوە بۆی باس دەکردم کە بە یەکجاری ترس لەمندا نەمابوو و باوەڕم کردبوو کە کورد بەبێترس و خەوف لە دونیا دەبن و لە هیچ ناترسن و زۆر لەخۆبایی بووم کە کچەکوردم. ئیتر لە منیشدا ترس نەما).
یای ڕووناک لە بەشێکی تردا باسی شەڕێکی دەکات کە ناوی شوێن و جێگاکانی نەدەزانی، بەڵام گریمانەم دەکرد کە مەبەستی شەڕەکەی مەکلاوێ بووبێ، ئاوا هاتە گۆ:
(۱۲ تا ۱۵ کەس بووین. لەشکرێکی زۆری دەوڵەتی شای قەرار بوو بەسەرمان دادەن. بە هاوڕێکانم گوت ئەو شەرە، شەڕی مان و نەمانە. گەر ئامادەن گیان دابنێن بۆ کوردستان، ئەوە ڕەگەڵم کەون تا پێڕا بەرانبەریان بینەوە، گەر ناشتانهەوێ ڕەگەڵم کەون، ئەو هەر لە ئێستاوە بچنەوە ماڵی خۆتان و ژیانی خۆتان بکەن. بە خۆشییەوە هەر هەموویان قارەمانانە و پیاوانە گوتیان هەموومان ئامادەین گیانمان فیدای کوردستان بکەین، ئەو ڕۆژە لەشکرێکی ۲ هەزار کەسیمان بە چەک و چۆڵی قوورسەوە شکاند و گورزێکی گەورەمان لێدان).
ئینجا یای ڕووناک بە لەتکەوپەتکە هەندێک لە بیرەوەرییەکانی کاپیتان حەمەدی لە شەڕەکانی محاڵی مەرگەوەر گێڕایەوە کە بۆ ئەوەی درێژە دادڕی نەبێ من لە نووسینەوەیان خۆ دەپارێزم، چون کاپیتان بۆخۆیان بە تێر و تەسەلی باسی کردووە. لە درێژەدا یای ڕووناک گوتی:
(بابم کوردستانی زۆر خۆشدەویست، زۆر پێی لەخۆبایی بوو. نەخشەیەکی کوردستانی گەورەی هەبوو، لە ژوورەکەی بەرامبەر بە خۆی هەڵیهاوەسیبوو. بە دوور و درێژی تێیڕادەما و  سیغاری بە سیغار گڕ دەدا و ئاخی هەڵدەکێشا. جارێک لێمپرسی کە ئەوە چییە کە لە دیوارت داوە؟ گوتی:

ئەوە نەخشەی کوردستانی گەورەیە. بەداخەوە ئەو چوار دەوڵەتە لێیان لەت کردووین و داگیریان کردووە. بەڵام بۆ خەم نابێ، چون دەزانم هەرچوار پارچە یەک دەگرێتەوە. گەر منیش بمرم و نەیبینم، دڵنیام کە نەوەی داهاتووی کورد خوێنی بۆ دەڕێژن و لە بێگانان وەریدەگرنەوە. ڕۆڵە ڕووناک؛ پێمخۆشە ئەوە بزانی کە لێرە لە ئازەربایجان حەز ناکەم بمرم. دەیگوت: کە شۆڕەوی داوە، تەپکەیە، هەرکەس پێوەبێ، دەربازبوونی نییە. تراویلکەیە، هەر لە دوورەوە جوانە، بەڵام پووچە و چی تێدا نییە. لێرە خۆم بە یەخسیر دەزانم. دەیگوت: پێمخۆشە لەدواهەناسەکانم لاق لەسەر خاکی خۆم دابنێم، جا بمرم. گوێم لە وشەی کوردی بێ، جا بمرم. بای کوردستان وە ڕوومەتم کەوێ، جا بمرم. لەناو خەڵکی خۆمدا بمرم. کە مردم با خاکی کوردستان لە ئامێزم بگرێ و لەناویدا بنێژرێم. جا کە هاتوو نەمردم و جارێکی دی کوردستانم دیتەوە، دەتبەمەوە کن خوشک و براکانت و ناو ئەو خەڵکەی ئەوێ، ئەودەم دەزانی کە بابت کێ بووە!

لە هەموو تەمەنمدا تەنیا یەکجار دیتم کە بابم گریا و فرمێسک لە چاوی هات. ئەویش کاتێک بوو کە لە بەرامبەر تلێڤیزیۆنی دانیشتبووین و هەواڵەکانی شۆڕشی گەلانی ئێرانمان چاو لێدەکرد. لەپڕ تێلێڤیزیۆن گوتی کە شا ڕۆییشت و خومەینی هاتەوە. ئیتر بابم دەستی کرد بە گریان و لە چاوانی بە هێشوو ئەسرین دەهاتنە خوار. نەیدەتوانی باوەڕ بکات کە دەتوانێ بچێتەوە کوردستان. دەیگوت یانی من دەتوانم کوردستان ببینمەوە؟ من دەتوانم منداڵەکانم ببینمەوە؟ من دەتوانم خەڵک و خاکەکەم ببینمەوە؟ زووزوو ڕووی تێدەکردم و دەیگوت: ڕۆڵە جوان حاڵی بە بزانە ئەو تلێڤیزیۆنە ڕاست دەکات یا درۆ؟ با من دڵم خۆش نەکەم.

گەر بۆ یەکەمجار هاتمەوە کوردستان، ئاوات و قسەکانی باوکم لە گوێچکەمدا دەزرینگانەوە. نەمدەزانی چی بکەم کە ڕۆحی باوکم شاد بکەم، لەپڕ هاتە زەینم کە بۆچی خاکی کوردستانی بە دیاری بۆ نەبەم؟ لەوچێک خاکی پیرۆزی کوردستانم بۆ هێنا و لەسەر گۆڕەکەی ڕشاندم و گوتم باوکە گیان ئەوەش ئەو خاکەی ئاواتت بوو بۆی دابێیەوە و ماچی کەی و لە ژێریدا بنێژرێی. خودا و ڕاستان وایانکرد کە خوشکە فاتم و کاک عەبدوڵڵای شەمامی تەلەفۆنیان بۆ کردم و گوتیان دەمانهەوێ بێینە ئازەربایجان سەردانی خۆت و گۆڕی باوکمان بکەین. چیت دەوێ بە دیاری بۆت بێنین؟ منیش گوتم لە من گەڕێ و ئێوە بۆ من دیارین، گەر بۆت دەکرێ هەندێک خاکی پیرۆزی کوردستان بێنە بە دیاری بۆ بابم با بۆنی کوردستان بکات، با بە ئاوات بگات. بە خۆشییەوە کە خوشکە فاتم هات، یەک کیسەی بچووکی خاکی کوردستانی دەگەڵ خۆی هێنابوو و بە دیاری بۆ گۆڕەکەی باوکمان برد و بەسەر گۆڕەکەیدا ڕشاندی).



ئازەربایجان - باکۆ - ساڵی ١٩٩٥ لە ڕاستەوە: بە جلی کوردییەوە کاک عەبدوڵلا شەمامی - پەرویز ئاغا هاوژینی یای ڕووناک - فاتم مەولوودیان کچی کاپیتان - خاڵی یای ڕووناک - یای ڕوناک - دایکی یای ڕووناک - پووری یای ڕووناک - منداڵەکان لە ڕاستەوە: ئاسڵان کوری یای ڕووناک - ڕامیار شەمامی و ...

کاتێک شۆڕشی گەلانی ئێران بڵێسە دەستێنێ و لە ساڵی ١٩٧٩ سەردەکەوێ، ئەو ئاوارە و شۆڕشگێرانەی کە لە دژی ئەو دەستەڵاتە تێکۆشابوون و بەو هۆیەوە خاک و وڵاتیان جێهێشتبوو، هیوا و هومێدیان بۆ گەڕایەوە و دڵخۆش بوون کە باقیی تەمەنیان دەتوانن بچنەوە وڵات و زێدی خۆیان. کاپیتان یەک لەو کەسانە بوو، کات نابەتڵێنێ و کاروبارەکانی ڕێکدەخات تا بگەڕێتەوە کوردستان بۆ ناو خزم و هاووڵاتیانی خۆی. بە تەلەفۆن خزم و کەسانی لە مەهاباد ئاگادار دەکاتەوە کە بڕیار وایە ڕۆژی سێشەممۆ ڕێکەوتی ٣١ی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٥٨ (٢٠-٤-١٩٧٩ز) بە فڕۆکە بگەڕێتەوە فڕۆکەخانەی (مهرآباد) لە تاران.

خزم و کەس، دۆستان و ناسیاوان لە مەهابادەوە بەرەو فڕۆکەخانەی تاران وەڕێکەوتن. لەوێ مامۆستا هەژار موکریانی و کاک جەلیلی گادانیـیش دێن بۆ پێشوازی کردن لە کاپیتان حەمەدی مەولوودی. بەداخەوە فڕۆکەکە کە دەنیشتێت کاپیتانی تێدا نابێ. ئەوە دەبێتە جێی سەرسووڕمانی هەمووان. کاتێک تەلەفۆن بۆ باکۆ دەکەن و لە هۆکارەکەی دەپرسن، بەداخەوە هەواڵی مەرگی کاپیتانیان پێدەدەن.



یـای ڕووناک کـچـی کـاک حەمەد دەگێڕێتەوە کە: (بـاوکم زۆر ئـاواتی ئەوەی دەخواست زێدی خۆی و خەڵکی خۆی ببینێتەوە. دەیگوت نـامهەوێ لە غەریبـایەتی بمرم. ئێمە لە "قوبـا" دەژیاین. ڕۆژێک کاک ڕەحیم قازی لە "باکۆ" تەلەفۆنی بۆ باوکم کرد و گوتی ئێستا لە ئێران شـا ڕۆیوە و دەتوانی سـەفەر بکەیەوە بۆ کوردسـتـان، بەڵگەکـانتم بۆ بنێرە بـا کـاروبـاری سـەفەرەکەت بۆ جێبەجێ کەم. ئەویش هەموو شتێکی بۆ نارد. بلیت کرا و بابم خۆی سـاز کرد بۆ گەڕانەوە بۆ مەهاباد. شـەوێک پێش سـەفەرەکەی، ئەوەندە دڵخۆش بوو کە حەجمینی نەبوو و بەردەوام لە ژوورەکەی دەهـات و دەچوو. تا بەتلێکی لای نیوەشـەو لەلای مامەوە پاشان بە زۆری ناردمێوە بۆ ماڵە خۆم و گوتی بەڵام بەیانی زوو وەرەوە بمبە بۆ باکۆ. بە قسـەم کرد. بەیانی کە چوومەوە دەبینم دەرگام لێناکاتەوە. لە دەلاقەوە چاوم لێکرد ئەوە باوکم بە کراوات و ئامادە لەسـەر مۆبڵەکە دانیشـتووە. هەرچی هاوارم کرد وەڵامی نەدامەوە. دەلاقەکەم شـکاند و چوومە ژوور، بە داخەوە دیتم کە جەسـتەی بێگیانی سـارد بۆتەوە و جەڵتەی دڵ لێیداوە و کۆچیدوایی کردووە. بۆ من کە هیچکات مرۆڤی بێگیانم نەدیتبوو تا ماوەیەک تووشی شۆک ببووم و تەواو نەبووم، بەتایبەت کە ئەو کەسـەش باوکم بێ. تەنانەت کە ئێسـتاش دێتەوە یادم، خەم و ترس و یادی باوکم، دەبێتە سندەکوڵێک و بەر بە ئەوکم دەگرێ. دوایی لە گۆڕستانی شاری "قوبا" بە خاکمان ئەسپارد.

بە پێی گێڕانەوەی یای ڕووناک و شـایەدی خزمان، ڕێکەوتی کۆچیدوایی کاپیتان، دەکاتە ۳۰ی خاکەلێوەی ساڵی ۱۳۵۸ (۱۹-٤-۱۹۷۹ز).

گەر وێنەی کێلەکەی کاپیـتان چاو لێبکەن، دەبینن کە ڕێکەوتێکی هەڵە لەسـەری نووسراوە. سەبارەت بەو ڕێکەوتە یای ڕووناک بە سەرسووڕمانەوە وەڵامی دامەوە کە ئەوە لە تۆ دەزانم کە ئەو ڕێکەوتە هەڵەیە! ئەو دەگەڵ ئەو ڕێکەوتەی کە من نووسیومە هاوڕا بوو، بەڵام نەیدەزانی بۆ ئەو ڕێکەوتە لەسەر کێلەکەی نووسراوە! و نەیدەزانی لە کوێ هەڵەیان کردووە! زۆر پێی ناڕەحت بوو. لە هەمووی زیاتر بەوە دڵگران بوو کە بۆ دەبێ پاشـی ئەو چەند سـاڵەی کە کێلەکەیان بۆ دروست کردووە، سەرنجی ئەو هەڵە گەورەیەیان نەدابێ.



لە ڕاستەوە: یای ڕووناک، پەرویز آغا شووی یای ڕووناک و ئەو منداڵەش نەوەی یای ڕووناکە. لەسەر کێلەکەی نووسراوە **محەممەدی مەولوودی کورد**

## وتووێژ دەگەڵ دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ



**پرسیار:** لە کەیەوە کاپیتان حەمەدی مەولودت ناسی؟

ئەو زیاتر لە ٢٠ ساڵ لە من گەورەتر بوو. سەرەتا ساڵی ١٩٦١ کاک حەمەدی مەولوودم لە باکۆ ناسی. کاک حەمەد پیاوێکی سەیر و دەگمەنە لە مێژووی کورددا. بە پیاوێکی ئازا بەناوبانگ بوو. پێش جمهوریەتی کوردستان قاچاغچێتی کردووە. شتی بردووە بە قاچاغ لە نێوان مەهاباد و شیراز[1] و ئەوانە. جا ئیتر کە جمهورییەت دروست بوو، وەک بڵێین - ئێستا حیمایەی پێدەڵێن لای ئێمە - حیمایە یا موڕاقیبی پێشەوا قازی محەممەد بووە. دائیم دەگەڵیا بووە بۆ هەموو شوێنێکا. جا ئەدی بۆ ئەوی هەڵبژاردووە؟ ئەوەش دیارە پێوەندییەکی کۆنی دەگەڵ بنەماڵەی قازییا هەیە.

**پرسیار:** کاک دوکتۆر چۆن زانیت کە کاپیتان حەمەد خەریکی ژیاننامەکەیەتی و ئەو ژیاننامەیە چۆن دەست بکەوێ؟

ژیاننامە، من خەریکم کرد. وتم کاک حەمە چیت دیوە بیگێڕەوە. کاک عەلی گەلاوێژ بۆی شەرح کرد و گوتی کاک حەمەد ئەوە عیزەددیین دەیهەوێ ژیانی تۆ بکاتە کتێبێک. لەبەر ئەوە چیت دیوە لە ژیانتا بیگێڕەوە و ئیتر دەستی پێکردووە لە منالّیا و هەژاری و فەقیری و باوکی و چۆن پەروەردە

---

[1] دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ بە ئەگەری زۆر لێرەدا زەینی یارمەتی نەداوە. کاپیتان تەنیا یەک جار شیرازی دیوە کە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ ئەوێ دوورخراوەتەوە (تەبعید - نەفی کراوە)، دەنا هیچکات توجارەت و کڕین و فرۆشتنی دەگەڵ ئەوێ نەکردووە. بەڵێ، کاپیتان قاچاخچی کەلوپەل بووە لە نێوان سنووری خەیاڵی و دەستکردی ئێران و عێراق و سەردەمێکیش باری لەودیو ڕا هێناوە و بە عەجەمەکانی شارەکانی ورمێ و مەراغە و تەورێز فرۆشتۆتەوە.

کراوە و چۆن گەورە بووە و دوایی، ئەو ماوەیەی قاچاخچێتییە چۆن بووە و چ ڕووی داوە، ئەوانەی باس کردبوو و هەروەها پێوەندیشی دەگەڵ ماڵە قازی لە کەیەوە بوو و بۆچی قازیش لەناو خەڵقی کورددا ئەوی هەڵبژاردبوو تا دایم دەگەڵیا بێ؟ وەک لێرە حیمایەی پێ دەڵێن، بەس ئی کاک حەمەد دەگەڵ پێشەوای لە حیمایەش زیاترە. پێشەوا بۆ هەر شوێنێک چووە کاک حەمەدیشی دەگەڵ بووە لە ماوەی جمهوریەت. کە جمهوریەت تەواو بوو هاتە عێراق.

**پرسیار:** کاک دوکتۆر گیان ئەو ژیاننامەیە چاپ کرا یا هیچ نووسینێکت لەسەر کردووە؟

نا، من بەتەما بووم بیکەم بە کتێب، دوایی من کە لە سۆڤیەتەوە بە قاچاغ هاتمەوە ساڵی ١٩٦٥ - ١٩٦٦ - نەقڵەکەی درێژە - چوومە قامیشلۆ و پەڕیمەوە ئەوبەری تورکیا و لەوێ ڕا بە ئاوی دیجلە هاتمەوە ئەولا بۆ لای ساسوار و ئاوشت و زۆرئاوا کە دوو دێ بوون. لەوێ بە سواری ناردیانم بۆ لای مەلا مستەفا بە ١٦ - ١٧ ڕۆژ گەییمە دیلمان. ساڵێک لە دیلمان بووم. هەموو شەوێ مەلا مستەفا دەهات و دادەنیشت، عەزیز شەریف لەوێ بوو کە سەرکردەیەکی شیوعی بوو، مەلا مستەفا قسەی بۆ دەگێڕاینەوە. ساڵێک لەوێ بووم و دواییش بەیانی کە ٢٩ی حوزەیران بوو بە منی گوت لێرە دانیشتووی چ دەکەی؟ بۆ ناچی بۆ بەغدا لەوێ بەشی کوردی هەیە و دەرس بڵێوە. کاغەزی دامێ بۆ وەزیرێک بە ناوی ئەحمەد کەمال فایەق.

**پرسیار:** لە باکۆ ژیانی کاک حەمەدت چۆن چاو پێکەوت؟

بەیانی زوو زوو دەهاتە سەرم لە کولییە لە بەشی داخیلی و لە پەنجەرەکەی دەدا و دەیگوت دە چایەکی لێنێ؛ منیش چام بۆ لێدەنا. لێم دەپرسی چییە بەو بەیانییە زووە هاتوویە سەرم؟ دەیگوت چی بکەم خەوم لێنەکەوتووە و بێتاقەت بووم و هاتوومە لات. ئیتر دەکەوتە قسە بۆم. جا خواردنی بۆ ئەکردم. جا خواردنی چاکی لێئەنا. گیپەی چاکی بۆ ئەکردین و بانگی دەکردین ماڵە خۆی. دەچوو کەماڵیشی دەهێنا،[1] کەمال مەزهەر. جا کەمال ئەوکات ژنێکی ڕووسی هەبوو، ژنەکەشی دەهێنا. ژنە ڕووسەکەی کەمالی قسەیەکی قۆڕی کرد و گوتی ئەو گیپەیە شتێکی پیسە. لە زەمانی حەڕبا ئێمە ئەوانەمان ئەدا بە سەگ و پشیلە. ئەدی تێگەیی کاک حەمە. گوتی ئیتر کەماڵ و ژنەکەی بەو ماڵەدا نایەنەوە. جا من بچم بازاڕ بگەڕێم و بە چەتوونی ئەو کەللە و گیپەیە پەیا کەم و ئەوەی بۆ بکەم، ئەو ژنەش ئاوا بڵێ! وەڵڵا نابێ بەو دەرکەیەمدا بێ. کاک حەمەد کاتی خۆیشی تەباخی بۆ شێخ لەتیفی کردبوو لە «حیللە» لە لەلای بووە. ئیتر کتێبەکانیشی کە بە قاچاخ هاتمەوە زۆرییم لەوێ دانا، لە بەشێکی ناوخۆ دامنا. لەبن دەستی ژنێکی ئازەریشا. وتم با لات بێ و ئەگەر شتێکم نارد تۆ بیدە بە ئاکادێمی. کەمال زانیبووی و چووبو لێی هەستاندبوو و تەنانەت زۆر کتێبی خۆیشمی و دەستنووسی خۆیشمی تێدا بوو. ئەو ژنە دەیزانی کە کەمال ڕەفێقمە بۆیە

[1] مەبەستیان دوکتۆر کەماڵ مەزهەرە.

متمانەی پێکردبوو دابوویە.

**پرسیار:** هیچ بیرەوەرییەک هەیە بۆتی گێڕابێتەوە لە یەکیەتی سۆڤییەت یا لە کۆماری کوردستان؟

زۆر شتی دەربارەی قازی و دەربارەی ئەو سۆڤیەتییانەی لەوێ بوون، لە بارەی ئەسەدۆفەوە. کۆمەڵێک شتی ئەسەدۆفیشم لا بوو. ئەسەدۆف کێیە؟ ئەسەدۆف ئەو وەختی من لە باکۆ بووم ئەو مودیری ئوتێلی ئین توریست بوو. ئەو ئۆتێلە گەورەترین ئۆتێلی باکۆ بوو. من لەوێ بووم جەمال عەبدولناسر هاتووە و لەوێ دابەزیوە، ئەوەی ئەندۆنێزیا لەوێ دابەزیوە سۆهارتۆ. ئەسەدۆف لەوێ مودیر بوو. من چوومە ئەوێ لای. هیتێرێکی هێنا و قۆرییەکی خستە سەر و چای لێئەنا. ئەسەدۆف لە مەهاباد بوو. وتی من بە ناوی ئیشی تیجاری ناردرابووم بۆ مەهاباد بەڵام لە ئەسڵدا لێپرسراوی هەموو کارەکە بووم بەرانبەر بە سۆڤییەت. جا ئیتر ئەو باسی شەخسییەتی قازی بۆ کردووم. جا قازی محەممەد ئەڵێن زمانی زۆر زانیوە ئینگلیسی و فەرەنسی و تورکی ئیستانبوڵی و تورکی ئازەری و فارسی و عەرەبی. ئەو ئەیوت قازی زۆر بە کراوەیی و بە وازحی ڕووسی قسەی دەکرد. ئەسەدۆف لێپرسراوی جمهورییەتەکە بوو. زۆر بە گەورەیی باسی قازی دەکرد. بە کاک کەماڵم گوت کە وەرە من ئەسەدۆف دەناسم و وەرە شتی لێ وەرگرە، بەلایەوە هیچ نەبوو. ئەو ڕەحیمی[1] هەبوو بەلایەوە ڕەحیم سەرچاوە بوو بۆ ئیشی مەهاباد. بەڵام ئەسەدۆف شتی زۆر لا بوو چوون ئەو لێپرساو بوو. سەلاحەدین قوربانۆف هەبوو ئەویش مەسئولی عەسکەری بوو لە ئیشی مەهابادا، ئەویشم دیوە باسی قازی ئەکرد. قازی وەک ئەوان باسیان ئەکرد شەخسییەتێکی گەورە و هەڵکەوتوو بووە لە کورددا. ئەوەی قازی شتێکی دەگمەنە کە مەلایەک لە قەزایەک ئەو هەموو توانا و خوێندەوارییەی هەبێ. جا شەخسییەتی قازی، کۆمەڵێکی کاک حەمەدی مەولودی بۆی باس کردووم. بەڵام بەو نەوعەش ئاخری قارەمانانە چۆ بەر سێدارە. دەربارەی ئێعدامەکە قسەی قۆڕ ئەکرا بەڵام خەڵقی مەهاباد باش ئاگادارن کە چۆن لەدار درا.

سپاس بۆ کاک (ئازاد بایز چەمچەماڵی) کە ئەم چاوپێکەوتنەی بە فیلم بۆ ئامادە کردم.

---

[1] مەبەستیان خوالێخۆشبوو ڕەحیمی سەیفی قازییە.

## وتووێژ دەگەڵ کاک مەحموود (...)[١]

ماڵمان لە گەڕەکی ئەرمەنیان بوو. کاک حەمەدی مەولوودی لەمن بەتەمەنتر بوو. ئەو سەرۆکی پێشمەرگەی بوو. ئەگەر دەچوە سەفەرێ یا لە شەڕی دەهاتەوە دایکم و وان دەیانگوت کاک حەمەد هاتۆتەوە بە بێمزەڕەتی. ئەمن منداڵ بووم، بۆ پێشمەرگایەتێ تفەنگیان نەدەدامێ، بۆم هەڵنەدەگیرا. تازە دەهاتم بخوێنم. ماڵە کاک حەمەدی جیرانمان بوون ماڵە «میرزا ساڵحی ئاژان»یش (جەوانمەردی)یان پێ دەڵێن جیرانمان بوون. پێش شەهریوەری هەزارو سێسەد و بیست و ئەوانە کە ڕووسەکان هاتنە ئێرە کاک حەمەد خەریکی کاسپی بوو. بەبیری منیش نیە چونکە ئەمن منداڵ بووم.

باجە خورشید خێزانی بوو. سێ کچ و کوڕێکیان هەبوو: باجە ئامین، باجە کافیە و باجە فاتم کچەکانی بوون و کوڕەکەشی کاک خانە بوو. کاک خانە زۆر بە نازداری گەورە بوو، نازدارێک بوو مەگین خودا بزانێ. پێشمەرگەیەک مستەفا چەپە (چاوشینی) یان پێدەگوت پێشتر ناڵبەندی دەکرد. هەر پێشمەرگەی کاک حەمەدیش بوو، ئەو و دوو پێشمەرگەی دیکە لە ماڵە کاک حەمەدی موحافیزی کاک خانەی بوون. دایمە کاک خانەیان دە باوەش دابوو.

دوایە کە ڕووسەکان هاتن ئێرە بۆمباران کرا، وەدەزانم ئەلعانە عالەم هەموو هەڵاتن بۆ سەر قەبران، خەڵک دەگریا. چون قەتمان تەیارە نەدیتبوو. بە قامکی تەیارەکەمان پێشانی خەڵکی دەدا. لەبیرمە دەمگوت ئەوەتا تەیارە ڕەش، ئەوەتا تەیارە ڕەش. جا تا ئەو ساڵانە خەڵک دەیانگوت قامک ڕامەدێرن دەنا خەلەبانەکەی وەدەزانێ تفەنگتان پێیە گوللەی پێوەدەنێن، دەیهاوێ. بەڵێ عورووس ئێرەیان گرت ئیدی ئەفسەر و سەرباز پادگانیان چۆڵ کرد. وڵات تێک چوو ئەفسەر دەهات دەیگوت بابە ئەو لیباسە کوردی‌یەی خۆت بدە بەمن چەکەکەشمت دەدەمێ چەندیشت پووڵ دەوێ دەتدەمێ. هەڵاتن ڕۆیشتن و بڵاو بوونەوە.

پێش ئەوەی عورووس بێنە کۆمەڵەی ژێکاف هەبوو. بە دزی لێکتر خڕەبوونەوە هەر ئاوا کۆمەڵەیان ساز کرد. ئەگە عورووس هاتن شەوانە خەڵک لێک خڕ دەبوونەوە سرتەیان دەکرد دەیانگوت عورووس ئاوا دەکا و ئاوا دەکا و قەرارە چەکمان بۆ بنێرێ. ئیدی ئەگەر عورووس هاتە ئێرە، لێرە وڵات بوو بە هەرجومەرج. قازی محەممەد دەستووری دا هەر کەس قودرەتی هەیە تفەنگی بکڕێ و پەیدای کا، هەرکەس نیەتی بە کۆڵەوەژ و داری وەرن کێشکێ بکێشن، هەر شەوەی ماڵێک بچنە دەرەوەی سابڵاغێ دەنا مەنگوڕ و خەڵکی دیکە دێن تاڵانمان دەکەن. ئیدی عالەمەکە هەمووی خڕبۆوە و وەدووی قازی کەوتن، خەڵک هێندێکی تفەنگیان کڕی.

لە قاوەخانەی چاوشینیان پێ دەگوت ئەلحان بۆتە ماڵە ئەحمەدی خمێ، خەڵک کێشکی دەدا هەر شەوەی ماڵێک. وردە وردە میرمیرێنیان ساز کرد. یەکێک دەبوو بە میر، خەڵکیان بە سۆعبەت

---

[١] لەبەر هۆکاری تایبەت نەیویست بناسرێ

بانگ دەکرد، دەیانگوت ئەتۆ ئەو کارەت کردووە، جەریمەیان دەکرد. میرێکیش لە گەڕەکی ڕەزگەیان داندرا بە نێوی محەممەد لاوازە. بابی ئەو عەبڵایەی بوو قاوەخانەی هەبوو. ماڵە (جولفایی) یان پێ دەڵێن، زۆر میرێکی چاک بوو. میری گەڕەکی ئێمەش سەدیقی سیاسەری بوو.

ئێستا دێموکڕات دانەمەزرابوو. جارێکی ئەوانە ناردیان لەدووی قازی محەممەدی، کوتیان قازیش جەریمە دەکەین . یەکێکیان نارد کوتیان قوربان میرمیرێنمان داناوە ئاگامان لە وڵاتیە. ئەلعانیش میر دەفەرموێ یان دەبێ قازی بێتە ئێرە یا سەتمەن جەریمەی دەکەین. قازی کوتی عەک بارەکەڵڵا. زیندەباد ئاگاو لە وڵاتیە، وەڵڵاهی پێم ناکرێ و ناتوانم دەنا دەهاتمە خزمەتتان، بەڵام سەتمەنی دەدەم، وەڵا ئەوەندەیان جەریمەکرد. جا لەوەی دواوە وردە وردە لە گەڵ عورووسان بوون بە یەک.

شەوێک عورووس بە ڕێگایەکی پەنا پردی سووری هەرە کۆندا ئەوەی لای باغی مکایلی بە ماشێنی برنوویان فرێدا. هەموو دە ڕۆنی دابوو. هەمووی لێی نووسرابوو « زیددی یەهوود». هەموو ئی ئاڵمانێ بوو گرتبوویان، ئاڵمان زیددی یەهوودی بوو. برنووەکان برنووی سەرتۆپیان پێ دەگوتن، جا گەورە و چکۆلە هەموو جۆرێکی تێدابوو، دەیانگوت تەیارەشکێن. ئیدی قازی مەمووری نارد کوتی بڕۆن سەرو تفەنگێکیان بدەنێ. ئیدی هەر کەس پێشمەرگە بوو تفەنگی هەڵگرت و هێنایانە حەساری دارایی. هەمووی دە ڕۆنی دابوو، بە نەفتی و بەماسلّە(گازۆئیل)ی ڕۆنەکەیان لێ دەکردەوە و خاوێنیان دەکردنەوە. جا وردە وردە تەشکیلات ساز بوو، ژێکاف پەرەی گرت و کاک حەمەدیش خۆی نیشاندا و بوو بە پێشمەرگە، دواتر بوو بە سەرۆکی پێشمەرگەی.

کاک حەمەد پیاوێکی زیرەک و بەغیرەت بوو. دەستە و مەستەی ساز کرد. پێشمەرگەیان دەئیختیار نا. لە گەڕەکی ئێمە یەستا پێشمەرگە دانەمەزرابوو، کابرایەک پێیان دەگوت عەزیزی قادر حەیرانی هاتبوو لە مزگەوتی فەقیران دەستنوێژێ بشوا، لەوێ لەقسان کابرایەک ڕقی لێی بوو لە دەستاوەکانی مزگەوتێدا کوشتی. خەبەریان دا بە کاک حەمەدی، کوتی ئەوشۆ دەیگرم. لەچوارڕێی مەولەوی بۆ سەرێ باغ و باغات بوو، چۆل بوو. کەس نەیدەوێرا بە شەو بچێتە ئەوێ یا بچێتە گومبەزان. جا ئەو گومبەزانەش وەک ئێستا نەبوو، زۆر ناخۆش و خەفە بوو، دەرکەی نەبوو. کاک حەمەد بەتەنێ چوو. تەواوی وڵاتی گەڕابوو. هەتا بەیانی گەڕابوو نەیدیتبۆوە. بۆ سبەینێ دیتیانەوە، کابرا نێوی سەعید... بوو؛ گوێلک و مانگا و شتی هەبوو هەموویان ڕاگوێست و ماڵەکەیان ئاورتێبەردا.

دواتر کە ژێکاف پەرەی گرت میر حەج و محەممەد مەحموود و مستەفا خۆشناو وان هاتنە ئێرە، کاک حەمەد دەگەڵ هەموان پێوەندی هەبوو. دەیانگوت مستەفا خۆشناوی زۆر خۆش دەویست. تەنانەت دەیانگوت مستەفا خۆشناو چاردە زمانان دەزانێ و زۆر زیرەکە. کاک حەمەد پێشمەرگەیەکی زۆر بەغیرەت و بەکار بوو، کەس نەیدەوێرا خۆی تێگەیەنێ. دەگەڵکوو تەشکیلاتی

دێموکراتی دامەزرا، کاک حەمەد هەمیشە لە جەبهەی بوو. قازی زۆری خۆش دەویست. کاک حەمەدیان کردە ڕەئیسی جەبهەی، هەمیشە لە جەبهان بوو. زۆرتر لە جەبهەی شاهیندژ و سەقزێ بوو. ئەگەر شەڕ کرا و شەڕ ساز بوو و تفەنگیان دانێ. شەڕەکە عومدە بوو و پەرەی گرت. لەشکری ئێرانێ لە سەردەشتێ مابوو. لەوێ شەڕبوو کاک حەمەد ڕۆیشتە ئەوێ. «وەستا برایم»ێک هەبوو بەننای چاک بوو، «وەستا برایمی مام کەریم»-یان پێ دەگوت؛ دەستی لە بەننایەتی هەڵگرت و بوو بە پێشمەرگە. پێشمەرگەی کاک حەمەدی بوو. لە شەڕێکیدا وەستا برایم شەهید بوو، کاک حەمەد تەرمەکەی ناردەوە و ڕایسپارد بە ئیحترام و ڕێزێکی زۆرەوە بینێژن.

دەیانگێڕاوە دەیانگوت هەرکەس لە جەنگەی شەڕێدا هەڵاتبا و جەبهەی بەجێهێشتبا یا لەخۆڕا پاشەکشەی کردبا، کاک حەمەد دەیکوشت. جارێکی دەستێکی سێ- چوار کەسی لە جەبهەی سەردەشتێ پاشەکشەیان کردبوو و هەڵاتبوون، کاک حەمەد گەڕابۆوە و گرتبوونی. هەمووی کاغەزی دە مل کردبوون و بۆ قازی محەممەدی نووسیبوو ئەوانە لەشەڕی هەڵاتوون، لە سابڵاغێ ئابڕوویان بەرن؛ ئەگەر وا نەکەن جەبهەی سەردەشتێ بەجێ دەهێڵم. ئەوانەیان لە سابڵاغێ گێڕا، خەڵک پێی دەکوتن هەی ح...، هەڵاتوون!؟ یەکیانم لەبیرە نێوی عەبڵا... بوو.

زێڕۆ بەگ لە سەردشتێ بوو، زێڕۆ بەگ شکاک بوو. کاک حەمەد ماوەیەکی دەگەڵ ئەوی بوو. لە هەرجێیەک شەڕەکە توند بووبا کاک حەمەد غاری دەدا دەچۆ ئەوێ. دەگەڵ زێڕۆ بەگی شکاک بوو، دەگەڵ بارزانیان بوو. هێندە زیرەک و لێهاتوو بوو نێوبانگی دەرکردبوو. هەر جەبهەیەک کاک حەمەدی لێبووبا ورەی پێشمەرگەکانی دیکەش زیاتر دەبوو.

کە وڵات تێکچوو، قازی محەممەد و چەند کەسی دیکە لە مەهابادێ ڕا بەرەو میاندواوێ بەرەوپیری سەرتیپ هومایوونی چوون. ئەو نمایەندە و نوێنەری شای بوو. سەرتیپ هومایوونی لەسەر ئەسپی بوو، لەشکرەکەشی دەگەڵ بوو، کوتی: «همین کە بە مهاباد رسیدیم تمام حمد مولودها را بگیرید و تحویل من بدید» ( دەگەڵکوو گەیشتینە مەهابادێ هەرچی حەمەدی مەولوودە بیانگرن و بیاندەن بە من). کوتیان قوربان حەمەدی مەولوودی یەک نەفەرە. کوتی:» پێم وانییە، شتی وا نابێ. کوتیان بەڵی هەر یەک نەفەرە. کوتی شتی وا چۆن دەبێ، ئەمن چوومە جەبهەی شاهیندژێ شەڕێکی زۆر توند بوو؛ پێیان کوتم وریای حەمەدی مەولوودی بە. چوومە سەقزێ دەیانکوت وریای حەمەدی مەولوودی بە. دەچوومە سەردەشتێ دەیانکوت وریای حەمەدی مەولوودی بە. کوتیان قوربان وەڵڵا هەر یەک نەفەرە.

یەستا وڵات تێکنەچووبوو کاک حەمەد لە جەبهەی سەردەشتێ را دەگەڵ پێشمەرگەکان دەگەڕانەوە هێندێک لە مەنگوڕان و خەڵکی دیکە کوتبوویان ئەوانە بە شکاوی دەگەڕێنەوە سابڵاغێ، ئێمەش لێیان دەدەین و تاڵانیان دەکەین و تفەنگەکانیشیان لێ دەستێنین. وەڵا خەبەریان دا بە کاک حەمەدی. کاک حەمەدیش بە پێشمەرگەکانی کوتبوو خوێنم دەگەڵ خوێنتانە هەتا

تەحویلی شاریو نەدەمەوە و نەوگەڕێنمەوە شاری بۆ هیچ کوێ ناچم. وەڵا لە لای گەنەدار و گوێچکەدەرێ و ئەو دێهاتانە، مەنگوڕ و خەڵک سەنگەریان لە پێشمەرگەی گرتبوو. ئیدی کاک حەمەد دەگەڵ دەستێک پێشمەرگەی ڕۆیی کوتی جا دایانگرن، ڕوحمو پێیاندا نەیە. وەڵا لێیان دابوون شکاندبوویانن. تفەنگێکی زۆریان لە مەنگوڕان ئەستاندبوو. هێندێک هەڵاتبوونە گەنەدارو گوێچکەدەرێ. گەنەدار و گوێچکەدەرێ وێران کرابوون.

یەکێک لەو پێشمەرگانەی لەگەڵ کاک حەمەدی بوو نێوی حەسەنی ڕەسووڵە شڵقەی بوو. هەروەها ئەو وەستا برایمەی پێشتر کوتم، هەروابێتەوە محەممەدی هیندوەش، مەجید قوباد و هەردووک ژن براکانی خۆی عەلی و مستەفای یاوەری(ڕەهبەر) و محێدینی ئایشێ کوللێران لەگەڵ کاک حەمەدی بوون. ئەو محێدینە ئەگەر قازی شەهید کرا و بۆخۆشی لە کاک حەمەدی هەڵبڕا ئیدی تێکەڵی کرد دەنا زۆر پێشمەرگەی چاک بوو. جا ئەو کاک حەسەنی ڕەسووڵە شڵقەی دەگەڵ پێشمەرگەیەکی چووبوونە نێو دێی گەنەدارێ. گێڕایەوە کوتی لە نێو دێی بووین کولانەیەکی گەورەی مریشکان بوو ئەگە تەماشام کرد پەڕۆیەکی سووری تێدابوو، دیتم ژنێک بوو خۆی دەوێدا شاردبۆوە. ئەگەر دەستم دەوێ ڕاکرد کوتی براله پیاوی چاک بە ئافرەتم، کوتم خوشکێ ماتبە با نەتبینن.

بەڵێ مەنگوڕەکان شکان، هاتینەوە کن کاک حەمەدی باسی ژنەکەمان بۆ گێڕاوە، ؛ کاک حەمەد کوتی دەبێ بچن ئەو ژنەی بێننە ئێرە، ئەمەش هەر دۆعامان دەکرد خولایە ئەو ژنە لەوێ نەمابێ و ڕۆیشتبێ، ئەگەر چووین ژنەکە لەوێ نەمابوو. گەڕاینەوە کوتم کاک حەمەد بەخودای لەوێ نەمابوو. کاک حەمەد کوتی شتی وا نابێ. کوتم دەڵێی یەکێکی بنێرە یا بۆخۆت بچۆ چاوی لێ بکە، وەڵا پێشمەرگەیەکی دیکەی دەگەڵ ناردم؛ کوتی بزانە ڕاست دەکا؟ دەیگوت لێی دەپرسم بۆ پێشیان پێ گرتین؟ بۆ ئاوایان لە ئێمە کرد؟ ئێمە لە ڕۆژێکی ئاوادابن، لەباتی ئیحترام و قەدرمان بگرن، بۆ سەنگەریان لێ گرتین؟ خۆ ئەوە ئەمنیان دەگەڵ نەبامایە و لەشکریان دەگەڵ نەبایە هەموویان تاڵان دەکردن.

کاک حەمەد زۆر ئازا بوو پێشمەرگەی وا هەر نەبووە. یەکی قوڵە خڕە بوو. کڵاوێکی تووکی لەسەر دەنا. کڵاو خوودیان پێ دەگوت. عورووس نیو باڵتۆیەکیان دابوو بە هەموان، ئەویش یەکی وای دەبەر دابوو. زستانان دەبەری دەکرد. تفەنگێکی قوڵەی سەرتۆپیشی پێ بوو. بڕنووی چاکی پێ بوو؛ دەمانچە و خەنجەریشی دەبەست ئیدی هەر شیرن بوو چاوی لێبکەی. ئەرێ وەڵڵا هەمیشە ئەگەر دەیانگوت کاک حەمەد هاتۆتەوە، دوو شەو و ڕۆژان لێرە دەبوو، ئیدی بەغار دەچۆوە جەبهەکان، ماوەیەکیش بەسەر جەبهەی سەردەشتێ ڕادەگەیشت.

بەڵێ پێشمەرگە گەڕانەوە. خەڵک بیستبووی لە ڕێیە پێشیان پێ گرتوون، نیگەران بوون خەڵکی دێهاتی سەر ڕێیە هاتبوونە سەر جادەی. کاک حەمەد هەتا تاقەداری دەگەڵیان هات. وەڵا هەرکەس

کوڕ و کەس و کاری خۆی ماچ دەکرد پێشمەرگەکان دەیانگوت ئەگەر کاک حەمەدمان دەگەڵ نەبووبا هەمووی دەشکاین. جا ئەودەمی کاک حەمەد یەک یەک پێشمەرگەکانی ماچ کرد. گەردن ئازادی لێ خواستن و کوتی ئەوە ئەنگۆ هەموو بەسڵامەتی گەیشتنەوە نێو کەس‌وکاری خۆتان ئەمن دەڕۆم، تازە نامبیننەوە. وەڵا بەنێو باغ و باغات و مێشەکانی «داشتەمر»ێدا ڕۆیشتبووە لای «قازیاوا»ـی. ئەودەمی ئەو سەددە ئێستا ساز نەکرابوو. پاش چەند ساڵان کوتیان کاک حەمەد چۆتە عورووسیاتی. دەوڵەت جاییزە و پووڵی دەدا بە هەرکەس بیگرێ یا ڕاپۆرتی لێ بدات. بە تەواوی دێهات و وڵاتیان ڕاگەیاندبوو هەرکەس بیبینێتەوە، خەبەرمان لێ بدەنێ، ئێمە جاییزەی دەدەینێ؛ بەڵام دەوڵەت هەرچی کردی بۆیان نەگیرا. جا ئیدی نازانم دوایە دەگەڵ مەلامستەفای یەکتریان گرتەوە یان نا. پاش چەند وەختان کوتیان کاک حەمەد ئەوە لە مەسکەوێیە، کاغەزیان بۆ ناردووە.

جارێکی ئەمن نەمدیت بەڵام کوتیان هاتۆتە وزندەرێ. ئەوە قسەی دوای تێکچوونی حکومەتی قازی بوو. دەوڵەت بە لەشکر و هێزێکی زۆرەوە چووبوون، دەیانگوت زوو خۆی گۆڕیبوو، لیباسێکی قوڵەی، شڕی دەبەرکردبوو و خۆی کاواوی کردبوو، مەڕ و دەواری وەپێش خۆی دابوو ئەوانیش بەڕاستی وەیانزانیبوو شوانە، وەڵا خۆی نەجات دابوو، نەیانناسیبۆوە. جارێکیش کوتیان هاتبۆوە دێیەکی، پێم وابێ نێوی دێیەکەی خەلان بوو. باجە خورشید چووبووە کنی.

جارێکیان کابرایەکی خەڵکی ئێرە «دەروێش حەمەدی ڕەجەب»ـیان پێدەگوت دەگەڵ شێخ حەسەنی غەوساباتێ ویستبوویان بچنە بەغدایە. قەدیم دەیانگوت هەرکەس بیهەوێ ببێتە شێخ، دەبێ بچێتە خزمەت حەزرەتی غەوس چلەی بکێشێ، لەوێ چلەی بکێشێ ڕۆژێ دەنکە خورمایەکی بخوا، جا دەبێتە شێخ، قەدیم ئاوا بوو. جا ئەو دەروێش حەمەدە گێڕایەوە کوتی ڕۆیشتبووینە ئەو دیوی، لەوێ مەجلیسێک بوو دانیشتبووین، باسی ئازایەتی و غیرەتی کاک حەمەدی مەولوودیان دەکرد. دەیان کوت قازی بێوی هیچی بۆ نەدەکرا، هەر دۆعای بۆ دەکرد هیچی لێ نەیە. لەهەموو جەبهەکان دایمە حازر بوو. کوتی لەمنیان پرسی کوتیان کاک حەمەد پیاوێکی چۆن بوو؟ ئەمنیش کوتم وەڵا پیاوێکی قوڵەخڕە بوو کڵاوخوودێکی لەسەردەنا، زۆر بە غیرەت بوو، ئەگە ئاوا چاوت لێ کردبا بەخۆوە نەبوو بەڵام ئەگەر پیاو دەیدی لێی دەترسا. کوتیان بیبینی دەیناسیەوە؟ کوتم وەڵڵاهی لەمێژیشە نەمدیوە، ڕەنگە. کوتیان لەوانە کێهایان کاک حەمەدە؟ پێداهاتم تەماشام کردن، کوتم هیچیان هەونین. وەڵا لەنەکاو یەکێکم دیت وەڵا دەستم دەئەستۆی کرد، ماچم کرد کوتم ئەوەتا ئەوەیە. کاک حەمەد کوتی کوڕە پیاوی چاک بە بۆ خاتری خودای دەنگێ نەکەی. کوتم نا بابە. باجە خورشید و وانیش هاتبوون. پێمکوت چت پێویستە؟ کوتی هیچم پێووێست نیە. وەڵا ئاوام گوێ لێبوو ئەو کابرایە کوتی بۆخۆم کاک حەمەدم لە خەلانێ دیت.

وتووێژ دەگەڵ: کاک مەحموود (...) ١٨-٤-١٣٩٦ - ٩-٧-٢٠١٧ یەکشەممە.

ئامادە کردنی: پارێزراوە

## وتووێژ دەگەڵ کاک عەلی قازی (کوڕی ڕەش)

**پرسیار:** کاک عەلی، بەڕێزتان ناوی کاک حەمەدی مەولودەچرچیتان بیستووە؟ دەیناسن؟

**وەڵام:** ئەوەندەی من لە بیرم بێ کاک محەممەدی مەولودە چرچی پیاوێکی زۆر عاقڵ و شەڕکەر بوو. هەمیشە دەگەڵ مەرحوومی بابم زۆر پێوەندییەکی نیزیکیان هەبوو. پاشان کە کۆمار نەما کاک محەممەد چوو بۆ باشووری کوردستانێ. هەروەختێکی دەهاتەوە بۆ باغی ساوای خۆمان، من دەچووم دەمدی و زۆر خۆشحاڵ دەبووم. لە پاشان چوو بۆ یەکیەتی سۆڤیەت و لەوێ ڕەحیم ئاغای سەیفی قازی زۆری ئاگا لێبوو. دەوڵەتی شۆڕەوی باخچەیەکی دابوو بە کاک محەمەد و خەریکی کشت و زەرغ و شتی وا بوو، لە پاشان براکەی محەممەد ئەمین چوو بۆ ڕووسییەی و لەوێ بێسەر و شوێن بوو نەمزانی چی لێهاتەوە. فەقەت کاک محەممەد لە باکۆیە بوو و لە باخچەکەی خەریکی کاری خۆی بوو و سەری خۆی پێ گەرم دەکرد. هەر لەو باخچەیەش وەفات دەکات.

**پرسیار:** کاک عەلی ئەوکاتەی کە کاک حەمەد لە باشووری کوردستان بوو و دەهاتەوە بۆ مەهاباد، بە ئازادی دەهاتەوە یا بە قاچاخی؟

**وەڵام:** نا، نا، بە قاچاخی چۆن! ئەو قاچاخ بوو. مستەفایەک هەبوو کە باخەوانی مە بوو. ئەو دەهات ئاگاداری دەکردمەوە. زۆریان ئاگا لێی دەبوو. هەمیشەش موسەللەح بوو و دەمانچە و تفەنگی پێبوو. هەمیشە لە کن مستەفای دەمایەوە. مستەفاش بۆخۆی هەم باخەوانمان بوو هەم کێشکچی بەردەرکی ماڵی ئێمە بوو.

**پرسیار:** لەو دیدارانەدا کە دەگەڵ کاک حەمەد کردووتانە باسی چی دەکرد؟ کاک حەمەد لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ کە ویستووم شۆڕش دەستپێبکەمەوە و ئەو باسەشم دەگەڵ کوڕی ڕەش کردووە. چیت لەبیر ماوە لەو بارەیە؟

**وەڵام:** بەڵێ. ئەو پێشنیارەی بە من کرد. ئەڵبەتە زۆر ڕابردوویەکی دوور و درێژە. کاک حەمەد هەمیشە خەمی کوردایەتی هەبوو و دەیویست کوردستان سەربەخۆ بێ. ئەو وەک برایەکی خۆشەویست بوو بۆ من. ئەڵبەتە ئەو زۆر لە من بە عومرتر بوو. کە دەهاتەوە بۆ باغی خۆمان لەوێ لەناو باخ چارداخێکمان هەبوو کە هەمیشە لەوێ دەمایەوە. من لەوێ دەچوومە خزمەتی. لە باکۆیەش کە دەبوو کاک ڕەحیمیش زۆری ئاگا لێدەبوو.

**پرسیار:** مامۆستا هەژار لە کتێبەکەیدا بە ناوی چێشتی مجێور دەنووسێ کە حەمەدی مەولودی چەتە بووە. ئاخۆ ئێوە لەسەر ئەو قسەیە چ زانیارییەکتان هەیە؟

**وەڵام:** وەڵڵا من نەمبیستووە و نازانم بەڵام کەسێکی زۆر ئازا بوو. هەمیشە نێوبانگی ئازایەتی هەبوو. ژیان خانم هاوسەری کاک عەلی لێی دووپات دەکاتەوە کە چەتە بو یا نا؟ کاک عەلی دە وەڵامدا دەڵێ: نا، نا، ئەوەندە ئەمن بزانم چەتە نەبووە.

سپاس بۆ کاک عەلی قازی و ژیان خانمی هاوسەریان کە ئەو وتووێژەیان دەگەڵ کردم.

## یای خورشید ڕەهبەر (هاوژینی کاپیتان)



یای خورشید ڕەهبەر کە بە (دایە خورشید) دەناسرا، هاوژینی کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچی بوو. لە بنەماڵەیەکی هەژار و دەستکورتی مەهاباد و لە ڕێکەوتی ٢ی خەرمانانی ساڵی ١٣٠١ی هەتاوی لەدایک دەبێ. دایکی ناوی «ئامین» و بابی ناوی «خەلیل» بووە کە بە «خەلیل مەزن» دەناسرا. دوو برای لە خۆی چکۆڵەتری هەبوو بە ناوەکانی «عەلی» و «مستەفا». تەمەنی دایە خورشید دەوری دە - یانزدە ساڵان بووە کە دایک و باوکی بە هۆی نەخۆشی دەمرن و منداڵەکان هەتیو و بێچاوەدێر دەمێننەوە. دایە خورشید دەیگێڕایەوە کە: (دوای مەرگی دایک و بابمان ئەوەندە گچکە بووین کە شەو دادەهات و تاریک دەبوو، دەترساین لە ژورەکەمان بنووین، بۆیە هەر سێکمان دەچووین لە تەندووری ماڵەکەماندا خۆمان دەشاردەوە. کاتێک کە ڕۆژ دەبۆوە و دەمانهەویست بێینە دەرێ، هەموو جارێ گیرمان دەکرد. ئەوەندە منداڵ بووین کە نەماندەزانی دەبێ یەک‌یەک لە تەندوورەکە بێینە دەرێ، هەرسێکمان بەیەکەوە هەڵدەستاین بەڵام جێمان نەدەبۆوە و لە زارکی تەندوورەکە گیرمان دەکرد. کە سەرکەوتوو نەدەبووین، دادەنیشتین تێر دەگریاین هەتا جیرانەکان بە هانامانەوە دەهاتن و یەک‌یەک ڕایاندەکێشاینە دەرێ). ماوەیەک ئاوا بە بێکەسی، نەداری و بێدەرەتانی ڕۆژ و شەوەکان تێپەر دەکەن. کاک حەمەد ئەو سەردەم کەسێکی لاو و ڕەبەن و هەروەها لەناو هاوتەمەنەکانی خۆیدا و لەناو چینی بێکەس و نەداردا خۆشەویست بووە. دەگەڵکوو چیرۆکی ئەو منداڵانە بە گوێی کاک حەمەد دەگا، خێرا خۆیان لێ بەخاوەن دەکات و باڵیان بەسەر دەکێشێ و دەبێتە پشت و پەنایان و لە بێکەسی دەریان دێنێ.

پاشان کە دایە خورشید دەگاتە تەمەنی ١٤ ساڵان، دەیخوازێت و ژیانی هاوبەشی پێکدێنن. بەرهەمی ئەو ژیانە سێ کچ و کوڕێک بوون بە ناوەکانی ئامین، خانە (بە ناسنامە ناوی

«عەبدولڕەحمان»ـە)، فاتم (بە ناسنامە ناوی «ئایشێ»یە) و «کافێ»یە. لەپاش کۆچ کردنی کاپیتان بۆ شۆڕەوی، ئەو ژنە قارەمانە لە دژوارترین دۆخدا، بە کڵاوچنین و پێچ بادان، منداڵەکانی گەورە کردووە. ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە گشت ملّك و باغەکانیان لەلایەن دەوڵەتەوە دەستی بەسەردا گیرابوو. دایە خورشید تا کۆتایی تەمەنی سەربەرزانە بە کاپیتان وەفادار مایەوە و منداڵەکانی پێگەیاند و دایمەزراندن. تەنانەت تا ئەوکاتە کە هەواڵی مەرگی کاپیتانیان پێدا، هەر چاوەڕوان بوو ڕۆژێک کاک حەمەد لە دەرگای ماڵەکەی وەژوور کەوێتەوە.

بەداخەوە لە دواساڵەکانی تەمەنیدا لە مەهاباد لەلایەن منداڵەکانییەوە زۆری کوێرەوەری و بێوەفایی دیتن و بەناچار ماوەیەک لە ماڵی کاک عەلی برای دەژیا و خزمەت کرا کە لە سابلاخ بە «عەلی یاوەر» دەناسرا. هەرکات دایە خورشید دڵی تەنگ دەبوو، ئاوا دڵداری خوشکی خۆی دەدایەوە و دەیگوت کە: خوشکێ گیان بۆخۆت دەزانی کە هەموومان قەرزداری کاکمین، ئێرە هیچ ماڵی خۆتە، ماڵی کاکیشمە.[1] دایە خورشید پاش ماوەیەک بە یەکجاری چوو بۆ سەردەشت و لە لای کچێکی بەناوی فاتم و زاواکەی بە ناوی کاک (عەبدوڵڵا شەمامی) نیشتەجێ بوو و ڕێزی لێگیرا. یای خورشید لە ڕێکەوتی ١٣٧٨/٨/٢٧هـ (١٩٩٩/١١/١٨ز)ـدا کۆچی داویی کرد و وەسییەتی کرد کە لە سەردەشت بینێژن و تەرمەکەی نەبەنەوە بۆ سابلاغ. ئێستا گڵکۆی ئەو ژنە کوردە، خۆشی نەدیو، خۆنەویست و بەشمەینەتە لە گۆڕستانی شاری سەردەشتە. ڕۆحیان شاد.



---

[1] ئەو خوشک و دوو برایە کاپیتانیان بە (کاکە بانگ دەکرد) ئەوە لە وەڵامی ئەو چاکانە بووە کە کاک حەمەد لەو ڕۆژە ئاستەمانەدا وەک کاکێکی گەورە بۆیان بووەتە سایە و سێبەر و پاراستوونی. تەنانەت دایە خورشید پاش ئەوەی شووی بە کاپیتان کرد، "کاک حەمەد"ی لە زاران نەکەوت.

## عومەر ناجی



عومەر ناجی (Ömer Naci) لە ئەسڵدا لە تورکە «چەرکەس»ـەکانی لای قەفقازە و لە تایفەی «جانخوت -canhut Jankhot»ـە. لەبەر شەڕە درێژخایەنەکانی نێوان قەیسەری ڕووس و سوڵتانیی عوسمانی تایفەکەیان کۆچ دەکەن بەرەوە سنوورەکانی تورکیەی ئەمڕۆ. لە ساڵی ١٨٧٨ز لە شاری بورسا لەدایک دەبێ بەڵام هەندێک سەرچاوە کە دەڵێن لە ئیستانبوڵ لەدایک بووە.

کە مێرمنداڵێک دەبێ هەموو بنەماڵەکەی لەدەست دەدات و لەلایەن یەک لە بەرپرسانی شارەکەیان وەک عەولادی خۆی هەڵیدەگرێتەوە و ڕۆی دەنێتە خوێندنێ. کە کەمێک گەورە دەبێ دەگەڵ بنەماڵەکەی زڕبابی کە کاربەدەستی دەوڵەتی عوسمانی دەبێ، بار دەکەن بۆ بەغدا. لەوێ مامۆستای تایبەتی بۆ دەگیرێت و زمانەکانی عەرەبی و فارسی و فەڕانسە بەباشی فێر دەکات. زۆری حەز لە وێژەی تورکی بووە و دەگەڵ شێعر و کتێب نێوانی خۆش بووە. پاشان دەینێرنەوە بۆ بورسا تا لە کۆلێجی سەربازی ئەو شارەدا زانستی سەربازی فێر بێ. لەناو کۆمەڵدا بە کەسێکی دڕ و شەڕانی بەناوبانگ بووە. وەک لە بەڵگەکاندا دەردەکەوێ کەسێک بووە کە لە قسەکردن و لێدواندا زۆر بەتوانا بووە و توانیویەتی کە کاریگەری لەسەر خەڵکدا بنێ. بەردەوام شێعر و وتارەکانی لە ڕۆژنامە گەورەکان وەک ١٨٩٩ Musavver Fen ve Edebiyat dergisinde، Servet-i Fünûn، Vatan، Hürriyet، Cemiyet، Çocuk Bahçesi چاپ دەکرا.

دەگەڵ مستەفا کەماڵ (ئەتاتورک) لە زانکۆی سەربازیی «بورسا» ئاشنا دەبن و ئەو یەکترناسینە لە داهاتووی ئیمپێراتورییەتی عوسمانی و پاشان تورکیە و تەنانەت ناوچەکەشدا ڕۆڵی خۆی

دەگیرێ. یەکەمجار لە ڕۆژی ١٠-٠٢-١٩٠٢ لەناو ئەرتەشدا دادەمزرێ و لە ساڵی ١٩٠٣ بەرێدەکرێ بۆ Üsküp و PreŞova لە باڵکان. هەر لەوێ دەگەڵ «ئامینە»ـی ١٧ ساڵان و کچی فەرماندەکەی خۆی ئاشنا دەبێ و دەیخوازێت. لە ساڵی ١٩٠٧ بە هۆی نووسینی وتارێک لە ڕۆژنامەدا هەڕەشەی لێکرا و هەڵدێتە پاریس و خۆی حەشار دەدات. لەوێ دەگەڵ کۆمیتەی ئیتیحاد و تەرەقی ( Ittihad ve Terakki) یا هەمان تورکە ڕەگەزپەرستەکان کە مستەفاکەماڵ و هاورێکانی بوون، پێوەندی دەگەڵ دەگیرێت و تێکەڵیان دەبێ و بە هۆی ئەوە کە قسەزانی باش بووە کردوویانە وتەبێژی کۆمیتەکەیان.

لەپاش ڕووداوەکانی پێش ڕووخانی ئیمپڕاتوریەتی عوسمانی و لاوازبوونی ئەو زلهێزە هاورێکانی لە کۆمیتەی ئیتیحاد و تەڕەقی کاری بۆ دەکەن و کێشەکانی بۆ چارەسەر دەکەن و دەگەڕێتەوە تورکیە. لە ساڵی ١٩١٠ی زایینی وەک کاندیدی پارتی ئیتیحاد و تەرەقی بۆ مەجلیس یا پارڵەمانی ئەوکات هەڵبژێردرا و دەستی کرد بە کاری سیاسی. تەنانەت وەک وەزیر ناویان دەهێنا. بەڵام ئەو خۆی نەیویستووە کاری سیاسی بکات چونکە، زیاتر خوو و خدەی شەڕخوازانەی هەبووە و پێیخۆشبووە سەرباز بمێنێتەوە و لە بەرەکانی شەڕدا بێ.

لە زۆربەی ناوچەکانی ژێر چەپۆکی عوسمانییەکاندا وەک قەفقاز، ترابلۆس، ئێران و باڵکان شەڕی کردووە. دە شەڕی دەگەڵ ئیتالیاییەکاندا بەشدار بووە، هەروەها بە داگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە موسڵ، جزیرە (گوندی هەزەک) و دیاربەکر کوردی کۆمەڵکوژ کردووە و دەستی لە کەس نەپاراستووە. چەشنی داعش سەری کوردانی بڕیوە و لە ناو چەقی شار و گوندەکان دا هەڵیهاوەسیون و کوردی پێ چاوترسێن کردووە. لە ڕێکەوتی ٠٤-٠١-١٩١٥ وەک خۆبەخش لەلایەن تەلعەت پاشا وەزیری کاروباری ناوخۆوە ئەمری پێدەکرێت کە سنووری ئێران ببەزێنێت و خەڵکی کورد و ئازەری ئەو وڵاتە دژی ڕووسەکان ڕێک بخات. لە درێژەی ئەو چالاکییەیدا هەرکەس دژی وەستابا، لەسێدارەی دەدا. لە گەرمەی شەڕی ڕووس و عوسمانی دەگاتە ئێران و ناوچەی کوردستان و ئازەربەیجان. تەنانەت لە ئازەربەیجان پشتیوانییەکی زۆر کۆدەکاتەوە بۆ بزووتنەوەی (مشروطه خواهی). بە هۆی خۆتێهەڵقوتانی لە کاروباری ئێرانییەکان دەیگرن و وەک دەڵێن بە سێدارە حوکم دەدرێت، بەڵام بە سەرکەوتنی بزووتنەوەکە دەرگای زیندانی بۆ دەکرێتەوە و ڕزگاری دەبێ. ئیتر لەوساوە وەک فەرماندەی شەڕەکانی ڕۆژهەڵاتی سنوورەکانی عوسمانی دەگەڵ ڕووسەکان دێتەوە مەیدان.

لە ساڵی ١٩١٢ لە دەڤەری ئەرزڕووم و ئەرزینجان بە بیانووی جیهاد بۆ ئیسلام هێزێکی زۆر لە عەشیرەتە کوردەکان کۆ دەکاتەوە. ئەو کوردانەی دەگەڵی نەکەوتوون هەر لەوێ سەری پەڕاندوون و کوشتوونی. ئیتر هەر بەو هێزەوە دادەگەڕێتە باقی خاکی کوردستان و لە دیاربەکر ڕا تا موسل، هەولێر، ڕواندز، سلێمانی و موکریان کوردەکان فریو دەدات و شەڕی دەوڵەتی عوسمانییان

پێدەکات و بەکوشتیان دەدات.[1] شێخ بابا سەعیدی و حەمە حوسێن خانی سەرداری موکری کە دوو لە پیاوە هەڵکەوتووەکانی کورد بوون لە موکریان، لەبەر ئەوەی فریوی قسەی ئەویان نەخوارد و ئەو شەڕەیان بۆ ئیسلام نەزانی، لەجێوە بە هۆڤانەترین شێوە کوشتنی.

ئەو کوردکوژە لە ڕێکەوتی ٢٩ی مانگی تەموزی ساڵی ١٩١٦ (ڕۆژی شەممۆ ٧ی مانگی ڕەزبەری ساڵی ١٢٩٥) لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا بە هۆی نەخۆشی تیفووس دەمرێت و لە شاری کەرکوک دەینێژن.

لەسەر ئەو کوردکوژە زانیاری زۆر هەیە بەڵام لەبەر نەبوونی دەرفەت بۆم نەلواوە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەم. هیوادرام لە داهاتوودا ئەو هەڵە ڕاو بکەم تا بتوانم بەو کارە چاوی نەتەوەکەم زیاتر بکەمەوە تا دوژمنی خۆی بناسێ و فریوی داو و دەوهۆیان نەخوات. ناوی ئەو کتێبەم لە پەڕاوێزی ژێرەوە داناوە و کە هیوادرام شارەزایانی مێژوو و زمانی تورکی، شەنوکەوی کەن و بیکەنە کوردی.

---

[1] لە کتێبی: (مەفرەزەکەی عومەر ناجی) ÖMER NACİ BEY MÜFREZESİ دا، نووسینی Yrd.Doç.Dr. Sadık SARISAMAN و لە لاپەڕەی ٥٠٧ ڕا زۆر بە وردی باس لەو شەڕانە دەکات کە لە ناوچەی موکریان و بەتایبەت لە سابڵاغ و دەوروبەری ڕوویانداوە کە بە فەرماندەیی عومەر ناجی کراوە. تەنانەت باسی ئەو عەشیرەتانەش دەکات کە هێزیان داوەتە عومەر ناجی.

## کۆنسوولی ڕووسیە لە سابڵاغ (ئالێکساندێر ئییاس)



ئەو کۆنسولە کەسێک بوو بەناوی ئالێکساندێر ئیڤانۆڤیچ ئییاس ( Iyas, Alexander Ivanovitch 1869-1914). خۆی بە ڕەچەڵەک خەڵکی فینلاندییە و لە ٢٧ی سێپتامبری ساڵی ١٨٦٩یە لە شاری (لۆڤیسا)ی ئەو وڵاتە لەدایک بووە. هەم خوێندنی لە ئاکادێمی سەربازی تەواو کردووە و هەمیش لە کۆرسی زمانە ڕۆژهەڵاتیەکانی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیا خوێندکار بووە. جیا لە زمانەکانی فینلاندی، ڕووسی و سوئێدی، شارەزاییەکی باشیشی لە زمانەکانی ئاڵمانی، ئینگلیسی، فەرانسی، لەهێستانی، فارسی، تورکی، ئازەری و کوردیدا (کرمانجی) هەبووە. بۆ قەیسەری ڕووسان لە زۆر شوێن خزمەتی کردووە بەڵام لە ساڵی ١٩٠١ـەوە بە فەرمی وەک دیپلۆماتێکی بەئەزموون لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئێراندا ئەرکەکانی ڕاپەڕاندووە. لە سالی ١٩١٢ وەک سەرکۆنسولی کۆنسولگەریی ڕووسیا لە سابڵاغ درێژە بە کارەکانی خۆی دەدات. لە مانگی دێسامبری ساڵی ١٩١٤ دا بە فیتی جیهادیی خەلیفەی عوسمانی، خەڵکی توندئاژۆی ئایینی کە سێمپاتییەکی زۆریان هەبوو بۆ بابی عالی و خەلیفەی عوسمانی، هان دران تا ئەو کۆنسوولەی لە مەهاباد بگرن و هەم سەری ببڕن و هەم ژن و منداڵەکەی ئەتک بکەن. (ئییاس ژن و منداڵی نەبوو). ئەوە لە حاڵێک دایە کە هێزێکی تورکان لە سابڵاغ بوون و دەگەڵ عرووسان لە شەڕدا بوون. ئالێکساندێر ئییاس لە ترسی گیانی خۆی لە سابلاغ ڕای کرد و هەڵاتە میاندواو و لە ڕۆژی ٢٩ی هەمان ساڵ و هەمان مانگدا دەگیرێت و دەیکوژن. ڕوون نییە کە لە میاندواو کێ ئییاسی کوشت؟ سەرەداوەکان ناوی «سەمەد خانی شوجاعودەولەی مەراغەیی» دێنن کە پێشتر لە قەفقاز ژیاوە و

بۆ پشتیوانی لە شەڕی عوسمانییەکان گەڕاوەتەوە ناوچەکە و بە فیتی عوسمانییەکان سەری ئەو کۆنسووڵە دەبڕێ. بۆ ئەوەی بەسەر کوردەکانی دابێنن سەرە بڕواوەکەی دەبەنەوە بۆ سابڵاغ و لەبەردەرکی ماڵی قازی فەتاح کە گەورەپیاوی مەهاباد بوو بەجێدەهێڵن. ئیتر هەندێک لەو خەڵکەی سابڵاغ کە دڵیان بە فەرمانی جیهادی بابی عالی خۆش بوو و لە گەمەی بابی عالی و هێزی عوسمانییەکان بێخەبەر بوون، خۆشحاڵی خۆیان لەو قەتڵە دەردەبڕن. بە پێی ئەو زانیارییانە کە یەک لە خزمەکانی ئیاس بە ناوی «جان چالێنکۆ» لە کتێبی ( IMAGES FROM THE ENDGAME; Persia through a Russian Lens ١٩٠١-١٩١٤)دا باسی دەکات ئەو نێگاتیڤ و بەڵگانەی کە لە کتێبەکەیدا چاپی کردوون، ئی کۆنسوولی کوژراوی ڕووسیەی تیزاری لە سابڵاغ ئالێکساندێر ئیڤانۆڤیچ ئیاس بوون کە لە شەڕێکی سپای ڕووس دەگەڵ سپای عوسمانییەکان، لەناو شمەکی فەرماندەیەکی گەورە و کوژراوی عوسمانییەکاندا دۆزراوەتەوە کە ئەوە زیاتر قامکی تاوان بۆ کوشتنی ئەو کۆنسووڵە بۆ تورک و ئازەرییەکان ڕادەکێشێ و زیاتر دەردەکەوێ کە بە دەهۆ بەسەر کوردیان داهێناوە تا شەڕەکە لە خۆیان دوور بکەنەوە. بەداخەوە لە سابڵاغ هەندێک کەس زۆر بێڕێزی بە سەریی ئیاس دەکەن. لە ڕاستەی مەیدانی مەنگوڕان، گەمەی پیدەکەن و وەبەر شەققانی دەدەن و بۆ ماوەیەک لە چەقی شار هەڵیداوەسن. ئەو ڕووداوە وا لە لەشکری ڕووسییەی تیزاری دەکات تا لە ڕۆژی جێژنی مەولودی لە ١٢ی ربیع‌الاول ساڵی ١٣٣٤ی مانگیی و ١٢٩٤ی هەتاوی و (١٨-١-١٩١٦) هێرش بکاتە سەر شاری سابڵاغ - مەهاباد و زیاتر لە ٩٠٠٠ کەس ڕەشەکوژ بکرێ.



وێنەی ئەمر شێخ‌بابا سەعید بەرزنجی (غەوس‌ئاباد) و هەندێک لە خزم و موریدانی، دەگەڵ کۆنسوولی ڕووسییەی تیزاری لە سابڵاغ ئێلێکساندر ئیڤانۆڤیچ ئیاس. ئەو وێنەیە لە گوندی غەوس‌ئاباد گیراوە.

## شێخ بابا سەعیدی (بەرزنجی - شێخ گوڵباب - غەوسابات - صدرالسادات).



ئەمر شێخ‌بابا سەعیدی بەرزنجی (غەوس‌ئاباد) ناسراو بە (صدرالسادات) دەگەڵ شێخ فەخرەددینی برای ناسراو بە (فخرالسادات) "راوەستاو"

شێخ بابا سەعیدی بەرزنجی غەوساباتی، ناسراو بە (صدرالسادات) ناودێر بە (شێخ گوڵباب یا شێخ بابا)، ساڵی ۱۸۵۸ز لە گوندی غەوساباتی سەر بە مەهاباد (ئێستا سەر بە بۆکانە) لەدایک بووە. بنەچەیان بە خزمایەتی دەگاتەوە سەر کۆلکەی شێخەکانی بەرزنجی و بەتایبەت پاشای کوردستان، شێخ مەحمودی نەمر.

زانایەکی ئایینی، ڕووناکبیر و ڕووناکبێژی زەمەنی خۆی بووە. باوەڕی بە گەشەی زانست و خوێندن بووە و بۆ ئەو مەبەسەتەش بەغدا، ئەلئەزهەری میسر و هیندووستانی بەسەر دەکاتەوە و لەو سەفەرانەشیدا شارەزاییەکی باش لە زانستەکانی پزیشکی، ئیلاهی، ئەستێرەناسی، بیرکاری و دەرمانسازی کۆدەکاتەوە و لە شێعر و وێژەش دا دەستی باڵای هەبووە. شەهید شێخ گوڵباب شارەزایی تەواوی لەسەر چەند زمان هەبووە کە توانیوێتی بە ڕەوانی قسەیان پیبکات و پییان بنووسێت و وەریانگێڕێ. ئەو مرۆڤە ئایینییە کە بەپێچەوانەی باوەڕی ئەوسەردەمی پیاوانی ئایینی، کە زمانەکانی غەیرە عەرەبییان بە زمانی کافران پێناسە دەکرد و فیربوونی ئەو زمانانەیان بە حەرام دادەنا، بەڵام بەڕێزیان بەپێچەوانە بیری دەکردەوە و فێربوونی زمانی بێگانان وەک کردنەوەی دەرگای سەرکەوتن و گەشەی گەل و ئیسلام پێناسە دەکرد و لەو پێناوەشدا خۆی فێری زمانەکانی عەرەبی، فەڕانسەوی، هیندی، فارسی، ترکیی ئازەری و ئیستانبووڵی کردبوو. لێزانین و شارەزایی شێخ بابای غەوساباتی لە زماندا گەیبوویە ئەو ئاستە کە کتێبی "قانوون" لە (ابو علی سینا) کە بە زمانی عەرەبی بووە و هەروەها، کتێبیکی دوو بەرگی بەناوی "طب فرنگی" کە بە زمانی فەڕانسەوی بووە، وەریانگێڕێتە سەر زمانی فارسی.

شەهید صدرالسادات لە غەوسابات، یەکەمین دەرمانخانەی (دارالشفاء) لەسەر ئەساسی زانستیی ئەوکات کردەوە و بەبێبەرامبەر دەرمانی خەڵکی نەخۆشیی دەکرد. ئەوکات کە نەخۆشیی "گوولی" زۆر بووە، بەرێزیان بۆ کۆکردنەوەی زانستی زیاتر لەمەر ئەم نەخۆشییە، سەفەری هیندووستان دەکات تا بتوانێ لە ئازار و دەردەکانی ئەو نەخۆشانەی کوردستان کەم کاتەوە. کە لە سەفەرەکەش هاتەوە ناوەندێکی پزیشکی لەسەر حیسابی و خەرجی خۆی دەکاتەوە کە تایبەت بووە بە چارەسەرکردنی نەخۆشیی گوولی. یەک لە کارە هەرە گرینگ و بەرچاوەکانی صدرالسادات، دامەزراندی ناوەندێک بوو بەناوی (قەلەندەرخانە) کە لەوێدا هەوڵی دەدا ئەو شوێنە بکات بە ماڵی ئەو لێقەوماو و برسی و نەدار و بەلەنگازانە کە بێکەس و بێشوێن بوون. شێخبابا لەو ماوە کەمەی تەمنی پڕ لە شانازییاندا، یەک لەو دەگمەن پیاوە ئایینییانە بووە کە باوەڕی بە جیایی دین لە سیاسەت بووە. لەسەر ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە بان باس کران، بەردەوام بەردەنگی بەرپرسە غەوارەکان بووە و لەلایەن نوێنەرانی وڵاتانەوە ڕاوێژی پێکراوە و حیساب بۆ قسەی کراوە. یەک لەو دەگمەن زانا ئایینییانە بووە کە دژی پاوانخوازی و داگیرکاری عوسمانییەکان هەڵوێستی گرت کە لەژێر ئاڵای ئیسلام و جیهادەوە، شەڕی پەرەپێدانی دەستەڵاتی بابی عالی و خەلیفەکانی عوسمانییان دەدا. لە گەرمەی شەری قەیسەری ڕووس و تورکی عوسمانیدا، بەشی هەرەزۆری ئەو شێخ و مەلا و پیاوە ئایینییەکانی ئەو سەردەم، هانی خەڵکی کوردیان دەدا شەر بۆ لەشکری عوسمانی بکەن بەڵام، شێخ بابا یەک لەو دڵسۆزانەی گەل و کوردستان بوو کە هاووڵاتیانی ئاگادار دەکردەوە کە ئەو شەڕە بۆ ئیسلام نییە بەڵکوو، بۆ داگیرکردنی وڵاتیانە و لایەنەکانی شەڕ درۆ دەکەن و لە هەست، گیان و شعووری ئەو میللەتە بۆ بەرژەوەندی خۆیان کەڵک وەردەگرن.

(بازیل نیکیتین) باڵوێزی ئەوکاتی کۆنسوولی عرووسان، لە پەرتووکی (ایرانی کە من میشناختم) دا دەڵێ: کاتێک لەشکری تورکان هێرشیان هێنا، خۆم گەیاندە ناوچەی ساوجوبڵاغ (سابڵاغ/مەهاباد) و چوومە خزمەت دانیشمەند و زانا، شێخبابا و داوام لێکرد کە ئەو خەڵکە ئاگادار بکاتەوە کە خۆیان بەدوور بگرن لەو شەڕە و فریوی درۆ و گزەی تورکان نەخۆن و بێلایەن بمێننەوە، لە وەڵامدا شێخبابا فەرمووی:

**«بەداخەوە من بەتەنیا ناتوانم پێش بە نەزانیی بگرم.**

هاندانی خەڵک بۆ تێوەنەگلان لەو شەڕە و هەڵوێستگرتن لە بەرامبەر جیهادی خەلیفەی عوسمانی وای کرد تا لە ساڵی ١٩١٥ بگیرێت و پاشان لە گوندی "کەرێزەی گڵی" لە نیزیک شاری بۆکان بە فەرمانی فەرماندەی لەشکری تورکان، (عومەر ناجی بەی - بەگ)، ئەو زانا و بلیمەتە، ئەو دڵسۆزەی خاک و نیشتمان لەسێدارە بدرێت. دیارە لەسەر ئەو مرۆڤە مەزنە و ئەو زانا و بلیمەتە چ لەلایەن مێژوونووسانی بێگانە و چ بە خامەی نووسەرانی کورد، ئەوەندە نووسراوە هەیە کە وەچەی داهاتوومان سەهلە، گەلانی تریش لە هەبوونی وەها مرۆڤدۆست و زانایەک ئاگادارییان هەبێت و شانازیی پێبکەن. مامۆستای نەمر، هەژار موکریانی لە مەدحی گەورەیی ئەو زانایەی کورددا ئاوا دەفەرموێ:

گیانی خۆی داوە بە تۆ شێخبابا *** باوی خۆشی بوو ئەگەر ئەو مابا.

لەم دواییانەشدا یەک لە نەوەکانی ئەو بنەماڵە سەربەرزە بە ناوی کاک (سەید مەسعود سەعیدی) پاشی ماندووبوون و زەحمەتکێشانی زۆر، توانیوێتە بەپێی بەڵگە و سەرچاوەکان، هەروەها وەک مێژوویەکی زارەکی لەو کەسانەی کە لەنیزیکەوە ئاگاداری ژیانی صدرالسادات بوون، کتێبێک ئامادە بکات بەناوی: (زندگینامەی عارف شهید، حضرت شیخ بابا سعیدی برزنجی).

ڕۆحی جەنابی صدرالسادات شاد و یادیان هەرمان.

بڕواننە ئەم سەرچاوانە:

١)- (زندگینامەی عارف شهید، حضرت شیخ بابا سعیدی برزنجی) لەلایەن بەڕیز (سەید مەسعود سەعیدی) نووسراوەتەوە.

٢)- مێژووی ئەدەبی کوردی - نووسینی عەلائەدین سەجادی - چاپی عێراق - لاپەڕەی ٥٤٩

٣)- ساوجبلاغ مکری (مهاباد در آینیه اسناد تاریخی) نووسینی: فریدون حکیمزادە، ل: ٤١،٤٢، ٦٣٥،٤٠



وێنەی ئەمر شێخ بابا سەعیدی بەرزنجی (صدرالسادات) دەگەڵ تاقمێک لە موریدانی و خزم و خەڵکی قەڵەندەرخانە لە گوندی غەوسابات

## شێخی بورهان

خوالێخۆشبوو شێخی بورهانی بە ئەسڵ ناویی «یۆسف» بووە. بنەماڵەکەیان بە ڕەچەڵەک خەڵکی «ماوەت» لە باشووری کوردستان بوونە. کۆچ دەکەن بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە گوندی «سێلۆێ» لە محاڵی مامەش لەدایک دەبێ. قۆناغەکانی سەرەتایی خوێندنی ئیلاهیات لە ناوچەی مامەشان تەواو دەکات. پاشان بۆ گەشەی زانستەکەی دەچێتە «تەوێڵە» لای شێخی گەورەی نەقشبەندی کە کەسێکی شارەزا بووە لە زانستەکانی سەردەم و باوەڕی بە گەشەی زانستی هەبووە لە کۆمەڵگادا. لەپاش تەواوکردنی خوێندن لە تەوێڵە، کۆچ دەکات و دێت بۆ ناوچەی سابڵاغ و لەپێشدا لە گوندێک بەناوی «عیساکەند» نیشتەجێ دەبێت. ئەوجار لە نێوان مەهاباد و بۆکان لە گوندی «بورهان» نیشتەجێ دەبێ و خانەقای لێ دادەنێ و وانەی زانستی ئیلاهیات و ئایین بە تینووانی ئەو زانستە دەڵێتەوە. تا پێش هاتنی بۆ بورهان خەڵک بە «مەلا وسوو» دەیانناسی، ئیتر لەوکاتەوە کە دێت بۆ بورهان، خەڵک لە زانست و خوداپەرەستی ئەو بەڕێزە تێدەگەن، بە «شێخی بورهان» ناوبانگ دەردەکات.

ئینجا کۆچ دەکات بۆ شوێنێکی تر و ئاوەدانی دەکاتەوە و خانەقای لێدادەنێ کە بە گوندی «خانەقا» ناودێرە کە ٨ کیلۆمیترێک لە بورهان دوورە. لە دەقە مێژوویەکاندا ئەو گوندە وەک زانکۆیەکی جێی مەتمانە و دەوڵەمەند لە بواری زانستییەوە ناوبانگی هەبووە. لە هیندوستان و ئەفغانستانەوە تا دەگاتە ئاسیای سەغیر و وڵاتانە عەرەبی، خوێنکاری هەبووە. گەورە پیاوانی وەک پێشەوا قازی محەممەد، سەیفولقوزات، هێمن و هەژار خوێندکاری خانەقا بوون.

شێخی بورهان هەرچەند خۆی بە ڕێبواری تەریقەتی «نەقشبەندییە» دەزانی بەڵام فەلسەفەیەکی پێشکەوتنخوازانەشی هەبووە و یەک لە ڕووناکبیرانی سەردەمی خۆی بووە باوەڕی وا بووە کە بۆ گەیشتن بە پلە و پایەی شێخایەتی زانست کۆ بکەیەوە و بگەی بە مەقامی تەسەووف یا عێرفانی و بە دڵ لە خودا نیزیک ببێەوە بۆیە، باوەڕی بە جێنشین نەبووە. ئەو کە خاوەنی ١١ کوڕ بووە، نەیهێشتووە کوڕەکانی شێخایەتی بکەن ئیتر لە دوای خۆیەوە شێخایەتی لە وەچەیاندا بڕاوەتەوە. هەروەها گشت مڵک و ماڵی خۆی لە خانەقا پێشکەش بە گەل کرد و نەیدا بە منداڵەکانی واتە (وقف)ی کرد. گڵکۆی شێخی بورهان هەر لە گوندی خانەقا تەسلیم بە خاک دەکرێت و ئێستا بە مەرقەدی شێخی بورهان ناسراوە و بووەتە جێیەکی پیرۆز و خەڵک لە شوێنی دوور و نیزیکەوە بۆ ڕێزلێنان لە دنیایەک خزمەتی گەورە کە بە خەڵکەکەی خۆی کرد، سەردانی ئەو مەرقەدە دەکەن و فاتیحای بۆ دادەدەن.

وەچەی ئەو زانایە لە ناوچەکەدا بە چەند ناو دەناسرێنەوە: شەمسی بورهان، شەمسەدینی، سێپێهرەدین یا (خوانچە سێپێهرەدین). شێخ عەبدولڕەحیم شەمسەدینی یەک لە کوڕەکانی

خوالێخۆشبوو شێخی بورهان بووە. لە ساڵی ١٣٤٥ هەتاوی کۆچیدوایی کردووە. خزمەکانی دەڵێن کە نیزیک بە ٩٠ ساڵ ژیاوە و هەر لە گوندی خانەقای بە خاک ئەسپێردراوە.

سپاس بۆ کاک تورەج شەمسی بورهان کە لە ئامادەکردنی ئەو کورتە ژیاننامەیەدا یارمەتییان دام.



گوندی خانەقا - ساڵی (١٣٣٥ﻫ - ١٩٥٦ز) لە چەپەوە: شێخ عەبدولڕەحیم ٢- شێخ حەسەن(کوڕەکانی شێخی بورهان) هەروەها ئەو کەسەی لە پەشت سەری شێخ ڕەحیم دیارە، میرزا "فەتاح فەتاحی قازی"یە و ئەو کەسەی پشت سەری شێخ حەسەنیش "میرزا حوسێن فەتاحی قازی"یە ٣- مەلا فەتاح (کوڕی شێخ عەبدولڕەحیم) ٤- میرزا عەبدولڕەحمانی جەوانمەردی قازی (مشهور بە سالاری موکری و کوڕی قازی فەتاح) ٥- سەید حەسەن شێخولئیسلامی موکری (باوکی مامۆستا هێمن موکریانی) ٦- میرزا خەلیل فەتاحی قازی (کوڕی میرزا ڕەسوڵی باخچە)

## وەستا حەسەن و وەستا حەمەدەمینی مێعمار


وەستا حەمەدەمینی مێعماری ئازەر

وەستا «حەسەنی مێعماری ئازەر» کە وەستا حەسەنی مێعمار دەناسرێ، لە ئەسڵدا خەڵکی شاری سنە و لەدایکبووی گەڕەکی قەتارچیان بووە. هەر لەوێش دەگەڵ یای «کشوەر لەلاهی» زەماوەند دەکات. بەرهەمی ئەم هاوژینییە دوو کوڕە. کوڕی گەورەی ناوی «مەحەممەد ئەمین» و کوڕی بچووکی ناوی «حاجی» دەبێت. وەستا حەسەن وەک مێعمارێکی ناسراوی سنە دەبێت. لە دەیان کاری بیناسازی لەو شارەدا دەستیان هەبووە. یەکیان مزگەوتی جامیعەی سنەیە کە لە سەردەمی ڕەزا شادا ساز کرا. پاشان بەرەو موکریان کۆچ دەکات. هەم لە سەقز هەم لە بۆکان بە تایبەت لە نوێژەن کردنەوەی قەڵای سەرداری بۆکان بەشدار بووە. لە سابڵاغ یەکەم کاری لە کاروانسرای سابڵاغ دەبێت. پاشان مێعمار و بەرپرسیاری سازکردنی پادگانی کۆنی سابڵاغە لە جێگای ئێستای ئیدارەی دوخانیات.

کشوەر خانمی هاوژینی لە سابڵاغ بەسەر منداڵەوە دەچێ و گیان دەدات و لە گۆرستانی کۆنی سابڵاغ ئەسپاردەی خاک دەکرێت کە دەکەوتە داوێنی کێوی داشامەجید لە مەهاباد. پاشان وەستا حسن لە سابڵاغ «زلەخا خانمی کاکی» دەخوازێت و پاش ماوەیەک بە خاو و خێزانەوە ڕوو لە شاری سلێمانی دەکا و هەر لەویش کۆچیدوایی دەکات. لە کوڕەکانی وەستا حەسەن، مەحممەد ئەمین دەگەڕێتەوە بۆ سابڵاغ و بە «وەستا حەمەدەمینی مێعمار» یا «مێعماری ئازەر» ناسراوە و شوێن پنجەی لە زۆر شوێنی سابڵاغ هەییە و زۆر جێگای متمانەی «وەرەهرام»، فەرماندار سەربازیی سابڵاغ بووە. کورەکەی تری وەستا حەسەن بە ناوی «حاجی» هەر لە سلێمانی دەمێنێتەوە و دەبێتە دارتاشێکی بەناوبانگی ئەو شارە و ئێستاش زۆر لە هاوشارییانی بەتەمەنی سلێمانی لەبیریانە. کاک حاجی خاوەنی پێنج کوڕ و دوو کچ بووە. کوڕێکی لە سەر کۆڵکەی بنەماڵەکەیانەوە گراوەتەوە شاری سنە و لە زانکۆی سنە مامۆستایە.

سپاس لە یای ئەسمەر مێعماری ئازەر کچی خوالێخۆشبوو وەستا حەمەدەمینی مێعمار و کاک دیلان سەعیدی دەکەم کە بۆ ئەو دێڕانە یارمەتییان دام.

## میرزا مەحموود عەزیزمی



مەحموود عەزیزمی کوڕی وەستا مەجیدی خەیات (بەرگدروو)یە بە پێی کارتی پێناسەکەی ساڵی ١٢٧٥ه (١٨٩٦ز) و لە شاری ساوجوبڵاغی موکری واتە مەهابادی ئێستا و لە گەڕەکی حاج حەسەن لەدایک بووە. بنەماڵەکەیان قەڕەباڵغ بووە، دەگەڵ بنەماڵەی مامیی بەناوی خوالێخۆشبوو «عەزیم» کە ٥ کوڕ و کچێکی هەبووە و ئەویش بەرگدروو بووە، هەموویان دەگەڵ یەکتر دەژین، بەڵام لە ٣ خانووی دیواربەدیواردا کە ڕێژەیان ٤٠ بۆ ٥٠ کەس دەبوون. مامە عەزیمیی لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانی و لە کۆمەڵکوژییەکەی سابڵاغ کە لەلایەن هێزەکانی ڕووسیبەی تێزاری کرا، دەکوژرێت. لەپاش مەرگی ئەو دوو برایە (مەجید و عەزیم) کوڕەکانیان تا ساڵەکانی دەیەی ١٣٤٠ی هەتاوی بەوپەڕی لێهاتوویی لەسەر ئەو پیشەیە بەردەوام دەبن کە عەبدوڵڵا عەزیزمی بە بەرگدروویەکی هەرە بەناوبانگی مەهاباد دەناسرا. باقی ئەندامانی تری ئەو بنەماڵەیە کە کارەکانی زانستی و کولتووری و ئەدەبیدا چالاک بوون و خاوەن ڕێزێکی تایبەتی بوون لەناو کۆمەڵگای خۆیاندا. مەحموود پاش خڕۆکەبوونی لە مەکتەبخانەکانی سەردەمی قاجار و لەبەردەستی مامۆستایانی بەرزی وەک مامۆستا مەلا عەبدولڕەحیمی سابڵاغی (مامۆستا وەفایی) وەبەر خوێندنی دەنێن. سەرەتا بە کتێبەکانی «بوستان و گلستان» لە سەعدی شیرازی و هەروەها بە ڕێنووسی تایبەتیی قەدیمی فێری خوێندن و نووسین دەبێت. پاشان کە ڕەزاشا دێتە سەر حوکم لە خوێندنگای ژمارە ٤٠ کە تایبەت بە بەساڵاچووان بووە و مامۆستا «عەلی مەحموودی» بەڕێوبەریی بووە، دەتوانێ بڕوانامە وەربگرێت بە ژمارە ٣٩٢ و بە ڕێکەوتی ١٣١٨ی هەتاوی. میرزا مەحموود کە بەردەوام بەهۆی خوێندەوە و موتاڵاکردن لە وێژەی فارسی و هەروەها لە دونیای شێعری کوردیدا وەک نالی و وەفایی و ...، شارەزایی باشی پەیدا کردبوو بۆیە زیاتر بە گفتە شیرنەکەی بەناوبانگ بووە کە لە قسەکانیدا هەمیشە شێعرە کوردی و فارسییەکانی تێکەڵ دەکرد و پەیامی دڵی خۆی دەگەیاند. بەهۆی مەرگی هاوسەرەکانی ناچار دەبێ چەند جارێک ژن بخوازێ. بەهۆی کۆمەڵە ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی وەک شۆڕشەکەی شێخ

عوبەیدوڵڵای نەهری (شەمزینی)(١٨٣٠-١٨٨٣) ، شەڕی ڕووسەکان و عوسمانییەکان، هێرش و حکومەتداری سمایل ئاغای لە مەهاباد، سێڵاوی ساڵی ١٣١٥ و ڕووداوەکانی سەردەمی کۆماری کوردستان ناچار بووە بەپێی دۆخی سەردەم بەردەوام پیشە بگۆڕێت، بەتایبەت لە سەردەمی ڕەزاشادا بەرپرسی ئارد و خەڵە و نانی لەشکری دەوڵەت بووە لە ناوچەکە کە هاوکارییەکی باشی هەبوو دەگەڵ باقی بازاڕییان لە مەیدانی ئاردی ئەو شارە. لەپاش مەرگی یای زارای هاوسەریان لە ساڵی ١٣٢١ی هەتاوی، سەرنجێکی تایبەتی دەدات بە تاقە کوڕەکەی بەڕێز «شەریف عەزیمی». وەک کاک شەریف دەفەرموێ یەک لە هۆکارەکانی بەختەوەرییم ئەوەیە کە لەبن دەستی ئەو بابە مێهرەبانەدا پەروەردە بووم.

بەداخەوە مۆمی تەمەنی میرزا مەحموود عەزیمی لە ڕێکەوتی ٩-٨-١٣٥٩ی هەتاوی لە شاری «گنبد کاوس» لە باکووری ئێران دەکوژێتەوە. ڕێک لە کاتێکدا کە کاک شەریف لەو شارە دادوەری دادگا بووە (دادستان) و لەوێ کاک شەریف خزمەتی باوکی پیری خۆی کردووە. ڕۆحیان شاد و یادیان هەرمان سپاس بۆ کاک شەریف عەزیمی کە لە نووسینەوەی ئەم کورتە ژیاننامەیەدا یارمەتی دام.

## وەستا برایمی بەننا

خوالێخۆشبوو کاک کەریم حیسامی لە کتێبی (کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران) ساڵی ١٩٧١ لاپەڕەی ١٦ سەبارەت بە وەستا برایم ئاوا دەنووسێ:

(وەستا برایمی بەننا خەڵکی مەهاباد کە ئەندامێکی تێکۆشەر و دڵسۆزی حیزبی دیموکراتی کوردستان و یەکێک لەو گیانبازانەی ڕێگای ئازادی کوردستان بوو. پاش ئەوەی هاتە ڕیزی هێزی بەرگری، بۆ جەبهەی سەردەشت ناردرا. لە هەوڵین شەڕدا لەگەڵ لەشکری حکومەتی تاران لە (قوڵتێ) ناوچەی سەردەشت پاش شەڕێکی ئازایانە شەهید کرا).

هەروەها لە وتووێژێکدا کە دۆستێکی بەڕێز دەگەڵ کاک مەحموود (...) سەربارەت بە کاپیتان حەمەدی مەولودی کردی بە مەبەستی ئەوە کە لەو کتێبەدا چاپ بکرێ، کاک مەحمود لە بەشێک لە قسەکانیدا زیاتر لەسەر شەهید بوونی وەستابرایم دەوێ و دەڵێ:

(... لەشکری ئێرانێ لە سەردەشتێ مابوو. لەوێ شەڕ بوو کاک حەمەد ڕۆیشتە ئەوێ. «وەستا برایم»ێک هەبوو بەننای چاک بوو، «وەستا برایمی مام کەریم»ـیان پێ دەگوت؛ دەستی لە بەننایەتی هەڵگرت و بوو بە پێشمەرگە. پێشمەرگەی کاک حەمەدی بوو. لە شەڕێکیدا وەستا برایم شەهید بوو، کاک حەمەد تەرمەکەی ناردەوە و ڕایسپارد بە ئیحتڕام و ڕێزێکی زۆرەوە بینێژن).

## محەممەدی تۆکمەچی



خوالێخۆشبوو میرزا محەممەد تۆکمەچی ساوجبلاغ ناسراو بە وەستا محەممەد لە شاری مەهاباد لە دایک بووە و لە چواری رەشەمەی ساڵی ١٣٩٠ کۆچیدوایی کردووە.

پێش دامەزراندنی کارخانەی بەرق لە شاری مەهاباد و کۆماری کوردستان، خەریکی سەنعەتگەلی وەک ئەسلەحەسازی و هەر وەها چاککردنەوەی ماتۆر بەرقەکان، دەستگاکانی چاپخانە و هەر وەها کێشانەوەی نەقشەی سیم کێشی بەرقی مزگەوتی سوور و زۆربەیەک وردەکاری سەنعەتی دیکە بووە. وەک دەڵێن ئەوەندە زیرەک و وریا بووە کە دوکتۆر شاڵک داوای لێ دەکا کە دەگەڵی بچێ بۆ ئاڵمان و پەرە بە زانستەکەی بدات. تەنانەت تا تارانیش دەچن پێکەوە کە بڕۆنە ئاڵمان بەڵام تێلێگرافی بۆ دێ کە بابت زۆر نەخۆشە و بگەڕێوە، ئیدی لەبەر ئەوە وەستا محەممەد ناچێ و دوکتۆر شاڵکیش بە تەنیا دەچێتەوە بۆ ئاڵمان.

دوای دامەزراندنی کۆماری کوردستان بە داواکاری جەنابی پێشەوا بە هۆی ناسینی ناوبراو کە بەرپرسی کارخانەی بەرق دەبێ دەینێرنە دەورەیەک بۆ تەورێز بۆ ماوەی ٣ مانگان بۆ فێربوونی کارەکانی پەیوەست بە سەنعەتی بەرق تا بتوانێ باشتر ئەوشوێنە بەڕێوە بەرێ کە بە هۆی زیرەکی و لێهاتوویەکی زاتی کە هەیبوو، لە ماوەی ٢٠ رۆژ دەورەکەی تەواو دەکا و دەگەڕێتەوە بۆ مەهاباد. دەگەڵ بەرپرسیاریەتی کارگەی بەرق لەو سەردەمەدا، جەنابی پێشەوا وەک ئەفسەری خۆی دایدەنێ و بە هۆی متمانە و باوەڕێکی زۆری کە پێی دەبێت دەیکاتە مەسئوولی قوورخانە کۆماری کوردستان. هەروەها لە ساڵی ١٣٤٩ هەتاوی بەرقی سەردەشت و دوایە شنۆ دادەمەزرێنێ و هەمیشە بە هانای خەڵک هاتووە و خزمەتی بە وڵاتی خۆی کردووە. رووحی بەرزی شاد و یادی بەخێر.

## كاكە زیادی کۆیە



خوالێخۆشبوو «کاکە زیادی کوڕی حەمە ئاغای گەورە» ساڵی ١٩١٤ لەشاری کۆیە لەدایک بووە . بەمنداڵی خراوەتە بەر خوێندن. مردنی زووی «حەمە ئاغا»ـی باوکی، رێی لە کاکە زیاد گرت کە درێژە بەخوێندن بدات بۆیە، ئەرکی بەرپرسیارەتی بنەماڵەکەی گرتە ئەستۆ بەڵام، هیچکات لەخوێندن و خۆ تۆکمەکردن بە زانست دانەبڕاوە .هەڵوێستی کاکە زیاد بەرامبەر بە مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بەڵگەی ئەوەن کە ئەم پیاوە هەڵکەوتووە یەکێکە لە کەسایەتییە هەرە تێگەیشتووەکانی سەردەمی خۆی.

کاکە زیاد زۆر رێزی لەخوێندەواران و رۆشنبیران دەگرت و یارمەتی خوێندکارانی دەدا بۆ تەواو کردنی خوێندن. سەرەتای چالاکییە سیاسییەکانی کاکە زیاد ساڵی ١٩٣٣دەستی پێکرد. ئەو ساڵە هاوڕێ دەگەڵ سابیر ئیسماعیل و زەکی ئەحمەد هەناری و مستەفا خۆشناو و چەند تێکۆشەرێکیتردا (کۆمەڵەی موتەنەویرین)ـیان دامەزراند کە بوو بە ئامرازێک بۆ داکۆکی کردن لەمافەکانی خەڵکی کوردستان. سەرەتای چلەکانیش کاکە زیاد ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە حزبی (هیوا)دا و دواتریش لە حزبی (رزگاری)دا وەک فیداکارێکی گەورە ناوی دەرکرد.

ئەم تێکۆشەرە هاوکارییەکی زۆری کۆماری کوردستانی کرد لە مەهاباد و پەیوەندییەکی بەهێزی دەگەڵ پێشەوا قازی محەمەددا هەبوو. ساڵی ١٩٤٦ کە پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا، لە کۆنگرەی یەکەمدا کرا بە جێگری سەرۆکی پارتی. ساڵی ١٩٤٧ لە پەرلەمانی عیراقدا بوو بەنوێنەری ناوچەی کۆیە. کاکە زیاد هەمیشە لە ڕیزی نیشتمانپەروەراندا بووە و لە تەواوی خۆپیشاندان و چالاکییە جەماوەرییەکاندا ڕۆڵی پێشەنگی بینیوە. **کۆنگرەی چوارەمی پارتی لە ڕێکەوتی ٣-١٠-١٩٥٩ لە ماڵی کاکەزیادی لە بەغدا بەسترا بە ئامادەبونی ١٢٠ ئەندامی کۆنگرە.** ساڵی ١٩٦١ دەگەڵ هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول دا، پەیوەندی کرد بە شۆڕشەوە. **هەروها لە ڕێکەوتی ٦-٤-١٩٦٣ بە ئەمادەبوونی مەلامستەفا بارزانی کونگرەیەکی نیشتمانی بە ئامادەبوونی گشت حزب و عەشایر لە کۆیە لە ماڵی کاکە زیاد بەسترا کە نزیکەی ٢٣ ڕۆژی خایاند.** تا ساڵی ١٩٧٥ بە بەردەوامی لەخزمەتی گەل و نیشتمانەکەیدا بوو.

دوای هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٧٥ دا کاکە زیاد وازی لەچالاکی سیاسی هێنا و لە بەغدا نیشتەجێ بوو. ساڵی ١٩٩١ کە کۆڕەوە مەزنەکەی گەلی کورد دەستی پێکرد کاکە زیادیش دەگەڵ خێزانەکەیدا ئاوارەی ئێران بوو. ئەم گەورە پیاوەی کورد رۆژی١٢-٠٤-١٩٩١ لە شاری (نەغەدە)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کۆچیدوایی کرد.

ڕۆحیان شاد و یادیان هەرمان

سپاس بۆ کاک شێروان زیاد کوڕی کاک زیاد و کاک دیاری مەحموود زیاد، نەوەی ئەو نەمرە کە لە ئامادەکردنی ئەم کورتە ژیاننامەیە یارمەتییان دام.



کاکە زیادی کۆیە و مەلا مستەفا بارزانی لە کاتی
کۆنگرەی چوارەمی پارتی لە ڕێکەوتی ٣-١٠-١٩٥٩ کە لە ماڵی کاکە زیادی بەسترا

## قوڵی خانی نەغەدەی



لە ئەسڵدا ناوی «نەقی خان» و ناسناوی «بوزچەلوو»یە کە بە «قوڵی خان» دەناسرێت و بەناوبانگە. کوڕی ڕەشیدولسەلتەنەیە. لە دەڤەری نەغەدە و سندوس گەورە و سەرۆکی عێلی «قەرەپەپاغ» بووە. هەر لەو ناوچەیەش لە ساڵی ١٢٩٤ھ - ١٩١٥ز لە دایک دەبێ و هەر لەوێش لە حوجرەی مەلایان و لە مەکتەبخانەکانی کۆن دەرس دەخوێنێت. گرینگی بە پەروەردەکردن و هونەر داوە. زمانەکانی کوردی و فارسی و تا ڕادەیەکیش ڕووسی زانیوە. کەسێکی دەنگخۆش بووە و بە دوو زمانی کوردی و ئازەری گۆرانی گوتووە. سێ کوڕ و کچێکی هەیە.

لە ناوچەکە هەر حکومەتێک دەستەڵاتی بەدەستەوە گرتبێ، ئەویش بەبێ جیاوازی پشتیوانی لێ کردووە. هاوکات دەگەڵ هەموو هۆز و عەشیرەتەکانی ناوچەکە نێوانی خۆش بووە و ڕێزیان لێگرتووە. لە ڕووداوەکانی سەردەمی شەڕی دووهەمی جیهانی کە فیرقەی ئازەربایجان دروست بوو، ئەو بوو بە ئەندامی فیرقە و لەپاشان کە مەجلیسی میللی ئازەبایجان دروست کرا ئەو وەک نوێنەری قەرەپەپاغەکان لە ناوچەی نەغەدە و سندوس بۆ ئەو مەجلیسە هەڵبژێردرا. بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی چوو بۆ تەورێز و کەسێکی چالاک بووە لە کۆماری خۆسەریی (خودموختار) ئازەربایجان و پلەی «سەرهەنگ»یشیان پێ داوە. لە کۆتاییەکانی تەمەنی ئەو کۆمارەدا وەک بریکاری وەزیری پەروەردەی ئەم حکوومەتە هاوکاری کردن.

لە پاش ڕووخانی کۆماری ئازەربەیجان بە هەر کلۆجێک بێ، توانی خۆی لە سزادانی حکومەت دەرباز بکات و ئەوجارەیان دەگەڵ حکومەتی محەممەد ڕەزاشا خۆ دەگونجێنێ. کە لە ساڵی ١٣٥٧ بنچینەی زنجیرە حکومەتی پاشایەتی لە ئێران هەڵکەندرا و محەممەد ڕەزاشا لە ئێران هەڵات و حکومەتی مەززەبی مەلایان هاتە سەرکار، دەگەڵ ئەوانیش نێوانی خۆش بوو و وەک یەکەم سەرۆکی شوورای شاری نەغەدە دەستی بە کار کرد. لە کۆتایی تەمەنیاندا کۆچ دەکات بۆ تاران و لە ڕێکەوتی ١٥-٤-١٣٦٥ لە گۆڕستانی ئەوشارە بەناوی «بهشت زهرا» دەینێژن.

## ژێنێڕاڵ حەمە ڕەشید خانی بانە

«حەمەڕەشید خانی بانە»، کوڕی قادرخان، کوڕی عەبدوڵلابەگ، کوڕی بارام بەگ، کوڕی سولەیمان بەگی بانە، (سڵەمان) کە لە ساڵی ١٨٨٩ی زایینی لە گوندی «شوێگێزان» لە دایک بووە و لە ساڵی ١٩٢٥ی زایینی لە یەکەمین هەنگاوی ڕووبەڕووبوونەوەدا سوپایەکی دووسەد کەسی ڕژیمی پەهلەوی لە نزیک گوندی «ۆینە» لە ناوچەی «شلێر»ـی سەر بە قەزای «پێنجوێن» تێکشاند، لەساڵی ١٩٢٨ی زایینی بە مەبەستی هاوکاری کەسایەتی شوڕشگێری ناوچەی هەورامان یانی «مەحموودخانی دزڵی» شاری مەریوانی لە بندەستی ڕژیمی پەهلەوی ئێران دەرهێناوە و ساڵی دواتریش شاری بانەی گرت. بە هۆی ئەو ڕوداوانە لە ژێر گوشاری ڕژیمی پەهلەوی، حکومەتی عێراق بۆ ماوەی دوو سال حەمەڕەشیدخانی بۆ شارەکانی «موسڵ» و «ئامێدی» دوورخستەوە. هەروەها ساڵی ١٩٤٦ی زایینی بەشداری کۆماری کوردستانی کرد. هێزی پێشمەرگەی کوردستان چوار ژێنێڕاڵی هەبوو بەو ناوانە: ١- حەمە حوسێن خان سەیفی قازی ٢- عومەر خان شکاک (شەریفی - کاردار) ٣- مەلا مستەفا بارزانی ٤- حەمە ڕەشید خانی بانە. بە هۆی بەشداریشی لە کۆماری کوردستان لە نێوان ساڵانی ١٩٤٧ تا ١٩٥٨ی زایینی لە لایان ڕژیمی عێراقەوە بۆ شارەکانی «ڕۆمادی» و «کەرکووک» دوور خرایەوە و لە ساڵانی ١٩٦١ تا ١٩٧٤ی زایینی لە شۆڕشی ئەیلولدا ڕۆڵی گێرا. بەڕێز حەمە ڕەشیدخان لە ڕێکەوتی ١٢-٤-١٩٧٤ی زایینی و لە تەمەنی ٨٥ ساڵی دا، بە هۆی نەخۆشی کۆچیدوایی کرد و لە گۆڕستانی «شێخ شەمسەدین» لەگوندی «دارۆخان» یانی لە زێدی باب و باپیرانی خۆی بەخاک ئەسپێردرا.



ژێنێڕاڵ حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی و ژێنێڕاڵ حەمە ڕەشید خانی بانە

## سەفەرخان قارەمانیان



ناوی تەواوی «صفرخان قهرمانیان»ـە. لە ساڵی (١٣٠٠ه-١٩٢١ز) لە گوندی «شیشوان» لە نیزیک شاری «عەجەبشێر» لە دایک دەبێت. ناوی بابی «محەممەد حوسێن» و ناوی دایکی «گوهرتاج»ـە. باوکی وەرزێڕ بووە و لە دۆخێکی زۆر نالەباردا ژیاون. بەدەست ئاغای گوندەکەیانەوە ناڵاندوویانە. چەند جارێک دەگەڵ چەند لاوێکی گوندەکەیان بەگژ ئاغاکەیاندا چوونەتەوە. پاشان دەبێتە ئەفسەرێکی فیرقەی دیموکرات و زۆر ئازایەتی لەخۆی پێشان دەدات. ئەویش وەک زۆربەی ئەو فیداییانەی ئازەربایجان ئاوارەی کوردستان دەبێت و چارەنووسی دەگەڵ کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی گرێدەدرێت. سەفەرخان پاش ئەوەی کە دەگەڵ کاپیتان دێتەوە بۆ ناوچەکە و لێکهەڵدەبڕن، لە مانگی ڕەشەمەی ١٩٤٨ دەگیرێت و حوکمی ئێعدامی بۆ دەردەچێ. پاشان ماوەیەکی زۆر کە چاوەڕوانی لەسێدارەدان دەبێ، لەپڕ سزاکەی بۆ دەکرێتە تاهەتایی و لە شۆڕشی گەلانی ئێراندا لە ساڵی ١٩٧٩ پاشی ٣١ ساڵان لە زیندان ئازاد دەکرێت و ئازەرییەکان وەک قارەمانێکی نەتەوەیی پێشوازییان لێکرد. ناوبراو لەلایەن دوو نووسەرەوە بیرەوەرییەکانی نووسراوەتەوە کە ناوەکانیان بەم چەشنەیە: [لحظاتی از زندگی صفرخان قهرمانیان، نووسینی: بهروز حقی]. هەروەها: [خاطرات صفرخان قهرمانیان نووسینی: علی اشرف درویشیان]. سەفەرخان لە ڕێکەوتی ١٠-١١-٢٠٠٢ لە تاران کۆچیدوایی دەکات و لە ئیمامزادەی کەرەج دەنێژرێت.



## شەهید حوسێن لاسوور (دادار - موکری)



(لەسەر داوای ساخکەرەوە تکا لە هونەرمەند کاک مستەفا دادار کرا کە لە زمان خۆیانەوە کورتەیەک لەسەر باوکی شەهیدیان و یەک لە قارەمانە خۆنەویست و گیانلەسەردەستەکانی کوردستان بنووسێت کە جێی خۆیەتی سپاسیان بکەم)

**لە ئازای بە نێوبانگەوە تا قارەمانی هەرمان و چیرۆکی کۆنی لە یاد چۆوە! «پێشمەرگەی ون»!**

زۆرن پێشمەرگەی ون و ئازای بێ نێو؛ کە ئەمەگدارانە لەوپەڕی خۆشەویستی بێ قەید و شەرت و بەبێ هیچ چاوەڕوانییەک، خۆبەخشانە و گیان فیدایانە شەقیان لە هەرچی بەرژەوەندی مرۆڤانە و تاکەکەسی و بنەماڵە و جگەرگۆشەکانیان هەڵداوە. سەر لە پێناو و گیان لە سەردەست بە خوێنی ئاڵیان مێرگ و چیمەن و لێرەوار و زەنوێر و زەبەند و دەربەند و دۆڵ و دەرە و بازگە و ڕژد و هەڵدێر و گەوە و بناری چیای هەڵەمووت و زەرد و ماە و دوند و لووتکە و ترۆپکی شاخی ڕەنگاوڕەنگ و چۆمی خوڕێن و زێی خوڕی پڕ لە شەپۆلی تاوێ هەدادان نەدیو و ڕووباری مەند و خەمباری مێژووی خەباتی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەکەیان سوورتر و گەشتر کردوە و ژیلەمۆی ئاگری خەباتی دامرکاوی پێشینیانی کوردیان سەر لەنوێ گەشاندۆتەوە و بەرە و مێژوویەکی نوێتر و هەرمان، هەنگاوی بە هەناویان هەڵێناوەتەوە کە گڕ و کڵپە و گرفەی ورشەداری خەباتی ئەو پێشمەرگە بێنێو و نیشانانە؛ بۆتە ئەستێرەیەکی پڕشنگداری قوبەشینی هەردەم جریوەدار و درەوشەداری مێژووی خوێناوی گەلی کوردی کۆیلە و بن دەست و تینووی سەربەستی و ئازادی.

یەکێک لەو پێشمەرگە ون و نەترس و ئازا و جەنگاوەر و شەڕوانە بەجەرگ و قارەمانانەی شاری ئازایان واتە«سابڵاغ» و موکریان و کوردستان؛ شەهیدی نەمر کاک «حوسێن لاسوور» بە ناسنامە پاشناو «موکری» کە دوایە بەبێ هەچ هۆیەک و لە دوای خوێندنەوەی «ئەسکەندەرنامەی نیزامی گەنجەوی»، دەیکات بە «دادار» کە دەبێتە باوکی هونەردۆستی کورد، «مستەفا دادار».


شەهید حوسێن لاسوور و کوڕەکەی،
هونەرمەند مستەفا دادار - موکری

لەوکاتەدا کە دەبێتە ١٣٤١ی هەتاوی و بەرامبەری زایینی ١٩٦٢ کاک مستەفا کوری گەورەی شەهید حوسێن لاسوور، دوای پێنج کچان لە دایک بوو. واتە ئەگەر بێین و بچین و تێی ڕامێنین و لێی ورد بینەوە؛ ئەگەر دایکی شەهیدی نەمر، کاک حوسێن لاسوور، سەرەتای ١٩١٥ دووگیان بووبێت و نەمر کاک «وسێن لاسوور»ـی دە پشت و زگاندا گێڕابێت؛ ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە نەمر کاک وسێن لاسوور ١٩١٦هاتۆتە دونیاوە. چونکە هەر لەو ساڵەشدا زۆر کەسی بەرچاو لەو نێوچەیەدا بە دەست لەشکری ڕووس گوژراون و شەهید کراون. وەک دەگوترێ کە کۆلکەی نەمر حوسێن لاسوور دەگەڕێتەوە سەر ناوچەی کرماشان یا فەیزوڵڵابەیگییەکان، گوندێک بە ناوی «کرمانجان».

ئەو هاوینەی ٢٠٢١ بێتەوە؛ ٥٩ ساڵی ڕەبەق بەسەر شەهیدکردن و تێرۆڕ و قەتڵی سیاسی و بە ناهەق ڕشتنی خوێنی یەکێک لە پێشمەرگە هەرە ئازاکانی ژێکاف و حدک و قۆڵسووری پێشەوا قازی محەممەدی نەمر، واتە شەهید کاک حوسێن لاسوور، تێدەپەڕێ.

سەبارەت بە ساڵ وشوێنی لەدایکبوونی نەمر شەهید کاک «حوسێن لاسوور» کە سەت مخابن زۆر روون نییە و گەر سەتی-سەتیش روون نەبێت، لانیکەم ٩٥ لە سەتی، دەکرێت ڕاستە و ڕاست، ئاوابێت. واتە هەر پاش گوژران و شەهید بوونی باوکی «کاک حسین لاسوور» واتە کاک مارف» لە ١٩١٦بە دەست سەربازانی لەشکری ڕووسان، لە مەڵبەندی لاجان و مامەش و پیرانان مەشهوور بە «مارف داڵە» لە عەشیرەتی مامەش، پێ دێنێتە سەر خاکی کوردستان. یانی نەمر کاک «حوسێن لاسوور» هەر بە مەلۆتکەیی دە باوەشی دایکی خۆشەویستی دا، پەڕێوەی سابلاغ دەبێت و دایکی کە ژنێکی دەوڵەمەند دەبێت، مێرد دەکاتەوە.

لە چۆنیەتی دەوری جەوانی و تافی لاوەتی شەهید کاک «حوسێن لاسوور» مخابن هیچم بە دەستەوە نێ بۆ مێژوو. نەمر کاک «حوسێن لاسوور» زۆر بە گەنجی بە هۆی تەنگ و چەڵەمەی ژیانی کولەمەرگی و میراتی تاڵی ژینی کۆیلەیەتی و دەردە کوردەوە، لە کوردستانی گەرمێن و باشوور، واتە لە «ڕەواندووز» تووشی گرتووخانە دێت و هەر لەوێش خۆی زیاتر بە فێرە نووسین

و خوێندنه وه خه ریک ده کات. نێوبراو خاوەنی دەست خەتێکی جوان بووە. زۆر هۆگری قورئانی پیرۆز و شانامەی فیردەوسی و ئەسکەندەرنامەی نیزامی گەنجەوی بووە. وەک نەمر حاجی قادری کۆیی فەرموویانە: (ئەوەی ئازایە شانامە دەخوێنێ...)

به وتەی نەمر عەلیشای «سەیدی زەمبیل» کە کاک «حوسێن لاسوور» لە مریدانی سەیدی نوورانی واتە باوکی ئەو زاتە بووە؛ ئاوا تاریفی نەمر کاک «حوسێن لاسووری» دەکرد:

نەمر کاکحوسێن لاسوور هەموو گیانی هونەری ئازایەتی بوو. ئەو لە یەککاتدا، «هەم سوارچاکی چاک بوو، هەم تفەنگچی و ئەنگێوەی چاک بوو و هەمیش مەلەوانی چاک بوو».

لە دۆستە هەرە نێزیکەکانی نەمر کاک وسێن لاسوور کە زۆریشبوون و مخابن ڕەنگە هیچ کامیان لە ژین و ژیاندا نەمابن، ئەوانە بوون:



شەهید حوسێن لاسوور (دادار - موکری) دەگەڵ یەک لە هاوڕێکانی کە خەڵکی محاڵی تەرگەوەڕ بووە. بەداخەوە ناوەکەی نازاندرێت.

شەهید «ڕەسوولی نەغەدەیان»، شەهید «حامیدی مازووچی»، نەمر کاک «حەمەدی مەولوودی« (ڕاتیبی) «مەشهوور بە ح.م.چرچی، نەمر کاک «حوسێن ماملێ» و نەمر کاک حەمەد «قادری» کە ناسراو بە کاک «حەمەدی سەروکانێ» و نەمر سید «محمد ئیسحاقی»، شەهید «عزیز یۆسفی» ناسراو بە «عەزیزی حەمە سیسی»؛ حەمە ئاقرەیی، مەشهوور بە «حەمە کەچەڵ» و شەهید «،سید عبدولله ئیسحاقی «ئه حمەد تۆفیق» و شەهید «سەید ڕەسووڵی دێهقان» ناسراو بە «سەید ڕەسوڵی بابی گەورە»، ڕەشەی فەللاحی ناسراو بە «ڕەشەی قاچاغچی»، مەلا قادری لاچینی»،

«عەوڵای عەلی پشی» پوورزای، ناسراو بە «عەوڵا گلۆڵە» و هتد.

سەردەمی تافی لاوێتی نەمر کاک وسێن لاسوور، هاوکاتە دەگەڵ بوونە بە ئەندامی «کۆمەڵەی ژێکاف» لە «سابڵاغ» واتە مەهاباد. بە وتەی نەمر کاک «مونتەقیمی قازی»: نەمر»حوسێن لاسوور»دەرەجەی ئەفسەری کۆماری پێ بەخشرا بوو و بە هۆی ئازایەتی کە هەبیوە دە نێو دۆست و دوژمندا خۆشەویست بوو.

بۆ وێنە بەهەشتی «کاک برایم سەقەفی (ثقفی)» دەیگێڕاوە: نەمر کاک «حوسێن لاسوور» کە تۆپیان پێوە نابا، چاوی نەدەترووکاندن.

هەروەها خوالێخوشبوو نەمر کاک وسێن لاسوور مرۆڤێکی تەڕپۆش و شانازیدار و بە جلکوبەرگ و لفکەشۆڕ و سۆرانی بەردانەوە بووە. لە کاتی سوارچاکیدا، لیباس و زمانی کوردی و ناسنامەی کوردی پێ فەخر بووە و بێجگە لەمانە، پیاوێکی کوردی ڕەسەن و شۆخ و شەنگ و زۆر شایی‌بەخۆ و لە ئاست زۆردارێتی شادا هەر شای بە خوێری و بە نۆکەر زانیوە.

لە سەردەمی خۆیدا هەر کە ناوی حوسێن لاسوور دەهات، یەکسەر خەڵک ئەو سفەتانەی دەهاتە زەین: مێرخاسێک بە ڕوومەتێکی جوان، بە چاوێکی زیت و گەشەوە، کوردەواری گوتەنی: «چاوی شێرانە و کاڵ و بەرانانە»، خاڵێکی شەڕابی کە لاڕوومەت و لاچاو و لاکوڵمەی ڕاستی داگرتبوو، مرۆڤێکی دڵ گەورە، مێهرەوان و بەخشندە، سەخی کە پەین و پووڵ بۆ ئەو یەک بوون. کوردێکی ئازا، نەترس، ڕەسەن، نیشتمانپەروەر و گیانلەسەردەست. بە واتایەکی تر ناوی حوسێن لاسوور پێناسەی ئەو خوو و خدە ڕەسەن و جوانانەی بان بوون.

نەمر کاک سە ید ڕەسووڵ دێهقان لە هەموو شوێنێ کە باسی نەمر کاک وسێن لاسوور هاتبێتە گۆڕێ، باسی ئازایەیەتی و دەستکەرەوەیی نەمر کاک وسێن لاسووری دەکرد. ئەو نەمرە دەیگێڕاوە کە چۆن لە ڕێی نێوان گوندی»پەسوێ و خورینج» چەتە و ڕێگر، پێشیان پێگرتوون و نەمر کاک سەید ڕەسووڵ کە زۆر گەنج بووە، شەمزاوە و چلۆن نەمر کاک وسێن لاسوور، لێی تووڕە بووە و پێی گووتوە: ئێستا ئەوە بۆ دەست ناکە یەوە؟ ها؟

یان کاتی خۆی، ساڵی ١٩٨١ کە لە گوندی «قەڵاتی گەدەی» مەنگوڕایەتی، شەهید دکتۆر قاسملووو لە دەورەی «پەروەردە و بارهێنانی» مامۆستایانی شۆڕشی نەغەدە و پیرانشار گوتاری بۆ دەدان. شەهید سەید ڕەسووڵ دێهقان، «مستەفا دادار» بە شەهید دکتۆر قاسملووو دەناسێنێت و پێی دەڵێت: دکتۆر قاسملووو، ئەوە کوڕی نەمر«حوسێن لاسور»ـە. ئەگەر لە بیرت مابێ، ساڵی موسەدیقی، لە گوندی «خورینجی» هەردووکمانی لە کادێنێدا، شاردەوە و لە چنگ عەجەمای دەرباز کردین.

هەروەها ساڵێکی کە نەمر وسێن لاسوور، کارداری گوندی «کێلێ و بەلەبانێ» دەبێت و بە سواری قەند و چاو و کوتاڵی بۆ ماڵە ئاغای دەبێت بگەیەنێتە جێ، مانگەشەو یان ئەستێرە بە

ئاسمانەوە بوون، دوو چەتەی چەکدار کە باب و کوڕ دەبن، پەلاماری نەمر «کاک حوسێن لاسوور» دەدەن و تەنانەت بە قەستی گوژتن تەقەی لێدەکەن و بە نێفەکی پانتۆڵ و شەڕواڵییەوە دەنێن و بە تەما دەبن ڕووتی کەن. نەمر کاک «وسێن لاسوور» دەهری دەبێت و نێوی خودا و ڕەسووڵان دێنێت و خەنجەر لە کالان دەکێشێت و بە خێرایی و سوورعەتی سەرسووڕەێنەر، باب و کوڕەی چەک دەکات و بە سووغرە بۆ لای «هەباس ئاغای» کێلێ و بەلەبانێیان دەبات و هەباس ئاغاش وەک دەسخۆشانە و خەڵاتی ئازایەتی، دەستێک کەوا و پانتۆڵی مرادخانی، پێشکێشی نەمر کاک وسێن لاسوور دەکات.

هەر لە تافی لاوییدا، لە محاڵی لاجانێ واتە لە گوندی سەرینچاوەی مامەشان کە تفەنگچی و کێشکچی ئاغای دەبێت؛ شەوێکی تاریک و توون، ئەحمەد پۆلیس ناوێک کە ماوەیەک پێشتر کارداری ئاغای بووە، کە نێوبراو بە ئەسڵ خەڵکی باشووری کوردستان بووە، واتە لەو دیوی گەرمێنێ ڕا دوای ئەوەی ژن و منداڵی ڕادەستی گەرمێنێ دەکاتەوە، بە تۆڵەی نامووسی؛ دەچێتە سەر ماڵی ئاغا و ئاغای دەگووژێت. نەمر کاک «حوسێن لاسوور» کە ئاگاداری زووڵمی ئاغای دەبێت؛ لە ئەحمەد پۆلیس وەدەنگ نایە و خۆ لە ڕووداوەکە دەبوێرێ.

باسی ئازایەتی و جوامێری پێشمەرگەی ون نەمر حوسێن لاسوور تەواو نابێت و خۆی کتێبوولکەیەکی گەرەکە.

یان کاتێک نەمر سەید محەممەد ئیسحاقی، لە زیندانی شایدا دەبێت، سێسەرە لە سەر ئەو بنەماڵە هەڵناگرێت و هەمیشە چاوەدێرییان دەکات. کاتێک بۆ یەکەمجار نەمر کاک «سەید محەممەد ئیسحاقی» برا گەورەی شەهیدی نەمر کاک «عەبدوڵڵا ئیسحاقی» ناسراو «ئەحمەد تۆفیق» ڕزگاری دەبێت لە زیندان، ماڵێکی ڕەق و ڕووتی دەبێت. نەمر کاک وسێن لاسوور، وەک هاوڕێیەکی دڵگەورە و سەخی، ماڵەکەی بۆ پڕ فەرش دەکات

یان بە وتەی نەمر «دایە خورشیدی ڕەهبەر» خێزانی نەمر کاک «حەمەدی مەولوودی - ڕاتیبی» واتە دایکی نەمر «ئامینە خانمی»مەولودیان، کاتێک ماڵی نەمر کاک «حەمەدی مەولوودی» داگیر و مووسادرە» کراوە، نەمر کاک «وسێن لاسوور»ـی ئەمەگدار بە دۆستایەتی نەمر «کاک حەمەدی، بێوچان بە نیوەشەوان لە «گوندی کەڵەکووکەی، بابی گەورە» ڕا بە چەکی شاردراوە و کۆڵێک کەلوپەل و یارمەتی مادی و مەعنەوی بە بنەماڵەی نەمر کاک «حەمەدی مەولودی» ڕاگەیشتووە.

نەمر دادە ئامینی مەولودیان - ڕاتیبی کچی نەمر کاک حەمەدی مەولودی، لە زمان دایکی نەمری واتە دایە خورشیدەوە زۆر شتی لەسەر ئازایەتی و مێهرەوانی، نەمر کاک «حوسێن لاسووری» بیستووە کە زۆر جار باسی لێوەکردووە.

نەمر کاک وسێن لاسوور داشداری لێقەوماوان و هەژارن بووە و دوژمنی داگیرکاران و دەوڵەتی ئێران و ئێرانچێتی و نێوچە پەرستی بووە و لە بەرەی دژی شا و شاپەرستان جێی گرتووە و کوردستان

ڕووگەی بووە و ڕۆڵەی بەوەفا و ئەمەگداری ژێکاف و کۆمار و هەروەها قۆڵسوور و کێشکچی نەمر «قازی محمد» بووە و ماوەیەک بەرپرسی کۆمیتەی حدک لە محاڵی شاروێران و ماوەیەکیش سەرلک بووە لە داشکستان.

چەندین جار بە ژن و منداڵەوە کەوشەن و سنووری دەستکردی بەزاندوە بۆ ئەوەی وەک پێشمەرگەیەک بەشداری ڕاستەوخۆی شۆرشی ئەیلوول بکات و مخابن بە هۆی سیخوڕ و گزیرانی شا و شاپەرستان، دەیگرن و دە گرتووخانەی دەکەن و دوایەش بەری دەدەن.

ڕێزدار کاک خانەی ماملێ (عەزیز) کوڕی نەمر کاک حوسێن ماملێ دەیگێڕاوە، لە زمان دایکی واتە پوور نوسرەت، خێزانی نەمر و دەنگخۆشی مەزنی کوردستان؛ مامۆستا «حوسێن ماملێ» کە گوایە کاتێک نەمر کاک «وسێن لاسوور» شەهید دەکرێت، شینی بۆ گێڕاوە.

یان نەنکە «خورشید» خێزانی تێکوشەری دێرین و نەمر کاک «حەمەدی مەولود - ڕاتیبی» داستانی ئازایەتی نەمر کاک «وسێن لاسووری» بۆ منداڵەکانی و نەوەکانی گێڕاوەتەوە و بە گشتی باس لە بوێری و دلێری ئەم مرۆڤە نەبەز و چاونەترس و مێهرەوانە دەکەن.

دیسان دەگێڕنەوە:

سەردەمی دەستەڵاتدارێتی تیمسار وەرەهرام، ژنە دەرەجەدارێکی عەجەم لە دەراوی چۆمی خوڕێنی پردی سوور خەریکی فەرش و مافووره شووشتن دەبێت و دەکەوێتە بەر شەپۆلی بە سامی ڕووبارەکە و لە ناکاو کە نەمر کاک «حوسێن لاسوور»بە داشقە و ئەسپەکەی خەریکی ڕاگوازتنی بەردی مەڕمەڕە، چاوی بەو دیمەنە دەکەوێت کە ژنێک کەوتۆتە نێو گێژاوی ڕووبارەکە، ئیدی زۆر مرۆیانە و جوامێرانە؛ خۆ دەهاوێتە نێو گێژاوی ڕووبارەکە و ژنە لە مردن ڕزگار دەکا.

هەروەها دەگێڕنەوە: سەردەمی شا واتە «گا زەرد» و گزێرانی حەمەڕەزا شای گۆڕبەگوڕ واتە تیمسار وەرەهرام لە سابلاغ کە نەمر کاک «حوسێن لاسوور» خەریکی بەردی مەڕمەڕ گوێزتنەوەیە بە داشقە و ئەسپەکەی، تا بۆ ڕەحمەتی«حاجی ساڵەی شاتری» بەڕی، هەر لەو کاتەشدا لە ژێر فەرماندەیی تیمسار وەرەهرام، خەریکن بیمارستانی شێر و خورشید، ساز دەکەن، هەر لەو کاتەشدا «ئەفسەرێک»ـی شا و وەرەهرام پێش بە نەمر کاک حوسێن لاسوور دەگرێت: بەربینگی پێدەگرێت و زۆری لێدەکات کە ئەو بەردانە دەبێت بۆ سازکردنی بینای نەخۆشخانە شێر و خورشید دەکار کرێت و «حاجی ساڵەی شاتری»چی؟ بۆ کوێ؟ ناهێڵم بۆ شوێنی دیکەی ببەیت؟ ئەفسەری شای کە ئاگاداری تووڕەیی و چاونەترسی نەمر کاک «حوسێن لاسوور» نابێت، لە پڕێکدا دەکەوێتە بەڕ شاڵاوی شریخەی قامچی، ئەو نەمرە. ئەوە دە کاتێکدایە، ئێستاشی دەگەڵ بێت، لە وێ دەوراندا، بە دەگمەن کەسێک دەیوێرا نەک هەر ئانگژای سەربازێکی ئاسایی پادشاهی ئێران بدات، چ جێی ئەوەی پەلاماری ئەفسەرێکی بەرزی قووبە لەسەر شانی، شای دژە کورد بدات. پاشان کە نەمر کاک حوسێن لاسوور دەبەنە لای «وەرەهرام» لەبەر ئازایەتی و هەقبەدەست بوونی نەمر کاک

حوسێن لاسوور، وازی لێدەهێنن.

بە ڕاشکاوی دەتوانم بڵێم: زۆربوون کە باسی ئازایەتی و نیشتمانپەروەری و لەخۆبووردوویی و مێهرەوانی و خۆشەویستی و دڵگەورەیی و سەخی، بوون و مرۆڤ بوونی نەمر کاک حوسێن لاسووریان کردووە یان نووسیویانە. مخابن یا شوێنەونکە کراوە یان لە یادیان کردوە.

بەڵام یەکێک لەو کەسانەی کە نەمر شەهید «حوسێن لاسوور»ـی وەک مامۆستای ئازایەتی خۆی دەزانی و دەیناسی و دەیناساند؛ نەمر شەهید «سەید ڕەسووڵی بابی گەورە - دێهقان» بوو!

بە نووسراوە لەم ساڵانەی دواییدا دوای نەمر شەهید سەید ڕەسووڵی بابی گەورە بە تەنیا بە ڕێز و دڵسۆز و تێکۆشەر، کاک مەلا محەممەدی خزری، لە کتێبەکەیدا لە ژێر نێوی«لە قەرەقشڵاخە وە بۆ سوئێد» لە لاپەڕەی ١٥٤، بە چەند دێڕێک، کورتە یادێکی لە ئاشنا بوون دەگەڵ کاک «عەلی کاکە سووری» باسکردوە و کە چلۆن نەمر کاک «حوسێن لاسوور» ساڵانی ١٩٦٠-١٩٦١ ئەو هەمووە کۆمەگەی نەمر شەهید کاک «ئەحمەد تۆفیق»ـی کردووە و جا لە کەلوپەل و پۆشاک ڕا گرتوویەتی هەتا خێوەت و پێڵاو و هتد، گشتی ڕەوانەی دیوی کوردستانی گەرمێن و شۆڕشی ئەیلوول کردوە.

دوای بیستنی تێرۆری سیاسی و شەهیدکردنی نەمر کاک «حوسێن لاسوو»؛ شەهید کاک ئەحمەد تۆفیق» وەک دۆستێکی بە ئەمەگ و چاکەدەچاودا؛ شوێن تفەنگەکان و حەق و حوقوقی شەهید حوسێن لاسوور دەکەوێت؛ کە منداڵە بێسەرپەرستەکانی لە برسان نەمرن.

سەبارەت بە تێرۆری سیاسی نەمر شە هید کاک حوسێن لاسوور سەت لە سەتی روون و ئاشکرا بووە کە کوردە ساواکی و بەغەرەزەکان و ڕق لێهەڵگرتوو لە جوامێران و پێشمەرگەکانی سەردەمی پێشەوای نەمر و کۆماری کوردستان لە مەهاباد بە تۆڵەی تێرۆری ئاغای «غەفوری محمودیان» ئەنجام دراوە. قەتڵێک و تێرۆرێک کە نەمر شەهید حوسێن لاسوور ڕۆحیشی لێی خەبەردار نەبووە.

دوای تێرۆری نامەردانەی نەمر شەهید حوسێن لاسوور، بگوژەکان و سێخوڕە کوردەکانی ساواک و شای ئێران، بە نیشانەی خۆشی و شادی و خەنی بوون، لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی شاهەنشاهی ئەوکاتی ئێراندا بە هەراوی و بە دێڕی زلی سەردێڕدا دەنووسن:

(سەرئەنجام یەکێک لە پاشماوەکانی «متجاسرین» کورد و کۆماری ڕزیو و پۆشالی کوردستان‌مان بە سزای خۆی گەیاند).

کاتێک نەمر شە هید کاک حوسێن لاسوور تێرۆر دەکرێت؛ ڕەنگە تەمەنی لە ٤٤ تێنەپەڕیبێ یان ئەوپەڕەکەی سەرەتای ٤٥ ساڵی بووبێت؛ ئەگەر لە دایک بووی کۆتاییە کانی ١٩١٦بووبێت!

وەختێک نەمر شەهید حوسێن لاسوور تێرۆر دەکرێت؛ ژنێک و ٧ منداڵان واتە ٥ کچ و دوو کووڕان لە پاش خۆی و بەبێ سەرپەرشت بەجێ دەهێڵێت.

نەمر شەهید حوسێن لاسوور بۆ کوردستان ژیا و بۆ کوردستان مرد. مەزلوومانە لە دایک بوو و مەزلوومانە شەهید کرا و دوای شەهیدبوونیی؛ کەوڵ کرا و ڕووت کرا.

«کەم ژیا و کەڵ ژیا»

«یادی ئەو شەهیدە مەزنە هەرمان»

ڕێز و حورمەت و کڕنۆش بۆ شەهیدانی هەرمانی کوردستان

مستەفا دادار - موکری

٢١-٤-٢٠٢١



لە ڕاستەوە: نەناسراو - شەهید حوسێن لاسوور و منداڵیکەش هونەرمەند مستەفا دادار

## سەید محەممەدی سەیدی



سەید محەممەدی سەیدی

«سەید محەممەدی حاجی سەید ڕەحمانی» یان «سەید محەممەدی سەیدی- سید محمد سیدی» ساڵی (١٢٨٢هـ - ١٩٠٣ز) لە شاری سابڵاغ- مەهاباد لە دایک بووە. کوڕی گەورەی مەڕحوومی حاج سەید ڕەحمانی سەیدی بووە کە بنەماڵەیەکی ڕەسەن و کۆنی ئەوشارەن و ناسناویان (سیدی)-یە. سەید ڕەحمانی باوکی سەید محەممەدی یەک لە گەورەپیاوانی مەهاباد بووە و لە دامەزراندنی یەکەم ئەنجومەنی شاری سابڵاغ لە زەمانی مەشروتەی ئێراندا دەستی باڵای هەبووە و ئەندامی ئەو ئەنجومەنەش بووە.

سەید محەممەد لە ناو چینی دەستکورت و بێدەرەتاندا خۆشەویست و خاوەن پێگە بووە. دژ بە زاڵمان وەستاوەتەوە و داکۆکیی لە بێکەس و داماوان کردووە. خۆی لە بەرەی خەڵک زانیوە و هیچکات لە دەوڵەمەند، ئاغاوەت و پیاوی حکومەت نیزیک نەکردۆتەوە. ئەوە بەو مانایە نییە کە سەید محەممەد دوژمنکاری دەوڵەمەند و هاوشارییەکانی کردبێ، بەپێچەوانە لای ئەوانیش خاوەن ڕێز بووە.

پلە و پایەی کۆمەڵایەتی سەید محەممەد و کاپیتان حەمەدی مەولوودی لە کۆکردنەوەی هێزی ئینسانی بۆ یەکلاکردنەوەی پارسەنگی داژداران، لە نێوان غەفور مەحموودیان و پێشەوا قازی محەممەد یەکلاکەرەوە بووە. بۆ پاراستنی شاری مەهاباد لە هێرشی عەشایر و هەروەها لە تۆکمە کردنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان ڕۆڵی سەرەکییان گێڕاوە و دەبێ بڵێین کە بەدەنەی هێزی نیزامی کۆمار و یا هێزی مرۆیی حیزبی دیموکرات بەشی هەرە زۆری لەلایەن ئەو دوو کەسەوە دابین دەکرا چوون خەڵکی نەدار، کاسپکار و نەخوێندەوار وەدوای قسەی ئەوان دەکەوتن. ناویی نهێنی لە کۆمەڵەی ژ.ک ـدا (هەڵگورد) بووە و سەرۆکی دەستەی (هەڵۆ) بووە لە یەک لە گەڕەکەکانی مەهاباد.[1]

---

[1] بڕوانە کتێبی: سێبەری ئازادی - نووسینی کەماڵ عەبدوڵاهی - لاپەڕەی ٢٣٧

له بۆشایی نەبوونی حکومەت لە مەهاباد کاتێک کە حکومەت سەرۆک عەشیرەتەکانی کردە فەرمانداری مەهاباد،[1] یەکەم کاری کە کردیان ئەوەبوو کە ئەو کەسانەی نێوانیان دەگەڵ حکومەتی ناوەندی و ئاغاوەت و عەشیرەتەکان خۆش نییە و پێیانوابوو بۆیان دەبنە گرفت، بیانکوژن دەنا، بیانگرن و بیاندەنەوە بە حکومەتی ناوەندی تا ئەوان لەناویان بەرن. بۆ ئەو مەبەستە دوو کەس بۆ ئەوان گرینگی هەبوو ئەویش کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی و کاک سەید محەممەدی سەیدی بوو. کاتێک کە قەرەنی ئاغای مامەش دەبێتە فەرمانداری مەهاباد کۆبوونەوەیەکی گشتی لە سەرۆک عەشیرەتەکان دەگرێت و بڕیار دەدەن کە کاری ئەو دوو کەسە تەواو بکەن.

بۆ ئەو مەبەستە هێزێکی زیاتر لە ٨٠ کەسی چەکداری خۆیان دەنێرنە سەریان تا بیانگرن بەڵام سەرکەوتوو نابن و کاپیتان حەمەدی مەولوودی زۆر بە ڕوونی و بە وردی باسی ئەو ڕووداوە گێڕاوەتەوە و لە دەقە مێژووییەکانیشدا ئاماژەی پێ کراوە کە زیندووترین و حاشاهەڵنەگرترین بەڵگە، نوتقێکی خوالێخۆشبوو «حەمەدەمین موعێنی» وەزیری کیشوەر کۆماری کوردستان بووە کە لە ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ١٨ - ساڵی یەکەم - شوممۆ ٤ ڕەشەمە ١٣٢٤ - ٢٣ فوریە ١٩٤٦ لە لاپەڕەی سەرەکیدا هاتووە.

سەید محەممەد خاوەن سەوادێکی مامناوەندی و خەتێکی خۆش بووە. کاسپکار و ماوەیەکیش توجارەتی تووتنی کردووە. لەناو خەڵکدا ناسراو و جێی مەتمانە بووە. لەبەر هەندێ پێشەوا قازی محەممەد بۆ ماوەیەک وەک بەرپرسی ئیدارەی دوخانیاتی مەهاباد دەستنیشانی دەکات و ئەویش زۆر لێهاتووانە کاروبارەکان ڕادەپەڕێنێ و ناهێڵێ کە پرۆسەی کشتوکاڵ و بازرگانی تووتن کە ئەوسەردەم وەک شادەماری ئابووری ناوچەکەی دەهاتە ئەژماردن، پەکی بکەوێ.

زیندوویاد سەید محەممەدی سەیدی لەپاش تێکچوونی کۆمار بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە زیندانیی تەورێز بە تاوانی سیاسی و جیاخوازی دەگیرێ، بەڵام ئەزموونەکانی لە ئیدارەکردنی کاروباری جووتیارانی تووتن کە هەیبووە، وا لە حکومەت دەکات کە دەستەوداوێنی ببنەوە و لەپاش ئازادکردنی لە زیندان سەرلەنوێ لە ئیدارەی دوخانیات دایمەزرێننەوە. لە بەڵگەیەکدا کە لە کتێبی (چپ در ایران، به روایت اسناد ساواک، حزب دموکرات کردستان ایران، جلد اول، لاپەڕەی ٨ دا) ئاوا دەنووسێ:

---

[1] بڕوانە کتێبی: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان - نووسینی حامید گەوهەری - چاپی یەکەم - هەولێر - ٢٠٠٤، لاپەڕەی ١٠٩

[ڕێکەوت: ٣٠-٥-٢٨

ژمارە: ١٦٧٠

دۆخی ئیدارەکانی حکومەت لە مەهاباد

لە مەهاباد فەرمانبەرانی دەوڵەتی لە کارمەندانی ئیدارەی خەلە ڕا گرتوویەتی تا دوخانیات، دادگوستەری و سەبت و ئەحواڵ بە گشتی لە سەردەمی قازی محەممەد کاربەدەست بوونە کە ئێستاش لەسەر کارەکەی خۆیان هەر ماون. هەموویان ئاواتەخوازن کە کوردستان سەربەخۆ بێت. یەک لەوان «سەید محەممەدی سەیدی»یە کە سەرۆکی دوخانیاتی قازی محەممەد بووە و ئێستاش لە بۆکان کارناس و مەزەندەکەرە و شەو و ڕۆژ بۆ کۆمەڵە [مەبەستی کۆمەڵەی ژ.ک - ـە] بانگەشە دەکات و لە چالاکی دایە...]

۸ / جریان چپ به روایت اسناد

تاریخ: ۳۰/۵/۲۸

شماره: ۱۶۷۰

وضعیت ادارات دولتی مهاباد

در مهاباد کارمندان ادارات دولتی اعم از خله‌داراتی [،] دخانیات [،] دادگستری [،] ثبت و ثبت احوال عموماً در زمان قاضی محمد متصدی امور بوده‌اند که فعلاً همان شغل را عهده‌دار میباشند عموم آنها آرزومندند که کردستان مستقل شود از جمله سید محمد سیدی رئیس دخانیات قاضی محمد که فعلاً در بوکان کارشناس و ارزیاب دولتی است شب و روز بنفع حزب کمله [کومله] فعالیت مینماید.



موضوع جالب وضعیت فرهنگ کردستان است کلیه آموزگاران و دبیران در مهاباد و بوکان و سردشت بلااستثناء از عمال قاضی محمد بوده و آشکارا در میان شاگردان تبلیغ و سخنرانی نموده و حتی بزبان کردی در کلاس تدریس مینمایند و اغلب اتفاق میافتد که اصولا فارسی صحبت نمینمایند و این موضوع باعث سر و صدای زیادی در مهاباد گردیده و چنانچه این اشخاص از محل منتقل نشوند زیان غیر قابل جبرانی ببار خواهد آورد.

(پی دوری) نام آل یونان که یک کمونیست دوآتشه است مدت ۵ ماه است بنام کارشناس دخانیات وارد مهاباد شده این شخص کلیه فعالیتهای حزب کمله [کومله] در دخانیات و شهر را اداره نموده و اغلب جلساتی بنام مهمانی تشکیل و تصمیماتی مقتضی میگیرند - ۲۰ روز پیش نامبرده از طرف دخانیات مامور خرید

بناغەی کوردایەتی و ڕەسەنایەتی ئەو کوردە نیشتمانپەروەرە ئەوەندە پتەو داڕێژرابوو کە لە هەر دەرفەتێک کەڵکی وەردەگرت تا بۆ کوردستان تێهەڵبێتەوە. بە پێی بەڵگەکانی ساواک لە هەمان سەرچاوەی سەرێ کە باسمان کرد لە لاپەڕەی ٦٦ و ٦٨ دا بە ژمارەی: ٥١١٩٣-٣٢١ و بە ڕێکەوتی ٣-٢-٤٠ باسی سەید محەممەد سەیدی و کۆمەڵێک کەس دەکات و دەڵێ:

**بابەت: چالاکی کردنی ناوبراوانی ژێرەوە بۆ حیزبی پارتی دیموکرات**

**ناوبراوانی ژێروە لە مەهاباد بۆ حیزبی پارتی دیموکڕات چالاکی دەکەن و دەگەڵ لایەنگرانی قازی محەممەد کە بۆ عێراق هەڵاتوون لە پێوەندی دان و زۆرجاران لە ڕێگای چۆمی ئاراسەوە لە هاموشۆ دان. [ناوی کەسەکان هەموو دەنوسێ کە سەید محەممەدیش یەک لەوانە]**



به: دفتر ویژه — تاریخ: ۴۰/۱۲/۳
از: — شماره: ۳۲۱/۵۱۱۹۳
موضوع: فعالیت افراد مشروحهٔ زیر بنفع حزب پارت دمکرات

نامبردگان زیر در مهاباد بنفع حزب پارت دمکرات فعالیت نموده و با عمال و طرفداران قاضی محمد و متواریان اخیر ایرانی بعراق در ارتباط بوده و اکثراً از طریق رود ارس رفت و آمد مینمایند.

۱ـ مناف کریمی رئیس شیر و خورشید مهاباد که سابقاً وزیر فرهنگ قاضی محمد بوده.

۲ـ ایوبی داروخانه‌دار که در زمان قاضی محمد وزیر بهداری بوده

۳ـ عزیز صدیقی[1] که در زمان قاضی محمد افسر و رئیس منطقهٔ سقز و سرا بوده

۴ـ حسین داودی مهابادی یا حسن داودی برادرش پسران حاجی داودی رئیس مجلس مؤسسات حکومت قاضی محمد.

۵ـ جعفر کریمی رئیس ستاد ارتش حکومت قاضی محمد.

۶ـ رحمان مدرسی که پدرش وزیر دادگستری قاضی محمد بوده و فعلاً خودش شهردار مهاباد میباشد. بعلاوه سید محمد سیدی ـ موقتی ـ کریم خسروی ـ شرفی ـ خلیل خسروی (وزیر ارتباطات قاضی محمد) صدیق حیدری[2]

(وزیر تبلیغات قاضی محمد) و شیخ‌الاسلامی
۳۲۱/۵۱۱۹۳ - ۴۰/۱۲/۱۲

لە بەڵگەیەکی تردا هەر لە هەمان سەرچاوە زیاتر لەسەر سەید محەممەد قسان دەکات و دەریدەخات کە بۆ پشتیوانی لە خەباتی کوردەکانی عێراق و بەتایبەت بۆ پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە پلە و پایەی کۆمەڵایەتی خۆی کەڵکی وەرگرتووە و بڕە پارەیەکی خەیاڵی و زۆر وەک یارمەتی دارایی بۆ شۆڕشی کوردەکانی باشوور کۆدەکاتەوە لە نێوان ساڵەکانی ١٣٤١ تا ١٣٤٠ بە دەستی خۆی دەیبا و پێشکەش بە شۆڕشەکەی مەلا مستەفا بارزانی دەکات. ئەو بەڵگەیە لە لاپەڕەی ٩١ سەرچاوەی سەرەوە ئاوا دەڵێ:



**ڕێکەوت: ٢٩-١٠-٤١**

**ژمارە: ٣٠٢٢٤-٣٣١**

**نهێنی**

**بابەت: یارمەتیدانی دانیشتووانی سەر سنوور بە شۆڕشگێڕانی کورد.**

**چەند ڕۆژ لەمەوبەر دوو کەس لە خەڵکی مەهاباد بە ناوەکانی میرزا قادر کە خۆی وەک برازای قازی محەممەد ناساندووە و ئەوەیتر کەسێک بووە بە ناوی سەید محەممەد، ئەوانە ٦٠٠٠٠ تمەن و هەندێک کارتی حیزبیان پێبووە کە لە ڕێگای گوندی «شینێ»ـی عێراق بەرانبەر بە بنکەی «دووستوو»[بەنەگەری زۆر مەبەستی گوندی «دۆڵەتوو»ـیە] لەلایەن کوێخای گوندەکە دەنێردرێنە قەڵادزێ و لەوێ دەگەڵ کەسێک بەناوی «ئەحمەد شەریف» دەناسێندرێن، ئەویش بەپەلە ئەو دوو کەسە دەنێرێتەلای مەلا [مەبەستی مەلا مستەفای بارزانییە]. وەک دەڵێن کە ئەو بڕە پارەیەی لە ئەندامانی حیزبی لە مەهاباد و دەروبەریی کۆ کردۆتەوە. ئەو دووکەسە گەڕاونەتەوە مەهاباد. بۆ پشتڕاستکردنەوە نێردراوەتە خزمەتتان.**

**وەرگرەکانی نامە: ئیدارەی ساواکی مەهاباد بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر و ڕوونکردنەوەی چۆنییەتی ڕووداوەکە.**

ئەو کوردە نەتەوەییە، ئەو تێکۆشەرەی کوردایەتییە، چاوە پڕ لە هیوا و خۆزگەکانی بۆ هەتایە وێکدەنێت و ساڵی ١٣٤٥ی هەتاوی لە مەهاباد کۆچیدوایی دەکات و هەر لەو شارەش تەرمیی

پیرۆزیان پێشکەش بە خاکی پاکی نیشتمان دەکرێ.

ڕۆحیان هەردەم شاد و یادیان هەرمان

سپاس لە کاک هێمن سەیدی، نەوەی مەرحوومی سەید محەممەدی سەید ڕەحمانی (سەیدی) کە لە ئامادەکردنی ئەو کورتە ژیاننامەیە هاوکاری کردم. [وریا].



دوو وێنە لە دوو وێستگەی جیاوازی ژیانی یەک لە پێشمەرگە و قارەمانەکانی کۆماری کوردستان - "سید محەممەدی سەیدی" ناسروا بە (سەید محەممەدی سەید ڕەحمانی)

## زێرۆ بەگی هەرکی

مایۆر «زێرۆبەگ بەهادوڕی» یەک لە گەورەکانی عەشیرەتی «هەرکی» لە محاڵی «تەرگەوەڕ»ە. بەڕێزیان وەک کەسێکی شەڕکەر و بە غیرەت ناوبانگی هەبوو. یەک لەو ئەفسەرانەی دەوڵەتی کوردستان بوو کە وەک دەگوترێ لەلایەن ڕووسەکانەوە ئەو پلە سەربازییەیان پێ بەخشراوە بەڵام دوکتۆر قاسملوو لە کتێبی «چڵ ساڵ خەبات»دا دەنووسێ کە بۆخۆی پلەی مارشاڵی بۆخۆی هەڵبژاردبوو.[1] پلەی زێرۆ بەگ هەرچییەک بووبێ لە خۆشەویستییان لەلای پێشەوا قازی محەممەد و حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی کەم و زیادی نەکردووە.

زێرۆ بەگ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات بووە. هەروەها بەڕێزیان یەک لە ئەندامانی ئەو هەیئەتە بوو کە سەفەریان کرد بۆ باکۆ. لە ڕێکەوتی سێشەمە ٣-ی بانەمەڕی ١٣٢٥ هەتاوی - ٢٣- ی ئاوریلی ١٩٤٦ هاوڕێ دەگەڵ پێشەوا بەشداری کرد لە ڕێوڕەسمی ئیمزاکردنی پەیمانی یەکیەتی و برایەتی دەگەڵ ئازەربایجان لە تەورێز. دوکتۆر قاسملوو لە سەرچاوەی سەرەوەدا و لە فەسڵی دووهەمدا سەبارەت بە زێرۆبەگ دەنووسێ:

( کاتێک کە بۆ وتووێژ دەگەڵ هەیئەتی ئازەربایجان لە کۆنسولگەری شۆڕەوی لە تەورێز کۆ دەبنەوە، لەسەر خاوەندارێتی شاری ورمێ ناگەنە ئەنجام. کوردەکان دەڵێن ورمێ ئی ئێمەیە و ئازەرییەکانیش دەڵێن ئی ئێمەیە. لەو کۆبوونەوەیەدا «زێرۆ بەگ بەهادوڕی» یەک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی «ئێڵی هەرکی» کە پیاوێکی نەخوێندەوار بەڵام وریا و نەترس بوو، کاتێک نوێنەرانی هەردوو لایەن لە ژووری وتووێژەکە دانیشتبوون، ئەسکەملەی خۆی هەڵگرت و بردی لە ناوەڕاستی ژوورەکەی دانا و گوتی: بەڕێز هاشمۆڤ، (مەبەستی کۆنسوولی شۆڕەوی لە ورمێ بوو) ئێستا کە ئەو ژووری ئی ئێوەیە، من دەتوانم ئەسکەملەکەم لە ناوەڕاستی دابنێم و بڵێم ئەو ژوورە ئی منە؟ مەبەستیان لەو قسەیە ئەوە بوو کە ورمێ لە ناوەڕاستی خاکی کوردستان هەڵکەوتووە و زۆرترین دانیشتووەکانی دەوری ورمێ کوردن و ناتواندرێ کە وەک بەشێک لە خاکی ئازەربایجان بێتەژمێرن.)

زێرۆبەگ دواتر بوو بە فەرماندەی هێزی پێشمەرگە لە جەبهەی سەردەشت لە شوێن ڕەئیس بەکر. خوالێخۆشبوو (عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری) لە کتێبی (یادداشتەکانم) بەشی یەکەم - لە لاپەڕەی ٨٧ باسی ئەو جێگۆڕکەیە لە نێوان ڕەئیس بەکر و زێرۆبەگ دەکات و دەڵێ: [ کۆماری مەهاباد زۆر پەلەی ئەکرد لە داگیر کردنی ئەو سوپایەی کە لە سەردەشت ئابلۆقە درابوو. هەمیشە

---

[1] زیاتر بڕواننە کتێبی: جوڵانەوە نەتەوەیی کورد نووسینی: پرۆفیسۆر د. وەدیع جوەیدە - وەرگێڕانی لە ئینگلیسییەوە: پرۆفیسۆر ی.د یاسین سەردەشتیی ل ٥٤١

بە نامە و ڕاسپاردە ئەیان ناردە سەر بەکر ئاغا کە پەلە بکات لە گرتنی سەردەشت و داگیرکردنی ئەو سوپایە، تا ئەوە بوو زێرۆ بەگیان بە خۆی و لەشکرێکی زۆرەوە نارد بۆ فەرماندەیی ئەو بەرەیە لە جیاتی بەکر ئاغا، چونکە وایان ئەزانی کە زێرۆ بەگ زیاتر شارەزای هەیە لەو بەرەیەدا و خەڵکی ناوچەکەش باشتر ئەیناسن...] بەڵام ڕەئیس بەکر (بەکر ئاغا) لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی گەشتێک بەناوی کۆماری کوردستاندا -بیرەوەرییەکانی ڕەئیس بەکر - (عەقید عەبدولکەریم حەوێزی) - (١٩٤٤ – ١٩٤٧) لاپەڕەی ١٠٠ دەڵێ:[ ... کە ئەو نامەیەم بەدەست گەییشت کات تێوارە بوو، دەست بەجێ فەرمانم دا کە ئەو ئازووقە و خواردەمەنییەی هەمانبوو بەسەر دانیشتوانیدا، دابەش بکەین. زێرۆبەگم کردە جێنشینی خۆم و فەرمانم دایە کە بۆ ڕۆژی دوایە هێزەکەمان بەرەوە مەهاباد بکشێتەوە].

جێی ئاماژەیە کە خوالێخۆشبوو زێرۆبەگ کە خاوەنی ناوچەی «باراندوز» لە ورمێ و لە دەشتەبێڵ بوو بۆ ماوەی ٢٠ ساڵان «غولام ڕەزا حەسەنی» ئیمام جومعەی کوردکوژی ورمێی وەک مێتەر ڕاگرتبوو تا خزمەتی یەک لە ئەسپەکانی بکات.



لە ڕاستەوە: ژەنەراڵ مایۆر محەممەد حوسێن سەیف قازی وەزیری هێزی کوردستان، ڕەشید بەگی هەرکی، پێشەوا قازی محەممەد و زێرۆ بەگی بەهادوری (هەرکی).

## محەممەد تۆفیق وردی

«محەممەد» کوڕی «تۆفیق»، کوڕی «فەرهادئاغا»، کە ناسناوی «وردی» بووە. دە ساڵی ١٩٢٣ لە شارۆچکەی «کۆیە» لەدایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لە کۆیە تەواو کردووە و پاشان لە بەغدا لە ساڵی ١٩٤٤ لە پەیمانگای مامۆستایانی سەرەتایی خوێندنەکەی تەواو دەکات. وەک مامۆستا لە خوێندنگاکانی «تەقتەق» و «قەڵادزێ» دەستبەکار دەکات. لەبەر چالاکی سیاسی چەند جاران دەگیرێت. پاشی دامەزراندنی کۆماری کوردستان ڕوو دەکاتە مەهاباد و خۆبەخشانە لە خوێندنگەکانی ئەو شارە وانەی کوردی دەڵێتەوە و لە گۆڤارەکانی ئەوسەردەمدا وتار دەنووسێت. لەپاش ڕووخانی کۆمار، دەگەڕێتەوە عێراق و بۆ ماوەیەک دەگیرێت. لە ساڵی ١٩٧٥ کۆچی دوایی کردووە. مامۆستا محەممەد وردی خاوەنی دەیان شێعری نەتەوەییە کە کەم کوردێک هەیە نەیانزانێ. ئەویش هۆنراوەی (ئەی شەهیدان)ـە کە دەڵێ: ئەی شەهیدان، نامرێ ناو و نیشانتان. تا شەهید خوێنی نەڕێژێ... ئەوەندەی کەوتۆتە بەر چاوم، تەنیا کتێبێکی لێکۆڵینەوە لەسەر فۆلکلۆری کوردی لەدوا بەجێ ماوە بە ناوی (فۆلکلۆری کوردی - ساڵی ١٩٦١).



مەهاباد، ساڵی ١٣٢٥ هەتاوی - ١٩٤٦ زایینی، لە چەپەوە: مامۆستا محەممەد تەوفیق وردی، نەناسراو، میرزا عەزیز مەولەوی، دوکتور محەممەد مەجدی

## زاهیری ڕەسام



خوالێخۆشبوو «زاهیر کوڕی ڕەشید کوڕی ساڵح» لە ڕیکەوتی ١٩٢٤-٠٧-٠١ لە شارۆچکەی «کۆیە» لەدایک دەبێ. لەوێ بە «زاهیری ڕەشیدی ساڵحە ڕەشی» ناسراوە. تا پۆلی شەشی سەرەتایی خوێندوویەتی کە ئەو سەردەم کەمکەس سەوادی خوێندن و نووسینی هەبووە. لە تەمەنێکی کەمدا زەماوەندێ دەکات و لە قەڵادزێ نیشتەجێ دەبێت. وەک بەرگدروویەکی لێزان لەو شارە کار دەکات. خەڵکی قەڵادزێی کۆن وەک کاک «زاهیری بەرگدروو» دەیناسن.

دوکانەکەی دەبێتە مەکۆی ئەو کوردە ئازادیخوازانە کە دڵیان بۆ ڕزگاری ئەتەوەکەیان لێدەدات. وەک ئەندامی «حیزبی شیوعی عێراق» کراوە بە بەرپرسیاری جووتیارانی دەڤەری قەڵادزێ و لەهەمانکاتیشدا بەرپرسی پێوەندییەکانی ئەو حیزبە بووە دەگەڵ «دەوڵەتی کۆماری کوردستان» لە مەهاباد.

لەپاش تێکچوونی کۆمار و هەروەها هەبوونی ڕێکەوتننامەی «سەعدئاباد» لە نێوان دەوڵەتانی (ئێران، عێراق و تورکیە و ئەفغانستان)، کە دەبوای داواکراوانی ئەو سێ وڵاتە ڕادەست بکرێنەوە، حکومەتی عێراق بەهۆی ئەم ڕێکەوتننامەیە گوشارێکی زۆری خستبوو سەر ئەو ئاوارە کوردانەی ڕۆژهەڵات و باشوور کە بیانگرن و ئێرانییەکان بدەنەوە بە ئێران و عێراقییەکانیش سزا بدرێن. کاک زاهیری ڕەسام لەو دۆخەدا ببوو بە پەنا و سێبەری زۆربەی ئەو لێقەوماوانە و جێگا و ڕێگای بۆ دابین دەکردن و دەیشاردنەوە. بۆ نموونە «مامۆستا قانع»ـی شاعیر و «ڕەئیس بەکر» و ... یەک لەو لێقەوماوانە بوون کە کاک زاهیری ڕەسام حەشاری دابوون و دەیشاردنەوە و دەیپاراستن.

ئەوانەی کە گیرابووشن هەوڵی دەدا بە چەشنێک ڕزگاریان بکات .وەک خۆی کە چەند جارێک باسی کردووە، لەلایەن خەڵکی قەڵادزییە و دەوروبەری بە نهێنی کەلوپەل و نامە و پۆست ڕادەگوێزرێتە کۆماری کوردستان.

ئەو خۆی تەنیا یەک جار بە کەلوپەلەوە دەچێت بۆ ئەوێ. ئەوکات لە سەردەشت هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە سەرۆکایەتی «زیرۆ بەگی هەرکی» (بەهادوری) لە ناوچەی سەردەشت


وەستا زاهیرای ڕەسام

دەبن. لەوێ وەزیرێک دەبینێت و ئەویش دەینێرێت بۆ لای «دڵشادی میرزا غەفوری» (دڵشاد ڕەسووڵی) کە لێپرسراوی ئازووقە و خواردن بووە لەو دەڤەرە. پاشی حووڕمەتگرتنێکی زۆر بە لۆری دەینێرێتە مەهاباد. لەوێ قەول دەبێت کە پێشەوا ببینێت بەڵام، تەشریفیان لەوێ نابێت، لەجیاتان دوو لە نوێنەرەکانی بەناوەکانی « محەممەد یاهوو و مەنافی کەریمی» لەوێ دەبن. قسەیان دەگەڵ دەبڕێنێتەوە و ڕێ و شوێن دیاری دەکەن کە مانگانە دوو جار کەلوپەل بۆ کۆماری کوردستان بنێرێت. کاک زاهیر کە دەگەڕێتەوە قەڵادزێ کەسێک بەکرێ دەگرێ بە مانگێ ١٠ دیناران تا مانگێ دوو جاران پۆست و شمەک بەرێت بۆ مەهاباد. ئەو کەسە ناوی «مەلا ئەحمەد تێوچاوانی» دەبێ.

لە ساڵی ١٩٥٩ بەهۆی کار و خەباتی سیاسییەوە دەیگرن و پاش ماوەیەک ڕایدەگوازن بۆ خوارووی عێراق و لەو ماوەیەدا فێری هونەری وێنەگرتن دەبێت. لە ساڵی ١٩٦١ دەگەڕێتەوە بۆ قەڵادزێ و زەوقی دەکەوێتە سەر پیشەی وێنەگرتن و دوکانێکی وێنەگرتن لەو شارە دەکاتەوە بەناوی «ستۆدیۆ پشدەر». هەر بەهۆی پیشەکەیەوە ئەمجار خەڵکی قەڵادزێ ناسناویکی تریشی پێدەبەخشن و بە کاک «زاهیری ڕەسام» بانگی دەکەن. وێنەکانی کاک زاهیر کەمتر کوردێک هەیە کە نەیدیتبێت بەڵام، کەس نازانێ کە ئەم وێنانە دەستکردی مامۆستا زاهیری ڕەسامن. یەک لەوانە وێنەیەی «مارگارێت»ـی پێشمەرگەی شۆڕش کە تفەنگێکی برنەوی دەشانی دایە.

لە ڕێکەوتی ٢٤-٠٤-١٩٧٤ کە قەڵادزێ کەوتە بە ڕقی دەوڵەتی خوێنمژی سەددام، بەهۆی بۆمبارانی ئەو ڕژێمەوە، کاک زاهیر بریندار دەبێت و کوڕیکیشی بەناوی «پێشڕەو» شەهید دەکرێت و دوکانەکەی زەرەرێکی زۆری بەردەکەوێت .لەو پیشەی خۆی بەردەوام دەبێت تا ساڵی ١٩٨٨ کە قەڵادزێ لەلایەن ڕژێمی بەعس خاپوور دەکرێت و دەگوازرێتەوە .دڵی گەورە و کوردانەی ئەم نیشتمانپەروەری کوردستان لە ڕۆژی ٠٨-١٠- ٢٠٠٩ لە هەولێر لە لێدان دەکەوێت و لە گۆڕستانی ئەو شارە تەسلیم بە خاک دەکرێت. ڕۆحیان شاد و یادیان هەرمان.

تیبینی: دونیایەک سپاسی کاک ستار حەمە تایەر و کاک ئاراسی کوڕی کاک زاهیر دەکەم کە لە نووسینی ئەو دێڕانەدا یارمەتییان دام. بەداخەوە ئامادەکردنی ئەو کتێبە درێژی خایاند و دە فریای کاک ستار نەکەوت تا بیبینێت. مخابن پەتای کۆرۆنا ئەو مرۆڤە جوانەی لێ ئەستاندین. بەڕێزیان زۆر تامەزرۆ بوو ئەو کتێبە بخوێنێتەوە. چەند جاران بەتایبەتی داوای کتێبەکەی دەکرد و لە دۆخی ئەو کتێبەی دەپرسی، هەر دەتگوت دڵی خەبەری داوە کە تەمەن بەرەو کۆتاییە. دەیانفەرموو کە بەردەوام لە زمان گەورەساڵانی پێش خۆی باسی قارەمانەتی کاپیتان حەمەدی مەولوودی بیستووە و لە دوورەوە وەک قارەمانێکی نەتەوەیی سەیرم کردووە. بەتایبەت خوالێخۆشبوو کاک زاهیر ڕەسام زۆر باسی کاک حەمەدی بۆ کردووم. هەروەها زۆر ڕووداوی لەسەر کاک حەمەدی دەزانی کە لە ڕانیە و قەڵادزێ و کۆیە ڕوویانداوە و قەول وابوو کە لە کاتێکی گونجاودا لە کۆی وتوێژێکدا هەمووی بنووسمەوە کەچی بە داخەوە نە توانیم وتووێژی دەگەڵ بکەم و نە کاک ستار کتێبەکەی بینی.



مامۆستا ستار حەمە تایەر

ڕۆحی کاک ستار شاد و یادیان بەخێر.

## میرزا حەمەدەمینی کۆیە



ناوی تەواوی «حەمەدەمین حاجی قادر»ـە کە بە «میرزا حەمەدەمینی کۆیە» ناسراوە. لەرێکەوتی ١٨٩٠ی زایینی لە شارۆچکەی «کۆیە» لە دایک دەبێت. لە حوجرەی مەلایان خوێندوویەتی و زۆر زیرەک بووە. پیشەی تیجارەت و بازرگانی کردووە و دەگڵ ناوچەکانی ئێران سات و سەودای هەبووە. زۆری سەردانی شاری سابڵاغی کردووە. ئەو پێشگری «میرزا»ـیە یادگاری خەڵکی سابڵاغێیە کە بەو ناوە بانگیان کردووە. دوو ژنی هیناوە یەکیان کۆیی بووە بەناوی «جەمیلە عەبدولا» و ئەوەیتریان سابڵاغی بووە و ناوی «ئامینە کچی حوسێن» بووە لە بنەماڵەی «گودەرزی»ـیەکانی ئەو شارەن. کەسێکی کوردپەروەر و نیشتمانپەروەر بووە. هاوکاری و پێوەندییەکی باشی هەبووە دەگەڵ بەرپرسانی کۆماری کوردستان. لە ساڵی ١٩٨١ لە گۆڕستانی «کۆن»ـی کۆیە تەسلیم بە خاک کراوە. سپاس بۆ کاک شێروان کاکە زیاد کۆیی و کاک ئەکرەم کوڕی خوالێخۆشبوو میرزا حەمەدەمین کە یارمەتیان دام بۆ ئەم کورتە پێناسەیە.

## هاشمی کورد

(هاشمی بەزاز یا هاشمی کورد) یەک لە پێشمەرگە فیداکارەکانی کۆمار بوو. لە دەستەی کاپیتان حەمەدی مەولوودیدا خزمەتی دەکرد. مام هاشم لە دوای تێکچوونی کۆمار، وێڕای کاپیتان و ئەفسەرە قارەمانەکان پەڕیوەی باشووری کوردستان (عێراق) بوو و پاشی گیران و چەرمەسەرییەکی زۆر، لە هەولێری دەلال نیشتەجێ بوو. لە سەفەرێکمدا لە ساڵی ٢٠١٠ بۆ باشووری کوردستان، ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا تا هاوڕێ دەگەڵ دایکم ئامینە مەولوودیان، کچی گەورەی کاپیتان، هەروەها کاک عوسمان ڕانییەی سەردانێکی کاک هاشم بکەین کە بەداخەوە پیر و ناساز ببوو. سەرەڕای ئەوەش زۆر بە گەرمییەکی چاوەڕواننەکراو پێشوازییان لێکردین و دەگەڵ دایکم کەوتنە دونیای بیرەوەرییە سەرنجڕاکێش و شیرینەکانی کۆن کە دەگەڵ کاپیتان هەیانبووە. بەرێزیان زۆر لە نیزیکەوە ئاگاداریی وردی لە ڕوداوەکانی سەردەمی کۆمار و شەڕەکانی جەبهەی سەقز، سەردەشت، مەکلاوێ و بەتایبەت دوارۆژەکانی کۆمار هەبوو. کاک هاشم تا دواساتەکانی ژیانیی، خۆی بە پێشمەرگەی کۆمار و وەفادار بە ڕێبازی پێشەوای کوردان، «حەزرەتی قازی محەممەد» و کۆمەڵەی (ژک) دەزانی. تەنانەت تا کۆتایی ژیانی، جلکی (مرادخانی) کە جلکی تایبەتی ناوچەی مەهاباد و موکریانە، لەبەر دەکرد. بەداخەوە ئەوکات ئەو دەفتەر و دەستنووسانەی کاک حەمەد سەر و سۆراخیان نەبوو، بۆیە ئەو هەلەم لەکیس چوو، دەنا دەمتوانی لەسەر دێربەدێری ئەو باسانەی لە (کوردبوون) دان، دەگەڵیان بدوێم و زانیاری زیاتری لە سەر ڕووداوەکان وەدەست بێنم. کاک هاشم لە ڕێکەوتی ٢١-٠٤-٢٠١٣ لە هەولێر کۆچیدوایی کرد.



لە ڕاستەوە: ئامینە مەولودیان (کچی کاپیتان حەمەدی مەولوودی)، وریا ماملێ و هاشمی کورد

## هاشم فەرهاد



هاشم فەرهاد کوڕی سمایل لە شاری سابڵاغ - مەهاباد لە دایک دەبێت. بنەماڵەکەیان ساماندار بوون و شۆرەتیان «فەرهاد»ە بەڵام بە «فەرهادی» بانگ دەکرێن. ڕێکەوتی لە دایکبوونەکەی نازاندرێت. بنەماڵەکەیان سەنعەتکارێکی بەناوبانگی ئاسینگەری بوون بۆیە وەک کوڕی گەورەی ماڵێ یاریدەی باوکی دەکات و ئاسینگەرێکی قابیلی لێدەردەچێ. قەد و باڵای کورت و جوانچاکی زەمەنی خۆی بووە. بە لاوێکی شۆخ و کەشخەپۆش ناوبانگی دەرکردبوو. کوڕێکی نەترس و بەورە بووە بەردەوام خەمی خەڵکی نەدار و بێدەرەتانی خواردووە. دژی بەسووک چاولێکردنی چینی باڵادەستی کۆمەڵگا لە خەڵکی نەدار بوو. بەردەوام خۆی لە بەرەی دژ بە دەوڵەمەند و چینی لە حکومەت نیزیک، دەزانی. ڕەنگە کارتێکەری بیری بۆلشویکی و کۆمۆنیستیش بەسەریدا زاڵ بووبێ کە ئەوسەردەم ئەو ئایدیۆلۆژییە لە گەرمەی خۆیدا بوو و ورەی زۆر دابوو بە خەڵکی هەژاری کۆمەڵگەکان.

هاوڕێیەتی کاک هاشم دەگەڵ کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچی و عەزیز زەندی ناسراو بە عەزیز ئاڵمانی، بەتایبەت حوسێنی زێڕینگەران کە یەک دامەزرێنەرانی هەر دوو (حیزبی ئازادیی کوردستان) و (کۆمەڵەی ژێ.کاف) بوو، لەبەر چاوی کەس شاراوە نەبوو. بە داخەوە لە مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٠ هەتاوی لە ڕووداوێکی زۆر ناڕووندا کاک هاشم لە جەرگەی بازاڕ تەقە لە کاک ڕەحمان شافعی دەکات و بە دوو فیشەکان دەیکوژێت.[١]

کاک ڕەحمان لە بنەماڵەیەکی ساماندار و دەستڕۆیشتوو و هەروەها خاوەن ڕێزی سابڵاغ بوو.

---

[١] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەو سەرچاوانە: خاطرات زندگی پر ماجرای دکتر قادر محمود زاده " آسو "ل:١٣٢ - تاریخ مهاباد، سید محمد صمدی، انتشارات رهرو مهاباد ل: ١٠٨ - ئاڵەکۆک، نووسینی: غەنی بلووریان، کۆکردنەوەی و ئامادەکردنی: حامید گەوهەری ل:٤٦

هەر ئەوڕۆژە لە لایان چەند چەکدارێکی سەر بە عەشایر کە خزم و نیزیکی کاک ڕەحمان بوون، کاک هاشم لە ماڵی خۆیدا دەدۆزنەوە و هەر لەوێ دەیکوژن. کاک هاشم کە چەند مانگێک دەبوو زەماوەندی کردبوو، هاوسەرەکەی دوو گیان دەبێت. دوای تێپەڕ بوونی چەند مانگ لە کوژرانی کاک هاشم، تاقە کچەکەی بەناوی «زارا» لە دایک دەبێت.

## محەممەدی قادری (حەمەدی کاک خدری)

محەممەدی قادری، کوڕی خدر کە بە «کاک حەمەدی سەروکانی» یان «کاک حەمەدی کاک خدری» لە ساڵی(١٢٧٥هـ-١٨٩٦ز) لە گوندی «سەروکانی» لە ناوچەی نەغەدە و لە عەشیرەتی مامەش و لە بنەماڵەیەکی ملّکدار و دەستڕۆیو لەدایک دەبێت. لە منداڵییەوە لەلایەن مامۆستای گوندی سەروکانی وەبەر خوێندن نراوە و پاشان لە حوجرەی درێژەی بە زانستی خۆی داوە و بە کەسێکی زانا دەناسرا. کوردێکی بەهەڵوێست و کوردپەروەر بووە و ڕۆڵی چالاکی گێڕاوە لە ڕووداوە سیاسییەکانی سەردەمی خۆی. یەک لەو کەسانە بووە کە ئامادەکاری کردووە بۆ هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە نەغەدە. هەروەها پێشمەرگەیەکی نەترس و گیانلەسەردەستی کۆمار بووە کە پلەی کاپیتانی پێدراوە. پاشی ڕووخانی کۆمار ئەویش وێڕای سەدان تێکۆشەری پەڕیوەی باشوور دەبن و ماوەیەک لە خەلان و زینوێ، لەلای شێخ عەلائەدین خۆی حەشار دەدات و ماوەیەکیش لە بەغدا دەبێت. پاشان کاری بۆ دەکرێت و دەگەڕێتەوە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. بەڵام دیسان کۆڵ نادات و لەسەر کوردایەتی و تێکۆشان بۆ وەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی گەلەکەی، لە ساڵی(١٣٣٢هـ-١٩٥٣ز) زیندانی جەڵدیان و جارێکیش لە گرتووخانەی ورمێ و ساڵی (١٣٤٧هـ-١٩٦٨ز) لە بەندیخانەی «قزل قلعه»ـی تاران دەگەڵ کۆمەڵێک لە چالاکانی کورد وەک دوکتۆر عەلی مەولەوی، کاک جەلیل گادانی، ئەحمەد ئاهەنگەری و کاک حەمەدەمین مەولودیان یان (ڕاتب) گیرا و کەوتە ژێر ئەشکەنجە و جەزرەبە.

بەداخەوە کاک محەممەد قادری و کاک حەمەدەمین مەولودیان(ڕاتب - ڕاتبی) برای کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچی، کاتێک لە زیندان ئازاد دەکرێن، ئیتر ناکەونەوە سەر ڕەوتی ژیانی ئاسایی خۆیان و ئاسەواری ئەشکەنجەی ناو زیندان کار لەسەر مێشکیان دەکات و باری دەروونییان تێکدەچێ و تا کۆتایی ساڵەکانی ژیانیان بە دەرد و دەرکەوتەکانی ئەشکەنجەی زاڵمان، دەیانناڵاند. کاک محەممەد قادری لە ساڵی (١٣٥٨هـ-١٩٧٩ز) لە گوندەکەی خۆیان واتە سەروکانی کۆچیدوایی دەکات و هەر لەوێش بە خاک دەسپێردرێت.

## تۆفیقی مەلا سدیقی



تۆفیق کوڕی سەدیق کوڕی عەلی لە ساڵی ١٩٢٠ لە شاری کۆیە لەدایک دەبێ. لە کۆیە و لە ڕانییە چۆتە خوێندنگە. لە ساڵی ١٩٣١ ڕا لە شاری ڕانییە نیشتەجێ بووە. لە ساڵی ١٩٤٠ بە هۆی نەخۆشییەوە ناتوانێ درێژە بە خوێندن بدات. ئینجا بۆ ماوەی ٢ ساڵان لە کۆمپانیای نەفتی کەرکوک کار دەکات. پاش ئەوەی لەوێش واز لە کار دێنێ، دەگەڕێتەوە بۆ ڕانییە و لەوێ دوکان دادەنێ و بەردەوام لە هاتوچۆی بەغدادا دەبێ بۆ کڕینی شتومەکی ناو دوکان. ئەو دوکاندارێتییە و ئەو هاموشۆیە بۆ بەغدا، دەبێتە هۆی ئەوە کە زیاتر دەگەڵ شۆڕگێران و ڕووناکبیران تێکەڵ بێت و خەباتی سیاسی دەستپێبکات. هەر لەو سەردەمشدا بووە کە دەگەڵ کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچی ئاشنا بووە و وەک ئەرکێکی نیشتمانی و مرۆیی یارمەتی کاپیتانی داوە و تەسکەرەکەی (پێناسە) لە نفوسی ڕانییە دۆزیوەتەوە و سەرلەنوێ بۆی دەرکردۆتەوە و بۆی ناردۆتە زیندانی ڕواندز.

یەک لە هاندەرەکانی بۆ تێکۆشانی سیاسی، خوالێخۆشبوو عومەر دەبابە بووە. لە ڕێکخستنی خۆپێشاندانەکەی ساڵی ١٩٥٤ لە ڕانییە ڕۆڵی سەرەکی گێڕا و هەر لەبەر ئەوەش دەگیرێت و ڕەوانە زیندانی موسڵ دەکرێ. کە لە زیندان بەردەدرێت سەر لەنوێ دەست بە خەبات دەکاتەوە تا نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ کە ئاوارەی ئێران دەبێ. کە لە ئێرانیش دەگەڕێتەوە بە خۆی و خێزانەکەی بۆ شاری سەماوە دوور دەخرێنەوە. خوالێخۆشبوو تۆفیقی مەلا سدیقی لە کۆتاییەکانی تەمەنیاندا بیرەوەرییەکانی خۆی لە کتێبێکدا نووسیوەتەوە بەناوی (بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی حیزبایەتی و پێشمەرگایەتی و دوورخرانەوەم).

مۆمی تەمەنی ئەو نیشتمانپەروەر و ئەو تێکۆشەرە لە ڕۆژی سێشەممۆ ڕێکەوتی ١١-٤-٢٠٠٦ دەکوژێتەوە و ناوی بە سەربەرزی لەناو گەلیی خۆیدا بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە.

ڕۆحیان شاد و یادیان بەخێر

## سەید عەلی حیجازی



لیواء (سەرلەشکر) عەلی محەمەد خالید حیجازی (١٨٩٩ - ١٩٧٦) یەکێکە لەو پۆلیسانەی کە بە بێبەزە و دڵڕەق ناسراوە. ناوی لکاوە بە قۆناغێکی مێژوویی لە ڕووداوەکانی دوای جوانەمەرگبوونی کۆماری کوردستان بەتایبەت لە سزادان و کوشتنی بارزانییەکان و ئەفسەرانی کوردی ناو کۆمار و زیندانی کردنی ڕووناکبیرانی کورد لەوسەردەم. هەروەها هاوکاریکردنی دەوڵەتی ئێران بۆ بەدەستەوەدانی داواکراوان.

سەرلەشکر (علی محمد خالید الحیجازی) کە لە کوردستان بە (عەلی حیجازی) ناسراوە لە ساڵی ١٨٩٩ لە شاری مەدینە لە حیجاز (عەرەبستانی سعودی) لە دایک بووە لە ٢٧ ی ئابی ١٩٧٦ (٢٧-٨-١٩٧٦ز) لە بەغدا کۆچیدوایی دەکات.

خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە شاری «مەدینە» لە عەرەبستانی سعودی (حیجاز) تەواو کردووە، پاشان باوکی دەینێرێ بۆ ئیستانبوڵ بۆ خوێندن لە بەشی دەرمان، بەڵام خوێندنی لە دەرمانەوە دەگۆڕێ بۆ خوێندن لە زانکۆی سەربازی و پەیوەندی بە کۆلێژی سەربازیی لە ئیستانبوڵ کرد و پلەی ملازمی (Teğmen - ستوان - lieutenant) دووەمی لە سوپای عوسمانی تەواو کرد.

کاتێک «مەلیک فەیسڵ» دەکرێت بە پاشای عێراق، سەید عەلیش دەنێردرێتە ئەو وڵاتە و لەو پۆستانەدا بەرپرسیارەتی دەدرێتێ: جێگری ئیدارەی پۆلیسی «بەسرە»، سەرۆکی پۆلیسی «بەغدا»، جێگری سەرۆک پۆلیسی هەموو عێراق، لەسەر داوای مەلیک فەیسەڵ و بە پشتیوانی هێزەکانی ئینگلیسی جێگیر لە عێراق و بە فەرمانی تایبەت، دەبێتە بەرپرسی گشت ناوچەکانی کوردستان. بەهۆی ئەو خۆشخزمەتیانەی کە لە کوردستان بۆ دەوڵەتی پاشایەتی دەیکات، پلەی بەرزتر دەکەن بۆ (سەرلەشکر-لواء) و لە ڕیکەوتی (١٤-٠٤-١٩٤٨ تا ١٢-٠٢-١٩٥٠) دەکرێت بە سەرۆکی بەڕێوبەرایەتی پۆلیسی گشت عێراق. ماوەیەکی کورتیش پارێزگاری «سلێمانی» بووە و پاشان پۆستی وەزیری ناوخۆی عێراق وەردەگرێ. هاوکات نێوانی دەگەڵ عبدالإله بن علي «(عەبدولئیلاهـ بن عەلی) « نائب السلطنة»ـی عیراق خۆش بوو. کاتی خۆی خاڵی مەلیک فەیسەڵی منداڵ بوو (کە « غازی»ـی بابی ساڵی ١٩٣٩ لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبیلدا مردبوو و کوڕە منداڵەکەی دەبوو گەورە



سەید عەلی حیجازی و عەبدولئیلاهـ بن عەلی خاڵی فەیسەڵی دووهەم و " نائب السلطنة"ی عیراق

بوایە تا بە رەسمی پادشایی کردبا. عەبدولئیلاهـ برای «مەلیکە عالیة»ـی بێوەژنی غازی و دایکی ئەو فەیسەڵە بوو. ساڵی ١٩٥٣ کە فەیسەڵی دووەم بە رەسمی بوو بە پادشا، ئەم « عبدالإله»ـە بوو بە « ولیعهد»، تا ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨. سەید عەلی حیجازی داردەستی ئەو بوو و ئەمرەکانی ئەوی بەجێدەگەیاند. وەک دەردەکەوێ، ئەو مەلیک عەبدولئیلاهـ ـە پێداگری کردووە کە وا بەسەر کوردەکان بێنن و ئەو ئەفسەرە کوردانەش لەسێدارە بدەن چارەنووس وا بوو کە کاتێک شۆڕش دژی حکومەتی پاشایەتی لە عێراق کرا ئەو مەلیک عەبدوڵڵایە کەوتە بەر دەستی و خەڵک و تیکە تیکەیان کرد و پاشماوەی لەشیان هەڵاوەسی .

سەید عەلی حیجازی لە ناوچەی کوردستان دژی کوردەکان و بەتایبەت بارزانییەکان بەرپرسیاری یەکەم بوو، کۆمەڵێک تاوانی دژی گەلی کورد ئەنجام دا. عەشیرەتی بارزانی کە لەدوای ڕووخانی کۆمار بەشێکیان هیچ عیلاجێکیان نەما و ناچار بوون دەگەڵ شێخ ئەحمەد، خودانی بارزان بگەڕێنەوە سنووری عێراق، سەید عەلی بە دهۆ و درۆ بەڵێنی بە هەموویان دا کە سزا نادرێن و عەفوو دەکرێن بەڵام لە دواییدا دەرکەوت کە هەمووی درۆ بوو. تەواوی پیاو و گەورەساڵانی ئەو عەشیرەتەیان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ زیندانی کرد. ئەو کوردکوژە دەستی سەرەکی هەبوو لە لەسێدارەدانی چوار ئەفسەری کورد (مستەفا خۆشناو، محەممەد مەحموود قودسی، خەیروڵڵا عەبدولکەریم، عیزەت عەبدولعەزیز) بە بەڵێنی درۆ و دەهۆ، ئەو ئەفسەرانەی ڕازی کرد تا خۆیان ڕادەستی دەوڵەتی عێراق بکەن و پاشان لەسێدارەی دان. هەروەها شەپۆلێکی بەربڵاوی گرتن و زیندانی کردنی ڕووناکبیرانی کوردی وەڕێ خست بە چەشنێک کە زیندانەکانی باکووری عێراق بە گشتی، کێشەی جێگایان هەبوو.

لەپاش تێکچوونی کۆمار و داگیرکردنەوە کوردستان لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە دۆخی بارزانییەکان کە لە یارمەتیدانی کۆماردا خوێنیان دانابوو، ناجێگیر بوو و دەوڵەت تێیهەڵپێچان و دوو مەرجی بۆ دانان، یا چەک دابنێن و وەک پەنابەر لە هەمەدان نیشتەجێ بن، یا خاکی ئێران جێبهێڵن. لەو کەش و دۆخەدا خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا بارزانی هەوڵ دەدا تا ڕێگای

دەربازبوونێک بدۆزنەوە تا خۆی و عەشیرەتەکەی بە چەشنێک ڕزگار بکات بۆیە، نامەیەک بۆ سەرلەشکر عەلی حیجازی دەنووسێت و داوای لێدەکات لە نێوان ئەوان و دەوڵەتی عێراقدا نێوبژیوانی بکات و چارەسەرێک بۆ کێشەی نێوان دەوڵەتی عێراق و بارزانییەکان بدۆزێتەوە. سەرەڕای ئەوە کە دۆخی بارزانییەکان لەو سەردەمدا لە دژوارترین دۆخدا بووە، بەڵام خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا ئامادە نەبووە کە واز لە چەک بێنێت و لە ڕوانگەیەکی بەهێزەوە نامەکە دەنووسێت و دەستی ئاشتییان بۆ درێژ دەکات. دەقی نامەکە بەو چەشنەیە:

[١٥-٤-٤٧ بۆ سەرلەشکر سەید عەلی حیجازی بەڕێز

وێڕای سڵاو و ڕێز

١. ئەم نامە تایبەتە بۆ ئێوەیە تا بینێرن بۆ سەرۆک وەزیرانی[١] بەڕێز. داواکارین کە بە زووترین کات بگاتە دەستی بەڕێز سەرۆک وەزیر.

٢. لە ناوەرۆکی نامەکەمانەوە دەردەکەوێ کە ئێمە نیازمان پاکە و بۆیە دەمانهەوێ بۆ ئامانجێکی پاک و باش هەنگاو هەڵبێنینەوە. گەرەکمانە بە چەکەکەمانەوە بمێنینەوە. گەر ئێوەش نیازتان دەگەڵ ئێمە پاکە، کەواتە دەبێ ڕێکەوتنێک بکەین. چارەسەری ئەو کێشەیە بە پیاوانی بەرپرس و موخلیسی وەکوو بەڕێزتان مسۆگەر دەبێ.

٣. من متمانەم هەیە کە ئێوە کەسێکی موخلیسن بۆ وەتەن و بۆ دۆستایەتی دەگەڵ ئێمە، لەبەر ئەوە ئاواتی من ئەوەیە کە ئەو کێشەیە بە واستەی ئێوەوە حەل بێ ئینشائەڵڵا. من بەردەوام نامەتان بۆ دەنێرم و هیوادرام باسەکە وەپشت گوێ نەخەن و حەول بدەن بە زووترین کات چارەسەرێک بدۆزنەوە تا ئێمەش بۆ ئاشتی بێ هیوا نەبین هەروەها با حکومەتیش سەری بەو کێشەیەوە نەهێشێ. لە هەمانکاتیشدا داوا دەکەم تا ناوچەیەکی دیاریکراو و بێلایەنمان بۆ تەرخان بکەن تا بتوانین خۆم و خەڵکەکەم لێێ بحاوێنینەوە تا ئەوکاتە کە موشکیلەکە بەدەستی ئێوەوە چارەسەر دەکرێ. چاوەڕوانی وەڵامی ئێوەین بەوپەڕی ڕێز و ئیحتیرامەوە.

واژۆ - مەلا مستەفا بارزانی]

---

[١] مەبەستیان سەرۆک وەزیران (صالح الجبر – سالح جەبر)ـە کە سەرۆک وەزیری سی و هەشتەمین کابینەی حکومەتی عێراقی لە سەردەمی پاشایەتی بووە. حکومەتەکەی لە ١٩٤٧/٣/٢٩ تا ١٩٤٨/١/٢٧ بەردەوام بووە.

١٥/٤/٤٧

الى سعادة امير اللواء السيد علي الحجازي المحترم

تحية واحتراما

١- نرسل لكم رسالة خاصة بواسطة سعادتكم الى فخامة رئيس الوزراء نرجو التفضل بتقديمها الى فخامته بأسرع واسطة ممكنة.

٢- يتضح لسعادتكم من مضمون رسالتنا حسن نوايانا وسلامة مقصدنا من بعد بصورة مسلحة فاذا كانت نواياكم مشابهة فلابد من الحصول على الشفاء وحل مشكلتنا بمساعي الرجال المسؤولين المخلصين امثال سعادتكم بوقت قريب

٣- انني واثق من اخلاصكم للوطن وصداقتكم لنا ولذلك آمل ان تحل مشكلتنا بمسعاكم انشاء الله وسوف اراسلكم دائما فارجو ان لا تهملوا قضيتنا وتسعوا لحلها سريعاً كي لا نضطر الى تحجيز الاهالي لضرورة اعاشة الرجال لانه قد تستاء الحكومة من هذا العمل

٤- ارجو ان تعينوا لي منطقة محايدة ابقى فيها مع رجالي وتمنحوا لنا واسطة للاعاشة حتى تنتهي قضيتنا على ايديكم وننتظر جوابكم والسلام عليكم

ملا مصطفى البارزاني

وێنەی نامەی واژۆ کراوی مەلا مستەفا بارزانی کە بۆ سەید عەلی حیجازی نووسیوە.

## محەممەد مەحموود (محەممەد قودسی)

ناوی محەممەد کوڕی مەحمود ئەفەندی ڕەسامە، ساڵی ١٩٢١ و کاتێک خێزانەکەیان ئاوارە و دەربەدەر بوون، لەشاری قودس لەدایک بووە و ئەم ناسناوەی پێبەخشراوە. لەتەمەنی شەش ساڵیدا لەشاری موسڵ چۆتە خوێندنگە و ساڵی دواتر خێزانەکەیان گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لەوێ درێژەی بەخوێندن داوە. پلەی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی تەواو کردوە و پاشان لە بەغدا چۆتە خوێندنگەی سەربازیی و دوای دوو ساڵ خوێندن ساڵی ١٩٤١ لەهەولێر دامەزراوە.



ساڵی ١٩٤٢ بوو بە ئەفسەر و ڕەوانەی ڕواندز کرا. لەوێ دەگەڵ هاوڕێ نیشتمان پەروەرەکانیدا کەوتنە بڵاوکردنەوەی بیری کوردایەتی و ساڵی ١٩٤٣ پەیوەندی کردووە بە بزوتنەوە چەکدارییەکەی ناوچەی (بارزان). پاش شکستهێنانی ئەو بزوتنەوەیە خۆی گەیاندە مەهاباد و لەناو ڕیزەکانی سوپای کۆماری کوردستاندا خزمەتی زۆری کرد و ئازایەتییەکی زۆری نواند، لەبەر ئازایی و دڵسۆزی ئەم ئەفسەرە تێکۆشەرە، پیشەوا کردویەتی بە نەقیب (کاپتان) و شانبەشانی ئەمەش لە بواری ڕامیاری و ڕۆشنبیریدا ڕۆڵی گەورەی گێڕا و کرا بەسەرۆکی یەکێتیی لاوانی کوردستان لە ناوچەی سەقز و بانە.

شەهید محەممەد قودسی لە وتارنووسین و وتار خوێندنەوەدا بەهرەیەکی گەورەی هەبوو، بۆیە ناویان لێنابوو (خەتیبی شۆڕشی کوردستان) ئەم لاوە ڕۆشنبیرە لەبواری چیرۆک نوسینیشدا بە مشوور بووە. چیرۆکی بڵاوکراوەی هەیە و لە گۆڤاری گەلاوێژدا چەند بەرهەمێکی بڵاوکراونەتەوە.

پاش تێکچوونی کۆمار، محەممەد قودسی و سێ هاوڕێکەی مستەفا خشناو، خەیروڵا عەبدولکەریم و عیززەت عەبدولعەزیز کەوتنە دەست کاربەدەستانی عێراق و لە ١٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧دا لەسێدارە دران. گەورەترین سامانی لەپاش بەجێماوی ئەم چوار قارەمانە نامە پیرۆزەکەیانە کە ڕۆژی ١٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ نووسیویانە و تێیدا ئامۆژگاری نەوەکانی دوای خۆیان دەکەن کە دڵسۆزی کوردو کوردستان بن .

## میرحاج ئاکرەیی



«میرحاج ئەحمەد تاهیر ئاکرەیی» ئەویش یەک لەو ئەفسەرە کوردانەی ناو ئەرتەشی عێراق بوو کە پشتیان لە هەموو پلە و پایەیەکی دەوڵەتی عێراق کرد و ژیانی خۆیان بۆ نەتەوەی خۆیان تەرخان کرد. ئەو ئەفسەرە لە کۆماری کوردستاندا ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو، هەم فەرماندەی لکی ٢ی هێزەکانی بارزانی بوو هەمیش چاوەدێری دەوڵەتی کوردستان بوو لە جەبهەی سەقز و سەرا.

لە ١٩-١١-١٩١١ لە ئاکرێ لەدایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لە ئاکرێ و ناوەندی لە موسڵ و بەغدا تەواو کردووە. ساڵی ١٩٣١ لە خانەی ماموٚستایان لە بەغدا وەرگیراوە و ساڵی ١٩٣٤ خوێندنی تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٣٤ بۆ ماوەی ساڵێک لە کۆلێجی سەربازی وەرگیراوە و پلەی ملازمی پێدراوە. بە هۆی هەبوونی ڕۆحێکی پاراوی کوردانە و لەزەبربونی لە بواری نووسین و لێدواندا، توانیویەتی کاریگەری لەسەر خەڵکانی دەوروبەری دابنێ. لە ساڵی ١٩٣٠ دەگەڵ هەندێک لە لاوانی تر (گروپی لاوانی کورد) دادەمەزرێنن کە هەڵگری گوتاری نەتەوەیی بوون. پاشان کە ڕێکخراوی "دارکەر" دروست بوو و بوو بە بناغەی حیزبی (هیوا) لە ٢٧-٥-١٩٣٩ میرحاج و گروپی لاوانی کورد تەڤلی ئەو ڕێکخراوەیە بوون. وەک نوێنەری ئەو حیزبە بە نهێنی سەردانی مەهاباد دەکات و دەگەڵ چەند کەسایەتی لاو و ڕووناکبیری ئەو شارە کە تەژی بوون لە هەستی کوردانە بەردی بناغەی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد - ژ.ک) دادەمەزرێنن. لە دروستبوونی کۆماری کوردستاندا وێڕای ئەفسەرەکوردەکان و عەشیرەتی بارزانی گەورەترین خزمەتیان بەو کۆمارە کرد.

خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا بارزانی متمانەیەکی ئەوتۆی پێ بووە و بەردەوام ڕاوێژی پێکردووە. لە سەرهەڵدانی شۆڕشی بارزانییەکان ڕا تا گەڕانەوەی بۆ کوردستان لە شۆڕوییەوە، وەک نیسێ دەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی بووە. گەر نەڵێین یەک لە دامەزرێنەرانی پارتی دیموکرات بووە بەڵام، لە یەکەمین ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق دێتە ئەژماردن. لە ڕۆژی ٠٩-١١-١٩٨٨ لە بەغدا بە هۆی نەخۆشی کۆچیدوایی دەکات و ڕۆژی ١٣-١١-١٩٨٨ تەرمەکەی لە شاری «ئاکرێ» لە باشووری کوردستان تەسلیم بە خاک دەکرێ.

## مستەفا خۆشناو


نەمر مستەفا خۆشناو

پۆلکۆڤنیک مستەفا خۆشناو» یەک لەو چەند ئەفسەرە کوردانەی ناو ئەرتەشی عێراق بوو کە تێکەڵ بە کۆماری کوردستان بوون و لە ڕێکخستن، دامەزراندن و ڕاهێنانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەستی باڵای هەبوو. لە ساڵی ١٩١٢و لە گوندی «هەرمك» ناحیەی «بێتواتە»ـی قەزای «ڕانیە» لە دایک بووە. تاقانە کوڕی بنەماڵەیان بووە. خوێندنی سەرەتایی لە شاری کۆیە و خوێندنی ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە.

دواتر لە شاری بەغدا خانەی مامۆستایانی بڕیوە و ماوەی دوو ساڵ لە هەڵەبجە وەک مامۆستا خزمەتیکردووە. لە سەرماوەزی ساڵی ١٩٣٤دا چۆتە قوتابخانەی عەسکەری و لە گەلاوێژی ساڵی ١٩٣٦دا بە ئەفسەر لە سوپای عێراقیدا دامەزراوە. شەهید مستەفا خۆشناو هەر لە تەمەنی لاوێتیەوە هەستی کوردایەتی و بیری نەتەوایەتی لە دڵ و دەروونیدا ڕەگی داکوتاوە و لەکۆتایی سییەکاندا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە دامەزراندنی کۆمەڵەی «هیوا»دا.

ساڵی ١٩٤٤ لەلایەن حکومەتی عێراقەوە کرا بە ئەفسەری پەیوەندی لە ناوچەی بارزان.لەو ماوەیەدا بەنهێنی سەردانی ئێرانی کرد و پەیوەندی کرد بە کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژ.ک)ـەوە. لەسەر ئەم هەڵوێستە حکومەتی بەغدا فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ دەرکرد، بەڵام مستەفا خۆشناو خۆی نەدا بەدەستەوە و دەگەڵ چەند ئەفسەرێکی نیشتمانپەروەردا پەیوەندی کرد بە بزوتنەوە چەکدارییەکەی بارزانەوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤دا کۆمەڵەیەکی دامەزراند بەناوی (کۆمەڵەی ئازادی). مەبەست لە دروستکردنی ئەم ڕێکخراوە سیاسیە پێشخستنی بیری کوردایەتی و فراوانکردنی بزوتنەوەکەی

ناوچەی بارزان بوو. پاش شکستهێنانی شۆڕشەکەی بارزانی لە بارزان، ئەم بزوتنەوەیە نەما. شەهیدی نەمر لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٥دا خۆی گەیاندە کۆماری کوردستان و لە یارمەتیدانی ئەو کۆمارەدا رۆڵی کاریگەری گێڕا.

گیانفیدا مستەفا خۆشناو پێشتر فەرماندەی لکی یەکی هێزەکانی بارزانی بوو و پاشان بوو بە فەرماندەی جەبهەی سەرا و سەقز. وەک لەو دەفتەرانەی کاپیتاندا ئاماژەی پێدەکرێت، گەیوەتە پلەی فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان. پاشی تێکچوونی کۆماریش هاوڕێ دەگەڵ سێ ئەفسەری قارەمانی تر بە ناوەکانی خەیروڵلا عەبدولکەریم، مەحەممەد مەحموود قودسی و عیزەت عەبدولعەزیز لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە لە ڕێکەوتی ١٩-٠٦-١٩٤٧ لە سێدارە دران. تەرمی هەریەك لە شەهیدان عیزەت عەبدولعەزیز لە ئامێدی، شەهید خەیروڵلا عەبدولکەریم لە هەولێر و هەر دوو شەهید مستەفا خۆشناو و محەمەد قودسی لە سلێمانی بەخاکی پیرۆزی کوردستان سپێردران.

لە زینداندا و لە دواساتەکانی ژیانیاندا نامەیەکی هاوبەش وەک وەسیەتنامە دەنووسن کە خۆی هەڵگری پەیامێکە بۆ نەتەوەی کورد و وەک مانیفێستێکی نەتەوەیی دەبێ لێی ورد ببینەوە. دەقی وەسیەتنامە بەکۆمەڵەکە بەو چەشنەیە:



نەمر مستەفا خۆشناو

## وەسیەتنامەی چوار ئەفسەرە قارەمانەکە



بەغدا

١٨ی حوزەیرانی ١٩٤٧

لەشوهەدای رێگای نیشتمانەوە

عیزەت عەبدولعزیزو مستەفا خۆشناو و خەیروڵلا عەبدولکەریم و محەمەد مەحموودەوە

بۆ: برایانی میللەتی کوردی خۆشەویست

لە دوای تەبلیغی حوکمی ئیعدام بە یەك سەعات نوسراوە

برایان: لە ژیانی ژێر دەستی و ئیستعماردا لەنوسینی ئەم نامەیەوە تەنیا ١٤ سەعاتمان ماوە بەپەتی ئیستعمار دەگەینە دونیای ئازادی و گیانمان دەگاتە گیانی پاکی شوهەدای رێگای نیشتمان.

برایان: خۆمان زۆر بە بەختیار دەزانین کە بەرامبەر واجبی میللی هیچ دوا نەکەوتین تەنیا نەسیحەتی ئێمە ئەوەیە کە لاوان و نیشتمانپەروەرانی کورد (...) [ئەو دوو وشەیە بە ڕوونی دیار نییە] بکەنە نیشانە و یەکیەتی بکەنە پەیرەوی خۆیان بۆ شکاندنی تەوقی ئیستعمارو رزگارکردنی هەموو میللەتێکی مەزڵوم بێ جیاوازی.

برایان: دوژمنی جەهالەت بن بەهەموو تواناتان شەڕی جەهالەت بکەن وە دوای جەهالەت مەکەون. ئێمە نیشانەی تێکوشینی میللی میللەتی کوردین لەساڵی ١٩٤٧ دا. برایانی ئێمە کە ماون بۆ رێگای شەرەف تێدەکوشن و پشت بەخودای گەورە میللەت رزگار دەبێ.

برایان: سەرکەوتنمان بۆ بەر پەتی سێدارە، مانای بێ دەسەڵاتیمان نیە بۆ تێکۆشان. بەڵکوو وەک سەربازێکی ئازا بەهەموو توانایەکەوە هەوڵمان دا تا گەیشتینە ئەم نەتیجەیە. ئیدی بۆ یەکیەتی وە بۆ ئازادی. بژی کورد و کوردستان.

واژۆ

خیرالله عبدالکەریم، مستەفا خۆشناو، عیزەت عبدالعزیز، محمد محمود

## ئەنوەر دڵسۆز



ناوی تەواوی (ئەنوەر حەسەن عوسمان ئەبوبەکر) بووە. لە ساڵی ١٩٢٤ی زایینی لە «قەڵاتی هەولێر» لەدایک بووە. لە هەرەتی لاوێتییەوە سەرقاڵی جموجۆڵی سیاسی بووە و لە بزووتنەوەی قوتابیان هەڵسووڕاوە. لە ساڵی ١٩٤٢ بەند کراوە و بۆ «فاو» دوور خراوەتەوە. پاش ئازادکردنی لە شاری ڕەواندز بە فەرمانبەر دامەزراوە. لە ساڵی ١٩٤٦ وازی لە فەرمانەرایەتی هێناوە و چۆتە ڕیزی شۆڕشگێران لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد. هەر لە مەهاباد لەسەر پرس و ڕای پێشەوا قازی محەممەد و بە ئامادەبوونی میرحاج باڵەکی و وەهاب ئاغای بێشۆک زەماوەندی کردووە. هاوسەرەکەی ناوی «حەلیمە» و لە بنەماڵەی ناسروای ئەو مەڵبەندە و نەقشبەندی بووە. لە کۆماردا دەبێتە بەرپرسی گومرگ و دابەشکردنی خۆراک لە شاری نەغەدە.

پاش تێکچوونی کۆمارەکە گەڕاوەتەوە عێراق و دەستگیر کراوە و پاشان ئازاد کراوە. جارێکی تر لە کەرکوک بۆ ماوەی ٢ ساڵ بەند کراوە و پاش ئازادبوونی لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوک دامەزراوە. لەساڵی ١٩٦٠ ڕووی لە وڵاتی سۆڤیەت کردووە بۆ خوێندن و لە زانکۆی (لۆمۆمبا) وەرگیراوە وباوەڕنامەی ماجستێری وەرگرتووە.

لەساڵی ١٩٦٥ بۆ دوو مانگ دەستگیر کراوە، کە هیچی لەسەر نەبووە، ئازاد کراوە و پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە کردوە. پاش دوو ساڵ بە ئاگاداری سەرکردایەتی شۆڕش، بەڕێگای سوریاوە گەڕاوەتەوە سۆڤییەت و بڕوانامەی (دکتۆرا)ی لە زمانی ڕووسی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٧٩ بە ڕاوێژکاری یاسایی لە وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراق دامەزراوە .ئەنوەر دڵسۆز زانا و زیرەک لە زمانی کوردی وعەرەبی و تورکی و فارسی و ڕووسی بوو، ئەڵمانی و فەرەنسیشی زانیوە. گەڵێ وتار و بابەتی ڕۆژنامەوانی هەیە.

ئەنوەر دڵسۆز لە ساڵی ١٩٩٥ی زایینی کۆچیدوایی کردووە و لە گۆرستانی بنەماڵەکەیان لە (باداوە) بەخاک سپێردراوە. دوو کور و شەش کچی لە دوا بەجێماوە.

[بەشیکی ئەم کورتە ژیاننامەیەم لە ماڵپەڕی کوردیپێدیا وەرگرتووە و بەشێکیشم لە ڕۆژنامەی کوردستان، ئامادەکردنی: ڕەفێق ساڵح و سەدیق ساڵح، چاپی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر - ٢٠٠٧ وەرگرتووە]

## حەزرەتی شێخ عەلائەدینی حوسێنی نەقشبەندی (کەمالیزادە لە ڕۆژهەڵات)



خوالێخۆشبوو حەزرەتی شێخ عەلائەدین حوسێنی نەقشبەندی کوڕی حەزرەتی شێخ جەلال لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٢٤ی مانگی ( ڕێبەندانی ١٢٧٥ هەتاوی – February ١٨٩٧) لە گوندی «زینوێ شێخی» لە دایک بووە. ئەو گوندە پێشتر شوێنی ڕێنوێنی و زانستی ئایینی ڕێبوارانی نەقشبەندی بووە و باب و باپیرانی حەزرەتی شێخ عەلائەدین (لە کوردیدا بە شێخ «عەلاوەدین»ـیش دێتە زمان و کاپیتان حەمەدیش هەر بە شێخ عەلاوەدین ناوییانی هێناوە) لەو گوندە پەرەیان بە ئایینی ئیسلامی و پەروەردەکردنی تینووانی زانستی ئایینی داوە و بە (دارولئیرشاد – دارالارشاد) پێناسە کراوە.

بە گوێرەی فەرموودەکانی حەزرەتی سەید «تەها کەمالیزادە» کوڕەگەورە و جێنشینی حەزرەتی شێخ عەلائەدین؛ پشتیان بە خزمایەتی لە لایەک دەگاتەوە «ئیمام عەلی نەقی» و لە ئەویش ڕا دەگاتەوە «ئیمام جەعفەری سادق». لەلایەکی تریشەوە لە دایکی ئیمام سادقەوە بە خزمایەتی دەگەنەوە «قاسم کوڕی محەممەد» و لە ئەویش ڕا دەگەنەوە حەزرەتی «ئەبوبەکری سەدیق»[1]. ئەو ماڵباتە مەزنە خزم و تایفەیان لە هەموو بەشەکانی کوردستان هەن و خاوەن ڕێز و حوورمەتی گەلی خۆیانن. بەشێکی ئەو بنەماڵەیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە کەمالیزادە یا کەمالیزادەی نەقشبەندی دەناسرێن.

حەزرەتی شێخ عەلائەدین هێشتا لاوێکی ١٩ ساڵانەی کەمئەزموون بووە کە باوکیان ئەمری خوا بەجێدەگەیێنێت و کۆچیدوایی دەکات. بەڵام لێهاتووی و پەروەردەی ڕەسەنیان وا دەکات کە

[1] بڕوانە کورتکراوەی بەستەری ئەو سەربوردەیە: https://bit.ly/٣aB٩٨٧e

لەلایەن ڕێنسپییەکان و خەلیفەکانی ئەو ماڵباتە، حەزرەتی شێخ عەلائەدین وەک جێگرەوەی باوکیان قەبوڵ بکەن و دەستی موریدانەیان بۆ بە سینگەوە بنێن. لەبەر ئەوەی تینوان و موریدانی ئەو خانەدانە بەردەوام لە گەشە بووە و گوندی «زینوێ شێخی» توانای ڕاگرتنی ئەو شەپۆلە لە موریدانی نەبووە، حەزرەتی شێخ عەلائەدین لە یەکەم هەنگاویاندا گوندی «خەلان» وەک دارولئیرشادی خۆی هەڵدەبژێرێ. بە پێی پلە و پایەی ئایینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو ماڵباتە لە کوردستاندا، هەروەها شوێنی نیشتەجێبوونیان لە شوێنێنکی گرینگ لە کوردستاندا کە لە سێسوچکەی سنوورە دەستکردەکانی کوردستان (باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات) هەڵکەوتووە، وایکردووە کە بەردەوام چارەنووسیان دەگەڵ ڕووداوە گرینگەکانی سەردەمیان گرێ بدرێ و ڕۆڵی یەکلاکەرەوە و تا ڕادەیەکی زۆر ڕۆڵی ئاشتیخوازانە بگێڕن. پەیمانی بەناوبانگی (سێسنوور) لە ناوچەی «داڵانپەڕ» کە لە سەردەمی کۆمار کوردستاندا لەلایەن نوێنەرانی (کۆمەڵەی ژ.ک) لە ڕۆژهەڵاتەوە و (حیزبی هیوا) لە باشووریی کوردستان ئیمزا کرا، تێیدا شێخ عوبەیدیللای حوسێنی نەقشبەندی «شێخ عوبەیدیللای زینوێ» دەگەڵ سەید عەبدولعەزیزی شەمزینی، نوێنەرایەتی حیزبی هیوایان دەکرد. هەروەها بەشداریکردنیان لە شۆڕشەکەی حەزرەتی شێخ عوبەیدیللا شەمزینی ڕا تا شەڕ لە دژی ڕووسەکان و داڵدەدانی خەڵکی برسی لە قاتوقڕییەکەی ئەو سەردەمدا و زۆر ڕووداوی تر، شوێنپەنجەی ئەو بنەماڵەیە دیارە.

لە سێبەری ئەو بنەماڵەیەدا هەموو چین و توێژەکانی کوردستان دەحەسانەوە. سەرەڕای ئەوەکە ئەو ماڵباتە مەزنە بە گەشەپێدەرێکی جوانی ئایینی ئیسلام دەناسرێن، کەچی باوەڕمەندانی گشت ئایینەکانی تر لەلایان حەساوە بوون و هەستیان بە ئۆقرەیی دەکرد. جگە لەوەش لەلایەن گشت عەشرەت و شێخەکانی تری کوردستانیشەوە ڕێز و حووڕمەتێکی ئەوتۆی ئەو ماڵباتە بەگشتی و حەزرەتی شێخ عەلائەدین بەتایبەتی دەگیرا و قسەی بەڕێزیان لەنێوان ناکۆکییەکانی ئەو سەردەمی عەشیرەت و شێخەکاندا وەعەرزێ نەدەکەوت. ئاشتیخوازی، تەبایی و برایەتی، فەلسەفەیەک بوو کە هەڵقوڵاوی تێڕوانییە ئایینی و سۆفیگەرایانەیانەکەیان بوو.

پلەوپایەی ئەو ماڵباتە بەتایبەت حەزرەتی شێخ عەلائەدین لە ناو دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانیش حاشای لێنەدەکرا و بەردەوام لە هەوڵدابوون کە خۆ لە جەنابی شێخ نیزیک بکەنەوە تا لە ڕێگای بەڕێزیانەوە بتوانن ئۆقرەیی و ئارامی لە ناوچەکەدا بپارێزن. ئەو پێوەندییە بەچەشنێک بووە کە هەرکات حەزرەتی شێخ سەفەری کردبا بۆ عێراق یان ئێران، گەر لەلایەن شا و مەلکیکی ئەو دەوڵەتانە پێشوازی لێنەکرابا، بە دڵنیاییەوە نوێنەرێکی تایبەتی بۆ پێشوازی کردنی تەرخان دەکرا.

لەپاش تێکچوونی کۆماری کوردستان و کۆماری ئازەربایجان، ئەو ماڵباتە بەگشتی و لە سێبەری بڕیارە ژیرانەکانی حەزرەتی شێخ عەلائەدین زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی چالاکی ئەو دوو

کۆماره، پەنایان بۆ حەزرەتی شێخ عەلائەدین دەبرد و بەڕێزیشیان هەمەجۆرە دەستی بەسەردا دەگرتن. وەک لە بەڵگە مێژووییەکاندا هاتووە، ئەو زاتە پیرۆزە لەپاش تێکچوونی کۆماری کوردستان، بە کەڵکوەرگرتن لە پێوەندییەکانی خۆی دەگەڵ پاشای عێراق، هەوڵیدابوو کە مافی پەنابەریەتی بۆ پێشەوا قازی محەممەد وەربگرێت و گیانی پێشەوا بپارێزێ. تەنانەت ئەو بەڵێنەشی لە بەرپرسانی دەوڵەتی عێراق وەرگرتوو و پێشەوای قازی محەممەدیشی لێی ئاگادار کردۆتەوە، بەڵام پێشوا قایبل نەبووە و مەهابادی بەجێنەهێشتووە.

حەزرەتی شێخ عەلائەدین لە ڕێکەوتی چوارشەممۆ ١٧ی خەرمانانی ساڵی ١٣٤٤ی هەتاوی (١٢,٥,١٣٥٨مانگی - ٨,٩,١٩٦٥ زایینی) بە هۆی نەخۆشی دڵەوە، دڵە بەڕۆحم و گەورەکەیان لە لێدان کەوت و خێڵی موریدان و خۆشەویستانی خۆیانی بەجێهێشت و لە گۆڕستانی (اعظمية) لە باکووری بەغدا کە شوێنی هەتایی کەسایەتییە گەورەکانە لە عێراق،[1] بە خاک دەسپێردرێت.

سپاس بۆ بەڕێز سەید جەبار کەمالیزادە، نەوەی حەزرەتی شێخ عەلائەدین لە وڵاتی ئاڵمان کە یارمەتیدام ئەو کورتە ژیاننامەیە لەسەر حەسرەتی شێخ بنووسم.



حەزرەتی شێخ عەلائەدین حوسێنی نەقشبەندی

[1] بڕوانە کتێبی (سادات نقشبندی و جنبشهای ملی کرد در گذر تاریخ) نووسینی "سەید عەبدولڕەحمانی حوسێنی نەقشبەندی"، وەرگێڕانی محمد بانەای، چاپی "ارومیه - موسسه انتشاراتی حسینی" لاپەڕەی ١٨٠. - هەروەها گۆڤاری هاوار - ساڵی دووهەم - ژمارەی ٧ - ڕێبەندانی ساڵی ٢٠٠٠ - چاپی ئاڵمان - لاپەڕەی ٢١

## سوڵتان ئاغا شێخ ئاغایی | شێخ ئاقایی



خوالێخۆشبوو سوڵتان ئاغای شێخ ئاقایی - شێخ ئاغایی کوڕی حاجی باقر کوڕی میرسوڵتان کوڕی برایم ئاغا کوڕی شێخ ئاغا کوڕی بەیرەم ئاغا لە عەشیرەتی دێبۆکرییە. دایکی کە ئامۆزای باوکی بووە، ناوی «قەمەرتانج» بووە. بە پێی سجیل لە ساڵی ١٣٠٠ هەتاوی واتە ١٩٢١ی زایینی لە دایکبووە. هەندێک خزم و کەسیان پێیانوایە کە ڕەنگە تەمەنی سولتان ئاغا لەوەش باتر بووبێ. ئەو بنەماڵەیە پشت لە دوای پشتیان دەستڕۆییشتوو، مڵکدار و خاوەن زەوی بوون. زۆربەی مڵکەکانیان لە تاڵاو، ستەک، گردەسوور و مەرجاناوێ بووە. بە هۆی ئەوەی کە ماڵیی لە گوندی تاڵاوێ بوو، ناوبانگیشی بە سوڵتان ئاغای تاڵاوی دەرکردووە. یەکجار زەماوەندی کردووە و خاوەن ٢ کوڕ و شەش کچ بووە.

لەچاو منداڵانی سەردەمی خۆی کەسێکی زیرەک و خوێندەوار بووە و تا پۆلی سێی ناوەندی خوێندوویەتی. زۆر هۆگری موتاڵا و خوێندنەوەی کتێب بووە. جگە لە زمانی فارسی و ئازەری و کوردی، سێ زمانی وەک فەرانسەوی، ڕووسی و عەڕەبی-یشی تا ڕادەیەک زانیوە.

مێرمنداڵی ئەو خوالێخۆشبووە هاوتەریب بووە دەگەڵ گەشەی بیری چەپ و سوسیالیزم لە جیهاندا و ئەویش بە هیوای پێکهێنانی سیستێمێکی دادپەروەرانە بۆ گەلەکەی لەو بیرە نیزیک بووەتەوە و لە ساڵی ١٣١٩ھ - ١٩٤٠ز بە فەرمی لە تەورێز تێکەڵ بە ڕێکخراوی جەوانانی حیزبی تودە بوو کە ئەوکات ئەو حیزبە یەکەم حیزبی هەڵگری ئاڵای سوسیالیزم و چەپ بوو لە ئێراندا. ئەو کە سوێندخۆری کۆمەڵەی ژ.ک بوو، پاشان لە کۆماری کوردستاندا پلەی باڵای سەربازی پێدرا.

بە تێکچوونی کۆماری کوردستان ئەو دەستی لە خەبات هەڵنەگرت و دەگەڵ تێکۆشەرانی حیزبی دیموکڕات، شانەکانی ئەو حیزبەیان بە نهێنی بەڕێوە دەبرد، هەر بەو هۆیەشەوە پێنج جاران گیرا کە سەرجەم دەیکردە ١٦ ساڵ و ٣ مانگ. هەموو جارێش بە بەرتیلێکی یەکجار زۆر کە کەس‌وکارەکەی دەیاندا بە بەرپرسانی ئەوکاتی ڕژێمی پاشایەتی، بەریان دەدا. لە زیندانەکانی جەڵدیان، ورمێ، قزڵ حەسار، زەنجان و فەلەکولئەفلاک حەپسی بووە.

له شۆڕشی جوتیارانی موکریان دژی ئاغاوەت و مڵکدارەکانی ناوچەکە لە ساڵی (١٣٣٠ھ - ١٩٥١ز)، وەک شۆڕشگێڕ و ڕووناکبیرێکی ڕەسەن ڕۆڵی سەرەکی گێڕاوە و یارمەتی وەرزێڕانی داوە تا مافی خۆیان لە ئاغاوەتەکان بستێنن. ئەوە لە حاڵێک دایە کە بۆخۆی مڵکدار و ئاغاوەت بووە، بەڵام باوەڕی تەواوی بە یەکسانی و دادپەوەری و مافی تاک و گەشەی کۆمەڵگای کوردەواری هەبووە بۆ گەییشتن بە ڕزگاری و لەو ڕێیەشدا نرخێکی زۆری دانا. لە سەردەمی شۆڕشی چەکدارانەی ساڵەکانی ١٣٤٧ و ١٣٤٨ بۆ ماوەیەک لە باشووری کوردستان تێکەڵ بە شۆڕشگێرانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەبێ، بەڵام هەم بە هۆی گرفتی تەندروستی (چوون بە هۆی تەسادوف لاقێکی لەدەست دابوو) و هەم لەبەر پلە و پایەی کۆمەڵایەتی سوڵتان ئاغا کە دوکتور قاسملووو پێیوابوو سوڵتان ئاغا لە ناوخۆی وڵات زیاتر دەتوانێ خزمەتی بکات، بۆیە لەسەر داوای سەرکردایەتی حیزبی دیموکڕات و بەتایبەت شەخسی دوکتور قاسملووو هاتەوە ناو شار و بەو هۆیەوە بۆ ماوەیەکی زۆر گیرا. تەنانەت لە دادگای ئەوکاتیدا نەیهێشتبوو پارێزەری بۆ بگرن و بۆخۆی بەرگری لە خۆی کردبوو. ئەو داکۆکییەی سوڵتان ئاغا وەها شارەزایانە بوو کە قازی و بەرپرسانی دادگا پیی سەرسام ببوون و لێیان پرسیبوو کە کێ ئەو داکۆکینامەیەی بۆ نووسیوی، لە وەڵام دا سوڵتان ئاغا دەڵێ کە من زۆربەی تەمەنم لە زینداندا تێپەڕاندووە و لە ناو زینداندا فێر بووم.

لە ژیانی تاکەکەسی دا بە کەسێکی ڕەنگپیاو و مێرخاس و دڵگەورە بەناوبانگ بوو، بەڵام لە هەمانکاتیشدا زۆرداری لە کەس قەبوڵ نەکردووە و لەسەر مافە ڕەواکانی گەلی خۆی کۆتا نەهاتووە و شێلگیرانە و پێداگرانە تێکۆشاوە تا دژی زۆرداری و بێدادی بوەستێتەوە جا ئەو کارە چ دەرئەنجامێکی بۆ ئەو هەبووبێ بە دڵ و بە گیان ئامادە بووە نرخەکەی بۆ دابنێ.

سوڵتان ئاغا لە ٢٠ی سێپتامبری ساڵی ١٩٩٢ کۆچیدوایی دەکات و تەسلیم بە خاکی پیرۆزی کوردستان کرا.



خوالێخۆشبوو سوڵتان ئاغای شێخ ئاقایی

## دوکتۆر ڕەحیمی قازی



خوالێخۆشبوو«ڕەحیم قازی» یان «ڕەحیمی سەیفی قازی» کوڕی «سیف القضات» شاعیر و گەورەپیاوی ناوداری کورد و موکریانە کە لە زمان خەڵکی سابڵاغەوە بە «ڕەحیم ئاغا» بانگ دەکرێ برای شەهیدی نەمر «حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی» و ئامۆزای «پێشەوا قازی محەممەد»ـی نەمرە. لە ساڵی ١٩٢٦ لە گوندی «گوێگجەلی» و لە بنەماڵەیەکی مڵکدار و دەستڕۆیو لەدایک بووە.

ڕەحیم قازی لە سێپتامبری ١٩٤٥ لەگەڵ کچی سەدری قازی ژیانی هاوسەری پێک دێنێ. تازە زاوا بووە کە لەلایەن دەوڵەتی کوردستانەوە دەگەڵ ٥٥ کەس لە خوێندکاری تر لە ئاوریلی ساڵی ١٩٤٦ دا بۆ خوێندن ناردرا بۆ مەدرەسەی نیزامی لە باکۆ. لە ئۆکتۆبری ١٩٤٦ لە کاتێک دا لە باکۆ بووە حەسەنی کوڕی لە دایک دەبێ. چارەنووسی ئەو باب و کوڕە وا دەبێ کە حەسەن بۆ یەکەمین جار لە تەمەنی ٢٥ساڵاندا لە مانگی ئاوریلی ١٩٧١ لە مۆسکۆ چاوی بە بابی دەکەوێ.

پاشی تێکچوونی کۆمار و شەهید بوونی برا و ئامۆزاکانی لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، ئەو بۆی نەکرا بگەڕێتەوە کوردستان و دەگەڵ چەند خوێندکارێکی تر لە ئازەربایجان مایەوە. لەوێ سەر لەنوێ ژن دێنێتەوە و لە هاوسەری دووهەمی دوو کچی دەبێ.

لە مەدرەسەی حیزبی درێژەی بە خوێندن دا و ساڵی ١٩٥١ چوو بۆ بەشی دوکتۆرا و دیفاعی لە بابەتی تێزی دوکتۆرایەکەی کرد کە بریتی بوو لە «حیزبی دێمۆکراتی کوردستان ڕێبەر و ڕێکخەری بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوەیی کوردستانی ئێرانە ( ١٩٤٥ - ١٩٤٦)». هەم جێگری سەرۆکی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوو هەم بەڕیوەبەری ڕۆژنامەی کوردستان بوو کە لە باکۆ دەردەچوو، هەم بەڕێوبەری ڕادیۆی دەنگی «کۆمەڵ» بوو کە لە موکریان بە « ڕادیۆ دزە» بە ناوبانگ بوو، لە پەنا ئەو کارانەش لە باکۆ و لە غەریبایەتی کۆڵی نەداوە و یەکەم ڕۆمانی کوردی بە زاراوە سۆرانی نووسی بەناوی (پێشمەرگە) کە زۆر دەنگی دایەوە. هەتا ئێستا ڕۆمانی پێشمەرگە ٥ جار چاپکراوەتەوە و وەرگێڕدراوەتە سەر شێوەزاری کورمانجیش. یەکەمجار لە سوێد و دووجار لە تورکیا چاپکراوەتەوە. هەروەها بەزمانی ئەرمەنیش چاپ کراوە، تا ئێستا لە باشوور و دەرەوەی

وڵات لە سەر ڕۆمانی پێشمەرگە تێزی ماستەر و تەنانەت پی.ئێچ.دی(PHD) نووسراوە. ڕۆمانی پێشمەرگە وەرگێردراوە بە زمانی ئینگلیسیش و بریارە بەو زمانەش چاپ بکرێ. ئەو خوالێخۆشبووە کتێبێکی دیکەی چاپ کراوە بە ناوی «بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوایەتیی گەلی کورد و قازی محەممەد ١٩٤١ - ١٩٤٧» کە لە دوای مەرگیی لە ساڵی ٢٠١٢ دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی ئاراس لە هەولێر چاپی کردووە.

لە مانگی ئاوریلی ساڵی ١٩٧٩ دوای ٣٣ ساڵ ژیان لە ئاوارەییدا و پاش ڕووخانی تەختی پاشایەتی لە ئێران، گەڕایەوە زێدی خۆی لە مەهاباد و لەلایەن خەڵکی ئەو شارەوە بە گەرمی پێشوازی لێکرا. بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات دەگەڵ تێکۆشەرانی حیزبی دیموکڕات تێکەڵ بە خەباتی سیاسی بوویەوە بەڵام ئەوجارەیان دەگەڵ هەندێک لە ئەندامانی باڵای ئەو حیزبە ناکۆکییان لێ پەیدا بوو و جیا بوونەوە کە بە «تاقمی حەوت کەسی» یا «تاقمی کۆنگرەی ٤» نێودێر بوون. بە ناچار دیسان ڕێگای غەریبایەتی دەگرێتەوە بەر و ئیتر تا کۆتایی تەمەنیان بۆ مەهاباد نەگەڕایەوە.

خوالێخۆشبوو ڕەحیم سەیفی قازی لە ڕۆژی ٩ی مانگی مەی ساڵی ١٩٩١ لە شاری باکۆ کۆچیدوایی کرد.

ڕۆحیان شاد.

## مێژووی دامەزراندنی یەکەم ڕادیۆ لە مەهاباد

لە مێژووی شاری مەهەبادا بۆ یەکەمجار لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا ڕادیۆ لە ڕێکەوتی ڕۆژی سێشەممۆ ١٠ی بانەمەڕی ساڵی ١٣٢٥ دامەزراوە و خوالێخۆشبووان مامۆستا هەژار موکریانی، عەلی خوسرەوی و ڕەحمان ئووەیسی بێژەر و نووسەری ڕادیۆکە بوون. لەو پێوەندییەدا وتووێژێکی درێژم دەگەڵ کاک «عەلی قازی» کوڕی پێشەوای نەمر کردووە کە تێیدا کاک عەلی باسی لە سەردەمی کۆمار کردووە و بەتایبەت ڕۆڵی محەممەدی مامڵێ لەو ڕادیۆیەدا کە لەوێ گۆرانی بۆ خەڵک گوتووە. باوکم هونەرمەند محەممەدی مامڵێ چەندجار باسی ئەو ڕادیۆیەی بۆ گێڕاوەمەتەوە کە چۆن هەواڵەکانی جەبهەی شەری پەخش دەکرد و چۆن گۆرانی لێ گوتووە، کە جیا لە گۆرانی ئاسایی، سرودیشی گوتووە، بەتایبەت سروودی «خوایە وەتەن ئاواکەی». هەروەها یای «خورشیدی ڕەهبەر» هاوژینی کاپیتان حەمەدی مەولودی کە دەبێتە دایەگەورەم، بە دەیانجار باسی ئەو ڕادیۆیەی بۆ دەکردین کە چۆن باس و خەبەری جەبهەکانی شەڕی دەکرد و بە کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچییان هەڵدەگوت. تەنانەت شتێکی تریشی باس کرد کە بە پێویستی دەزانم

بینووسم و دەیگوت بڵیندگۆیان لەسەر ماشێنان دادەنا و بە ناو کوچە و شەقامەکانی شاردا دەگەڕا و خەبەری سەرکەوتنەکانی پێشمەرگەیان بە فەرماندەیی کاپیتان حەمەدی مەولودی باس دەکرد. لە کتێبی «شانێک بە بەر شانی نیشتمانەوە» ژینواری عیزەت سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، لاپەڕەی ٣٤ نووسەر باس لە بیرەوەرییەکانی خۆی لە سەردەمی کۆمار و شادی و خۆشی کوڕ و کچانی مەهاباد لەو ڕۆژگارەدا دەکات، بە تایبەت دەنگی محەممەدی ماملێ کە لەسەر بڵیندگۆیەکانی ئەو ڕادیۆیە بڵاو دەکرایەوە. تێیدا ئاوا دەنووسێ:

— (ئاسودەیی خەڵکەکەش لە ژیانی ئاسایی ڕەنگی دەدایەوە، من هەر چەندە بە تەمەن هەرزەکار بووم، بەڵام سەلیقەی پڕ جۆشی مەهابادییەکانی ئەو زەمەنەم لەبەر چاو هەرگیز ون نابێ. بۆ دەربڕینی زەوقی ئاهەنگ و خۆشییان، زۆربەی ئێواران کچ و کوڕانی جوانی مەهاباد، بە پێ بەرەو بەری مەحموودکان و لای باغی میکاییل ڕێچکەیان دەبەست و شادی و شاییان دونیای پڕ دەکرد لەبەر تەپڵ و نایە و دەنگی شایەرەکان هەڵدەپەڕین. هەروەها ئێوارانیش هونەرمەندی گۆرانیبێژی گەورە محەممەدی ماملێ، ڕاستەوخۆ لەسەر بڵیندگۆکانەوە، بە دەنگە خۆشەکەی مەهابادی دەهێنایە زەوق و سەفا، چ خەونێک بوو ئەو ڕۆژانە خودایە، هێندە کورت و لەبیر نەکراون).

لە ڕاپۆرتێکدا بە ناوی (کوردستان قسە دەکا) کە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ٤٣ - ساڵی یەکەم - شەممۆ ١٤ بانەمەر ١٣٢٥ لە لاپەڕەی یەکەمدا چاپی کردووە، تێیدا دەنووسێ کە: (ئیستاسیۆنی ڕادیۆی مەهاباد پایەتەختی حکومەتی میللی کوردستان دەگەڵ ٥ دەستگا بڵیندگۆ کە ١- لە حەوشەی کانگای حیزبی دیموکڕات ٢- لە پێشمەرگەخانە ٣- ڕووبەڕوی شارەوانی ٤- ڕووبەڕوی خانوی حەزرەتی پێشەوا ٥- ڕووبەڕوی مزگەوتی عەباس ئاغا، نەسب کران) دانرا و ڕەسمەن کرایەوە و جێژنێکی جوان گیرا بوو.

هەروەها گرینگە کە ئاماژەی پێبکرێ کە بەڕێز عەلی کەریمی لە کتێبی "ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمانی زەبیحی - مامۆستا عولەما"ـدا و لە لاپەڕەی ٢٢٥دا لە زمان پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵەوە باسی یەک لە ئاوارەکانی کۆماری کوردستان دەکات کە پەنای بردۆتە سلێمانی و لە ماڵی بابی پرۆفیسۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ داڵدە دراوە و ناوی ( دەروێش عەبدوڵا )ـیە و خەڵکی سابڵاخ بووە و ژەنیاری دەفەش بووە کە بە گوتەی خۆی لە سەر بڵیندگۆی کۆمار (ڕادیۆی کۆمار) گۆرانی و سروودی گوتووە و دەفەی لێداوە.

## بەڵگەی ژمارە یەک[1]

نامەی یەک لە بەرپرسانی عەجەمی دەوڵەتی ئێران لە مەهاباد بە ناوی «قاسمی» کە دیار نییە بەرپرسی کام ئیدارە بووە و بەدووری نییە هەمان کەس بێ کە کاپیتان باسی دەکات. دەگەڵکوو ئەرتەشی شاهەنشاهی لە مەهاباد ڕادەکەن، ئەو بەرپرسانەش لە ترسی گیانی خۆیان ماڵ و حاڵیان بەجێدەهێڵن و ئەو شارە چۆڵ دەکەن. یەک لەوانە کە ناسناوی قاسمی‌یە نامەیەک لە ورمێ ڕا بۆ ئەمر سەدری قازی دەنێرێ و بە پاڕانەوە و لاڵانەوەیەکی سەرشۆڕانە و بێوێنە داوای ماڵەکەی دەکاتەوە. دەق و وەرگێردراوی نامەکە دەگەڵ وێنەی نامەکە لێرە وەک خۆی دادەنێمەوە.



[1] ئەو نامەیە کاک حەسەنی قازی بۆی ناردم کە زۆریان سپاس دەکەم.

**[١٣ی ڕەزبەر**

**لە خزمەت دۆستی بەڕێز و خۆشەویستم کاک سەدری قازی**

**بە قوربانت بم لەپاش پێشکەشکردنی ڕێز و سڵاوی بچووکانە، هیوادرام ئێوەی بەخشەندە و مێرخاس باش و سڵامەت بن. گەر دەخوازن لە حاڵی منی خزمەتکارتان بپرسن، لە سێبەری خودای لەشم ساغە و ئێستا لە ورمێ چاوەڕوانی هاتنی سەرۆکم کە بڕیار وایە لە تارانەوە بێ. هیوادرام بە زوویەکی زوو دیدارتان دەگەڵ تازە بکەمەوە. سڵاوم هەیە بۆ خزمەت زانای بەڕێز حەزرەتی قازی.**

**ئاغای پایەبەرز و خاوەن شکۆ، کەلوپەلی بچوکتان لەلای کاک «ساڵح شاتری»ـین کە ئەو شتانەن:**

١. جووتێک بەڕەی دوو گەزی ئەفشار.
٢. دەنکێک مافووری سێ لە چواری کاشان.
٣. بەڕەیەکی دوو گەزی بیجاڕ.
٤. بەڕەیەکی دوو گەزی ئەفشار.
٥. کیفێکی نەخشە.
٦. تەلەفۆنێکی سەر میزی.

**تکایە ئەو کەلوپەلەم لە بەڕێزیان بۆ وەرگرەوە و ئەوەی دەشمێنێتەوە دەگەڵ کەسێکی باوەڕپێکراوی خۆتان بینێرنە ورمێ.**

**دونیایەک سپاستان دەکەم. لە خودا دەکەم تەڵەبێ کە ناوبانگی چاکیتان زیاتر بکات و لەوە زیاتر ڕێز و کەرامەتی پێ ببخەشێ و سایە و سێبەری لە گەشە بێ.**

**کاکی بەڕێز و بە قەدرم داوا لە بەردەم وجودی بەخێر و مەبارەکتان دەکەم کە ئەو زەحمەتەشم بۆ بکێشن زۆرتان ئاگا لە کەلوپەلەکەم بێ تا لە ڕێگا لێم عەدم نەبێ و نەشکێن. تکایە شۆفیرەکەی بەرپرسیار بکەن. لێرە من بیست تمەن پێشکرێ دەدەم بە کاک «ستراک»ـی شۆفر بەڵام بار کردنی کەلوپەلەکە لە گەردنی خۆتانە. تەنانەت کرێی هات و چۆی ئەو کەسانەی کە ماڵەکەم دەهێنن گەر ئیزن بدەی لە ئەستۆی خۆم دەبێ. لە کۆتاییدا هیوای تەمەندرێژی ئێوەی بەڕیز لە دەرگای خودای مەزن داواکارم.**

**بەو پەڕی ڕێز و حووڕمەتەوە - قاسمی**

**واژۆ**

**هەرکام لە کەلوپەلەکەی منتان پێویست بوو، دەتوانن لای خۆتان گلی بدەنەوە و زۆریش شاد دەبم.**

**واژۆ]**

## بەڵگەی ژمارە دوو[1]



وزارت دارائی

جناب آقای نخست وزیر

[illegible]

ڕێکەوت: (جوان ناخوێندرێتەوە) وەزارەتی دارایی

ژمارە: ٦٥٩٤- ١٨٣٢٨ بەشی ماڵیی

هاوپێچ: تایبەت بۆ ئارشیوی گشتی

بەڕێز سەرۆکوەزیری هێژا

وەک لە نامەی ژمارە ١٢٣-٣٦٣ ڕێکەوتی ٥-٣-٢٢ سەبارەت بە ڕەوشی گشتیی شاری مەهاباد باسم کردبوو دیسان پێتان ڕادەگەیێنم کە بەو چەشنەی کە سەرۆکی دارایی لە تێلێگرافی ژمارە ٤١٢٢ - ٣-٥-٢٢ ئاماژەی پێدا بوو، تا ئێستا هیچ ئاوڕێک لە کێشەکە نەدراوەتەوە و کارمەندانی دەوڵەت زۆر لە دۆخێکی دژوار دان و ئێستاش شەڕفرۆشان دەست لە شەڕەنگێزی هەڵناگرن و لە شەوی یەکی جۆزەردانی ئەوساڵ ماڵی ڕەئیسی دارایی کە شوێنی حەسانەوەی خۆی و بنەماڵەکەی بوو هێرشی کرایە سەر و بە ١٠ تیران فیشەکبارانیان کردووە و بە چەند ڕۆژان جارێک بە بیانووی آرد وەرگرتن هێرش دەکەن سەر ئەو ئیدارەیە و هەڕەشە لە ڕەئیسی ئیدارەکە دەکەن - هەروەها ئەو ڕەئیسە دەڵێ کە گشت شارۆمەندانی مەهاباد چەکدارن و پادگان و ژاندەرمەریش کەسی لێ نییە تا بتوانن پێشیان پێ بگرێ و شارەبانیش هەروەها هیچی لە دەست نایەت. ئێستا داواتان لێ دەکەین فەرمان بدەن لە لایەن وەزارەتی ناوخۆوە کارێکی جیددی بۆ سەقامگیری ئاسایش ئەو شارە بکەن و داواکارین لە بڕیارەکانتان ئاگادارمان بکەنەوە.

وەزیری دارایی سەرۆکی گشتیی دارایی

---

[1] سپاس بۆ کاک حەسەنی قازی کە ئەم بەڵگەیی دامێ.

## بەڵگەی ژمارە سێ[1]

[وەزارەتی ناوخۆ - سەرۆکی گشتیی شارەبانی ئێران - ژمارە ۱۱۱۵۱-۷۱۲۶-۱، ڕێکەوتی ۱۳-۸-۱۳۲۵ (نهێنی)

بۆ وەزارەتی ناوخۆ

ئیدارەی پۆلیسی شاری سنە بە ژمارەی (۷۴۲) - ۲۵-۷-۳۰ پێتان ڕادەگەیێنێ کە کەسێک بە ناوی محەممەدی مەولود خەڵکی مەهاباد کە پێشتر قاچاغچی بووە، وەک دەڵێن لەساڵی ۱۳۲۰ دەگەڵ کەسانێکی تر لە قاچاغچییەکان بۆ شاری ئیسفەهان دوورخراوەتەوە، ماوەیەکە بە نوێنەری حیزبی جەوانان مەهاباد هەڵبژێردراوە و بە دێ و دێهاتی ناوچەی سەقزدا دەگەڕێ و ئەو لاوانەی کە لە تەمەنی ۱۵ تا ۳۰ ساڵە دان ڕادەکێشێتە ناو حیزبەکەیان و ناونووسیان دەکات و هێمایەکی سوور کە لە پارچە دروست کراوە لە سینگیان دەدات و لە هەرکامیان مانگانە بڕە پارەیەک وەردەگرێت و دەینێرێتەوە بۆ مەهاباد.

لە لایان سەرۆکی گشتیی شارەبانی ئێران - پاسیار یەکەم حیسام وەزیری - واژۆ]



---

[1] ئەم بەڵگەیە لە ئارشیوی بنکەی ژین وەرگیراوە.

## حیزبی ئازادیی کوردستان

شەڕی چالدێران (١٥١٤ز) بەدوای خۆیدا دوژمنداریێتی و شەڕە درێژخایەنەکانی لە نێوان ئیمپێراتورییەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەوییەکانی لە ئێران لێکەوتەوە. ئەو شەڕ و ناکۆکییانە بە ئاشکرا ماڵیی کوردی وێران کرد و سەرەتایەک بوو بۆ دابەشکردنی کوردستان لە داهاتوودا.

لە پەیمانی ئەرزروومی دووهەم لە نێوان دوو زلهێزی عوسمانی و مەمالیکی مەحسوورە (ئێران) لە ١٠-٣-١٢٢٦ هەتاوی برابەر بە ٣١ مەی ١٨٤٧ و لە ئاکامدا و لە پاش چەند ساڵی تر دووژمنکاری و شەڕ لە ساڵی ١٩١٣ز کە کاری دەستنیشانکردنی سنوورەکانی لە نێوان ئەو دوو دەستەڵاتە بڕیاری لەسەر درا، سنووری دەستکردی نێوان ڕۆژهەڵاتی کوردستان و باشووری کوردستان بە فەرمیی دروست بوو. ئەو دۆخە تازەیە بە دڵی کوردان نەبوو و بەردەوام شۆڕش دژ بە داگیرکاران سەری هەڵدەدا. ئەو گوشارەی کە کوردەکان دەیانهێنا سەر داگیرکەران، وای لێکردن کە لە کۆشکیی «سەعدئاباد» لە تاران، پەیمانێکی ئاسایشی بە چاوەدێری دەوڵەتی بریتانیا مۆر بکرێ (١٩٣٧ز). بەپێی ئەو پەیمانە نابێ ئیزن بدرێت کە لە سنووری هیچکام لەو وڵاتانە جمجۆڵ دژ وڵاتانی واژۆکەریی ئەو پەیمانە بکرێت. بۆ ئەو مەبەستەش ڕێوشوێنی توندیان گرتە بەر. لەسەر ئەساسی پەیمانی سەعدئاباد دەبوایە هاوکارییەکان لە بواری زانیارییەوە تۆکمە بکرێت و لایەنی بەرانبەری لێ ئاگادار بکرایەوە. لە خاڵی حەوتەمی ئەو پەیمانەدا ڕاشکاوانە هاتوە کە: (ئێمە هەموو پێکەوە، هەرچەشنە هەوڵدان و پێکهێنانی خەباتی سیاسی، کولتوری و کۆمەڵایەتیەکی تر لە هەرێمی خۆماندا دەوەستێنین و هەوڵی نەهێشتنیان دەدەین).[1]

ئەو سنوورە خەیاڵی و دەستکردە ڕەنگە ڕێگاخۆشکەر بووبێت بۆ سیاسەتی دەستەمۆکردن و دابەشکردنی کوردستان بەڵام، قەت نەیتوانی ئەو دوو جەستەیەی نیشتمان لێک دابڕێ. لە نێوانیاندا بەردەوام هاتوچۆ هەبووە و بازرگانی ڕووی داوە و ژنخوازی کراوە. گەر واشبووبێ کە سنوورەکانیان بە تووندی کۆنترۆڵ کردبێ بەڵام، بە لاڕێدا هاموشۆ هەبووە کە پێی گوتراوە ڕێگای قاچاغ و لەو ڕێگایانەوە کەلوپەل و سات‌وسەودا لە نێوان ئەو دوو بەشەی کوردستاندا بەردەوام بووە.

مامە غەنی بلوریان لە کتێبی بیرەوەرییەکانی خۆیدا بە ناوی «ئاڵەکۆک» (لاپەڕەی ١٥ – ٢٣) لە زمان «کاکە مین»ـەوە دەڵێ کە ئەوکەسانەی بۆ کاری بازرگانی دەچوون هاموشۆی ئەودیویان

---

١ کریس کۆچیرا - مێژووی کورد لە سەدەی ١٩ و ٢٠ دا - وەرگێڕانی محەمەدی ڕەیانی - چاپی یەکەم - چاپخانەی کارون - تاران - ١٣٦٩ی هەتاوی. لاپەڕە ٢٧٧

دەکرد، پێیان دەگوتن قاچاغچی، بەڵام نەک بەو مانایە کە دەرمانی هۆشبەر و کاری نەشیاو بکەن، بگرە لە ئێرانەوە مافوور و فەرشیان دەبرد و لەولاشەوە چایی، فەردە جل و کەلوپەلی ڕۆژانەی خەڵکیان دەهێنایەوە. ئەوانە گەورەترین ڕۆڵیان لە گەشەی سیاسی و فەرهەنگی لە نێوان ئەو دوو بەشە لە جەستەی کوردستانیان دەگێڕا و بە هێنا و بردنی خەبەر و هەواڵ یا هێنانی بڵاڤووک و گۆڤارەکان بۆ ڕۆژهەڵات، کاریگەرییان لەسەر ڕووداوەکان دادەنا. زۆرجارانیش لەبۆ کاری سیاسی و تەشکیلاتی، ڕۆڵی قاسیدیان گێڕاوە. وەک مامە غەنی باسی دەکات، ئەوانە بە هێنانی چاپکراوەکان لە باشوورەوە بۆ مەهاباد خەڵکی تینوو و تامەزرۆی ئەو ناوچەیەیان دڵخۆش دەکرد لەبەر ئەوەی، ئەو گۆڤارانە هەم شوێندانەرییان دەبوو بۆ فێربوونی زمانی کوردی و هەم لە گەشەی بیری نەتەوەیی خەڵکەکە کاریگەرییان دادەنا.

کاپیتان حەمەدی مەولوودی، حوسێنی زێڕینگەران (فرووهەر) و سەعیدی حەمەقالەی و ... ئەو سەردەم قاچاغچی بوون. تەنانەت کاک حەمەد پێناسەی عێراقی بۆ دروستکرا بوو و پێناسەی ئێرانیشی هەبووە، بە هاسانی و بەردەوام لە هاتووچۆی ئەو دوو بەشە لە کوردستاندا بوون. هەموو ئەو بڵاوکراوانەی باشووری کوردستانییان دەهێنایەوە بۆ مەهاباد و دەیاندا بە خوێندەوارەکانی ئەو شارە کە جێی مەتمانە بوون وەک عەبدوڵڕەحمان زەبیحی و عەلی زەندی و ... ئیتر جیا لە پەیوەندییەکی پتەو دەگەڵ چینی ڕووناکبیر و نیشتمانپەروەری باشوور کە لە داهاتوودا بوون بە پشتیوانە هەرە سەرەکییەکانی کۆماری کوردستان.[1] هەر ئەو پێوەندییانە وا دەکات تا ئەو جەماعەتە لە ڕێگای کاک حەمەد و باقی قاچاغچییەکان، پێوەندییەک دروست بکەن لە نێوان حیزبی هیوا و ڕووناکبیرانی باشووری کوردستان. ئەو پێوەندییانە وەها گەشە دەکات کە لە ساڵەکانی دواتر پەیمانی سێ سنوور و هاتنی چەند تێکۆشەرێکی وەک مستەفا خۆشناو بۆ مەهاباد لێ دەکەوێتەوە. مامە غەنی بلوریان سەبارەت بەو باسە ئاوا هاتۆتە گۆ:

(پێش ئەوەی نیروی موتەفقین واریدی کوردستان بێ، پۆلیسی ڕەزا خان بۆ ئەوەی پێش بە بڵاوکردنەوەی ئەو فیکر و بیر و باوەڕە نەتەوایەتییە بگرێ، تەدارەکی هێرشێکی بینی، هەر ئینسانێکی کە هەستی لێدەکرد قاچاغچییە و هاتوچۆی عێراق دەکات و لە ڕێگای هێنانی گۆڤاری گەلاوێژەوە، بیر و باوەڕی نەتەوایەتی بڵاو دەکاتەوە، هێرشی کرایە سەر. لە ناوچەی میاندواو و مەهاباد و دەوروبەر کۆمەڵێکیان گرت و لە کوردستان دووریان خستنەوە بۆ باشوور و باکووری ئێران و شیراز و کرمانیان ڕەوانە کردن. لە نێو ئەواندا حوسێنی فروهەر و محەممەدی مەولودی ئەو دوونەفەرە تەنها کەسانێک بوون کە لەو هێرشەدا دەستگیر کران کە دەستیان لە جەریاناتی کۆمەڵەی ژ.ک و هێنانی ئەو گۆڤارە لە عێراقەوە بۆ داخیلی ئێران هەبووە. ئەو دوو کەسە، کە

---

[1] بڕوانن کتێبی: حکومەتی کوردستان - کورد لە گەمەی سۆڤیەتدا – نووسینی: نەوشیروان مستەفا – لاپەڕەی ٧٧

حزب دمکرات کردستان / ۳۲

تاریخ: ۳۷/۹/۱۹
شماره: ۴/۵۹۲ ب ۲

یکی از عمال حزب کومله که از سال ۲۵ بعراق متواری شده‌اند فعلاً رابط ایران و بادکوبه هستند که عکس آنها در دست است

یکی از عمال کومله باستفاده از موضوعیت متواری شده و حتما است در عراق بسر برده اینکه اخیراً بطور قاچاق وارد مناطق مهاباد – اشنویه – سردشت – بوکان شده مرتباً رابطه بین اکراد و عمال کومله میباشند.

۱ـ عبدالله بارزانی[1] یکی از رؤسای بارزان که در سال ۲۶ در عراق تحت تعقیب بوده است شامبرده روی آشنائی با عمال قاضی محمد در منزل وی پنهان شده بود و در سال ۳۳۲ [۱۳۳۲] بتهران آمده با خرید یکدستگاه تاکسی مشغول امرار معاش خود بوده و سرکزش چهارراه فخرالدوله کافه فیروز که همیشه عمال کومله در آنجا جمع میشوند اینک نامبرده بمحض جریان اخیر عراق ببارزان مراجعت کرده است و اغلب به تهران آمده و رفت نموده و رابطه بین عمال کومله تهران و عشایر بارزان و عشایر منطقه مهاباد شده است.

۲ـ محمد مولود اهل مهاباد یکی از زبردست‌ترین افراد عمال حزب کومله – ژ – ک است نامبرده همیشه رابطه بین عراق – ترکیه – ایران – بادکوبه بوده است نامبرده از زبده‌ترین افراد کومله بوده که از سال ۱۳۲۵ بعراق متواری شده بود. ...دلشاد رسولی اهل عراق که از بدو تأسیس حزب کومله کردستان ...

[illegible]

ئەودەمی حوسێنی زێڕینگەریان پێدەکوت دوایە شۆڕەتی خۆی گۆڕی و کردیە حوسێنی فروهەر، لە زیندانی «برازجان» دەگەڵ ئێمە بوو، ١٥ ساڵ حوکم درابوو، لەوێ مەسلول بوو و دوایە هاتە دەرێ، ئازاد بوو مرد.

حوسێنی فروهەر یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک بوو. ڕەحیم لەشکری کارمەندی ئیدارەی فەرهەنگ، حەمەدەمینی خاتەمی کارمەندانی پایەبەرزی سەبتی ئەحواڵی مەهاباد، ڕەحمانی کەیانی، قادری قادری، قادری مودەرەسی ئەو ئینسانانە بوون کە بنەمای کۆمەڵەی ژ.ک یان دامەزراند. بەڵام، ئەوانە هیچیان نەگیران، تەنها کەسێک کە گیرا حوسێنی فروهەر بوو و دەگەڵ حەمەدی مەولودی. ئەودەم بازجوویی بەو جورە و بەو شکڵەی نەبوو، تەحقیق بکەن بازجویی بکەن و شکەنجە بکەن، ئەسرار وەرگرن. حکومەت نەیدەویست دەنگەکە بەرز بکاتەوە و پەخش بێتەوە کە ئەوانە لەسەر مەسەلەی میللی گیراون، بەڵکە بەنێوی قاچاغچی ئەوانیان گرت. هەرچی قاچاغچی بوو خڕیان کردەوە، ئەوەی تێیدابوو و تێیدا نەبوو و هات و چۆی عێراقی دەکرد، گیرا، بۆ ئەوەی ئەو هات و چۆیە ببڕن).[1]

هەروەک پێشتر باسمان کرد ڕۆڵی کاپیتان لەو پێوەندییانەدا لەبەر چاوی حکومەتی ئێران شاراوە نەبووە و لە نامەیەکی نهێنیدا لە ڕێکەوتی (١٩-٩-١٣٣٧) بە ژمارەی (٥٩٢-٤ب٢) کە لە کتێبی (چپ در ایران - به روایت اسناد ساواک - حزب دموکرات ایران - جلد اول - صفحه ٣٢) ناوای لەسەر دەنووسێ: (محەممەد مەولوود خەڵکی مەهاباد یەک لە زیرەکتری و چالاکترین ئەندامانی کۆمەڵەی -ژ-ک ـە. ناوبراو بەردەوام لە نێوان عێراق - تورکیە - ئێران - بادکووبە [باکۆ] قاسید

[1] بروانە کتێبی: سەدەی کارەسات - نووسینی برایم فەرشی - لاپەڕەی ١٥

بووه. ناوبراو له هەره پیاوه ئازاکانی ناو حیزبی کۆمەڵەیه [مەبەستی کۆمەڵەی ژێ. کاف،ه] که ساڵی ١٣٢٥هەڵاتبوو بۆ عێراق.)

له ساڵەکانی پێش دەستپێکی شەڕیی دووهەمیی جیهانیی، به هۆی دروستبوونی بەرەیەکی بەهێزی کۆمۆنیستی له ڕووسییه، که باسیی له مافی گەلانی بەشخوراو دەکرد و دژی سیاسەتی ئیستیعماریی ئیمپریالیستەکانی دەدوا، بەتایبەت ئیمراتوریەتی شاهانەی بریتانیا که له چەوساندنەوەی گەلانی جیهاندا له هیچ کردەوەیەک خۆی نەدەپاراست، کەش و هەوای جیهانی بەرەو گۆڕانکارییەکی دەگمەن لەچاو پێشووی خۆی بردبوو و زۆربەی حکومەتەکانی جیهان به هەستیارانەتر هەڵسوکەوتیان دەگەڵ خەڵکەکانی خۆیان دەکرد. له لایەکی تریشەوه هەستێکی بەربەرینی ناسیۆنالیستی له جیهاندا پەرەی ئەستاندبوو که گەلیی کوردیش یەک له نەتەوەکان بوو که لەو سەردەمدا کەوتبوو بەر کاریگەرییەکی ئەوتۆی ئەو هەسته ناسیۆنالیستییه و خۆیان به بەشخوراو و قوربانی دەستی ئیمپێریالیسمی بریتانیا دەزانی. ئەو سەردەمه نەک بۆ کورد بەڵکوو به سەردەمی هۆشیاری نەتەوەیی بۆ زۆربەی گەلانی جیهان ناودێره. هەر لەو سات و ئانەشدا، له جوغرافیای سیاسیی دەوڵەتی عێراقدا هەندێک کراوەیی هاتنه ئاراوه و جموجۆڵی سیاسی دروست بوو و حیزبی هیوا (هەرچەند به نهێنی)، دامەزرا. هەروەها له بواری چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانییەوه چەند هەنگاوێکی گەوره هەڵێنرایەوه. پێشتر گۆڤاری «زاری کرمانجی»(١٩٢٦ – ١٩٣٠ز) له ڕواندز دەردەچوو[1] و گۆڤاری بەناوبانگی «گەلاوێژ» (١٩٣٩ – ١٩٤٩ز) له بەغدا ڕێک لەو سەردەمه دایه که له دایک دەبێ و له گەشەی بیری نەتەوەیی لەناو کۆمەڵانی خەڵکی هەرچوارپارچەی کوردستان بەتایبەت باشوور و ڕۆژهەڵات گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕێ.[2]

له ئێران ڕەزا شا که له ساڵی (١٩٢١ز) به کودەتا هاته سەر حوکم، به کەسێکی زاڵم و بێبەزه و خۆپەرەست ناوبانگی هەبوو. له ساڵی (١٩٢٥ز) ئەرتەشەکەی بەهێزتر و تۆکمەتر کرد و کەوته گیانی هەموو نەتەوه کەمینەکانی پێکهێنەری ئێران و یەک لەوان کوردەکان. ترس له ڕەزا شا و بێدادی ئەو دیکتاتۆره هەناسەی له خەڵک بڕیبوو. له لووتکەی زۆرداری ڕەزاشادا و له گەرمەی دەستەڵاتی ئەو دیکتاتۆڕەدا، هەروەها به کارتێکەری دۆخی سیاسی جیهان و بەتایبەت باشووریی کوردستان پۆلێک له لاوه نیشتمانپەروەرەکانی مەهاباد، که زۆربەیان له بنەماڵه دەستکورت و ماماوەندییەکان بوون، وەک ڕۆناکبیرێکی نەتەوەیی، نیشیمانپەروەر و پێشکەوتنخواز، یەکەمین حیزبی مۆدێرنی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان به ناوی (حیزبی ئازادیی کوردستان) به نهێنی دامەزراند. ئەو لاوانه ئەو کەسانه بوون:

---

[1] بڕوانه کتێبی: ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمان زەبیحی - مامۆستا عولەما – نووسینی: عەلی کەریمی ل ٦٣.

[2] بڕوانه کتێبی "سەدەی کارەسات" - نووسینی ئیبراهیم فەرشی – ل ١٥.

١. عەزیز زەندی (عەزیز ئاڵمانی)
٢. حوسێن فروهەر (حوسێن زێڕینگەران)
٣. عەبدوڵڕەحمان زەبیحی (مامۆستا عولەما)
٤. حوسێن مکائیلی
٥. حوسێن لبادی
٦. کەریم یاهوو
٧. غەفور مەحموودیان
٨. مەحموود مەحموودیان
٩. محەممەدی مەولودی (ڕاتبی) یا (حەمەدی مەولودی) [١]

سەرچاوە مێژووییەکان ناوی کەسانێکیتریش باس دەکەن کە لە حیزبی ئازادیی کوردستاندا ئەندام بوون بەڵام، وەک دەردەکەوێ ئەندامی دامەزرێنەری ئەو حیزبە نەبوون. بە پێی هەندێک بەڵگە، ئەو حیزبە لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٣١٨ه) دامەزراوە.[٢] زۆربەی دەڵێن ناوی «حیزبی ئازادیی کوردستان» بووە و هەندێکیش دەڵێن ناوی «حیزبی ئازادیخوازانی کوردستان» بووە. ئەو ناڕوونییە زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دروستبوونی ئەو حیزبە لە کەش و هەوایەکی زۆر نهێنی و مەترسیدار بووە کە جگە لە یەک بەیاننامە[٣] و ئەساسنامەکەیان[٤] چی تر لەو حیزبە دەبەردەستدا نییە. چونکە دەستەڵاتی ڕەزاشا لەوپەڕی هێزی خۆیدا بووە کە تەنانەت ئیزنی بیرکردنەوە بە بیرۆکەیەکی ئەوتۆ لای ئەو تاوانێکی گەورە بووە و هەرکەس تاوی ئەو کارانەی دابا، سەریی لەسەر دادەنا.

وەک بەڵگە مێژووییەکان دەریدەخەن و کاپیتان حەمەدی مەولودیش لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژەیەکی کورتی پێداوە، لە ساڵی (١٣١٩ه) دەوڵەتی ڕەزاشا لە مەهاباد بە شێوەیەکی بەرفراوان خەڵکی خاوەن پلە و پایە و شوێندانەری کۆمەڵایەتی لەو شارە کە ڕێژەیان دەوری ٦٠ بۆ ٨٠ کەس

---

[١] نامیلکەی (عبدالرحمان ذبیحی) کاریزمای ناتەمام - نووسینی: ناسر باباخانی

[٢] بڕوانە کتێبی: پەنجا ساڵ خەبات -نووەسینی جەلیل گادانی - جلدی یەکەم - لاپەڕەی ١٦ و ١٧

[٣] زنجیرە لێکۆڵینەوەی "گۆڤاری نیشتمان - لێکۆڵەر: جەماڵ نەبەز - چاپی دووهەم - ساڵی ٢٠١٠ - هەولێر لاپەڕەی ٩٠. هەروەها بڕوانە کتێبی ئاڵەکۆک - کۆکردنەوەی و ئامادەکردنی حامید گەوهەری - ستۆکهۆڵم ١٩٩٧ - لاپەڕەی ١٦. هەروها گۆڤاری "توده" ارگان سازمان انقلابی حزب توده ایران در خارج از کشور لە ژمارەی ١٩ تیر ١٣٤٩ لاپەڕەی ١٠دا دەنووسێ: (لە ساڵەکانی ١٩٤٢ - ١٩٣٩ز، ڕێکخراوێکی چووکە بە نێوی "حیزبی ئازادیی کوردستان" بە ڕابەریی دوکتور عەزیز زەندی پێکهات. لەو ڕێکخراوەیە جگە لە بەیاننامەیەک بە بۆنەی هاتنی ئەرتەشی سوور بۆ باکووری ئێران، کە لەودا پیرۆزبایی کراوە لە ڕزگار بوون لە فاشیزم و داوای مافی دیاریکردنی چارەنووس بۆ گەلی کورد دەکات، چ سەنەدێکی دیکە لەبەر دەستدا نییە)[لە گۆڤاری گزینگ، ژمارە ١٧ لاپەڕەی ٣٩ وەرگیراوە]

[٤] هەروەها بۆ خوێندنەوەی کوردی ئەو ئەساسنامەیە بڕوانە گۆڤاری پەیکی کوردستان ژمارە ٣٤ اسناد احزاب سیاسی ایران - (١٣٢٠ - ١٣٣٠) - به کوشش بهروز طیرانی - انتشارات اسناد ملی ایران - ١٣٧٦ - لاپەڕەی ٢٧

بوونە، دوور دەخاتەوە بۆ شارە دوورەکانی ئێران بە تایبەت بۆ شاری شیراز.[1]

هەر لەو پێوەندییەدا مامۆستا ناسر باباخانی[2] ڕوونتر لەسەر هۆکاری ئەو دوورخستنەوانە دەدوێت و ڕاستەوخۆ گرێی دەداتەوە بە دامەزراندنی حیزبی ئازادیی کوردستان و ئەو حیزبەی بە شتێکی دەگمەن و نوێ باس دەکات نە تەنیا لە کوردستان بەڵکوو لە سەرانسۆی ئێراندا. لە درێژەدا دەڵێ کە لەلایەن شارۆمەندێکی مەهابادی[3] ڕاپۆرتێک دەدرێ بە ڕوکنی دووی ئەرتەشی شاهەنشاهی و ئەوانیش لە هەوڵی ئەوەدا دەبن کە دامەزرێنەرانی ئەو حیزبە بگرن بۆیە، هەندێکیان ڕادەکەن و هەندێکیان زیندانی دەکرێن[4] و بەشێکیشیان وەک حەمەدی مەولود و حوسێن زێرینگەران (فروهەر) لەزێدی خۆیان دوور دەخرێنەوە. هەر لەو بارەیەوە خوالێخۆشبوو دوکتۆر ڕەحیمی قازی لە کتێبێکی دەستنووسدا کە بە زمانی فارسی نووسراوە بەناوی «قاضی محمد و جنبش رهایی‌بخش ملی خلق کرد» کە تا ئێستا چاپ نەکراوە ڕوانگەیەکی تری هەیە و دەڵێ:

[کۆمەڵەی ژ.ک لە مانگی ژووئەنی ساڵی ١٩٣٨ [١٣١٧هـ] لە مەهاباد لە لایان چەند ڕووناکبیری نیشتمانپەروەر دامەزرابوو بەڵام، لە سەروبەندی دیکتاتۆری ڕەزاخاندا و لە هەل و مەرجی تێرۆر و خەفەقاندا چالاکییەکانی کۆمەڵە بەرچاو نەبوو. لە مانگی مای ساڵی ١٩٣٩، دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد پێوەندی دەگەڵ نیشتمانپەروەرانی کورد لە عێراق دەگرن و لە سنوور چاوپێکەوتنێک لە نێوان نوێنەرانی هەردووک لا دەکرێ. لەو چاوپێکەوتنەدا بڕیار دەدرێ هەڵسووڕانی کۆمەڵە هەم لە ئێران و هەم لە عێراق پەرەی پێبدرێ. یەک لە نوێنەرانی کوردی عێراق کە ئەفسەر بووە، گوزاریشی بڕیارەکانی ئەو چاوپێکەوتنە دەدات بە کاربەدەستانی عێراق و لە ئاکامدا دەوڵەتی عێراق و ئێران بەپێی بڕگەکانی پەیمانی سەعدئاباد بە شێوەیەکی هەمەلایەنە هەڵسووڕانیی (کۆمەڵەی ژ.ک) دەخەنە ژێر چاوەدێری. لە ساڵانی ١٩٤٠ - ١٩٤١دا کاربەدەستانی دەوڵەتی ڕەزاخان شکیان لە هەندێک خەڵکی مەهاباد کرد و دووریان خستنەوە.[5,6]]

---

[1] بڕوانە کتێبی: تاریخ مهاباد - سید محمد صمدی - چاپ رهرو - سال ١٣٧٣ - لاپەڕەی ٩٥

[2] عبدالرحمن ذبیحی کاریزمای ناتمام - ناسر باباخانی - بخش اول

[3] اسناد احزاب سیاسی ایران - (١٣٢٠ - ١٣٣٠) - به کوشش بهروز طیرانی - انتشارات اسناد ملی ایران - ١٣٧٦ - لاپەڕەی ٣٣

[4] بڕوانە کتێبی ئاڵەکۆک - کۆکردنەوەی و ئامادەکردنی حامید گەوهەری - ستۆکهۆڵم ١٩٩٧ - لاپەڕەی ١٦.

[5] بڕوانە کۆڤاری گزینگ، ژمارە ١٧ لاپەڕەی ٣٧

[6] بە دڵنیاییەوە دوکتور ڕەحیمی قازی لەسەر ئەو بنەمایە کە ئەو ئەندامانەی (حیزبی ئازدیی کوردستان) کە لە زێدی خۆیان دوورخراونەتەوە و لە داهاتووشدا هەر کۆڵەکەی (کۆمەڵەی ژ.ک) بوون، بۆیە هەر بە ئەندامانی (کۆمەڵەی ژ.ک) ناویان دەبا. دەنا، گشت سەرچاوەکان دامەزراندنی (کۆمەڵەی ژ.ک) گرێدەدەنەوە بە دوای داگیرکردنی ئێران لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانان و نەمانی دەستەڵاتی ڕەزاشا لە ڕێکەوتی سێی خەرمانانی ١٣٢٠ی هەتاوی کە وردەوردە دوورخراوەکان گەڕانەوە مەهاباد و ئینجا دەگەڵ باقی هاوڕێانیان قۆڵیان هەڵماڵی بۆ ڕێکخستنێکی تر کە لەسەر ئەساسی حیزبەکەی پێشوویان (حیزبی ئازادیی کوردستان) بە هەندێک گۆڕانکاری لە

وردەوردە جوغرافیای سیاسیی ئێران و دەوڵەتی ڕەزاشا کە لە بنەوە پشتیوانی لە ئاڵمانی نازی دەکرد، لەلایەن دەوڵەتانی ڕۆژئاوایی لاواز کرا و ڕەزاشا بۆ دوورگەی «موریس» لە ئافریقای باشوور دوور خرایەوە. دەوڵەتی ئینگلیس باشووری ئێران و دەوڵەتی شۆڕەویش باکووری ئێرانیان داگیر کرد. لە ناوەڕاستی ئێرانیش حکومەتی ئێران هەر مابوو بەڵام، بە کزیی و هیچ دەسەڵاتیشی نەبوو. لەو بۆشاییەی نەبوونی قەوارەی دەوڵەتی ئێران و هەڵاتنی کاربەدەستانی حکومەت لە کوردستان و ئازەربەیجان، هەروەها هاتنی ئەرتەشی سووری شۆڕەوی بۆ ئەو ناوچانە لە ڕۆژی هەینی شەشەمی گەلاوێژی ساڵی(١٣٢٠ه - ١٩٤١ز) کەشێکی لەبار بۆ هەناسەدانێکی سیاسی پەیدا بوو کە بێوێنە بوو. ئەو ڕووداوانەش وای کردبوو کە زۆربەی هەڵاتووەکان یان دوورخراوەکانی (حیزبی ئازادیی کوردستان) بگەڕێنەوە مەهاباد. کاپیتان حەمەدی مەولودی تەنانەت لەسەر ڕەخساندن یا هاتنە ئارای ئەو دۆخە لەبارە، ڕاناوەستێ و چەند ڕۆژێک لە شیراز دەمێنێتەوە و لەو شارە ڕا دەکات و بە پێیان و بە شاخ و دەشت و بیاباندا، ڕێگای ڕۆژئاوا دەگرێت و دەگەڕێتەوە مەهاباد و بۆ ماوەیەکی زۆر بە نهێنی لە گوندەکانی دەور و پشتی مەهاباد دەژی.

(حیزبی ئازادیی کوردستان) کە تەمەنێکی کورتیی خۆی، بە نهێنی و لەژێر گوشار و دەربەدەری و دوورخستنەوەی ئەندامەکانی تێپەڕ کردبوو. ئیتر لە سێبەری ئەو دۆخە ئاسایشی و سیاسییەوە دەیتوانی لە کەشێکی ئازادانەتر و بە هێزێکی تازەوە خۆ درەخەن و بە ڕێکخستنێکی نوێ بێنەوە گۆڕەپانی خەبات. ئەندامانی (حیزبی ئازادیی کوردستان) هیچ کاتیان نەبەتڵاند و ئەوجار لە ڕێکەوتی ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١ بە ناوی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان» کە بە کورتکراوەی (ک.ژ.ک) یا بە (ژ.ک) ناسراوە خۆیان ئاشکرا کرد. ئیتر ئەو ڕێکەوتە بە کۆتایی تەمەنی حیزبی ئازادیی کوردستانیش دەژمێردرێ. دیارە لەو چالاکییە تازەیەیاندا هەندێک لە ئەندامانی پێشوویان دەگەڵ نەبوو. بۆ وێنە عەزیز زەندی زیاتر بۆ لای حیزبی تودە بایدابۆوە و داکۆکی لە سیاسەتەکانی ئەوانی دەکرد. غەفور مەحموودیانیش زیاتر بۆ لای ئینگلیسییەکان و تا ڕادەیەکیش بۆ لای حکومەتی ناوەندی کلی کردبوو یان لانیکەم دەتوانین بڵێی بە ڕووسەکان بێباوەڕ بووە.

ئەندامانی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (کۆمەڵەی ژ.ک) هەندێک دەستیان لە ئەساسنامەکەی حیزبی ئازادیی کوردستان وەردا و کەوتنە بانگەشە و ئەندامگیری بۆ حیزبەکەیان.[1] کاپیتان بەهۆی ناسیاوبوونی لە ناوچەی موکریان ڕۆڵێکی باشی دیتووە بۆ وەدەستهێنانی پشتیوانی و یارمەتیدانی

---

ئەساسنامەکەیاندا، کە لە ئاکامدا (کۆمەڵەی ژ.ک) دامەزرا. ئەو سەردەم کە شەپۆلی ڕاگواستنی زۆرەملی لە مەهاباد ڕوویدا، (کۆمەڵەی ژ.ک) دروست نەببوو.

[1] بڕوانە کتێبی "ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا بە پێی بەڵگەنامەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت لە نووسینی دوکتور ئەفراسیاو هەورامی و پێداچوونەوە و ئامادەکردنی سدیق سالح لاپەڕەی ١١٣

ک.ژ.ک. چالاکییەکانی کاپیتان حەمەدی مەولودە چرچی لەبەر چاوی ڕوکنی دووی ئەرتەشی شاهەنشاهی ون نابێت و سەرۆکی گشتیی شارەبانی سنە لە نامەیەکدا بۆ وەزارەتی ناوخۆی ئێران لە ڕێکەوتی ١٣ی خەزەڵوەری ١٣٢٥ ئاوا دەنووسێ[1]:

**[وەزارەتی ناوخۆ - سەرۆکی گشتیی شارەبانی ئێران - ژمارە ١١١٥١-٧١٢٦-١، ڕێکەوتی ١٣-٨-١٣٢٥ (نهێنی)**

**بۆ وەزارەتی ناوخۆ**

**ئیدارەی پۆلیسی شاری سنە بە ژمارەی (٧٤٢) - ٢٥-٧-٣٠ پێتان ڕادەگەیێنێ کە کەسێک بە ناوی محەممەدی مەولود خەڵکی مەهاباد کە پێشتر قاچاغچی بووە، وەک دەڵێن لە ساڵی ١٣٢٠ دەگەڵ کەسانێکی تر لە قاچاغچییەکان بۆ شاری ئیسفەهان دوورخراوەتەوە، ماوەیەکە بە نوێنەری حیزبی جەوانان مەهاباد هەڵبژێردراوە و بە دێ و دێهاتی ناوچەی سەقزدا دەگەڕێ و ئەو لاوانەی کە لە تەمەنی ١٥ تا ٣٠ ساڵە دان ڕادەکێشێتە ناو حیزبەکەیان و ناونووسیان دەکات و هێمایەکی سوور کە لە پارچە دروست کراوە لە سینگیان دەدات و لە هەرکامیان مانگانە بڕە پارەیەک وەردەگرێت و دەینێرێتەوە بۆ مەهاباد.**

**لە لایان سەرۆکی گشتیی شارەبانی ئێران - پاسیار یەکەم حیسام وەزیری - واژۆ]**

بە پێی ئەو بەڵگەیە کە دەریدەخات کاک حەمەد لەپاش (حیزبی ئازادیی کوردستان) لە دامەزراندن و گەشەی (کۆمەڵەی ژ.ک)دا ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو و بێ وچان هەوڵی بۆ داوە. لە داهاتووشدا ئەو حیزبە سەرلەنوێ ناوی خۆی دەگۆڕێت بە (حیزبی دیموکراتی کوردستان).

---

[1] اسناد احزاب سیاسی ایران - (١٣٢٠ - ١٣٣٠) - به کوشش بهروز طیرانی - انتشارات اسناد ملی ایران - ١٣٧٦ - لاپەڕەی ٧٧

## نامەی "ئاڵما فاسوم" بۆ ڕۆژنامەی کوردستان مینشنێری.

خانمی ئاڵما فاسوم لە نامەیەکدا بۆ میسیونێرێکی دیکە لە ئەمریکا کە خەریکی خۆ ئامادەکردن بووە بێ بۆ کوردستان بە کورتی باسی شەڕی دێبۆکری و مەنگوڕان دەکا لە سەر کۆلکە دارێک بۆ چا لێنان. ئاڵما فاسوم ئەو نامەیەی لە ۱۷-ی ژوویەی ۱۹۲۱ لەسابڵاغەوە نووسیوە و ئەو نامەیە لە ژمارە ۱۰-ی خولی ۱۳-ی کوردستان مینشنێری *The Kurdistan Missionary* لە مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ۱۹۲۱ دا چاپ بووە. بە پێی ناوەرۆکی ئەم نامەیە ئەو شەڕە دەبێ لە دووحەوتووی یەکەمی مانگی ژوویەی ساڵی ۱۹۲۱ ڕووی دابێ. حەسەن قازی

" نامەیەکی دیکە لە "ئاڵما فاسوم"ـەوە:

لە نامەیەکدا بۆ یای ئەندرسون کە لە بەرواری ۱۷ی ژوویە ۱۹۲۱ دا نووسیویە دەڵێ: " ئێستا ئەوە نزیکەی دووساڵ دەبێ کە ئێمە یەکدیمان دی. ئەتۆ ئێستا خوێندنی خۆت لە "Moody" تەواو کردووە. هیوا دارم ئەتۆش زۆر حەز لە کوردستان بکەی، هەر وەک ئێمە کە ئێستا دەیکەین.کوردەکان هەتا بڵێی سرنجڕاکێشن. تەنێ پێیانخۆشە زۆر شەڕ بکەن. لەوەتی ئێمە هاتووین تەواو لەو نزیکانەی ئێمە شەڕێک قەوما. هەموو شەڕەکە لەسەر کۆلکەیەکی دار هەڵئاییسا. کوردێک داوای ئەو کۆلکەیەکی ئاشی دەکا بۆ سووتەمەنی. ئێستا ئەو کۆلکە دارە ئی ئاشی گەورەیە و نێوکۆڵ کراوە بۆ ئەوەی ئاوی پێدا بڕوا و باراش بگێڕێ و شتێک نییە کە هەر ئاوا بە هاسانی دەستی لێهەڵگیرێ و بدرێ بە کەسێکی دیکە. هەرچوتێک بێ، ئەوان داوایان کرد و خاوەنەکەی دەستی لەوە گێڕاوە بیانداتێ. جا لە سەر و گوێلاکی یەکتری بەر بوون و دەستیان کرد بە تەقە کردن لە یەکتری و لەو ڕووداوە دا زۆر کەس کووژران و بریندار بوون. هەر دوو ڕۆژ لەمەوبەر یەکێک لە بریندارەکان لە گەڵ هەموو نۆکەرەکانی هاتە لامان. ئەو چاوێکی لە قیس دابوو و چەند برینی دیکەشی لە بەدەنی دا بوو. کوردێکی زۆر کەڵەگەت و جوانچاک بوو. کچە دراوسێیەکەمان پێی گوتم هەر ئەو کوردە پار زستانێ ژنەکەی خۆی هەڵئاوەسیوە. ئەدی ئەوان شەڕکەری ئەوتۆن. بڕیا بە بریای خوڵای بێ ئەو دەمە بگاتە کە ئەو شەڕکەرانە دەستەمۆ بن هەروەک ئیندیانەکانی ئێمە [ !! ]. بەڵام ئەوان لە زۆر ڕووەوە دەبێ پەسن بدرێن..... "

ئەوە وێنانە لە سنووقەکەی کاپیتاندا هەڵگیرابوون. هەبوونی ئەو وێنانە وێنای کەسایەتی و ئاوات و خۆزگەکانی ئەو قارەمانەی کۆماری کوردستان دەکەن.




مەلا مستەفا بارزانی



مەلا مستەفا بارزانی





ئەو وێنەیە لە زۆر سەرچاواندا بە نەمر شێخ سەعیدی پیران ناسێندراوە، بەتایبەت کە ڕۆژنامەی (المصور)ـی میسر لە ڕێکەوتی ٢٤ی ئاپریلی ١٩٢٤دا چاپی دەکات و بە شێخ سەعیدی پیران دەیناسێنێ. ئەو زانیارییە هەڵەیە. ڕەنگە ئەو کەسانەی کە ئەو وێنەیان داوە بە کاپیتان حەمەد ئەوانیش بە هەڵە وا تێگەیین کە ئەوە شێخ سەعیدی پیرانە. لە ڕاستیدا ئەوە وێنەی زانایی ئیلاهییات و بیرمەند، بەدیعولزەمان شێخ سەعید نوورسی، کوڕی سۆفی میرزا، کوڕی عەلی، کوری خدر، کوڕی میرزا خالید، کوڕی میرزا ڕەشانـە کە بە (شێخ سەعیدی نوورسی) دەناسرێ و دەگەڵ برازاکەی بە ناوی عەبدولڕەحمان لە ئیستانبووڵ گرتوویەتی. شێخ سەعید نوورسی، یەک گەورە پیاوە ئایینییەکانی سەردەمی خۆی بووە کە لە گشت تورکییەدا مریدی هەبووە و فەتحوڵڵا گولەن خۆی بە شاگرد و مریدی تەریقەتی ئەو زانایە دەزانێ. بۆ زانیاری زیاتر بڕواننە کتێبی (ئێنسکلۆپێدیای کورد و کوردستان، ئامادەکردنی لێژنەیەک. بەرگی یەکەم، ڕێکخراوی زانست بۆ باس و توێژینەوە، چاپی یەکەم - ٢٠١٨



ئەو وێنەیە کە لەناو ئاڵبۆمی کاپیتاندا هەڵگیرابوو. بە جلوبەرگ و بە سەروسیمای ڕا بە جوانی دیارە کە وێنەی هەڕەتی لاوێتی یای خورشید ڕەهبەر، هاوسەری کاپیتانە. بەداخەوە هیچ لە پشت وێنەکە نەنووسراوە. کاتێک کە لە ئینتێرنێت بە شوێن قەدەمخێردا گەڕام ئەو وێنەیە هاتە سەر و بۆیە منیش پێموابوو کە قەدەمخێرە و لە چاپی پێشوودا ناوی قەدەمخێرم لەسەر نووسیوە، بەڵام بە دوای چاپە کۆنەکەدا، کۆمەڵێک لە خزم و ئاشنایان گومانیان خستە سەر ئەو وێنەیە کە قەدەمخێر بێت و بەڵکوو ئەوانیش پێیانوایە کە ئەوە یای خورشید ڕەهبەرە لە هەڕەتی لاوێتییاندا، بۆیە وێنەکەی لەلای کاپیتان ڕاگیراوە.



کارتپۆستاڵێک لە شاری پارالیای یۆنان




کارتپۆستاڵێک لە زەماوەندێکی کە ژنانی ناوچەیەک
لە کوردستان بە جلی کوردییەوە دیارن






کارتپۆستاڵێک لە کوردستانەوە. وێدەچێت یاری میرمیرێن بێ. لە پشتی وێنەکە بە زمانی ڕووسی نووسراوە (فێستیڤاڵ لە کوردستان)




پشتی وێنەکەیە



ڕاوەستاوان لە ڕاستەوە: ئامینە مەولوودیان، محەممەد ماملێ، کافییە مەولوودیان، عەبدولڕەحمان مەلوودیان (خانە) نوسرەت ڕەحمانزادە. دانیشتوان لە ڕاستەوە: مستەفا ڕەهبەر و خورشید ڕەهبەر. منداڵەکان لە ڕاستەوە: تاهیر ڕەهبەر، ڕووناک مەولوودیان/خودایار، سولەیمان خودایار



کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی (مەولوودیان)



کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی (مەولوودیان)



کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی (مەولوودیان) لە باکۆی ئازەربایجان



کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی (مەولوودیان)



کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی (مەولوودیان)



کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی (مەولوودیان)



وێنەیەک لە دانیشتنێک لە کاتی سەفەری مامۆستا هەژار موکریانی بۆ ئازەربایجان - باکۆ ساڵی ١٩٥٩ز
دانیشتوان لە ڕاستەوە: ئەوەی سەری دیارە نەناسراوەتەوە. ڕەحیم سەیفی قازی، مامۆستا هەژار، .ساری ویلی
(هونەرمەندێکی ئازەری)، بە ئەگەری زۆر عەلی خان سەلاح (گەلاوێژ)ـە. ڕاوەستاو لە ڕاستەوە: عەبدولقادر
مەحموودزادە (دوکتۆر ئاسۆ)، محەممەدی مەولودی (کاپیتان محەممەد مەولودیان)،
جەعفەرپور (هونەرمەندی ئازەربایەجان)، نەناسراو



[illegible]

ئەوە نووسراوەی پشت وێنەکەیە کە بە دەستخەتی دوکتور ڕەحیمی سەیفی قازی نووسراوە. گەر سەرنجێ بدەن، دوکتور ڕەحیم بە جەفەنگ لە ئاست ناوی کاپیتان حەمەد دەنوسێ (کەچەڵ) تەنانت لە ناوئاخنی بیرەوەرییەکانی کاپیتاندا دەخوێنینەوە کە شەهیدی نەمر حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی کاتێک دەیهەوێ دڵی کاپیتان بێننەوە جێ، بە جەفەنگ پێیدەڵێ ئەوە لە کوێی (کەچەڵ). سپاس بۆ کاک حەسەنی سەیفی قازی کە دەستخەتی دوکتور ڕەحیمی سەیفی قازی بۆ پشتڕاست کردمەوە.



کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی (مەولوودیان) و مامۆستا هەژار موکریانی. باکۆ ١٩٥٩ز



خەدیجە ڕاتب خوشکی کاپیتان حەمەدی مەولوودی (١٩٣٢ - ٢٠٢١ز)



لە ڕاستەوە: فاتم (ئایشێ) مەولوودیان، عەبدولڕەحمان (خانە) مەولوودیان، کافییە مەولوودیان ساڵی
١٩٥٢



یەک لە کۆنترین وێنەکانی کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی (مەولوودیان)
پێدەچێ کە ئەم وێنەیە لە تەوریز چرکێندرابێ.



نەمران کۆلۆنێل محەممەد نانەوازادە و ژێنێراڵ محەممەد حوسێن خانی سەیفی قازی



لە ڕاستەوە: عەلی ئاغای دێبۆکری (ئەمیر ئەسعەد) و میرزا ڕەحمەتی شافعی



کاک هاشم فەرەجی مەنشوور بە کاک هاشم موزیقەچی



له ڕاستەوە: کاک عەبدوڵا شەمامی، یای ڕوناک و یای فاتم مەولوودیان کچەکانی کاپیتان حەمەدی مەولوودی - مەهاباد ساڵی ١٩٩٣



یای ئامین مەولوودیان کچی کاپیتان حەمەدی مەولودی و کاک هاشمی کورد (هاشمی بەزاز) هەولێر ساڵی ٢٠١٠



یای ڕووناک کچی کاپیتان حەمەدی مەولوودی لە باکۆ



یای ڕووناک کچی کاپیتان حەمەدی مەولوودی خوێندنگا







یای ڕووناک کچی کاپیتان حەمەدی مەولوودی لە خوێندنگای ناونەتەوەیی ایوانوو



کاک حەمەدەمینی ڕاتب - مەولوودیان دایکبرای کاپیتان حەمەدی مەولوودی .



کاک حەمەدەمینی ڕاتب - مەولوودیان دایکبرای کاپیتان حەمەدی مەولوودی

پشتی وێنەکەی لاپەڕەی پێشوویە کە کاک حەمەدەمینی ڕاتب - مەولودویان دایکبرای کاپیتان حەمەدی مەولوودی لە شۆڕەوی ڕا ناردوویەتەوە بۆ برازای خۆی واتە کاک عەبدولڕەحمان مەولوودیان (خانە) و براژنیی یای خورشید ڕەهبەر کەبە دەست و خەتی خۆی لەسەری نووسیوە.



کاک عەبدولڕەحمان مەولوودیان (خانە) کوڕی کاپیتان حەمەدی مەلوودی

● ئـ :

ئاپۆرا: جەنجاڵی، تێکچڕژان، قەرەباڵغی
ئازەربایجانی شۆڕەوی: وڵاتی ئازەربایجانی ئێستا کە پەیتەختەکەی (باکۆ) یە
ئاشپەزخانە: چێشتگە، موبەق، مەتبەخ، مدبەق
ئاورگە: ئاگردان، کوانوو، کوانگ، سووتماک
ئاوکێش: سەقا
ئەتک: هەتک، ئابڕووبردن
ئەرخەیان: دڵنیا، بێگومان
ئەوچەل: بەڵێ، ئەرێ، ئەوجار، ئینجا
ئەوک: قوڕگ، گەروو
ئیشتیا: حەز، ئارەزوو
ئیندرقاش: دێیەکە لە نزیکی مەهاباد
ئۆین: یاری، گەمە، فێڵ، تەفرە، کەڵەک

● ب:

بادەوە: کۆلارەی لە کاغەز دروستکراوی منداڵان، بەرزە حوایلە
بارگین: بارگیر، ئەو ئەسپ و ماینەی تەنها کاری گواستنەوەی بار و بارخانەی پێ بکرێت
باکۆ: پایتەختی ئازەربایجانە، ڕۆژهەڵاتیترین پایتەختی کیشوەری ئەوروپایە
بڕست: توانا، تین، وزە، هێز، تاقەت، حەوسەڵە
بەدگووز: قین لەسک/لەزگ، بوغزاوی، خیشاوی
بەرچیغ: تێلا، ئەستوون، ئەستووندەگ، دەستەک، تەژە
بەردەڕەشان: ناوی گوندێکە لە نزیکی مەهاباد
بەلەجەڕ: دێیەکە لە ناوچەی ناوەندیی شارستانی سەقز
بەلەنگاز: هەژار، نەدار، بەدبەخت
بوومەلێڵ: تارمایی، تاپۆ
بێبەزە: بێبەزەیی، دڵڕەق، بێڕەحم
بێدەرەتان: بێپەنا، بێلانە، بێنەوا

● پ:

پادگان: سەربازخانە، قشڵە
پلیکان: پلیکانە، پێپلیکانە، قاڵدرمە
پەژیوان: پەشیمان
پۆڵوو: پشکۆ، پەنگر، ژیلەمۆ، ئەسکڵ
پۆست: هەم بە مانای بنکەی سەربازی دێت و هەم بە مانای نۆرەی پاسەوانی دێت لە بنکەیەکی سەربازی. هەروەها بە مانای بنکەی پشکنینی سەربازیش دێت.
پیل: پەل، باڵ، قۆڵ
پێخۆر: هەرشتێک کە بەنانەوە بخورێ

● ت:

تا: بار، فەردە، لەرزوتا
تاقەت: هێز و توانا، شاردنەوە، وەشارتن
تالووکە: پەلە، پەلەپەل، خێرا، دەستوبرد، دەمودەست
تاوپەڕان: خۆرئاوابوون، ڕۆژئاوابوون
تاوهەڵاتان: هەتاوکەوتنان
تخوون: نزیک بوونەوە

تریزوو: ترۆزی، ئەجور
تەتەر: نامەبەر، پۆستەچی، کەسێ نامە دەبا و دێنێ
تەقڵەکوت: بەپرتاو، بەلەز، بەخێرایی، گورج، شێوە هەڵاتنێکی ئەس
تووش: سەخت، نالەبار
توک: نەفرین، دوعا، موو، قژ

● ج:

جامین: چارە، سەروسەکوت،
جلیتقە: هێلەک، هێلەگ، سوخمەی بێ قۆڵی پیاوانە، سەدریە
جمخانە: توونخانەی حەمام. ئەو شوێنەی ئاگری لێدەکرێتەوە بۆ گەرمکردنی ئاوی حەمامی گشتی. لەبەر گەرمایەکی زۆری کە هەیبووە و بە جەهەننەم شووبهاندوویانەوە و بە کورتکراوەیی پێیان گوتووە جمخانە.
جەربەزەیی: بزێوی، چەتوونی، هاروهاجی
جەردەیی: ڕێگر، ڕێگا بەخەڵکیی گرتن و ڕووتکردنەوەی بە زۆر
جەزرەبە: لێدان، ئەشکەنجە، ئازاردان
جەغز: جوغز، بازنە
جورئەت: بوێریی، ئازایەتی، چاونەترسی، قارەمانی، مێرخاسی
جیرە: پشک، مووچە، بەشێکی هەمیشەییە کە کەسێک بۆ کەسێکی بڕیبێتەوە
جیرەخۆر: مووچەخۆر
جیفرک: هەڵبەزینەوە و لاقە هاویشتنی ئەسپ و چوارپێ کاتێک کەیفی ساز دەبێ. هەرکات بۆ مرۆڤ بەکاری بێنن باری نەرێنی دەگرێ

● چ:

چاک: شەخس، مەزار
چرێش: سرێش، کەتیرە
چما: بۆچی
چەکمە: جزمە، جەزمە، کەوشی تا ئەژنۆ
چەلان: جاران، پێشوو، ڕابردوو، ڕابووردوو
چەلەنگ: دەفری تەنەکە
چەنەوەری: دەمەوەریی، دەمەدەمە، چەنەبازی
چۆماغ: کوتەک، گۆپاڵ، تێلا، خوترە، دەسکی پاچ و پێمەرە
چێشنان: چێشتەنگاو، نێوان بەیانی و نیوەڕۆ

● ح:

حاڵیجاو: هیلاک، خەستە، نەخۆش
حەجمین: ئۆقرە، ئارام، توانا، ئیسراحەت، تابشت
حەسار: حەووش، حەوشە
حەشیمەت: ئاپۆرە، حەشامات، دانیشتووان
حەوجە: پێویست، نیاز
حەول: هەوڵ، کۆشش
حەیس و بەیس: باس و نیاز
حولـلەمەرەسێ: ئیفلاس، سەرساجیعەلی

● خ:

خەرازی: وەردەواڵە
خەوش: کەموکوڕی، ناتەواوی، کەمایەتی، کەمایەسی
خورجین: تورەکە، کیسە
خۆسانسۆری: چاودێریی خودی، (الرقابة الذاتية)

● د:

دارۆغە: پاسەوان، حەسحەس، سەرۆکی پۆلیس
دڕدۆنگ: دوودڵ، بەگومان، پاشەڵ پیس
دژوار: ئاستەم، تووش، سەخت، زەحمەت
دژوێن: چڵکن، ئەسپێون
دەراغ: شانە، مەخزەن، فیشەکدان
دەرخۆنە: پنە، سەرپۆشێکی گڵینی دەسکدارە دەخرێتە سەر دەمی مەنجەڵ لەسەر ئاگر
دەرمانداو: دەرمانخوارد، ژەهرخوارد
دەگەڵ: لەگەڵ، لەتەک
دەهۆ: گزی، فێڵ، دهۆ، تەفرە
دۆستاخ: زیندانی، بەندکراو، بەندی، حەپس (تورکی: دوستاق – ئازەریی: دوستاغ)
دیلمانج: وەرگێڕ، (مترجم – موتەرجیم)

● ڕ:

ڕازی سەربەمۆر: نهێنی پارێزراو
ڕژد: ڕەزیل، پیسکە، چرووک، دەستنووقاو
ڕەپێچەکدان: قۆڵبەست، قۆڵپێچ، دەستبەستنەوە بەزۆر
ڕەجاڵ: هەژار، نەدار، فەقیر، بێنەوا، ڕەجاڵە
ڕەژی: خەڵووز، ڕەژوو، زووخاڵ
ڕەکێش: پەلکێش، بەزەویدا ڕاکێشان

● ز:

زاکوون: یاساوڕێسا، شێواز
زڕدایک: باوەژن، هەوێی دایک
زنج: حەوشی لە چەپەر و قامیش بۆ ماڵات تێ کردن
زەین: بیر، هۆش، هزر
زینو: باسکی شاخ و کێو
زینوێ: گوندێکە لە ناحیەی حاجی ئۆمەران، سەربە قەزای چۆمان لە پارێزگای هەولێر

● ژ:

ژووشک: ژیشک، زوشک، ژووژی، ژیژی
ژێکاف: (ژ.ک) کورت کراوەی ڕێکخراوی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد)ـە.
ژێڵلا: خوارەوە، ژێرەوە

● س:

ساڵدات: سەرباز، فیداکار
ساواک: (سازمان اطلاعات و امنیت کشور - دەزگای هەواڵگری و ئاسایشی وڵات)ی ئێران لە سەردەمی دەسەڵاتی پەهلەویدا
سایینقەڵا: شارۆچکەیەکی پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژاوایە، دەکەوێتە ناوچەی موکریان

سەربەمۆر: ئاشکرا نەکراو، نەبینراو و نەبیستراو
سەرەچبوغ: سەرەمۆدنە، سەرەسەبیلە بۆ سیغارکێشان
سەکەت: تۆپیو، کەوتی، سەکەت، مردوو لە ڕێگەی خراپەدا، لە کار کەوتن
سەولە: ئەستورکێ -کولێرە- لە درشتەی ئارد کە خۆراکی سەگە
سەی: سەگ
سیخوڕ: جاسوس، شۆفار، هەواڵدز

● ش:

شاروێران: دەشتی شاروێران، یەکێکە لە دەشتە فروان و بە پیتەکان لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان
شپرزە: شپرێو، پەرێشان، بێحاڵ
شمەک: شتومەک، کەلوپەل، کەرەسە، پێداویستی
شنگڵ: خۆ تەکان دان
شەپەڵاغە: زللـە، شەپازلە
شەیپوور: ئامێرێکی موزیکی هەواییە
شوڵ: لقی بردرای داری تەڕ
شیر: شمشێر، شمشیر
شیمانە: ئەگەر، ڕێتێچوون، لەوانەیە (الاحتمال)
شیو: چێشت، ئاش، شام، دۆڵ

● ع:

عرووس: ڕووس، عەرووس

● غ:

غەوارە: بێگانە، غەریبە، بیانی
غوڕڕابی خەو: قوڵایی خەو، شیرینخەو

● ف:

فاسونیا: قوماش، پارچەی پیاوان، فاستونی
فانی: ونبوون، دیارنەمان
فراوین: فراڤین، ژەمی نیوەڕۆ، نیوەڕۆژە
فلە: فەلە، دیان، خاچپەرست، مەسیحی
فەعلە: شاگرد، کرێکار

● ق:

قاتر: هێستر، ئێستر
قامک: پەنجە، ئەنگوست
قاو: دەنگۆ، دیعایە، هەواڵ
قشڵە: بنکەی سەربازیی
قەرتاڵە: تریان، بەرچنە، سەبەتە، سەوەت
قەرەوڵ: پاسەوان، ئێشکگر، نۆبەچی، ئێشکچی، کێشکچی، سێرەی تفەنگ
قەول: بەڵێن، پەیمان، سۆز
قووتار: کۆتایی، تەواوبوون، ڕزگاربوون
قومقومە: مەتارەی سەفەر، تونگەی جێگەی تراو
قۆرخانە: گەنجینەی چەک، جبەخانە

● ک:

کاپیتان: کاپتن، فەرماندە، سەروان
کاروانسەرا: کارمەسەرا، خانوویەکی گەورەیە، جێگەت پشوودانی کاروانە
کایە: یاریی، وازی، گەمە
کڵفەت: کارەکەر، کەنیزەک، دایەن، قەرەواش
کەژوو: قەیاسە، کەژگ، کەژێکە کە سەر و بنی چیغ و حەسیری پێ دەگیرێ
کەنگێ: کەی، چ‌کات
کۆپین: برە خۆراکی مانگانە، (بایەعی)
کیپلینگ: جۆزێف ڕودیارد کیپلینگ (٣٠ ی کانوونی یەکەمی ١٨٦٥ - ١٨ ی کانوونی دووەمی ١٩٣٦) نووسەر و ڕۆماننووس و ڕۆژنامەنووسێکی بریتانی بوو کە لە ساڵی ١٩٠٧ خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی بەدەستهێنا. خەڵاتەکەی بەهۆی شیعر و کورتە چیرۆک و ڕۆمانەکانیەوە پێبەخشرا. یەکێک لە بەناوبانگترین فیلمەکانی جۆن هیوستن، ئەو «پیاوەی دەیویست پاشا بێت»، لە چیرۆکێکی ڕودیارد کیپلینگ دروستکراوە.
کێچاوا: دێیەکە لە نزیکی شاری مەهاباد

● گ:

گازندە: سکاڵا، گلەیی، نارەزایی
گاڵە: کلۆم، داخستن، قفڵی داربنی درگا
گاوگەردوون: سەر برینی ئاژەڵ بۆ پێشوازی لە پیاوی بە قەدر و حورمەت
گرژاڵ: ڕەنگێکە بۆ (مەرەز/شاڵ) کە نێوانی ڕەش و سوورە، سووری ئاماڵ ڕەش، ناوی گوندێکی سەر بە شاری سەردەشتی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە
گورج: خێرا، بەپەلە، دەستوبرد
گوڕاندن: نەڕاندن، هاوار بەسەرداکردن
گوڕە: هەراوهوریا، زەنا
گوڵمێخ:
بزمارێکی درێژی ئەستووری سەرپانە
گوێلک: گوێرەکە
گۆنگەڵ: گێچەڵ، گرفت، تەنگژە، بەزم
گیرفانبڕ: پارەدز، کەسێکە شتێکت لێ بدزێ کە بەخۆت بێ و پێی نەزانیت
گێوژ: گۆێژ

● ل:

لە حەیفان: لە داخان، لە مەراقان
لەوێچ: مشتێک، مستێک، چنگێک
لێوڕێژ: پڕ، لێوانلێو

● م:

ماشە: مقاش، مەقاش، سەبەتەیەکی دەم تەنگی بن فرەوانە ڕاوە ماسی دەچێتە نێوی و دەیگرن
محەنج: سەروحەج
مرخیش مرخیش: یا مرخێش مرخێش هەناسە سوار بوون بە شتێکی قورس و سەنگینەوە. لێرەدا توانجە بە مانای هەوڵ، بێنە و بەرە و قسە و باسێکی زۆر و بێبەرهەم.
مشکۆڵزمە: قەرزاربار، منەتبار، ئۆباڵ

لەئەستۆ
مەبالات: گرنگیی، بەها
مەجۆعمە: سینیی، کەشەفە، دەفری دارین
مەکلاوێ: دێیەکی سەردەشتە، دەکەوێتە نێوان سەردەشت و بانەوە
مەگین: مەگەر، چۆنها
مەهاباد: (یان سابڵاغ)، بەناوبانگترین شاری ڕۆژهەڵاتی کوردستانە. مەهاباد ساڵی ١٩٤٦ پایتەختی کۆماری کوردستان بوو، کە پێشەوا قازی محەمەد سەرۆک کۆماری بوو
مەودا: نێوان، نووکی خەنجەر و شمشێر
موبالات: مەبالات، (بێ موبالات) گوێپێنەدان، گرنگیی پێنەدان، خەمساردی
مۆدنە: دارجگەرە، دارجغارە
مۆلەکە: موهلەکە، جێگەی ترس و مردن
میچ: بان، سەقف
مێشە: بێشە، دارستانی «بی» لە دەم چەم

● ن:

ناحەز: دزێو، ناشیرین، نەیار، ناپەسەند
نۆبەچی: ئێشکچی، کێشکچی، پاسەوان، ئێشکگر

● هـ:

هاچەر: کلیل، ئاچەر، کرێڵ، کلیلە، کلێڵ
هاموشۆ: سەردان، بەسەرکردنەوە
هاواڵ: هەڤاڵ، هاوڕێ
هەترە: ورە، غیرەت، جەسارەت
هەتک: ئەتک، ئەتک کردن، ئابڕووبردن
هەدا: ئارام، ئۆقرە، ئۆخژن، هەراس
هەرمەنیی: ئەرمەنی، خەڵکی ئەرمەنیی بە ئایین مەسیحین.
هەنێهەڵگر: هەنیەهەڵگر، ئەو کەسەی مووی دەموچاو هەڵدەگرێ بەتایبەت بۆ ژنان
هەوشار: شارۆچکەیەکە سەر بە پارێزگای ورمێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، بەپێی دابەشکردنی ناوچەیی لە کوردستاندا هەوشار سەر بە ناوچەی موکریانە. هەروەها کەوتووەتە نێوان شاری تیکاب، ساینقەڵا و فەیزوڵابەگیی بۆکان
هۆردوو: (ئۆردوو) شوێنی کۆبوونەوەی لەشکر
هۆمەن: ئامباز ، شاڵاو، هێرش
هیچکارە:
بێکارە، هیچ لە بارا نەبوو، بێکەڵک

● و:

وەتاغ: ژوور، دیو، هۆدە، ئۆدە
وێدەچێ: پێدەچێ، دوورنییە، لەوانەیە

● ی:

یای: خانم، خاتوو/ن (بۆ ڕێزلێنان لە ژنان دەگوترێت)
یەرغو: چۆمی یەرغو لە مەهاباد
یەکپێ: لەپڕ، ناکاو

## ئەو سەرچاوانەی بۆ بەڵگەمەندکردنی ئەم کتێبە سەردانیان کراوە


١. کتێبی: نگاهی به تاریخ مەهاباد نووسینی: سید محمد صمدی.
٢. کتێبی: مەهاباد در آیینەی اسناد تاریخی نووسینی: فەرەیدوون حەکیم زادە.
٣. کتێبی: سەردشت در آیینه اسناد تاریخی، نووسینی: فریدون حکیمزادە.
٤. کتێبی: خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو، نووسینی: دکتر قادر محمودزادە (آسو).
٥. کتێبی: زبده تاریخ کرد و کردستان – نووسینی محەممەد ئەمین زەکی بەگ – وەرگێڕان بۆ فارسی: یدلله روشن اردلان.
٦. کتێبی: کارەساتی مێژوویی (کوشتاری خەڵکی کورد بە دەستی سپای رووسی تزاری) نووسینی: عەزیز وەلیانی.
٧. کتێبی: مێژووی دەوڵەتی عوسمانی – محەمەد فەرید بەگ.
٨. کتێبی: ایرانی که من میشناختم/ئێرانێکی کە من دەیناسم) نووسینی (بازیل نیکیتین یان باسیلی نیکیتین).
٩. کتێبی: کۆمەڵناسی کوردەواری، دوکتور حوسێن خەلیقی - بەرگی یەکەم - چاپخانەی الحوادیث - بەغدا – ساڵی ١٩٩٢.
١٠. کتێبی: کێشەی کورد ١٨٩٦-١٩١٧ نووسینی م.س لازاریف. لە وەرگێڕانی دوکتور کاوس قەفتان.
١١. کتێبی: کورتە مێژووی بنەماڵەی قازی لەویلایەتی موکری - نووسینی: خەلیلی فەتاحی قازی - وەرگێڕ و ئامادەکار: حەسەنی قازی.
١٢. کتێبی: وێبلاگر ڕوانگە کە کاک حەسەنی سەیفی قازی بەڕێوەی دەبات.
١٣. کتێبی: «کورد و عەجەم» نووسینی نەوشیروان.
١٤. کتێبی: فەرهەنگی «هەنبانە بۆرینە»، نووسینی مامۆستا هەژار.
١٥. کتێبی: یادداشتەکانم، بە پێنووسی: عەبدوڵڵا احمد ڕەسووڵ پشدەری، بەرگی یەکەم.
١٦. کتێبی: سەدەی کارەسات، نووسینی: برایم فەرشی، چاپی بنکەی ژین.
١٧. کتێبی: ئاڵەکۆک، نووسینی: حامید گەوهەری.
١٨. کتێبی: سمکۆ و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد نووسینی: محمد رسوڵ هاوار.
١٩. کتێبی: ڕاپەڕینی کورد بە ڕابەرایەتی سمکۆ نووسینی: م.م فان بروونەسن. وەرگێڕانی: شێرکۆ هەژار.
٢٠. کتێبی: تاریخ هیجده ساله آذربایجان (بازمانده تاریخ مشروطه ایران). نووسینی احمد کسروی.
٢١. کتێبی: فەرهەنگۆکی خشڵ و پۆشاکی ژنانەی موکریان، نووسینی: مامۆستا عەبدوڵڵا سەمەدی.
٢٢. کتێبی: نەخشەی پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی ئوستانی ورمێ – ناوەندی بڵاوکردنەوە: سلێمانی، کتێبخانەی ئەندێشە، ساڵی ٢٠١٢.
٢٣. کتێبی: کورتە مێژووی بزووتنەوەی نەتەوایەتییەکانی کورد. نووسینی: (دوکتور سادق شەڕەفکەندی)، وەرگێڕان لە فارسییەوە: تەها عەتیقی.

٢٤. کتێبی: ئێنسکلۆپیدیای کورد و کوردستان، ئامادەکردنی لێژنەیەک. بەرگی یەکەم، ڕێکخراوی زانست بۆ باس و توێژینەوە، چاپی یەکەم - ٢٠١٨

٢٥. کتێبی: سمکۆ (سمایل ئاغای شوکاک) و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد - چاپی یەکەم ١٩٩٥- ستۆکهۆڵم.

٢٦. کتێبی: جوڵانەوە نەتەوەیی کورد نووسینی: پرۆفیسۆر د. وەدیع جوەیدە - وەرگێڕانی لە ئینگلیسییەوە: پرۆفیسۆر ی.د یاسین سەردەشتیی

٢٧. کتێبی: مێژووی کورد لە سەدەی ١٩ و ٢٠ دا) نووسینی: کریس کۆچێرا - وەرگێڕانی: محەممەد ڕیانی - چاپی یەکەم - تاران.

٢٨. کتێبی: بیرەوەرییەکانی ماژۆر مەلیکزادە هیربد.

٢٩. کتێبی: شاری وێران- نووسینی عەلی حەسەنیانی (هاوار) - چاپی دووهەم - بڵاوکراوەی مانگ.

٣٠. کتێبی: «کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا»، نووسینی دوکتور کەماڵ مەزهەر - بەرگی یەکەم - چاپی دووهەم - ساڵی ٢٠٠٩.

٣١. کتێبی: جمهوری ١٩٤٦ کوردستان - نووسینی: ویلیام ئیگڵتۆن - وەرگێڕانی: سید محمد صمدی.

٣٢. کتێبی: سڵاو لە سابڵاغ - نووسینی: ئەحەدی ئەنجیری.

٣٣. کتێبی: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان - نووسینی: حامید گەوهەری.

٣٤. کتێبی: خاطرات آرداشس آوانسیان از اعضای گروه ٥٣ نفر .به کوشش علی دهباشی. انتشارات شهاب.

٣٥. کتێبی: ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا بە پێی بەڵگەنامەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت لە نووسینی دوکتور ئەفراسیاو هەورامی و پێداچوونەوە و ئامادەکردنی سدیق سالح.

٣٦. کتێبی: کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا بەرگی یەکەم و چاپی دووهەم لە ساڵی ٢٠٠٩.

٣٧. کتێبی: سێبەری ئازادی، نووسینی: (کەماڵی عەبدوڵڵاهی) چاپی بنکەی ژین، لە سلێمانی - ساڵی ٢٠٠٨.

٣٨. کتێبی: اسرار محاکمه قازی محەممەد و یاراش. نووسینی: محەممەد ڕەزا سەیفی قازی.

٣٩. کتێبی: ڕۆژنامەی «کوردستان» ئۆرگانی فەرمیی حیزبی دیموکڕاتی کوردستان.

٤٠. کتێبی: ژیان و بەسەرهاتەکانی عەبولڕەحمانی زەبیحی (مامۆستا عولەما) نووسینی عەلی کەریمی.

٤١. کتێبی: مرگ بود، بازگشت هم بود - نووسینی: نجفقلی پسیان.

٤٢. کتێبی: تاریک و ڕوون - مامۆستا هێمن موکریانی.

٤٣. . کتێبی: کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران - نووسینی: کەریم حیسامی - ساڵی ١٩٧١.

٤٤. کتێبی: بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوایەتیی گەلی کورد و قازی محەممەد ١٩٤١ - ١٩٤٧ - نووسینی ڕەحیمی قازی - دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس - هەولێر.

٤٥. کتێبی: قیام افسران خراسان نووسینی: ابوالحسن تفرشیان.
٤٦. کتێبی: گەشتێک بەناوی کۆماری کورستاندا - بیرەوەرییەکانی - ڕەئیس بەکر - (عەقید عەبدولکەریم حەوێزی) - (١٩٤٤ - ١٩٤٧) - بڵاوکراوەی: ئاراس - چاپی دووهەم.
٤٧. کتێبی: سادات نقشبندی و جنبشهای ملی کرد در گذر تاریخ) وەرگێڕانی محمد بانەای، چاپی «ارومیه - موسسه انتشاراتی حسینی.
٤٨. کتێبی: خاطرات صفرخان - سی و دو سال مقاومت در زندانهای شاه - در گفتگو با علی اشرف درویشیان.
٤٩. کتێبی: لحظاتی از زندگی صفرخان قهرمانیان نووسینی: بهروز حقی.
٥٠. کتێبی: (لە بیرەوەریەکانم، بەرگی - یەکەم، لە منداڵیەوە تا ساڵی ١٩٧٥، نووسینی: کەریم حیسامی.
٥١. کتێبی: اسناد احزاب سیاسی ایران - (١٣٢٠ - ١٣٣٠) - به کوشش بهروز طیرانی.
٥٢. کتێبی: چپ در ایران، به روایت اسناد ساواک، حزب دموکرات کردستان ایران، جلد اول.
٥٣. کتێبی: «مائۆ، چیرۆکی نەزانراو» نووسینی جونگ چانگ و جۆن هەلیدای - وەرگێڕانی مامۆستا شێرکۆ هەژار - بەشی دوو.
٥٤. کتێبی: چێشتی مجێور، نووسینی: عەبدوڕەحمان شەرەفکەندی (هەژار)، ئامادەکردن و سەرپەرشتی چاپ: خانی شەڕەفکەندی، چاپی یەکەم، ساڵی ١٩٩٧.
٥٥. کتێبی: ڕۆمانی پێشمەرگە - نووسینی د. ڕەحیمی قازی.
٥٦. دیمانەیەکی تێلیڤیزیۆنی لە مێژووناس و گەڕێدەی کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا «کەریم زەند».
٥٧. کتێبی: حکومەتی میللی کوردستان - لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی مێژوویی - نووسینی مامۆسستا ڕەحیم سابیر - چاپی یەکەم ٢٠١١.
٥٨. کتێبی: حکومەتی کوردستان - کورد لە گەمەی سۆڤیەتدا - نووسینی: نەوشێروان مستەفا.
٥٩. کتێبی: پەنجا ساڵ خەبات -نووەسینی جەلیل گادانی - جڵدی یەکەم.
٦٠. زنجیرە لێکۆڵینەوەی «گۆڤاری نیشتمان - لێکۆڵەر: جەماڵ نەبەز - چاپی دووهەم - ساڵی ٢٠١٠ - هەولێر.
٦١. گۆڤاری «توده» ارگان سازمان انقلابی حزب توده ایران در خارج از کشور لە ژمارەی ١٩ تیر ١٣٤٩.
٦٢. گۆڤاری گزینگ، ژمارە ١٧.
٦٣. گۆڤاری هاوار - ساڵی دووهەم - ژمارەی ٧ - ڕێبەندانی ساڵی ٢٠٠٠ - چاپی ئاڵمان.
٦٤. گۆڤاری پەیکی کوردستان ژمارە ٣٤.
٦٥. نامیلکەی: عبدالرحمن ذبیحی کاریزمای ناتمام - ناسر باباخانی - بخش اول.
٦٦. کتێبی: (مەفرەزەکەی عومەر ناجی) *ÖMER NACİ BEY MÜFREZESİ* دا و لە نووسینی *Yrd.Doç.Dr. Sadık SARISAMAN*.
٦٧. کتێبی: (*IMAGES FROM THE ENDGAME; Persia Through a Russian Lens* ١٩١٤-١٩٠١) نووسینی: جان چالێنکۆ.

٦٨. کتێبی: زندگینامەی عارف شهید، حضرت شیخ بابا سعیدی برزنجی) لەلایەن بەڕیز (سەید مەسعود سەعیدی) نووسراوەتەوە.
٦٩. سەمێژووی ئەدەبی کوردی – نووسینی عەلائەدین سەجادی - چاپی عێراق.
٧٠. کتێبی «چڵ ساڵ خەبات» نووسینی نەمر عەبدولڕەحمانی قاسملووو.
٧١. کتێبی: بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی حیزبایەتی و پێشمەرگایەتی و دوورخرانەوەم نووسینی: تۆفیقی مەلا سەدیقی.
٧٢. لە قەرەشڵاخەوە بۆ سوێد نووسینی: مامۆستا محەممەدی خزری - بەرگی یەکەم.
٧٣. کتێبی: (از مهاباد تا بایکانور) نووسینی: «رحمان حلوی».
٧٤. کتێبی: «شانێک بە بەر شانی نیشتمانەوە» نووسینی: ژینواری عیزەت سلێمان بەگ دەرگەڵەیی.
٧٥. کتێبی: سمکۆ - بارودۆخی سیاسی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٦ تا ١٩١٨ی زایینی – نووسینی: هێما سۆفی
٧٦. کتێبی: *«Road Through Kurdistan, the Narratives of an Engineer in Iraq»* - (*Archibald Milne Hamilton*)
٧٧. ماڵپەڕی کوردیپێدیا. *www.kurdipedia.org*
٧٨. ماڵپەڕی ڤەژین لیکس. *www.lex.vejin.net*
٧٩. ماڵپەڕی فەرمیی ماملێ. *www.mamle.net*
٨٠. ماڵپەڕی نەمران. *www.nemiran.com*
٨١. وێبلاگی توێژین. *https://agiri١١/٢٠١٧.blogspot.com/١٢/*
٨٢. وێبنووسی وێنەکانی کۆمار: *http://weneykk.blogspot.com/*
٨٣. وێبنووسی ڕوانگە: *https://ruwange.blogspot.com/٢٠٠٩/٠٧/blog-post_١٨.html*

**سپاس بۆ ئەو بەڕێزانە کە زۆرم ماندوو کردن:**

١. کاک هۆگر کاوانی
٢. کاک موحیب مەهابادی
٣. کاک هێمن سەیدی
٤. کاک ڕامیار شەمامی
٥. یای مەرزە مەولوودیان
٦. یای یەگانە جەفەرۆڤا (***Yegane Jafarova***)
٧. کاک چایدۆست ڕەسوڵ
٨. کاک حەسەن ئاغا میراودەلی
٩. کاک ئاراس زاهیر ڕەسام
١٠. کاک ڕامین نەوزاد
١١. کاک تورەج شەمسی بورهان
١٢. کاک عەبدوڵاخان ئەمیری
١٣. کاک عوسمان ڕانیەیی
١٤. کاک ئازاد بایز چەمچەماڵی
١٥. کاک ڕزگار ئەژی (نەوەی مامۆستا گۆرانی شاعیر)
١٦. کاک ئیبراهیم ...
١٧. کاک مەحمود ...
١٨. کاک نەبەرد پاڵانی
١٩. کاک سمایلی ئاغا مەجیدی
٢٠. یای سەرگوڵ قازی
٢١. کاک جەعفەر فەقێ نەبی
٢٢. کاک سامڕان شێخ محەممەدی
٢٣. کاک سەتار فەرەجی
٢٤. کاک سۆران باریکە
٢٥. کاک عیسا مێرگەسووری
٢٦. یای گوڵاڵە شەمامی
٢٧. یای شەونم ماملێ
٢٨. کاک ئارمان داودی
٢٩. کاک کامڕان ئیبراهیمیان
٣٠. کاک ئاری کەریم
٣١. کاک عەتا محەممەد
٣٢. کاک توانا حەمە
٣٣. کاک محەممەد ڕەزا سەیفی قازی

# ئیندێکس

## ز



## س

## ش

## ل



## م

ئەو کتێبەی لەبەر دەستتانە، بەشێکە لە بیرەوەرییەکانی کاپیتان حەمەدی مەولوودە چرچی کە پاش تێپەڕبوونی ٤٣ ساڵ لە مەرگی خۆیان بڵاو دەکرێتەوە. بەڕێزیان لە سەردەمی پێش شەڕی یەکەمی جیهانی ڕا بۆمان دەگێڕێتەوە تا ڕەشەکوژی خەڵکی مەهاباد لەلایەن لەشکری ڕووسی تێزارییەوە. لە زۆر بابەتی گرنگی تر دەدوێ کە بە چاوی خۆی دیتوونی.
لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا پلەی بۆ کاپیتان بەرز دەبێتەوە و ڕاستەوخۆ لە لایەن پێشەوا قازی محەممەدەوە ئەمری وەرگرتووە و بە خۆی و بە پێشمەرگەکانی، وەک فیدایی بۆ کۆماری کوردستان چاویان لێدەکران و دژوارترین ئەرکەکانیان پێدەسپاردن.
بیرەوەرییەکانی لەو بارەوە پڕن لە زانیاری نەبیستراو و تازە و دەگمەن کە تێیدا دەچێتە ناو ناخی ڕووداوەکان، کەمایەسییەکان، گومانەکان و ئازارەکان. کەس هەڵنابوێرێ و ڕاستگۆیانە ئەسکوێ لە بنی مەنجەڵ دەدا و بەرە لەسەر هەتیو هەڵدەداتەوە.

# BEING A KURD

## A CHAPTER OF CAPTAIN HAMADI MAWLUDI'S MEMORIES



Revalidation and Compilation by:
WIRYA MAMLE





